


# دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


● **ئەخلاق .... و سیاسەت (توێژینەوەیەکی سیاسییانەی فەلسەفەی دەسەڵاتە)**

● نووسین: **ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام**

● وەرگێڕانی: **شەریف عوسمان**

● نەخشەسازی **ناوەوە: رێدار جەعفەر**

● بەرگ: **هۆگر صدیق**

● نرخ: (**٧٠٠٠**) دینار

● چاپی یەکەم: **٢٠١٢**

● تیراژ: **١٠٠٠** دانە

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٦٢) ساڵی(٢٠١٢)ی پێ دراوە.**

## زنجیرەی کتێب (٦٧٩)





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە سوعاد خانی هاوسەرم لەگەڵ منداڵەکانم**

**بەتایبەتی سارا خانی کچە بچووکم**

# پێرست

# پێشەکی وەرگێڕ

خوێنەری بەڕێز : دوای ئەوەی ئەو کتێبەی ئیمام عەبدولفەتاح ئیمامم خوێندەوە ، باسی تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت دەکات، کە چۆن لە سەردەمە کۆنەکانەوە تا ئێستا ئەو تێکەڵکردنە لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەردەوامە، بە چاکم زانی وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی تاکی کوردیش سوودی لێوەربگرێ.

نووسەر لەم کتێبەیدا هەوڵی ئەوەی داوە توێژینەوەیێکی سیاسییانە، هەر لە سەردەمی هۆز و هۆزە سەرەتاییەکانەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ، بۆ فەلسەفەی دەسەڵات بکات، ئینجا دێتە سەر شیکردنەوەی سیستەمی ئەو دەسەڵاتە سیاسییانەی، کە ئێستا لە رۆژهەڵاتدا بوونیان هەیە بەتایبەتی وڵاتە عەرەبییەکان. دوای ئەوەش لەگەڵ سیستەمی سیاسی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا ئەوانەی، کە دیموکراسییەت پیادە دەکەن بەراوردیان دەکات، لەهەمانکاتدا هەوڵیداوە تاکی عەرەبی و رۆشنبیرانی عەرەبی لەوە بە ئاگا بێنێتەوە، کە تاکە سەرچاوەی دابینکردنی مافەکانی تاکی مرۆڤ لە پیادەکردنی دیموکراسییەت دایە. ئێمەی گەلی کوردیش بەشێکین لەو سیستەمە سیاسییانەی، کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە و باوە لەوانەیە ئەو سیستەمە سیاسییەی، کە ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا هەیە لە زۆرێك لەو سیستەمە سیاسییانەی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بوونیان هەیە لە رووی پیادەکردنی دیموکراسییەتەوە باشتر بێ ، بەڵام هێشتا پێوستمان بە پیادەکردنی دیموکراسییەتی زیاترە، وەك (هیگڵ) دەڵێت: (باشترین چارەسەر بۆ هەڵەکانی دیموکراسییەت زیاترکردنی دیموکراسییەتە).

داوای لێبووردن لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم لە هەر کەموکوڕییێك کە لە وەرگێڕانەکەدا هەبێ، هیواداریشم خاڵێکم خستبێتە سەر پیتێك بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی.

**شەریف عوسمان**

**هەولێر٢٥/٩/٢٠١٠**

(ئەگەر تێکڕای مرۆڤەکان لەسەر بیرۆکەیێك هاوڕا بوون، تەنیا یەك کەس لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا نەبوو، نابیّ مرۆڤایەتی بیّدەنگکردنی ئەو کەسە، لە بیّدەنگکردنی تێکڕای مرۆڤایەتی بە گەورەتر بزانێت، با ئەو هێزەشی بۆ بڕەخسیّ، کە بتوانیّ کارێکی وا بکات ..!).

جۆن ستیوارت میل ( الحریە ) ﴾

## پێشەکی

ئەم کتێبە درێژەپێدەری کاروانێکی دوورودرێژی کتێبێکی هاوشێوەی خۆیەتی،کە پێش نۆ ساڵ برایێکی خۆی دەستی پێکردبوو مەبەستم لە کتێبی (الطاغية: دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي)[1]ە،کە وەك کولێنگێك بەکارمان هێنابوو، بۆ ئەوەی خێزانێکی کۆنەپەرست و نارەسەنی پێ هەڵتەکێنین، (کە ئەویش خێزانی ستەم و زۆرداریە). لەمەشدا لایەنە خراپەکانی ئەم کاروانە شەکەت و ماندووەی دەنواند، بەڵام ئەم کتێبەی، کە ئێستا لە بەردەستماندایە (ئەخلاق.. سیاسەت) توێژینەوەیەکە لەبارەی فەلسەفەی دەسەڵاتەوە، کە گوزارشت لە لایەنە چاکەکانی ئەو کاروانە دەکات. لێرەدا هەوڵی ئەوە دەدەین بنچینە باشەکانی بیناکردنی سیاسەت بخەینە روو ((بۆ ئەوەی کەسێکی مرۆڤ دۆستی بێ کەموکوڕی ـ بۆ هاوڵاتی عەرەبی وێنا بکەین)) کەسێکی خاوەن باوەڕ و سەر راست بێ، خاوەنی ئەخلاقێکی باش بێت، لە درۆ و دووزمانی بە دوور بێ، نەك یەکێکی هەلپەرست بێ، یان یەکێك بێ کەس لێی رازی نەبێ،[2] بەڵکو یەکێك بێ بتوانێ ماف و بەرژەوەندییەکانی

---

١- چاپی یەکەمی لە مارسی ١٩٦٤دا لە(سلسلة عالم المعرفة) ژمارە/١٨٣ و لەساڵی١٩٦٦دا لە چاپی دووەمی هەمان زنجیرەدا چاپکرایەوە و لە ساڵی١٩٦٧دا کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە چاپی سێیەمیشی بلأو کردەوە، (کۆمەڵەی لێکۆلینەوە ئیسلامییەکانی ئێرانیش) لە تاران، وەك لە وتارەکەی ئەو کۆمەڵەیەدا هاتووە، کە لە رۆژی ٢٨ /یۆلیۆی ١٩٩٤دا بلأوکراوەتەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی ـ واتە دوای بلأو بوونەوەی کتێبەکە بەچەند مانگێك!.

٢- ئەوەی جێگای سەرنج و داخە لە ولأتی ئێمەدا درۆ بۆتە دیاردەیێکی گشتی. کاتێك ئەو پیرێژنە ئینگلیزەی، کە ئێمە بەکرێ لە خانوەکەیدا بووین بە خێزانەکەمی گوت (ئێمە هیچ باوەڕمان بە عەرەب نییە) منیش ئەمەم زۆر پێناخۆش بوو، کە خێزانەکەم لێی پرسی (بۆچی)؟ پیرێژنەکە گوتی : (چونکە عەرەب بەردەوام درۆ دەکەن)، ئەمەش شتێکە کەس ناتوانێ رەتی بکاتەوە، چونکە ئەو بەردەوام درۆ لەگەڵ خۆی یان لەگەڵ خەڵکانی تردا دەکات. دیاردەی درۆ لە بەرزترین پلەو پاییەکانی دەولەتەوە تا دەگاتە خەڵکانی سەر شەقام: درۆ لە گەڵ خەڵکیدا دەکەن، بۆ ئەوەی کارگە و کۆمپانیا و پرۆژە سەقەتەکانی خۆیانی پێ سەربخەن و زەرەر نەکەن، بەڵکو تەنانەت دۆڕاندنە دزێوەکانی خۆشیانی پێ دەکەنە تەنها شکستێکی بچووك !. جارێکیان پرسیارم لەو دارتاشە کرد کە کەلوپەلی کتێبخانەکەی بۆ دروست دەکردم ـ کە چەندین جار لە بەڵێنەکانی

خەڵكانی تر بپارێزێ، نەك كەسێكی خۆپەرست بێو لە خۆی زیاتر لە خەمی كەسی تردا نەبێ لەوانەیە یەكەم هەنگاو، كە هەڵی بێنین ئەوەیە دەبێ زۆر بەجوانی لەوە تێبگەین، كە (سیستەمی دەسەڵات) مانای چییە، و چۆن بنیادێكی بەهێز و پتەوی دەبێ، كە نە گەردەلوولی شەڕوشۆڕ و نە رەشەبای كودەتا سەربازییەكان و نە شەپۆلەكانی رەگەزپەرستی بتوانێ جێگای پێ لەق بكات. لەو بینا سیاسییە پتەوەدا، كە گەل خۆی حوكمڕانی خۆی دەكات، وخۆی دەبێتە گەورە و خاوەنی خۆی واتە (خاوەنی دەسەڵات) و هیچ یاساییێكی بە سەردا ناسەپێندرێ و هەر پرۆژە یاساییێكیش، كە خۆی بەشداری تێدا نەكات سەر ناگرێ، بەڵكو خۆی یاساو رێنمایی و بنەما و ئەو پرۆژە یاسایانە دادەڕێژێ، كە خۆی دەچێتە بن باریانەوە و جێبەجێیان دەكات، بەمەش دەبێتە خاوەن سەربەستییێكی راستەقینە، چونكە سەربەستی راستەقینە مانای ئەوە نییە لە یاسا رابكەین، یان لە داب و نەریت و رێنماییەكان دەربچین، وەك ئەوەی ئاژاوەچییەكان بۆی دەچن، بەڵكو ئەوە دەگەیێنێ، كە دەبێ ملكەچی ئەو یاسایانە بین، كە خۆمان بۆ خۆمانیان دادەڕێژین، لێرەدا تەنها خزمەتی خۆمان و ویستە ئازادەكانی خۆمان دەكەین، وەك (كانت) دەڵێ: سەربەستی خودموختارییێكە (autonomy)ـ خۆم بە دەستی خۆم دەستنیشانی دەكەم، سەربەستی ئەوەیە، كە خۆت شتەكان دەسنیشان بكەیت (self-Determination) واتە خۆت حوكمڕانی خۆت بكەی.

هەنگاوی دووەم: دەبێ ئەوە بزانین، كە پاراستنی بەرژەوەندییەكانی خەڵكی یەكێكە لە ئامانجەكانی بینای سیاسی، بەو پێیەی، كە بارودۆخ و هێزو تواناكانیان رێیان پێدەدات بە شێوەییێكی سروشتی گەشە بە خۆیان و موڵك وماڵەكانیان بدەن. بە شێوەییێك، كە هیچ گوشار و ستەمێكی تێدا نەبێت، بەڵكو گفتوگۆ و یەكتر رازیكردن جێگای توندوتیژی بگرێتەوە، و سندووقەكانی دەنگدان جێگای بەكارهێنانی چەك بگرێتەوەو مافەكانی هەڵبژاردن جێگای كوتەك بگرێتەوە.

ئامانجی بینای سیاسی ئەوەیە، كە هەر تاكێكی ناو كۆمەڵ بتوانێ بە شێوەییێكی ئازاد بەدوای خۆشگوزەرانییەكانی خۆیدا بگەڕێ، ئەمەش جگە لە پیادەكردنی مافەكانی خۆی بۆ هەڵبژاردنی

---

خۆیدا دوا دەكەوت ـ (بۆ درۆم لەگەڵدا دەكەی) زۆر بەبێرێزی وەڵامی دامەوە وگوتی: ماشەئڵلا! وا ـ وەزیرەكان درۆ دەكەن، بۆ من لەوان بەدەربم ؟!! و زۆری تریش. لەكۆتاییدا ئەم دیاردە بێ ئەخلاقیەش، بۆ سیستەمە سیاسیەكە دەگەڕێتەوە، چونكە ئەخلاق ئەنجامێكە زادەی سیاسەتە، نەك بە پێچەوانەوە بێ.

ئەو ڕێگایەی، کە خۆی دەیەوێ لە ژیاندا بیگرێتەبەر شتێکی زیاتر ناگەیێنێت، دەبێ مرۆڤ سەربەست بێ لەوەی، کە چ کارێك بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ و بە کامەیان ڕازی دەبێت، کە بیکات و بەپێی بۆچوونەکانی خۆی بە ڕێدا بڕوات و نابێ هیچ کۆت و پێوەندێکی بۆ دابندرێ، یان ویست و ئارەزووەکانی خەڵکانی تری بەسەردا بسەپێندرێ و ئەو کەسانەی، کە دەست دەخەنە ناو ئەو هەل و دەرفەتانەی، کە بۆ خەڵکانی تر دەڕەخسێ تا کارێکی سوودبەخشی تێدا بکەن و ئەو خێرو خۆشیە بهێننەدی، کە لە ژیاندا خەویان پێوە دەبینی. بنیادی سیاسی کاری ئەوە نییە، کە هاوڵاتی و شاری (بێ خەوش) (فاضل) ئامادە بکات وەك ئەوەی (فارابی) خەوی پێیەوە دەبینی، کە ئەفلاتوونیش لە پێش ئەودا هەمان ئەو ئامانجەی هەبووە، هەروەها ئامادەکردنی خەڵکیش نییە بۆ ئەو دونیا.. یان ڕەوانەکردنیان بێ بۆ بەهەشت، یان بە زۆر خواپەرستیان پێ بکەن بۆ ئەوەی بچنە بەهەشت، کە ئەمە کارێك بوو لە کارەکانی پیاوانی ئاینی و هەندێك لە تاکەکانی ناو کۆمەل نەك هەموویان، چونکە هەر کەسەو لەخۆی بەرپرسە ((و هەر تاکێك ئالودەی دەسکەوتەکانی ژیانی خۆیەتی)). بینای سیاسی (دەوڵەتی) باش، خۆی لەخۆیدا پیادەکردنی ئەو مافە سروشتیانە دەستەبەر دەکات، کە خودا بە مرۆڤی بەخشیوە، وەك: مافی ژیان، ئازادی، موڵکداری، یەکسانی ، بیرکردنەوەی ئازاد و بێ بەربەست و دەربڕینی بیروبۆچوونەکانیان بەو ڕێگاچارانەی، کە هەیە، بە مەرجێك نابێ بە هیچ کلوجێك ڕای جیاواز قەدەغە بکرێت ئەگەرچی لەلای کەسانی دیکەش بە هەڵە دابندرێت. لێرەدا پرەنسیپە بنچینەییەکان ئەوانەن، کە (جۆن ستیورات) دەری بڕیوە و دەڵێ: ((ئەگەر تێکڕای مرۆڤەکان لەسەر بیرۆکەیێك هاوڕا بوون، تەنها یەك کەس لەگەڵ ئەو ڕایەدا نەبوو، نابێ مرۆڤایەتی بێدەنگکردنی ئەو کەسە، لە بێدەنگکردنی تێکڕای مرۆڤەکان بە گەورەتر بزانێ، با ئەو هێزەشی بۆ بڕەخسێ، کە بتوانێ شتێکی لەو بابەتە بکات..))[3]. بە ڕای ئێمە تاکە سیستەم، کە بتوانێ ئەم هەموو شتە دەستەبەر بکات سیستەمی دیموکراسی لیبڕالییە، لێرەدا زیادکردنی وشەی لیبڕالیمان زۆر بە گرنگ زانی، تا ئەو دزو پیاوخراپانەی بە وشە دزینەوە خەریکن نەتوانن دیموکراسیەت لە ناوەڕۆکەکەی خۆی بەتاڵ بکەنەوە.

هەنگاوی سێیەم: ئێمە دەبێ جیاوازی لەنێوان ئەخلاق وسیاسەتدا بکەین، چونکە هەریەکە و بوار و مانای تایبەت بەخۆی هەیە. بواری ئەخلاق هەڵسوکەوتی خودی تاك دیاری دەکات و

٣- جۆن ستیوارت میل (اسس الليبرالية السياسية) وەرگێڕانی ئیمام عەبدولفەتاح وهاوڕێکەی کتێبخانەی مەدبولی ١٩٩٦.

بواری سیاسەتیش هەڵسوکەوتی کۆمەڵ دیاری دەکات. زۆر گرنگە ئێمە بتوانین ئەو دوو بوارە تێکەڵ بە یەك نەکەین. ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە ئێمە لە گرنگییەکانیان کەم دەکەینەوە، یان بوونی هاوکاری و پێوەندییەکانی نێوانیان رەتبکەینەوە. بەڵکو دابەشکردنی کار و فەرمانەکان و رێکخستنەوەیانە و هەروەها دەسنیشانکردنی بوارەکانیانە و رێکخستنی ئەو رۆڵەیە، کە لە هەر بوارێکدا هەیانە...هتد، ئەمەش یەکێکە لە سونبولەکانی شارستانییەتی نوێ. لە کاتێکدا تێکەڵکردن و جیاوازی نەکردن لەنێوان شتە جۆربەجۆرەکاندا هیچ هەڵەیەك قبوڵ ناکات و نیشانەی دواکەوتنیشە. لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا جوتیار خۆی کەرەستەکانی جووتکردن و خانوی بۆ خۆی دروست دەکرد، دوای ئەوە ئاسنگەر و دارتاش و وەستای دیوار پەیدا بوون.. ئەمانە هەر یەکەو کاری تایبەتی خۆی هەبوو، لە شارستانییەتە کۆنەکاندا فەیلەسووف تەنها فەیلەسووف نەبوو، بەڵکو لەزۆر بواری تریشدا شارەزابوو، هەروەها پزیشك بوو لەهەمان کاتیشدا داوودەرمانیشی دروست دەکرد، لەوانەیە هونەرمەندیش بووبێت.. لەدوای ئەوکاتەوە لقەکانی زانستی مرۆڤایەتی، کە لەبارەی فەلسەفەن پەلوپۆیان هاوێشت و لەیەکتر جیابوونەوە و تایبەتمەندی خۆیان پەیدا کرد، بۆیە ئێستا لەم سەردەمەدا ئەوە نابیستین، کە زانایێك شارەزایی لە هەموو بوارەکانی زانستدا هەبێت و نە پزیشکێکیش لە هەموو لقەکانی پزیشکیدا پسپۆڕ بێت، نە هونەرمەندێکیش دەتوانێ لە هەموو بوارەکانی هونەردا شارەزا بێت.. بەڵکو ئێستا پسپۆڕی گەیشتۆتە دوورترین سنوری خۆی، وای لێ هاتووە، کە لێکۆڵەری دڵسۆز و باش شانازی بەوەوە بکات، کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی لە بوارێکدایە، کە ئەوەندەی سەرە دەرزییێك بچووکە.[٤] لێرەدا ئەم پەندە ئینگلیزیە خۆی دێنێتە ناوەوە، کە دەڵێ: ((جاك، هەموو شتێك دەزانێ و لە گەڵ ئەوەشدا هیچ شتیك نازانێ)). چونکە گەشەکردنی ئاستی کلتوری مرۆڤ لە تێکەڵ کردن وگونجاندنەوە بەرەو لێك جیابوونەوە و پسپۆری هەنگاو دەنێ، لەکاتی خۆیدا لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، ئەخلاق لەگەڵ ئاین و یاسادا لە یەك شتدا بەرجەستە و تێکەڵ بەیەك کرابوون و ناوی لێنرابوو داب و نەریت. لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا تاك مافێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵکو تاك لەناو تۆڕی داب و نەریتدا

---

٤- بۆ نموونە ئێمە زۆرجار باس لە (جیهانی رووەك) دەکەین، ئەمەش هەر بۆ ئاسان کردنە، چونکە لێکۆڵینەوە لە جیهانی ڕووەکدا وەك لقەکانی تری زانست وردەکاری ورد و پسپۆڕی زۆری تێدایە، چەندین نامەی دکتۆرا لەسەر پیاز وەرگیراوە، لێکۆڵینەوەی زۆر قووڵ لەسەر دەرە شامی کراوە، ئەندازەی بۆ ماوەییش هاتۆتە ناو ئەو مەیدانەوە، وبۆتە هۆی ئەنجام و گەشەکردنێکی ترسناك. کە ئەمەش باشترین ئاماژەیە بۆ ئەو جۆرە پسپۆڕیە.

دەجوولآیەوە، کە توندو تیژییێکی لە ڕاددەبەدەر لە وردەکارییەکانیدا هەبوو: هەزاران شتی حەرام هەڵسوکەوتەکانی ئەو تاکەیان دەسنیشان دەکرد و هەزاران ترس و تۆقاندنیش حەزو ئارەزوەکانی ئەو تاکەیان دەکوشت ((..داب ونەریت هەموو رەفتارەکانی ژیانی ئەو تاکەیان دیاری دەکرد.. وەك چۆنێتی هەڵسان، دانیشتن، راوەستان، خواردن وخواردنەوە و خەوتن. تا ئەو راددەیەی گومان لەوەدا هەبوو، کە مرۆڤ بوونەوەرێکی سەر بەخۆ بێت..))[5] لە دوای ئەوکاتەوە دەوڵەت هات و جێگای خێزان و بنەماڵە و هۆز و کۆمەڵگەی گوندانی گرتەوە و یاسا جێگای داب و نەریتی گرتەوە، کە هەر هەمووی رێنمایی بوو. کاتێك کە یاسا جێگای داب و نەریتی گرتەوە نووسینیش بە دەرکەوتبوو[6]. لێرەدا کۆمەڵگە، ئەو شێوازە سروشتیانەی هەڵدەبژارد وەك یاسایێك پیڕەوی دەکرد، کە بە ئەزموون سوودی لێیان بینیبوو.

لە ماوەی ئەو گەشەکردنە دوورودرێژەشدا، تێکەڵکردنی (ئەخلاق و سیاسەت) لەلای زۆر لە بیرمەندو سیاسەتمەدارەکان و لە سیستەمە سیاسییەکانی شارستانییەتە کۆنەکانی رۆژهەلآتی کۆن و یۆنان و موسڵمانەکان، بە درێژایی چاخی ناوەڕاست و ..هتد، هێشتا بوونی هەبوو. ئەو کاتە ئەو بیرو باوەڕە باو بوو، کە گوایە فەرمانڕەوا ــ کە سەرداری ولآتە ــ ئەو خۆی پێشەنگ و نموونەیە، ئەگەر خۆی کەسایەتییێکی (بێ خەوش) بێ، ئەوا دەتوانێ ((هاولآتیانی بێخەوش)) دروست بکات، کە لەویشەوە ((دەوڵەتی بێ خەوش)) دروست دەبێ، بۆیە لە هەموو فەلسەفە سیاسیە کۆنەکاندا گرنگی بە پەروەردەکردنی ((فەرمانڕەواییێکی چاك)) و خاوەن ئەخلاقی بەرز، کە بتوانێ داب و نەریت و ئەخلاقی باش لە ناخی خەڵکیدا بچێنێت دراوە. هەر چەندە ئەخلاق خۆی ئەنجامی شێوەی ئەو سیستەمەیە، کە هەیە، نەك بە پێچەوانەوە، چونکە ئەخلاقی بەرز تەنها لەو کەسانەدا بەدی دەکرێ، کە هەموو مافە سیاسییەکانی خۆیان بەدەست هێنابێ و توانیبێتیان بە شێوەیێکی سروشتی پیادەیان بکەن. بەڵام ئەو کەسانەی، کە ئەوەی ئەخلاق بێ نیانە و لە دۆڵ لێدان و زوڕنا کوتین و دروشمی بریقەداردا شارەزایی باشییان هەیە و ئاسمانت بۆ دەهەژێنن و (بە سەر و ماڵ) خۆیان بە قوربانی فەرمانڕەوا دەکەن، دواییش لە کاتە ناسك و پێویستەکاندا[7] وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن و تیێدەتەقێنن!.

---

٥- وۆل دیۆرانت(قصة الحضارة)بەرگی یەکەم، وەرگێڕانی زەکی نەجیب مەحموود لــ٥٤ــ.

٦- هەمان سەر چاوەی پێشوو لـ٤٨ـ و دوای ئەو.

٧- ئەمە لە رۆژانی کوشتنی سەرۆك سادات وکودەتاکەی دژ بە عەبدولکەریم قاسم روویاندا... هتد لەگەڵ دووفاقی جەماوەر، سەرەڕای دووفاقی تاکەکانی کتێبەکەی ئێمەدا (الطاغية: دراسة فلسفية لصور من

ئەم کتێبەمان دابەش کردۆتە سەر هەشت دەروازە، کە بە پێشەکی دەست پێدەکات و بە (دوا وتەش) کۆتایی پێدێ. دەروازەی یەکەممان بۆ (گفتوگۆ بەراییەکان) تەرخان کردووە، لە بەشی یەکەمدا (حەتمی بوونی سیستەمی دیموکراسی)مان خستۆتە روو، بەو پێیەی، کە لە هەموو سیستەمە سیاسییەکانی دیکە باشترە. بەشی دووەمیشی لەبارەی کۆمەڵێك بیروبۆچوونی سەرەتاییە لەبارەی (ئەخلاق.. و فەرمانڕەوا)، لە بەشی سێیەمیشدا وردەکارییەکانی هەر بوارێك لە بوارەکانی ((ئەخلاق.. وسیاسەت)مان خستۆتە روو. هەروەها لە دەروازەی دووەمیشدا باسی شێوەکانی گەشەکردنی کلتوریمان کردووە لە بەشی یەکەمیدا ئەوەمان خستۆتە روو، کە (هربەرت سبنسەر) (١٨٢٠-١٩٠٣)ی فەیلەسووفی ئینگلیزی ناوی ناوە یاسای گەشەکردن، کە لە گونجانەوە بەرەو لێك جیابوونەوە دەڕوات و لە هەندێك لە بەشەکانی تردا باس لە هەندێك نموونەی تێکەڵکردنی ئەخلاق و یاسا و(سیاسەت) ئاین دەکات لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، بەڵام دەروازەی سێیەمی کتێبەکە تایبەتە بە تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت لە شارستانییەتە کۆنەکانی رۆژهەڵاتدا، میسر و چینیشمان بە نموونەی ئەو شارستانییەتانە هێناوەتەوە. لە دەروازەی چوارەمدا تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەتمان خستۆتە روو لە بیری یۆنانیدا: وەك ئەرەستۆ، ئەفلاتون. لە دەروازەی پێنجەمیشدا هەڵوەستەیەکی دووردرێژمان لەسەر بیری سیاسی کردووە ((لەلای موسڵمانەکاندا))، ئەم بەشەیان لەلای ئێمە زۆر گرنگە، چونکە تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت لەلای موسڵمانەکاندا زۆر بە زەقی دیارە، تەنانەت تا ئێستاش دەنگ و سەدای ئەو تێکەڵکردنە لای نووسەرە نوێییەکانمان هەر ماوە: ئەو فەلسەفە سیاسییەی لای ئیبن ئەبی رەبیع و فارابی و شارە بێ خەوشەکەی (المدینة الفاضلة) و ماوەردی وحوکمە سوڵتانییەکانی (الاحکام السلطانیة) و هەروەها لەلای تەرتووشی، چرای پاشاکان (سراج الملوك)مان خستۆتە روو.. سەرەنجام گەیشتینە ئەو ئەنجامەی، کە بڵێین ئەمانە چەند بیرۆکەیێکی سەردەمی خۆیان بوونە نەك هی ئێستا، بەڵام هەرگیز بە کەڵکی ئەوە نایەن ئەو دەوڵەتە نوێیەی لەسەر بنیاد بنرێ، کە ئێمە مەبەستمانە و لە دەروازەی شەشەمیشدا لێك جیاکردنەوەی ئەخلاق و سیاسەتمان، لەلای (ماکیاڤللی) و (تۆماس هۆبز) و جۆن لۆك)ەوە خستۆتە روو. لە دەروازەی حەفتەمدا هەندێك نموونەی ئەو ئەزموونە سیاسیانەمان هێناوەتەوە، کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا پیادە کراوە، سەرەتا لە کۆنترین وڵاتی دیموکراسیەوە دەستمان پێکردووە: کە ئینگلتەرایە، ئینجا هاتوینەتە سەر وڵاتە یەکگرتووەکان و فەرەنسا و دواجاریش باسی

---

الاستبداد السياسي) ل١٦-١٧چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی١٩٩٧، وتارێکم لەبارەی (دووفاقی بە کۆمەڵ) نووسیوە بەراوردی بکە، کە لە ڕۆژنامەی ئەلقاهیرەدا بلاّومکردۆتەوە.

دیموكراسیەتمان لە ژاپۆندا كردووە. بۆ ئەوەی بیسەلمێنین، كە دیموكراسیەت سیستەمێك نییە، كە تەنها تایبەت بێ بە رۆژئاوا، بەڵكو ئەمە ئەزموونێكی خودی مرۆڤ خۆیەتی ئینجا لەهەر كوێیەكی دونیادا بێت. هەرچی دەروازەی هەشتەمیشە، كە دوا دەروازەیە گفتوگۆ كۆتاییەكانمان تیایدا خستۆتە روو، لەوێدا گفتوگۆمان لەسەر چەند بیرۆكەیێكی زۆر بەهێز ئەنجام داوە، كە دیموكراسی لیبرالی لە رەگوریشەوە هەڵدەتەكێنێ و ناوی لێدەنێ ((زۆرداری شارستانی)) (الاستبداد المتحضر) هەروەها چەند گفتوگۆیەكمان لەبارەی ئەخلاق و سیاسەت لە پێوەندیە نێودەوڵەتییەكاندا ئەنجامداوە.

ئێستاش لە كاروانێكی وا دووررودرێژ و پڕماندووبووندا و لە توێژینەوەی بابەتێكی قورس و پڕ لە گرێ وگاڵی وەك پێوەندیەكانی نێوان ئەخلاق و سیاسەت و دانانی لەنێو سیستەمێكی سیاسیدا، بێگومان دەكەوێتە هەڵەی زۆرەوە، كەسێكیش كار نەكا هەڵە ناكات. ئەوەی، كە هەڵەش ناكا تەنها خودایە. هەر وەكو زانایێكی چینی كۆن لەو بارەیەوە دەڵێ: ئەگەر بمەوێ كتێبەكەم هیچ هەڵەییێكی تێدا نەبێ، تا دونیا ماوە پێم تەواو ناكرێ. بێگومان من ئێستاش لەو باوەڕەدام، كە خراپی و دواكەوتوویی بارودۆخی عەرەب بە پلەی یەكەم بۆ رژێمە سیاسییەكان دەگەڕێتەوە، نەك بۆ ئەخلاق وەك هەندێك كەس بۆی دەچن، یان هەندێك كەسی دیكە وای بۆ دەچن، كە هۆكارەكەی بۆ ئاین دەگەڕێتەوە. ئەوەی راستی بێ ئەمە پێویستی بە هەوڵوكۆششی بیرمەند و رۆشنبیرەكانی عەرەب هەیە، كە توێژینەوەییێكی دڵسۆزانە و وردبینانە و بێ وچان لەسەر ئەم بابەتە گرنگە بكەن.. بە بۆ چوونی من ئەم نەتەوەیە تا لە رووی هۆشیاری سیاسیەوە پێ نەگات هەر گیز راناپەڕێت.

بۆیە لە خودای گەورە دەپاڕێمەوە، كە هەمووومان بەرێتە سەر رێی راست..

**ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام**

**قاهیرە/تەموزی ١٩٩٩**

# دەروازەی یەکەم

## ((چەند گفتوگۆییێکی ڕێخۆشکەر))

**( ئێمە گفتوگۆ لەسەر بابەتێکی وا ئاسان ناکەین، بەڵکو گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکەین، کە مرۆڤ دەبێ چۆن بژی).**

**کۆماری ئەفلاتون: (٣٥٣)**

## پێشەکی:

تۆماس جیفرسۆن (١٨٢٦-١٧٤٣) Tomas Jefferson یەکەم کەس بوو، کە توانی بنەماکانی دیموکراسی لە چەند رستەیەکدا دابرێژێ و هێماییێکی مرۆڤایەتی پێوە دیار بێ، گوتی: ((ئەمانە چەند راستییێکی زۆر روون و ئاشکران، کە پێویست بە هیچ بەڵگەیەك ناکەن: مرۆڤەکان هەر هەموویان وەك یەك لە دایکبوونە و خوداوەند چەند مافێکی شاراوەی پێبەخشیون، کە بەهیچ کلوجێك نابێ دەسبەرداری بن. ئەو مافانەش، ئەمانەن: مافی ژیان، و مافی ئازادی، و مافی گەڕان بەدوای خۆشگوزەرانییەکانی خۆیاندا))[٨].

ئەو لەو باوەڕەدایە، کە دەکرێ هەموو شتێك بگۆڕێ تەنها مافەکانی مرۆڤ نەبێ، کە نابێ دەستیان لێ بدرێ، چونکە ئەو مافانە پیرۆزن، و بەشێکن لەو گەوهەرەی، کە خوداوەند پێیانی بەخشیوە و کەس بۆی نییە لێیان بستێنێتەوە، چونکە ئەمە کارێکە دەبێتە هۆی رووخانی مرۆڤ و جوانترین کارەکانی خوداوەندی مەزن تێك دەشکێنێ. لەوانەیە لەسەرەتادا ئەو مافانە (چەند پرەنسیپێکی ئەخلاقیانە بووبن) بەڵام ناشکرێ هەر کەسەو بە ئارەزووی خۆی بەکاریان بێنێ، لەبەرئەوەی تەنها ئەمە بەس نییە، کە بڵێین (مرۆڤ ئازادە) کە چی دەکات با بیکات و ئیتر لەوێدا بوەستین، چونکە ئەمە خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی ئاژاوەگێڕی وکەس بەکەس نابێ. یان ئەوەتا بڵێین هەر چۆنی رێککەوت با مرۆڤ بژی... هتد، بەڵکو دەبێ ئەو مافانە بخرێنە چوارچێوەی چەند یاسایەکەوە، مەبەستم ئەوەیە لە چەند یاسایەکی دیاریکراودا جێگایان بکرێتەوە، ئازادی ئەوەیە، کە بە یاسا رێکبخرێ، رێك وەك ئەوەی مۆنتسکیۆ دەڵێ: (ئەو کاتەی مافەکان دەخرێنە ناو چوارچێوەی یاساوە دەبنە شتێکی (بابەتیانە)، بەم جۆرەش شێوە راستەقینەکەی خۆی وەردەگرێ، ئەو کاتە هەرکەسەو بەئارەزووی خۆی لێکی ناداتەوە). ئەمەش مانای ئەوەیە، کە مرۆڤ لە چنراوێکی کۆمەڵایەتی گشتیدا یەك بگرێتەوە و هەڵسوکەوتەکانی کۆمەڵ رێك بخرێن، ناو لەمەش دەنێین (سیستەمی سیاسی) لەبەرئەوەی سەرکردەکانی شۆڕشە

---

٨ - جۆن لۆك (الحریە الثقافیة) وەرگێرانی ئەمین موسا قەندیل، کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری لــ٢٢٧ــ وە دوای ئەو.

گەورەکەی فەرەنسا چەند چەمك و دروشمێکی ئەخلاقیانەیان بەرز کردبۆوە وەك: سەربەستی، یەکسانی، برایەتی... و هتد، بێ ئەوەی بیخەنە چوارچێوەی هیچ یاسایەکەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەو شۆڕشە بەرەو توندوتیژی و تۆقاندن هەڵبگەڕێتەوە و رێگا بە پەڕاندنی ملی خەڵکێکی زۆر بدات، وەك هیگڵ دەڵێ: یاساکانی گومان باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشابوو و ژوورەکانی لەسێدارەدان لەدژی ئەو کەسانەی، کە لەگەڵ لەسێدارەدان نەبوون دەستی بەکارکرد، دوای ئەوانیش کەوتە گیانی ئۆپۆزسیۆن ئینجا ئەو ئۆپۆزسیۆنە هەر کەسێك بوایە گرنگ نەبوو، لەدوای ئەوانیش ئەو کەسانەی گرتەوە، کە گومانیان لێدەکرا ئۆپۆزسیۆن بن، ئینجا ئەو کەسانەی، کە لەوانەیە ئۆپۆزسیۆن بووبن لە سێدارە دەدران.. فەرەنسا لەناو دەریاییێکی خوێندا نقوم ببوو..! هۆکارەکەشی تەنها بۆ بەکارهێنانی چەمکەکانی ئەخلاق لەبواری سیاسەتدا دەگەڕێتەوە ، کە پێویستی بەوە دەکرد یاساکان تێیدا بەرجەستە بکرابان .

ئەگەر ئەوەی (جیڤەرسۆن) دەیلێ راست بێ، کە پرەنسیپەکانی دیموکراسی چەند راستییێکی روون و ئاشکران، لەبەرئەوەی گرنگی بە مافە بنچینەییەکانی مرۆڤ دەدەن، ئەمەش ئەوە دەگەیێنی، کە دیموکراسیەت وەك سیستەمێکی سیاسی پێویستییێکە، کە خودو سروشتی مرۆڤ دەیهێنێتە دی. ئەگەرچی لەکاتی شۆڕشەکەی فەرەنسادا تێکەڵکردنی (ئەخلاق و سیاسەت)، شۆڕشەکەی بەرەو ئاقاری توندوتیژی هەڵگێڕایەوە. ئەمە وامان لێدەکات، کە شێلگیرانە بەدوای (فەلسەفەی دەسەڵاتدا) بگەڕێین، یەکەم شت: دەبێ ئەوە لێك بدەینەوە، کە بۆ دەبێ بەدیهاتنی دیموکراسی شتێکی حەتمی بێ؟ دووەم: هەوڵی ئەوە بدەین پێوەندییەکانی نێوان (حوکمڕان و ئەخلاق) دەسنیشان بکەین، سێیەم: دەبێ ئەخلاق و سیاسەت لەیەکتری جیابکەینەوە. ئەوەی لە دەروازەی یەکەمدا پێی هەڵدەستین (گفتوگۆییێکی رێخۆشکەرە) لە سێ بەشدا.

گەر خودای گەورە خەڵکی بە یەکسانی و ئازاد دروست کردبێ، ئەگەر ئازادی و یەکسانی دوو شادەماری دیموکراسی بن، ئەوا لە بەشی یەکەمدا سێ فەیلەسووفمان بە نموونە هێناوەتەوە، کە هەریەکەو لە گۆشەییێکەوە دەڕوانێتە دیموکراسی، بەلام هەرهەمووشی دێتەوە ناو یەك رووبار: ئەویش حەتمی بوونی ئەو سیستەمەیە، کە مافی

مرۆڤبون بۆ هەر مرۆڤێك دەستەبەر دەکات و ئەو مافە سروشتیانەی بۆ دابین دەکات، کە خود و کەسایەتی ئەوکەسە دروست دەکەن.

هەروەها لە بەشی دووەمدا چواردە بیرۆکەی پرەنسیپیانەمان لەبارەی (حوکمڕان و ئەخلاق) خستۆتەروو، هەوڵمانداوە سنووری تێکەڵکردنی نێوان (ئەخلاق و سیاسەت)، یان (بێخەوشی و یاسا) لەبیرۆکە سیاسییەکانماندا روون بکەینەوە، بێگومان ئەو تێکەڵکردنەش لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە بە میرات بۆمان ماوەتەوە، بۆیە زۆر بە گرنگی دەزانم چاوێکی پێدا بخشێنینەوە، بەڵکو بە تەواوەتی لێی رزگار دەبین.

لەبەشی سێیەمیشدا هەوڵمانداوە گرنگترین نیشانەکانی ئەو دوو بوارە (ئەخلاق و سیاسەت) دەسنیشان بکەین، کە ئەخلاق شتێکی رەها و نەگۆڕە و لەناخی مرۆڤەکاندایە... و هتد، بەڵام سیاسەت بە پێچەوانەی ئەخلاقەوەیە – شتێکی رێژەییە و دەگۆڕێ و هەروەها لە دەرەوەی ناخی مرۆڤەکاندایە.. هتد، سەرەڕای ئەمەش، بوونی پێوەندی و هاوکاری لەنێوان هەردووکیاندا رەت ناکاتەوە.

# بەشی یەکەم

## (لەبارەی حەتمیەتی دیموکراسییەوە)

**(سیستەمی دیموکراسی باشترین و نموونەییترین سیستەمە، بوار بۆ سروشتی مرۆڤ دەڕەخسێنێ، کە تێیدا گەشە بکات).**

**(جۆن دیـــوی)**

## یەکەم: دیموکراسی... وکۆتایی مێژوو:

لە ساڵی ١٩٨٩دا فۆکۆیاما[٩] وتارێکی لەیەکێك لە گۆڤارەکانی ئەمریکادا[١٠] بە ناونیشانی ((کۆتایی مێژوو-End History)) بلاو کردەوە . دوای ئەوە هەمان ئەو بیرۆکەیەی گەشەپێدا و لە کتێبێکی گەورەدا و بەهەمان ناونیشان لە ساڵی ١٩٩٣دا بلاوی کردەوە. لەو کتێبەدا وای بۆ دەچێ گوایە لەو چەند ساڵە کەمەی رابردوودا، دوای ئەوەی هەموو رکابەرەکانی خۆی شکست پێهێنا، کە دواییینیان شوعیەت بوو. هاودەنگییێکی تەواو لەسەرتاسەری جیهاندا بەدی دەکرێ، کە دیموکراسی لیبڕالی باشترین سیستەم بێ بۆ دەسەڵات،. هەروەها دەڵێ: ( ئەم دیموکراسیەتە ((دوا وێستگەی سیستەمە ئایدۆلۆژییەکانی مرۆڤ)) پێکدەهێنێ. دیموکراسی لیبڕالی دوایین سیستەمی دەسەڵاتی مرۆڤایەتی پێکدەهێنێ. لە کۆتاییشدا ئەمە دەبێتە ((کۆتایی مێژوو)). ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ئێمە ناتوانین ئەلتەرناتۆیڤێکی باشتر لە (دیموکراسی لیبڕالی) بدۆزینەوە، کە وەك نموونەیێکی بەرزی سیستەمی دەسەڵات کاری پێبکەین)[١١].

فۆکۆیاما وای بۆ دەچێ، کە لەکۆتایی سەدەی بیستەمدا رژێمە دیکتاتۆرییەکان لەناو دەچن و نامێنن.

أ- دیکتاتۆریەتی دەسەڵاتی سەربازی راستڕەو ئەمە لەلایەك.

---

٩ - فرانسیس فۆکۆیاما Francis Fukuyama بیرمەندێکی سیاسی بە ڕەچەڵەك ژاپۆنییە ڕەگەزنامەی ئەمەریکی هەیە زۆر پلەو پایەی بەرزی لە فەرمانگەکانی ئەمریکادا وەرگرتووە. وا پێدەچێ، کە دەیویست ببێتە (کیسنجەر)ێکی دیکەی ئەو ئیدارەیە.

١٠ - ئەمە گۆڤاری (ناشینالْ ئینتەریستە. National Interst).

١١ - ئەوەی ڕاستی بێ (نهاية التاريخ) بیرۆکەی فۆکۆیاما نییە، بەڵکو توێژینەوەو شیکردنەوەی فەیلەسووفی بە ڕەگەز فەرەنسی و بە ڕەچەڵەك ڕووسی (ئەلیکسەندەر کۆجیڤ١٩٦٨-١٩٠٢- A. Kojeve)ە ، کە بۆ فەلسەفەکەی هیگڵی کردبوو. کۆجیڤ لەدوای شۆڕشەکەی ڕوسیا هەڵات بۆ ئەڵمانیا و دوایی لە فەڕەنسا گیرسایەوە، لەساڵی ١٩٣٣ بە دواوە سیمینارەکانی خۆی دەوتەوە، کە لەسەر (ڕووکارەکانی دەرەوەی رۆح) ی هیگڵ بوو. لەدوای شەڕی جیهانی دووەمیشەوە زیاتر سیمینارەکانی خۆی لەبارەی بیرۆکەی (کۆتایی مێژوو) و شیکردنەوەی کێشەکانی کۆیلەو خاوەن کۆیلەکاندا چڕ کردبووەوە. ئەم سیمینارانە لە ساڵی ١٩٤٧دا بە ناونیشانی دەروازەیێك بۆ هیگڵ خوێندنەوە لە پاریس دەرکەوت، لە ساڵی ١٩٦٩دا وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی.

ب- دیکتاتۆریەتە گشتگیریەکەی شوعیە چەپڕەوەکان لەلایەکیترەوە.

سەرجەم ئەمانە و لەهەرهەموو حاڵەتەکانیشدا دەبنە ڕێخۆشکەر لەبەردەم دیموکراسی لیبڕالی هاوسەنگدا. کە ئەمڕۆ بۆتە تاکە هیوای سەرجەم ناوچە فەرهەنگییەکانی سەر ئەم هەسارەیە.

ئەو پێشەکیانەی، کە (فۆکۆیاما) کردوویەتیە پێگەی کارەکانی خۆی بۆ ئەوەی بگاتە ئەو دەرئەنجامە گرنگە، چەند پێشەکییێکی زۆر گرنگن، هەروەها ئەو ئەنجامەی، کە پییێگەیشتووە بیرۆکەییێکی گرنگمان پێشکەش دەکات. باشە دەبێ ئەم پێشەکیانە چی بن و ئەو ئەنجامانەش چی بن، کە ئێمە دەمانەوێ شتێکیان لێی هەڵبهێنجین....؟

**یەکەم:** ئەو پێشەکییانەی، کە(فۆکۆیاما)پشتی پێ بەستبوون لەیەکێك لەبیرۆکە بنچینەییەکانی فەلسەفەکەی فەیلەسووفی مەزنی ئەڵمانی(هیگڵ- ١٧٧٠-١٨٣١) وەرگیرابوون تیایدا دەڵێ:(مرۆڤ لە چەندین پێداویستی بنچینەیی سروشتی لەگەڵ ئاژەڵدا هاوبەشە وەك: پێداویستییەکانی خۆراك، خەوتن، جێگای حەوانەوە، سێکس، لەپێش هەموو ئەمانەش پارێزگاریکردن لە ژیان و مانەوەی خودی خۆیدا...هتد). تا ئەو رادەیە مرۆڤ بەشێکە لە سروشت، بەڵام لەلای (هیگڵ)دا مرۆڤ چەند جیاوازییێکی جەوهەری لەگەڵ ئاژەڵدا هەیە، ئەو نەك هەر تەنها ئارەزووی شتە هەست پێکراوەکان دەکات وەك پارچە گۆشتێك، یان پارچە نانێك، یان پارچە جلێك، کە لەسەرما بیپارێزێ، یان جێگاییێك تییێدا بحەوێتەوە، بەڵکو مرۆڤ جگە لەشتە مادییەکان ئارەزووی هەندێك شتی مەعنەویش دەکات. یەکەم ئارەزووی بنچینەیی مەعنەوی ئەو ئەوەیە، کە بەرامبەرەکەی دان بە مرۆڤبوونی ئەودا بنێ، دەیەوێ ئەوانی تر، وەك بوونەوەرێکی ئادەمی دانی پێدا بنێن، کە بوون و سەنگ و بەهاو ئابڕوومەندی خۆی هەیە. بگرە زۆر جاری وا هەیە لەپێناو پاراستنی ئەو سەنگ و بەهاو ئابڕوەدا قوربانی بە گیانی خۆی دەدات. ئامادەیە لەپێناو ((پلەو پایە کۆمەڵایەتیەکەی خۆیدا)) ژیانی خۆی بخاتە مەترسیەوە، هەر مرۆڤە، کە دەتوانێ بەسەر زۆر لە غەریزە بنچینەییە ئاژەڵییەکانی خۆیدا زاڵبێت لەهەمووشیان گرنگتر غەریزەی مانەوەیە لەپێناوی پرەنسیپ و ئامانجە بالاکانی خۆیدا. هیگڵ زیاتر روونی دەکاتەوە و دەڵێ: ئارەزووکردنی بە دەستهێنانی دانپێدانان و رێزی ئەوانی تر خۆی لەخۆیدا بزوێنەری مێژووە، هەر ئەمەشە وا لە مرۆڤ دەکات تا رادەی مردن شەڕ لە پێناویدا بکات. هەر

کەسێك لەئاستی خۆیەوە هەوڵدەدا دان پێدانانی ئەوی تر بۆ خۆی مسۆگەر بکات، تا هەست بە بەهاو تواناکانی خۆی بکات [١٢]. ئەوکاتەی ترسان لە مردن وای لە زۆرانبازەکان کرد، کە یەکێکیان مل بۆ ئەویتریان کەچ بکات، لێرەدا و هەر لەو سۆنگەیەوە پێوەندییەکانی نێوان (کۆیلەو خاوەن کۆیلە) پەیدا بوو.[١٣] خۆ خستنە مەترسیەوە لەم شەڕە خوێناویانەدا و لەبەرەبەیانی مێژووەوە لەپێناو ((مەترسی خۆراك، جێگا، هەست بە ئارامی کردن نەبووە))، بەڵکو خۆخستنە مەترسییەکان لەپێناو پلە و پایەدا بووە، یان تەنیا بۆ ئەوە بووە، کە ڕێزی لێ بگرن، ئامانجەکانی شەڕیش ئیعتیبارە بایۆلۆجییەکان دەسنیشانی ناکات، بەڵکو دەرکەوتنی یەکەم دیاردەی ئازادیە مرۆڤایەتییەکان لەخۆی دەگرێ.

هەرچی پێوەندییەکانی نێوان (کۆیلە وخاوەن کۆیلەشە)، کە لەهەر کۆمەڵگایێکدا شێوەییێکی جیاوازی وەرگرتبوو، نەیتوانی ئارەزوەکانی دانپێدانان و ڕێزگرتنی نێوان کۆیلەو خاوەن کۆیلەکان هەر یەك بەجیا تێر بکات: لێرەدا کۆیلە بە هیچ کلووجێك دانی پێدا نەدەنرا، هەروەها دانان بە خاوەن کۆیلەکانیشدا ناتەواو بوو[١٤]. ئەم هەستەش وای کردبوو، کە

---

١٢ - ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە بە پێی توانا — هەوڵ دەدەین خۆمان ئەو زاراوە هیگڵیانە لابدەین، کە لەلای ئەو کەسانەی کە لەگەڵ فەلسەفەکەی هیگڵدا را نەهاتوون زۆر قورس و ئاڵۆزن. بە شێوەییێکی وردتر بڵێین، مرۆڤ بەو شتەی، کە هیگڵ ناوی ناوە (هۆشیاری خود) واتە ئەو هۆشیاریەی، کە ڕەنگدانەوەی لەسەر خودی تاك هەیە و وای لێدەکات بڵێ (من) جیاوازیم لەگەڵ بوونەوەرەکانی سروشتدا هەیە بە ئاژەڵیشەوە. (ئەوەش ئەو شتەیە، کە ئاژەڵ ناتوانێ بیکات) ـ ئەو، واتە مرۆڤ چاوی لەوەیە، کە بەرامبەرەکەی دان بەو (من)ەی ئەودا بنێ. بەڵام بەرامبەرەکەشی لەبەر ئەوەی ئەویش (هۆشیاری خودە) بۆیە هەمان ئارەزووی هەیە. بەم شێوەیە دەبینین (هەر تاکێك حەزی دەچێتە ئارەزووەکانی تاکی بەرامبەر).

١٣- وا باشترە بلیێن (جەدەلی نێوان کۆیلە و خاوەن کۆیلە) چونکە پێوەندییەکانی نێوانیان جەدەلیە وەك لەم پەراوێزەی خوارەوەدا دەردەکەوێ.

١٤ - ئەو دانپێدانانەی نێوان کۆیلە و خاوەن کۆیلە ناتەواوە لەبەرئەوەی خاوەن کۆیلەکە خودی خۆی لەگەڵ ڕاڕەوی جەدەلەکەدا- دەبێتەوە بە (کۆیلە)، لەکاتێکدا (کۆیلەکەش) هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە خاوەن کۆیلە. چونکە خاوەن کۆیلە لە تەواوی کارەکانی وەك چاندن و دروێنەی دەغڵودانەکانی.. وهتد پشت بە کۆیلەکە دەبەستێ، ئەو پێداویستیانەی، کە بۆ ژیانی ئەو خاوەن کۆیلەیە پێویستن کۆیان دەکاتەوە، تا وای لێ دێ ئیتر

هەردوولا لەیەکتر ناڕازی بن، ئەمەش ئاماژەییێکە بۆ ئەو دوو شتە دژ بە یەکەی کە قۆناغە تازەکانی مێژووی لێ لە دایك بوو. هیگلێ دەڵێ: (لە کۆتاییشدا و لە ئەنجامی بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسادا تواندرا بەسەر ئەو (دوو دژ بە یەکە)ی، کە لە پێوەندییەکانی نێوان کۆیلە و خاوەن کۆیلەدا هەیە زاڵ بن، کە کۆیلەکانی دوێنێ بوونە خاوەنی خۆیان، و پرەنسیپەکانی دەسەڵاتی گەل و سەروەری یاسایان[15] سەپاند، دانپێدانانێکی گشتگیرو هاوسەنگ، جێگای ئەو دانپێدانانە نابەرامبەرەی، کە لە پەیوەنییەکانی نێوان کۆیلە وخاوەن کۆیلەدا هەبوو گرتەوە تا وای لێهات هەر هاوڵاتییێك ئامادەیی ئەوەی تێدا بێت دان بە کەرامەت و مرۆڤبوونی ئەویتردا بنێ). دەوڵەتیش لەلای خۆیەوە لە جارنامەییێکدا دانی بەو کەرامەتەدا نا. لێرەدا هیگلێ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە بەو دان پێدانانەی، کە تێکرای خەڵکی رازی دەکات و ئەمەش دان پێدانانێکە بە مرۆڤبوون، هەروەها بەها و ڕێز و کەرامەت و پلەو پایەی یەکتردا.. و هتد، دەگەینە کۆتایی مێژوو.. مرۆڤ هەر بە زگماکی بەهاو رێز وکەسایەتی خۆی هەیە، هەر ئەو شێوە بیرکردنەوەیەشە، کە پاڵیان پێوە دەنێ داوای حکومەتێکی دیموکراسی بکەن، بۆ ئەوەی وەك کەسێکی گەورە و پێگەیشتوو مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، نەك وەکو منداڵێك، یان پێنەگەیشتوێك، بەڵکو وەك تاکێکی سەربەست و ئازاد دان بە سەربەخۆییاندا بندرێ، لەو سەردەمەی ئێمەدا دیموکراسی لیبڕالی بەسەر شوعیەتدا سەرکەوت، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە لەمەی دواییاندا خەڵکی هەرچەندە دەوڵەمەند بێ ناتوانی خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات[16].

---

خاوەن کۆیلەکە ناتوانێ دەسبەرداری کارگوزارییەکانی کۆیلەکەی خۆی بێ. بەمشێوەیە خاوەن کۆیلەکە دەبێتە کۆیلە، کۆیلەکەش دەبێتە خاوەن کۆیلە. بۆیە ئەو پلەو پایەیەی خاوەن کۆیلەکە بەدەستی هێناوە ناتەواوە. بۆیە ئەو مشتومڕەی(جدل) نێوان (کۆیلەو خاوەن کۆیلە) تەنها بەو دانپێدانانە نەبێ، کە لە شۆڕشەکەی فەڕەنسا هاتە کایەوە کۆتایی نایێ، کە بریتین لە پرەنسیپەکانی دادپەروەری، برایەتی، یەکسانی، ئازادی بۆ هەموو تاکێك. ئەمەش ئەو بنچینەیەیە، کە لەمەودوا دیموکراسیەت پشتی پێدەبەستێ.

١٥ - لەوانەیە ئەمە مانایێکی روونی هەبێ، وەك لە ماددەی هەژدەمی دەستووری شۆڕشەکەی ساڵی ١٧٩٣ دا هاتووە، کە ((نابێ مرۆڤایەتی مرۆڤ لەکەدار بکرێ، یاسا هەرگیز دان بەوەدا نانێ، کە یەکێك ببێتە خزمەتکاری یەکێکی تر)).

١٦- بۆ ئەمانە هەمووی بە کتێبەکەی ف. فۆکۆیامادا بچۆوە.

**دووەم:** ئەو ئەنجامەی، کە دەمانەوی لەو هەموو پێشەکیەدا دەستمان بکەوێ، ئەوەیە، کە دیموکراسی ئەزموونێکی مرۆڤایەتیە، لەدوای ململانێ و کۆششێکی زۆری مرۆڤەوە هاتۆتە کایەوە بۆئەوەی بتوانێ بەهاو کەرامەت ومرۆڤبوونی خۆی بسەلمێنێ. بۆیە لێرەدا عەقڵی مرۆڤ ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێ، هەروەها ئەخلاقیش زۆرمان بۆ دێنێ، کە مرۆڤایەتی و سەربەستییەکانی مرۆڤ بپارێزین[١٧]. ئەمەش نە رۆژئاواییە و نە رۆژهەڵاتییە، بەڵکو ئەزموونێکی خودی مرۆڤ خۆیەتی وەك مرۆڤێك. چونکە مرۆڤ هەمیشە بۆ ئەوەی بگاتە سیستەمێکی نموونەیی دەسەڵات لەهەموو شوێنێکدا تێکۆشاوە و خەباتی کردووە. سیستەمی دیموکراسی لەدوا قۆناغەکانیدا توانی هێزو تواناو توندوتۆڵی و کارامەیی خۆی بسەپێنێ، تا ئەو رادەیەی، کە دەتوانین بڵێین، بە راستی (کۆتایی مێژووە) بە شێوەیێکی گشتی مەبەستم لە کۆتایی ململانێ ئایدیۆلۆجی و سیاسییەکانە. وای لێهاتووە، کە هەموو وڵاتانی جیهان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا دان بە گرنگی دیموکراسیدا بنێن، تەنانەت ئەگەر ئەو دانپێدانانەش لە ناوەڕۆکدا ناڕوونی پێوە دیار بێت. لێرەدا تۆ تاکە فەرمانڕەوایێکیش نادۆزیتەوە دان بەوەدا بنێ، کە بە شێوەیێکی دیکتاتۆریانە دەسەڵات بەڕێوەدەبات. ئەگەرچی بە کردەوەش دیکتاتۆر بێت. ئەمەش ئەوەت پێ دەڵێ، کە ئەم دان پێدانانە لەو رژێمانەشدا بە دی دەکەی، کە لە ستەم و زۆرداریدا دەستێکی باڵایان هەیە، بەڵام بەناوی دیموکراسیەت و ئەنجومەنە نوێنەرایەتییەکانی دیموکراسیەوە خۆیان پەردەپۆش دەکەن، بەو جۆرەی، کە لە رژێمە سەرتاسەرییەکانی پێشووی وەك یەکێتی سۆڤیەتدا دەماندیت، کە بە خۆی دەوت دیموکراسی گەلی، بەو پێیەی، کە وشەی دیمۆس(Demos) لە بنەچەدا یۆنانییە مانای (گەل) یان تیکڕای خەڵکی دەگەیێنێ — هەر لەبەر ئەمەش بوو ئەفلاتون دژی دیموکراسی بوو - بەڵام شوعییەکان، وایان لێکدایەوە، کە مەبەست لە وشەی (هەمووخەڵکی) پرۆلیتاریایە (Proletariat) واتە چینی کرێکاران، یان زەحمەتکێشان، لێرەدا ئەگەر هات و ئەو چینە

---

Francis fuku Yama: The End of History and The Last Man "The Free Press 1993.

هەروەها تەماشای وەرگێڕانە عەرەبیەکەی بکە بەناونیشانی (نهاية التاريخ، وخاتم البشر) وەرگێڕانی حوسێن ئەحمەد ئەمین سەنتەری ئەل ئەهرام ساڵی ١٩٩٣.

١٧- د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (مسيرة الديموقراطية : رؤية فلسفية) دارل زویل بۆبڵاوکردنەوە لەقاهیرە ساڵی ١٩٩٩ ل ــــ٥ــــ.

دەسەڵاتی گرتەدەست و هاتنە سەر دەسەڵات، واتە ئەو کاتە ئێمە دیموکراسیمان بە مانا ورد و پڕ بە پێستەکەی خۆی بە دیهێناوە! بەم پێوەرەش دەسەڵاتی گشگیری کەسایەتی تاکی هاڕیبوو و ئازادییەکانیشی قۆرخ کردبوو، دەیانویست دەسەڵاتی پرۆلیتاریا ببێتە رژێمێکی دیموکراسی ناوازە، ناویان نابوو (دیموکراسی گەلی)، کە لە دوای شەڕی جیهانی دووەمدا حیزبە شوعیەکان لە وڵاتانی وەك پۆلۆنیا و یۆگسلاڤیا و ئەلبانیا و رۆمانیا و مەجەر و ئەڵمانیای [18] دیموکراسیدا سەپاندبوویان.

با نموونەیێکی تر وەر بگرین، ئەو رژێمە نامۆیەی، کە ئەحمەد سۆکارنۆ (١٩٠١-١٩٧٠) سەرۆکی بزووتنەوە رزگاریخوازییەکەی ئەندەنوسیا بوو لە دژی ئیستیعماری هۆڵەندیدا، لە ساڵی (١٩٤٥-١٩٦٧)دا بووە یەکەم سەرۆککۆماری ئەندەنووسیا و (٢٢) بیست و دوو ساڵ بە سەرۆککۆماری مایەوە تا ئەو کاتەی لە ساڵی (١٩٦٦) دا (سۆهارتۆ) توانی بە کودەتاییێك بیڕووخێنێ و ئەو ماوەیەی ژیانی، کە مابوو لە زینداندا بە سەری برد، (سۆهارتۆ)ش نزیکەی (٣٢) سی و دوو ساڵ لەسەر کورسی دەسەڵات مایەوە، تا ئەو کاتەی (بزووتنەوەی گەلی) سەرتاسەری وڵاتی گرتەوەو سۆهارتۆی لەسەر دەسەڵات هێنایە خوارەوە. ئەمانە هەمووی لە ئەنجامی ئەو سیستەمە زۆرداریە بوو، کە(ئەحمەد سۆکارنۆ) بەڕێوەی دەبرد و ناوی لێنابوو (دیموکراسی ئاڕاستە کراو) (سۆکارنۆ) وای بۆ دەچوو، کە پیادەکردنی (دیموکراسی رۆژئاوا) لەگەڵ گەلانی وڵاتانی سێیەمدا ناگونجێ، بۆیە دەبێ سەرکردەکانی بزووتنەوە نیشتمانییە پێشکەوتووخوازەکان پرەنسیپەکانی یەکگرتن پەیڕە و بکەن، لەپرۆسە سیاسییە جەماوەرییەکاندا سنوورێك بۆ کارە بێسەرو بەرەکان دابندرێن. ئەمەش دەقاو دەق دانانی

---

١٨- بەڵکو حیزبە شوعییەکان خۆیان، ئەوەی پێی دەڵێن: (مەرکەزیەتی دیموکراسی)یان بەسەر خەڵکیدا سەپاند، کە ئەمە چەمکێکی سۆشیالیستیە و ڕیزەکانی ناوەوەی ڕێکخستن پتەو دەکات، مانای ئەوەیە لەلایەك سەرکردەکان کۆنترۆڵی کاروبارەکان بکەن و لەلایەکی تریشەوە ئەندامەکان، مافی ئەوەیان هەبێ گفتوگۆ لەسەر بڕیارەکانی سیاسەتی حیزب بکەن، لەگەڵ (الموسوعة ألسياسية)دا بەرگی شەشەم بە چاودێری ئەلکەیالی بەراوردی بکە، دەزگای عەرەبی بۆ لێکۆلینەوەو بلاوکردنەوە بەیروت لـــ١٦١ـــ هەروەها،
Wiliam Ash :Moraisand politcs :The Ethich of Revolution Routledge&Kegan paul,1997,P.117 .
ویلیەم ئاش وای دەبینێ، کە ئەم سیستەمە دیموکراسیە نموونەییە لەدژی دوژمنەکانی چینی کرێکاران ئاراستە کراوە، کە دەیانەوێ بۆرجوازیەت لە هزر و هەستی خەڵکیدا زیندوو بکەنەوە لـــ١١٧ـــ.

کۆت و بەند بوو بۆ ئازادی و سیستەمی فرەحیزبی و دەرکردنی رۆژنامەی ئازاد و ڕەهاکردنی دەسەڵاتەکانی سەرۆکایەتی کۆمیتەی ناوەندی دەوڵەتە بەسەر ژیانی سیاسی هاوڵاتیان و ئەنجومەنە نوێنەرایەتییەکان و دەزگاکانی راگەیاندندا.

ئەوەی جێگای داخە ئەو سیستەمە (داهێنراوەی) سۆکارنۆ، لەلایەن زۆربەی رژێمەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم پەیڕەو دەکرێت، لەلای ئێمە لە میسر — و لە سەردەمی جەمال عەبدولناسردا هەندێك نووسەر هەبوون لەبارەی شتێك دەدوان، کە پێیان دەگوت (دیموکراسی هەست پێکراو) ـ ئەمەش مانای ئەوە بوو، کە پێشەوا خۆی هەست بە داخوازییەکانی جەماوەر دەکات بێ ئەوەی ئەوان داوای بکەن[19]. و خۆی بڕیار لە جێبەجێکردنی دەدات، هەروەك عەبدولناسر لە خۆماڵیکردنی نۆکەندی سوێس، و دروستکردنی بەنداوی عالیدا کردی، و هەروەها چەندین بڕیاری چارەنووسسازی تریشی دەرکرد!

ئێمە نامانەوێ گفتوگۆ لەسەر ئەو جۆرە سیستەمە نامۆیانەدا بکەین، ئامانجی ئێمەش ئەوە نییە، و ئەو جۆرە گفتوگۆیانەش لێرە جێیان نابێتەوە[20]. بەڵکو ئێمە دەمانەوێ سەرنجتان بۆ ئەوە رابکێشین، کە ئەو رژێمانە هەر هەموویان دروشمی (دیموکراسییان) هەڵواسیوە. ئەمەش دان پێدانانێکی تەواوە بە بەهاو گرنگی و چالاکییەکانی ئەم سیستەمە، دان پێدانانێکە ئەوە دەگەیێنێ، کە (سیستەمی دیموکراسی) نموونەی راستەقینەی کۆتایی مێژووی رژێمە سیاسییەکانە، چونکە باشترین سیستەمە بۆ دەسەڵات. (دیموکراسیەت) دوا ئەنجامی ئەو ململانێیە دوورودرێژە خوێناویەیە، کە مرۆڤ لەپێناو بەدەسهێنانی دانپێدانانی بەرامبەرەکەی بە کەرامەت و ئازادی و مرۆڤ بوونی خۆیدا خەباتی کردووە.

لێرەدا ئێمە حەز دەکەین ئەوە رەتکەینەوە، کە ناوی لێ بنێین (دیموکراسی رۆژئاوا)، هەر چەندە وشەی دیموکراسی لە بنچینەدا یۆنانییە و بە شێوەیێکی تایبەت لە هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمدا تا راددەیێك لە ئەسینا پیادە کراوە. ئەوەتا ئێستا دەبینین دیموکراسیەت ماوەیێکی

---

١٩- سەیرکە ئەمە رێك ئەوە دەگێێنێ کە ئەو سەرکردەیە (نا بینایە) بۆیە گیروگرفتەکانی ناو کۆمەڵگە لە رێگەی کەناڵە دیموکراسیە ناسراوەکانەوە نابینێ و پەنا دەباتە بەر (هەست کردن) !.

٢٠- لە کۆتایی لێکۆلینەوەکەدا دەگەڕێینەوە سەر گفتوگۆکردنی بیرۆکەیێکی گشتی تر، کە ئەم هەموو سیستەمانە لەخۆ بگرێ — ئەو سیستەمانەی د.عیسمەت سەیفولدەولە لە کتێبی (الاستبداد الديمقراطي)دا ئاماژەی پێکردوە، دارل موستەقبەل لە قاهیرە.

دوورودرێژی لە ئینگلتەرا بڕیوە. هەروەها ئێمە ئەوە ڕەتدەکەینەوە، کە دەڵێن دیموکراسی سیستەمێکە تایبەتە بە هەندێك وڵاتەوە، یان ئەزموونی چەند کۆمەڵگەیێکی تایبەتە، بۆیە لەگەڵ وڵاتانی جیهانی سێیەمدا ناگونجێ، هەر وەك چۆن ئەحمەد سۆکارنۆ لەکاتی خۆیدا وای دەگوت.

ئەگەر ئێمە باسی دیموکراسیمان کرد لە ئینگلتەرا، یان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یان لە فەڕەنسا، یان لە وڵاتانی تری پێشکەوتوو، لەبەر هیچ شتێك نییە، بەڵکو تەنها بۆ ئەوەیە، کە ئێمە دەمانەوێ سوودێك لەو پرەنسیپ و بنچینە و بیرۆکە پیادەکراوانە وەربگرین، کە بە کەڵکی ئێمە بێن...ئەوەی، کە لەلای من سەیرە ئەوەیە، ئێمە نزیکەی هەموو شتەکان لە ڕۆژئاوا وەردەگرین، تەنانەت هەندێکجار زبڵ و خاشاکەکەشیان لێ وەردەگرین، بەڵام، کە باس دێتە سەر دیموکراسی، لێرەدا یەکسەر دەنگەکان بەرز دەبنەوە و دەڵێن ئەمە ئەزموونێکی ڕۆژئاواییە، و ناکرێ ئێمەی ڕۆژهەڵاتی ئەزموونەکانی ڕۆژئاوا بۆ ئێرە بگوازینەوە!.

جارێکی تریش دەیڵێینەوە: کە دیموکراسی ئەزموونی مرۆڤەکانە وەك مرۆڤ، بە چاوپۆشی لە ڕەگەز و ئاین و دابونەریتەکانییان. لێرەدا نموونەیێکی بەرچاومان لە بەردەستدایە، کە ئەویش (ژاپۆن)ە، ئەو وڵاتەی کە سیستەمی دیموکراسی پیادە دەکات و بە خێراییێکی زۆرەوە ڕێگاکانی خۆی بڕیوە و ئێستا لە چەندین بواردا پێشبڕکێ لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکات — لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتێکی ڕۆژئاوایی نییە، ئێستاش هیندو ئەندەنووسیا وا بەرەو ئەو دیموکراسیەی، کە ڕژێمەکانیان بە سەقامگیری دەهێڵێتەوە هەنگاو دەنێن... لەکۆتاییدا سیستەمێکی دەسەڵاتی دیکەشمان هەیە، کە ئەویش (ئیسرائیلە)، من لەو باوەڕەدام، کە ئەو سیستەمە دیموکراسیەی ئیسرائیل بوو عەرەبی تێکشکاند. یان بڵێین ڕژێمە عەرەبییەکانی ڕاونا، چونکە ئەمڕۆ شێوەی سیستەم شەڕ دەکات نەك سوپا.

## دووەم: دی تۆکڤیڵ.. و حەتمیەتی دیموکراسی

لێرەدا کورتەیێکی خێرا لەبارەی بیرمەندێکی تر، کە هەمان ڕێبازی هەیە دەخەینە ڕوو و باوەڕیشی بە (حەتمیەتی دیموکراسی) هەیە، بەمەش مەبەستمان لە ((ئەلیکسیس دی تۆکڤیڵ) (١٨٠٥-١٨٩٥))ی بیرمەندی فەرەنسیە، کە لەساڵی ١٨٢٧دا لە دادگای فەرسای دادوەر بوو، لە ساڵانی ١٨٣٩-١٨٤٨دا لە دووخولی پەرلەمانی فەرەنسادا ئەندام پەرلەمان بووە، هەروەها لە ساڵی١٨٤٩دا وەزیری دەرەوەی فەرەنسا بوو.

تۆکڤیلْ زۆر بە پەرۆشی ئەوەوە بوو، سیستەمێکی سیاسی باش، کە لە سیستەمەکانی تر باشتر بێ بۆ دەسەڵاتی فەرەنسا هەڵبژێرێ، دەستی بە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی سیستەمە جۆربەجۆرەکانی دەسەڵاتی سیاسی کرد، و هەڵوەستەییێکی دوورودرێژی لەسەر سیستەمی دیموکراسی کرد، و سەرنجی دایە ناوەڕۆك وگەشەکردنەکانی ئەو سیستەمە لە ئەوروپا و دەرەوەی ئەوروپادا و لێکۆڵینەوەی وردی لەسەریان کرد. ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەو وڵاتە تازەپێ گەیشتووەی، کە ماوەییێکی کەمە دروست بووە، توانیویێتی زۆر بە ڕێکوپێکی سیستەمی دیموکراسی پیادە بکات. ئەمەش سەرنجی تۆکڤیلْی بەلای خۆیدا راکێشا و لە ساڵی ١٨٣١دا سەردانێکی ئەو وڵاتەی کرد، تا لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بۆ سیستەمەکە بکات، و ساڵێکی تەواو لەو وڵاتە مایەوە و تێبینییەکانی خۆی لەسەر ئەو سیستەمە تۆمار کرد، تا ئەو شتانەی، کە سوودیان بۆ وڵاتەکەی هەبێ وەریبگرێ بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەڵگەی فەرەنسی، بە تایبەتی گرفتەکانی ئازادی و یەکسانی، کە دوو شادەماری سیستەمی دیموکراسین[٢١]. هەروەها (تۆکڤیلْ) ئەنجامەکانی ئەو سەردانەی لە کتێبێکی زۆر

---

٢١- دوای ئەوە یاساناس و فەیلەسووفەکان ئازادی و یەکسانیان بۆ چەندین جۆر شیکردۆتەوە:-

**جۆرەکانی ئازادی:**

أ-ئازادیی بیرکردنەوە و چۆنێتی دەربڕینی ئەو بیرکردنەوەیە.

ب-ئازادیی شوێنگۆڕین و هاتن و چۆن.

ج-ئازادیی موڵکدارێتی.

د-ئازادیی کۆڕ وکۆبوونەوە.

هـ- ئازادیی ڕۆژنامەگەری.

و- ئازادیی باوەڕی ئاینی وخواپەرستی.

ز-ئازادیی نیشتەجێبوون و ڕێز لێگرتنی..و هتد.

**جۆرەکانی یەکسانی:**

أ- دابەشکردنی فەرمانە گشتییەکان بێ جیاوازی.

ب- یەکسانی لە بەرامبەر یاسا و دادگاکاندا.

ج- یەکسانی لە تێچووەکان و ئەو بارگرانیانەی دەکەوێتە ئەستۆیان.

د- سەپاندنی باج بە بێ جیاوازی.

گرنگدا بلاو کردەوە بە ناونیشانی (دیموکراسیەتی ئەمریکا)، بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٨٣٥ و بەرگی دووەمیشی لە ساڵی ١٨٤٠دا بلاو کرایەوە، تێیدا باسی لە(حەتمی بوونی دیموکراسی) کردووە. شۆڕشی دیموکراسی، کە دروشمی (یەکسانی) یەکێکە لە کۆڵەگەکانی ئەو شۆڕشە، بە رای ئەو ئەمە ئەوەندەی دیاردەییێکی جیهانییە ئەوەندە رووداوێکی لەناکاو و سەر پێیی نییە، چونکە هەرهەموو رووداوە گەورەکانی مێژوو بۆ بەرژەوەندییەکانی یەکسانی روویان داوە و لەسەر حیسابی کەم کردنەوەی ئیمتیازات و پلەوپایەی میرەکان بووە، و لە پلەوپاییەی خەڵکە رەشورووتەکەی بەرز کردۆتەوە و دەڵێ: ((ئەگەر سەرنجی خۆمان بدەینە هەر لاییێك، تەماشا دەکەین هەمان شۆڕش لە سەرتاسەری جیهاندا بەردەوامی هەیە.. ئێمە رووداوە جۆربەجۆرەکانی خەڵکی لەهەر شوێنێکی جیهاندا بێ دەبینین، بەلای بەرژەوەندییەکانی دیموکراسیدا دەشکێتەوە، هەر هەموو ئادەمیزادیش بە هەوڵ وکۆششەکانیی خۆیان هاوکار، یارمەتیدەر بوونە بۆی، ئینجا ئەوانە ئەو کەسانە بن، کە دڵسۆزانە هەوڵی سەرخستنی دیموکراسیان داوە، یان ئەو کەسانە بن، کە هەر بیریشیان لێ نەکردۆتەوە. ئەو کەسانەی لە پێناویدا دەجەنگان و هەروەها ئەوانەش، کە دوژمنی دیموکراسیش بوون، هەر هەموویان هاوکار بوون بۆ سەرخستن و جێگیرکردنی پێگەکانی دیموکراسی. لێرەدا چاك و خراپەکان تێکەڵ بەیەك بوون، کە هەندێکیان بە ناچاری بوو هەندێکیشیان بێئەوەی ئاگایان لێبێ ببوونە چەند کەرەستەییێکی کوێرانە و خوداوەند هەڵێدەسووڕاندن و کاریان بۆ سەرخستنی دیموکراسی دەکرد. ئەوەی راستی بێ، ئەو گەشەکردنەی یەکسانی، بەرهەم و زادەی ئەو هەڵسووڕاندنەیە و جێ پەنجەی ئەوانی پێوە دیارە، بێگومان ئەمەش رووداوێکی جیهانی بەردەوامە.. ئایا ئێوە مەزەندەی ئەوە دەکەن، کە دیموکراسی دوای ئەوەی

---

هـ-یەکسانی لە سەپاندنی خزمەتی سەربازیدا..وهتد.

یاساناسانیش وای بۆ دەچن، کە سەرجەم دیکتاتۆرەکان یەك دروشم هەڵدەگرن ئەویش ئەوەیە دەڵێ (هیچ ئازادییێك نادەینە دوژمنانی گەل) دوژمنانی گەلیش لای مارکسییەکان ئەو کەسانەن، کە مارکسی نین. ئەمەش لەکاتی شۆڕشەکەی فەڕەنسادا، و لە سەردەمی رۆبسبیر، یان لە سەردەمی ستالین لە ڕووسیا، و نازییەکان لە ئەڵمانیا ڕویاندا، کە ئەمەش دەستووری تیرۆر بوو.. بە کتێبەکەی د.عەبدولحەمید متووەلی (حریات عامة).و د. سوعاد ئەلشەرقاوی (النظم السياسية في العالم المعاصر) لــ٣٠٠ـ دا بچۆرەوە. دەبینین ئەم دروشمە لە هەندێك شوێندا دەگۆڕێ و دەبێتە (دوژمنانی شۆڕش) وەك ئەوەی لە چەندین دەوڵەتی عەرەبی شۆڕشگێڕدا ڕوویاندا.

دەرەبەگایەتی تێك دەشکێنێ و بەسەر پاشاکاندا سەردەکەوێ لە بەردەم برجوازییەکان و دەوڵەمەندەکاندا پاشەکشە دەکات..؟ ئایا لەمەودوا لەجێی خۆیدا چەق دەبەستێ و رادەوەستی، کە ئێستا بازوەکانی بەهێزتر بوونە، و دوژمنەکانیشی لەوپەڕی بێهێزیدان))؟[٢٢]. بێگومان نەخێر. ئەمەش مانای ش، کە دیموکراسی لەلای (تۆکڤیلێ) شتێکی حەتمیە، و هەر هەموو رووداوەکانیش لە بەرژەوەندی ئەودان، ئەمەش ویست و ئارەزووەکانی خوداوەندە، ئەوانەیکە پشتگیری دەکەن و ئەوانەی دژایەتیشی دەکەن، هەردووکیان پێکەوە کار بۆ ئەوە دەکەن هەرچی زووترە جێبەجێ بکرێت و پێگەکانی بچەسپێت، لەو روانگەیەشەوە کەس ناتوانی لە روویدا بوەستێتەوە و رێی پێبگرێت، چونکە ئەمە رێگەگرتنە لەویست و ئارەزووەکانی خودا..

ئەمە ئەو ئەنجامانە بوو، کە تۆکڤیلێ لە ئەزموونە دیموکراسییەکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای هەڵیهێنجابوو. و لەلای خۆی وێنەیێکی نموونەیی دیموکراسییەت لە ئەزموونەکەی ئەمەریکادا دەدۆزێتەوە. بە بۆچوونی ئەو ئەمەریکا تاکە وڵاتە، کە شۆڕشی دیموکراسی تیایدا گەیشتبێتە گەشەکردنێکی تەواوی خۆی. ئەم شۆڕشەش بۆیە لە ئەمەریکا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لەبەر ئەوەی پەنای بردبووە بەر هۆکارە ساکار و ئاسانەکانی ئاشتیخوازی. ئەو وای دەبینیێ، کە پێویستە لەسەر فەرەنسا لەو بوارەدا شوێن پێی هەنگاوەکانی ئەمەریکا هەڵگرێ بۆ ئەوەی بگاتە یەکسانییێکی تەواو. سیستەمی دیموکراسی توانی سیستەمە سیاسییەکانی وەك سیستەمی ئۆروستوکراتی و دەرەبەگایەتی و مولکدارێتی رەها...و هتد رابماڵێ و بە هێزو تواناییێکی زۆرەوە پێگەکانی خۆی جێگیر بکات، ئەگەربێت و بە باشی و بەپێی کارێکی هێمن و لەسەرخۆ ئامادە و ئاراستە بکرێ، دەتوانێ خۆشی و خۆشگوزەرانی بۆ تاکەکانی گەل دەستەبەر بکات ((تاکە ئامانجی رەوای دەسەڵاتیش ئەوەیە، کە زۆرترین رێژەی خۆشگوزەرانی بۆ ئەو کەسانەی لەژێر جڵەوی دەسەڵاتەکەی ئەودا دەژین دەستەبەر بکات))، ئەمەش پەیوەستە بە رادەی باوەڕ بوون بە خودای گەورەوە، چونکە خودا خەڵکی بۆ ئەوە دروست کردووە تا دڵخۆش بن، لەبەرئەوەی زانیاری پێویستیان لە بارەی یاساکانی گەردون و سیستەمە سروشتییەکاندا هەیە، لە رەفتارەکانیاندا پەیرەوی ئەوە دەکەن کە زانستەکان دەیانەوێ بیکەن...)[٢٣]. ئەمەش رێك ئەو شتەیە، کە سیستەمی دیموکراسی دەیەوێ بیهێنێتەدی.

---

22 - Alexis de Toquville : Democracy in America" By Reev in ss GreatPolitical Thinkers by William Elentein P. 536 Oxford 1966

٢٣- جۆن دیوی(الحرية والثقافة) وەرگێڕانی ئەمین موسا قەندیل، کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری ساڵی ١٩٥٥ لـ٢٤١ـ.

تۆكڤیلْ له كاتێكدا له دایكبوو، كه پڕیبوو له ئاژاوەی سیاسی و كۆمەلآتی، لەو كاتەدا بوو، كه فەرەنسا بەرەو گۆڕانكارییەكان دەچوو له كۆمەلگەییەكی ئۆرۆستۆكراتیەوە بەرەو كۆمەلگەییەكی دیموكراسی شۆڕشگێڕ، ئەو بارودۆخەی ئەوسا وای له تۆكڤیلْ كردبوو، كه به تێگەیشتن و شیكردنەوەییەكی زۆر بابەتیانە بارودۆخەكەی ئەوسا هەلسەنگێنیّ، بۆ خۆی ئەوە رەتدەكاتەوە، كه ئەو لاینگیری هیچ لایەنێكی ئوروستۆكراتی یان دیموكراسی بێت و دەلیّ: دەیانەویّ به مرۆڤێكی حیزبیم له قەلەمدەن، بەلآم من هەرگیز وا نیم. ئەوان به نۆرە هەر جارەی بیرۆكەییەك دەخەنە پالْم جارێك دیموكراسی و جارێك ئۆروستۆكراتی. گوایە من لەمیانم یان لەویتریانم، ئەگەر له سەردەمێكی تر، یان لەولآتێكی تردا بژیبام لەوانەیە وابووایە، بەلآم بەختی من وابوو، كه بەم شێوەیە له دایك بووم، ئەمەش وای لێم كردووە، كه تۆمەتەكانی ئەم یا ئەو لەسەر خۆم دوور خەمەوە و ویژدانیشم زۆر ئاسوودەیە. من له دوای شۆڕشێكی دووروودرێژ هاتوومەتە ئەم جیهانەوە، دوای ئەوەی دەولەتە كۆنەكە لەبەریەك هەلوەشابۆوە و له ناوچووبوو هیچ سەقامگیرییێك له ئارادا نەبوو، ئەو كاتەی من له دایك بووم ئۆروستۆكراتیەت لەناو چووبوو، دیموكراسیەتیش هێشتا له دایك نەببوو...)[٢٤]. تۆكڤیلْ بەرۆحێكی بابەتیانەی تەواوەوە هەولەكانی خۆی بۆ توێژینەوەی سیستەمی دیموكراسی خستبووە گەڕ و به هێزێكی زۆرەوە رێڕەوی خۆی گرتبوو، بۆ ئەوەی خۆی بەسەر جیهاندا بسەپێنیّ، هەروەها هەولی داوە لێكۆلینەوە لەسەر ئەو بنچینانە بكات، كه دیموكراسی لەسەر بنیاد دەنرێت، لەو باوەڕەشدایە، كه ئەو بنچینانە ئازادی و یەكسانین. سەرەنجام گەیشتە ئەو رایەی كه دیموكراسیەت، لەلاییێك شتێكی حەتمیە و لەلاییێكی تریشەوە دیموكراسی به بیّ یەكسانی بوونی نابیّ، لایەنی سیّ یەمیشی ئەوەیە كه یەكسانی به بیّ بوونی ئازادی دەبێتە هۆی تێكدانی شیرازەی كۆمەلگە[٢٥].

ئەو كتێبەی تۆكڤیلْ بووە هۆی چالآكتركردنی بیروڕا دیموكراسییەكان له ئەوروپا، ئەو بیروڕا چەوتانەی راستكردەوە كه لەو ولآتانەدا بلآو ببوونەوە، كه دەیانگوت دیموكراسی دەبێتە هۆی

---

٢٤- ج. ج. شۆڤالبیە (امهات الكتب السیاسیة) وەرگێڕانی جۆرج سەدقنی له بلآوكراوەكانی وەزارەتی كلتوری و رێنمایی نەتەوەیی له دیمەشق سالْی ١٩٨٠ لـ٨٩ـ.

٢٥- د. مەهدی مەحفووز (اتجاهات الفكر السیاسي في العصر الحدیث) دەزگای زانكۆ بۆ لێكۆلینەوە و بلآوكردنەوە. بەیروت سالْی ١٩٩٠لـ١٦٧ـ و دوای ئەو.

گێرەشێوێنی یان دەبێتە هۆی دیکتاتۆریەتی سەربازی [٢٦] و دەستی کرد بە پێدا هەڵدانی شێوازەکانی دەسەڵاتی دیموکراسی لە ئەمەریکادا و دابەشکردنی دەسەڵاتە سەرەکییەکان لە نێوان ناوەندو ئەو هەرێمانەی پەیمانیان لە گەڵێدا بەستبوو، هەروەها لایەنە باشەکانی بەڕێوەبردنی لامەرکەزی و ئەو سیستەمە سەربەخۆیە خۆجێیەتیەی کە هەرێم و شارەکان پێیان درابوو و پشتگیری لەو دەسەڵاتانە کرد کە درابوونە دەستەی دادوەران  بە تایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە شیکردنەوەی دەستوور و بە دەستووریکردنی ئەو بڕیارانەی کە دەستەی یاسادانان دەری دەکات. لەگەڵ مۆنتسکیۆدا (M0ntesquieu 1689-1755) هاوڕا بوو کە دەڵێ: (ژینگەو بارودۆخی کۆمەڵایەتی کاریگەری خۆی لەسەر دەستنیشانکردنی سیستەمە سیاسییەکاندا هەیە. لە کۆتاییدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دیموکراسیەت دەبێ سەرجەم جیهانی شارستانییەت بگرێتەوە ئەوەش لە ئەنجامی ئەو گەشەکردن و پێشکەوتنە سروشتییەوە دەبێ کە بە خۆیەوە دەبینێ).

## سێیەم: دیموکراسیەت و سروشتی مرۆڤایەتی:

دەمانەوێ بە چەند وشەیەکی کورت لە بارەی بیرۆکەکانی فەیلەسوفی ئەمریکی سەردەم جۆن دیوی(١٨٥٩ـ١٩٥٢) J.Dewey کە لە بارەی دیموکراسیەت و پەیوەستبوونیان بە سروشتی مرۆڤایەتیەوە کۆتایی بەو بەشە بێنین کە بە دەوری (حەتمیەتی دیموکراسی)دا دەخولایەوە.

بە شێوەییەکی گشتی(دیوی) گرنگییەکی تایبەتی بە دیموکراسی داوە، و بە شێوەییەکی تایبەتیش گرنگی بە پێوەندیە سروشتییەکانی مرۆڤ داوە، ئەو لە کتێبی (ئازادی... و رۆشنبیری)دا، لێکۆڵینەوە لەسەر تیۆری کۆمەڵێك فەیلەسووف دەکات لە بارەی ئەو سروشتە، لەوانەش ئەفلاتون، کە ئەو وای بۆ دەچێ خەڵکانێك هەن لەبەر ئەو سروشتە تایبەتییەی، کە هەیانە، دەبێ بۆ بەرقەرار بوونی ئاسایش لەنێوانیاندا لە سەرووڕا رێنماییەکانیان بەسەردا بسەپێندرێ..ئەگەر بەم شێوەیەش نەبێ لەناو دەچن و هەموو کارەکانیشیان بێ سەرووبەر دەبێ، یان سنوورێکی نابێ لێی بوەستێ و بەناوی (ئازادییە گشتییەکانی خەڵکییەوە) هەموو یاسا و رێساکان لێك هەڵدەوەشێنەوە و کۆمەڵێکی تر هەن کە ئەوانیش (چینی سەربازەکانن)

---

٢٦- ئەمە ئەو بیروباوەڕە کۆنانە بوو، کە ئەفلاتون دەیگوتنەوە، کە لەلای ئەو دیموکراسی مانای حوکومڕانیکردن بوو لەلایەن هەموو خەڵکەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئاژاوە و گێرەشێوێنی.

هەر چەندە ئەوان ئەو توانایەیان نییە لە مەبەستی ئەو یاسایانە تێبگەن، چونکە ئەوان هەر بە سروشت دڵسۆزانە حەز بە گوێڕایەڵی یاساکان دەکەن. هەروەها روو لە بیروباوەڕە راستەکان دەکەن. لە سەرووی ئەو دوو چینەشەوە کۆمەڵێکی تر هەن و ئەوان دەسەڵات دەگرنە دەست، ئەم کۆمەڵەیان ئەقڵ و ژیری دەکەنە سەر مەشقی کارەکانی خۆیان، کە مەشق و پەروەردەکردن قاڵی کردوونەتەوە و بە شێوازێکی راست و دروست پێگەیشتوون ئەوانەش ((چینی دەسەڵاتدار و فەیلەسووفەکانن)). ئەفلاتون بەم شێوەیە لە سەر بنچینە سێ لایییەکەی سروشتی مرۆڤ [27] سیستەمی دەسەڵاتی دەستنیشانکردووە. ئەمجۆرە دابەش کردنەش لەلایەن (دیوی)ەوە رەتکراوەتەوە. [28]

هەروەها (دیوی) تیۆرەکانی فەیلەسووفی ئینگلیزی ((تۆماس هۆبز)) (١٥٥٨-١٦٧٩) . Hobes شیدەکاتەوە و گفتوگۆی لەسەر دەکات. بیروڕاکانی ئەو فەیلەسووفەش دەڵێ: (سێ هۆکار لە ناخی سروشتی هەر مرۆڤێکدا خۆیان حەشار داوە و بەرە و شەڕو ناکۆکییەکان پاڵیان پێوە دەنێن: یەکەمیان ململانێکردنە و دووەمیان مەزەندەی خراپە، سێیەمیشیان خۆبەزل زانین و خۆهەڵکێشانە.[29] دیوی لەو باوەڕەدایە کە ئەم تایبەتمەندییانە بەکردەوە لە سروشتی مرۆڤدا بوونی هەیە، کە دەبنە هۆی دروستبوونی شەڕو ناکۆکییەکان، بەڵکو دەبنە هۆکاری شەڕی نێوان وڵاتانیش، یان شەڕی ناوخۆ لەناو یەك نەتەوەدا، بەڵام هۆبز لەمەدا بە شێوەییێکی خراپ تێی گەیشتووە).

(دیوی) پێی وایە ئەو بیروڕا جیاوازانەی لەبارەی ئەو سروشتە باوەی مرۆڤ لە سەردەمێکی دیاریکراودا، زۆر بە توندی پەیوەستە بەو تێزە کۆمەڵایەتیانە کە لەو سەردەمەدا هەیە، رەگ و ریشەی خۆشی لەوەوە وەردەگرێ، ئەمانەش چەند تێزێکی دیارن و زۆر بە روونی بەدیدەکرێن، ئەگەرچی لە هەر حاڵەتێکیاندا بن زۆر ئاڵۆزن. ئەو تیۆرەی

---

٢٧- جۆن دیوی (الحرية والثقافة) وەرگێڕانی ئەمین موسا قەندیل کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری ساڵی ١٩٥٥ لـــ١٥٥ـــ.

٢٨- هەمان سەرچاوە.

٢٩ لە راستیدا دیوی ئەم هۆکارانەی بۆ نیوە کورت کردۆتەوە، چونکە هۆبز سەرچاوەی ململانێیەکانی ئادەمیزاد بە شەش سەرچاوە دادەنێ نەك سێ سەرچاوە، بە درێژی بە کتێبەکەی مندا (توماس هوبز : فيلسوف العقلانية)دا بچۆرەوە دار ئەلسەقافە بۆ بڵاوکردنەوە و دابەش کردن لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٥ لـ٣٠٦ـ و دواتر.

ئەفلاتون کە لە بارەی سروشتی ئادەمیزادە لە کۆمەڵێك خەسڵەتدا وەریگرتووە، کە دابەش دەبنە سەر سێ بەش، ئەمەشیان وەك تیۆرەکەی هۆبز وایە کە لە سەردەمی شەڕە ناوخۆییەکانی ئینگلتەرا داینابوو، کاتێك کە بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان چەند گۆڕانکارییەکیان بە سەرداهات، ئینگلیزە رادیکالییەکانیش بانگەشەیان بۆ دەکرد چونکە ئەمە لە لاییەك پاکانەکردن بوو لە ئازادی، لە لایێکی تریشەوە پاکانەکردن بوو بۆ ئەو حکومەتە جەماوەرییەی کە پشتی بە دوو کۆڵەگەی بنچینەیی دەبەست، یەکەمیان (بەرژەوەندییە تاکە کەسییەکان بوو) دووەمیشیان (بەشداریکردنێکی ویژدانانە) بوو. هەر چەندە ئەم دوانە دژ بەیەکن، بەڵام زۆر زیرەکانە توانیان بە یەکەوە بیبەستنەوە. هەندێکجار خەڵکی حەز دەکات بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی بێنێتە دی هەروەها بۆ کارەکانی ناو حکومەتیش بیانکاتە بنچینەیێکی تیۆری، لە لاییێکی تریشەوە هەندێکجار حەز دەکات بە ویژدانەوە بەشداری لە کارەکاندا بکات کە کاریگەری بەرچاوی لە سەر پێوەندییەکانی نێوان تاکەکاندا هەیە لەگەڵ یەکتردا وەك تاك. ئەوە بۆ زیاتر لە سەدەیێك دەچێ ـ کە هەندێك کەس بۆ پاکانەکردن لە دەسەڵاتی سیاسی بە کاریان دەهێنی: خەڵکی خۆیان حوکمی خۆیان بکەن. بەڵام (دیوی) دەڵێ: (لە کاتی ئێستادا ئەم تیۆرە بە کەڵکی ئەوە نایێت وەك رێنیشاندەرێك لە پرۆسە دیموکراسییەکاندا بە کار بهێندرێت).

بەڵام لە تیۆرە تایبەتیەکەی ئەودا، وای بۆ دەچێ کە دیموکراسی بەشێوەیێکی پراکتیکی ئەو باوەڕە لە خۆیدا دەگرێ، کە دەبێ دامەزراوە سیاسییەکان حیسابێکی گەورە بۆ سروشتی مرۆڤ بکەن. بە مانایێکی تر، لەسەری پێویستە بوارێکی بەرفراوان بۆ ئەو سروشتە بڕەخسێنێ تا بە ئازادییێك کاری تێدا بکات زیاتر بێت لەو بوارەی کە دامەزراوە سیاسییە نا دیموکراسییەکانی دیکە هەیانە، دیموکراسی هەمیشە لەگەڵ توانا سروشتییەکانی مرۆڤدا کۆك بووە، یان سیستەمێکی سیاسی لەو جۆرە زۆر پێویستە تا ئەو تواناییانەی تێدا نەشونما بکات، زۆریش جەختی لەسەر دەکاتەوە، یان کار بۆ پەرەپێدان و گەشەپێدانی بکرێ. سەرەڕای ئەمەش باوەڕبوون بەگرنگییەکانی (مرۆڤی ئاسایی) ئاماژەیێکی بە هێزیشن بۆ ئەوەی، کە دیموکراسیەت شێلگیرانە بە سروشتی مرۆڤەوە پەیوەستە.

((دیوی)) دەگاتە ئەو رایەی کە سیستەمی دیموکراسی باشترین سیستەمە سروشتی مرۆڤ بەدی هێنابێ بۆ ئەوەی گەشە بکات و بشنێتەوە. ئەگەر بێت و واز لە سروشتی مرۆڤ بێنین و دەسکاری نەکەن و لە گوشارە دەرەکییەکانی رزگاری ببێت، روو لە بنیادنانی دامەزراوەی

سەربەخۆ و ئازاد دەكات وكارەكانی خۆی بە باشترین شێوە ئەنجام دەدات. هەروەها دیموكراسی باوەڕبوونە بە (فەرهەنگە مرۆڤایەتییەكان) و دەبێ بڵاو ببێتەوە و بەسەر هەموو ئەوانیتردا باڵادەست بێت، واتە لایەنە مرووڤایەتییەكانی ئەو فەرهەنگەیە كە دەبێ بمێنێتەوە، ئێمەش دەبێ لە كۆتاییدا دان بەوەدا بنێین كە كێشەكە كێشەییێكی ئەخلاقیە وەك هەر بیرۆكەییێكی دیكە پەیوەستە بەوەی كە چۆن پێویست بكات دەبێ وابێ..چونكە كاریگەری بۆچوونە مرۆڤایەتییەكان لەسەر دیموكراسی لەهەر هەموو بوارە جۆربەجۆرەكانی فەرهەنگ لە پەروەردە و زانست و هونەر و ئەخلاق و ئاین و هەروەها پیشەسازی و سیاسەت بوو لەو رەخنانە رزگاری كرد كە ئاراستەی دەكران. لەبەرئەوەی رێبازی دیموكراسی لە روانگە تیۆریەكەیەوە رێبازی رازیكردن و قەناعەت پێهێنانە لە رێگای گفتوگۆ گشتییەكانەوە نەك تەنها لە ئەنجومەنەكانی یاساداناندا بەڵكو لە رۆژنامە وگۆڤارەكان و وتوێژەكانی خەڵكی و كۆبوونەوە گشتییەكانیشدا، واتە سندووقەكانی هەڵبژاردن و دەنگدان جێگای بەكارهێنانی گوللە بگرێتەوە و مافی دەنگدان جێگای لێدانی دار و قامچی بگرێتەوە و تەعبیر لەو خواست و ئارەزووانە بكات، كە هانمان دەدەن تا گفتوگۆ و یەكتر رازیكردن جێگای تێلاو زوڵم و زۆر بگرێتەوە. سەرەڕای بوونی هەندێك كەموكوڕی و ناتەواوی لەم رێبازەدا و بوونی چەند نموونەییێكی دەمارگیری وخۆمانە خۆمانەكردن لە دیاریكردنی بڕیارە سیاسییەكاندا، بێگومان بووە هۆكاری كەمكردنەوەی ناكۆكییە تایفییەكان و لە بازنەییێكی تەسكدا هێشتیەوە، بەڕادەییێك كە لە ماوەی سەدەی رابردوودا كەس بیری لێنەكردبۆوە.

بە رای (دیوی) دۆزینەوەی رێبازێكی تر كە باشتربێ لە سیستەمی دیموكراسی، و شێوەییێكی تر لە شێوەكانی سیستەمی سیاسی، كە یارمەتی سروشتی مرۆڤ بدات تا پێی بگات و بەرەكەی بخوا كارێكی ئاسان نییە، هەر لە پێناوی ئەمەشدایە كە رێگەی دیموكراسی ئەو رێگا پڕ لە ناخۆشی و ماندوو بوونەیە كە دەبێ بیگرینە بەر. ئەگەر هات و دیموكراسی و هەرچی ئەو ئازادیانەی كە تیایدا هەیە گەورەترین بارگرانییەكانی بەرپرسیارێتی بخاتە سەر شانی زۆرترین ژمارەی خەڵكی، بێگومان ئەمە دەبێتە هۆی دەركەوتنی چەند لایەنێكی لاواز تیایدا، بەڵام ئەو لایەنە لاوازانە كاتین و دوایی بە رۆیشتنی كاتەكانی مرۆڤ دەتواندرێ چارەسەر بكرێن و ببێتە هۆكارێك لە هۆكارەكانی بەهێزبوونی ئەو سیستەمە، ئەگەر بێت و هۆكارەكانی ئازادیە دیموكراسییەكان هەمان ئەو هۆكارانە بن كە بوارەكانیتر بۆ مرۆڤ والاّ دەكەن بۆ ئەوەی بە شێوەییێكی تەواوتر و تۆكمەتر تواناكانی خۆی بەكار بهێنێ، چونكە ئەو

تواناyanه ئەگەر هات و سەرکوتکراو دەرگاکان بە روویدا داخران، لەکاتێکی گونجاودا هەڵدەچێ و رادەپەڕێ و داوا دەکات بوارەکانی بەردەمی فراوانتر بکرێ بۆ ئەوەی دەرکەوێ وخۆی بە ئامانج بگەیێنێ و گوزارشت لە خۆی بکات. لێرەوە داواکارییەکانی دیموکراسی لە کاکڵە و ناوەڕۆکدا لەگەڵ داواکارییەکانی هەر سیستەمێکی دادپەروەرانە دەگونجێ و رێك دەکەوێ. ئەو دامەزراوانەی خۆیان حوکمڕانی خۆیان دەکەن باشترین رێگەن بۆ گەیشتن بە یەکسانی و رێگە خۆشکەرن بۆ سروشتی مرۆڤ تا خۆیەتییێکی تەواو بۆ زۆرترین ژمارەی خەڵکی بێنێتە دی. ئێستا پێشکەوتن گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە دەسەڵاتی ئەوەمان دەداتێ بڵێین: دیموکراسی رێگاییێکە لە رێگاکانی ژیان، دەبێ درك بەوەش بکەین، کە ئەمە رێگاییێکیشە لەڕێگاکانی ژیانی کەسایەتی و پێوەرێکی دروستی رەفتارە کەسییەکانمان دەداتێ).[٣٠]

بەم شێوەیە کۆمەڵێك لەو فەیلەسووفانەی کە لە بۆچوونەکانیاندا زۆر لەیەك جیاواز بوون ئێستا هاوڕان و هەر هەموویان لەگەڵ ئەو بۆچوونەدان کە دەڵێ: ((دیموکراسی شتێکی حەتمیە)) ئینجا یان لەبەرئەوەیە کە کۆتایی بە ململانێکانی نێوان (کۆیلە و خاوەن کۆیلە) دێنێ، وا لە کۆمەڵ دەکات دان بە بەهاو کەرامەت و توانای هەر تاکێك لە تاکەکانی خۆیدا بنێ، یان لەبەرئەوەیە کە رژێمە کۆنەکانی راپێچدا و رای ماڵێن: وەك رژێمە ئۆروستۆکراتەکان و دەرەبەگەکان و ئەو مافە خوداوەندیانەی پاشاکان بە خۆیان رەوا بینیبوو، یان لەبەرئەوەیە کە بوارەکان لە بەردەم سروشتی مرۆڤایەتی دەڕەخسێنێ تا بتوانێ تواناکانی خۆی دەرخات و گەشەو داهێنان بکات، وەك ئەو رووەکەی ئەگەر هات و ئاوو هەوای گونجاوی بۆ بڕەخسێ گەشە دەکات و بەروبوومی دەبێ.، ئایا دەبێ مرۆڤ هەوای کەمتر بوێ لە رووەك؟. ئەگەر بە ئازادی هەناسە نەدات ئایا گەشە دەکات و پێشدەکەوێ؟ و ئەگەر ئەوەی مرۆڤ لەوانی تر جیا دەکاتەوە (بیرکردنەوە) بێت یان ئەقڵ بێت و ئەگەر ئازادی بیرکردنەوەو رادەربڕین و گفتوگۆو رازیکردن نەبێت، چۆن دەتوانێ بیر بکاتەوە؟.

((لۆرکا))ی شاعیری ئیسپانی لە شیعرێکدا بە خۆشەویستەکەی دەڵێ ئەگەر من ئازاد نەبم ناتوانم تۆم خۆش بوێت:-

(ماریانا، ئایا مرۆڤ بێ ئازادی دەبێ چ ماناییێکی هەبێ..؟)

---

٣٠- بۆ هەر هەموو ئەمانە بگەڕێوە سەر بەشی پێنجەمی کتێبەکەی (جۆن دیوی) ((الحرية..والثقافة))، وەرگێڕانی ئەمین مووسا قەندیل، کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری لە قاهیرە ساڵی ١٩٥٥.

پێم نالێی گەر من ئازاد نەبم چۆن دەتوانم تۆم خۆشبوێ؟
گەر من خاوەنی دڵی خۆم نەبم چۆن ئەو دڵەت بدەمێ؟.....[31]

پوختەی ئەمانە هەمووی سیستەمی دیموکراسی بەوەی لەو ئازادی و یەکسانییەی کە دەستەبەری دەکات و ئەو دادپەروەریەی کە دەیهێنێتەدی توانی خۆی بەسەر سیستەمەکانی تردا بسەپێنێ و لەبەردەمی خۆی رایان بماڵێ و بۆ ئەوەی ببێتە سیستەمێکی سیاسی بۆ سەرجەم مرۆڤەکان وەك مرۆڤ لە هەر جێگاییێك بێت نەك ئەمە رۆژهەڵاتییە، یان رۆژئاواییە، بەڵکو وەك مرۆڤێك بە پێی ئەو خودو ناوەرۆکەی کە هەییێتی، کە ئەویش ئازادیە — وەك (هیگڵ) سەر راستانە دەڵێ — (گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بەکردەوە ئاواتەکانی لە جیهانی واقیعدا بێتە دی. لێرەوە (حەتمی بوونی دیموکراسی) وەك ئەزموونێکی سیاسی دەگمەن خۆی دێنێتە پێشەوە). لە کۆتایی باسەکەماندا دەگەڕێینەوە سەر گفتوگۆو بیرو بۆچوونەکانی دژ بە دیموکراسیەتی لیبڕالی، کە بە ستەمی دیموکراسی(الاستبداد الديمقراطي) ناویان بردووە[32] .

---

٣١ تەماشای کتێبەکەی من(الطاغية: دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي) بکە کتێبخانەی مەدبوولی لەقاهیرەلـ٢٧١ .

٣٢ - د- عیسمەت سەیفول دەولە کتێبی (الاستبداد الديمقراطي) دارولموستەقبەل لە قاهیرە.

# بەشی دووەم

## ((حوکمڕان... و ئەخلاق: چەند بیرۆکەییێکی پرەنسیپانەیە))

**((پینەدۆز پێڵاو دروست دەکات، بەڵام تەنها ئەو کەسەی کە پێڵاوەکە لە پێ دەکات، دەزانێ لەچ شوێنێکدا پێی دەگوشێ..)!**

**( پەندێکی یۆنانییە))**

لەم بەشەدا کۆمەڵێك بیرۆکەی بنچینەیی دەخەینە روو، ئێمە داوامان لەم خوێنەرە بەڕێزەی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە ئەوەیە، کە لە هزری خۆیدا بیهێڵێتەوە و دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە کورتی بکەینەوە.

**بیرۆکەی یەکەم:** لەم کتێبەدا دەمانەوێ دوو بواری گرنگ روون بکەینەوە و بەپێی توانا جیاوازییە وردەکانی نێوانیان دەسنیشان بکەین، هەوڵی ئەوەمان داوە ئەو تێکەڵکردنانەی لە نێوانیاندا کراوە بخەینە روو: کە ئەویش بواری (ئەخلاق) و(سیاسەت)ە، یان ئەو تێکەڵکردنەی لەنێوان بێخەوشی (الفضيلة) و یاسادا هەیە، ئەم تێکەڵیەش لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە بە میرات بۆمان ماوەتەوە، ئەو کات زۆربەی بیرمەندە سیاسییەکان باوەڕیان وابوو، کە کاری دەوڵەت ئەوەیە کە هاوڵاتیان لە رێگای دروستکردنی کۆمەڵگایێکی (چاك و بێخەوش)ەوە بگەیێنێتە بەهەشت،[33] بەپێی ئەو وتەیەی کە دەڵێ: ((خەڵکی لەسەر ئاینی پاشاکانیانن))، لێرەوە بیرمەندە موسڵمانەکان و کەسانی دیکە گرنگییان بەوە دەدا کە چەند مەرجێك بۆ حوکمڕانی چاك دابنێن کە شایستەی ئەوە بێت دەسەڵاتی ئەو یۆتۆپیایە بگرێتە دەست. ئەگەرچی ئەو رەوشە فەرهەنگییەی کە لەو سەردەمەدا لەناو کۆمەڵگاکاندا باو بوو ئەو رێیەی پێدابوون بەم شێوەیە بیر بکەنەوە. بەڵام ئێمە زۆر سەرمان لەوە سوڕدەمێنی کە دەبینین هەندێك لە بیرمەندەکانی ئەم سەردەمەی ئێستامان هەمان ئەو بیرۆکە ساویلکەیە دووبارە دەکەنەوە[34] وا دەزانن، کە گرفتی ئێمە لە هەڵسوکەوتەکانی حوکمڕاندایە (بێگومان

---

٣٣- ئێمە ئەگەر لەم کتێبەدا باسی تێکەڵکردنی ((ئەخلاق و سیاسەت))مان کردبێ، هەروەها دەبێ ئاگامان لەوەش هەبێ، کە تێکەڵکردنی (ئایین) و (سیاسەتیش) دەگرێتەوە بەو پێیەی کە ئەخلاق جەوهەری ئایینە. پێغەمبەری خۆشەویستمان پەیامەکەی خۆی لەم فەرموودەیەدا کورت کردۆتەوە کە دەڵێ: ((انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق)) واتە من بۆیە نێردرام بۆ ئەوەی بەر و پاداشتەکانی ئەخلاق تەواو بکەم. تەنانەت ئەگەر لەگەڵ(ستيس)یشدا بڵێین کاکڵەی ئایین تەسەوفە نەك ئەخلاق (بە کتێبی ((الدين..والعقل الحديث)) دا بچۆرەوە) بەڵام بیرۆکەکە هەر دەمێنێ لەبەر ئەوەی خەسڵەتەکانی تەسەوف دەسگرتنەوەیە (زهد) لە خواردن و خەرج کردن و دورکەوتنەوەیە لە شتە قەدەغەکراوەکانی دونیا. بەکورتیەکەی ڕەفتارە چاکەکان واتە ئەخلاق.

٣٤ - ئەگەر بێت رێگە بە موسڵمانە دێرینەکان بدرێ بیرۆکەی (حوکمڕانێکی چاك ) وەك چۆن مەیتەر (کە عەرەب پێی دەڵێن سائس) کە وشەی سیاسەتیش لەوەوە هاتووە.. هتد ئەسپ رادێنێ ئاوهاش (هاوڵاتییێکی چاك) پەروەردە بکات، و رایبێنێ، کە دواتر باسی دەکەین —دەڵێم ئەگەر چی لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا لەبەر

مەبەستمان لایەنە ئەخلاقیەکەیێتی) نەك جۆری ئەو دەسەلاٌتەی کە هەیە (یان سیستەمە سیاسیەکە) لەگەلْ ئەوەشدا سەری کێشەکە سیستەمە سیاسیەکەیە واتە شێوەی بنیادی دەولەتە، نەك حوکمڕانەکە چونکە لەوانەیە ئەو یەکێك بێت وەك (بیل کلینتۆن) کە خاوەنی هەلسوکەوتێکی بیٚ ئەخلاقانە بێت، بەلاٌم حوکمڕانی سیستەمێکی سیاسی باشە، واتە رەفتارەکانی ئەو حوکمڕانە کار ناکاتە سەر جۆری حوکمڕانییەکەی، ئەگەر هات و ئەو هەلسوکەوتەی کاریگەری لەسەر حوکمڕانییەکەی هەبوو ئەو کاتە کۆمەلگە دێتە ناوەوە و ئەو حوکمڕانە دەداتە دادگا و لەسەر کار لایدەدا ئەمە لەلایێك، لەلاییێکی تریشەوە ئەگەر دادگایی کراو لەسەر کار لادرا، سیستەمە سیاسیەکە هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە، چونکە بنیادی دەولەت هیچ کاتێك ناوەستێتە سەر کەسایەتی حوکمڕانەکەی، وەك ئەوەی ئەگەر فیرعەون بمریٚ سیستەمە سیاسیەکەش لە ناو دەچیٚ!

مەبەستمان لە سیستەمێکی سیاسی باش، ئەو سیستەمە دیموکراسیەیە کە پشت بە دوو پرەنسیپی سەرەکی دەبەستیٚ کە ئەمانەن: (أ) دەسەلاٌتی گەل لە دروستکردنی بڕیارەکاندا، (ب) یەکسانی مافەکان لەکاتی پیادەکردنی ئەو دەسەلاٌتەدا. ئەو سیستەمەیە کە بە شێوەییێکی یەکسان مامەلە لەگەلْ هەموو خەلکیدا دەکات، یان وەکو (جیٚرمی بنتام) کە هێرشیکردە سەر ئەو ئوروستۆکراتانەی کە باوەڕیان وابوو ژیانی هەندێك کەس لەژیانی کەسانیتر بە نرخترە و گوتی((هەر یەکێك یەکسانە بە یەك کەس نەك زیاتر)) خۆی کێشەکە لەوەدا نییە کە بەیەکسانی تەماشای خەلکی بکەیت، بەلکو دەبیٚ بەیەکسانی تەماشای بیرو راکانیشیان بکەیت، یان وەك (یۆربیدس) ی شاعیری یۆنانی دەلێ: (لە سەرمانە هیچ حیسابێکی تایبەت بۆ مولك ومالی خەلکی دانەنێین، چونکە دەنگی پیاوە هەژارەکانیش مافی هەمان دەسەلاٌتیان هەیە) بۆیە چەندی بوارەکانی رادەربڕین بۆ ئاراستەکردنی سیاسەت لە

---

چەند هۆکارێکی جیاواز، ڕێگە بە بلاٌوبوونەوەی ئەو جۆرە بیرۆکانە درابیٚ، بەلاٌم چۆن دەبیٚ بیرمەندە نوێییەکانمان.. ئەوانەی کە دواتر ناویان دێنین؟ بیرۆکەکانی ماوەردی و ئیبن ئەبی ڕەبیع و تەرتووشی و غەزالی دووبارە بکەنەوە و خەلکانێکی تریش دەبینین هەمان بیرۆکەیان هەیە، باشە ئەو ماوە دوورو درێژ و ئەو گەشەکردنە رۆشنبیری وکۆمەلاٌیەتی و سیاسییە زۆرەی کە روویان داوە هیچ ئیعتیبارێکی بۆ نەکراوە بۆ نموونە، بۆت هەیە بەکتێبەکەی د.محەمەد یوسف موسا (نظام الحکم في الاسلام) و د. ئەحمەد چەلەبی (السیاسة في الفکر الاسلامي)دا بچیتەوە...

بەردەم خەڵکیدا فراوانتر بێت، ئەگەری ئەوە زیاتر دەبێت کە ئەو سیاسەتە دەربڕی بەرژەوەندییەکان و جێ چاوی خەڵکی بێت وەك ئەو پەندەی دەڵێ: ((پینەدۆز پێڵاو دروست دەکات، بەڵام ئەو کەسەی کە لە پێی دەکا دەزانێ لە چ شوێنێکدا پێی دەگوشێ)) لێرەدا تەنها خەڵکە رەش و رووتەکەیە بە دەست سیاسەتی حکومەتەکەیانەوە دەتلێنەوە!.

لەوانەیە ئەو فەرمانڕەوایە پیاوێك بووبێت ئەخلاقی زۆر بووبێت، کەسێکی وەك مەنسوور پیاوێك بوو بە راستی گاڵتەی پێ نەدەکرا، چونکە زۆر کارامە بوو[35]: کۆشکەکەی مەنسوور هەرگیز نەیدەزانی رابواردن و شتی خراپ چییە، رۆژانە کارەکانی خۆی زۆر جوان ڕێك دەخست. چێشتەنگاوان تەماشای کاروبارەکانی رۆژانەی دەوڵەتی دەکرد و هەرچی بۆ خەڵکی چاکبوو ئەوی دەکرد. لە دوای نوێژی عەسریشدا لەگەل ماڵ ومنداڵەکەی خۆیدا دادەنیشت. دوای نوێژی شێوانیش تەماشای ئەو نووسراوانەی دەکرد، کە لە هەرێم وشوێنە دوورەکانەوە دەهاتن، لەگەڵ وەزیر و پیاوەکانی دەوڵەتدا پرسوڕای دەگۆڕییەوە، کە سێ لەسەر یەکی شەو تێدەپەڕی دیوەخانەکەی چۆڵ دەبوو، ئەو کاتە بۆ خەوتن دەچووە سەر جێگای نووستن و دوای تێپەڕبوونی دوو لەسەر سێی شەویش لەخەو هەڵدەستاو دەستنوێژی دەگرت و تا بەرەبەیان لە میحرابەکەی خۆیدا دادەنیشت و نوێژی دەکرد و دوای ئەوەش دەچووە مزگەوت و نوێژی بە خەڵکی دەکرد، و لە دوای ئەوەش دەڕۆیشتەوە دیوەخانەکەی خۆیی وکارەکانی خۆی وەك چەند رۆژە دەست پێدەکردەوە.[36]

ئایا شتێك هەیە لە کارەکانی رۆژانەی ئەو حوکمڕانە ئەخلاقبەرزە باشتر بێ؟ باشە دەبێ چ عەیبێکی لێ بگرین؟ وەڵامەکەی هەر زۆر ئاسانە: سیستەمی دەسەڵاتەکە و ئینجا کەسایەتی فەرمانڕەوا و ئەخلاقەکەی، دەسەڵات بەڕێوە دەبەن و هەموو دەسەڵاتەکانی ئیسلامیش بەم شێوەیە بووە، نەك بە یاسا بەڕێوە چووبێ. بۆیە مردنی خێرا چاوەڕێی ئەوکەسانەی دەکرد کە بەر هەڵستیان لە فەرمانەکانی بکردایە، و چەندین کارەسات و ماڵوێرانی بەسەریدا دەهێنا بۆ

---

٣٥ - وابزانم شتێکی وا لە بارەی ڕەفتارە ئەخلاقییەکانی عەبدولناسر (بەو مانایەی کە هەیە) کە لەکەداری بکات نەزاندراوە و نەشمزانیوە هیچ پێوەندییێکی لەگەڵ ژناندا هەبووبێ، بۆ نموونە وەك ئەوەی لە بارەی عەبدولحەکیم بلاّو بۆوە. لە گەڵ ئەوەشدا بە هەموو پێوەرەکان هەر دیکتاتۆرە.

٣٦- تەماشای ئەحمەد ئەمین (حی الاسلام) بەشی دووەم لـ٤٦ـــ، و ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (الطاغیة: دراسة فلسفیة لصور من الاستبداد السیاسي) کتێبخانەی مەدبوولی، چاپی سێیەم ساڵی١٩٩٧ لـ٢٥٤ـــ بکە.

نموونە: ((کۆنترین فەیلەسووفی سیاسی عەرەب (فارسی کوڕی وەڕاق) بوو، کە لە سەرەتاکانی سەردەمی مەنسووردا بە فەرمانی خەلیفە لە سەری درا، لەبەرئەوەی رەخنەی لە گەندەڵییەکانی باری سیاسی ئەو سەردەمە گرتبوو..))[37].

لەوانەیە (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) ئەو خەلیفە بەهێزە، کە دامەزرێنەری راستەقینەی دەوڵەتی ئەمەوی بوو، چەندین کاری نەمری هەبێ و لەوانەیە وەلیدی کوڕیشی کاری خێرخوازی زۆری کردبێ، ((ژنی بۆ هەتیوەکان دەهێنا و خەڵکی بۆ خەڵکانی پەککەوتە وکوێرەکان بە کرێ دەگرت بۆئەوەی خزمەتیان بکەن دەستیان رابکێشن [38]..)). بەڵام ئێمە ئەو (کارە خێرخوازیانەمان) ناوێ بەڵکو ئێمە یاسامان دەوێ بۆ رێکخستنی کاروبارەکانی خەڵکی و پارێزگاریکردن لە مافەکانیان، چونکە جیاوازییێکی گەلێ زۆر لەنێوان خێر پێکردن و یاسای دابینکردنی کۆمەڵایەتیدا هەیە، ئێمە ئەو یاسایەمان دەوێ کە مووچە بۆ بە ساڵاچوان دیاری بکات، نەك خێرخوازێك خێریان پێبکات. دەمانەوێ ئەو ئایەتە پیرۆزە بکرێتە یاسا (خذ من اموالهم صدقة، تطهرهم و تزكّيهم) واتە زەکات لەماڵەکانیان دەرکە تۆ بەم کارەت دەریان دەخەیت و پاکیان دەکەیتەوە) (١٠٣ التوبە)، دەوڵەت باج لە دەوڵەمەندەکان وەربگرێت بەپێی یاسا لە(دابینکردنی تەندروستی) و دابینکردنە کۆمەڵایەتییەکان و مووچەی بەساڵاچواندا خەرج بکات...هتد. نەك پرسەکە بۆ هەواو هەوەسی خێرخوازێك بەجێ بهێڵێ! بۆ کەسانی کەم دەرامەت و پێویست، ئەگەر یاسا بیداتێ هەزار جار باشترە لەوەی،، کە مرۆڤێکی وەك خۆی خێری پێبکات وا لەو کەسە بکات هەست بە لاوازی وکەمی بکات و هەستیان بریندار بێ و هەست بە زەلیلی و تێکشکان بکات. بەڵام یاسا (Abstract.) شتێکی گشتیە بۆ هەمووان وەك یەکە، چونکە یاسا (مافەکان) دەپارێزێ، وەك مافی موڵکدارێتی و مافی ژیان و مافی ئازادی...و هتد هاولاتیان مافی خۆیانە ژیانێکی سەربەرزانە بژین، لێرەدا یاسا جۆربەجۆرەکانی دابینکردنی کۆمەڵایەتی، ئەو شتانەیان بۆ دەستەبەر دەکات.

---

٣٧ ئەحمەد بن ئەلدایە (الفلسفة السياسية عند العرب ) پێشکەشکردن و لێکۆلینەوەی د.عومەر ئەلمالکی، ئەلشەریکەلوەتەنییە بۆ بلاوکردنەوە و دابەش کردن، جەزایر ساڵی ١٩٧١.

٣٨ تەماشای کتێبی (الطاغية) ی من بکە لـــ ٢٤٨ـــ چاپی سێیەم.

**بەڵام بیرۆکەی دووەم:** حوکمڕانیکردنە لە ڕێگەی چەمکە ئەخلاقییەکانەوە، ئەمەش ئەو حومکمڕانییە نییە کە پێی خۆشحاڵبین، یان هەوڵی بۆ بدەین، چونکە لەلایێك ئەمە نەزانینە و لەلاییێکی تریشەوە ساویلکەییێکی گەورەیە، چونکە بە هەر پێوەرێك بیپێوی تەماشا دەکەی کارەساتێکە بۆخۆی، لەبەر ئەوەی ئەو فەرمانڕەوایە یەکسەر دەبێتە فەرمانڕەواییێکی زۆردار بەسەر خەڵکیەوە. چەمکە ئەخلاقییەکان، ئەگەر نەگۆڕدرێن نەکرێنە چەند یاساییێکی سیاسی جێگیر و یاسا حوکمی کۆمەڵ نەکات بە ئارەزووی ئەو کەسە دەبێت و تاکەکان بە هەوەسی خۆیان دەیگۆڕن و بەکاری دەهێنن و ناوەڕۆکەکەی بە تاڵ دەکەنەوە و دەسەڵاتێکی تاکەکەسی پڕ لە زوڵم و زۆرداری دێتە ئاراوە و خەڵکی بەرەو زیندانەکان ڕاپێچ دەکرێن، ئەگەر بۆ پەتی سێدارەکانیان نەبەن!.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە هیگڵ شۆڕشەکەی فەڕەنسا وا لێکدەداتەوە کە بۆتە شۆڕشێکی تیرۆریستی، چونکە ئەم شۆڕشە چەند دروشمێکی ئەخلاقیانەی زۆر جوان و ماقوولی لە بارەی ئازادی و یەکسانی و برایەتی بەرز کردبۆوە، بەڵام نەیتوانی ئەو دروشمانە بکاتە چەند یاساییێك و پیادەیان بکات بەڵکو هەر وەك چەمکێکی ئەخلاقی مانەوە، ئەنجامەکەشی ئەوە بوو: شۆڕشەکە بووە شۆڕشێکی تیرۆریست. ((بارودۆخەکەش لە فەڕەنسا بەرەو ئارامی نەچوو: لەبەرئەوەی ئازادی و یەکسانی و برایەتییەکە نەخرانە بواری جێبەجێ کردنەوە، بەڵکو هەر لە بازنە تیۆریەکەیاندا مانەوە و تەنها وەك دروشمێك بەرز کرابوونەوە بێئەوەی هیچ ناوەڕۆکێکیان هەبێ)).[39] دوای ڕاگەیاندنەکەی ١/ئابی/١٧٨٩ کە مافەکانی مرۆڤی تێدا خرابووە ڕوو: کە خەڵکی بە ئازادی لە دایك دەبن و لە مافەکاندا یەکسانن. وەك مافی موڵکدارێتی و ئازادی و ئاسایش و نەتەوە سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە...و هتد. تاکیش لە پیادەکردنی ئازادییەکاندا نابێ زیان بەوانیتر بگەیێنێ و ئازادی گۆڕینەوەی بیروڕا و بۆچوونەکان بەرزترین مافەکانی مرۆڤن... هتد ئەمانە هیچیان جێبەجێ نەکران[40]. دوای ئەوەی دەستووریان دانا و پاشا پێی

---

٣٩- تۆ تێبینی ئەوە بکە کە ئەمە لەساڵی ١٩٥٢دا لە شۆڕشەکەی میسردا ڕوویاندا، کاتێك کە چەند دروشمێکی ئەخلاقیانەی بەرزی هەڵگرتبوو، بەڵام لە ناوەڕۆکدا بەتاڵ کرابۆوە هەروەها بەرەو تیرۆریستیش گۆڕابوو.

٤٠- (هیگل والثورة الفرنسیة) لە کتێبەکەی ئێمەدا(المنهج الجدلی عند هیگل) لـ٩٦ـ کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦.

رازی بوو — بەڵام ئەم دەستووره کاری پێنەکرا — ئەمە لایەنە رووکەشە پراکتیکیەکەی ئەو ویست و ئارەزووانە بوو کە هیگڵ ناوی نابوو ((ئازادیە نەرێنییەکان)) کە هەر شتێك لەڕووی بوەستیتەوە تەنانەت ئەو دام و دەزگایانەی کە خۆشیان دایدەمەزرێنن، تێکیدەشکێنن و بۆ لەناو بردنیان لە هیچ شتێك ناسڵەمێنەوە، چونکە نایانەوێ کەس سنوور بۆ ویست و ئارەزووەکانیان دابنێ[41]

لێرەدا ((تاکە یاسای باڵادەست، یاسای قەناعەت پێهێنانە ئەمەش هەڵوێستی خودی تاك خۆیەتی، ئێمە نە دەتوانین بزانین ئەو قەناعەتە چیە نە دەشتوانین حوکمی لەسەر بدەین تەنها لە رێگەی قەناعەت پێهێنانەوە نەبێ))[42]. بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی یاسای گومان، چونکە ئەگەر تەنها بیرۆکە ئەخلاقییەکان و باوەڕپێکردن لە پێوەندییەکانی نێوان حوکمڕان و خەڵکیدا باڵادەست بوون. ئەوەندەی پێناچێ دەگۆڕێن، خەڵکی باوەڕیان لەسەر ئەو حوکمڕانە نامێنێ. بۆیە دەبینین لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشەکاندا ئەگەر چەمکە ئەخلاقییەکان زۆر بەکار بهێندرێن، دەبینین بە زۆری باسی (باوەڕ) و (پاکی) و (بێگەردی شۆڕشگێڕانە و (شوورەیی)...و هتد دەکرێ. هەر هەموو ئەم چەمکانە زۆر بە خێرایی و بەئاسانی بە پێچەوانەوە بەرەو خراپی هەڵدەگەڕێنەوە..هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە زۆر جار دەبینین وەزیرەکان و ئەوانەی دەسەڵات بەڕێوە دەبەن لە شەو و رۆژێکدا لە کونجی زیندانەکاندا دەیانبینییەوە.. هتد، بەڵام لە حاڵەتی شۆڕشەکەی فەڕەنسادا، بەرەو قەسابخانەکەی (جیلۆتین) راپێچیان دەکردن. گومان هەموو شوێنێکی گرتبۆوە و ببووە دەسەڵاتێکی تۆقێنەر و پاشای بەرەو

41 - ئەمەشیان بە ڕوونی لەو ڕێکخستنە سیاسییەی، کە شۆڕشی میسری لە ساڵی ١٩٥٢دا دروستی کردبوو دەردەکەوێ : وەك دەستەی نووسەران و ئینجا یەکێتی نەتەوەیی و یەکێتی سۆسیالیستی و دوای ئەویش یەکێتی سۆسیالیستی هەموار کراو، هەروەها مینبەرەکان و حیزبە مام ناوەندەکان... هتد. ئەمە سەرەڕای بڵاوکراوەکان و جاڕنامەی مافی مرۆڤی میسری، کە هیچ کام لە (فەلسەفەکانی شۆڕش) تا دەگاتە (بەڵێننامەکان) و (بەیاننامەکەی ٣٠ مارس) و کاری شۆڕشگێڕانە دەستی پێکرد.. و هتد، ئەمانە هیچیان نەهاتنەدی. ئەمە جگە لە دەرکردنی کۆمەڵێك دەستووری زۆریش . د.ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (المنهج الجدلی عند هیگل) کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦ لـ٩٦ـ.

42- (اصول فلسفة الحق) وەرگێڕانی ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ١٩٩٧ لـ١١٠-١١١ـ.

قەسابخانە پەلكێش كرد. رۆبسبیر بێخەوشی بە پرەنسیپێكی بەهادار دادەنا. دەتوانین بڵێین: ئەو بێخەوشی بە پرسێكی زۆر جیددی دادەنا، بێخەوشی و تۆقاندن هەردووكیان ببوونە سیستەمێكی رۆژانە، چونكە ئەو (بێخەوشی تاكەكەس)ەی كە لەسەر قەناعەت پێهێنان دروست دەبێ زوڵم و زۆرێكی زۆر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ، چونكە بێئەوەی بۆ بنەما یاساییەكان بگەڕێتەوە دەسەڵاتەكانی خۆی جێبەجێ دەكات. بۆیە سەرەڕای بوونی دەستووریش دەبینین گومان و نائارامی پەرەی سەندبوو، تارادەیێك كە دانتۆن ێرژێچا كە ئەو كاتە وەزیری داد بوو لە ٢٨/مارسی/١٧٩١ داوای كرد ئەو دەسەڵاتەی بدرێتێ ماڵەكانی پاریس (بپشكنن) بۆ گەڕان بە دوای دوژمنەكانی شۆڕشدا. بەم شێوەیە سێ رۆژ دوای ئەو داوایە بە هەزاران كەس لەوانەی كە گومانیان لێدەكرا دەستگیر كران!.

كەواتە دەبێ بەباشی ئاگاداری ئەوە بین، كە دەسەڵاتی دەوڵەت شتێكە و پێوەندیە ئەخلاقییەكانی تاكیش لەنێوان خۆیاندا شتێكی دیكەیە و لەگەڵ یەكتردا جیاوازییێكی زۆریان هەیە، لە فەلسەفەی دەسەڵاتدا هیچ بوارێك بۆ (برادەرایەتی) و (متمانە) و (خۆشەویستی) یان بڵێین (تا مردن تۆ دەكەین بە سەرۆك)! یان (تا دونیا ماوە دەنگ بەتۆ دەدەین) بوونی نییە، ئەمانە هەر هەموویان هەڵەن، چونكە ئەوەی فەرمانڕەوا بە خەڵكەوە دەبەستێتەوە یاسایە كە بەسەر هەموو خەڵكیدا وەك یەك جێبەجێ دەكرێ هەر لە ترۆپكی دەسەڵاتەوە تا دەگاتە پیاوانی سەر شەقام و ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت بەڕێوە دەبات یاسایە نەك پێوەندیە كەسایەتییەكان، (هەروەها نابێ هەواو هەوەسەكانی فەرمانڕەوا) یان (هەست و سۆزەكانی فەرمانڕەوا) كارییگەریان لەسەر دەسەڵاتدا هەبێ، كاتێك دەبینین سەرۆكێك فەرمان دەدات (فلانە نەخۆش لەسەر بوودجەی دەوڵەت چارەسەر بكرێ بەراستی ئەمە شتێكی (زۆر نابەجێیە) زۆر لەوە دەچێ كە (ئەمیری باوەڕداران) سەد هەزار دینار بە خێر بداتە شاعیرێك لەبەر ئەوەی پێیداهەڵگوتووە!، بۆیە پێویستە یاسایێك هەبێ بڵێ هاوڵاتییێكی نەخۆشی بەم شێوەیە هەیە مافی خۆیەتی لەسەر بوودجەی دەوڵەت چارەسەر بكرێت و ئەگەر لە ناو وڵات چارەسەر نەكرا لەسەر بوودجەی دەوڵەت بنێردرێتە دەرەوەی وڵات بۆ چارەسەركردن.. بەم شێوەیە یاسا و پرەنسیپە گشتییەكان حوكم لەسەر هەموو حاڵەتەكان دەكەن، ئەی باشە دەبێ گوناحی ئەو نەخۆشە چیبێ كە ناتوانێ دەنگی خۆی بگەیێنێتە ئەو فەرمانڕەوایە یان هیچ واسیتەییێكی نەبێ یان شەرم لە خۆی بكات پەنا بباتە بەر رێگای پێچ و پەنا...و هتد؟! بۆیە باشترین شت ئەوەیە یاسا گشتییەكانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت كارا بكرێن.

**بەڵام بیرۆکەی سێیەم:** کە پێویستە خوێنەر لە هزری خۆیدا بیهێڵێتەوە لەوانەیە ئەم پرسیارە گرنگە بوروژێنێ: ئایا ئەمانە هەموو ئەو شتانەن کە پێوەندییەکانی نێوان (ئەخلاق) و (سیاسەت) بنبڕدەکەن و لێکیان جیادەکەنەوە؟ دەتەوێ بڵێی دوای ئەو لێك جیاکردنەوەیە هیچ پێوەندییێك لە نێوانیاندا نامێنێ..؟ لە وەڵامدا دەڵێم نەخێر من لە هیچ کاتێکدا نەم گوتووە ئەم دوو بوارە بە تەواوی لە یەك جیا دەبنەوە بە شێوەیێك کە نێوانیان ئەوەندە دووربێ بە زەحمەت بتوانین لێی بپەڕینەوە، بەڵام تێڕوانینی ڕاست ئەوەیە کە بۆ یەکەم جار (ئەخلاق) لە ڕێڕەوی کۆمەڵگاکاندا دەردەکەوێ و لەگەڵ چنینەکانی داب و نەریت و داب و نەریتی کۆمەڵگاکاندا تێکەڵ دەبێ، وەك کۆمەڵگە سەرەتاییەکان وکۆمەڵگە خێڵەکییەکان، کە دواتر دێینە سەری. دوای ئەوە جیاوازییەکان و لێکترازان لەنێوانیاندا سەر هەڵدەدەن و چەمکە ئەخلاقییەکان دەبنە خەرمانێك و سیاسەت بیرۆکەکانی خۆی لێ هەڵدەچنێ، بۆ نموونە بیرۆکەی دادپەروەری خۆی بیرۆکەیێکی ئەخلاقیانەیە و ئەفلاتون لە کتێبی (کۆماری ئەفلاتون)دا گەورەترین گفتوگۆ و توێژینەوەی بۆ تەرخان کردووە، بۆ ئەوەی لەیەك کاتدا ئەم بابەتە هەم لەلای تاك و هەم لەلای کۆمەڵدا چارەسەر بکات. هەروەها بیرۆکەی (یەکسانی) و (ئازادی) و (برایەتی) و...هتد، چەند بیرۆکەیێکی ئەخلاقین. سیاسەتیش دێ لەو خەرمانە ئەخلاقیەدا کام بیرۆکەی کە ئەو پێویستی پێیەتی لێی هەڵدەهێنجێ و یاساڕێژی دەکات مەبەستم ئەوەیە، کە بۆ بەڕێوەبردنی پێوەندییەکانی نێوان خەڵك و حکومەت دەیانکاتە یاسا. هەروەها (ئەمانەتیش) لە چوارچێوەی چەند یاسایێکدا ڕێکدەخا بۆ پاراستنی موڵك وماڵی خەڵکی، نەك بە شێوە ئەخلاقیەکەی خۆی بمێنێتەوە و پشت بە ویژدانی تاکە کەسێك ببەستێ.

**بیرۆکەی چوارەم:** ـ ئەگەر ئێمە ئەو سیستەمە ڕەت بکەینەوە کە لە دروستکردنیدا پشت بە فەرمانڕەوا و ئەخلاق دەبەستێ و بە پێی چەمکە ئەخلاقییەکان حوکم دەکات، یان وەك ئەوەی فەرمانڕەوا پشت بەو چەمکە دەبەستێ کە پێی دەڵێن ((شوانێکی چاکە)) و خاوەن ئەخلاقێکی بەرزە. کە ئەمەش بیرکردنەوەییێکی زۆر خراپە. یەکەم: لەبەرئەوەی ئەو دەسەڵاتە دەبێتە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری تۆقێنەر. دووەم: لەبەرئەوەی ئەو فەرمانڕەوایە مافەکانی خەڵکی دەدزێت، لە سەرووی هەمووشیانەوە مافی هەڵبژاردنی فەرمانڕەواییێکی گونجاو کە بتوانێ لە دەسەڵات دایگرێتە خوارەوە ئەگەر دەرکەوت گەندەڵە، هەروەها داگیرکردنی مافی دارشتنی ئەو یاسایانەش کە بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی خۆیان دایدەڕێژن...هتد. ئەمەمان بە دەسەڵاتێکی دیموکراسی گۆڕیەوە، کە لەلاییێك لە دەرکردنی بڕیارەکاندا پشت بە

دەسەڵاتەکانی یاسادانان دەبەستێ و لەلایێکی ترەوە لەکاتی پیادەکردنی ئەو دەسەڵاتەدا ڕەچاوی یەکسانی دەکات لە مافەکاندا.

پێش ئێستا ئێمە هەر هەموو ئەمانەمان بە کورتی خستبووە روو، بەڵام ئەو پرسیارەی کە لەم حاڵەتەدا دەوروژێنرێ ئەوەیە، ئایا دەسەڵاتی دیموکراسی— واتە دەسەڵاتی گەل و سەروەری یاسا- پێویستی بە گەلێکی رۆشنبیر و خوێندەوار نییە؟ (جۆن ستیوارت میلێ -ﻠ.ێپ ﺪﺪﺨﺖ)ی (١٨٠٦-١٨٧٣) کە فەیلەسووفێکی لیبرالی سەدەی نۆزدەمە وای بۆ دەچێ کە لە حاڵەتی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی دیموکراسیدا، گەل پێویستی بە ئاستێکی بەرز و پێشکەوتووی شارستانییەت دەبێ. هەر لێرەوە دەڵێ: (وڵاتانی رۆژهەڵات —وڵاتە دواکەوتووەکان بەگشتی- نەگەیشتوونەتە ئەو رادەیەی کە بتوانن حوکمی خۆیان بگێڕن، چونکە ئەوان هێشتا لە خانەی پێنەگەیشتواندان (منداڵ)، ((کە لەوانەیە هێشتا گەل خۆی بە منداڵ بزانێ)) و پێویستی بە دەسەڵاتێکی رەها و پێگەیشتوو و رووناکیبەخش هەیە تا بەڕێوەیان ببات). ئەو وای بە باش دەزانێ، کە ئەو دەسەڵاتە دەبێ بەدەس وڵاتانی رۆژئاواوە بێت. هەموو بیرمەندەکانی سەردەمی رۆشنگەری بەمشێوە رەگەزپەرستیە دەدوان. هەر چەندە بوونی گەلێکی رۆشنبیر سوودێکی زۆری بۆ دیموکراسی هەیە، لە بەرئەوەی هەوڵی ئەوە دەدات بۆشاییەکانی نێوان دەسەڵات و جەماوەر کەمتر بکاتەوە، چونکە هیچ نیشانەیێك ناتوانێ بڵێ نەبوونی کلتورێك، وا لەگەل دەکات نەتوانێ گفتوگۆ لەسەر ئەو کێشانە بکات کە لەلای ئەو گرنگە تا لێیان تێبگات، یان دەستی لە بەرپرسیارێتی کاروبارە تایبەتییەکانی خۆیدا هەبێ و لە کاتی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە بارەی مێژووی دەسەڵاتە رەهاکاندا دەکرێ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە دەسەڵاتی زۆرداری دەتوانێ هەموو شتێك بێت، تەنها ناتوانێ وەك رێنیشاندەرێکی خەڵکی بێت.[43]

لە کتێبێکمدا بەناونیشانی (الطاغية) پێشتر گفتوگۆیەکمان لەبارەی بیرۆکەی ستەمکارییەکانی رووناکیبەخش، یان دادپەروەر، یان زۆردارێکی چاك و خێرخواز [44]...هتد

---

٤٣ - دێڤید بیتهام وکیفی بۆیلی :(مدخل الى الديمقراطية) وەرگێڕانی ئەحمەد ڕەمۆ، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی کلتوری سووریا ساڵی ١٩٩٧ لــ٤٢و٤٣ــ.

٤٤ -کتێبەکەی من (الطاغية: دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي) چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٧ لــ١١١ــــ و دوای ئەو.

کردووە و گوتوومانە ئەمانە شتی (پڕوو پووچن) و هەرگیز نایەنەدی، چونکە هەر لە بنەڕەتدا ئەمانە بریتین لە چەند بیرۆکەییێکی مەنتقی دژ بەیەك، لەبەرئەوەی ستەمکاری خۆی توندوتیژی لەخۆیدا دەگریٚ، بۆیە چۆن دەکریٚ دادپەروەر بیٚ؟ فریدریکی گەورە، گەورەترین نموونەی ئەو (ستەمکارە دادپەروەر)ە بوو، ئەو وا بیری دەکردەوە، کە گەیشتۆتە لووتکە ئەو کاتەی کە گوتی (خۆم و گەلەکەم گەیشتوینەتە ریٚکەوتنیٚك کە هەمووما‌ن لەسەری رازین: کە ئەوان هەرچی دەڵیٚن با بیلیٚن و ئەوەی منیش حەزم لیٚبیٚ دەیکەم:- بەڵام دەبیٚ ئەوە بزانین کە ئەم ئازادیە هەرگیز کاملٚ نەبووە، فردریکی گەورە هەرچەندی پیٚگەی دەسەڵاتی بەهیٚزتر دەبوو ئەوەندە رەخنەگرتن لە کاروبارەکانی جەنگ یان مەراسیمەکانی باجی زیاتر قەدەغە دەکرد، کاتیٚك یەکیٚك لە راویٚژکارەکانی فردریك پیٚشی لە یەکیٚك لە کارەکانی گرت و گوتی ((ئەمە کاریکی بیٚئەخلاقیە)) لە وەڵامدا فردریك پیٚی گوت: هیچ کاتیٚك ئەخلاق لە بەردەم پاشاکاندا ریٚگر نەبووە[٤٥].

تۆ تەماشاکە بزانە چۆن ((پاشای چاك)) لە چاوتروکانیٚکدا بەرەوخراپی هەڵدەگەڕیٚتەوە، هۆیەکەشی ئەوەیە، کە ئەخلاق و بیٚخەوشی تەنها تایبەتە بە خودی کەسەکە خۆی هەر کاتیٚك بگۆڕیٚ دەگۆڕیٚ، سەرەڕای ئەمەش ئەخلاق وەك لاستیك وایە و بەپیٚی میزاجی خۆی لیٚکیدەداتەوە، لە بەرئەوەی سوپاییٚکی بەهیٚز لەبەر دەستدایە، بۆیە داگیرکردنی ماڵی جیران و خەڵکانیتر و غەدر لیٚکردنیان بەکاریٚکی ئەخلاق بەرزی دەزانن.

بەڵام ئەو وتەیەی، کە دەڵیٚ: لە کۆمەڵگایەك ئەگەر زۆربەی هاولاٚتییەکانی نەخویٚندەوار و نارۆشنبیر بن ناکریٚ دیموکراسی تیٚدا پیادە بکریٚ و پەنا ببردریٚتە بەر سەروەری یاسا، وەك پیٚشتریش لە کتیٚبی (الطاغیة) دا گفتوگۆمان لەسەر کردبوو، لیٚرەدا بەرپەرچی هەندیٚك لەو بەرهەڵستکارانەمان دەدەینەوە لەمەشدا پشت بە چوار بەڵگەی بنەڕەتی دەبەستین. یەکەمیان: دیموکراسیەت خۆی لەخۆیدا مومارەسەکردنە و گەلیش لە هەڵەکانی خۆی فیٚردەبیٚ، بۆیە دەبیٚ بچیٚتە ناو ئەو ئەزموونەوە، تا ئەو شارەزاییەی تیٚدا پەیدا بکات، کە بتوانیٚ دەسەڵاتیٚکی دیموکراسی دروست بنیاد بنیٚ. دووەم: خەڵکی ئەسینا، کە یەکەمجار لەویٚوە کاروانی دیموکراسی دەستی پیٚ کردووە، خویٚندەوار نەبوون؟ و کلتوریش نەبوون؟ بەڵام مافە سیاسییەکانی خۆیان دەزانی ئەمەش داواکارییٚکی بنچینەییە بۆ چەسپاندنی دیموکراسی و سیٚیەم: دەتواندریٚ هەمان

---

٤٥- هەمان سەرچاوەی پیٚشوو لـ١١٣ـ.

شت لەبارەی خەڵكی (ماگناكارتا) بگوترێ كە لە دژی پاشا جۆن، یان پاشا یۆحەننا شۆڕشیان كرد و توانیان ئەو بەڵگەنامە گرنگەی پێ مۆر بكەن. هەروەها هەمان شت لەبارەی خەڵكی پاریس بڵێ، كە شۆڕشی فەڕەنسایان بەرپاكرد و چوارەمیش: كاكڵەی ئەو كارانەی كە بۆ چەسپاندنی دیموكراسی پێویستە، هۆشیاری سیاسییە، كە ئەمەیان تەنانەت لەلای خوێندەوارەكانیشمان بوونی نییە. ئەمەش وامان لێدەكات ئێمە بەئاسانی دەستبەرداری ئەو دەسكەوتانە بین، كە تائیستا بەدەستمان هێناوە، بۆیە پێویست بەوە دەكات بیرمەندو رۆشنبیرەكانمان هەوڵەكانی خۆیان دووبەرابەر بخەنە كار بۆ گەشەپێدانی ئەو چەمكە، وەك ئەوەی (رۆسۆ) و (ڤۆڵتێر) و (مۆنتسكیۆ) و زانا فەڕەنسییەكان لە كۆتاییەكانی سەدەی هەژدەمدا كردیان.

**بیرۆكەی پێنجەم:** - وشەی (سیاسەت) بە دوو مانا دەوترێ: یەكەمیان سیاسەتی ناوەخۆیە لە بنیادی دەوڵەتدا، دووەمیشیان سیاسەتی دەرەوەیە لە پێوەندییەكانی ئەو وڵاتە بە وڵاتانی ترەوە. ئێستا پرسیارەكەمان ئەوەیە: ئێمە لەم دوو واتایەدا مەبەستمان كامیانە؟! وەڵامەكەی روون و ئاشكرایە، كە ئێمە لەسەرەتای ئەم كتێبەوە باس لە سیاسەتی ناوەخۆ دەكەین، مەبەستم بنیادی دەوڵەتە یان رێكخستنەوەی سیاسییانەی كۆمەڵگەیە بەو شێوەیەی، كە پێی دەڵێن دەوڵەت، كە ئەویش لە یاسادا بەرجەستە بووە. كێشەكەی ئێمە ئەو پێوەندییەیە كە لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا هەیە لەو سیستەمە ناوخۆییەدا.

لەم كتێبەدا ئەوەندە مەبەستمان پێوەندییەكانی نێوان وڵاتان نییە، چونكە ئێمە باس لە بنیادی دەوڵەت دەكەین، لەم كتێبەدا كە ناونیشانە لاوەكیەكەی (توێژینەوەی فەلسەفەی دەسەڵاتە) ـ واتە توێژینەوەی ئەو شێوازەیە، كە پێویستە دەسەڵاتێكی راستەقینەی لەسەر بنیاد بندرێ، بەو مانایەی، كە چۆن سیاسەت ئەوەی بە كەڵكە لە چەمكە ئەخلاقییەكان بیخاتە چوارچێوەی یاساوە، بۆئەوەی ببێتە چەند یاسایێك و خەڵكی پێ بەڕێوەببات و پارێزگاری لە ژیانیان بكات و چاودێری مافەكانیانی پێبكات، لێرەدا ئەخلاق وەك منارەییێك وایە كە لەژیاندا رێگاكانی خۆمانی پێ دەسنیشان دەكەین، بەڵام سیاسەتی دەرەوە و پێوەندییەكانی نێوان وڵاتان، لەبنچینەدا لەسەر چەند بەرژەوەندییێك پێكهاتووە، هەر دەوڵەتێك لەلای خۆیەوە هەوڵدەدات بگاتە بەرژەوەندیە تایبەتییەكانی خۆی، ئەگەر بەرژەوەندییەكانیش یەك نەگرنەوە ئەوا شەڕو ناكۆكی لەنێوانیاندا دروست دەبێ، لەم پێوەندیانەدا هیچ بوارێك بۆ ئەخلاق جێگای نابێتەوە، بۆیە (هیگڵ) دەڵێ: شەڕ دادگای مێژووە. وینستۆن چەرچڵ ئەو

سەرۆك وەزیرانە بەناوبانگەی بەریتانیا دەیگوت: ((بۆ بەرژەوەندییەكانی بەریتانیا ئەوەندەم تاوان ئەنجام داوە، ئەگەر بێتو لە ناوەوەی ولآتدا ئەنجامم بدابایە ئەوە سەرجەم ژیانی خۆم لە بەندیخانەكاندا بە سەر دەبرد)). ئەمەش نموونەیێكی روونە كە لەپێوەندیە نێودەوڵەتییەكاندا ئەخلاق بە تەواوەتی بوونی نییە، ئەمەش لە كۆتایی بەشی ((ئەخلاق.... و سیاسەت لە كۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا)) بە روونی بە دی دەكرێ.

لەگەڵ ئەوەی ولآتان هەر لە سەردەمە كۆنەكانەوە هەوڵی ئەوەیان داوە كە چەند یاساییێك بۆ رێكخستنی پێوەندییەكانی نێوان ولآتان و چاودێریكردنی پرەنسیپەكانی دادپەروەری و هاوسەنگی نێوانیان دابڕێژن. بۆیە رۆمانەكان شتێكیان بەناوی (یاسای گەلان — ژس پ ێس‌خژیٚحب) دارِشت ئەو یاسایە مەبەستی رێكخستنی پێوەندییەكانی نێوان رۆما و ولآتان وگەلانی تر بوو. ئینجا دوای ئەوە ئایینی مەسیحی هات بۆ ئەوەی چەند هەنگاوێك كاروانی ئاشتی بەرەو پێشتر ببات و مزگێنی (خۆشگوزەرانی) بۆ خەڵكی و ئاشتی بۆ جیهان را بگەیێنی. هەروەها ئیسلامیش كاتێك داوای لە خەڵكی كرد ((أدخلوا في السلم كافة)) (البقرة -٢٠٨) واتە هەر هەمووتان بچنە ریزی ئاشتیەوە، وای كرد بیرمەندەكان لە هەوڵ وكۆششی خۆیاندا بەردەوام بوون بۆ ئەوەی چەند یاساییێك دابنێن تا پێوەندییەكانی نێوان ولآتانی پێ رێك بخەن، بەڵام هیچ كام لەمانە سەركەوتوو نەبوون. هۆیەكەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، یاسا بۆ ئەوەی جێبەجێبكرێ پێویستی بە هێز هەیە، رێك وەك ئەوەی لە ناوخۆی ولآتەكاندا پیادە دەكرێ، بەڵام هێزێكی نێونەتەوەیی نییە تا بتوانێ ئەو یاسایانە جێبەجێبكات.[٤٦] تەنانەت دوای هاتنەكایەی كۆمەڵەی نەتەوەكان (عصبة الامم) لە ساڵی ١٩١٩دا و نەتەوەیەكگرتووەكانیش لە ساڵی ١٩٤٥دا نەتواندرا جێبەجێبكرێ و هیچ یەكێك لەوانە نەیتوانی ئەو خەونە بێنێتە دی: تا یاسا نێودەوڵەتییەكان بەشێوەیێكی یەكسان بەسەر ولآتاندا بسەپێنێ و چاودێری بكات، وەك ئەوەی هەر ولآتێك بەرامبەر بە هاولآتیانی خۆیاندا دەیكەن. تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ پێوەندیە نێودەوڵەتییەكان، بەرژەوەندییە خۆپەرستییەكان بە سەریدا زاڵە و ئەو كەسەی كە دەڵێ ولآتان دۆستایەتی، یان پێوەندییێكی باش و بێ بەرژەوەندی- بە زۆری ئابوورییەكان — لەنێوانیاندا هەیە بە هەڵەدا چووە، چونكە لەو كاتەوەی ولآتە

٤٦ - ئەگەر ئەو هێزەش بوونی هەبێ، بێگومان لە خزمەتی بەرژەوەندییەكانی ولآتە زلهێزەكاندا دەبێ كە هیچ هێزێك ناتوانێ رِێیان پێبگرێ.

یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆتە پۆلیسێکی نێودەوڵەتی، هەرچی دەیکات تەنها بە دیهێنانی ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیەتی، هەر چەندە خۆی دەڵێ من ویستەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی جێبەجێ دەکەم، بۆیە دەبینین بە چەندین پێوانەی زۆر و جۆراوجۆر و بەپێی ئەو بارو دۆخەی کە تێیدایە پێوانەی دەکات.

هەر چەندە بوونی چەند حاڵەتێکی کەمی گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان لە دادگا نێودەوڵەتییەکاندا، بۆ چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتییەکان، سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، بەڵام شێوازە گشتییەکانی پێوەندیە نێودەوڵەتییەکان لە ناوەڕۆکدا تا ئیستاشی لەگەڵدا بێ لە جەوهەردا ئەخلاقیانەیە وەك لەکۆتایی ئەم کتێبەدا دەیبینین.

**بیرۆکەی شەشەم:** دەڵێ: (ئەو حوکمڕانە ئەخلاقیە، مەبەستم ئەو حوکمڕانەیە، یان ئەو پاشا بێخەوشە (الفاضل)، یان ئەو شوانە چاکەیە[٤٧]، زۆر جاریش بە (باوك)، یان (براگەورە)ی هەموو تاکەکانی گەل، یان ((خودان بنەماڵە))، یان گەورەی بنەماڵە ناو دەبرێ، کە لەکاتی حوکمڕانییەکەیدا پشت بە چەمکەکانی ئەخلاق دەبەستێ). لەسەردەمی نوێشدا سەرۆك ئەنوەر سادات هەمان ئەو جۆرە نازناوانەی بە خۆی دەبەخشی و بەمجۆرە

٤٧ - ئەگەر ڕێگە بە کەسایەتییێکی وەك (مەسیح) بدرێ، کە بەخۆی بڵێ(شوان)ە و هاتووە چاودێری بەرخە سەرلێشێواوەکانی ئیسرائیل دەکات، ئەمە لەبەرئەوەیە کە پێغەمبەرە و هاتووە ڕێگای ڕاست بە سەرلێشێواوەکان پێشان بدات و پیاوخراپ و ئەوانەی لەڕێگا لایان داوە بیان هێنێتەوە سەر ڕێگای ڕاست...هتد. بەڵام حوکمڕان نابێ خۆی وەك ئەو دا بنێ و خەڵکیش نابێ بەو چاوە سەیری بکەن، چونکە ئەو بە هەڵبژاردنی خەڵکی دەسەڵاتی وەرگرتووە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانیان و بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکان و پاراستنی مافەکانیان هاتووە نەك ڕێگایان پێ پێشان بدات. دەسەڵاتیش لە هەموو حاڵەتەکاندا هەر بۆ ئەو خەلکە دەمێنێتەوە، دەسەڵات دەسەڵاتی گەلە، وەك ئاشکراشە نەتەوە سەرچاوەی هەر هەموو دەسەڵاتەکانە، و خەڵکی مافی خۆیەتی ئەگەر لە ڕێگە لایدا لە دەسەڵات دایبگرێ، چونکە ئەوان هەڵەکانی ئەو ڕاست دەکەنەوە نەك بە پێچەوانەوە و هەر ئەوانیش چاودێری کارەکانی دەکەن و لەسەر هەڵەکانی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکەن. ئەو وەك سەرۆك نە لە سەرووی یاسایە و نە بێ کەموکوڕیە و نە فریشتەشە تا هیچ هەڵەیەك نەکات. لێرەدا (فارابی) بە هەڵەدا چووە کە دەڵێ : دەکرێ (پێغەمبەرێك ) ببێتە سەرۆکی دەوڵەت، چونکە پێغەمبەر ڕێ نیشادەرە نەك حوکمڕان، ئەو هاتووە بەخششەکانی (مکارم) ئەخلاق تەواو بکات، بۆیە لێرەدا پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ :(ئەمە پێغەمبەرایەتیە نەك موڵکداریێتی).!.

نازناوە سەیرانەش هەستی بە شانازییێکی زۆر گەورە دەکرد! سەرچاوەی سەیرو سەمەرەکانیش لێرەدا تێکەڵکردنێکی روونی ئەخلاق و سیاسەتە. لەوانەیە یەکێك لە نووسەرەکان مەبەستی ئەوە بووبێ کاتێك دەنووسێ و دەڵێ: ((ئێمە ئەوە رەت دەکەینەوە، کە ناوی گەورەی ماڵ لە سەرۆك کۆمار بنێین، چونکە ئەم بۆچوونە سەرەرای ئەوەی دژی دەستوورە، ئەوەمان بۆ دەردەخا کە هاولاتیان نابێ هیچ راییێکی ئەو رەت بکەنەوە، چونکە نابێ قسەکانی خودان خێزان رەت بکرێتەوە، ئەگەر راستیشی تێدا نەبێ، لەبەرئەوەی رێزگرتنی وەك ئەرك وایە، و تاکەکانی خێزان بۆیان نییە لە فەرمانەکانی ئەو دەربچن، یان ئامۆژگاری بکەن))..[48].لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا زۆرێك لە حوکمڕانەکان شانازی بەوەوە دەکەن کە پێیان بڵێی باوکی میللەتن، خەڵکیش بەجۆرە نازناوانە هەڵدەخەڵەتێن، کاتێك چاوەڕوانی خێرو خۆشی لەو جۆرە سەرکردانە دەکەن!. هەندێك سەرکردەش هەن نازناوی (کاك فلان) بۆ خۆیان دادەنێن ((بێگومان ئەمەش هەر ناونانێکی ئەخلاقیانەیە) و کاتێك کە یەکێك پێیان دەڵێ (سەرۆك) تووڕە دەبن و بە توندی هەڵدەچن، وەك ئەوەی لە بەر پرسیارێتی رابکەن و خۆیان لە کێشەکان بدزنەوە لەژێر پەردەی ئەو(برایەتییە) ئەخلاقیەدا! ئەمانەش هەر هەمووی وشەبازی و سووکایەتی کردنە بە ئەقڵی خەڵکی.!!

مامۆستاکەمان دکتۆر زەکی نەجیب مەحموود دەڵێ: (ئێمە ناتوانین ئەو نازناوانەی کە سەرۆك سادات بۆ خۆی دادەنێ قبووڵی بکەین) بۆ نموونە وەك دەڵێ: ((من برا گەورەی بنەماڵەی میسریم))، یان ((خودان خێزانی میسرم))، یان دەڵێ ((هاولاتیان منداڵی منن)). ئەگەر ئێمە گوتمان سەرۆك کۆمار لە پاڵ پلەکەی خۆیدا لە جێگای باوکیشە لەناو خێزانی میسریدا، و هاولاتیانیش منداڵی ئەون، دەبینین ئەو جۆرە نازناو و راو بۆچوونانە لە یەك کاتدا دوو رەگەزی دژ بەیەك لە خۆ دەگرن، کە یەکەمیان: ئەوەیە ئەگەر سەرۆك بێ و ئەو شتانەی جێبەجێنەکردوە کە بۆی هەڵبژێردرابوو، ئەوە ئەو کەسانەی کە هەڵیان بژاردووە دەتوانن لە پلەو پایەکەی بیهێننە خوارەوە. رەگەزی دووەم: ئەگەر باوکیش بێ ئەمەیان ناتواندرێ لە کارەکەی بهێندرێتە خوارەوە بە حوکمی ئەوەی باوکە، وەك هەموو باوکێك لەناو خێزانەکەی خۆیدا.[49]

---

٤٨ - د.حلمی موراد،(جريدة الشعب ) قاهیرە رۆژی ١٩٨٠/١٠/٧.

٤٩ -د-زەکی نەجیب مەحموود (في تحديث الثقافة العربية ) لـ٢٠٨ـــ دار لشروق لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٧.

دەبێ ئاگاداری لایەکەی تری وێناکە بین ئەویش وەسفکردنی کۆمەڵگەیە بە یەك (خێزان)، ئەم ناو نانەش زۆر دەوترێتەوە، هەندێکیش چەپڵەی بۆ لێدەدەن لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیەکی زۆر گەورەیە، چونکە چەمکی (خێزان) چەمکێکی ئەخلاقیانەیە نەك سیاسیانە، خێزان دامەزراوەیێکە ئەندامەکانی بە کۆمەڵێك چەمکی ئەخلاقیانە بەیەکەوە دەبەسترێنەوە، وەك ئەو ئەرکانەی کە پێوەندیەکانی نێوانیان رێك دەخات هیچ (یاساییێك) حوکمیان ناکات وەك ئەوەی لە دەوڵەتدا هەیە. بۆیە ناکرێ بگوترێ ئێمە هەموومان (یەك خێزانین) یان ((خێزانیێکی گەورەین)) و یەك بیرو را کۆمان دەکاتەوە، چونکە بوونی جیاوازی لە بیروڕاکاندا دەبێتە ((پلانیێك)) و مەبەستی تێکدانی ئەو یەکێتیە و لەیەك هەڵوەشاندنەوەی نەتەوە دەبێ لەناو ئەو خێزانەدا! بەم شێوەیە دەبینین ئەوانەی بیروڕای جیاوازیان هەیە لەچاوتروکانێکدا دەبنە پیلانگێڕو دوژمنی نیشتمان کە دەستی بێگانەیان لە پشتە![50]

ئێمە لە وڵاتەکەماندا لەو گەمە سیاسیانە بێزار بووینە، کاتێك کە بێ ئەوەی ئەو شتانە بخەنە چوارچێوەییێکی یاساییەوە چەمکە ئەخلاقییەکانی وەك بیرۆکەی (باوك)، یان (برا)کاك، یان ((یەك خێزان)) مان بۆ دەگوازنەوە، بۆ ئەوەی لە مەیدانی سیاسەتدا بتوانن بە هەوەسی خۆیان یاری پێبکەن و هەندێك جاریش چەمکە ئاینییەکان بەکار دێنن، مەبەستیشیان لەم کارانە ختوکەدانی هەست و نەستی خەڵکیە و گەمەکردنە بە هەست و سۆزیان کە بەم چەمکە ئەخلاقیانە دەیبزوێنن و ساویلکەکانی پێ هەڵدەخەڵەتێنن بێ ئەوەی ئاگاداری ئەوە بن کە ئەمانە چەند بیرۆکەییێکی سەرەتایین و لەسەردەمی هۆزگەرێتیشدا هەر هەبووە، کە ئاغای هۆزەکە لە جیاتی باوك و برا گەورە و خودان خێزان بووە، هۆزەکەش ئەو خێزانە بووە کە ئەو سەرپەرشتی کردووە، بگرە هەر بۆ خۆشی لەناو ئەو خێزانەدا گەشەی کردووە و گەورە بووە، ئەو کۆمەڵگایەی کە حوکمڕانەکە خۆی تیایدا بە باوك یان خودان خێزان داناوە یان کۆمەڵگاکە خۆی، خۆی بە خێزانێك دابنێ و (یەك را کۆیان بکاتەوە، بێگومان ئەو کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی دواکەوتووە و پێشکەوتوونییە، چونکە (یەکڕایی) وەك برتراند رسل دەڵێ: (ئەمە نیشانەی

---

٥٠ - لە وتارێکدا بە ناونیشانی (ما لە وما علیە) ئەم بابەتەمان بە دوورو درێژی چارەسەر کردووە، گۆڤاری (سطور) ژمارە/ ٩ی ئۆگەستی ١٩٩٧.

دواکەوتنی کۆمەڵگەیە و بەپێی کۆمەڵێك بیروباوەڕی کۆن دەژین).[51] بۆیە تۆ ئەم زاراوە (عەرەبیانە)، یان رۆژهەڵاتیانە لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا نابینی بەکاربهێندرێ، هیچ کاتێك گوێمان لێ نەبووە لە کۆمەڵگەی ئینگلیزیدا بە (تاچەر) بڵێن (دایکی ئینگلیز) ئەو خۆیشی ئەو جورئەتە ناکات ئەو قسەیە بکات ـ و نەشمان بیستووە (چەرچڵ) یان (دیگۆل) یان (کارتەر) یان (بۆش)...هتد بە خۆیان یان بە خەڵکانی تر بڵێن (باوکی ئینگلیز) یان گەورەی خێزانە فەڕەنسیەکە یان ئەمریکیەکە، تەنها خۆمان رۆژهەڵاتییەکان خاوەنی ئەم (داهێنانەین) ئەمەش نیشانەیێکە لە دواکەوتوویی کۆمەڵگە و مۆرکێکی بنچینەییە لە مۆرکەکانی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان.[52]

بۆیە نابێ لەوە سەرسام بین کە (ئەحمەد بەهادین) لە یاداشتەکانی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە: (رۆژێك چۆتە لای سادات بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵدا بکات و داوای لێ بکات چەند گۆڕانکارییێك لە دەستووردا بکات، سادات پێی گوتبوو (ئەحمەد گوێ بگرە: من بۆ بەرێوەبردنی دەسەڵات لە میسردا پێویستیم بە دەستوور نییە، من و عەبدولناسر دواهەمینی فیرعەونەکانین.. لەوانەیە ئەوەی لە دوای من دەسەڵات دەگرێتە دەست پێویستی بە دەستوور هەبێ، بەڵام ئەحمەد، من پێویستم بە دەستوور نییە!).

ئەو ساداتەی کە لەسەرەتای کارەکەیدا وەك سەرۆك کۆمار پشووی کۆتایی هەفتەکانی لە گوندی (میت ابو الکرم) دا بە سەر دەبرد، کە شوێنی لە دایکبوونی خۆی بوو، هەمان ئەو ساداتە لەدوا رۆژەکانی ژیانیدا بیری لەوە دەکردەوە کە جل و بەرگی فیرعەونەکان لەبەر بکات و سواری پەیتوونەییێك بێ کە لەشێوەی پەیتوونەکانی سەردەمی فیرعەونەکان بێت و پێی بچێتە سەردانی(هەرەمەکان و ئەبولهۆل)! وەك پاشا فیرعەونییەکان لەشێوەی تاوس رێی دەکرد!!.

**بیرۆکەی حەوتەم:** ئەو بیرۆکە بنچینەییانەی، کە پێویستە بەباشی ئاگاداریان بین، ئەو هەڵانەن، کە نووسەرە سیاسییەکانمان دەیوروژێنن، ئەویش ئەو (ئامۆژگاریە بە نرخانەن) کە

---

٥١- برتراند رسل.(حکمه الغرب) بەشی دووەم. وەرگێڕانی د- فوئاد زەکەریا (سلسلة عالم المعرفة) ژمارە/٧٢ی دیسەمبەری /١٩٨٣ لـ ـ٢٠ـ.

٥٢ - هەروەها لەگەڵ ئەم وتارەمدا بە ناونیشانی (سید موبوتو..حاکما بأمرالله) رۆژنامەی (الوفد) سێ شەممە ١٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٧بەراورد بکە.

نووسەرەکانمان ئاراستەی فەرمانڕەواکانی دەکەن، هەر وەك ئەوەی، کە ئیمام غەزالی لە سەردەمی خۆی، لەکتێبی (التبر المسبوك)دا نووسیبوی، کە ڕۆژی حیساب بە بیری فەرمانڕەواکان دێنێتەوە، وەك ئەوەی ڕۆژێك دێ دەبێ لە بەردەم بارەگای خودای مەزندا رابوەستێ ولەبارەی ڕەعیەت ونەخۆش وپەککەوتەو بە سالاچوەکان. هەروەها لەبارەی مالی موسلمان و ئەو کۆشك و تەلارانەی دروستی کردوون و ئەو زیادە خەرجی و رابواردنانەی کە کردوویەتی...و هتد لیێ پێچینەوەی لەگەڵدا بکرێ. یان هەندێکیان پەنا دەبەنە بەر هەست و سۆزی فەرمانڕەوا بۆ ئەوەی ویژدانی بجوولێنن، بەشێوەییێك بیر دەکەنەوە کە: لە کاتێکدا ئەگەر گەل پاڵەپەستۆی برسێتی و ڕەشوڕوتی و دەردەداری تەنگی پێهەڵچنیبوو، نابێ فەرمانڕەوا بیر لە حەسانەوە و خەوتنی ناو جێگای گەرم و نەرم بکاتەوە، لە کاتێکدا میللەت کە خۆی خاوەنی راستەقینەی هەموو شتەکانە لەناو کەلاوە و سەرجادەکاندا بخەون، موڵك وماڵ و ئەلماس و زێڕو زیوێکی زۆریش لای فەرمانڕەوا کەڵەکە کرابن [٥٣]. باشە دەبێ زەرەری چی بێت ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایە وەك باوکێکی میهرەبان بە بەزەییەوە تەماشای خەڵکەکەی خۆی بکات و دەستی خێریان بۆ درێژ بکات، نەك وەکو قەسابێك بێت کە تەنها لەخەمی فرۆشتنی گۆشت و خوریەکەی خۆیدا بێت..؟.[٥٤]

لە راستیدا ئەگەر ئێمە بمانەوێ قسە لەسەر فەرمانڕەواییێکی زۆردار و ستەمکار بکەین، و بڵێین ئێمە دەیدەینە دەست خوا بۆ ئەوەی مافەکانمان لەو فەرمانڕەوایە وەربگرێتەوە، ئەمە مانای ئەوەیە ئێمە کارێکی زۆر مەترسیدارمان ئەنجامداوە، چونکە لەمەدا تەنها یەك ئەنجاممان دەست دەکەوێ، ئەویش ئەوەیە کە خودا ئەو دەسەڵاتە رەهایەی داوەتە فەرمانڕەوا، نەك خەڵکی، یان گەل ئەو دەسەڵاتەی پێدابێ، بۆیە لەو کاتەدا ئەو فەرمانڕەوایە لە بەرامبەر هیچ کەسێکدا بەر پرسیار نابێ، بەڵکو تەنها لە بەردەم خوادا بەرپرسیار دەبێ[٥٥]. ئەوەی

---

٥٣- وتارەکەی مامۆستا جەمال بەدەوی لەبارەی لەناوچوونی (مۆبۆتۆ) زۆردارەکەی زائیر بە ناونیشانی (چارەنووسی زۆردارێك) کە لە ڕۆژی سێشەممەی ٩-ی دیسەمبەری ١٩٩٧ لە ڕۆژنامەی (الوفد)دا بلاو ببۆوە بەراوردی بکە.

٥٤ - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥٥ - بۆ یەك چرکەش چیە گومانم لەوەدا نییە کە ئەگەر بێتو هەر فەرمانڕەواییێکی زۆردار گوێبیستی ئەوە ببێ کە لەسەردونیا هیچ لێپێچینەوەییێکی لەگەڵدا ناکرێ تەنها ڕۆژی قیامەت نەبێ لە خۆشیا هەڵدەپەڕێ.

راستی بێ بیرمەندە موسڵمانەکان، ئەو کەسانەی وتاریان لەبارەی دەسەڵات دەنووسی، یان دەخوێندەوە وایان شیدەکردەوە، گوایە بەڕێوەبردنی دەسەڵات و ئەو خەڵکەی کە لە ژێردەستیاندایە راسپاردەییێکن خوا لە ئەستۆی فەرمانڕەواکانی داناوە، ئەگەر ئاگای لێیانبێ و بیانپارێزێ ئەو فەرمانڕەوایە خوا لێی خۆشدەبێت و دەچێتە بەهەشت، ئەگەر واش نەکات ئەوە خوا سزای دەدات و دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە. لە سەردەمە ناوەندییەکان، سیستەمی دەسەڵاتدارێتیدا بیرکردنەوە ئەخلاقیە ئاینییەکان لە هەمبەر بیرۆکە سیاسییەکان بەمشێوەیە بوو بێ ئەوەی هیچ (مافێکی سروشتی) بدرێتە خەڵکی، کە ئەگەر فەرمانڕەوا ئەو مافانە پێشێل بکات ئەوان بتوانن لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکەن. ئێستاش با بە یەکەوە گوێ بۆ ئەم چیرۆکەی خوارەوە بگرین:

((ئەبوو موسلیمی خۆراسانی، کە لە معاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان چووە ژوورەوە، پێی گوت: سڵاوت لێ بێ ئەی کرێکار. دارودەستەکەی گوتیان بڵێ ئەی ئەمیر. گوتی: سڵاوت لێبێ ئەی کرێکار، گوتیان بڵێ ئەی ئەمیر. بۆ جاری سێیەمیش هەمان شتی دووبارە کردەوە. دوای گوتی: تۆ کرێکاری خودای، چونکە خوا تۆی بۆ ئەم مەڕانە بە کرێگرتووە تا چاوت لێیان بێت. ئەگەر تۆ دڵی هەژارەکانیت خۆش کرد[٥٦] و نەخۆشەکانیت چارەسەر کرد و لە گەورەوە تا بچووکیانت بەسەر کردەوە، ئەوکاتە خوداکەت کرێیەکەیت دەداتێ. ئەگەر نەتوانی

---

ئەمە سەرەڕای ئەوەی پێداگری کردن لەسەر لێپرسینەوەی قیامەت خەڵکی تووشی خراپییێکی کوشندە دەکات، چونکە خەڵکی گرنگی بەوە دەدات، کە لەسەر دونیا زیندانی بکرێ ئەگەر بۆ چەند ساڵێکیش بێت، نەك لە ڕۆژی قیامەت سزایەکی توند بدرێ لەسەر ئەو کارانەی کە کردوویەتی، چونکە خەڵکی گرنگی بەوە نادەن کە ئەو فەرمانڕەوایە هەتا هەتایێ لە ئاگردا دەسوتێ، یان نا ! لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە هەمان ئەو یاسایەی کە بە سەر خەڵکیدا دەسەپێ بەسەر ئەویشدا بسەپێ. باشە دەبێ فەرمانڕەوای زۆردار چی لەوە باشتری بوێ لە گەلەکەی کە (تا ڕۆژی حیساب واتە قیامەت وازی لێ بێنن ؟ ئایا لەو دونیا لەبەر دەم بارەگای خودادا ڕاناوەستێ وکارو کردەوەکانی بە تەرازوێکی زۆر هەستیار ناپێون و لەسەر رەفتارەکانی حیسابێکی توندی لەگەڵدا ناکەن !؟ ئایا ئەمە سزاییێکی توند نییە... و هتد ؟ ئەوەی ڕاستی بێ ئەم جۆرە وتارانە لە لاییێك دەبنە پاڵپشتێك بۆ دەسەڵاتی زۆرداری و لە لاییێکی تریشەوە دەبێتە هۆی پەراوێزخستنی خەڵکی، ودوورخستنەوەیان لەوەی کە لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکەن.

٥٦ - مەبەستی ئەوەیە هەژارەکانی گەلەکەی تێر بکات.

هەژارەکانیان دڵخۆش بکەیت و نەخۆشەکانیان تیمار بکەیت، هەموویان بەسەر بکەیتەوە، ئاغا گەورەکەت کە خودایە سزات دەدات)). چونکە لێپێچینەوە لەبەردەم (دادگای خودادا) ناکرێ ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایە لەلایەن خوداوە ئەو دەسەڵاتەی پێ نەدرابێ کە خودا ئەو فەرمانڕەوایەی بە کرێ گرتووە بۆ چاودێریکردنی (ئەو مەڕانە) ئەمجۆرە بۆچوونانە تا ئیستاش لەلای فەرمانڕەواکانماندا هەر ماوە و بەردەوامە: ئەوان (شوان)، و ئێمەش (مەڕ)، ئەوان رامیارن (واتە مەیتەر)، ئێمەش ئەو وڵاغەین، کە پێویستی بەو دارەیە کە بە دەستی مەیتەرەکەوەیە.

ئەوەی راستی بێ ئەمجۆرە تێڕامانانە هەرگیز بە کەڵکی رابەرایەتیکردنی وڵاتانی ئێستا نایێت، ئەگەرچی ئەو ئامۆژگاریانە لەوانەیە سوودی بۆ ئەو سەرۆك هۆزە هەبێ، کە ئێواران تاکەکانی ناو هۆزەکەی خۆی کۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی ناکۆکییەکانیان چارەسەر بکات، بەڵام دەوڵەتە نوێییەکان لە رێگەی ئەو یاسایانەوە بەڕێوەدەچن، کە خەڵکی خۆیان بۆ خۆیانی دایدەڕێژن، ئازادییە راستەقینەکان لێرەدا بەرجەستە دەبن، من بۆ خۆم ئازادم گوێڕایەڵی ئەو یاسایانەش دەبم کە خۆم بۆخۆمی دادەڕێژم: (ئەمەش مانای سەربەخۆبوونی راستەقینەی ویست و ئارەزووەکان دەسەلمێنێ کە (کانت. Kant) پێی دەڵێ: Autonomy))، یان ئەو ئەنجومەنەی کە خۆم هەڵمبژاردووە لە جیاتی من دایدەڕێژێ.

**بیرۆکەی هەشتەم:** ئەگەر یەکێك (ئاینپەروەر) بێ، یان نا، ئینجا ئەوکەسە (فەرمانڕەوا بێ، یان نا) ئەمە کێشەی تاکە کەسێکە و پێوەندی بە خودی کەسەکەوە هەیە. چونکە تەنها کەسەکە لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێ لەسەر ئەو کارەی کە ئەنجامی داوە، تەنها ئەو کەسەیە بە ئاگر سزا دەدرێ یان بە بەهەشت پاداشت دەکرێ. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئاینپەروەری تەنها کێشەی خودی تاکە کەسێکە و شتێکی (باتنی)یە وکەس نازانێ چۆنە تەنها خواو کەسەکە خۆی نەبێ ئەویش وەك ئەخلاق وایە، لەوانەیە ئەو ئاین پەروەرییە تەنها شتێکی رووکەش بێت و ئەو خاوەن ئەخلاقەش کەسێکی تەڵەکەباز بێت (لەشێوەی ئاینپەروەر خۆی پیشانی خەڵکی بدات)، بەڵام ئەوەی لەلای من ولای هەر مرۆڤێکی تری هاوڵاتی گرنگ بێت رەفتارە دەرەکییەکانی ئەو فەرمارڕەوایەیە، کە رەفتارەکانی ئەویش بچێتە ژێر باری هەمان ئەو یاسایانەی کە من دەچمە ژێر بارییەوە. ئەوەی زانراویشە یاسا تەنها لەسەر نیاز، یان بۆچوونی (نییەت) خەڵکی لێپێچینەوە لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکات، بەڵکو لەسەر ئەو کردەوانەی کە لە جیهانی دەورووبەریدا بە کردەوە ئەنجامیان دەدا لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێ. ئەم بابەتە لە

بەشی داهاتوودا، کە دێینە سەر باسی تایبەتمەندییەکانی (ئەخلاق.. و سیاسەت) دەگەڕێینەوە سەری و باسی دەکەین.

لەوانەیە یەکێك ڕەخنە لەوە بگرێت و بڵێ: باشە ئەگەر هات و ئەو فەرمانڕەوایە ئەخلاقێکی بەرزی هەبوو و ئاینپەروەریش بوو، سەرەڕای ئەوەش گوێڕایەڵی هەموو ئەو یاسایانەش بوو، کە خەڵکی بە گشتی گوێڕایەڵی دەبن؟. لە وەڵامدا دەڵێین: ئەمە بۆ خەڵکی دەبێتە خێرو بەرەکەت، بەڵام بە مەرجێك لەکاتی فەرمانڕەوایەتیکردنیدا ئەم دوو سیفەتە هەر هەموو تواناکانی ئەو کەسە داگیر نەکات، یان ئەو دوو سیفەتە نەبێتە مەرجێك بۆ وەرگرتنی جڵەوی دەسەڵات.[57] بۆ نموونە ئیستا ((مام عەلی دەرگاوان)) پیاوێکی چاك و بە ئەدەب و ئاینپەروەرو بە ئەخلاقە، بەڵام بە کەڵکی ئەوە نایێت فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتێك بکات. ئەمەیان بەشێکی وەڵامەکەیە، بەڵام بەشی دووەمی وەڵامەکە، وەك ئەو فەرمانڕەوایەیە، کە ئەگەر هەبێ پێی دەڵێن: ((فەرمانڕەواییێکی نموونەیی)) کە کەسایەتی ئەخلاق بەرزو پیاو چاك و ئاینپەروەرە لەلایەکی تریشەوە گوێڕایەڵی ئەویاسایانەیە کە ئەنجومەنی نوێنەران دەری دەکات، ئەو جۆرە کەسایەتیانە تەنها لە کتێبەکاندا دەیانخوێنینەوەو هیچی تر، بەڵام وەك حەقیقەت بوونیان نییە، لەکاتێکدا ئەو واقیعە پراکتیکیەی کە مێژوو بۆمانی دەگێڕێتەوە شتێکی زۆر جیاوازترە.. لە مێژووی کۆندا: ئەبوموسای ئەشعەری پیاوێکی بێ خەوش و خواپەرست و ئاینپەروەر بوو و هەموومەرجەکانی دادوەری تێدا بوو. عومەری کوڕی خەتاب کردی بە دادوەر و لە کارەکانیشی دڵنیا بوو، بەڵام ئایا ئەو تایبەتمەندیە ئەخلاقی و ئاینییە بەسە بۆ ئەوەی یەکێك ببێتە پیاوی دەوڵەت، یان

---

[57] - لویسی شازدەیەم کە لە ساڵی ١٧٧٤دا چووە سەر عەرشی فەڕەنسا، هەموو ڕەفتارە ئەخلاقییەکانی تێدا بەدی دەکرا، دەست پاك، وقسە خۆش بوو، زەوقێکی جوانیشی هەبوو، بەڵام لە توانایدا نەبوو فەرمانڕەوایەتی بکات، چونکە سروشت لە بیرتیژی و هزرێکی روون و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان و هەستی قۆستنەوەی هەل و دەرفەتەکان و کارکردنی بە جددی و بەردەوامبوون لەکارەکاندا، کە ئەمانە لە خەسڵەتەکانی پیاوی دەوڵەتن، بێ بەشی کردبوو. (بۆیە لەجیاتی ئەوەی خۆی ڕووداوەکان ئاراستە بکات، ئەو خۆی دابوە دەست شەپۆلەکانی قەدەر و یارییان پێدەکرد) ئەمەش ئەو مانایە دەگەیێنێ کە سیفەتەکانی (پیاوی دەوڵەت ) جیاوازە لە (کەسێکی خاوەن ئەخلاق و باوەڕ). ه.أ.ل. فیشەر (تاریخ أوروبا في العصر الحديث) وەرگێڕانی ئەحمەد نەجیب هاشم، وديع الضبع دار ئەلمەعاریف لە میسر ساڵی ١٩٤٦ لـ٧ـــ.

تەنانەت سیاسەتمەدارێکیش؟ ئەمەیان مێژوو بە نەخێر وەڵاممان دەداتەوە، وەك لە رۆژی ناو بژیوانیکردنەکەی کە ئەبوموسای ئەشعەری ئەو پیاوە خاوەن ئەخلاقە، رووبەڕووی عومەری کوڕی عاسی سیاسەتمەدار بۆوە، ئەنجامەکەشی زانراوە کەچی بوو!. لە مێژووی نوێشماندا دەتوانی جیاوازی لەنێوان ئەحمەد عورابی ئەو پیاوە چاك و ئاینپەروەر و ئەخلاق بەرزەی کە دوای ئەوەی باوەڕی بە بەڵێنەکانی ئینگلیز کرد و شەوێکی بە نوێژکردن و پاڕانەوە لەخوا لەگەڵ سەربازەکانیدا بەسەر برد ئینجا شەڕەکەی دۆڕاند و میسر بووە موستەعمەرەییێکی بەریتانی، لەگەڵ محەمەد عەلی پاشای گەورەدا بەراوردی بکەیت کە ئەو رۆژە بە بۆنەی سەفەرکردنی ئیبراهیمی کوڕیەوە کە بە سوپا سالاری سوپایێك بۆ سعوودیە دەچوو هەرچی (مەمالیك) هەیە- کە تا دوێنێ دوژمنی بوون — بۆ داوەتێکی گەورە بانگهێشتی کردن — کە مەمالیکەکان کەوتنە ئەو داوەی کە لە مێژوودا بە (قەسابخانەکەی قەڵا) ناسراوە پێگەی حکومەت و وڵاتەکەی خۆی پێجێگیرتر کرد، بەمشێوەیە محەمەد عەلی بە زیرەکی و چاپوکی خۆی، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو بێ ئەخلاقیەشی کرد، وڵاتەکەی خۆی پاراست.

**بیرۆکەی نۆیەم:** ئێستا بۆ هەڵبژاردنی فەرمانڕەوای نوێ، وەك سەرۆك کۆمار، پێویست بەو مەرجانە ناکات کە (ماوەردی) و کەسانی دی لە (حوکمە سولتانییەکان)دا باسیان کردبوو [٥٨]، وەك: هەستەکانی چاو وگوێ و زمان ساغ و پاراو بن بۆ ئەوەی شتەکان باش هەست پێ بکات، و ئەندامەکانی لەشی ساغ بن وکەموکوڕیان تێدا نەبێ کە لە جموجۆڵی کەم کاتەوە و نەتوانێ بەخێرایی هەڵسێتەوە سەرپێ..و هتد، بۆ ئەوەی خەڵکی لێی رازیبن، لەو سەردەمەی ئەوسادا فەرمانڕەوای باش دەبووایە ئەو خەسڵەتانەی تێدا با، وەك ئەوەی سەردەمەکە بەسەریدا سەپاندبوون و کۆمەڵگای ئەوساش وای پێویست بوو، چونکە فەرمانڕەوا بە هەموولایێکدا دەڕۆیشت و دەبووایە سواری ئەسپێك بێ و بەپێش سوپاکەی بکەوێ و خۆی بەشداری شەڕەکان بکات...هتد. ئەو جۆرە مەرجانە لە سەرۆکی ئێستادا بە پێویست نازاندرێن، چونکە شەڕەکان لە ریگای (کۆمپیوتەرەوە) بەڕێوە دەچن! لەوانەیە (ژێر دەریایێك) لە توانایدا هەیە لەژێر دەریاوە مووشەکێك ئاراستەی فڕۆکەیێك بکات و لە ئاسمان بیخاتە خوارەوە و پاپۆڕە جەنگییە گەورەکان و فڕۆکە هەڵگرەکان (باریجە) دەتوانن لە دووریێکی زۆر دوورەوە مووشەکەکانیان تێ بگرن و لەوانەیە بگاتە هەزاران (میل) و نیشانەکانی خۆشی زۆر

---

٥٨ - لە بەشێکی تایبەت بە خۆی، بە دوور و درێژی باسی دەکەین.

به وردی بپێکێ. خەڵکی سەر شەقام ئەمانە هەر هەمووی دەزانن، سەرەڕای ئەم هەموو شتەش هێشتا هەندێك لە نووسەرە نوێخوازەکانمان داکۆکییێکی زۆر سەیر لەو مەرجانە دەکەن، کە ((ئیسلام بۆ فەرمانڕەوا، یان سەرۆك دایناوە))، کە ئاینی ئیسلام زۆر دوورە لەو قسانەی ئەوان دەیکەن! ئەوەی راستی بێ (ماوەردی) و (ئیبن خەلدوون) و (تەرتووشی) و (غەزالی)...و هتد بەپێی ئەو سەردەمەی ئەوانی تێدابوون ئەو مەرجانەیان داناوە و دەڵێن دەبێ فەرمانڕەوا چەند سیفەتێکی وای تێدا بێ. خۆی ئەم بیرۆکانە زادەی سەردەمەکانی خۆیانن — نەك بیرۆکەی ئاینی ئیسلام بن — لە بەشەکانی دادێ بە درێژی گفتوگۆ لەسەر ئەم بابەتە دەکەین [59]، بەڵام ئەوەندە بەسە کە پەنجە بۆ هەندێك لەو بۆچوونە سەیرانەی وتەکانی هەندێك لەو نووسەرانە رابکێشین. دکتۆر محەمەد یوسف موسا، بێ یەك و دوو دەڵێ: ((ئیسلام ئەوە نازانێ کە کاتێکی دیاری کراو بۆ خەلیفایەتی کردن دەسنیشان بکات بۆ ئەوەی خەلیفە کاروبارەکانی نەتەوەکەی تێدا بەڕێوەببات و ئینجا دوای ئەوە لە دەسەڵات بێتە خوارێ و یەکێکی تر لە رێگەی هەڵبژاردنەوە بێ، یان بەهەر رێگەییێکی ترەوە بێ و ببێتە خەلیفە، بەڵام ئەوە دەزانێ کە خەلیفە چەند ئەرکێکی لە سەر شانە و دەبێ جێبەجێیان بکات و لە دەسەڵات بمێنیتەوە و بەرپرسیارێتیەکەی خۆی لە ئەستۆ بگرێ لەبەرئەوەی بۆ ئەو کارە باشە و توانای بە سەریدا دەشکێ، ئەگەر بە درێژایی ژیانیشی تێیدا بمێنێتەوە شتێکی ئاساییە، ئەمە باوەڕی ئیسلامە و بڕیاری لە سەر داوە، کە خێرو بەرەکەتێکی گەورەیە بۆ نەتەوەی ئیسلام [60].

دکتۆر ئەحمەد چەلەبی پێیوایە، کە (ئەوەی نوێخوازەکان دایانهێناوە ئیسلام باوەڕی پێی نییە کە ئەگەر سەرۆك نەیتوانی کارەکانی خۆی ئەنجام بدات سەرۆکێکی تر لە جێگەی خۆی دابنێ. هەروەها ئیسلام باوەڕی بەوەش نییە کە هیچ جێگرێك بۆ سەرۆك دابندرێ، کە جێگرێك بێت تا سەرۆك لە ژیاندا مابێ ئەو هیچ دەسەڵاتێکی نەبێ و نەتوانێ بە هیچ کارێك هەڵسێ ئەگەر بە راسپاردەی سەرۆك نەبێ، کە ئەویش لە چوارچێوەییێکی دیاریکراودا

---

٥٩ - دەتوانی لە کتێبی (نظام الحكم في الاسلام) کە دار ئەلکیتاب ئەلعەرەبی بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها لە کتیبی (السياسة في الفكر الاسلامي ) ی دکتۆر ئەحمەد چەلەبیدا بچیتەوە : چاپی شەشەم، کتێبخانەی نەهزەی میسری ساڵی ١٩٩١ لە قاهیرە دەری کردووە، بە قسەکانی دکتۆر محەمەد یوسف موسا دا بچۆوە.

٦٠ - دکتۆر محەمەد یوسف موسا (نظام الحكم في الاسلام ) لـ١٤٦ـ.

دەبێ))[٦١]. چەلەبی ((هانا دەباتە بەر هەموو سەرۆکەکان وگەلانی جیهانی ئیسلامی لەوە ئاگاداریان دەکاتەوە، کە لە دەسنیشانکردنی سەرۆك و ماوەی سەرۆکایەتیەکەیدا بۆ بیری ئیسلامی بگەڕێنەوە)) — بە رای ئێوە دەبێ ئەو ماوەیە چەند بێ؟ بێگومان وەك ئەوە نییە کە پیشتر بینیمان کە دەڵێ دەبێ ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی بە درێژایی تەمەنی فەرمانڕەواکە بێ: (بەڵام ئەو دەڵێ دەبێ چوارساڵ بێ و بۆ یەك جاریش نوێ بکرێتەوە)[٦٢]. ئەگەرچی ئیسلام باوەڕی بە بیرۆکەی یەکەم بوو و دانی پێداناوە کە دەڵێ: (دەبێ فەرمانڕەوا بە درێژایی تەمەنی لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە) و ئەمەش دەبێتە خێرو بەرەکەت بۆ نەتەوەی ئیسلام!.

ئەمانە دوو مامۆستای زۆر بەڕێزن ڕێزی تایبەتیمان بۆیان هەیە، چەند شتێك دەنووسن کە زۆر لە یەکتر جیاوازن و هەردووکیشیان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ئەمە باوەڕی ئیسلامە و ئەو بڕیاری لە سەر داوە. من نازانم لە بەرچی بیرمەندە ئیسلامییەکان ئەم جۆرەشتانە بە ناوی ئیسلامەوە دەنووسن، بۆ بە ناوی خۆیانەوە نایینووسن، تاوەکو خەڵکی ساویلکە پێی نەخەڵەتێ و وابزانن ئەمە (بیروڕای ئیسلامە) — و نەتوانێ هیچ گفتوگۆیێکی لەسەر بکات، چونکە ئەمە دەبێتە کوفرو لادان لە ڕێی ڕاست.

لە کاتێکدا ئەو شتانەی ئەوان بە ناوی ئیسلامەوە دەیلێن هەر هەمووی بیروڕای خودی خۆیانە هەر لە ئیبن ئەبی ڕەبیعەوە بیگرە تا دەگاتە فارابی و ماوەردی و غەزالی و تەنانەت نووسەرە نوێییەکانیش...و هتد، بۆیە گفتوگۆ کردن لەبارەیانەوە وەك ئەرکێك وایە بۆ گەشە پێدان و پێشخستنی هزر و ئەندێشەی مرۆڤ، لەبەر گرنگی بیرۆکەکە دوایی دەگەڕێینەوە سەری.

**بیرۆکەی دەیەم:** ئێمە نامانەوێ ئەو سەرۆکانەی ئێستامان ئەم خەسڵەتانەیان تێدا بێت کە تا ئێستاش هەندێك لە نووسەرەکانمان هەمان ئەو ـ خەسڵەتە ئەخلاقیانە ـ دەڵێنەوە ((کە دەبێ دەستی کراوە و دڵی فراوان بێت، هەروەها ئامۆژگاری لە زاناو پیاو ماقووڵەکان وەربگرێت)) کە چەند شتێکی سەرەکین بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی[٦٣]. بێ ئەوەی پرسیار لە خۆیان بکەن و بڵێن دەبێ ئەو دەست کراوەییە چۆن بێ؟. و چۆن پارەکان خەرج بکات: ئایا ئەو

---

٦١ - دکتۆر ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي ) لـــ٦٤ـــ.

٦٢ - دکتۆر ئەحمەد چەلەبی هەمان سەرچاوە، لـــ٦٥ـــ.

٦٣ - دکتۆر ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي) لـــ٥٨ـــ.

خەرجیە لە ماڵی خۆی دەبێت، یان لە ماڵی دەوڵەت..؟ بێگومان هەر هەمووی لە (خەزێنەی دەوڵەت) دەبێت، لەو خەزێنەیەی کە موڵکی خەڵکیە و هەمان ئەو نووسەرەش ئەو خەڵکەی لە مافی هەڵبژاردنی سەرۆك بێبەش کردووە [٦٤]. بە پێچەوانەوە ئێمە ئەگەر بە پێی یاسا بێت نامانەوێ ئەو سەرۆکە دەست کراوە بێت تەنانەت یەك فلسیش خەرج بکات ئەگەر بەپێی یاسا نەبێت، بەڵکو دەبێ لەو پڕۆژانەدا خەرجی بکات کە حکومەت و ئەنجومەنە تایبەتەکان بڕیاری لەسەر دەدەن. نامانەوێ سەرۆکەکەمان ئەو شان و شەوکەتەی هەبێت کە چەندین شێرو پڵینگ و سەرباز لە چواردەوری خۆیدا کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لە ناو دڵی خەڵکیدا دروست بکات[٦٥].

ئەوەی ڕاستی بێت هەندێك لە نووسەرە سیاسییەکانمان شتی وا دەنووسن وەك بڵێی ئەو سەرۆکە (سەرۆك هۆزێك) بێت و لەسەر سەکۆی دیوەخانەکەی خۆی دانیشتبێ [٦٦]، خەڵکیش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان بێنە لای. لە کاتێکدا ئەو نووسەرانە خۆیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆیان پەنا دەبەنە بەر یاسا و پارێزەر و دادوەرەکان، بۆ نموونە لەو کێشانەی کە لەگەڵ دەزگاکانی بڵاوکردنەوەدا دەیانبێ، هیچ یەك لەو نووسەرانە بە بیریدا نەهاتووە پەنا بباتە بەر (سەرۆك کۆمار و داوای لێ بکات دادگاییێکی دادپەروەرانەی ئەو دەزگا نەفرەتیەی بڵاوکردنەوە بکات، یان ئەو مافانەی کە لە خەزێنەی دەوڵەت بەری دەکەوێت بۆی خەرج بکات! باشە ئەی دەبێ بۆ چی ئەو قسە سەیرو نامۆیانە بنووسن؟ ئایا دەبێ بۆ بەکار بردنی ڕۆژانە بێت؟ یان بۆ جووڵاندنی هەستی ئاینی و سۆزی خەڵکی بێت؟ باشە بۆ ئەو هەستانە بەرز ڕاناگرن و بیگەیێننە ئاستێکی بەرز و باڵا کە بتوانن ئەخلاق و ئاین لە یەك جیا بکەنەوە وکاروبارەکان بە شێوەییێکی ڕاست و دروست تێبگەن، کە ئەویش ئەوەیە دەبێ چەمکە ئەخلاقییەکان بخرێنە چوارچێوەی چەند یاساییێکەوە؟ ئەو کۆمەڵگەیەی کە لەسەر (چاکەو پیاوەتی) سەرۆکێکی دەست کراوە بنیاد دەنرێ ئەوە (کۆمەڵگا) نییە، بەڵکو کۆمەڵێك گەجەرو گوجەرن و ئەو مافە بە خۆیان نادەن وەك هاوڵاتییێك بژین و ببنە خاوەنی کەرامەتی

---

٦٤ - هەمان سەرچاوە لـــ٦٢ـــ.

٦٥ - هەمان سەرچاوە لـــ٦٨ـــ.

٦٦ - نامەوێ بڵێم وەك کوێخای گوندەکەی خۆمان وابێ کە لەسەر تەختەکەی خۆی دادەنیشێ و بڕیار لەسەر هەموو شتێك دەدات !.

خۆیان و لە سایەی ئەو یاسایەدا بژین کە بۆ هەمووان وەك یەکە و پیاوەتی کەسی بە سەرەوە نەبێ ئینجا چ سەرۆك کۆمار بێت، یان خەلیفە.

ئەوەی ئێمە دەمانەوێ لە سەرۆکی ئێستاماندا هەبێ جیاوازییێکی گەلێ زۆری لەگەڵ ئەمەدا هەیە:-

١ـ هاولاتییێك بێ وەك هاولاتیانی تر و بە هۆی پلەو پایەکەیەوە کە بە سەرۆك یان فەرمانڕەوا هەڵبژێردراوە هەست بە لوتبەرزی نەکات و وا بزانێ کە لە خەڵکانی تر باشتر و بالاترە. لەبەرئەوەی هاولاتیە هاوئاستەکانی خۆی ئەویان بۆ ئەم پلەیە هەڵبژاردووە.

٢ـ دەبێ ئەو سەرۆکە یەکسەر درك بەوە بکات، کە هاولاتیان ئەویان بۆ ئەو پۆستە هەڵبژاردووە ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ، کە گەل سەرچاوەی دەسەلاتە، هەر ئەویش بۆ ئەم پلەو پایەیە بەرزی کردۆتەوە، ئەمەش بەدیهاتنی پرەنسیپەکانی دیموکراسیە، کە گەل یان نەتەوە خۆی سەرچاوەی دەسەلاتەکانە، هەروەها بەشە گرنگەکەی دووەمیان ئەوەیە کە دەبێ فەرمانڕەوا ئەوەی لە یاد نەچێ کە هەر لایەنێك بتوانێ یەکێك هەڵبژێرێ بۆ سەرۆك، دەشتوانێ لە سەرۆکایەتی لایببات و لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات.

٣ـ نابێ سەرۆك بە تەنیا بڕیارەکان دەربکات و نابێ کێشە گەورەکانیش بە تەنیا چارەسەر بکات، بەڵکو دەبێ کێشەکە لە گەڵ راوێژکارەکانی خۆیدا تاوتوێ بکات و ئینجا بیخاتە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران بۆ ئەوەی رەزامەندی لەسەر وەربگیرێ. بۆ نموونە تۆ دەتوانی تەماشای سەرۆکی ئەمریکا بکەیت، کە لەکاتی وەرگرتنی بڕیارێکی گرنگدا چی دەکات و ئەگەر گرنگیش نەبێ — چۆن بە یەکەوە تاوتوێی دەکەن و پرسوڕای یەکتر وەردەگرن ئەگەرچی ئەو سەرۆکە راستەوخۆ لەلایەن گەلیشەوە هەڵبژێردراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە بێ رەزامەندی ئەنجومەنی نوێنەران ناتوانێ یەك وەزیریش چیە دابمەزرێنێ.

٤ـ ئێمە نامانەوێ سەرۆك دەستی کراوە بێت، چونکە من لەو باوەڕەدا نیم کە (سەرۆکێکی رەزیل) (ولاتەکەی خۆی بەرەو هەڵدێر ببات)[٦٧]، بەڵکو دەمانەوێ سەرۆکیش وەك هەر هاولاتییێکی تر ئەو کاتەی دەبێتە سەرۆك (دان بەوەدا بنێ کە چەند پارەو پوول و موڵك ومالی هەیە) و لەکۆتایی ماوەی سەرۆکایەتیەکەشیدا بڕی پارە و موڵك و ماڵەکەی گەیشتۆتە ئەو رادەیە — دوای ئەوەش وەك هەر هاولاتییێکی تر یاسای بە سەردا بسەپێ کە (ئەم هەموو

٦٧ - ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي)لــ٥٨ــ.

شتانەت لە کوێ بوو)، ئەوەندەمان پێ دەکرێ بڵێین: ((بریا سەرۆك و پاشاکانمان ئەمەیان بە وردی لێك دەدایەوە و جێبەجێیان دەکرد..))[٦٨].

**٥ـ** دەبێ سەرۆك هەستی (خێڵەکی)، یان (بنەماڵە) بە لاوە بنێ و خۆی بەو جۆرە شتانە هەڵنەداتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو دەبێتە هی هەموو وڵات — و ئەم هەستەش وای لێدەکات کە منداڵ و تاکەکانی ناو خێزانەکەی خۆی لە خەڵکی تر بە زیاتر بزانێ و پلە و پایە و جێگا گرنگەکانیان بداتێ کە ئەوان شایانی ئەو جێگایە نین، و هەندێك جاریش نە پلە و پایە و نە شوێنی گرنگ وەردەگرن بەڵکو وشەی (ئێمە خزمی سەرۆکین) وەك وشەییێکی نهێنی بەکار دەهێنن، کە وەك پاسەپۆرتێك هەموو دەرگا داخراوەکانیان بۆ دەکاتەوە.

**٦ـ** دەبێ خۆی وخزم و چوار دەورەکەی و ئەوەی یاسا دەیانگرێتەوە، ملکەچی یاساکان بن، چونکە ئەوەی (سیستەمی دەسەڵاتێکی باش) کە سیستەمی دیموکراسیە تێیدا بە یەك یاسا لێپێچینەوە لەگەڵ هەموو هاوڵاتییێکدا دەکرێ لە سەرۆك کۆمارەوە تا دەگاتە خەڵکی سەر شەقام لە (سیستەمی دەسەڵاتێکی خراپ و گەندەڵ) کە سیستەمی خێڵەکایەتی و گشتگیری و دیکتاتۆری و ستەمکارەکان...و هتد کە هەر هەموویان یەك خێزانن جیادەکاتەوە، سەروەری یاسایە ـ نەك ئەخلاقی فەرمانڕەوا کە ویست و ئارەزووەکانی فەرمانڕەوای زۆردار تیایدا بۆتە یاسا.

ئەمانە چەند خەسڵەتێکن کە دەمانەوێ لە سەرۆکی ئێستاماندا هەبێت کە لە فەرمانڕەوایەتیەکەیدا پشت بە بنەما ئەخلاقییەکان نەبەستێ، بەڵکو دەمانەوێ پشت بە ئەنجومەنی نوێنەرایەتی و رێچکە دیموکراسی و دامەزراوە شەرعییەکان...و هتد ببەستێ. بە کورتیەکەی پشت بە سیستەمێکی دیموکراسی ببەستێ، کە کەرامەت و مرۆڤبوون و شتە پیرۆزەکانی هاوڵاتیان بپارێزێ.

**بیرۆکەی یازدەم:** - لەو باوەڕەدا نیم سەرۆکێك هەبێ لە ئەبوبەکری سەدیق و لە عومەری کوڕی خەتاب ئەخلاقی بەرزتر بێ و لەوان باشتر و ماقوڵ تر بن. لەگەڵ ئەوەشدا لەلایەن عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە رووبەڕووی رەخنەی توند بۆوە، بۆ نموونە، پێی گوت: (هەموو کارەکانت لێ تێکداین و پرسیشت بەکەس نەکرد و هیچ مافێکی ئێمەشتان رەچاو نەکرد..). ئەبوبەکر نە هەڵچوو و نە تووڕەش بوو و نە ئەو قسەیەشی بە تاوانێك لە قەڵەمدا کە لێبووردنی لە سەر

---

٦٨ - هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.

نەبیّ، بەڵکو وەك پیاوێکی دیموکراسی و زۆر هێمنانە وەڵامی دایەوە گوتی: (بەڵێ، بەڵام لە شەڕو ئاژاوە ترسام) [69] ئەو لێرەدا پرەنسیپێکی گرنگ و بنچینەیی بۆ دەسەڵاتی دیموکراسی دادەنێ کە ئەویش: مافەکانی خەڵکە لە رەخنەگرتن و ئەبوبەکری سەدیق ئامۆژگاری پاشاو فەرمانڕەواکان دەکات کە پارێزگاری لە ماڵ و موڵکی خەڵکی بکەن، بەڵام لەبارەی خۆی دەڵێ: (ئێمە کاروبارەکانی موسڵمانانمان گرتە دەست و نەدینارێك و نە درهەمێکیشمان وەرنەگرت، بەڵکو ئێمە لە شیلەی خواردەمەنییەکانی ئەوانمان دەخوارد و دڕی زبری جلەکانی ئەوانمان لەبەر دەکرد) [70] و موڵك و ماڵی هیچ موسڵمانێکمان لەلا نەماوە، کاتێك کە نەخۆشیش کەوت لە پێش مردنیدا داوای لە عائیشەی کچی کرد کە ئەو موڵك و ماڵە کەمەی لە لای مابۆوە بیداتەوە بە خەلیفە. [71]

هەمان شت لەبارەی خەلیفەی دووەم کە عومەری کوڕی خەتابە بڵێ، (ئەو کاتەی دەسەڵاتی گرتە دەست داوای لە خەڵکی کرد لە کارەکانیدا چاودێری بکەن و لێپێچینەوەی لە گەڵدا بکەن) گوتی: (هەر یەکێك لە ئێوە ئەگەر کارێکی ناڕاست یان لادانێکی لە من دیت با راستی بکاتەوە لەبەرئەوەی من تەنها یەکێکم لە ئێوە..) [72]. عومەر کەسایەتییێکی کارامە بوو لە کارەکانیدا بە توندو تیژ و موکوڕ ناسرابوو، کە دەسەڵاتی خەلیفایەتی گرتە دەست خەڵکی زۆر لە توندو تیژیەکەی دەترسان، ئەویش هاواری لێکردن و گوتی: (ڕاستە لە بەرامبەر خراپەکاراندا توندو تیژم، بەڵام بەرامبەر بە خەڵکی چاك و سەرڕاست لە خۆشەویستییا روومەتی خۆمی بۆ دەخەمە سەر زەوی.

و چەندین ئەخلاق بەرزی و بێ خەوشی باڵای تر و رەفتاری ئەخلاقیانەی بەرز، کە لە شوێنێکی دیکەدا چەندین نموونەمان بۆ هێناوەتەوە [73].

---

٦٩ - ئەلمەسعوودی (مروج الذهب و معادن الجوهر) بەرگی دووەم لـــ٣٠٧ـــ.

٧٠ - (طبقات ابن سعد) لـــ٢٩ـــ کە لە کتێبی دکتۆر چەلەبی وەرگیراوە لـــ٦٩ـــ.

٧١ - دکتۆر ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي ) لـــ٦٩ـــ.

٧٢ - دکتۆر ئەحمەد چەلەبی (هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە).

٧٣ - بە کتێبەکەی ئێمە (الطاغية..دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي )دا بچۆوە لـــ٢٢١ـــ ی چاپی سێیەمی کتێبخانەی مەدبوولی ساڵی ١٩٩٧.

هەندێك لە خوێنەران بە تایبەتی ئەوانەی پەلە دەکەن وا دەزانن کە ئەم جۆرە نموونانە دژی ئەو بیرۆکانەن کە ئێمە دەمانەوێ و پاڵپشتن بۆ سیستەمێکی ئەخلاقیانە — بەڵام ئەمە وانییە، بەڵکو ئەوەی راستی بێ ئەمانە چەند نموونەیێکن پشتگیری لە قسەکانی ئێمە دەکەن. ئێمە دەتوانین لەم چەند نموونە کەمانەی باسمان کردووە، ئەم پرەنسیپە بنچینەییانە هەڵهێنجین:

١ـ خەڵکی ئەو مافەی هەیە بەرەورووی هەڵبژاردنی سەرۆك بوەستێتەوە و هاتنە سەر دەسەڵاتی رەتبکاتەوە ئەگەرچی پلەو پایە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەکەشی بەرز بێت.

٢ـ دەبێ پارێزگاری لە موڵك و ماڵی دەوڵەت بکرێ و جیاکردنەوەییێکی تەواو لەنێوان موڵك وماڵی فەرمانڕەوا و گەلدا بکرێ.

٣ـ دەبێ سەرۆك لە کۆتایی کارەکەیدا لێپێچینەوەی لە گەڵدا بکرێ کە چی هەیەو چی نییە و هەرچی پارەو پوولی هەیە بخەملێندرێ، چونکە لەوانەیە لە دوای دەسەڵات گرتنە دەست زۆر زیادی کردبێت.

٤ـ دەبێ لە جێبەجێ کردنی یاساکاندا توندو تۆڵ بێ و لە بەرامبەر سەرپێچیکاران (کەسانی ستەمکار و زۆردار) مەبەستم ئەوانەیە کە دزی و راوە رووت دەکەن یان دەسدرێژی دەکەنە سەر موڵك و ماڵ، یان ژیان، یان ناموسی خەڵکی، یان بەشێوەییێکی گشتیتر بڵێین ئەوانەی یاساکانی وڵات پێشێل دەکەن...هتد.

٥ـ پلەی سەرۆك دەخرێتە بەر دەم هەڵبژاردنێکی ئازاد، خەڵکیش بە ویست و ئارەزووی خۆیان ئەو کەسە دەسنیشان دەکەن کە دەیانەوێ ببێتە فەرمانڕەوا... هتد.

ئێستا لەگەڵ مندا وا بێنە پێش چاوی خۆت، ئەگەر بێت و ئەو ئەخلاقە چاکانەی ئەو دوو پیاوە هەیان بوو بکرابوونایەتە چەند یاساییێك و بەردەوام بە درێژایی رۆژگار حوکمڕانی موسڵمانانی پێ بکرایە و ئەوەی لە دوای ئەواندا دەسەڵاتی دەگرتە دەست چەند یاساییێکی نوێی بۆ زیاد بکردایە ـ بیری لێ بکەرەوە لەو حاڵەتەدا چ سوودێکی گەورەی بە خەڵکی دەگەیاند..؟ بەڵام جێی داخە هیچ شتێکی لەم بابەتە رووی نەدا و ئەو ئەخلاقە پاکانە بە مردنی ئەو دوو پیاوە کۆتایی پێ هات هەر لەبەر ئەمەش بوو معاویە لە گۆڕینی سیستەمی دەسەڵات بۆ سیستەمێکی پاشایەتی ستەمکار و بۆماوەیی لە ناو خێزانەکەی خۆیدا هیچ گرفتێکی ئەوتۆی نەبوو و زۆر بە ئاسانی

گوتی: لەبەر ئێوە من خۆم لەسەر کارەکانی ئەبی قەحافە راهێنا و دەشمویست کارەکانم وەك کارەکانی عومەر بێت، بەڵام نەمتوانی وا بکەم و لێی هەڵاتم)[٧٤].

بۆیە تۆ ناتوانی وەك جۆستنیانی (٤٨٣-٥٦٥) ئیمپڕاتۆری رۆمانی بکەیت کە تۆمارێك بۆ ئەو یاسایانە دابنێیت کە لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەرچوونە وەك ئەوەی ئەو ئیمپڕاتۆرە بۆ دەوڵەتی رۆمانی کرد [٧٥].

**بیرۆکەی دوازدەم:** ئەوەی راستی بێ سیستەمی دەسەڵاتی ئەخلاقیانە، کە پشت بە (پاشاییێکی ئەخلاق بەرز)، یان (شوانێکی چاك) دەبەستێ، گەلیش کە خۆی خاوەنی بەرژەوەندیی یەکەمە لەو سیستەمە سیاسیەدا وای لێدێ کە هیچ نرخێکی نەبێ و لە پلەی خوار خوارەوەی سیستەمەکە دادەنرێ و کەس پرس و رای پێناکات، بەڵکو تەنها پرس و رای (پیاوانی مەسڵەتی) (اهل الحل والعقد) وەردەگرن کە ژمارەکەیان دەگاتە شەش یان چوار کەس یان سێ کەس... بەم شێوەیەی کە دوایی دێینە سەر باسکردنی ـ ئەوەی ئێستا لەلای ئێمە گرنگە ئەوەیە کە (خەڵکە رەش و ڕووتەکە توانای دەسنیشانکردنی سەرۆك، یان خەلیفەیان نییە لەبەر ئەوەی بە شێوەییێکی باش توانای هەڵسەنگاندن و دەسنیشانکردنی خەڵکیان نییە بۆ ئەم پلەو پایە گەورەو گرنگە. دەگێڕنەوە دەڵێن عومەری کوڕی خەتاب ویستی پرس و ڕا بەحاجییەکان بکات، بەڵام هەندێك لە یاوەرەکانی ئاگاداریان کردەوە کە لەم وەرزی حەجەدا خەڵکێکی هەمەجۆر کۆبوونەتەوە و ئەوانە لە مەبەستەکانی تۆ تێناگەن، و بە هەمووڵاییێکیشدا بڵاوی بکەنەوە باش نییە، بۆیە پێویستە ئەمە هەڵگیرێ تا دەگەڕێینەوە شاری (مەدینە) ئینجا بخرێتە بەر دەستی زاناو خاوەن بیروراکان، ئەویش لەم کارەدا بە گوێی کردن..)[٧٦] هەروەها دوای کوژرانی عوسمانی کوڕی عەفان لێشاوی خەڵکی تەوژمیان بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب برد بۆ ئەوەی دەنگی (بیعة) بدەنێ و بیکەن بە خەلیفە ئەویش درکی بەوەکرد کە ئەم لێشاوە خەڵکە خەڵکێکی رەشۆکین، بۆیە هاواری لێکردن: ئەمە کاری ئێوە

---

٧٤ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٢٣٣ـ.

٧٥ - ئیمپڕاتۆر (جۆستیانی یەکەم ) دوای ئەوەی ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی ڕێك خستەوە، لە ساڵی ٥٢٨ ی زاینی لیژنەییێکی پێك هێنا و کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەی یاسا ڕۆمانییەکانی خستە ئەستۆیان و لەساڵی ٥٥٣ دا هەموو یاساکانیان لە تۆمارێکدا تۆمار کرد، کە دوایی بە (سجللی جۆستیان) ناسرا.

٧٦ - دکتۆر ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي ) لـ٦٣ـ.

نییە، بەڵکو تەنها کاری بەشداربوانی شەڕی بەدرە: (کوا تەلحە و زوبێر و سەعد لە کوێن..؟)[77].

بەڵام دەسەڵاتی نەتەوە خۆی لە پێویستی ئەو رەزامەندیەدا دەبینێتەوە کە (پیاوانی مەسلەتی) بە باشی دەزانن دەبێ یەکێك هەڵبژێرن کە لە هەموو کەس زیاتر خەڵکی گوێڕایەڵی بن[78]. (لەگەڵ ئەوەی کە دەبێ خەڵکی لە یاسا زیاتر گوێڕایەڵی کەسی تر نەبن!).

ئەمەش پرەنسیپێکی نامۆیە و لەهەمان کاتدا مەترسیداریشە، چونکە لە دروست کردنی سیستەمی سیاسیدا خەڵکی خۆیان خاوەن بەرژەوەندیە راستەقینەکانن و لە هەڵبژاردنی سەرۆك و دارشتنی یاسادا هەر خۆیان سەرچاوەی دەسەڵاتەکانن. بنەما سەرەکییەکانی دیموکراسی دەڵێ: من خۆم کاری چاندن دەکەم و خۆشم دەیدوورمەوە و خۆم دروستی دەکەم و خۆم باج دەدەم و لەکاتی شەڕەکاندا خۆم پارێزگاری لە وڵات دەکەم...هتد، کەواتە من فەرمانڕەوایەتی دەکەم. ئەو خەڵکە رەشۆکیەی کە زۆر بە قێزەوە باسی دەکەن، لە پێکهێنانی سیستەمی سیاسیدا خۆیان یەکێکن لە تاکەکانی گەل و خاوەنی بەرژەوەندییەکانن، لەوانەیە زانیاری و رۆشنبیرییێکی تەواویان نەبێ (پێشتریش هەندێك گفتوگۆمان لە بارەیەوە کردووە)، هەروەها هۆشیاریشیان کەمە...هتد، بەڵام ئەمانە هەر هەموویان نابێ ببنە رێگر لە بەشداریکردنێکی پراکتیکیانەیان لە هەڵبژاردنی سەرۆکدا و ئەگەر هەڵەشیان کرد با سوود لە هەڵەکانی خۆیان وەربگرن، چونکە دیموکراسی پیادەکردنی زیاترە لەوەی تیۆرێکی فەلسەفی بێت، زیاتر لەو مەلەوانییە دەچێ کە دەبێ پیاو خۆی فڕێ بداتە ناو ئاوەکەوەو مەلەی تێدا بکات تا فێری مەلەوانی دەبێ، نەك بچێ کتێبێك لەسەر فێربوونی مەلەوانی بکڕێت و بیخوێنێتەوە، ئەگەر چی فەیلەسووف و بیرمەندەکان لە دانانی تیۆری سیاسیدا بەشداری دەکەن، بەڵام لە کۆتاییدا سەنگی مەحەك زۆرینەی خەڵکەکە خۆیەتی، هەروەك ئەو پەندەی خەڵکی ئەسینا دەڵێ: (پینەدۆز پێڵاو دروست دەکا، بەڵام تەنها ئەو کەسەی کە لەپێی دەکا دەزانێ پێڵاوەکە لە کوێوە پێی دەگوشێ..). زۆر جار هەستم بەوە دەکرد کە زۆربەی خەڵکی بە تایبەتی لە میسر لە ناخەوە هەست بەوە دەکەن کە ئەو رژێمە گەندەڵ وخراپە، بێ ئەوەی هیچ شتێك لە بارەی تیۆرییە ئابووری، یان سیاسی، یان کۆمەڵاتییەکانەوە بزانن، بەڵام

---

٧٧ - هەمان سەرچاوە.

٧٨ - هەمان سەرچاوە.

خەڵکانی سەر شەقام لە کاتی پیادەکردنی کاری ڕۆژانەیان لە دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا و بە تێکەڵبوونیان لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەست بەوە دەکەن کە ئەم ڕژێمە گەندەڵ و خراپە، بێئەوەی لە توانایاندا هەبێ بەڵگەییێك یان شتێك لە بارەیەوە بە دەستەوە بدەن و بیسەلمێنن کە ئەو (هەستەیان) ڕاستە یان نا. گومانم لەوەدا نییە کە (بەشێك) لە هۆشیاری سیاسی لە ڕێگای ئەو پیادەکردنەی کاری ڕۆژانەو تێکەڵ بوونەوە دروست دەبێ.

لە ڕاستیدا کەمکردنەوەی بەهاکانی (خەڵکی) بە تایبەتی زۆرینەی خەڵکەکە ـ تەنها ئەنجامێکی مەنتقیە و لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە فەرمانڕەوای بێخەوش و شوانی چاکن ـ نموونەی بەرزی نێو خەڵکین و هەر ئەو نموونەیی و پێشەنگیەیە کە دەبێ ئەوانیش چاوی لێبکەن. ئەگەر ئەمە ڕاست بێ کەواتە سەرۆك هەموو شتێکە و خەڵکیش بەهیچ ناچێ. ئەوەی لەسەریانە بیکەن ئەوەیە کە بە دوای ئەو سەرۆکە بکەون و لێی نزیك ببنەوە و ڕێچکەی ئەو بگرن و بۆ هەر شوێنێك چوو ئەوانیش بچن بەدوایدا و لە قسەو کردارەکانی دەرنەچن. (وەك ئەوەی باسمان کرد ـ ئەگەر ئەو شتێکی خۆش ویست دەبێ خەڵکیش خۆشیان بوێ و ئەگەر ڕقی لە شتێکیش بۆوە دەبێ خەڵکیش ڕقیان لێ ببێتەوە.).

**بیرۆکەی سیزدەم:** لە سیستەمەکانی دەسەڵاتی ئەخلاقیدا کەسایەتی تاك، یان ئەوەی کە پێی دەڵێین: خودی تاك بوونی نامێنێ، تاکیش وەك تاکێك هەست بە بوونی خۆی ناکات، لەبەرئەوەی هەر هەموویان لەگەڵ کەسایەتی فەرمانڕەوای بێخەوش و شوانی چاکدا تێکەڵ بووە ـ هەر لەبەر ئەمەشە کە هەندێك لە نووسەران مافی ئەوە بە خۆیان دەدەن کە بڵێین: (موسڵمانان لە هەموو سەردەمەکاندا بە دوای خەلیفە دەگەڕێن ـ و ڕێچکەی ئەویش دەگرن و هەر لە سەر ئاینزاکەی ئەویش دەڕۆن، و ئەوەی ئەو دەیکات، ئەوانیش دەیکەن و لە ئەخلاق و کردارو وتەکانی ئەو دەرناچن)[٧٩] ئەو خۆی ئەو نموونە بەرزەیە کە خەڵکی چاوی لێ بکەن و هەرخۆشی ئەو پێشەنگ و هەڵبژاردەیەیە کە دەبێ موسڵمانان چاوی لێبکەن و بە دوای دەکەون.

---

٧٩ -(مشاكله الناس لزملائهم ) لێکۆڵینەوەی محەمەد کەمالەددین عیزەددین لـ٢٠ـ. (لە دکتۆر چەلەبی وەرگیراوە لـ٧٢ـ.

سوفیان ئەلسەوری، بە خەلیفە جەعفەری کوڕی مەنسووری گوت: (من تاکە پیاوێك دەناسم ئەگەر ئەو چاك بوو خەڵکی هەمووی چاك دەبێ: خەلیفە بە سەرسوڕمانەوە گوتی: ئەو کەسە کێیە؟ ئەویش گوتی: ئەو کەسە تۆی).! قەدەری سەرۆك هەر وا دەبێ، لەهەموو سەردەم و شوێنێکدا ئەخلاقەکەی بە پانی و درێژی وڵاتدا رەنگ دەداتەوە، لێرەدا دەبووایە خودی خۆی چاك بکات تا گشت نەتەوەی ئیسلام چاك بێت.[80] ئینجا تۆ بیری لێ بکەرەوە کە (چاك بوونی نەتەوەی ئیسلام کە لە ملیۆنەها کەس پێك دێ لەسەر چاك بوونی تاکە کەسێك وەستابێ!).

ئیبن تەبا تەبایی دەڵێ: ﴿پاشا هەندێك کاروباری تایبەت بە خۆی هەیە: ئەگەر شتێکی خۆش ویست خەڵکیش هەمووی ئەو شتەیان خۆش دەوێ، ئەگەر رقیشی لە شتێك بۆوە هەموویان رقیان لێ دەبێتەوە، ئەگەر بە شتێکیدا هەڵگوت خەڵکیش پێیدا هەڵدەڵێن، ئەمە یان سروشتیان وایە یان شتێکی چاو لێ کەریە، هەر لەبەر ئەمەشە دەڵێن: (خەڵکی لەسەر ئاینی پاشاکانیانن)[81]!.﴾ لێرەدا تێبینی ئەوە بکە، کە (پاشا نموونەیێکی بەرزی ئەخلاقە هەر ئەویش پێشەنگ و هەڵبژاردەیە.!).

ئەگەر بێت و بەمشێوەیە هەموو شتەکان لە فەرمانڕەواییێکی بێ خەوشدا کۆ ببێتەوە، لێرەدا هەستی ئازادی و بەرپرسیارێتیش لەگەڵیدا دادەتەپێ و ون دەبێ، هەروەها کارە مەبەستدار و بێ مەبەستەکان وەکو یەکی لێدێ! لەم حاڵەتەدا ئەخلاقی راستەقینە بوونی نامێنێ، لە بەر ئەوەی کرداری ئەخلاقیانە هەر ئەوە نییە کە لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئەخلاقدا بگونجێ، بەڵکو ئەو شتەیە، کە لە ناخی تاکدا هەڵدەقوڵێ، هەر وەك کانت I.Kant دەڵێ: مەبەستم هەستەکانی ناوەوەی مرۆڤ و هەستکردنێتی بە ئەرکەکانی خۆی، کە ویست و ئارەزووی چاکە و خێرخوازی بە بنچینەی هەموو ئەخلاقەکان دادەنێ، ئەگەر پیاو لە تواناشیدا نەبێ لە جیهانی دەرەوەدا جێبەجێیان بکات وەك ئەوەی لە بەشی داهاتوودا باسی دەکەین.

لە کۆتاییدا هۆشیاری ئەخلاقیانە ئەو لایەنە شاراوەیەیە، کە ئەگەر دابونەریتەکانیش لەناو بچن ئەو هەر دەمێنێ و سزا دەرەکییەکانیش رەت دەکاتەوە، لەبەرئەوەی هۆشیاری ئەخلاقیانە پێویست بەوە دەکات کە درك بە ئەرکەکان بکات و هەست بە کەسایەتییێکی

---

٨٠ - دکتۆر ئەحمەد چەلەبی (السیاسة في الفکر الاسلامي) لــ٧٠ــ.

٨١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لــ٧٢ــ.

ئازاد بکات، ئەم کارەش لەو کۆمەڵگایانەی کە تاك لەگەڵ کەسانی دی، یان لەگەڵ فەرمانڕەوادا تێکەڵ بەیەك دەکرێ بوونی نامێنێ. لێرەدا جیاوازییێکی ئەوتۆ لە نێوان ئازادی و کۆیلایەتیدا نابینین، چونکە هەمووان لە سووکایەتی پێکردندا لەبەردەم فەرمانڕەوادا وەك یەکن و لەبەر ئەوەی (کەرامەت) لە نێوانیاندا بوونی نامێنێ، بۆیە هیچ کامێکیان ئەو مافە کەسێتییەی نابێ کە لە یەکێکی تری جیا بکاتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی هەستکردن بە بێزاری و داڕوخانی کەسەکە. بەمشێوەیە کارە بێئەخلاقییەکان خۆی بە رووپۆشی ئەخلاقێکی ساختە پەردەپۆش دەکات ـ بۆیە ساختەیە، چونکە سەرچاوە دەرەکیەکەی نەك ناوەوەی ئەو تاکە: ترسانە لە سزادان نەك بە ئەرکی سەر شانی خۆی بزانێ.

تاك لە رووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ ویست و ئارەزووە گشتییەکانی فەرمانڕەوادا کە راستەوخۆ فەرمان دەدا، کە دەبێ تاك چی بکات و چی نەکات، لە کاتی بوونی ئەو جۆرە دەسەڵاتانەدا خودی تاك، یان هۆشیاری تاك، یان رەنگدانەوەی ویست و ئارەزووەکانی تاك لە سەر خودی خۆی هیچ بوونێکی نییە، لێرەدا تاك بێ ئەوەی بیر بکاتەوە یان تەماشا بکات ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکان دەبێ، چونکە ئەگەر گوێڕایەڵ نەبێ لە (هەمووان)، واتە لە کۆمەڵ دادەبڕێ وخۆی تووشی سزا دەکات.

ئەوەی راستی بێ بیرۆکەی (هۆشیاری خودی تاك) چەند بۆ زانست و سیاسەت و بیرکردنەوە گرنگە ئەوەندەش بۆ بوارەکانی ئەخلاق گرنگە، بۆیە با کەمێ هەڵوەستەی لە سەر بکەین: ـ

دەتوانین بڵێین: (هۆشیاری واتە (درککردن) هەروەها ئەم درککردنە لەلای ئاژەڵیشدا هەیە، بۆنموونە پشیلە هەست بە خواردنەکەی خۆی دەکات و دەچێ بیخوات، سەگیش هەست بەخاوەنەکەی دەکات و دەکەوێتە دوای و هەروەها ئەوانی تریش، بەڵام هەستەکانی مرۆڤ جیاوازییێکی زۆری لەگەڵ ئەواندا هەیە: راستە ئەویش هەمان ئەو هۆشیاریە ئاژەڵیانەی هەیە، بەڵام لەم سنوورەدا ناوەستێ، بەڵکو بۆ ناخی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو هۆشیاریە درك بە خودی خۆشی بکات: بۆ نموونە من نانەکەم دەخۆم و ئاو دەخۆمەوە و بۆن دەکەم...هتد مەبەستم ئەوەیە من هەر هەستێك لە بواری خۆیدا بە کار دێنم تا ئەو ئاستەی ئێستا لە گەڵ ئاژەڵدا لە سەر یەك خەت دەوەستین، بەڵام بە پێچەوانەی ئاژەڵ من دەتوانم بگەڕێمەوە ناو ناخی خۆم و درك بەو کارانە بکەم، کە پێی هەڵدەستم. بۆیە ئەو کاتەی، کە دەڵێم (من دەخۆمەوە) (من دەبینم)...هتد واتە بەم رستە ساکارە کردارێکی دوولایەنە دەردەبڕم، ئەویش من بە خواردنەوەی

ئاوەکە هەڵدەستم ئەمەیان کرداری یەکەم دوای ئەوە من هەست بەکرداری ئاو خواردنەوەکە دەکەم و خواردنەکە دەخۆم و لە هەمان کاتدا هەست بە کرداری خواردنەکە دەکەم، کەرتی یەکەم هۆشیارییە یان درك کردنە. کەرتی دووەم هەست کردنە بەو هۆشیارییە، یان ئەو درك کردنە، کە درك پێکردنی خودی مرۆڤە یان هۆشیاری خودی کەسەکەیە. وشەی (من) لە ناخەوە ئەو کردارە دوولایەنە لە ناخی خۆیدا لە خۆ دەگرێ، چونکە بەهۆی ئەوەوە هەست بەخۆم دەکەم (ئاژەڵ ناتوانێ بڵێ: (من) بەڵام مرۆڤ تەنها خۆی دەتوانێ ئەو شتە بڵێ، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەیە کە سروشتی مرۆڤ خۆی وایە بیر دەکاتەوە) [٨٢]. چونکە بیرکردنەوە Reflection واتە رەنگدانەوە، و تەنها خودی ئەو مرۆڤەی کە بیر دەکاتەوە خاوەنی هۆشیاری خودی خۆیەتی. وئەو هۆشیاریەی خودی تاك خۆی مانای ئازادییە، چونکە ئازادی لە سادەترین ماناکانیدا ئەوەیە کە هیچ کۆت و بەندێك رێگەت پێ نەگرێت، بە هیچ شتێکی دەرەکیەوە نەبەسترێیتەوە، و لابردنی کۆت و بەندەکانیش لەگەڵ هۆشیاری خودی مرۆڤ نەبێ جێبەجێ نابێ، چونکە ئێمە لێرەدا دەبینین خود تەنها پێوەندی لەگەڵ خۆیدا هەیە، ئازادی راستەقینە بەم شێوەیەیە. هیچ کەسێك سنووری بۆ دانانێ تەنها خودی خۆی نەبێ ئەمەش سنووردار کردنی خود خۆیەتی Self-Determination و گوێڕایەڵی یاساکان لە کۆمەڵگا تازەکاندا کە پیاو خۆی بۆ خۆی یان لە رێگای نوێنەرەکانییەوە دای دەڕێژێ ـ تیایدا ئازادیان زیاترە لەو پشێویەی (مرۆڤی سەرەتایی) تێیدا دەژیا، چونکە ئەم یاسایانە تەعبیر لە ناخی خۆم دەکەن (بە تایبەتی ناخە گشتیەکەم) لە کۆتاییدا کاتێك کە من گوێڕایەڵی یاساکە دەبم گوێڕایەڵی خۆم دەبم، ئەمەش ئازادی راستەقینەیە وەك پێشتریش باسمان کرد.

ئەم هۆشیاریەی خود کاکڵەی رەگەزەکانی ئەخلاقە، هەستکردن بە خودی خۆم، هەروەها هەستکردنم بە ئەرکەکان لە ناخەوە (بەو سیفەتەی کە من مرۆڤێکی ژیرم) وادەکات پابەند بوونە ئەخلاقییەکان لە ناخمەوە هەڵقوڵابێ! نەك پابەندبوونێکی دەرەکی بێ (لێرەدا دەرەکی مانای ئەوەیە داب و نەریت یان یاسا... هتد، شتەکان دەسەپێنن). ئەمەش بەپێی بەهاکانی کردارە ئەخلاقییەکان کارێکی یەکلاکەرەوەیە.

---

٨٢ - هیگڵ (موسوعة العلوم الفلسفیة) وەرگێڕانی ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام، کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٧ بڕگەی ژمارە/٢٤ (پاشکۆ).

ئەم (هۆشیاریەی خودی تاك) بنچینەی خودی تاکە، هەر خۆی گوزارشت لە ناخی راستەقینەی مرۆڤ دەکات، هەر بۆخۆشی ئەو راستییە بێ کۆتاییەیە کە بەهاو کەرامەت و پیرۆزییەکان بۆ مرۆڤ دادەنێ، کە لە لایێك لە شتە سروشتییەکان، لە لایێکی تریشەوە لە ئاژەڵەکانی جیا دەکاتەوە [٨٣].

ئەم (هۆشیاریەی خود) کە بنچینەی خود پێکدەهێنێ لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بە دی ناکرێ، لەبەرئەوەی رژێمە سیاسییەکان لەسەردەمە کۆنەکانەوە بەشی دووەمی ئەو هۆشیاریەیان لە ئێمە دزیوە و تەنها بەشی یەکەمیمان لەلا ماوە، کە هەست بە شتەکانی دەورو بەری خۆمان دەکەین. هەروەها ئەم (هۆشیارییەی خود) کە دەسپێکی بیرکردنەوەی زانستیانەیە، ئەگەر بێت و ونی بکەین هەتا بنا گوێمان لە شتە خورافیاتەکاندا نوقوم دەبین، کە ئەمەش ئێستا بە کردەوە رووی داوە.!

ئەم (هۆشیارییەی خودی مرۆڤ) بنچینەی ئەخلاقە باتنییە راستەقینەکەیە، ئەگەر بوونیشی نەما لە ئەخلاقە دەرەکییەکەی کە پشت بە سزا دەرەکییەکان دەبەستێ زیاتر هیچمان بە دەستەوە نامێنێ!.

ئەم (هۆشیاریەی خود) کە بنچینەی ژیانی سیاسیە، فەرمانڕەواکانمان لێمانیان دزیوە و زەوتیان کردوە، بۆیە هاوڵاتی وای لێهاتووە هیچ شتێك لەبارەی مافەکانی خۆی نەزانێت، بەڵکو وا بیر دەکاتەوە کە لەم دونیایەدا لەو رژێمەی کە چەندین ساڵە لە گەڵیدا دەژی زیاتر هیچ دەسەڵاتێکی تر لە جیهاندا بوونی نییە. ئەوەی ئێستا بۆ دروست کردنی دیموکراسی یان سیستەمێکی سیاسی باش پێویستە ـ گێڕانەوەی ئەو هۆشیاریە دزراوەیە بۆ ئەوەی هاوڵاتیان بتوانن خۆیان فەرمانڕەوایەتی خۆیان بکەن.

کڵێسا مەسیحییەکان بە درێژایی سەردەمەکانی ناوەڕاست، هەمان ئەو کارەیان کرد ئەو کاتەی کە بەشی دووەمی هۆشیاری ئەوروپییەکانیان دزیبو و تەنها بەشی یەکەمیان بۆیان بەجێ هێشتبوو، کە ئەمەش لەگەڵ ئاژەڵەکاندا یەك دەگرێتەوە ـ بۆیە تاك نەیدەتوانی بۆ خۆی بیر بکاتەوە (چونکە بیرکردنەوە Reflectio وەك گوتمان رەنگدانەوەیە) لەبەر ئەمەشە گەورەیی (دیکارت)ی باوکی فەلسەفەی نوێمان بۆ دەردەکەوێ کە توانی ئەم هۆشیارییە ونبووە بگێڕێتەوە و بۆ یەکەمجار مرۆڤ بتوانێ بڵێ: (من بیر دەکەمەوە) ـ چونکە وشەی

---

٨٣ - بە وردی بەو وتارەمدا بچۆرەوە کە لە بارەی (الوعي الذاتي) لە کتێبی (المنهج الجدلی عند هیگل) نووسیومە کتیبخانەی مەدبوولی / قاهیرە ساڵی ١٩٩٦ لـ ـ٥٣١ـ و دوای ئەو.

(من) مانای ئەو کردارە دوو لایەنەیە، کە خودی کەسەکە بۆ خۆی دەگێڕێتەوە تا درك بە خۆی بکات یان ئاگای لە خۆی بێت و بڵێ من.

ئەوەی ئێستا ئێمە دەمانەوێ بە هاوڵاتیانی عەرەبی بڵێین ئەوەیە کە بڵێ (من) من خاوەنی ئەم زەویەم، خۆشم دەیچێنم وخۆشم دەی دوورمەوە و هەر خۆشم بەرگری لێ دەکەم...هتد. کەواتە خۆم دەسەڵات دەگرمە دەست: ـ ئەوەی بۆ هاوڵاتی عەرەبی دەمانەوێ ئەوەیە کە هەست بە خودی خۆی بکات، وەك مرۆڤێك درك بە مرۆڤبوونی خۆی بکات کە وەك خەڵکانی تر ئەویش مافی هەیە، ئەو مافانەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە (جارنامەی جیهانی مافی مرۆڤدا) لە ١٠/دیسەمبەری ١٩٤٨ دا بڕیاری لێ داوە و لە ٣٠ ماددە پێك هاتووە.

ئەوەی بۆ هاوڵاتیانی عەرەبی داوای دەکەین ئەوەیە با دەسەڵاتی سەرپەرشتیکار (الوصی) رەت بکاتەوە لەبەرئەوەی چیتر ئەو منداڵ نییە وپێویستی بە فەرمانڕەواییێکی بێ خەوش نییە بە سەریاندا بیسەپێنن کە چۆن بژین، یان فەرمانڕەواییێکی ئاینی فێری بکات چۆن ژیانی سیاسی بە سەر بەرێت، چونکە ئەو هاوڵاتیە، کە بە ئاگری سیستەمە گشتگیر و دیکتاتۆرە سەربازی و نا سەربازییەکانەوە سووتاوە، کاتی ئەوە هاتووە کە بە ئاگایی و تواناوە مافە سیاسییەکانی خۆی پیادە بکات.

**بیرۆکەی چواردەم: ـ** ئەم بیرۆکەیە هەموو بیرۆکەکانی پێشتر لە وشەیێکدا کورت دەکاتەوە ئەویش (گوێڕایەڵبوونە بۆ یاساکان) هەروەها ئێمە دەمانەوێ ئەو شێوە کۆنەی کە دەڵێ: گەورەیی لەوەدایە، کە یاساکان پێشێل بکەیت و لەلای ئێمەدا شتێکی دەگمەنە ئەگەر یەکێك گوێڕایەڵی یاساکان بێت بە مەزن وگەورە دابنرێت ئەگەر ئەو یاسایە خۆشی داینابێ، لە وڵاتەکەماندا نەمێنێ، چونکە فەرمانڕەوا بەم کارەی دەیەوێ ویست و ئارەزووەکانی رەها و بێ سنوور بن، ئەگەر خۆشی داڕێژەری ئەو یاسایە بێ. لەبەر ئەوەی سووکایەتی کردن بە یاساکان هێڵی جیاکەرەوەی نێوان فەرمانڕەواو خەڵکی رەشۆکیە لەلای ئێمە، بۆیە تۆ پێم بڵێ تا چەند دەتوانی سووکایەتی بە رێنمایی و یاساکان بکەیت، منیش پێت دەڵێم تۆ لە چ پلەو پایەیێکی کۆمەڵدای، چونکە لە هەمووان پلەو پایە بەرزتر، لە هەمووان زیاتر سووکایەتی بە یاسا دەکات و لە هەمووان نزمتر لە هەمووان کەمتر سووکایەتی بە یاسا دەکات [٨٤].

---

٨٤ - د.زەکی نەجیب مەحموود (... والثورة علی الابواب) لـ٧٨ــ(لە چاپکراوەکانی کتێبخانەی ئەنگلۆ میسریە).

له ((وینستۆن چەرچڵ))ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا دەگێڕنەوە و دەڵێن: له کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا دەچێتە ناو ئێزگەی رادیۆی بەریتانیا بۆ ئەوەی وتارێك بۆ خەڵکی بەریتانیا بخوێنێتەوە، له ژوورەکەدا بێژەرەکە داوای لێدەکات جگەرە بە ناوبانگەکەی بکوژێنێتەوە، لەبەرئەوەی له ژوورەکەدا جگەرەکێشان قەدەغەیە، ئەو پیاوەش جگەرەکەی کوژاندەوە و وتارەکەی خۆی پێشکەش کرد له کاتی دەرچوونیدا، دیتی بێژەرەکە بە شێوەیێك تەماشای دەکات و چاوی پڕ له ترس و دڵەڕاوکێیە لەبەر ئەو کارەی کە کردویێتی، یەکسەر گەڕایەوە لای و دڵی دایەوە گوتی: دەڵێی دەترسێی؟ باشە له چی دەترسی؟ ئەی تۆ یاسات جێ بەجێ نەکرد؟ کە ئەمەش ئەرکی تۆیە، سەرۆك وەزیران خۆی له بێژەرەکە تووڕە دەکات تەنها لەبەر ئەوەی له جێبەجێکردنی یاسادا بە سەر سەرۆکی وەزیراندا هەستی بە ترس کردووە، کە نەیهێشتووە جگەرە بە ناوبانگەکەی بکێشێ.

ئێمە دەمانەوێ فەرمانڕەوا، یان هەر کەسێکی تر بێ کە له وڵاتەکەماندا دەسەڵات دەگرێتە دەست یەکەم کەس بێت یاسا جێ بە جێ بکات تەنانەت لەسەر خۆیی و خێزانەکەشی، نابێ کەس له کەس وکاری خۆی یان ناسیاوێکی خۆی له هەر تاوانێك، یان کەتنێك، یان سەرپێچییێك کە کردبێتی دەربازی ببێت، هەر چەندە ئەو سەرپێچیە سادەو بچووکیش بێت، ئەگەر سەرپێچی کردنێکی یاسای هاتوچۆش بێت، یان ڕێنماییەکان بێ، یان بیناسازی بێت، یان گومرگ، یان باج، یان سەرپێچییێکی سەربازی بێت نابێ دەربازبێت، هەروەها لەبواری کارکردندا بە پێش کەس نەکەوێ، یان پەنا نەباتە بەر دەسکەوتی ناشەرعی... هتد.

ئێمە دەوڵەتی یاسامان بە کردەوە دەوێ، نەك هەر بە قسە بێ، یان بە چەند دەقێکی نووسراو له جیهانێکی (خەیاڵی)یدا، بەڵام کە دێتە سەر ئەرزی واقیع تێك دەشکێ وکەس کاری پێناکات، کەچی لەوانەیە بگوترێ: ئەو یاسایەی کە تۆ دەتەوێ سەروەر بێ، ئایا بۆ جێبەجێکردنی پێویستی بە (ئەخلاق) نابێ؟ له وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، لێرەدا دەگەینە ترۆپکی رێکخستنێکی سیاسی باش کە هەردوو بەشەکەی (ئەخلاقی تاك) لەگەڵ گشتدا (یاسای گشتی) له یەك ئاستدا دەگەنەوە یەك، دادوەر یاسا جێبەجێ دەکات، بەڵام له هەمانکاتدا پێویستی بە دەروون پاکی و دڵسۆزی و گەڕانەوە بۆ ویژدانی خۆی دەبێ بۆ ئەوەی بە وردی ئەو یاسایە جێبەجێبکات!.

کەس گومانی لەو بەها ئەخلاقیانەی رەفتارەکانی تاك نییە، بەڵام ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەین ئەوەیە هەڵسوکەوتەکانی (تاك)، هەرچەندە بێ خەوشیش بێت، لەگەڵ سیاسەت واتە رێکخستنی ناوخۆی وڵات کە دەبێ یاسا تیایدا سەروەر بێ لە یەکتر جیا بکەینەوە!.

# بەشی سێیەم

## ((ئەخلاق.... سیاسەت))

**(( لە رابردوودا دژایەتی  نێوان ئەخلاق و سیاسەت  جێگای مشتومرێکی دوورودرێژی ناو خەڵکی بوو .. لە راستیدا چاکە و خێرو بێری دەوڵەت چەند داخوازییێکی شەرعی خۆی هەیە، کە  زۆر جیاوازترە لە داخوازییەکانی شەرعیەتی چاکەکانی تاك ...)).**

**هیگڵ (اصول فلسفة الحق)..لـــ٥٩٨ـ))**

## دەسپێك:

کاتێك وشەی (سیاسەت)مان بەر گوێ دەکەوێ، یەکسەر وشەی (دەوڵەت) دێتە ناو مێشکی مرۆڤ ئەو وابەستەبوونەی ئەو دوو وشەیە بە یەکتریەوە لە پرۆسەی بە بیرهاتنەوەی نەستدا دەتوانین بە ململانێیەکی هەتاهەتایی نێوان تاك و دەوڵەت لێکی بدەینەوە [٨٥]. یان بە واتاییێکی تر بڵێین لەنێوان (ئەخلاق و سیاسەتدا)، لەنێوان رەفتارەکانی تاك کە دەبێ لەگەڵ کۆمەڵێك داب و نەریت و بێخەوشیدا تەبا بێت و نێوان رەفتارەکانی کۆمەڵ کە دەبێ یاساییێك هەبێ رێنماییان بکات نەك (ویژدان) و(ئەرك) و ئەو هەستەی کە ئەم و ئەو دەیانەوێ بیسەپێنن.

بەم شێوەیە بۆمان روون دەبێتەوە کە لێرەدا دوو بواری دیار و جیاواز هەیە، کە نابێ تێکەڵ بە یەکتری بکرێن ئەویش بواری (ئەخلاق)ە کە رەفتارەکانی تاك رێك دەخات و بواری (سیاسەت) یش، کە بەو چەند یاسا سیاسیەی، کە دەیان سەپێنێ، رەفتارەکانی کۆمەڵ رێك دەخات و لە کۆتاییدا هەر ئەویش فەرمانڕەوایەتیان دەکات. ئێمە دەمانەوێ لە مانای وشەی سیاسەت تێبگەین[٨٦]، کە دەکرێ بڵێین یاسای ناوخۆی دەوڵەتە. بەوەی کەوا جیاوازی نێوان بواری (ئەخلاق) و بواری (سیاسەت) هەمان جیاوازی نێوان بنەما ئەخلاقییەکان و بنەما یاساییەکانە و لە لاپەڕەکانی داهاتوودا تایبەتمەندییەکانی هەر بوارێك و جیاوازی نێوانیان و

---

٨٥ - (تاريخ الفكر السياسي) د. ئیبراهیم دەسووقی ئەبازە، د.عەبدولعەزیز ئەلغەننام، دار ئەلنەجاح بەیروت ساڵی١٩٧٣ لـــ٦ـــ.

٨٦ - وشەی سیاسەت لەوانەیە مانا گەلێکی زۆری هەبێ : وەك سیاسەتی ناوەخۆ لە دەوڵەتدا (واتە ئەو یاسایانەی کە ژیانی خەڵکی رێك دەخات ) یان سیاسەتی دەرەوە (واتە پێوەندییەکانی نێوان وڵاتان رێك دەخات ) و وشەی سیاسەت بە هەندێك کۆمەڵە مەبەستی هاوبەش دەوترێ کە گەلێك دەیکاتە ئامانجەکانی خۆی و بەو رێگایانەش دەگوترێ کە ئەو گەلە ئامادەی دەکات بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە د.عەبدولحەی حیجازی (المدخل لدراسة العلوم القانونية)بەرگی یەکەم لـــ٧٢ـــ. و یاسا دانەری فەرەنسی(ج ـ دابان) بەم شێوەیە پێناسەی سیاسەت دەکات (زانست و هونەر لە هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی کۆمەڵەی سیاسی (نیشتمانی و نێودەوڵەتی)دا هەڵدەقوڵێ و لە حکومەتەکەی ئەو کۆمەڵەیەدا هەوڵ دەدەن بگەنە باشترین ئەو رێگایەی کە دەبێتە هۆی بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆی، ئەویش خێرو بێرە گشتییەکانە بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵەکە خۆی لە رێگای رێزگرتنی تاکەکان لە مافەکانی ئەویتر ) سەرچاوەی پێشوولـــ٧١ــپەراوێزی ژمارە/٤.

ئەو پێوەندیەی، کە بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە بەجیا لێکیان دەدەینەوە. ئەمەش گومانی تێدانییە وەك ((بیرگ)) دەڵێ (کە ئەو پرەنسیپە راستەقینانەی سیاسەت هەمان پرەنسیپەکانی ئەخلاقن، تەنها فراوانتر بوونەتەوە) ئەو فراوان بوونەش لێرەدا بە مانای بە یاساکردن دێ ((یان لە ناو چوارچێوەی چەند یاسایەکی دیاریکراو و ڕووندا دابنرێ و جارێکی دیکە وەك چەمکێکی ئەخلاقیانە بەکار نەهێندرێ و تاك بە ئارەزووی خۆی لێکی بداتەوە. بەڵکو ببێتە چەند یاسایەك و بەسەر هەموو ئەو تاکانەدا بسەپێ کە ئەو کۆمەڵە پێکدەهێنن: لە سەرەوە تا دەگاتە خوارەوە: لە فەرمانڕەواوە تا پیاوانی سەر شەقام بەبێ هیچ جیاوازییێك.

## ئەخلاق:

مرۆڤ بوونەوەرێکی ئەخلاقیە هەر بەم رەفتارە بەرزەشییێتی لە ئاژەڵ جیادەکرێتەوە، کەوا لە ئەخلاق دەکات ببێتە سروشتی دووەمی مرۆڤ ــ تەنها مرۆڤە کە ئەگەر بارو دۆخەکە لەبار نەبوو دەتوانێ ئارەزووەکانی بەرزەفت بکات و هەر چەندی ئەو ئارەزووە فشاریشی بۆ بێنێ بتوانێ رێگە لە تێربوونی ئارەزووەکانی خۆی بگرێ، هەر ئەویشە دەتوانێ دەسەڵاتی بەسەر غەریزە و هەڵچوونەکانی خۆیدا هەبێ هەر چەندە زۆرو بەهێزیش بن. ئەمە ئەو مرۆڤە خاوەن ئەخلاقەیە کە دەکرێ رەفتارەکانی هەم بە ئازا، یان بە ترسنۆك، یان بەڕاستگۆ، یان بە درۆزن، هەروەها بە دەست پاك یان بەدز، بە ئاینپەروەر یا قۆلبڕ و بە خۆپەرست یان مرۆڤێکی کراوە....هتد لەقەڵەم بدرێ.

کەواتە وەك کانت) kant) دەڵێ مرۆڤ ئاژەڵێکی ((خاوەن ئەخلاقە)) ئـەویش ئـەو بیرۆکەیـە دەردەبڕێ کە دەڵێ ئەخلاق تەنها تایبەتە بە رەفتارەکانی مرۆڤ نەك ئەوانی تر، مـرۆڤ ئـەو تاکـە بونەوەرەیە کە هەڵگری بەها ئەخلاقییەکانە وەك هارتمـان ( N.Hartman _ 1882ــ ١٩٥٠) دەڵێ: مرۆڤ ئەو تاکە بونەوەرەیە تەنها لەرێگەی بەها ئەخلاقییەکانییەوە بوونی دیـاری دەکـرێ. (هیگل)یش G.Hegel ئەمەی لە رستە کۆکەرەوەکەیدا پوخت کردۆتـەوە ((ئـەخلاق سروشـتی دووەمی مرۆڤە، چونکە سروشتە یەکەمەکەی لایەنە ئاژەڵ ئاسا راستەوخۆکەیەتی))[87] و ئەگـەر مرۆڤ تەنها خۆی جێگری خوابێـت لەسـەر زەوی و ئەگـەر هـەر خـۆی ئـەو پاداشـتە خواییـەی

٨٧ - هیگڵ (العقل فی التاریخ) وەرگێڕانی د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام ـدەزگای تەنویر بەیروت ساڵی ١٩٨١ لــ١٠٤ــ.

هەڵگرتبێ کە توانای ئەوەی پێ دەبەخشێ هەمووشتەکان بزانێ و بە تایبەتی خێرو شەڕ لێك جیا بکاتەوە ــ ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەو مرۆڤە خاوەن ئەخلاقە، مرۆڤی تاکە نەك کۆمەڵ، چونکە مەبەستەکانی ئەخلاق میسالیانەیە کە ئەویش تاك دەگەیێنێتە ئاستی کامڵ بوون، لە کاتێکدا ڕێکخستنی سیاسی واقیعبینانەتر و سوودمەندانەترە، ئامانجی دروست کردنی ڕێنمایی و سەقامگیری و پاراستنی بەرژەوەندیە گشتییەکانی خەڵکیە لەناو کۆمەڵگەدا، بۆیە بنەما ئەخلاقییەکان لە ویژدانەوە هەڵقولاون و بە مەبەستی پاك کردنەوەی دەروونی تاك رووی لە تاك کردووە و بەرزی بکاتەوە بەرەو مێرگە بالاکان وکامڵبوونی مرۆڤایەتی. بنەماکانی ڕێکخستنی سیاسیش روو لە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ دەکات، ئەو بەرژەوەندییە هاوبەشەی کە تاکەکانی کۆمەڵ بە یەکەوە دەبەستێتەوە و سیستەم و سەقامگیرییەکانی خۆی لەسەر هەڵدەنێ. کەواتە ئەخلاق هەندێك بنەما دادەنێ کە بەهای هەڵس و کەوتەکانی کەسەکە دەسنیشان دەکات تا بڕوانێتە خودی خۆی ـ واتە تێڕوانینی دوا ئەنجامەکانی ئەم هەڵس وکەوتانە و شوونەوارەکانی لەسەر خودی کەسەکەدا کە ئاستی دەروونی خۆی بگەیێنێتە ئاستێکی بالا وکامڵ کە ئارامی دەروون و خۆشگوزەرانی بۆ بە دی بهێنێ.

بەلام ڕێکخستنی سیاسی ئەو یاسایانە دانانێ کە بەهای رەفتارەکانی ئەو کەسە بەرامبەر بە کۆمەڵگە دەسنیشان دەکات و تێڕوانینەکانی ئەو رەفتارانە وکاریگەری لەسەر خودی کۆمەڵگە کە بە دیهێنانی بەرژەوەندی قازانج و ئاسایشی کۆمەڵگەیە.

لێرەوە بوونی ئەخلاق لەسەر بنچینەی بەدیهێنانی بەها بەرزەکانی کەسایەتییە و بوونی یاسا سیاسییەکان لەسەر بنچینەی بەدیهێنانی بەها کۆمەلایەتییە سوود بەخش و دیاریکراوەکانە. بۆیە ئەخلاق لە سەرنجە بەردەوامەکانی تاك بەرەو بەرزی وکامڵ بوون ئەو تاکە دەخاتە بن رکێفی ویژدانی خۆی، لە کاتێکدا یاسا لە هەوڵە بەردەوامەکانی خۆیدا بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی خۆی و دروست کردنی دەزگا مەدەنییەکان و سەقامگیری تیایدا تاك دەخاتە بن رکێفی کۆمەڵەوە. بۆیە دەڵێن:: یاسا یان ڕێکخستنی سیاسی سیستەمێکی کۆمەلایەتیە، بەلام ئەخلاق سیستەمێکی تاکە کەسیە. بۆیە هەندێك لە بیرمەندەکان دەڵێن یاسا ئامانجی ئەوەیە یەکسانی بە دیبێنێ لە کاتێکدا ئەخلاق ئامانجی بە دیهێنانی خێرو بێرە، یان بەزەیی...هتد [٨٨].

---

٨٨ - عەبدولحەی حیجازی (المدخل لدراسة العلوم القانونیة) لە چاپکراوەکانی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٧٢.

هەردوو سیستەمەکە  لە رووکەشدا یەك دەگرنەوە، بەڵام لە واقیعدا لەیەکتر جیاوازن، بۆ نموونە: ئەگەرچی هەردووکیان کوشتن حەرام دەکەن، بەڵام ئامانجیان جیاوازە: یاسا دەڕوانێتە دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی کوشتن، وەك کاریگەریە خراپەکانی لەسەر باری ئاسایش و سەقامگیر بوونی کۆمەڵگە، بەڵام هەرچی ئەخلاقە، دەڕوانێتە ئەو ئاستەی دەروونی مرۆڤی تێدا دێتە خواریێ و تا چەند شەڕخوازی و خراپەکاری تێدا دەڕویێ. یاسا کە کوشتن حەرام دەکات، بۆیە حەرامی دەکات، چونکە خۆی بە پاسەوانی کۆمەڵگە دەزانێت لەو کەسانەی کە دەیانەوێ ئاسایش و سەقامگیری کۆمەڵگە تێك بدەن، بەڵام کە ئەخلاق حەرامی دەکات، بۆیە حەرامی دەکات چونکە پاسەوانی تاکەکەیە دژی ئەو کەسەی کە شەڕی پێ دەفرۆشێ، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە رەفتاری تاك بەوە پێناسە دەکرێ کە بە ئەخلاقە یان بێ ئەخلاقە، بە مانایێکی وردتری ئەم وشەیە، چونکە (پێناسەکانی) کردارە ئەخلاقییەکان تەنها بە سەر رەفتارەکانی تاکدا دەسەپێ [89].

ئەگەر بلێین یەکێك لە شتە پێویستەکان ئەوەیە کە دەبێ کردار ئازاد بێ بۆ ئەوەی بتوانرێ وەسفی بە ئەخلاق یان بێ ئەخلاق وەك خۆی باس بکرێ، پێناسەی کرداری ئازاد (ئەو کردارەیە کە بکەر دەتوانێ کارێکی تر هەڵبژێرێ، چونکە ئەگەر کردار ئازاد نەبێ لە بازنەی ئەخلاق دەردەچێ. ئایا دەکرێ رەفتارەکانی کۆمەڵە کەسێك بە ئازاد وەسف بکەین، بەو مانایەی کە تێیدا مەبەستمان (ئازادی ویست و ئارەزووەکانە) ـ نەك ئازادی سیاسی؟! ئایا دەتوانرێ هەڵبژاردنێك لە نێوان بە ئەخلاق و بێ ئەخلاق و لەنێوان دەسپاکی و دزیدا بکرێ؟!، تەنها ئەگەر لەمەدا مەبەستمان دەستنیشانکردنێکی ئازادانە بێ لەلایەن تاکەوە بۆ رەفتارێکی دیاریکراو [90].

---

٨٩  - کتێبە یاساییەکان ئەم بیرۆکەیە  زۆر  بەرِوونی دەخەنە ڕوو بۆ نموونە تەماشای د. حەسەن کیرە لە کتێبی (المدخل الی القانون) بکە لە خانەی نەهزەی عەرەبی چاپ و بلاّو کراوەتەوە ساڵی ١٩٦٧ لــ٣٠٠ــ و دوای ئەو. د. عەبدولحەی حیجازی (مدخل لدراسة العلوم القانونیة) زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٧٢ بەشی یەکەم لــ١٦٠ــ. و د. ئیبراهیم ئەبو لەیل و د. محەمەد لئەلفی (مدخل لنظریة القانون والحق) لە بلاّوکراوەکانی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٨٦ لــ١٧ــ و دوای ئەو. د. عەبدولعەزیز عامر (مدخل لدراسة القانون المقارن..) لە بلاّوکراوەکانی مزگەوتی قار یونس ـ بەنغازی ساڵی ١٩٧٧ لــ٢٥ـ٢٦ــ..هتد.

٩٠  - مانای ئەوەیە ئەگەر ئەو کارەی بە  (زۆرداری) پێ بکەن کارێکی ئەخلاقیانە نییە ئەگەر لەگەڵ بەها ئەخلاقیەکانیشدا بگونجێ: وای دابنێ یەکێك رۆیشتە  لای دەوڵەمەندێکی رەزیل و بە دەمانچە هەڕەشەی لێ کرد و پێی گوت دەبێ پارە بدەیە هەژارەکان، یان کۆمەڵە خێرخوازییەکان، وا دابنێ رەزیلەکە بە گوێی کردو

هەروەها یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی کردارە ئەخلاقییەکان ئەوەیە، کە زۆر پشت بە نیاز (نییەت) یان (کانت) ناوی لیێ ناوە (مەرامی چاکەخوازی) دەبەستیێ، بۆیە ئەو کردارە بە کردارێکی ئەخلاقی دەمێنیێتەوە لەبەرئەوەی لە ئەنجامی (نیازێکی چاکەخوازانەوە) رووی داوە، ئەگەر ئامانجەکەی خۆشی بە دی نەهێنابی، لە کردارە ئەخلاقییەکاندا هیچ مەرجێکی ئەوتۆ نابیندریێ، تەنها ئەو هەنگاوە پێویستانە نەبیێ، کە لە ئەنجامی نیازێکی چاکدا دەنرێن بۆ هێنانە دەرەوەی ئەو نیازانە بۆجیهانی رووناکی. لێرەدا (کانت) لە دەربڕینەکەی خۆیدا وردبین بووە کە وشەی (ویست و ئارەزوو)ی چاك یان خێرخوازانەی لە جیاتی وشەی (نیاز) بەکار هێناوە، (چونکە ئەو بۆ بە دیهێنانی نیازە چاکەکان هەوڵی ویستێکی ئارەزوومەندانە بەکار دێنیێ و لەناو خودی مرۆڤدا وەکو ئاواتێك نایهێڵێتەوە، بەڵام ئەگەر هات و ئەو ویستە چاکخوازیە هەوڵەکانی خۆی بۆ جێبەجێکردنی بەکارهێناو تیایدا سەرکەوتوو نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بە خاوەن رەفتار و ئەخلاقێکی باڵا دەمێنێتەوە[91].

ئەمەش مانای ئەوەیە کە بنەما ئەخلاقییەکان گرنگی بە حاڵەتی ناوەوەی تاك دەدات و لەبەر رۆشنایی ئەم حاڵەتەدا رێز لە کارەکانی دەنریێ: بۆ نموونە، کارێکی ئەخلاقیانەی وەك یارمەتیدانی مرۆڤی هەژار وکەم دەرامەت ـ لەوانەیە لە گەڵ پێداویستیەکانی ئەخلاقدا هاوڕا

---

هەرچی هەیە کردیە خێر: ئایا لەم حاڵەتەدا ئەم کارە ئەخلاقیانەیە؟ ئایا ئەمە بۆ هەژار و دەسکورتەکان بە چاکە دەژمێردریێ ؟! نەخێر، چونکە مەرجەکانی کاری ئەخلاقیانە ئەوەیە کە دەبیێ ئازاد بیێ و بە ویست و ئارەزووی ئازادانەی خاوەنەکەی بیێ !.

٩١ - تەنها هەندێك نموونەی کەم دەهێنینەوە :- ئەگەر داوایان لە پزیشکێك کرد کە نەخۆشێك چارەسەر بکات، ئەویش جانتاکەی هەڵگرت و سواری ئۆتۆمبیلەکەی بوو و بە پەلە بە ڕیێ کەوت، بەڵام لە رێگادا تووشی رووداوێك بوو و نەیتوانی لەکاتی پێویست بگاتە لای نەخۆشەکە، کاتێك، کە گەیشتە ئەویێ دیتی نەخۆشەکە مردووە ـ لەگەڵ ئەوەی نەخۆشەکەشی چارەسەر نەکرد بەڵام هەر بە رەفتارێکی ئەخلاقیانە دادەنریێ.

- لە هاوینی ١٩٠٧دا فەیلەسووفی فەڕەنسی سەردەم (ئۆکتاڤ هاملان ـ Octave Hamelin ـ ١٨٥٦ـ١٩٠٧) سەفەرێکی بۆ کەنارەکانی لاند جێبەجیێ کرد کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای فەڕەنسا بە مەبەستی گەشت وگوزار. لەویێ یەکێکی دیت وا خەریکە دەخنکیێ، خێرا خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکەوە تا ڕزگاری بکات، بەڵام لە بە دیهێنانی ئامانجەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو و کابرایەکە خنکا. لەگەڵ ئەوەشدا و سەرەڕای خنکانی کابرا و فەیلەسووفەکەش لەگەڵیدا رەفتارەکانی هاملان ئەخلاقیانە بوو بەڵکو پاڵەوانێتیش بوو.

بیٚ، یان پێچەوانەی ئەو بێت بەپێی مەبەستی خێرخوازەکە خۆیەتی، کە ئایا بە نیازپاکی ئەمەی کردووە یان بە مەبەستی خۆدەرخستن و پێدا هەڵگوتنی خەڵکی کردوویەتی[92].

هەروەها تایبەتمەندییەکانی کاری ئەخلاقیانە بەهاکەییێتی کە لە ناوخۆیدا خۆی حەشار داوە، رەفتاری (دەسپاکی) لە ناو خودی خۆیدا بەهاکەی خۆی هەڵدەگریٚ. راستگۆیی بە چاو پۆشی لەوەی هەرچییێکی لیٚ بکەوێتەوە خۆی لە خۆیدا بەهاییێکی ئەخلاقیانەیە، هەمان شتیش لە بارەی ئازایەتی و دەست بڵاوی و چاکە و قوربانیدان و بەها ئەخلاقییەکانی تر بڵیٚ بەهاکانی کرداری ئەخلاقیانە ناوەستێتە سەر ئەنجامەکانی ئایا جێبەجیٚ دەکریٚ یان هەوڵدەدات بیکات، بەڵکو دەوەستێتە سەر ئەوەی کە بە پێی ئەو پرەنسیپ و بنەمایانەی کە مرۆڤ ئەرکەکانی خۆی جێبەجیٚ دەکات، ئەو ئەرکە هەرچییێك بێت. ئایا ئەو رۆژەی (ئۆکتاڤ هاملان)کە خۆی فریٚ دایە ناو ئەو شەپۆلە بە یەکدا هاتووانەوە بۆ ئەوەی مردووەکە رزگار بکات چاوەڕێی هیچ پاداشتێکی دەکرد؟ بەڵکو ژیانی خۆشی وەك نرخێك بۆ ئەم کردارە ئەخلاقیە لە سەر دانا!!.

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین: کاری ئەخلاقیانە، دەبیٚ پێش هەموو شتێك تاك توانای زانینی خێرو شەڕی هەبێت و لە یەکیان جیا بکاتەوە، دواتریش بە کردارێکی ئازاد و بە ئاگاوە یەکێکیان هەڵبژێریٚ و ئامانجی بەدیهێنانی مەبەستێکی ئەخلاقیانەی دیاری کراو بیٚ کە کەسەکە بە ویست و ئارەزووی خۆی هەوڵی بۆ دەدا و هەنگاوە پێویستەکان بۆ ئەو هۆکارە بە کار دەهێنیٚ. ئەو فەرمانە خوداوەندیەی کە جۆرێك لە جۆرەکانی بەرو بوومی حەرام کردووە، ئایا بۆ یەك کەس هاتووە یان بۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتووە؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیێنیٚ کە ئێمە بە هەڵەدا چووینە ئەگەر بلێین: لەبەر ئەوەی بەرپرسیارێتیەکە لە ئەستۆی کۆمەڵدایە سزاکەشی بە کۆمەڵ دەبیٚ، وەك ئەوەی جوولەکەکانیش کردیان! ئایا ئەوە راستتر نییە کە بڵێین بەرپرسیارێتیەکە بۆ تاکە و سزاکەش هەر بۆ تاك دەبیٚ؟ ئەمە ئەو ئەخلاقەیە کە هەر لە بنچینەدا رژاوەتە ناو رەفتارەکانی تاکەوە. و دەتوانین هەمان شت لە بارەی (١٠) دە ئامۆژگاریەکە بلێین: کە دەڵیٚ: کەس مەکوژە، دزی مەکە و زینا مەکە...هتد هەرچەندە ئەم شتانە ئاراستەی مرۆڤ کراوە وەك مرۆڤێك و لەکۆتاییدا جێبەجێکردنەکە دەخرێتە ئەستۆی

---

٩٢ - عەبدولحەی حیجازی (مدخل لدراسة العلوم القانونیة) بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٧٢ بەشی یەکەم لــ١٦٠ــ.

تاکەوە، کە ئەویش لەوانەیە پێی رازی بێ یان رەتی بکاتەوە. بەو پێیەش یاسا ئەخلاقییەکان جیاوازیان لەگەڵ یاسا سیاسییەکاندا هەیە، وەك ئەوەی دوای کەمێکی تر پێی ئاشنا دەبین کە ئەوەی دووەمیان تایبەتە بە رێکخستنی رەفتارەکانی دەرەوەی تاك لەناو کۆمەڵدا و گۆشکردنی کاروبارەکانی ناوەوەش کە پەیوەستە بە سۆز و نیاز بۆ بنەماکانی ئاین و ئەخلاقی بەجێ هێشتووە. بۆیە یاسا تەنها لە سەر بیرکردنەوە لە تاوان کەس سزا نادات، بەڵکو دەبێ رەفتارە دەرەکیەکە بوونی هەبێ و دەسنیشان بکرێ وەك دەست کردن بە جێبەجێکردنی، یان هەڵسان بە ئامادەکردنی. تەڵاقیش ناکەوێ ئەگەر پیاوەکە تەنها بیر لە تەڵاق بکاتەوە، بەڵکو دەبێ دارشتەیێك هەبێ ئاماژەی پێبدرێ بۆ تەڵاقدانەکە...هتد[٩٣].

بەڵام ئایا ناڵێین کۆمەڵیش ئەخلاقی خۆی هەیە؟ هەندێك جار وا روو دەدات کە کۆمەڵێك بە راستگۆیی و دەستکراوەیی یان ئازایەتی بە ناوبانگن، هەندێکی تریش بە درۆزن ناویان دەرکردووە وەك (ئیپیمیندس Epimenides)ی فەیلەسووف لە بارەی کرێتییەکان[٩٤] دەڵێ: کرێتییەکان هەتا قولەپێیان لە فرت وفێڵ و خیانەتدا نوقوم بوونە!. ئایا لەم حاڵەتەدا لەبارەی ئەخلاقی کۆمەڵێك کەس قسە ناکەین؟! لەلایێکی تریشەوە ئایا گوشارێکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی توند لە سەر تاك نییە کە بە بنەما ئەخلاقیە تایبەتەکانەوە پابەند بێ و رەچاوی بکات؟ ئایا کۆمەڵگەش پەنا ناباتە بەر جێبەجێکردنی ئەو بنەمایانە تا بە چەندین سزای ماددی و ئەخلاقی ئەو پابەند بوونە بە دی بێنێ؟! لەم حاڵەتەدا دەبێ ئەخلاق (رێکخستنێکی کۆمەڵایەتی) وەربگرێ بۆ ئەوەی تاك گوێڕایەڵی رێ و شوێنەکانی ژیانی کۆمەڵ بێت. لەوەدا

---

٩٣ - (المدخل الى نظرية القانون ونظرية الحق) دانانی ئیبراهیم ئەبولەیل و د.محەمەد لئەلفی بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٨٦ لـ١٣ـ.

٩٤ - فەیلەسووفێکی یۆنانی کۆنە (لە سەدەی شەشی پێش زاین ژیاوە) خەڵکی دوورگەی کرێتە لەسەر جیاوازییە مەنتقییەکان ململانێی لەگەڵ (میگاریا)دا هەبووە. لە بارەی خەڵکی وڵاتەکەیەوە دەڵێ (کرێتییەکان هەموویان درۆزنن)، لەهەمانکاتدا خۆشی خەڵکی کرێتە، واتە ئەویش درۆزنە، لێرەدا وشەی درۆزن واتە مانای پێچەوانەکەی دەبەخشێ کە ڕاستگۆیە واتە خەڵکی کرێت هەموویان ڕاستگۆن، ئەوەی کە واشی گوتووە یەکێکە لەوان واتە ئەویش ڕاستگۆیە ! لەبەر ئەم هۆکارەیە پێی دەڵێن (جیاوازییەکانی ئەپیمێنیدس) یان جیاوازییەکانی (درۆزنەکە) بەراوردی بکە.

Penguin Dictionary Of Philosophy Ed By Thomas Moutner 1997P.173

(ئەقلێکی بە کۆمەڵ) دروست دەبێ وەك (دۆرکایم) بۆی چووبوو. (بەو مانایە ئەخلاق تەنها ئامێرێکە لە ئامێرەکانی داب و نەریت، ئەرکەکەشی لە پاراستنی کۆمەڵگەدا خۆی دەنوێنێ، یان تەنها ئەخلاقێکی گشتیە یان ئەخلاقی کۆمەڵە).

لێرەدا یاساناسی فەرەنسی (کێلسن)Kelsen وای دەبینێ، کە (تیۆرە پاراوەکانی یاسا بە شێوەییێکی بنەڕەتی بنەما یاساییەکان و بنەما ئەخلاقییەکان لەیەکتر جیا دەکاتەوە) ـ بەڵام درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێ:(جیاکردنەوەی یاساو ئەخلاق لەیەکتر مانای ئەوە نییە کە یاسا پێچەوانەی ئەخلاق (Immoral..) بکەینەوە، بەڵکو تەنها وای لێ بکرێ لە ئەخلاق ammoral.. جیا بکرێتەوە[٩٥].

لە راستیدا بنچینەی کێشەکە و سەرچاوەی تێکەڵکردنەکە، دوو هۆکارن: ـ

**یەکەم:** ـ ئێمە زۆر جار ئەو رستەیەمان لەبیر دەچێتەوە، کە دەڵێ: ـ (فلانە گرووپ بە راستگۆیی، یان بە دەسکراوە، یان بە ئازایەتی...هتد بە ناو بانگن، لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە زۆربەی تاکەکانی ئەو گرووپە، کە بە راستگۆیی، یان بە دەستکراوە، یان بە ئازایەتی...هتد بەناوبانگن. لە کۆتاییدا تەنها تاکەکە خۆی راستگۆیە یان درۆزنە، دەسکراوەیە یان رەزیلە، ئازایە یان ترسنۆکە...هتد. ئەگەر هات و ژمارەی ئەو تاکانەی ئەخلاقێکی دیاریکراویان هەیە لە گرووپێکی دیاریکراودا زۆر بوون گرووپەکە بەو ئەخلاقە ناوبانگ دەردەکەن و پێی دەڵێن ئەخلاقی کۆمەڵایەتی کە لە بنچینەدا لە ئەخلاقی تاکە کەسدا سەرچاوە دەگرێ، دۆرکایم دەڵێ: (کاتێك کە ویژدان قسە دەکات، کۆمەڵگە هەرهەمووی لە بارەی ئێمەوە قسە دەکەن). ویژدانی بە کۆمەڵ کە بیر دەکاتەوە و هەست دەکات و دەیەوێ، بەڵام لە رێگەی ویژدانی تاکەکانەوە نەبێت ناتوانێ بیر بکاتەوە، یان هەست بکات، یان بیەوێ[٩٦].

---

٩٥ - د. عەبدولحەی حیجازی (المدخل لدراسة العلوم القانونیة) لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٧٢ بەشی یەکەم لــ١٦٠ــ.

٩٦ - د. سەمیر عەبدولمونعیم لە کتێبەکەیدا (البعد الاخلاقي لقانون العلاقات الدولیة) کتێبخانەی نەهزەی میسری چاپی یەکەم ساڵی ١٩٨٨ لــ٨٨ــ رستەکە لە کتێبی (دروس في الفلسفة الوصفیة) لــ١٠٢ــ وەرگێراوە.

**دووەم:** ـ ئێمە زۆر جار سەرچاوەی بنەما ئەخلاقییەکان لەگەڵ ئەو کەسەی کە کارەکە جێبەجێدەکات تێکەڵی یەك دەکەین، لەوانەیە ئەو گرووپەی کە نوێنەرایەتی داب و نەریتێك بکات، ئەو خۆی بنەما ئەخلاقییەکانی دانابێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاك بۆی هەیە و ئازادە لەوەی گوێڕایەڵی بێت یان بە ویستێکی ئازادانە ڕەتی بکاتەوە و گوێڕایەڵی نەبێت و کۆتاییەکەشی هەرچییێك بێت لە ئەستۆی خۆی دەگرێ. هەمان شتیش لەبارەی ئەو گرووپە بچووکانەی ناو یەك کۆمەڵگە بڵێ: بۆ نموونە وەك گرووپەکانی پارێزەران و پزیشکان...هتد هەندێك جاریش پێی دەڵێین: (ئەخلاقی پیشە)، لەوانە گرووپی پارێزەران، کە خۆیان ئەو بنەمایانەیان داناوە کە نهێنییەکانی (خاوەن کێشەکان) ئاشکرا نەکەن، یان هەڵیان نەخەڵەتێنن، یان ئەو کەسەی کە دەزانن لە سەرەتاوە کێشەکەی دۆڕاوە بە هەڵەیدا نەبەن و بڵێن کێشەکە دەبەینەوە...هتد، بەڵام ئەمە دەمێنێتەوە سەر پارێزەری تاك کە ئایا ئەو بنەمانایانە جێبە جێدەکات یان لێی رادەکات.

هەر چەندی فەرمانە ئەخلاقیەکە یان (بنەما ئەخلاقیەکە) لە قووڵایی ناخی تاکەکەوە هەڵقوڵابێ دەوڵەمەندتر و بە نرختر دەبێ، چونکە ئەو تاکە تەعبیر لە خۆی دەکات و ئاسۆکانی داهێنان و پێشکەوتنی لەبەر دەمدا زیاتر دەکات.

لەوانەیە سوودمان لەو پۆلینکردنە وەرگرتبێ کە فەیلەسووفی فەڕەنسی (هینری بریجسۆن ١٨٥٩-١٩٤١)، بۆ ئەخلاقی کردووە ئەویش ئەمەیە (ئەخلاقی داخراو) و (ئەخلاقی کراوە)... یەکەمیان ئەخلاقە داخراوەکانی گرووپەکانە کە زۆر لە شانە، یان لە کوورەی مێش هەنگوین دەچێ و دوەمیشیان ئەخلاقێکە پڕە لە جم و جۆڵ وکارکردن و داهێنان کە چارەنووسی مرۆڤی پێوە بەندە، چونکە هەر ئەو ئەخلاقەیە ئاسۆییێکی فراوان وبێ کۆتایی بە رووی ئادەمیزاددا دەکاتەوە[٩٧].

هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە بەها ئەخلاقییەکان (ڕەها)ن و پێشتریش لە جێگاییێکی دیکەدا ئەمەمان بە درێژی خستبووە روو[٩٨]، هیچ رۆژێك لە رۆژان راستگۆیی (شوورەیی)

---

٩٧ - د.زەکەریا ئیبراهیم (بریجسۆن) سلسله نوابغ الفکر الغربی ژمارە/٣ دەزگای مەعاریف میسر چاپی دووەم لـ١٨٧ـ١٨٨ـ.

٩٨ - (أخلاق الانسان : نسبية ام مطلقة ؟) لەگەڵ کتێبەکەی ئێمەدا (افکار...ومواقف) لـ٤٠٢ـ ودوای ئەو کە لە کتێبخانەی مەدبوولی لە ساڵی ١٩٦٦ دەرچوە بەراوردی بکە.

نەبووە و هیچ کاتێکیش نابێتە شوورەیی و (درۆ)ش هەر چەندی  لە مێشکی خۆشماندا بیڕازێنینەوە ناکرێ ببێتە (ئەخلاق پاکی)،  بەڵام لەوانەیە هەندێکجار خوێنەر لێی تێك بچێ کاتێك کە دەگوترێ (درۆی سپی) بۆ نموونە: وەك ئەو دیلەی کە درۆ لەگەڵ دوژمندا دەکات و ژمارە و توانای کۆمەڵە سەربازییەکەی خۆی بە دوژمن نالێ، یان وەك ئەوەی کە (درۆییێك) لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکەم کە بەخۆی و دەمانچەکەیەوە کەوتۆتە دوای کەسێك و دەیەوێ بیکوژێ، لەوکاتەدا پیاوەکە هەڵەتە دەکەم و پێی دەڵێم ئەو کەسە بە فلانە رێگادا رای کرد، کە لەوانەشە خۆی لە ماڵێکدا حەشار دابێ. یان ئەو  پزیشکەی کە لە گەڵ نەخۆشەکەی خۆیدا درۆییێك دەکات کەوا خەریکە دەمرێت، بەڵام پێی نالێ کە دەمرێ... هتد. لە راستیدا ئەو نموونانە ناتوانێ (درۆ) بکاتە پاك ئەخلاقی یان بێخەوشی، یان راستگۆیی بکاتە شوورەیی! بەڵام لە راستیدا ئەوەی روو دەدا هەڵواسینی بەهاکانە، یان ئەخلاق پاکی راستگۆییە، چونکە ئێمە ئامانجمان بەدیهێنانی پرەنسیپێکی ئەخلاقیانەی بەرزە، کە لەوانەیە ژیانی مرۆڤێك بێت یان چارەنووسی وڵاتێك بێت،  لێرەدا ئەمە (ڕاگرتنی) پرەنسیپەکانی  ئەخلاقیێکی دیاریکراوە کە (دەبێ لە هەموو حاڵەتەکاندا تۆ راستگۆبیت) بۆ ئەوەی رێگا لە شەڕانگێزی گەورەتر و نالەبارتر بگریت، بۆیە چەند مەرجێکی بنچینەیی بۆ ئەم (درۆ سپییە) هەیە کە ئەم دوو مەرجەن:

**یەکەم:** دەبێ توانای گشتاندنی بنەما ئەخلاقیەکانمان هەبێ لە هەموو بارو دۆخێکدا وەکو یەك بەو مانایەی کەلە خۆم بپرسم و بڵێم: ئایا دەکرێ کەسێکی دیکە لە هەمان هەڵوێستدابێ و هەمان شت بکات؟ تاوەکو دڵنیا بین کە کێشەکە پەیوەست نییە بە تاکە کەسێکەوە.

**دووەم:** ئەوەیە کە ئەگەر لە پێناوی بنەماییێکی باڵاتر نەبێ، نابێ هیچ بێخەوشییێکی ئەخلاقی هەڵبواسین یان رابگرین[٩٩] چونکە ئەخلاق خۆی رەهایە، بەڵام سیاسەت رێژەییە [١٠٠]،

---

٩٩ - کاتێك ئەو  سەربازەی بە دیل گیراوە (درۆ) دەکات و دوژمن بە هەڵەدا دەبات، کە  شوێنەکەیان  یان ژمارە یان چەندە یان توانای کوشتاری خۆیان بە دوژمن نالێ: کە ئەو هیچ چەك و فیشەکێکیشی لە لا نییە...هتد لە ڕاستیدا و بە مانایێکی وردتری ئەم وشەیە، ئەو سەربازە (درۆ ناکات)،  بەڵکو لە پێناوی بێخەوشییێکی باڵاتردا، بێ خەوشیڕاستگۆیی هەڵدەپەسێرێ کە ئەمەش پارێزگاری کردنە لە گیانی هاوڕێکانی و دڵسۆزیشە بۆ وڵاتەکەی.

چونکە گوزارشت لە چەند (بەرژەوەندییێك) یان چەند (قازانجێك) دەکات. هەر بۆیە لە سەردەمە کۆنەکانەوە ململانێ لەنێوان سوکرات کە فەیلەسووفێکی ئەخلاقی بوو لەگەڵ سۆفستاییەکاندا کە فەیلەسووفی سیاسەت بوون هەبوو. بە درێژایی مێژوو ململانێی نێوان ئەخلاق و سیاسەت بەردەوام هەبووە، بەوپێیەی کە ململانێی نێوان شتە رەها و رێژەییەکانە، واتە نێوان خوداوەندی رەها و مرۆڤی رێژەیی، ئەزەلی و رۆژگار، نێوان ئاسمانی و سەر زەمین بووە. هەمان ئەو ململانێیەیە کە لە نێوان ئاین و سیاسەتدا هەیە. لەمەدا ئێمە مەبەستمان ئەوە نییە کە یەکێکیان بە سەر ئەویتریاندا سەر بخەین، بەڵام هەوڵی ئەوە دەدەین ئەوەی هی قەیسەرە بۆ قەیسەر بێ و ئەوەی هی خوایە بۆ خوا بێ. بە واتاییێکی تر ئێمە دەمانەوێ ئەوە روون بکەینەوە کە بواری ئەخلاق جیاوازییێکی زۆری لەگەڵ بواری سیاسەتدا هەیە، هەروەها ئەوەش روون بکەینەوە کە تێکەڵکردنی ئەو دوو بوارە زیان بە هەردووکیان دەگەیێنێ، ئەمەش خەسڵەتێکی کۆمەڵگا جۆربەجۆرەکانە کە بوارەکانی تایبەت بە هەردووکیان لە یەکتر جیا دەکاتەوە.

ئەخلاق کە وەك نموونەییێکی باڵا و ئەو مۆمە رووناکی بەخشەیە، کە مرۆڤ لە شەوە تاریکەکاندا رێگای پێ رووناك دەکاتەوە تا پێی هەڵنەنگوێ و هەرواش دەمێنێتەوە. ئەو کۆڵەکەیەیە کە مرۆڤ سەرەتای ژیانی خۆی لە سەر بنیاد دەنێ، ئینجا ئەوەی پێی دەکرێ بیکاتە یاسا بۆ ژیانی سیاسی خۆی لە ئەخلاق وەری دەگرێ، بۆیە بەم شێوەیە باسی ئەخلاق کراوە چونکە ئەو رێگا ناخۆشەیە کە پێویستی بە هەوڵ وماندوبوونێکی زۆر هەیە تا بیبڕی، هەر بۆیەش مەسیح دەڵێ: (هەوڵ بدە لە دەرگا تەنگەبەرەکانەوە بچیتە ژوورەوە لەبەرئەوەی دەرگا گەورەکان و رێگا بەرینەکان بەرەو هەڵدێر دەچن و ئەوانەی بەو رێگایەشدا دەچنە ژوورەوە زۆرن) (ئینجیلی مەتی: ئیسحاحی حەوتەم:١٣). کەواتە ئەخلاق ئەو دەرگایەیە کە دەتگەیێنێتە ژیانی هەتا هەتایی، وەکو گوتمان ئەو رێگایە پڕە لە ژان و ململانێ و

---

١٠٠ - هیچ کۆمەڵگاییێك نییە رێگە بدات دزی بکرێت و بیکاتە یەکێك لە بێخەوشییەکانی خۆی و هەندێك ئەخلاقی پاکیش بکاتە کردارێکی (شوورەیی)، وەك ڕاستگۆیی و دەست کراوەیی و دەستپاکی و لە بەڵێنەکانی وەفاداربێ و دڵسۆزبێ لە کارەکاندا، یان بنەماکانی ڕێزگرتن.

بە پێچەوانەشەوە: هیچ کۆمەڵگاییێك نییە درۆ و دووزمانی و کوشتن و دەس بەسەرماڵی خەڵکی داگرتن و هەروەها فرتو فێڵ و قۆڵبڕین و گۆڕینی کەلوپەل و خیانەتکردن و ترسنۆکی...هتد بکاتە بێخەوشی.

دەردەسەری، کەم کەس هەیە بتوانێ لەو دەرگایەوە ئاودیو بێ. لێرەدا سوکرات کە فەیلەسووفێکی ئەخلاقیە دەڵێ: (دەرگای شوورەیی فراوانە)، بەڵام (دەرگای بێ خەوشی) تەسك و تەنگەبەرە. لێرەدا بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین، ئەخلاق شتێکی (ڕەهایە) نەك رێژەیی بێت و بەپێی بارودۆخەکە بگۆڕێ، بۆ نموونە راستگۆیی ئەوە نییە لەلای هەندێك نەتەوەدا ببێتە بێ خەوشی و لەلای هەندێکی تر ببێتە شوورەیی، هەروەها لە سەردەمێکیشدا نابێتە بێ خەوشی و لە سەردەمێکی تردا ببێتە شوورەیی. ئەگەر چی داب و نەریت دەگۆڕێ، بەڵام پرەنسیپە ئەخلاقیە شاراوەکانی ژێری ناگۆڕێن. ئەگەر بێت و لە کانگەی سۆز و وەفاداری خۆیەوە ژنەکە خۆی بۆ مێردەکەی بسوتێنێ کە ئەمە وەك نەریتێك وایە لە هیندستان و پێی دەڵێن (سوتی Sutte-) ـ ئەگەر چی ئەم نەریتە لە کۆمەڵگاکانی تردا بوونی نییە ـ ئەمە مانای ئەوە نییە کە پرەنسیپە ئەخلاقییەکان لە کۆمەڵگاییێکەوە بۆ کۆمەڵگاییێکی تر رێژەیی دەبن یان دەگۆڕێن، چونکە ئەو پرەنسیپە ئەخلاقیانەی کە ئەم نەریتە دەریان دەبڕێ لە هەموو کۆمەڵگاکاندا یەك پرەنسیپە، کە وا (پێویست دەکا ژن بەرامبەر بە مێردەکەی وەفادار بێ) لەوانەیە گۆڕەکەی بۆ هەڵدەچنێ، یان خێر و سەدەقەی بۆ دەکات، یان گوڵێك لەسەر گۆڕەکەی دادەنێ...هتد، ئەمانە کۆمەڵێك نەریتی جیاوازن کە گوزارشت لە (وەفاداری) دەکەن، کە یەکێکە لە بێ خەوشییەکانی ئەخلاق، هەمان شت لە بارەی تێکڕای دابونەریتەکان بڵێ، کە لە کۆمەڵگەییێکەوە بۆ کۆمەڵگەییێکی تر دەگۆڕێ، لەمەشدا تەنها پۆشاکەکەی دەرەوەی هەمەجۆرە، بەڵام لە هەر کۆمەڵگەو سەردەمێکیشدا بێت[١٠١]، یەك پرەنسیپی ئەخلاقی خۆی لەژێریدا حەشار داوە جێگیر بووە و چەسپاوە و بەردەوامیش دەبێت.

## ١-ئەخلاق رەها و چەسپاوە:

پرەنسیپە ئەخلاقییەکان نە جێگۆڕکێ دەکەن و نەخۆشیان دەگۆڕێن. لە کاتێکدا ئەو یاسایانەی سیاسەت بەر جەستەیان دەکات رێژەیی و مەرجدارن، لەبەر ئەوەی یاساکان لە کۆمەڵەوە دەردەچن، هەروەها دەبێ لەگەڵ گەشەکردنی کۆمەڵدا یاساکانیش گەشە بکەن. ئەمەش بەندە بە هۆکارە مێژوویی وکۆمەڵایەتییەکانەوە...هتدـ هیچ سیستەمێکی سیاسی یان یاسایی وا وشك و نەگۆڕ نییە کە گۆڕانکارییەکان قبووڵ نەکات، چونکە یاساکان

١٠١ - ئەم کتێبەمان (أفكار...ومواقف) لـ٤٠٢ـــوئەوانی تر بەراورد بکە.

سیستەمێکی ئەزەلی و کامڵ نین تا هیچ عەیب و خەوشێکی تێدا نەبێ، بەڵکو قابیلی گۆڕان و جێ گۆڕکێشن ((ئەمە هەڵەییێکی زۆر گەورەیە کە (کۆرنیل) دەڵێ: یاسا شتێکی نەگۆڕ و سەرمەدیە، یان بە شێوەییێك بەستاویەتی کە وەك مردوو ناجووڵێ، بەڵکو یاسا لەکاتی خۆیدا هەروەها ئێستاکەشی لەگەڵدا بێ کۆمەڵە بنەماییێکن کە مرۆڤ خۆی دروستی کردوون و دایناون و بەردەوام لە گەشەکردن و گۆڕان دان و هەر کارێکی یاسادانان، سەرەتاییێکە بۆ دانان و دروست کردنێك کە نە کۆتایی دێ و نە لە ڕێڕەوەکەی خۆشیدا دەوەستێ[102].

ڕاستی لە بواری بیری سیاسیدا شتێکی ڕەها نییە، چونکە بیری مرۆڤ بە ڕەنگی ئەو سەردەمە ڕەنگ دەگرێ کە تیایدا نەشونمای کردووە و شێوەی خۆی لەسەر شێوەی ئەو بارودۆخە وەردەگرێ کە لە سێبەرەکەیدا دروست بووە، هەروەها بیرە سیاسییەکانیشی لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخەکەدا دەگۆڕێ، لە وڵاتێکیشەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازی دەبێ، هەروەها لە کاتێکیشەوە بۆ کاتێکی تر جیاوازی هەیە، ناشکرێ بیرمەندە سیاسییەکان بۆ هەر گیرو گرفتێکی سیاسی هەموویان لەسەریەك جۆرە چارەسەر کۆك بن، بەڵکو بیرۆکەکان جیاوازیان دەبێ، چارەسەرەکانیش جۆربەجۆر دەبن... ئەو جیاوازیانەن کە بیری مرۆڤ نەش و نما پێ دەکەن و بە تیۆر و چارەسەری جۆراوجۆر خۆراکی پێ دەبەخشن، بیری جیاواز و تێز و حیزبە سیاسیە جۆربەجۆرەکان بەم شێوەیە دروست دەبن[103].

هەروەها دەبێ باوەڕمان بە ڕێژەیی چارەسەرەکان و بیردۆزە سیاسییە جۆربەجۆرەکان هەبێ، بەڵکو ئەو کێشە سیاسیانەی کە لە پێناو چارەسەر کردنیدا یەك تیۆر و تێزی سیاسی لە وڵاتە جۆربەجۆرەکاندا سەر هەڵدەدەن و زۆر جار ناوەڕۆکەکانی دەگۆڕێن، لە ناو یەك دەوڵەتدا ڕەهەندەکانی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێن،...(ئەمەش بە راستی لە خۆبایی بوون و نەزانینە ئەگەر بێت و هەوڵی ئەوە بدەین بگەینە چەند تیۆرێکی نەمر و هەتا هەتایی یان مەزهەبێکی سیاسی کە بۆ هەموو کات و شوێنێك بگونجێ..)[104].

---

١٠٢ - د. عەبدولحەی حیجازی (المدخل لدراسة العلوم القانونیة) لە بڵاوکراوەکان زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٧٢ بەشی یەکەم لـ ـ٤٠ـ و ٤١ـ.

١٠٣ - د. سەروەت بەدەوی (اصول الفكر السياسي والنظريات والمذاهب السياسية الكبرى) دەزگای نەهزەی عەرەبی ساڵی ١٩٧٦ لـ١٦ـ.

١٠٤ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ١٧ـ.

کەواتە سیاسەت بە کات و شوێنی دیاریکراوەوە بەستراوەتەوە و ئەو یاسایانەی کە سیستەمی سیاسی بەر جەستە دەکەن لە کاتێکی دیاریکراودا دەر دەکەون بۆ ئەوەی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی گەلێك بکات، لەوانەشە ئەگەر ئەو بارودۆخەی کە یاساکەی تێدا دەرچووە بگۆڕێ ئەویش بگۆڕێ. لێرەدا ساڤینی (١٧٧٩ ـ ١٨٦١)[١٠٥] کە یاساناسێکی ئەڵمانی دیار و ناسراوە، دەڵێ: ئەو یاسایانەی کە لەناو نەتەوەییێك لە نەتەوەکاندا هەیە تەنها بەشێکن لە هۆشیاری نەتەوەیی ئەو نەتەوەیە، هەر وەك چۆن روەك لە ناخی زەویەوە دەردەچێ، هەروەها یاساکانیش لەناو ناخی گەلەوە دەردەچن. هەروەها یاساکان و بیرۆکە و وێنا سیاسییەکانیش بە شێوەییێکی گشتی لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر ولە نەتەوەییێکەوە بۆ نەتەوەیێکی دیکە، هەروەها لە سەردەمێکیشەوە بۆ سەردەمێکی تر جیاوازیان هەیە.

## ٢ . ئەخلاق تایبەتە بە ناخی مرۆڤ:

یان ئەوەتا لە ناوەوەی مرۆڤ دەڕوانێ، مەبەستم ئەوەیە دەڕوانێتە حاڵەتە شاراوەکانی، یان نیازەکانی ئەو کەسە. هەر لەبەر رۆشنایی ئەم حاڵەتەشە ریز لە کارەکانی دەگیرێ، بۆ نموونە: بەخشینی هەندێك پارە بە هەژار و کەم دەرامەتەکان، یان دروستکردنی قوتابخانەییێك، یان نەخۆشخانەییێك...هتد. لەوانەیە ئەمانە کارێك بن لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەخلاقدا بگونجێن، یان بەپێچەوانەی ئەوە بێت، بەپێی مەبەستەکانی ئەو کەسەی کە پارەکەی بەخشیوە، کە ئایا بە راستی مەبەستی خێروچاکە بووە، یان مەبەستی خۆ دەرخستن و بۆ ئەوەی بووە خەڵك پێیدا هەڵ بڵێن.

کەچی سیاسەت یان ئەو بنەما یاساییانەی کە رێکخستنە سیاسییەکان بەر جەستە دەکەن ـ تەنها گرنگی بە رەفتارەکانی دەرەوەی تاك دەدات، بۆیە ناچێتە ناوەوەی ناخی مرۆڤ، بەڵکو دەوەستێتە سەر رەفتارە دەرەکییەکانی مرۆڤ، (هانز کلیسن) دەڵێ: (یاسا رەفتارە دەرەکی و دیارەکانی مرۆڤ رێك دەخات، وەك بنەماییێك ئەو گرنگی بە نیازە شاراوەکانی مرۆڤ نادات، ئەگەر بە قسە یان بە کردار دەری نەبڕێتە دەرەوە، بەڵام ئەخلاق وەك بنەما گرنگییێکی زۆر بە

---

١٠٥ - فردرش کارل فۆن ساڤینی (١٧٧٩ ـ ١٨٦١) شارەزا و یاسادانەری ئەڵمانی و لە یاسادانانداا پێشەنگێکی مێژوویی بووە، لە ماوەی ئەو تێگەیشتنەی کە لەبارەی گەشەی مێژوویی یاسا هەیبوو هەوڵی دەدا لێکۆڵینەوەییێك لەبارەی ماناو سروشتی یاسا ئەنجام بدات.

نیاز و خواست دەدات، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە بنەماکانی ئەخلاق فەرمان بە چاکە دەکەن و نەفرەت لە خراپە دەکەن و حوکم لەسەر کارەکانی مرۆڤ دەدەن و لەسەر بنچینەی چاکە، یان خراپە بۆی راست دەکاتەوە). ئەمەش کردارێکی ناوەکیە و لە ناخی دەرووندایە. بەپلەی یەکەم بنەماکانی ئەخلاق لەگەڵ دەروون و ناخی دەروونندا دەدوێن و پشت بەو نیاز و خواست دەبەستێ، باشە ئەگەر گرنگی بە قسەو باسەکاندا، بێگومان ئەمەیان روو نادات، مەگەر تەنها لە بارەی نیاز و خواستەکانەوە بێت[١٠٦].

### ٣- گۆڕینەوە لە سیاسەتدا:

سیاسەت بەو پێیەی، کە یاساکان بەرجەستەی دەکەن، مۆرکی گۆڕینەوە لەخۆیدا هەڵدەگرێ، مەبەستم لەمەدا ئەوەیە پێوەندی لەنێوان دوولادا دادەنێ، یان چەند مافێك دەداتە لایەنێکی ئەو پێوەندیە، لە کاتێکدا ئەرکێك دەخاتە سەر شانی لایەکەی تریان کە بارتەقای ئەو مافانە بێ، بەوشێوەیەی کە دەگوترێ بیرۆکەی ماف و بیرۆکەی ئەرك، کە هەردووکیان بە توندی بە یەکەوە بەستراونەتەوە تا ئەو رادەیەی کە بیرۆکەی ئەرك بە (شێوە نەرێنییەکەی) بیرۆکەی ماف دادەنرێ.

دۆخی گۆڕینەوە، کە سیاسەت لە ئەخلاق جیا دەکاتەوە، لەوکاتەی کە یاسا ماف دەداتە لایەنی یەکەمی پێوەندیەکە، لەبەرامبەریشدا و لەبەرژەوەندی لایەنی یەکەم، ئەرکێك دەخاتە ئەستۆی لایەنی دووەم کە هاوسەنگ بێت لەگەڵ مافەکەدا.

بەڵام ئەخلاق ئەو دۆخەی جێگۆڕکێ کردنی نییە، چونکە ئەو دەوڵەمەندەکان هان دەدا کە یارمەتی هەژارەکان بدەن، بەڵام هیچ مافێکی هەژارەکان ناخاتە ئەستۆی دەوڵەمەندەکان کە بتوانێ بە یاسا ئەو یارمەتیەی لێ بستێنێ، بۆیە لێرەدا دەڵێن بنەما یاساییەکان بەو دووانەیە Dualism ناسراوە کە فەرمانیش دەدا و پاداشتیش دەکات، لە کاتێکدا ئەخلاق یەك لایەنەیە Monist لەبەرئەوەی تەنها فەرمان دەدات، ئەگەر تۆ وا راهاتی رۆژانە شتێك بدەیتە سواڵکەرێك، رۆژانە دێت لەبەردەرگاکەتان دادەنیشێ با هەموو رۆژێك تۆ دینارێکی بدەیتێ، ئەگەر رۆژێکیان لە بیرت چوو، یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر بێ پارەت نەدایێ، ئەمە مافی

106 - Hans Kelsen General Theory of Law and State, Traslated by Andres Wedbery , New York ,Russell ,1961.P.20-21.

ئەوەی ناداتێ رات بگرێ و داوای پارەکەت لێبکات، لەبەرئەوەی چاکەکە تەنها لە لایەن تۆوە هەڵقوڵاوە و هیچ پێوەندییێکی بەو گۆڕینەوەیە نییە لەگەڵ لایەنەکەی تردا.

ئەو رۆژەی لە مەیدانی عابدیندا کە ئەحمەد عورابی شۆڕشەکەی خۆی دەست پێکرد و داوای مافەکانی خەڵکی دەکرد، خدێوی تەوفیق پێی گوت: (ئێوە کۆیلەی چاکەکانی ئێمەن..) ئەو بە چاوێکی ئەخلاقیانەوە دەیڕوانییە پێوەندییەکانی نێوان فەرمانڕەواو گەلەکەی کە ئەویش تەنها یەك رووی هەیە، لە فەرمانڕەواوە بۆ گەلەکەییێتی، لە خاوەنشکۆی سوڵتانییەوە بۆ کۆیلەکان بۆ ئەوانەی کە پاداشتی لێ وەردەگرن، ئایا دەبێ ئێستا کۆیلەکان چۆن زاتی ئەوە بکەن داوای مافەکانی خەڵکی لەخاوەنشکۆ بکەن؟ کۆیلە کەی مافی بەسەر خاوەنەکەیەوە هەبووە؟! بە هەموو مێژوودا بچۆرەوە دەبینی دەستکراوەیی و سۆز و چاکە و پیاوەتی...هتد هەر هەمووی بە یەك جۆگەدا دەڕوا لە سەرچاوەوە بیگرە تا دەڕژێتە دەریاوە: ئەویش لە ویژدان و ئەخلاقی فەرمانڕەواوە بۆ (مەڕە) زۆر و زەوەندەکان بووە، ئەو کارە نەمر و دەستە سپیەی کە پێشکەشی خەڵکیان دەکات، تەنها ئەرکێکن ئەخلاقەکەی بە سەریدا دەسەپێنێ، بەڵام هیچ مافێك نادرێتە خەڵکی، هەر بۆیەش خدێوی لە خۆبایی هیچ کاتێك بە بیریدا نەدەهات رۆژێك لەرۆژان کۆیلەکان شۆڕش لە دژی ئەو کەسانەدا بکەن کە چاکەیان لە گەڵیاندا کردووە و هەوڵی ئەوە بدەن ئەو دەستە ببڕن کە یارمەتی داون! بەڵکو ئەوەی دەتوانن بیکەن تەنها هاوارێکی پاڕانەوەیە وەك ئەوەی مەنفەلوتی داوای لە دەسڵاتداران کردبوو (بەزەییتان بە خەڵکی سەر زەوی بێتەوە، ئاسمانیش بەزەیی پێتاندا دێتەوە)(ارحموا من في الارض يرحمكم من في السماء)! یان ئامۆژگاری دەسڵاتدارەکان بکەن و بڵێن: ئێوە لەم دونیایەدا چ بچێنن لەو دونیا ئەوە دەدوورنەوە، وەك ئەوەی ئیمام غەزالی لە کتێبەکەیدا (التبر المسبوك فی نصائح الملوك) کردوێتی! کە پوختەی ئامۆژگارییەکانی خۆی ئاراستەی سوڵتان محەمەدی کوڕی مەلەکشای سەلجووقی کردوە[١٠٧].

---

١٠٧ - تەماشای (مؤلفات الغزالي) د. عەبدولرەحمان بەدەوی لــ١٨٥ـــ و دوای ئەو بکە، ئەنجومەنی باڵای چاودێری هونەر و ئەدەب لە قاهیرەساڵی ١٩٦١.

## ٤- ئەکتیڤ بوونی ئەخلاق:

هەروەها ڕادەی ئەکتیڤبوونی ئەخلاق جیاوازیان لەگەڵ سیاسەتدا هەیە، کەواتە یاسا ئەخلاقییەکان وەك پێشتریش دیمان لە یەك ڕوانگەوە کار دەکەن، ئەو کاتێك کە فەرمان دەدات یان هۆشیاری دوورکەوتنەوە دەدات، بۆ هیچ شتێکی نییە تەنها بۆ سەرخستنی خێر و چاکەیە لە دژی خراپە کردن و بۆ بەدیهێنانی کامڵبوونی مرۆڤە، نەك بۆ ئەوەی دەسەڵات و ماف بداتە کەسانی دی. ئەگەر ئەخلاق وا پێویست بکات کە کەسێك بۆ خۆی حەزی لە چی بێت و بۆ خەڵکیش حەزی لە هەمان شت بێ، ناچێ بە کەسەکە بڵێ تۆ مافت بەسەر ئەو حەزەی منەوە هەیە. لێرەوە بۆمان دەر دەکەوێ کە سروشتی ئەخلاق (یەك لایەنەیە)، بەڵام سیاسەت وەك لە یاساکاندا دەردەکەوێ، کە بیرۆکەی مافەکانی تێدایە واتە داوا لە خەڵکی دەکات ئەو ئەرکانەی کە دەکەوێتە سەرشانیان جێبەجێی بکەن، لێرەدا کاتێك یاسا کەسێك لە بەرامبەر یەکێکی تردا ناچار دەکات دان بەوەدا بنێ کە مافێکی ئەو کەسەی لەلایە بەرامبەر بە پابەندبوونی لایەنی یەکەم بەو مافە. ئەگەرچی ئەخلاق دەڵێ: دەبێ تۆ بەرامبەر بە بەڵێنەکانت وەفادار بیت هەروەها قەرزەکانیشت بدەیتەوە). لێرەدا ئەخلاق بەوەندەوە دەوەستێت، کە پابەندبوونەکە بخاتە ئەستۆی ناخی کەسەکە. بەڵام کاتێك یاسا بە قەرزارێك دەڵێ (قەرزەکەت بدەوە)، لە هەمانکاتدا مافی ئەوە دەداتە خاوەن قەرزەکە کە ئەو قەرزە لە قەرزدارەکە وەربگرێتەوە و قەرزدارەکەش ناچار بکات قەرزەکە بداتەوە.

## ٥- سنووری ئەخلاق:

لە ڕووی سنووری کارکردندا جیاوازی لە نێوان ئەخلاق و سیاسەتدا هەیە، گومانی تێدا نییە کە سنووری ئەخلاق بەر فراوانترو بەر بەرینترە لە سنووری یاسا، چونکە یاسا تەنها حوکم لە سەر پێوەندییەکانی نێوان ئەو تاکانە دەدات کە لە ناو کۆمەڵدا دەژین. ئەگەرچی لەو ڕووەوە لە توانادا هەبێ بنەماکانی یاسا لە ئەخلاق وەربگیرێ، لە کاتێکدا ئامانجەکانی ئەخلاق ئەوەیە ئەو پێوەندیانەی لەنێوان تاکەکاندا دروست دەبن، بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بۆیە ئەرك و بوار و یارمەتی و چاکە،... هتد دروست دەبن، کە زیاترە لەو ئەرکانەی کە یاسا دەتوانێ دروستیان بکات کە بە دەسەڵاتەکانی خۆی پشتگیری لێ دەکات.

سەرەڕای ئەمانەش ئەخلاق ئەو شتەش لە خۆی دەگرێ کە پێی دەڵێن: (ئەخلاقی تاك) وەك ئەرکێکی ئەو کەسە بەرامبەر بە خۆی کە نابێ خۆی بکوژێ یان ژنی دووگیان خۆی بکوژێ یان کۆرپەڵەکەی خۆی لەبار بچوێنێ، چونکە مرۆڤ پابەندە بە پارێزگاریکردن لە ژیانی

خۆی لەبەرئەوەی ئەویش تاکێکە، هەمان شتیش لە بارەی ئەندامەکانی لەش دەگوترێ، وەك لێکردنەوەی ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەش بۆ ئەوەی بیفرۆشێتە کەسێکی تر، هەروەها کەوتنە ژێر کاریگەری شەهوەتە نەگریسەکانی خۆیەوە...هتد[108]. و هەمان شتیش لە بارەی ئەرکەکانی ئیمانداران دەگوترێ بەرامبەر بە خوای خۆیان. ئەمەیان بێ یان ئەوەکەی تریان یاسا ئەوەندە گرنگیان پێنادات تەنها لەو سنوورەدا نەبێ کە کاریگەری لە سەر پێوەندییەکانی خەڵکی لەگەڵ یەکتردا هەیانە[109].

## ٦- پاداشت و سزا:

هەروەها ئەخلاق لە رووی پاداشت و سزاوە جیاوازی لەگەڵ سیاسەتدا هەیە، لەبەرئەوەی ئەو یاسایانەی کە رێکخستنی سیاسی دایان دەرێژێ تەنها بۆ رەفتارە دەرەکییەکانی تاکە، بۆیە رێگە بە بەکارهێنانی (سزا) دەدرێ وەك تۆڵە سەندنەوەیێك بۆ ئەو کەسەی سەرپێچی یاسا بکات.

بەڵام یاسا ئەخلاقییەکان کە لەگەڵ ناوەوەی مرۆڤدا دەدوێن ناتوانن پەنا ببەنە بەر پاداشت یان سزای ماددی کە (تۆڵە سەندنەوەیە)، چونکە پاداشت یان سزا لە مەیدانی ئەخلاقدا تەنها لێپێچینەوەیە لەگەڵ ویژداندا کە خەڵکی خۆی دوورخاتەوە لە سەرپێچیکاران و بە چاوی سووك تەماشایان بکات و گاڵتەی پێبکات. لەمەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە سزاو پاداشت لە یاسا ئەخلاقییەکاندا مەعنەویە یان ئەدەبیە، بەڵام لە سیاسەتدا کە یاسا رێکی دەخات کارەکە بە پێچەوانەی ئەمەوەیە لێرەدا سزاییێکی ماددی بە سەر سەرپێچیکاردا دەسەپێندرێ و ناچاری دەکات رێز لە بنەما یاساییەکان بگرێ. لەو بارەیەوە کیلسن دەڵێ:

هەر لە بنەڕەتدا ناکرێ یاسا لە ئەخلاق جیا بکرێتەوە تەنها ئەگەر بڵێین ئەمە کارێکی (تۆڵەسێنە) یان بە کارێکی پێوانەیی دابنێین، کە بە ئاڕاستەکردنی هەموو جۆرە رەفتارەکانی مرۆڤ هەڵدەستێ و چەند کارێکی سزادان دەکەوێتە ئەستۆی رەفتارە سەرپێچیکارەکان، کە

---

١٠٨ - د. عەبولرەحمان بەدەوی (الاخلاق عند كانت)ئاژانسی چاپەمەنییەکان لە کوێت ساڵی ١٩٧٩ لـ١٨٤ـ١٨٧ـ.

١٠٩ - د. عەبدولحەی حیجازی (المدخل لدراسة العلوم القانونية) لە بڵاوکراوەکانی کوێت ساڵی ١٩٧٢ بەشی یەکەم لـ١٦١ـ.

لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە ڕێکخراون، بەڵام ئەخلاق کارێکی کۆمەڵایەتیە ئەو جۆرە پاداشت و سزایانە قبووڵ ناکات، سزاو پاداشت تەنها کاری ئەوەیە کە ئەو ڕەفتارانە بە چاك دابنێ، کە لە گەڵ بنەماکاندا ڕێکن و ئەو ڕەفتارانەش بە خراپ دابنێ، کە پێوانەی بنەما ئەخلاقییەکانن، بەڵام بەکارهێنانی (سزا مادديیەکان ناچێتە هیچ حیسابێکەوە)[١١٠]. لێرەدا تاکە پێوەری دیار بۆهەریەك لە یاسا و ئەخلاق ئەوەیە، کە لە یەکەمیاندا (پاداشت و سزا) بە کار دێ، بەڵام لە دووەمیاندا بە کار نایێت، واتە لە یەکەمیاندا سزاییێکی ماددی هەیە و لە دووەمیاندا هیچ سزاییێکی ماددی بوونی نییە، ئەو سزا ماددیەش لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر بەپێی جۆری سەرپێچیەکە جیاوازیان دەبێت، وەك لە یاساکانی کەتندا هەیە لەوانەیە لە سێدارەدان، یان بەند کردن، یان قەرەبووکردنەوە بێ، لەوانەشە دەس بەسەراگرتنی موڵك ومالّ، یان فرۆشتن، یان گێڕانەوەی، یان چاککردنەوەی شتومەکە ئەسڵییەکان بێ...هتد. هەمان شتیش لە بارەی ئەو دەسەڵاتە بڵێ کە ئیمزاکردنی سزا و پاداشتەکە لە ئەستۆ دەگرێ، ئەمەیان تایبەت بوو بە بنەماکانی ئەخلاق (ویژدانی تاك) یان کۆمەڵ، بەڵام دەسەڵاتی سزادان لە یاسادا دەسەڵاتێکی گشتییە هەر خۆی ئیمزاکردنی سزا و پاداشتەکە لە ئەستۆ دەگرێ و لە کاتی پێویستیشدا بۆ جێبەجێ کردنی ئەو سزایە پەنا دەباتە بەر هێز[١١١].

ئەوەی ڕاستی بێ ئەم جیاوازیانە بۆ شێوەکانی کاری یاسایی و هەڵاوێردنی لەگەڵ کارە ئەخلاقییەکان دەگەڕێتەوە، چونکە هەر لە بنچینەدا و لە ترسی ئەو بنەمایانەش، کارە یاساییەکان پشت بە ڕەزامەندی ڕەفتارە دەرەکییەکانی کەسەکە دەبەستێ بەرامبەر بە بنەما یاساییەکە، ئەمەش ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە توانای وەرگرتنی ئەو ڕەزامەندیەی هەبێ لە ڕێگەی بە کارهێنانی هێزەوە، بە شێوەییێك کە کاریگەری لە سەر سروشتە یاساییەکانی کارکردندا نەبێ، بەڵام کارە ئەخلاقییەکان پشت بە ڕێککەوتنی ڕەفتارەکانی ئەو کەسە دەبەستی لەگەڵ بنەماکەدا، بۆیە ناتواندرێ ئەو کارە لە ڕێگەی هێزەوە بە دەس بهێندرێ، چونکە بەکارهێنانی هێز بۆ بەدەس هێنانی ئەو ڕەزامەندیە وادەکات ئەو ڕەزامەندیە تەنها دەرەکی بێت کە سەرچاوەکەی ترسە نەك لە ناخی مرۆڤەوە بێ کە سەرچاوەکەی خۆشەویستیە.

---

١١٠ - لە هەمان سەرچاوەی پێشوو بەرگی یەکەم لـ١٦٢ـ پەراوێزی ژمارە/٤٠ وەرگیراوە.

١١١ - د. عەبدولعەزیز عامر (المدخل لدراسة القانون المقارن) بلاوکراوەکانی زانکۆی قاریونس ـبەنغازی ساڵی ١٩٧٧ لـ٢٥ ـ٢٦ـ.

هەروەها با لەو حاڵەتەدا ئەو کارە کارێکیش بێ سەرچاوەکەی ئەخلاق بێت. بە شێوەییێکی تر دەتوانین بڵێین سزادان لەگەڵ بنەما یاساییەکەدا دەگونجێ، لە راستیدا ئەو بنەمایە لە دەرەوە را، یان لەلایەن دەوڵەتەوە هاتووە. لەبەرئەمەیە پاداشت و سزا پەیوەستە بە دەوڵەتەوە. یاساش وەك کانت دەڵێ: رێگە بە هیچ کەسێك نادات یەکێك لە لایەنەکان بێ و لەهەمانکاتدا ناوبژیوانیش بێ، بە پێچەوانەی بنەما ئەخلاقییەکان کە لە ناخەوە (دەنگی ویژدان، یان هەست بە ئەرك کردن) بێ، بۆیە ئەو بنچینەیەی کە هەیێتی ئەوەیە کە ئەو کەسە دەبێ خۆی دادوەری یەکەمی خۆی بێ، بۆیە لێرەوە و لە حاڵەتی یەکەمدا پێوەری لێك جیاکەرەوەی هەر یەکە لە یاسا سیاسییەکان و یاسا ئەخلاقییەکان ئەوەیە کە توانای بە کارهێنانی سزای هەیە، لە حاڵەتی دووەمیشدا توانای بەکارهێنانی ئەو سزایەی نییە، چونکە لە ئەخلاقدا جگە لە ئازاردانی ویژدان یان رق وکینەی کۆمەڵگە بەرامبەر بە سەرپێچیکار هیچ سزاییێکی تر نییە. لە هەر شوێنێکدا سزادان نەبوو واتە لە سنووری یاسا دەچینە دەرەوە و دەچینە ناو سنووری ئەخلاقەوە لەبەرئەوەی بوونی سزاو پاداشت یان نەبوونی، مانای بوونی بنەماکانی یاسایە یان بوونی بنەما ئەخلاقییەکانە.

## ٧- مەبەست لە ئەخلاق:

لە رووی ئەو (مەبەستانەی) کە دەیکەنە ئامانج، ئەخلاق جیاوازی لەگەڵ سیاسەتدا هەیە، گومانی تێدا نییە کە ئەخلاق ئامانجی (مەبەستەکانی تاکە) ئەویش بەدیهێنانی کامڵبوونی کەسایەتییێکی رەهای مرۆڤە، هەر لەبەر ئەمەیە رەفتارەکانی کەسەکە بەرەو خۆی و خەڵکانی تر وا رێك دەخات کە (خۆشویستنی چاکە و رقبوونەوە لە خراپە) لە ناو دڵ و دەروونیاندا دەچێنێ و لە کاتی ئەنجامدانی هەر کارێکدا ویژدانی کەسەکە بە ئاگا دێنێتەوە [١١٢].

بۆیە ئەخلاق، لە سیاسەت ـ یان لە یاسا بە گشتی ـ زیاتر دەچووە ناو شتەکان و توند تریش بوو تەنانەت حوکمی بە سەر بیرکردنەوەکانی ناوەوەی مرۆڤیشدا دەکرد، بۆیە بە تەواوەتی رێزی لێ ناگیرێ و ناسەپێندرێ تەنها لەلایەن چەند کەسێکەوە نەبێ کە ژمارەیان زۆر نییە، بەڵام ئامانجی راستەوخۆی یاسای سیاسی (مەبەستێکی کۆمەڵە کە سوود گەیاندنە

---

١١٢ - (المدخل نظرية القانون و نظرية الحق) دانانی د. ئیبراهیم ئەبولێل /د.محەمەدلئەلفی بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێتساڵی ١٩٨٦ لـ١٨ـ.

بە خەڵکی و بەرژەوەندییەکانی خەڵکی و دەستەبەرکردنی ئەمن و ئاسایشی ناو کۆمەڵگەیە، ئەو بە دانانی ئەو بنەمانایانە بۆ کۆمەڵانی خەڵکی ئامانجی کامڵ بوونی تاك نییە، بەڵکو مەبەستی راگرتنی هاوسەنگیە لەنێوان تاکەکاندا. کاری یاسا ئەوە نییە بانگەشە بۆ ئەخلاق بکات، بەڵکو کاری ئەو تەنها دانانی رێکخستنێکی کۆمەڵایەتیە کە رێگە بۆگەشەکردنی بەها کۆمەڵایەتییەکان خۆش بکات و ببێتە بەربەستێك لە بەردەم بڵاوبوونەوەی ئەخلاقە خراپەکان لەناو خەڵکیدا بۆ ئەوەی نەبێتە دەردێکی (کۆمەڵایەتی)، ئەمەش ئەو پەڕی ئەرکە ئەخلاقیەکەییێتی، بەڵام کامڵبوونی ئەخلاقی هەر بە کاری ویژدانی خودی ئەو کەسە دەمێنێتەوە. بۆ نموونە یاسا لە سەریەتی بە کارهێنانی ماددە بێهۆشکەرەکان قەدەغە بکات و نەهێڵێ ببێتە دەردێکی کوشندەی کۆمەڵایەتی، بۆیە رێی پێ دەدرێ کە حەرامی بکات، بەڵام ناتوانێ بە زۆر خەڵکی ناچار بکات کە بە رۆژوو بن، یان کەم بخۆن، یان قەناعەتیان پێ بکات کە ئەو جۆرە خواردنە، یان ئەو جلوبەرگە بەکار بهێنن، یان کۆڕ و زیکری ئاینی ببەستن، یان ریش بەردەنەوە، یان ریشیان بتاشن، یان ژنان کراسەکانیان کورت بکەن یان درێژ...هتد. ئەم جۆرە کارانە هەمووی دەبێ لە ناوەوەی تاك خۆیدا هەڵقوڵێ، چونکە ئەگەر لە دەرەوەڕا بە سەریدا بسەپێندرێ تەنها دەبێتە کارێکی (ڕووکەش) و خەڵکی بێ ئەوەی ماناکەی بزانن چیە و لە ناوەڕۆکەکەی قووڵ ببنەوە پیادەی دەکەن!.

## ٨ – ئەخلاق، رێکخستنی ئاکاری تاکە:

ئێمە پێش ئێستا بینیمان ئەخلاق چۆن رەفتارەکانی تاك رێك دەخات، لە کاتێکدا سیاسەت رەفتارەکانی کۆمەڵ رێك دەخات، ئەگەر سیاسەت رەفتارەکانی کۆمەڵ رێك بخات، کەواتە دەبێ بیروڕای جیاوازیش لەو کۆمەڵەدا هەبێ. دەبێ چەندین بیروڕا هەبێ: لێرەدا بیروڕا و رای پێچەوانە دروست دەبێ ـ بەمەش دەوترێ ئۆپۆزسیۆنی سیاسی، بەڵام ئەخلاق لە یەك بیروڕا زیاتر قبووڵ ناکات و بیروڕای زۆر و شتە رێژەییەکانیش لە ئەخلاقدا بوونی نامێنێ، و هیچ کەسێك نابینی بڵێ راستگۆیی شوورەییە، یان بڵێ دزیکردن بێخەوشیە...هتد. بۆیە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی سیاسی لە رێگەی چەمکە ئەخلاقییەکانەوە بێگومان مانای ئەوە دەگەیێنێ کە بیرو رای پێچەوانە یان دژەڕا هەڵوێستێکی (بێ ئەخلاقیە) یان (شوورەییە)، یان (عەیبەیە) وەك ئەوەی ماوەییێك لە ماوەکان لەلای خۆمان ناویان دەبرد. لێرەدا ئەو هەڵوێستە رێك وەك هەڵوێستە

ئاینییەکە وایە، واتە حوکم کردن لە ڕێگەی چەمکە ئاینییەکانەوە، واتە وەسفکردنی ئۆپۆزسیۆن بە (کوفر)، یان (زەندیق)، یان بە (کۆمەڵە کەسانێك کە لە ڕێگە لایان داوە).

لەلایێکی ترەوە حوکمڕانیکردن لە دەوڵەتدا لە ڕێگەی چەمکە ئاینییەکانەوە ـیان ئەخلاقییەکانەوە ـ دەبێتە حوکمڕانییێکی ستەمکار و هەڵوەشاندنەوەی هەموو یاساکان، چونکە لێرەدا کێشەکە ئەوەیە کە دەسەڵات نەك تەنها پشت بە ئەخلاقی سەرۆکەکە دەبەستێ، بەڵکو دەبێ خەڵکەکە (باوەڕ)یشیان بە دادوەری و پاکیزەیی و دەسپاکی و بێ خەوشی...هتد ئەو فەرمانڕەوایە هەبێ. لەم حاڵەتەدا ئێمە لەروانگەییێکی میسالیانەوە هەنگاو دەنێین و هەوڵدەدەین واقعێك بنیاد بنێین کە لە سەر شێوە میسالیەکە بێ و ئەو بارودۆخەی ئیستا لە ئارادایە وەلا بنێین کە خۆمان بەشێکین تیایدا. هەندێکجار چەند بیرۆکەییێك لە بارەی بەرپاکردنی (شۆڕش) بۆ بەدیهێنانی چەند چەمکێکی ئاینی، یان ئەخلاقی دیاریکراو، دەبینین ڕێك بە هەڵتەکاندنی ئەو واقیعە کۆتایی دێ کە هەیە و کار بۆ بنیادی دەوڵەتێکی نوێی میسالی دەکات، وەك ئەوەی لاپەڕەییێکی سپی نوێمان لەبەر دەستدا بێ و ئەوەی بمانەوێ لە بارەی ئەو شێوە ئاینییە، یان ئەخلاقیەی کە دەمانەوێ بێتە دی، ئەمەش لەبەر یەك هەڵتەکاندنی واقیعەکە دەگەییێنێ، کە گوایە ئێمە دەمانەوێ چاکی بکەین. گەورەترین هەڵە لەمجۆرە بیرکردنەوانەدا ئەوەیە چاوپۆشی لە راستییێکی گرنگدا بکەین ئەویش ئەوەی کە دەمانەوێ چاکی بکەین ئەو واقیعەیە کە ئێستا هەیە. چاککردنی ئەم واقیعەش دەبێ تەنها لەو واقیعەوە دەست پێ بکەین کە ئێستا هەیە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە خۆمان بدەینە دەست راستییێکی ترەوە، کە زۆر گرنگە ئەویش ئەوەیە کە ئەم واقیعەی ئێستا لە ئارادایە بە درێژایی چەندین ساڵ و لە مێژوویێکی بەردەوامدا بنیاد نراوە. رووخاندن و هەڵتەکاندن و چاوپۆشی لێکردنی، یان لە ناو بردنی و بە نووکە قەڵەمێك بیکەینە لاپەڕەییێکی سپی بۆ ئەوەی سەر لە نوێ دەوڵەتێکی نوێی میسالی بنیاد بنێینەوە شتێکی مەحاڵە ـ ئەمە کارێکە نە دەکرێ ونە کەسیش داوا دەکا بکرێت، بەڵکو ئەوەی دەکرێ و ئەوەی داوا کراوە بکرێ (چاککردنی) هەڵەو کەم و کوڕییەکانی ئەو بینا سیاسیەی ئێستایە ـ ئەگەر بێت و ئەم راستیە لەبەرچاو نەگرین دەکەوینە ناو زوڵم و ستەمێك کە زۆر خراپترە لەو ستەم و زوڵمەی کە ئێستا بە دەستیەوە دەناڵێنین.

## ٩- کاکڵەی سیاسەت بەرژەوەندی سوود وەرگرتنە:

کاکڵەی سیستەمی سیاسی، بەرژەوەندی و سوود وەرگرتنە. ئینجا دەرکەوتنی دۆخی گۆڕینەوە دەردەکەوێ، بەڵام بنچینەی سیستەمی ئەخلاقی ئەوەیە کە ئەرکەکان بۆخودی خۆی ئەنجام بدات بێ ئەوەی بڕوانێتە ئەنجامەکەی کەچی دەبێ یان چی نابێ. یەکەمیان سروشتێکی دوولایەنەی هەیە و دووەمیشیان یەك لایەنەیە و لە سەر یەك هێل دەڕوات. لێرەدا دروستبوونی سیستەمی دەسەڵات لەسەر بنچینەی ئەخلاق، واتە هاوڵاتیان هیچ مافێکیان نابێ، بەڵکو ئەوەی کە وەری دەگرێ (دیاریە)، یان (پاداشتە)، یان (منەتە)، یان ئەو ئەرکەیە، کە ئەخلاقی فەرمانڕەواکە بە سەریدا دەسەپێنێ!. بۆئەوەی زیاتر بتوانین روونی بکەینەوە، نموونەییێك لە هەڵوێستی ئەخلاقیانە وەردەگرین: وەك (چاکەکردن لەگەڵ هەژاراندا) یان (یارمەتیدانی کەسێکی کەم دەرامەت)، یان بە هاناوەچوونی داماوێك، یان دەسکراوەیی و پیاوەتی و ئازایەتی...هتد، دەبینین ئەمانە هەر هەمووی کارگەلێکن ئەخلاق دەیانسەپێنێ، بەڵام هیچ مافێك ناداتە هەژار و کەم دەرامەتەکان، هیچ کەسێکیان بۆی نییە بڵێ: ئەمرۆ بۆ خێرت پێ نەکردم؟ بۆ ئەمڕۆکەش وەك دوێنێ یارمەتیم نادەی؟ تەنها ئەگەر بتوانێ ویژدانی بجوولێنێ و کاری تێ بکات! کێشەکە (ئەخلاقە)، واتە ئەرك ـ هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە ئەمە باو بووە. هاوڵاتیان لە خۆیان رانەدەبینی داوای مافەکانی خۆیان، یان خاوەنداریێتی، یان ئازادییەکانی خۆیان بکەن، تەنانەت نەیاندەتوانی داوای ژیانی خۆشیان لە فیرعەون بکەن! ئیمپراتۆریەتی (چینی کۆنیش) بەهەمانشێوە بوو، کە گەلی چینی وا هەستیان دەکرد تەنها بۆ ئەوە لە دایکبوونە کە عاربانەکەی ئیمپراتۆر رابکێشن، کە ئەمەش چارەنووسێکی حەتمی ئەوان بوو! هەر چەندە ئیمپراتۆر زۆر بە نەرمی و بە سۆزێکی باوکانەوە لە گەڵیاندا دەدوا ـ ئەمانە کردارە ئەخلاقییەکانی ئەو بوون، بەڵام هیچ مافێکی بۆ هاوڵاتیان تێدا نەبوو.

### ١٠- سەرچاوەی ئەخلاق و سیاسەت:

یاسای ئەخلاق لە گۆشەییێکی گرنگەوە جیاوازی لەگەڵ یاسای سیاسیدا هەیە، کە ئەویش سەرچاوەی هەردووکیانە، یاسای ئەخلاق بوونی خۆی لەو بیرۆکانە بە دەست دەهێنی کە لەناو هزرو بیری تاك و ویژدانی کۆمەڵدا هەن، ئینجا سەرچاوەکە باوەڕی ئاینی بێ، یان پرۆگرام و پێوەرە فەلسەفییەکانی کۆنترۆڵکردنی رەفتارەکانی ئادەمیزاد بێ. هەر لە بەر ئەم هۆکارانەشە دەبینین لە ئەنجامی ئەو جیاوازیانەی کە لایەنەکانی ناوەوەی تاکەکان هەییێتی لەگەڵ هەستی گشتی ناو کۆمەڵ، بنەما ئەخلاقییەکان روونی و سنووردارکردنی تێدا بە دی ناکرێ، بەڵام بنەما یاساییەکە رووکارێکی روون و رەهەندێکی دیاری هەیە، لەبەرئەوەی سەرچاوەی راستەوخۆی بنەما یاساییەکان دەسەڵاتی یاسادانانە، کە یاساییێکی ورد و تۆکمە لە ناو کۆمەڵگادا دەردەکات.

بۆیە دەبینین یاسا ئەو بنەما ئەخلاقیانەی کە دەتواندرێ رێك بخرێن و ساغکردنەوەیان ئاسانە هەڵدەبژێرێ، تا رادەییێك ئەو پەیوەست بوونەی بۆ دەستەبەر دەکات کە لەگەڵ ئەو هۆکارانەی لەبەر دەستدان دەگونجێ. یارمەتیدانی ئەو کەسانەی کە دەست کورتن لەلایەن خزمان و خەڵکانی دی ئەرکێکی ئەخلاقیە، بەڵام یاسا بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانە پلەییێکی دیاریکراو لە خزمان هەڵدەبژێرێ، دەبینی کە هێزی ئەو یاسایە بنەماییێکی بە هێزی هەیە و لەسەر ئەو کەسە دەکاتە ئەرك و ناچاری دەکات کە بە بنەما و بەند و لقەکانی رازی بێت و پلەکانی تری خزمایەتیش بۆ بنەما ئەخلاقییەکان بەجێ دەهێڵێ بۆ ئەوەی پەیمانەکان رێك بخات، بە شێوەییێکی گشتی بنەما ئەخلاقییەکان رێگە لە کەسەکە دەگرن تا درۆ نەکات، بەڵام هەرچی یاسایە تەنها لەسەر هەندێك لە شێوەکانی درۆ وەك دەسدرێژی کردنە سەر مافەکانی خەڵکی و شایەتیدانی بەدرۆ، ساختەکردنی بەڵگەنامەکان و زانیاری بە درۆ پێشکەش بکات، کە دەسنیشانکردن و سەلماندنیان ئاسانە و مەترسیش لەسەر کۆمەڵگە دروست دەکات خەڵکی سزا دەدات[١١٣].

---

١١٣ - (المدخل الی نظریة القانون ونظریة الحق) دانانی د. ئیبراهیم ئەبولەیل ـ د. محەمەد ئەلئەلفی ـ لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێتساڵی ١٩٨٦ ـ لــ١٧ـ١٨ــ.

## ١١- سیاسەت سەقامگیری ئاسایش و دەسەڵاتە:

چەند لایەنێکی تری ئەو جیاوازیانەی کە لەنێوان یاسای سیاسی کە بۆ پارێزگاریکردنی بەردەوامبوونی ئاسایش و دەسەڵاتە لەناو کۆمەڵگادا و لەنێوان پرەنسیپەکانی ئەخلاقدا هەیە، ئەگەر بێت و بنەماکانی ئەخلاق سزادانی تاوانبارێکی بە ئەرك زانی، هەرچەندە تاوانەکە ماوەییێکی زۆریشی بە سەردا تێپەڕیبێ، بەڵام لە بنەما یاساییەکاندا ئەگەر هات و ماوەییێکی دیاریکراو بەسەر تاوانەکەدا رۆیشت و نەدرایە دادگا، یاسا تاوانبارەکە دەپارێزێ، ئەگەر ئەخلاق کردیە ئەرك بەسەر ئەو کەسەی پارەی بە قەرز وەرگرتووە دەبێ بیداتەوە و بڵێ پارەی کەس بۆ کەسێکی تر حەڵاڵ نییە، بەڵام لە یاسادا مەرجی بۆ ئەمە داناوە کە شتێك لە بارەی قەرزەکە لە نێوان خۆیاندا بنووسنەوە ئەگەر بۆ ماوەییێکی دیاریکراو بوو و ئەگەر هات و ئەو کەسە پارەی بە قەرز دابوو و هیچ بەڵگەییێکیشی لەلا نەبوو کە قەرزی داوەتە ئەو کەسە لەبەر نەبوونی شارەزایی لە رێورەسمی یاسایی، یان باوەڕی بە کەسەکە هەبووە، یان بەڵگە نامەی قەرزەکەی وون کردووە، ئەوکاتە لەبەر پاراستنی سەقامگیری مامەڵەکردن لە ناو کۆمەڵگەدا کەس گوێ بۆ داواکارییەکانی خاوەن قەرزەکە ناگرێ.

## ١٢- بە یەکگەیشتنی ئەخلاق و سیاسەت:

ئەمانە ئەوە ناگەیێنی کە هیچ پێوەندییێك لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا نەبێ و هەر یەکەیان دوور لەوی تریان دەژیێ، بێ ئەوەی هیچ پێوەندییێکیان بە یەکەوە هەبێ. بەڵکو ئەوەی راستی بێ پێوەندییێکی توندوتۆڵ لەنیوانیاندا هەیە، ئەویش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەردووکیان لە یەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاون  کە ئەویش ژیان گوزەراندنە لە ناو کۆمەڵدا. هەروەها دەبێ ئەوەمان لە بیر نەچێ کە یاسا بەپێی ئەو گەشەکردنە مێژووییەی خۆی بڕێك لە بنەماکانی ئەخلاقی تێدایە، هەر چەندە لە یەکتریش جیاواز بن ـ ئەگەرچی کەمیش بێ. دەوڵەتیش هۆکارەکانی سزادانی دەرەکی بۆ زیاد کردووە، بەم کارەشی لە بنەماکانی ئەخلاقەوە گۆڕیوێتی بۆ بنەماکانی یاسا. هەرچەندی شارستانییەتیش پێش بکەوێ ئەوەندە یاسای ئەخلاقیش کاریگەری زیاتر دەبێ. بۆیە هەر لەو بارەیەوە هەندێك لە ئەرکەکان سەرەتا دۆخی ئەخلاقییان وەرگرتبوو، دوایی گۆڕان دۆخی یاساییان وەرگرت، وەك ئەرکی خاوەن کارەکان لە دابینکردنی ژیانی کرێکارەکاندا، لە کاتی رووداوەکانی کار و نەخۆشییە درێژخایەنەکاندا، ئەمە لە ئەرکێکی ئەخلاقیەوە گۆڕا و بوو بەو مافەی کە یاسا پارێزگاری لێ دەکات.

دیاردەکانی کاریگەر بوونی یاسا بە بنەماکانی ئەخلاق لە هەموو لایەنەکانی یاسادا بە روونی دیارە: ئەم دیاردەیە لە پێوەندییەکانی نێوان خێزاندا دەردەکەوێ وەك پرۆسەی هاوسەر گیری و ئەرکەکانی ژن و مێرد، هەریەکەیان پێش ئەوی تریان و مافی نەفەقە کێشانی هەندێك لە خزمان. هەروەها لە یاسای (کەتندا) لە سزادانی ئەو کەسانەی کە کارێك دەکەن ئابڕووبەر بێ، یان داب و نەریتە گشتییەکان لەکەدار بکا دەردەکەوێ. هەروەها ئەخلاق زۆر شۆڕ دەبێتەوە ناو پێوەندیە داراییەکان. ئەمەش بە تایبەتی لەوەدا دەردەکەوێ کە دەبێ نیازی پاك بێ و ئاگای لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بێ و لەگەڵیدا ئەمانەتپارێز بێ. هەروەها لە کاری توندو تیژی و کاری شاراوە و داگیرکردن بە دوور بێ و لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو گرێبەستانەی پێچەوانەی داب و نەریتن و ئەو گرێبەستانەی کە دەکرێ هەڵبوەشێندرێنەوە بۆ ئەوەی شتەکان تێکەڵ بکات، یان تێ بزربکات، یان بۆ خۆی بیقۆزێتەوە. هەروەها لە وەرگرتنەوەی ئەو قەرزانەی، کە خاوەن قەرزەکە بە خواستی خۆی و لەبەر جێبەجێکردنی ئەرکێکی ئەخلاقی یان کۆمەلایەتی داویە بە یەکێك (کە پێی دەگوترێ پابەند بوونە سروشتییەکان)، هەروەها لە حەرامکردنی خراپ بەکارهێنانی رەوایەتی (الحق) و لە زیاد جەخت کردنە سەر ئەو قەردارەی بە هۆی گۆڕانی بارودۆخەوە ناتوانێ قەرزەکەی بداتەوە کە ئەگەر بیداتەوە تووشی زەرەرێکی زۆری دەکات و چەندین پرەنسیپی ئەخلاقی تریش کە یاسای وەزعی بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاستی بنەما یاساییەکان[١١٤].

## ١٣- تێرکردنی یاسا بە بیرۆکە ئەخلاقییەکان:

لە هەندێك حاڵەتدا تێرکردنی یاسا بە بیرۆکە ئەخلاقییەکان رێگە لە ناکۆکییەکانی نێوان ئەخلاق و یاسا ناگرێت. بۆ نموونە لەوانەیە کارێك لە رووی یاساییەوە تەواو بێ، بەلام پێچەوانەی پێداویستییە ئەخلاقییەکان بێ. وەك ئەوە وایە یەکێك بڵێ زەوییێکم هەیە، بەلام موڵکی یەکێکی تربێ ئەو زەوتی کردبێ. هەروەها تەنها (درۆکردن) کە ئەخلاق حەرامی کردووە لە یاسادا نابێتە هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکان ئەگەر فرت و فێڵی لەگەڵدا نەکردبێ.

١١٤ - بە د. عەبدولحەی حیجازی (المدخل لدراسة العلوم القانونیة) بەرگی یەکەم لـ١٦٤ـ١٦٥ـ دا بچۆرەوە.

(چونکە مەرج نییە هەرچییێك لە رووی یاساییەوە رێی پێ درابێ لەگەڵ ئەوەی ئەخلاق بە باشیان دەزانێت رێك بن).

ئەگەر ئەوە راست بێ، کە ئێمە بڵێین دەبێ یاسا پێچەوانەی ئەخلاق نەبێ، نابێ وا تێبگەین کە ئەو یاسایەی لەگەڵ ئەخلاقدا ناتەبا بێ، نابێ بە یاسا هەژمار بکرێت. لەبەرئەوەی پێویستی وەك یەکی یاسا لەگەڵ ئەخلاقدا پێویستییێکی یاسایی نییە، بەڵکو پێویستییێکی ئەخلاقیە. جیاوازی یاسا لەگەڵ ئەخلاقدا بنەماکانی وەسفکردن لە سیفەتە یاساییەکەی خۆی دانامالێ، ئەمەش ئاماژەییێکە بۆ ئەوەی کە ئەخلاق و یاسا یەك شت نین، ئەگەرچی لە زۆر رووەوە تێکەڵ بە یەك دەبن، بەڵام هەر یەکەیان شتی تایبەت بە خۆی هەیە. لەوانەیە بواری ئەخلاق لەگەڵ یاسا لە شتێکدا یەك بگرنەوە کە بنەماییێکی یاساییە و لە هەمانکاتدا هەر خۆی بنەماییێکی ئەخلاقیشە ئەمەش لەو کاتانەدا دەبێ کە ئەو رێڕەوەی پێچەوانەی ئەخلاقە لە هەمان کاتدا پێچەوانەی یاساش بێ، وەك (دزی) کردن و کوشتن ...هتد. بەڵام یاسا لە هەمووکاتەکاندا ئەوە ناکات، چونکە نایەوێ بێتە ئاستی داخوازییەکانی ئەخلاق، بەڵام لەبەر هەندێك پێداویستی و هۆکاری بارودۆخی تردا دەیکات، بۆ ئەوەی هەندێك زەرەر و زیان و مەترسی و بشێوی کۆمەڵایەتی...هتد لابەرێت. بەم شێوەیە هەماهەنگییێك لە نێوان ئەخلاق و یاسادا هەیە، کە لەم حاڵەتانەدا تەنها بە رێکەوت دروست دەبێ و تایبەتە بە هەندێك کاروباری دیاریکراو.

ئەگەر لە هەندێك کاتیشدا پێك بگەن، بەڵام ئەخلاق ناگاتە پلەو پایەی یاسا، بەڵکو هەر یەك لەمانە تایبتمەندییەکانی خۆی دەپارێزێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەخلاق لە ناو کۆمەڵدا بەردەوام ئامۆژگاری هەستە سیاسییەکان دەکات، بەڵکو بەردەوام هۆکارێکی سەرەکیشە بۆ دروستکردنی یاساییێکی وەزعی[115] لە رێگەی ئاراستەکردنی ویژدانی تاکەکانەوە، ئەوانەی کە خۆیان ماندووناکەن تا ویژدانی خۆیان ئاسوودە بکەن، ئەو کاتێك کە کارێکی یاسایی، یان جێبەجێکردنیان پێ دەسپێردرێ. گرووپە شارستانییەکانیش هەوڵەکانی خۆیان دەخەنە کار بۆ ئەوەی بەشی یاسا لە بەشی ئەخلاق زیاتر بکەن. باشتر وایە داوا لە تاکەکانی ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین، کە لە رێگەی یاساوە ئاواتەکانی دادوەرییە سروشتییەکان بهێننە دی.

---

١١٥ - عەبدولحەی حیجازی (سەرچاوەی پێشوو) لـ١٦٦ـ١٦٧ـ.

# دەروازەی دووەم

## (لە بارەی سروشتی گەشەکردنی کلتوری)

**((مرۆڤ لە نا ئارامی و شەپۆلە هەڵچوەکانی دەریا و دیمەنەکانی هەور...و هتد سەری سورِ دەمێنێ، بەڵام ئەوەی لە بیر چۆتەوە، کە خودی مرۆڤ خۆی سەیرو سەمەرەترین شتی سەر گۆی ئەم زەمینەیە ...!)).**

**(قەشە ئۆگەستین )**

## دەسپێك:

لەم دەروازەیەدا کە ناونیشانی (لە بارەی سروشتی گەشەکردنی کلتوری) مان بۆی داناوە بە درێژایی سێ بەش هەوڵدەدەین، ئەو بیرۆکەیە بخەینە روو کە دەڵێ: (لە دونیادا گەشەکردنەکان هەر هەمووی لە گونجانەوە بۆ لێك ترازان و جیابوونەوە دەڕوات، یان لە یەك پارچەیی و تێکەڵاویەوە بەرەو لێکدابڕان و تاکڕەوی گەشە دەکات). ئەگەر بێت و ئەو یاسایەی کە فەیلەسووفی ئینگلیزی (هێربەرت سبنسەر) دۆزیویێتیەوە لە هەردوو جیهانی ماددی وئەندامیدا بە روونی دیار بێ، لە پەرەپێدانەکانی کلتوریدا زۆر روونتر دیارە. دوای ئەوەی لە کۆندا سەرۆکی بنەماڵە خۆی فەرمانڕەوا و دادوەر و خاوەن و دابینکەری ئابووری بوو ـ ئەم هەموو فەرمانانە گوازرانەوە ناو دەستە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵ و هەمان شتیش لە بارەی زمان و داب و نەریتەکان و ئاین و حکومەت و زانست و هونەر...هتد بڵێ. هەموو ئەو لایەنە کلتوریانەی کە ئێمە تاکو ئێستا ناسیومانن بە پێی ئەم یاسایە گەشەیان کردووە، لە گونجان و یەکبوونەوە، بۆ نەگونجان و لێك ترازان، لە تێکەڵاوی و یەك تۆپەڵیەوە بۆ چەند لقێکی لێك جیاواز.

لە بەشەکانی دووەم و سێیەمدا هەندێك نموونەی تێکەڵاوی و یەکگرتنەوەی ئەخلاق و یاسا و ئاینتان بۆ دەخەینە روو، بەو پێیەی کە (داب و نەریتەکان) لە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی هۆزە سەرەتاییەکاندا دەریان دەبڕی، بەو مانایەی کە ئاین لەلای هەندێك لەو هۆزانە ئەوە دەردەخەن کە وابەستەییێك لەنێوان کۆمەڵە مرۆڤێك و کۆمەڵە خوداییێکدا هەبووە و هەندێك جاریش زیندووەکان ومردووەکان و خوداکانیان لە یەك ئاستدا دادەنا. هەندێك جاریش ئەو وابەستە بوونە دەگەیشتە رادەییێك کە تاکەکانی ناو هۆزیان لەگەڵ ئەو سەرچاوە پیرۆزانەی کە لێیەوە هاتوون تێکەڵ بە یەکتر دەکرد، ئەو هۆزانە وایان دەزانی کە ئەوان لە باڵندەییێکەوە هاتوون بە ناوی تەوتەم و بە باپیرە گەورەی خۆیانی دادەنێن، بۆیە هەر لەبەر ئەمەیە ئەو باڵندەیە ئەگەر زیانبەخشیش بێت دەبێتە شتێکی پیرۆز وکوشتن و سەربڕینی حەرام دەکرێ،!.

هەندێك لە ئاینە کۆنەکان ئەوەندە دەچوونە ناو هەڵسوکەوتی تاکەکانی ناو کۆمەڵ، تا ئەو رادەیەی شێوەی داهێنانی پرچ، یان ریش تاشینیشی بۆیان دیاری دەکرد، هەروەها چۆنێتی

بڵاوکردنەوەی گەنم و جۆ بەسەر زەویدا لە کاتی تۆو کردن و چۆنێتی چاندنی دارمێویشی بۆ جوتیارەکان دەسنیشان دەکرد!.

سەرۆکی هۆز لە زۆربەی کاتەکاندا هەرسێ دەسەڵاتەکە پیادە دەکات، ئەویش ناوبژیوانی کردنە لەنێوان لایەنە ناکۆکەکاندا، هەروەها تاکەکانیش دەپارێزێ و پارێزگاری لە موڵك وماڵەکانیشیان دەکات و پێداویستییەکانیشیان بۆ دابین دەکات. سەرەڕای ئەوەی کارو بارەکانی هۆزەکەی خۆی بە چەند بڕیارێك کە خۆی پێی باشە رێکدەخات. هەر خۆشی یاریدەدەرێك بۆ خۆی دادەنێ و داب و نەریتیش وا دەخوازێ کە حوکمڕانیکردن بە میرات بێ لە باوکەوە بۆ کوڕە گەورەکەی.

ئەگەرچی سەرۆکی هۆز هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆیدا کۆ دەکاتەوە، تەنانەت دەسەڵاتە رۆحیەکەش هەر بە دەستی خۆیەوە دەگرێ، وەك ئەوەی ئەو حەلقەییێکی پێوەندی بێ لەنێوان (خودا) و خەڵکیدا. سەرۆکی هۆز دەسەڵاتەکانی خۆی لە سروشە خوداییەکانەوە، یان سەرچاوە غەیبییەکانەوە وەردەگرێ، بۆیە توڕەبوونی سەرۆك هۆز! توڕەبوونی خودا بەدوای خۆیدا دەهێنی و لەوانەشە بە وشکە ساڵی و قات و قڕی هۆزەکە سزا بدات.. هەروەها سەرۆکی هۆز خۆی قوربانییەکان پێشکەش بە خوداوەند دەکات.. سەرەڕای ئەم هەموو شتانەش بە سەرۆکی هۆز دەڵێن: (گەورەی رم)، یان (سەرۆکی سەرجەم ئازادییەکان)، یان (کەجوور)، یان پادشای گەورە کە رێزێکی زۆر و پلەو پایەییێکی بەرزی هەیە، هەروەها ماڵەکەشی بە شوێنێکی پیرۆز دادەنرێ و خەڵکی بە ترس و لەرزەوە لێی نزیك دەکەونەوە و ناشبێ کەس سەرۆك بێ تاقەت بکات، چونکە لەوانەیە لەو کاتەدا خەوی لێ کەوتبێ، یان رۆحەکەی لە حاڵەتی گەڕان دابێ، بەڵام هەرکەسێك پەنا بباتە بەر ماڵەکەی سەرۆك، لەو حاڵەتەدا هەر تاوانێکیشی کردبێ دەپارێزرێ!.

بەم شێوەیە هەر لە سەرەتای گەشەکردنەکانی کلتورەوە دەبینین تێکەڵبوونێکی روون و ئاشکرا لەنێوان رەگەزە جیاوازەکانی بنیاتنانی هۆزە سەرەتاییەکاندا هەبووە، کە دواتر ئەو تێکەڵبوونە لێك دەترازێ و پارچە پارچە دەبێ و دەبێتە سەدان رەگەزو فەرمان و دەستەی سەر بەخۆ.

# بەشی یەکەم

## (لە تەباییەوە بۆ ناتەبایی)

**((پەرەسەندن گردبوونەوەی بەشەکانی ماددە و تێکشکانی هێز و جوولەیە، لەو ماوەیەدا لە حاڵەتێکی گونجان و بێ ئاراستەکردن و گرێنەدراوەوە دەگوازرێتەوە بۆ حاڵەتی ناتەبایی و لە یەکترازان و نەگونجان))**

**( هێربیرت سبنسەر )**

## له ته‌باییه‌وه بۆ ناته‌بایی

فه‌یله‌سووفی گه‌وره‌ی ئینگلیزی (هیربیرت سبنسه‌رHerbert Spencer ـ ١٨٢٠ ـ١٩٠٣) که له‌م سیٚ ساڵه‌ی ئه‌م دواییه‌ی سه‌ده‌ی بیسته‌مدا[١١٦] له ئینگلته‌را به زه‌قی له بواری فه‌لسه‌فه‌دا ده‌رکه‌وت و چه‌ند وتاریٚکی جۆراوجۆری پاکنووس کرد وه‌ك خۆسازدانیٚك بۆ ئه‌وه‌ی له کانونی دووه‌می ساڵی ١٨٥٨دا له کتیٚبیٚکدا بلاٚویان بکاته‌وه (واته پیٚش ده‌رچوونی کتیٚبی بنه‌چه‌ی جۆره‌کانی داروین به ساڵیٚك)[١١٧] وه‌ك خۆی ده‌ڵیٚ: (کاتیٚك که بیرۆکه‌یه‌کی پڕشنگدار له میٚشکمدا بریسکایه‌وه ـ وه‌ك بریسکانه‌وه‌ی رۆژ له سه‌ر جامی په‌نجه‌ره‌کاندا) ـ ئه‌و بیرۆکه‌یه‌ش مانای ئه‌وه‌یه، که یاساییٚك هه‌یه بۆ په‌ره‌سه‌ندن که چۆن به سه‌ر میٚژووی کۆمه‌لاٚیه‌تی و سیاسیدا جیٚبه‌جیٚ ده‌بیٚ ئاوهاش به سه‌ر هه‌موو گه‌ردوون و هه‌رچی له‌ناویدا هه‌یه له هه‌ساره وکۆمه‌ڵه ئه‌ستیٚره‌کان جیٚبه‌جیٚ ده‌بیٚ، هه‌روه‌ها به‌سه‌ر تیۆرو چه‌مکه ئه‌خلاقییه‌کانیشدا جیبه‌جیٚ ده‌بیٚ، هه‌روه‌ها شیکردنه‌وه‌ی هه‌موو جۆر و ره‌گه‌زه‌کان و شیکردنه‌وه‌ی هه‌موو بواره‌کانی وه‌ك هونه‌ر و زه‌وق و جوانی تیٚدا به‌دی ده‌که‌یت! هه‌روه‌ها به په‌رۆشییه‌کی زۆره‌وه هاته پیٚش و زنجیره‌ییٚك کتیٚبی ده‌رکرد، که مادده و ئه‌قڵ له سه‌رده‌می دروستبوونی (سه‌دیم)ه‌کانه‌وه تا ده‌گاته مرۆڤ و له درِنده ترسناکه‌کانه‌وه تا شکسبیر چۆن گه‌شه‌یان کردووه و ده‌ڵیٚ: (گه‌شه‌کردن گردبوونه‌وه‌ی به‌شه‌کانی مادده‌یه و تیٚکشکانی هیٚزو جووڵه‌یه، له‌و ماوه‌یه‌دا له حاڵه‌تی ریٚژه‌یی گونجانیٚکی Homogeit بیٚ ئاراسته‌کردن و بیٚ ئه‌وه‌ی به یه‌کتره‌وه ببه‌ستریٚنه‌وه تاحاڵه‌تی ریٚژه‌یی جیابوونه‌وه Heterogeneity، یان له یه‌ك دوورکه‌وتنه‌وه،

---

١١٦ - رۆدلف میتس (الفلسفة الانجليزية في مائة عام) ـ وه‌رگیٚڕانی د. فوئاد زه‌که‌ریا ـ دار ئه‌لنه‌هزه لعه‌ره‌بیه قاهیره ساڵی ١٩٦٣به‌رگی یه‌که‌م لـــ١٠٩ـ

١١٧ - کاتیٚك که کتیٚبی بنه‌چه‌ی جۆره‌کانی داروین له ساڵی ١٨٥٩دا ده‌رکه‌وت سبنسه‌ر به‌و چاوه ته‌ماشای کرد که پاڵپشتیٚکه بۆ بیرۆکه‌کانی ئه‌و، له‌و کاته‌وه پشتگیری خۆی بۆ ئه‌و ناوه‌رۆکه پیٚشاندا که ده‌ڵیٚ : ئه‌و ژیانه‌ی که هه‌یه له باپیره گه‌وره هاوبه‌شه‌کانمانه‌وه بۆ ئیٚستا گه‌شه‌یان کردووه، له‌گه‌ڵ هه‌ندیٚك گۆڕانکاریش که به سه‌ریاندا هاتووه. ئه‌وه بوو که زاراوه به‌ناوبانگه‌که‌ی خۆی دارِشت که ده‌ڵیٚ (مانه‌وه بۆ باشترینه‌کانه)، که دواتر داروین به کاری هیٚناو کردیه هاوشانی هه‌ڵبژارده‌ی سروشتی ـ به‌م کتیٚبه‌ی خواره‌وه‌دا بچۆره‌وه.
Dictionary of The Histary of Ideas ,VOL.2 -P.182.

یان نەگونجانی ئاراستەکراو و دەسنیشانکراو و یەکگرتوو، لەو ماوەیەدا گۆڕانێك بەسەر جووڵە هەڵگیراوەکاندا دێ کە هاوتەریبە لەگەڵ گۆڕانەکانی پێشوودا[118].

یەکەم (سەدیم) لە ماددەیێکی کۆك وگونجاو پێکهاتبوو و لە یەکتر دەچوون، بەڵام زۆری نەخایاند کە گاز و شلەمەنی و تەنە رەقەکان لە یەك جیا بوونەوە و جیاوازیان تێکەوت. ئەو گەشەکردنانەی کە لە گونجان و وێکچوونەوە بۆ جیابوونەوە و لێکترازان روودەدەن یاسایێکە وەکو یەك بە سەر هەموو بوونەوەرە زیندوو و مردووەکاندا جێبەجێ دەبێ. زیندەوەرە یەك خانەییەکان کە لەوەوە نەش و نماکردنی هەموو بوونەوەرە زیندووەکان دەست پێ دەکات، لە سەرەتادا یەکێتییێکی گونجاوی پێك دەهێنا، ئینجا ئەم گونجانە بەرەو لێك جیابوونەوە و لێکترازان یان نەگونجان هەنگاو دەنێ وگەشە دەکات.

گومانی تێدا نییە ئەو یاسایەی کە (سبنسەر) پەردەی لە سەر لادابوو و دارشتنێکی ئالۆزی بۆی کردبوو، ئەگەرچی دەتوانین لە دەربڕینێکی ئاسانتردا ئەم یاسایە دابڕێژینەوە و بڵێین: بە رای (سبنسەر) هەموو گۆڕانکارییەکان بریتین لە کرداری کامڵبوون و تێکشکان، یان کامڵبوون و لێکجیابوونەوە، لەسەرەتادا هەموو جیهان بریتی بوو لە بارستە ئاگرێك و هەموو پارچەکانی لە یەکتر دەچوون و لەنێوان خۆیاندا گونجاو بوون و هەمووشیان توابوونەوە، دواتر دەستی بە وشك بوونەوە و کامڵبوون ولێکجیابوونەوە کرد و جیاوازی کەوتە نێوانیان، هەسارەکان لە خۆر جیابوونەوە و زەوی بووە هەسارەییێکی سەربەخۆ، ئینجا دیوی دەرەوەی زەوی وشك هەڵگەڕا، وشکانی و ئۆقیانووسەکان و رووبارو شاخەکان، کە نێوانیان پڕە لە شیو و دۆڵ دەرکەوتن و زۆر بە روونی کرداری جیاوازییەکان دەستی پێکرد و لە توانای هەر مرۆڤیکدا هەیە ئەو دوو کردارەی، گونجان و لێکترازان لە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی گەشەکردن و لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانیدا، زۆر بە روونی ببینێ!. چونکە ئەو گەشەکردنە لە بوونەوەرە زیندووەکاندا لە پارچە پرۆتۆپلازماییێکی گونجاو و یەك شێوەییەوە دەستی پێکرد، و دواتر هەنگاو هەنگاو ئەو بە یەکچوونە دەگۆڕێ و دەبێتە لێك جیابوونەوەییێکی جۆراوجۆر: لە سەرەتادا دەبینین بوونەوەرە زیندووەکان بریتی بوون لە یەك خانە، یان (بوونەوەرێکی تاکخانەیی) و ئەو خانەیەش بە هەموو کردارە زیندەگییەکان هەڵدەستا: وەك خۆراك و دەردان، و هەناسەدان و زاوزێ و....هتد. ئینجا ئەو خانەیە گەشە دەکات و دەبێتە بوونەوەرێکی چەند خانەیی و بە تێکڕای کردارە زیندەگییەکان

---

١١٨ - ئەم پرۆژەیە پێویستی بە (١٠) بەرگ کتێب بوو و ماوەی (٣٠)ساڵیشی خایاند. ئەم کتێبە بخوێنەوە.
Dictionary of The Histary of Ideas Vol. 2- P.182.

هەڵدەستن بێ ئەوەی تێك بچێ یا بۆگەن بێ، یان (ئەندامێکی دیاریکراو و تایبەت دادەنێ کارێکی دیاریکراو ئەنجام بدات). دوایی گەشە دەکات بۆ بوونەوەرێکی زیندوو کە لە چەندین خانە پێکدێت و هەر کۆمەڵە خانەیێك کارێکی دیاریکراو ئەنجامدەدەن، ئینجا ئەم بوونەوەرە زیندوانە گەشە دەکەن و ئەندامەکان دەردەکەون و هەر ئەندامێك لە چەند پارچە چنینێکی گۆشت پێکدێ و هەر ئەندامێکیش کارێکی تایبەت بە خۆی ئەنجام دەدات واتە ئەو تەنە لاشەیە لە چەند کۆئەندامێك پێك دێت و ئەو کۆئەندامانەش لە چەند ئەندامێك و ئەندامەکان لە چەند پارچە چنراوێکی گۆشت پێك دێن، بەم شێوەیە گەشە کردنەکان بەرەو جیاوازی و تایبەتمەندێتی دەڕۆن، ئەو کردارەی کە سەرەتا یەك خانە پێی هەڵدەستا، ئێستا دەیان و بگرە سەدان خانە لە کردارێکی زۆر ئاڵۆزدا پێی هەڵدەستن، هەر ئەو شتەیە کە سەرەتا بە شێوەیێك دەستی پێکرد کە زۆر سادەو ساکار بوو. گەشەکردنەکانی کۆرپەڵەی ناو سکی دایك بەهەمانشێوەی گەشە کردنەکانی ئەو بوونەوەرە زیندووانەی کە لە سەر رووی زەویدا دەرکەوتوون بەڕیوە دەچێت، کە لەو خانەیێکی پیتێنراوی گونجاوەوە دەست پێدەکات و دابەش دەبێتە سەر چەندین خانەی تر و بە هەموو کردارە زیندەگییەکان هەڵدەستن، ئەوسا جیاوازی و تایبەتمەندییەکان دەست پێدەکات، کۆئەندام و ئەندامەکان دروست دەبن، وەك کۆئەندامی هەناسەدان، بۆ نموونە: لە لووت و گەروو و بۆڕی هەناسەو سییەکان و...هتد پێکدێ و هەر ئەندامێك لەو ئەندامانە لە چەند پارچە چنراوێك وهەر پارچە چنراوێك لە چەند خانەیێك پێکهاتووە، و هەر یەکەو فەرمانێکی تایبەت بە خۆی هەیە...هتد.

و ئەو یاسایەی کە وەسفی شێوەکانی گەشەکردن دەکات، کە پێشکەوتنێکە لە گونجانەوە، یان لەوێکچوونەوە، یان کۆبوونەوەی کۆمەڵێك کردار لە یەك کرداردا، بەرەو جیابوونەوە و لەگەڵ یەك نەگونجان و جیاوازی تایبەتمەند ـ بەڵکو بەرەو لێك هەڵاتنیش ـ دەڕوات. ئەمە نەك تەنها هەر لە جیهانی ئەندامیدا هەبێ، بەڵکو لە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان و جیهانی کلتوریشدا بە شێوەیێکی گشتی بوونی هەیە: هەموو ئەو لایەنە کلتوریانەی کە تا ئێستا ناسیویانمانە، گشتی لە شێوەیێکی سادەو ساکارەوە گەشەیان کردووە و هیچ کامێکیان لە ناکاو و بە کامڵی و پێگەیشتوویی وەك ئەوەی (زیۆس)[١١٩] بیری لێ دەکردەوە، لە ئەسینا نەهاتۆنەتە دونیاوە.

---

١١٩ - ئەفسانە کۆنەکانی یۆنانی وا دەگێڕنەوە، کە (زیۆس ـ Zeus )ی گەورەی هەموو خواکان کاتی خۆی هەستی بە ژانەسەرێکی زۆر کردووە، (هۆکارەکەشی ئەوە بووە کە یەکێك لە خوا مێینە سەرەتاییە بە

بۆ نموونە (خێزان) لە لای سبنسەر یەکێتییێکی بایۆلۆجی و (کۆمەڵایەتیە)، غەریزەییێکی هۆشیار دەستی بە سەردا گرتووە و ئەم یەکێتیەش گوێڕایەڵی ئەو پرەنسیپە گشتیانەیە کە باسی دەکەین، ئەویش گەشەکردن و گواستنەوەیە لە گونجانەوە بۆ نەگونجان و لێك جیا بوونەوە، دوای ئەوەی سەرۆکی بنەماڵە خۆی فەرمانڕەوا و تەمیٚ کەری ئەو خێزانە بووە و هەر ئەویش کاروبارە ئابوورییەکانی بەڕێوە دەبرد، ئەم کردارە گەشەی کردو گواسترایەوە بۆ دەستە کۆمەڵایەتیە جۆربەجۆرەکانیتر، هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی بنەماڵە فەرمان و پلەوپایەییێکی کۆمەڵایەتی خۆی هەبوو کاری تێیدا دەکرد[١٢٠].

دەتوانی بڕوانیتە قۆناغە سەرەتاییەکانی گەشەکردنی زمان و بیرو باوەڕەکان، یان داب و نەریتەکان.. بۆ ئەوەی ئەو باوەڕەت لا دروست بیٚ، کە لە شێوەییێکی سادەو ساکارەوە کە گونجان و وێکچوون و یەکبوونیان تێدا باو بووە، بەرەو شێوەییێکی لێکدراو و ئاڵۆز کە جیاوازی و نەگونجان وکامڵبوونی تێدا دەردەکەویٚ گەشەیان کردووە.. بگرە ئەو یاسایە خۆی رووناکییێکی زۆر دەخاتە سەر ئەو ناوچانەی کە تەنها بازنەکانی پێوانە و هەڵێنجان لە خۆ دەگریٚ وەك: (هونەری نووسین و توێژینەوەی بنەماکانی نووسینە هەڵکەنراوە

---

هێزەکانی قووت داوە، کە ئەویش میتس Metis بووە، دوای تێپەڕ بوونی چەندین ڕۆژ و مانگ زیۆس ڕووداوەکەی لە بیر کردبوو. کاتێك کە لەسەر دەریاچەی تریتۆن Triton دانیشتبوو لە ناکاو، هەستی بە ژانەسەرێکی زۆر کرد، خەریك بوو سەری بتەقیٚ لە تاو سەری وەك شێت هاواری دەکرد تا (هیڤاستۆس) ی ــخوای ئاسنگەری ـ هات رزگاری کرد، ئەویش بە تەورێکی خوایانە سەری شەق کرد و (ئەسینا)ی خوای لیٚ هاتە دەرەوە، کە تەواو پێگەیشتبوو و چەك و قەلغانی لە خۆی بەستا بوو، وەك بڵێی لە ناو شەڕدا بیٚ لە گەڵ هاوارەکانیدا ئەرزو ئاسمان لە بەردەنگی دەلەرزی، تەنانەت خواکان خۆشیان ترسیان لیٚ نیشتبوو ! د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (معجم دیانات واساطیر العالم) بەرگی یەکەم لـ ـ١٤٠ـ ـ کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦.

١٢٠ - ئەگەرچی سبنسەر سوورە لە سەر ئەوەی کەوا نموونە زۆرن، بەڵام ئێمە چەند نموونەییێکی سادە و روون دەهێنینەوە ئەگەر بێت و سەرنجێك بدەینە ئەو بابەتانەی کەوا فەلەکناسێك و جیۆلۆجییێك دەیانخوێنێتەوە، هەروەها سەرنجیش بدەینە زانستەکانی ژیان و دەروونناسی وکۆمەڵناسی ـ تەماشای ئەو هەڵبژاردانە بکە کە ئەندرێسکی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (هربرت سبنسەر) کۆی کردبوونەوە لـ ـ٦٠ـ ـ و دوای ئەو، کۆی کردۆتەوە.

جۆربەجۆرەکان...هتد)[121]. ئینجا تۆ روو بکەیتە هەر لایێك دەبینی لە تۆپەڵێکی هەماهەنگ و وێکچوودا گەشەکردنەکان دەست پێدەکەن، وردە وردە لە یەکتر جیا دەبنەوە و دەبنە چەند ئەندامێك، ئەو ئەندامانەش بە چەند کارێکی دیاریکراو هەڵدەستن کە لە سەرەتادا شێوەییێکی دەڵەمەی هەیە، هەروەها ئەو تاکخانەییە گونجاوانە گەشە دەکەن و لە یەکتر جیا دەبنەوە و جۆرەها ئەندامی لێ دروست دەبێ: یەکێکیان بۆ خواردن، ئەوی تریان بۆ دەردان و یەکێکیتر بۆ جووڵەو رۆیشتن و یەکێك بۆ هەستکردن.. هەروەها زمانی ئاخاوتنیش سەرەتا یەك زمان بوو، کە لەسەر زەویدا بڵاو بۆوە، چەندین زمان و شێوەزاری تری لێکەوتەوە.. هەر زانستێکیش بە دەیان زانستی تری لێ دەبێتەوە، ئەوانیش هەر یەکە و دەبنە چەند لقە زانستێکی دیکە.. دیمەنێك، یان رووداوێك چەندین شێوەی ئەدەبی لێ دروست دەبێ کە لە ژمار نایێن.. ئەمانە هەمووی نموونە گەلێکن لەسەر هەمەجۆری و لەبەر یەك هەڵاتن (تنافر) کە لە دوای گونجان و وێکچوونەوە دێن. گەشەکردنەکان بەم شێوەیە دەست پێدەکەن، سەرەتا لە بە یەکەوە ژیانی بەشەکان وکۆبوونەوەیان لە یەك یەکێتیدا، تا ئەو کاتەی بەشەکان دەست بە نەش و نما دەکەن و لە یەکتر جیا دەبنەوە و هەندێك جاریش لە یەکتری رادەکەن.

کۆمەڵگەی ئادەمیزاد لەلای سبنسەر وەك بوونەوەرێکی زیندوو وایە: کە چەند ئەندامێکی هەیە بۆ خۆراك و سووڕی خوێن و هاوکاریش لە نێوان ئەندامەکانیدا هەیە، سەرەڕای ئەمانەش زاوزێ دەکات و دەردانی هەیە، نەش و نماش دەکات و چەندی زیاتر نەش و نما بکات ئەوەندە ئاڵۆزتر دەبێ و چەندی ئاڵۆزتریش بێ ئەوەندە زیاتر بەشەکانی بەرەو سەربەخۆبوون دەچن.. لە هەموو شێوەکانی ژیاندا شێوەی تاکەکانی وەرگرتووە.

کۆمەڵگەش بەو پێیەی کە هی هەموانە و بە پێی ئەو بەشانەی کە لێی پێکدێ، ژیانێکی دوورو درێژی هەیە و بەرەو یەکێتییێکی سیاسی هەنگاو دەنێ، لە خێزانەوە بۆ هۆز، بۆ گوند و بۆ شار و بۆدەوڵەت و دواتر بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئینجا بەرەو یەکێتییێکی ئابووری، لە پیشەسازیە بچووکەکانی ماڵانەوە تا سیستەمی کۆمپانیاکان و.. هتد.

لە رێڕەوی هەموو ئەم گەشەکردنانەدا، دەبینی دابەشکردنی کار و پیشەسازی جۆراوجۆر و هەمەجۆری بەرهەمەکان لەنێوان شار و لادێ دا و لەنێوان نەتەوەییێك و

121 -Herpert Spencer Evolution in Culture and Socioty Ed By Stanistar Andreski,Nelson 1971- P.11

نەتەوەییێکی تردا، ئەمانە هەموویان ئاماژەگەلێکن بۆ هەمەجۆری و لێکترازان، و بەڵکو بۆ لێکهەڵاتنیش.

ئێمە لە تواناماندا هەیە ئەو گەشەکردنانە هەست پێبکەین: لە یەکبوونەوە بۆ هەمەجۆری و لە خۆ گونجاندنەوە بۆ لێکترازان، لەهەموو لایەنەکانی کۆمەڵدا: وەك ئاین و حکومەت و زانست و هونەر...هتد.

ئەگەر ئاین سەرەتا لەهەر نەتەوەییێکدا خۆی لە پەرستنی کۆمەڵێك خواو رۆحە هاوشێوەکانیدا نواندبێ، ئەگەر زۆر بێ، یان کەم، ئەمانە هەمووی وردە وردە کۆ بوونەوە و لە یەك نزیك بوونەوە تا لە یەك خودای بە هێزدا چڕبۆوە و هەموو خواکانی تر کەوتنە ژێر رکێفی ئەوەوە. ئینجا ئەو یەکبوونە بووە چەندین ئاین و بیرو باوەڕی تر، ئاین نەك خۆی لە هیچ کێشەییێك نەدەدا، بەڵکو هەڵوێستەکانیشی بەرامبەر بە تاکەکان گۆڕا و ببووە چەقێك کە هەموو کۆڵەکەی ژیان بە دەوریدا دەسووڕایەوە. ئاین تاکە گۆشە بوو لە ژیانی گەلە سادەو سەرەتاییەکاندا. کاتێك کە پیشەسازی جێگەی شەڕو شۆڕی گرتەوە، بیرکردنەوەکان لە مردنەوە گۆڕان بۆ ژیان و ژیان لە کۆت پێوەندەکانی دەسەڵاتی پیرۆز رزگاری بوو و بەرەو رێگەی ئازادی دەسپێشخەری کراوە[١٢٢] هەنگاوی نا.

---

١٢٢ - سەرەڕای ئەو ڕەخنەیەی کە (وۆڵ دیورانت) ئاراستەی فەلسەفەکەی سبنسەری کردبوو، بەڵام لەو باوەڕەدا بوو کە سبنسەر ئەو بەرگانەی لەسەر زانستی کۆمەڵایەتی دایناوە بە بەنرخترین شاکارەکانی ئەو دەژمێردرین و گەورەیی ئەو پیاوە لە فەلسەفەی سیاسیدا دەردەخەن (کەس نەیتوانیوە وەك ئەوەی سبنسەر پێشکەشی کرد لە بارەی زانستی کۆمەڵایەتی شتێك پێشکەش بکات، تەنانەت (کانت)یش کە دامەزرینەری ئەو زانستەیە لەو بارەیەوە ناتوانێ شان لە شانی ئەو بدات ). بە کتێبی (قصە الفلسفة من افلاطون الی جون دیوی)دا بچۆرەوە کە لەدانانی وۆڵ دیورانتە و وەرگێرانی د. فەتحوڵلا محەمەد ئەلموشەعشەعە، کتێبخانەی ئەلمەعاریف بەیرووت چاپی شەشەم ١٩٨٨ لـ٤٨٠ـ و دوای ئەو.

# بەشی دووەم

## (سەرۆکی هۆز)

((تا ئێستا نەمزانیوە هیچ کۆمەڵگاییێك لە بواری ئەخلاقدا گەیشتبێتە خاڵی سفر..داب و نەرێتیش کەمترین ئەو پێناسەمان دەداتێ کە لەلای گەلە سەرەتاییەکاندا بوونی هەبووە .))

(تایلور) (تایلەر)

ئەو بیرۆکە بنچینەییەی، کە دەمانەوێ بیخەینە روو ئەوەیە کە بڵێین: (پێوەندییەکانی نێوان ئەخلاق و سیاسەت هەر لە سەرەتادا پێوەندییێکی تێکەڵ بووە، لە کۆمەڵگە سەرەتایی و ساکارەکاندا هیچ جیاوازییێك لەنێوان ئەخلاق و سیاسەت و ئایندا نەبووە). زۆرجار سەرۆکی هۆز کە هەندێکجاریش پێیان دەگوت (شامان)، واتە جادوباز هەر خۆی پیاوی ئاینیش بوو، هەروەها زۆربەی جارەکانیش دانەر و جێبەجێکار و یاسادانەری هۆزەکەشی بوو، ئەگەرچی پرسیشی بە کۆمەڵێك سەرکردە، یان پیاو ماقووڵی هۆزەکەش بکردبایە، بەڵام دوایین بڕیار هەر دەهاتەوە لای خۆی، هەر خۆی حوکمڕانییێکی رەهای دەکرد، لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا هیچ جیاوازییێك لەنێوان ئەخلاق وسیاسەتدا نابیندرێ. لێرەدا بە شێوەییێکی گشتی مەبەستمان لە ئەخلاق چەمکە باوەکانی ئەخلاقە، وەك: دەسپاکی و ئازایەتی و هاوکاری، و راستگۆیی و سەر ڕاستی و جۆرەها کاروباری تر: کەئەنجامەکەی بۆ ویژدانی مرۆڤ دەگەڕێتەوە. بەڵام سیاسەت، کە مەبەستمان یاسایە، یان پێکهاتە سیاسیەکەی کۆمەڵە، یان پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکەی هۆزە، ((کە لەوبارەوە پرسیاریان لە(کینای) ی فەیلەسووفی فەرەنسی کرد، بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: پ ـ ئەگەر پاشا بوویتایە چیت دەکرد؟ لە وەڵامدا گوتی: هیچ ناکەم، جارێکی تر لێیان پرسیەوە: ئەی کەواتە کێ فەرمانڕەوایەتی دەکا؟ لە وەڵامدا گوتی: یاسا[١٢٣])) ئەمە کێشمەکێشی ناوێ، کە پێوەندییێکی توندوتۆڵ لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا هەیە، چونکە بێخەوشی و بیرۆکە ئەخلاقییەکان یەکەمجار دەردەکەون، سیاسەتیش ئەوەی بەباشی بزانێ لێی وەردەگرێ و دەیانکاتە یاسا. زۆربەی هەرە زۆری چەمکە سیاسییەکان کە

---

١٢٣ - ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (الطاغية... دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي ) لـــ٢٤٥ـــ.

(هەروەها بیرۆکەی یاساش گەشەی کردووە: سەرەتا یاسا لە شێوەی داب و نەریتێکدا دەستی پێکرد، کە باوەڕێکی پتەو بە بوونی پاداشت و سزاییێکی خوایی دەیپارێزێ... دوای دەرکەوتنی بیرۆکەی دەسەڵات و بەستانەوەی بەو فەرمانڕەوایەی کە دەسەڵاتەکە پیادە دەکات ویست و ئارەزووەکانی فەرمانڕەوا بووە سەرچاوەی یاسا و بنچینەی بنەماییێکی رێك و پێکی رەفتارەکانی تاك لەناو کۆمەڵدا. لەکۆتاییدا بیرو باوەڕی دیموکراسی هاتە ئاراوە کە یاسا لە سەر ویستی گەل دادەڕێژرێ، یان کاری داڕشتنی یاسا وگۆڕینی بە دەسەڵاتەکانی گەل دەسپێردرێ، بۆ ئەوەی بەردەوام لەگەڵ پێداویستی و ئارەزووەکانی گەلدا بگونجێن.

د. سەروەت بەدەوی (اصول الفكر السياسي والنظريات والمذاهب السياسية الكبرى) دارولنەهزە ئەلعەرەبیە ساڵی ١٩٧٦ لــ١٨ـ١٩ـ.

دواتر هونەرکاریان تێدا کراوە لە سەرەتادا چەند بێ خەوشییێکی ئەخلاقی بوونە. بۆ نموونە ئێمە دەبینین (ئەفلاتون) لە کتێبی (کۆماری ئەفلاتوندا) گەورەترین گفتوگۆ لەبارەی بابەتە دادوەرییەکان بەرێوە دەبات، کاتێك کە فەیلەسووفێك تویژینەوە بۆ عەدالەتەکان لەلای تاك و کۆمەڵدا دەکات ، دەبینێ هەردوو لایەنی ئەخلاق و سیاسەتی تێدا بە دی دەکرێ، وەکو ئەخلاق لەلای تاك، لەکۆتاییدا دەیگەیێنێتە سەرڕاستی و ڕەفتارێکی باش، بەڵام لەناو خەڵکیدا دەبێتە هۆی دروستبوونی دادپەروەری لەناو خەڵکیدا. ئەمەش مانای ئەوەیە، کە پێوەندییێکی توندوتۆڵ لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا هەیە، هەر لەبەر ئەمەشە دەبینین لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا لەیەك پێناسەدا کۆ بوونەتەوە، بەڵام هەرچەندی کۆمەڵگە گەشە بکات و پێش بکەوێ ئەوەندە جیاوازی لەنێوانیاندا دروست دەبێ، ئەخلاق دەبێتە پرسێکی تایبەت بە رەفتارەکانی تاك و بۆ نیاز و ویژدان و شتی لەو بابەتانە دەگەرێتەوە. لەکاتێکدا سیاسەت دەبێتە کۆمەڵێك یاسا و پرۆژە یاسا کە کاروبارەکانی دەوڵەت رێکدەخات. ئەگەر بێت و ئێمە بیرە سیاسییەکانی سەردەمە کۆنەکان بخوێنینەوە و لێکی بدەینەوە، دەبینین ئەو تێکەڵبوون وگونجانە هەر لە سەرەتاوە نەك تەنها لەلای کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، یان تەنها لە سیستەمی هۆزەکاندا هەبووە، بەڵکو لە بیرە سیاسییەکانی وڵاتانی رۆژهەڵاتی کۆنیشدا بوونی هەبووە.

یەکەمجار هەندێك نموونەتان لە سەر سیستەمی هۆزە سەرەتاییەکان پێشکەش دەکەین، ئینجا دوای ئەو هەندێك بیری رۆژهەڵاتیشتان لە سەر میسر و چین و شوێنانی تر پێشکەش دەکەین.

ئەو بیرۆکە بنچینەییەی، کە دەمانەوێ لێرەدا بیخەینە روو، تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەتە، لە سەرەتای بیرە سیاسییەکاندا ئینجا چ لە رۆژهەڵاتی کۆندا بێ، یان لەلای یۆنانییەکان بێ، تەنانەت لە قۆناغەکانی ئیسلامی و مەسیحیشدا لەسەردەمەکانی ناوەڕاستدا بونی هەبو[١٢٤]. بەڵام ئەگەر سەیرێکی سەردەمەکانی پێش شارستانییەتەکان بکەین، لەمەدا مەبەستم قۆناغی کۆمەڵگە سەرەتاییەکانە، یان ئەو هۆزانەی کە بە سادەیی دروست ببوون،

---

١٢٤ - هینری دبیرۆ دەڵێ: (لە سەردەمە کۆنەکاندا ئەو کاتەی کە داب و نەریت تاکە سەرچاوە، یان بە لیەانی کەم سەرچاوەی سەرەکی یاسا بوون، ئەخلاق و یاسا هەردووکیان یەك شت بوون). د. عەبدولحەی حیجازی لە کتێبی (المدخل لدراسة العلوم الفانونیة) پەراوێزی لـــ١٦٤ـــ بەشی یەکەم لە بڵاوکراوەی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٧٢ وەری گرتووە.

دەبینین نەك هەر تەنها ئەخلاق و سیاسەت تێکەڵ بە یەك دەکران، بەڵکو لەگەڵ ئاینیشدا تێکەڵ بە یەك دەکران، لە یەکتر جیاکردنەوەی ئەو شتەی پێی دەگوترا ئاین و ئەو شتانەی کە بە رەفتارەکانی ئەخلاق، یان بە یاسا سیاسییەکان دەژمێردرا کارێکی قورس بوو. ئەگەر بێت و هەندێك نموونەی هۆزە سەرەتاییەکانتان بۆ بهێنینەوە، دەبینین ئەو بیرۆکەیە لە هۆزی (دەنکا)دا بە روونی دەردەکەوێ کە یەکێکە لەو هۆزانەی کە لە دۆڵی نیلدا دەژین، هەرچەندە لە بنچینەدا ئەوان لە پارێزگای یەکەمدا کۆ ببوونەوە ئەو هۆزە سەرەتاییانە باوەڕیان بە ئاینێکی زۆر سەرەتایی هەیە. و ئاین لەلای هۆزی (دەنکا)دا ئاماژە بە وابەستە بوونی کۆمەڵێك مرۆڤ بە کۆمەڵێك خوداوە دەکات، بەڵام ئەم ئایینە و پەیڕەوکارانی ئەم ئاینە، ئەوانەی کە زیندوون و ئەوانەی کە مردوون و هەروەها خواکانیش لە کۆمەڵگادا کۆ دەکەنەوە و بە بەشێکی دانەبڕاوی ئەم گەردونەی دادەنێن، ئەمەش ئەو مانایە دەگەیێنی کە ئەوان لە لاییێك خواکان بە چەند بوونەوەرێکی زیندوو دادەنێن و لەنێوان خۆیاندا بە یەکەوە بەستراونەتەوە، و لەلاییێکی تریشەوە بە مرۆڤەکانەوە بەستراونەتەوە، کە هەندێکجار بە پێوەندییێکی خۆشەویستی و هەندێك جاریش ئەو پێوەندییە پڕە لە رق وکینە.

ئەوەی لەلای ئێمە گرنگە ئەو بوونەوەرە باڵایانەیە کەبە دادپەروەر و پیرۆز و باڵا و بە هێز و دەست رۆیشتوو لەسەر چالاکییەکانی زۆربەی بوونەوەرەکان دادەنرێن. دەبینین (خوای) هەندێك لە هۆزەکان لە شێوەی تەوتەمە. تەوتەم Totem – لەوانەیە لە ئەسڵدا وشەیێکی پورتوگالی بێت و ماناکەشی دیار نییە، بەڵام ئەمە ناوی ئاژەڵێکە، یان (هەندێك جاریش بە جۆرە رووەکێك دەگوترێ). کە ئەو هۆزانە باوەڕیان وایە ئەوان لەوەوە پەیدا بوونە، ئەو تەوتەمە باپیرە گەورەی ئەوانە. بەمشێوەیە دەبینین ئەو بوونەوەرە لەلای ئەوان بە پیرۆز تەماشا دەکرێ، وکوشتنی، یان سەربڕینی حەرام کراوە، ئەگەر زیانبەخشیش بێت، چونکە باوەڕیان وایە باپیرە گەورەی ئەو هۆزانە مرۆڤی ئاسایی بوونە و دواتر لە بەر هەر هۆکارێك بێ، بوونەتە ئاژەڵ، بۆیە لێی دوور دەکەونەوە.

کەواتە لێرەدا (تەوتەم) شێوەی ئاژەڵی وەرگرتووە و بە شتێکی پیرۆز تەماشا دەکرێ. هۆزی تان (ێچخلێ) باوەڕیان بە جۆرە تەوتەمێك هەیە کە ئەویش ئاژەڵی (گا)یە. لەو باوەڕەدان کە ئەوان لە نەوەی ئەو ئاژەڵەن. چەمکی خوایەتی لەلای هۆزەکانی (دەنکا) دا بە رای ئەوان ئەو چەمکە خۆی لەوەدا چڕ دەکاتەوە، کە ئەوان بە چەندین هێز و رۆح و بوونەوەری پیرۆز و بەرز و خاوەن دەسەڵات دەورە دراون و ئەوانیش بۆ ئەوەی ئەو هێزو رۆحانە رازی

بکەن قوربانیان بۆ دەدەن و قوربانیان بۆ سەر دەبڕن. خەڵکەکە لەو خوا و هێز و ڕۆحانەی کە خودای باب و باپیرانیشیان بووە دەپاڕێنەوە و دەڵێن: (ئەی خودای باب و باپیرانمان)، یان (ئەی خودای پێشینانمان). ئەم خوایە زۆر بە تۆکمەیی بە ئەخلاقەوە بەستراوەتەوە و بۆ دەرخستنی درۆ و ڕاستییەکان و فرت و فێڵ و هەڵخەڵتاندن و شتە پەردەپۆشکراوەکان، تواناییێکی ڕەهای هەیە، بە کورتیەکەی بەرپرسە لە بڵاوکردنەوەی دادپەروەری لەناو خەڵکیدا و سزای ئەو کەسانەش دەدا کە کاری توندو تیژی و ستەمکاری، یان فرت و فێڵ، یان درۆ و دەلەسە دەکەن، یان خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنن. لە بارەی تاوانباریش، یان ئەوانەی کە خراپەکاری دەکەن، هیچ گرفتێکی ئەوتۆی تێدا نییە، چونکە ئەوان باوەڕی تەواویان بەوە هەیە کە ڕۆژێك لەرۆژان خوا تۆڵەیان بۆ دەکاتەوە و دادپەروەری دێنێتە دی. زۆرجار دەبینی خەڵکی تووشی گرفتێك، یان بەدبەختییێك، یان نەخۆشییێك دەبن، یان مانگاکەیان نەخۆش دەکەوێ، یان شێت دەبێ، یان مردار دەبێتەوە ئەم شتانە هەمووی بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە ڕۆژێك لەرۆژان گوناهێکیان کردووە. لەوێشدا بەردەوام نیشانەو بەڵگەی ماددیان بە دەستەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ لە دادپەروەری خودا دڵنیا بن. هەر بۆیەش تاکەکانی هۆزی (دەنکا) لە پێناو پارێزگاریکردن لەو هەماهەنگی و هاوسەنگیەی نێوان خودی خۆی وجیهانی دەرەوەدا تێدەکۆشێ. ئەگەر گرژییێکیش رووبدات، هەوڵی چاککردنەوەی ئەو گرژیە دەدات و ئەگەر کێشەییێکیش کەوتە نێوانیانەوە لە ڕێگای سەر بڕینی قوربانییەکان و ڕێوڕەسمە ئاینییەکانەوە، تەنانەت لە ڕێگای ئەو حاڵەتانەی کە ناتواندرێ بە روونی هۆکارەکەی بزاندرێ، وەك ئەوەی لەسەر دارێك بکەوێتە خوارەوە و قۆڵێکی بشکێ، کاری بۆ ئەوە دەکرد ئەو کێشانە چارەسەر بکات و گونجان و پێکەوە ژیان بەدی بێنێ. ئەو تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا بە دوای ئەو هۆکارانەدا دەگەڕێ کە بوونەتە هۆی تووڕە بوونی خودا، یان ئەو گوناهانەی کەخۆی کردوویەتی یان کەسانێك لە خزمەکانی خۆی کردوویانە. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئاین بە تەواوەتی کۆنترۆڵی ژیانی ئەخلاقیانەی خەڵکی کردووە. بەڵکو تەنانەت لە شیکردنەوەکانیاندا بۆ مردنیش، دەڵێن: فلانە کەس کە مرد ئەمە چۆن روویدا؟ لە وەڵامد دەڵێن: خوا خۆی داوێتی خۆشی دەیباتەوە، قوربانییەکانیش لە شوێنێکدا سەر دەبڕن کە لە دەرەوەی ئەو سنوورەدا بێ کە (ژنی) مردووەکەی تێدا نیشتەجێیە. ئەگەر ئاین دەستی بەسەر ئەخلاقدا گرتبێ، کەواتە دەستی بە سەر پێکهاتەی سیاسی هۆزەکەشدا گرتووە. زۆر جار وادەبێ کە سەرۆکی هۆز، هەرخۆشی پێشەنگێکی ئاینی، یان ئەو جادوبازەی کە دەتوانێ بە چەند

شتێکی لە رادەبەدەر هەڵسێ، ئینجا ئەگەر ئەمە لەبارەی دیاردە سروشتییەکان، یان دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بێ. فەرمانڕەوایەتی سیاسی لەلای ئەوان شتێکی پیرۆزە و سیفەتێکی خوایی هەیە، ئەمەش لە ئەفسانە و گۆرانییەکانیاندا رەنگی داوەتەوە، سەرۆك هۆزیش لە رێگای ئەنجومەنێکەوە کار دەکات، نەك بەتەنیا کار بکات، ئەو ئەنجومەنە بە زووترین کات کاروبارەکانی دادوەری لەناو خەڵکیدا دەگرنە دەست. ئەگەر هەر کێشەیێك لەناو سیستەمی کۆمەڵایەتیدا رووبدات، وەك تاوانی کوشتن، یان دەستدرێژی، یان دزینی مانگاو (هەوجاڕ)، یەکسەر سەرۆکی هۆزی لێ ئاگادار دەکرێتەوە و ئەویش داوا دەکات ئەنجومەنەکە کۆ ببێتەوە و ئەندامەکانیشی دەبنە دادوەری بە ویژدان و هەرسێ دەسەڵاتی ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی لە دەستی خۆیاندا کۆ دەکەنەوە، و رێزی تایبەتی خۆیان هەیە و چارەسەرکردنی کێشەو ناکۆکییەکان دەخرێنە ئەستۆی ئەوان. ئەوەی راستی بێ تاکەکانی هۆزی (دەنکا) لە بیرکردنەوەی ژیانی رۆژانەی خۆیاندا لایەنە ئاینی و دونیاییەکەیان لێك جیا نەدەکرایەوە، بەڵکو هەموو سەرەداوەکانی ئاینی و ئەخلاقی و مەدەنییان لە لای خۆیان کۆدەکردەوە بۆتێکەڵ کردنی کلتوورەکان.

یاساکانی گەشەکردن وەك ئەوەی پێش ئێستا سبنسەر پەردەی لەسەر هەڵماڵی، نەك هەر تەنها بەسەر بوونەوەرە زیندوەکاندا جێبەجێ دەکرێ، بەڵکو بەسەر کۆمەڵگەی ئادەمیزادیشدا جێبەجی دەکرێ، وەك رێکخستنە ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. گەشەکردنی کلتوری لەم کۆمەڵگایەدا، لە گونجانەوە بەرەو نەگونجان و لێك جیابوونەوە هەنگاو دەنێ، واتە کۆمەڵگاکان دەست بە قۆناغەکانی گەشەکردن دەکەن، کە هەموو شتەکان لە ناویدا لەگەڵ یەکتردا گونجاون و لە تۆپەڵێکی هەماهەنگدا تێکەڵ بە یەکتری بوونە، ئینجا هەرچەندی کۆمەڵگە گەشەی زیاتر بکات، جۆرێك لە جیاوازی و تاکڕەوی روودەدەن. بابەتە ئاینییەکان شێوەیێکی تایبەتی وەردەگرن و کێشە ئەخلاقییەکانیش شێوەیێکی تر وەردەگرن و کێشە سیاسییەکانیش شێوەی سێیەم وەردەگرن. کۆمەڵگەش هەر چەند گەشەی نوێتر بکات، تاکڕەوی و جیاوازی نوێتر دروست دەبێ. رێك وەك هەر دیاردەیێکی کۆمەڵایەتی وایە کە لە ناو کۆمەلگادا روو دەدەن، دەبینین لەسەرەتادا جوتیار، خۆی وەستای دیوار بوو، خۆشی پینەدۆز بوو... هتد.

بەڵام هەرچەندی کۆمەڵگە پێش بکەوێ و گەشە بکات، کارەکان زیاتر دابەش دەبن و سەربەخۆتر دەبن، جگوتیار تەنها کاری جوتیاری دەکات و دارتاشیش تەنها کاری دارتاشی

دەکات، بەڵکو تەنانەت لەناو یەك کارێکیشدا جیاوازی دروست دەبێ، دەبینین هەندێك دارتاش کەلوپەلی پیشەسازی دروست دەکات، وەك (تەورداس)...هتد. هەندێك دارتاشیش دەبینین کەل و پەلی ناو ماڵ وەك کورسی و مێز دروست دەکات...هتد. دابەشبوونی کار و تایبەتمەندێتی بەمشێوەیە دروست دەبێ، هەمان شتیش بە مانای رێکخستنی ناوخۆی دەوڵەتەوە روودەدا، کە لە بابەتەکەی ئێمەدا سیاسەتە، واتە دەرکەوتنی ئەو یاسا (وەزعیە) سەربەخۆیانەی کە سەرەرای ئەو دەسەڵاتەی هەیە بڕیار دەدا، ئەمەش مانای ئەوەیە سیاسەت هەر لە سەرەتای مێژووەوە تەنها بە خۆیەوە پەیوەست نەبووە، بەڵکو لەگەڵ زۆر لە رەگەزە کۆمەڵایەتییەکانی تردا وەك ئەخلاق و ئاین تێکەڵ بووە. ئەمەش ئەنجامێکی ترسناکت بۆ دەخاتەی روو، ئەویش ئەوەیە کە هەر چەندی ئاین لەگەڵ سیاسەت و ئەخلاقدا تێکەڵ بکرێ، دەبێتە ئاماژەییێك بۆ دواکەوتوویی ئەو کۆمەڵگەیە، وتا ئێستاش لە قۆناغە هەرە سەرەتاییەکانی گەشە کردندایە. هەرچەندە وشەی (حەرام وحەڵاڵ) بێتە ناوەوە و زۆرێك لەو دیاردانە شی بکاتەوە کە هیچ پێوەندییێکی بە ئاینەوە نییە، کە ئەمەش ئاماژەییێکە بۆ دواکەوتوویی ئەو کۆمەڵگەیە و بۆ بیرۆکەکەی (تابوو ـ Taboo) دەگەڕێتەوە کە (فرۆید) ئاماژەی پێدەدات و مانای (شتە حەرامکراوەکان)، یان ئەو شتانە دەگەیێنێ کە (نابێ دەستیان لێ بدرێ). ئێمە دەمانەوێ هەر لەو روانگەیەوە پێوەندییەکانی نێوان ئەخلاق و سیاسەت لێکبدەینەوە، تا بزانین ئەو تێکەڵکردنەی نێوان ئەخلاق و سیاسەت و ئاین لەلای هۆزە سەرەتاییەکاندا هەبووە، هەروەها لە بیری رۆژهەڵاتی کۆنیش لە میسری کۆن و چینیشدا هەر بەردەوام بووە و لە بیری رۆژهەڵاتیش بە شێوەییێکی گشتی لەلای بابلییەکان و ئاشوورییەکان و خەڵکانی تریشدا باو بووە. ئینجا کاتێك کە مامۆستایانی فەلسەفەی سیاسی وەك ئەفلاتون و ئەرستۆ لە تێکەڵکردن و پێکەوە لکاندنی لایەنە ئاینییە ئەفسووناوییەکان لەگەڵ فەلسەفەی سیاسیدا دوورکەوتنەوە، رەگەزی ئاین لەلای یۆنانییەکان لادرا و بەکار نەهات، بەڵام تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت بەروونی لە لایان مایەوە و لە یەکتر جیانەکرانەوە، تەنها لە لای (میکاڤیللی و فەیلەسووفی ئینگلیزی (تۆماس هۆبز) نەبێ کە یەکەم کەس بوو لە کتێبی (ئەژدیها) دا بیناییێکی سیاسی مرۆڤانەی بنیاد نا. دوای ئەویش (جۆن لۆك) لە سەر ئەم هێلە بەردەوام بوو و تائەمڕۆشی لەگەڵدا بێ لە کۆمەڵگە رۆژئاواییە لیبڕالییەکان و شارستانییەکان بە شێوەییێکی گشتی لە سەری بەردەوامن و لەسەر شێوازی سیستەمێکی دیموکراسی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا درێژەی پێ دەدەن.

ئەگەر بێت و ئێمە باسی هۆزە سەرەتاییەکان بکەین، بۆ نموونە هۆزەکانی (دەنکا)ی باشووری سوودان وەربگرین، لەکۆتاییدا دەتوانین بگەینە ئەوەی کەسیفەتەکانی سەرۆك هۆز لەلای ئەو هۆزانە، لەتوانا سیاسییەکانی ئەو سەرۆکەدا خۆی دەنوێنێ، واتە توانای ناوبژیوانیکردن و بنبڕکردنی ئەو ناکۆکی و جیاوازیانەی لەنێوان تاکەکانی هۆزەکەدا روو دەدەن، هەروەها شارەزابوون لەو هۆکارانەی کە ناکۆکییەکانی پێ چارەسەر دەکرێ و دەسەڵاتیشی هەبێ، واتە مافی بڕیاردان و رێکخستنی کارەکانی خەڵکی هەبێ، سەرۆکی هۆز لەبەرئەوەی چەند سیفەتێکی کەسایەتی و ئەخلاقی و ئاینی هەیە و رێزو شکۆمەندی و پێوەندییێکی خۆشەویستی زۆری لەلایەن خەڵکیەوە پێ دەبەخشرێ، سەرۆکی هۆز لە جێگەی باوکە بۆ تاکەکانی ناو هۆز، تواناکانیشی لەو سیفەتە رۆحیانەدا خۆی دەنوێنێ کە ئەو حیکمەت و ئیلهامانەی لە خواوە بۆ هاتووە، سەرەڕای ئەوەی تواناییێکی باشی هەیە لە تێڕوانینی راست و روون بۆ کاروبارەکانی خەڵکی تا ئەو راددەیەی، کە دەتوانێ ناوبژیوانی و مەسلەت لەنێوان خەڵکیدا بکات، هەروەها نموونەی پاکی و بێگەردی و چاکی و سەرراستی ئەخلاقیشە، سەرەڕای ئەمانەش هەمووی، دەبێ سەرۆکی هۆز لەسەرخۆ بێت و تووڕە نەبێت و هەمیشە دڵ و دەروونی ئارام بێ، ئەو دڵئارامیەش نیشانەی ئاشتی و ئارامی و تەندروستی و دڵنیا بوونێتی لە کارەکاندا، ئەمەش مانای ئەوەیە کە زۆربەی کاتەکان خۆی لە هەڵچوون بە دوور دەگرێ. خوا وەك نەریتێك ئەم ئارامیەی پێ بەخشیوە و دڵی فراوان کردووە، بۆیە پەندێکیان هەیە دەڵێ: (سەرۆکی هۆز دەم و پلێکی سارد و لەسەر خۆی هەبێ باشترە لەوەی دەم و پلێکی گەرم و تووڕەی هەبێ)، چونکە ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە میزاجێکی توندی هەیە و بەرچاوی خۆی نابینێ، وکاڵفامەو خێرا هەڵدەچێ و هەرجارەی بە بارێك توندو تیژی بەکاردێنێ و خێرا دڵی ئاو ناخواتەوە، بەڵکو ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە نەخۆشی دەروونیشی هەیە. بەڵام زمانی ئارام و لەسەر خۆی سەرۆك هۆز، واتای ئاشتی و ئارامی و هەڵنەچوون و ڕاستگۆیی لە کارکردندا دەگەیێنێ، کە توانای ئارامکردنەوە و ناوبژیوانی کردنی نێوان خەڵکانی دیکە و کۆتایی هێنانی کێشەکان و بە توانایی لێك جیاکردنەوەی راستی و ناراستییەکان دەگەیێنێ. ئەمە چەند ئەخلاقیێکی سەرۆکی هۆز، یان (سەرۆکی رم) وەك خۆیان ناویان ناوە) ـ سەرۆکی هۆزیش لەلای ئەواندا لە نوور، سروشی خواییەوە هاتووە، لێرەدا دەتوانین بڵێین: کارەکانی سەرۆکی هۆز لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە: ـ

**یەکەم:** ـ ناوبژیوانی و مەسڵەتی و دادوەری کردن: ـ لایەنە ناکۆکەکان کۆدەکاتەوە و هەوڵدەدات بیان گەیێنێتە جۆرێك لە پێکهاتن، یان قەرەبووکردنەوە بەرامبەر بە لێخۆشبوونی بەرامبەرەکەی. بەم شێوەیە رۆڵی (دەسەلاتی دادوەری) لە کۆمەڵگا نوێییەکاندا دەبینیێ.

**دووەم:** ـ پاراستنی خەڵکی، وەك تاك و هەوڵدەدات ئارەزووەکانیان بێنێتە دی و خەڵکانی پێویست، ئینجا ئەو پێویستیە هەرچییێك بێت بەدوای سەرۆك هۆزدا دەگەڕێ تا لە جێبەجیکردنی پێویستیەکەیدا یارمەتی بدات. لێرەدا سەرۆکی هۆز دەسەلاتی جێبەجیکردن پیادە دەکات.

**سێیەم:** ـ لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی هۆزدا دەسبەکار دەبیێ و رێکیان دەخات و دەبێتە کەرەستەییێکی چالاکی دەستە جەمعی و گیروگرفتەکانیان چارەسەر دەکات و هەوڵدەدات خۆشگوزەرانیان بۆ بە دی بێنیێ، تەنانەت ئەگەر کارەساتێك، یان تێکشکانێکیش رووبدات وەك وشکەساڵی، یان کەمهێنانی بەروبوومی یەکێك لەجۆرەکانی دانەوێڵە سەرەکییەکان، یان روودانی کارەساتێك، یان بڵاوبوونەوەی نەخۆشییێك لە هەردوو جیهانی ئاسمانی و سەر زەویدا، یان لە جیهانی واقیعی و رۆحیدا، کاری سەرۆك هۆز ئەوەیە کە بۆ چاککردنەوەی پێوەندییەکان و گێڕانەوەی هەماهەنگی و گونجان و یەکێتی ناو هۆزەکەی دادوەری و ناوبژیوانی بکات و لەو حاڵەتانەشدا لەبەر (رۆحیانەتی) باب و باپیرانی دەپاڕێتەوە، چونکە ئەوان پارێزەری هۆزەکەن. خوێندنەوەی ئەو نزا و پاڕانەوانەی کە لە کاتی دانانی سەرۆکی هۆزدا دەگوترێنەوە ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە ئەمە ئاماژەییێکە بەو تروسکە رووناکیەی کە ژیان رووناك دەکاتەوە، یان رێگا نیشاندەر و رێکخەری وشەکانە[١٢٥].

سەرەڕای ئەو رۆڵەی کە سەرۆك هۆز دەیگێڕێ، ئەو بە ئاراستەکەرێکیش دەژمێردری بۆ گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتییەکان، ئەگەر هەر داهێنانێك یان مۆرکێکی کلتوری نویێ هەبیێ و بیانەویێ بیهێننە ناو کۆمەڵگاکەوە، ئەو یەکەم کەسە کە کار بۆ ئەوە دەکات پشتگیری ئەو داهێنانە، یان بانگەشەی ئەو مۆرکە نوێیە بکات. سەرۆکی هۆز لادان، یان دەرکردنی بۆ نییە و لە کارەکانیشیدا راناگیریێ و ناشکوژریێ، ئەگەر چی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەندێکجار پلەو پایەکەی لاواز دەبیێ، بەتایبەتی ئەگەر ریش

١٢٥ -- د. فاروق مستەفا (الانثروبولوجيا الثقافية) دارلمەعریفە لە زانکۆی ئەسکەندەریە بەشی یەکەم ساڵی ١٩٨٤ لـ٢٣٦ ـ ٢٣٧ـ.

سپییەکان یەك بگرن و هاوکاری یەکتری بکەن، پشتگیری و پشتیوانی خۆیانی لیٚ بسەننەوە و هەندێك کەس باس لەوە دەکەن کە لەم سالآنەی دواییدا دەولّەتی (سودان) هەولّی ئەوەیدا هەندێك یەکەی کارگێری دروست بکات، لەوانە دامەزراندنی چەند سەرۆك هۆزێکی نویٚ بە لێپرسراوی یەکە کارگێرِییەکان، ویستی پشتگیریان بکات، بەلاّم خەلّکی (دەنکا) ئەم گۆرِانکاریانەیان رەتکردەوە و زۆر بە توندی بەرەنگاری بوونەوە و گالّتەیان بە بیرو بۆچوون و رەفتارەکانی حکومەت دەهات، بەلّکو بۆ گالّتە پیٚکردن و سووك تەماشاکردنی ئەو برِیارانەی کە حکومەت دابووی گۆرانیان ریٚکدەخست، تا توانیان تواناکانی سەرۆك هۆزە نوێیەکانیان لاواز و بیٚ هێز بکەن و نەیانتوانی رۆلّە کاریگەرەکەی خۆیان پیادە بکەن، تا ئەو کاتەی سەرۆك هۆزە خۆجێیەتییەکانی پیٚشوویان لە برِیارداندا نەکردە جیٚگر و راویژکاری خۆیان. ئەمە نموونەییێکی روونی تیٚکەلّکردنی ئەخلاق و سیاسەت و ئاینە و گونجانی ئەو لقانە و یەکگرتنیان تا ئەو رادەیەی کە زەحمەتە بتوانی سەرکردەییێکی ئاینی، و سیاسییێك و مامۆستاییێکی ئەخلاق لە یەکتری جیا بکەیتەوە، کە دەشکریٚ لە یەك تاکە کەسیشدا کۆ ببیٚتەوە، کە ئەمەش لەگەلّ گەشەکردنی کۆمەلّگەی ئادەمیزاددا لەیەکتر جیا دەبنەوە و زیاتر لیٚك دەترازیٚن.

# بەشی سێیەم

## (گەورەی ڕم)

**((گەورەی رم، یان خاوەن رم، یان پێی دەڵێن: (کەجوور). واتە خاوەنشکۆ کە ڕێزێکی زۆری لێدەگیرێ و پلەوپایەییێکی بەرزی هەیە و ماڵەکەشی جێگاییێکی پیرۆزە و هەرکەسێ پەنای بۆ بەرێت، ئەگەر هەرتاوانێکی ئەنجام دابێت لێی دەبووردرێ...))**

**(رۆس.. Ross)**

## یەکەم: دەسپێك:

ئێستا دەبێ نموونەیێکی تری پێکهاتەکانی ناوەوەی سیستەمی هۆزگەرێتی بخەینە روو، کە ئەویش تێکەڵکردنێکی تەواوی چەمکەکانی ئەخلاق و سیاسەت و ئایینە. ئەخلاق لەلای تاکەکانی ناو هۆزدا لە ئاین و هەروەها لە سیاسەتیش جیا ناکرێتەوە، بەڵکو دەبینین چەمکەکان هەر هەمووی لە یەك تۆپەڵی گونجاو و بێ جیاوازی تێکەڵ بە یەکتری کراون، سەرباری ئەمانەش (داب و نەریتەکان) خۆیان ئەخلاق و سیاسەت و ئاین رێك دەخەن، ئەمەش زۆر لەو خانە زیندووە دەچێ، کە بە هەموو کردارە بایۆلۆجییەکان هەڵدەستێ وەك پێشتریش باسمان کردبوو و هیچ تایبەتمەندییێکی بوارەکانی تێدا بە دی ناکرێ و نە تاکڕەوی لە مەیدانەکاندا و نەجیاوازی لە چەمکەکاندا بە دی دەکرێ. بۆیە یاسای مەدەنی هەر هۆزێك (داب و نەریتە) و یاسای ئەخلاق و هەروەها یاسا ئاسمانییەکانیش هەر داب و نەریتە[١٢٦]. ئەم سەرەداوانەش هەر هەمووی لە دەستی سەرۆك هۆزدا کۆبوونەتەوە، کە هەر خۆی (گەورەی رم)ە، یان (خودان کێرد)ە، یان (کەجوور پاشا)یە، یان ئەوکەسایەتیەیە کە دەبێ بە ترس و

١٢٦ - لەوانەیە یەکەم سەرچاوەی ئەو بنەما یاساییانەی، کە مرۆڤایەتی ناسیبێتی (داب و نەریت) بووبێ. کە بنەما یاساییەکان دەردەکەوتن، هێزی خۆی لە گرژبوونی نێوان تاکەکاندا وەك سونەتێکی دیاریکراو وەردەگرێ (لەگەڵ باوەڕ بوونیان بە جێبەجیکردنی و پێویستی رێزگرتنی بەندەکانی ئەو یاسایە بە ئیمزاکردنی سزایەکە، یان ناچارکردنی ئەو کەسەی سەرپێچی یاساکە دەکات )، بەڵام ئەم سەرچاوانە ئەگەر چی لەگەڵ کۆمەڵە سەرەتاییەکاندا دەگونجان کە هێشتا پێداویستییەکانیان زۆر ئاڵۆز نەببوو، بەڵام ئەوەندەی نەبرد لەگەڵ بەرەو پێش چوونی رۆژگار و گەورە بوونی گرووپەکان و زۆربوونی ڕووەکانی چالاکی و دەرکەوتنی پێوەندییەکانی نێوان تاکەکان کە ناتوانێ بە تەنیا پێداویستییەکانی خۆی بە دەست بێنێ، کە سەرچاوەیێکی لە سەرەخۆی بەرهەمهێنانە ـ بۆ ئەو داواکاریانەی کە بەردەوام لە زۆر بووندایە بگات بەو کاروانە بەردەوام و بێ وچانە، کە بۆ ماوەیێك لە بەر چاو ون دەبێ تا رێگە بۆ سەرچاوەیێکی تری یاسادانان چۆڵ بکات کە دەوڵەت بنەما یاساییەکان لە رێگای ئەو هێزو دەسەڵاتەی لە بەر دەستیدا هەیە دەیسەپێنێ. د.حەسەن کیرە :(المدخل الی القانون) دار ئەلنەهزە ئەلعەرەبیە بەیروت ساڵی ١٩٦٧ لــ٢٣١ـ ٢٣٢ــ.

لەرزەوە لێی نزیك ببیتەوە، هەروەها نابێ دەست لە هیچ شتێك بدەی کە موڵکی ئەو بێت، وەك ئەوەی دوای کەمێکی تر بۆتانی روون دەکەینەوە.. سەرۆکی هۆز فەرمانڕەوایەتییێکی رەها دەکات و کەس نابێ لە فەرمانەکانی دەربچێ، ئەگەر یەکێکیش بە گوێی نەکات، یان لە فەرمانەکانی لابدات، یەکەم سزاییێکی دونیایی دەدرێ و دووەمیش سزاییێکی رۆحی دەدرێ.

لەمەودوا تێبینی ئەوە دەکەین، کە دەسەڵاتەکان هەر هەمووی لە دەستی (سەرۆکی پیرۆز)دا کۆ دەبێتەوە کە چەمکەکەی لەو (پاشا پیرۆزانەی کە لەلایەن خوداوە نێردراون) نزیك دەبێتەوە کە لە رۆژهەڵاتی کۆندا فەرمانڕەوایەتیان دەکرد لەگەڵ بوونی هەندێك جیاوازی لاوەکی لێرە و لەوێ. بەڵام ماڵەکەی وەك (پاشا رۆژهەڵاتیەکە) پیرۆزە و موڵك و ماڵەکەشی وەك ئەو پیرۆزە، بەخشین و قەدەغەکردن لە دەست خۆی دایە، هەر خۆشی ئەڵقەی پێوەندیە لەنێوان خودا و خەڵکیدا. دوایین تایبەتمەندییەکانی سەرۆك هۆز ئەوەیە، دەبینین زۆر لە تایبەتمەندییەکانی پاشا رۆژهەڵاتییەکان نزیکە کە وا دەزانن لەلایەن خواوە نێردراون.

## دووەم: هۆزەکانی کارلینجا: .

ئەمانە چەند هۆزێکن لە شاخەکانی (تۆلیشی)دا دەژین، کە دەکەوێتە سەر سنوورەکانی رۆژئاوای هەرێمی نۆبا (لە ناوەڕاست و خوارووی هەرێمی کەردۆڤانی باشوری سودان) ئەوانە لە شەش (گوند)دا دەژین، کە دراوسێی یەکترن، پێوەندییێکی توندوتۆڵ لەنێوانیاندا هەیە، چەند ملە شاخێکی بچووك، یان چەند رەوەزە بەردێك لە یەکتر جیایان دەکاتەوە، گوندەکان شێوەییێکی بازنەیی پێکدەهێنن لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژئاواو باشور شۆڕدەبنەوە و ئەو ئەفسانەیەی لەناو خەڵکی کارلینجی باوە، کە شێوەی دروستبوونی هۆزەکانی کارلینجی شیدەکاتەوە و دەڵێ: (میسالی ـ Missalli: خوای ئاسمان، کوولەکەییێکی لەسەر شاخی تۆلیشی چاند، کە بەرەکەی پێگەیشت بووە دوو کەرت و ژنێك و پیاوێکی لێ هاتە دەرەوە، ئەو ژن و پیاوە باپیرە گەورەی هۆزەکانی کارلینجین و لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا نەوەییێکی زۆریان لێ پەیدا بوو.

ئەم گرووپە خەڵکە کۆمەڵێك لە بنەماکانی رەفتار بەڕێوەیان دەبات، کە پەیوەستن بە هەندێك بیرو باوەڕی ئاینی و ئەخلاقی، کە رەفتارەکانی ئەو کۆمەڵەیە ئاراستە دەکات. ئەو بنەمایانە تاکەکان ئاراستە دەکەن کە بە چ شێوەییێك هەڵسوکەوت بکەن و رەفتارەکانیان چۆن

بێت. ئینجا ئەمە وەك پلانێکی پیادەکراوی لێهاتووە مەبەستیشی بە دیهاتنی دیسپلینە کۆمەڵایەتییەکان وڕێکخستنی سیاسی ناو هۆزەکەیە و هەر گیرو گرفتێك کە بێتەڕێیان چارەسەری بکات و دەسنیشانکردنی ئەو سزایانەیە، کە بەسەر ئەو تاکانەدا دەسەپێ کە پابەندی بنەماکانی رەفتارەکان نابن و لەو ڕێچکەیە دەردەچن کە پێشتر بۆیان دەسنیشان کرابوو. بەم شێوەیە ئەم هۆزانەش وەك هۆزەکانی تر دەبنە خاوەن چەند بنەمایێکی چالاك بۆ بەدیهێنانی ئەو دیسپلینە. بۆ بەرەنگار بوونەوەی سەرپێچییەکان لەکاتی خۆیدا، ئەمەش خۆی لەوەدا دەنوێنێ، کە پێی دەڵێن دابو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان.

داب و نەریتیش لەلای ئەو هۆزانە زۆر سادەو ساکارن، کە لە کۆمەڵێك چەمك و بیرۆکەی گونجاو و هەماهەنگ پێك هاتوونە، کە هەندێك ئاراستەکردنی تایبەت لە خۆیدا دەگرێ. هەروەها دەتوانێ کار لە رەفتارەکانی کۆمەڵ بکات بە ئەرێنی بێ، یان نەرێنی بێ، کە ئەمیان جۆرێکی باشە یان خراپە، ئەم پێکهاتە سیاسیە سادەو ساویلکەیە، کە دوورە لە ئاڵۆزییەکانی مەدەنییەتی نوێ و ئامانجی پارێزگاریکردنە لەو بینا کۆمەڵایەتی و کلاسیکی و ئەو پێوەندیە کۆمەڵایەتیانەی کە هەیە، کەواتە لەسەر هەموو تاکێك پێویستە هەڵسوکەوتەکانی خۆی دەسنیشان بکات و بە شێوەیێکی میکانیزمی لەگەڵ هەڵسوکەوتەکانی خەڵکانی تردا بیانگونجێنێ و نەکەوێتە ژێر گوشاری ئەو کۆمەڵەی کە شێوەو پێوانەی هەڵس و کەوتەکانی بە سەردا دەسەپێنی. لە بەر ئەمە دەتوانین بڵێین داب و نەریت لای ئەو هۆزانە تاکە ئاراستەکەری رەفتارەکانی تاکەکانی ناو هۆزەکەیە. داب و نەریت وشەیێکی مەودا فراوانە (بیرە ئاینییەکان و چەمکە ئەخلاقییەکان و یاسا سیاسییەکان) لە خۆدەگرێ ـ یان لەم قۆناغە سەرەتاییەدا لە بری هەموو ئەم شتانەیە و ئەو خانە زیندووەیە، کە لە بەشی پێشووتردا بینیمان، کە بە رۆڵی خواردن و دەردان و هەناسەدان و...هتد هەڵدەستێ. لێرەدا داب و نەریت لە جیاتی دادگاو دادوەر، ناکۆکی وکێشەکانی نێوان خەڵکی ناو هۆزەکە چارەسەر دەکات ـ داب و نەریت هەندێك لە شتە حەرامەکان دەسنیشان دەکات و دایدەنێ، بۆ نموونە بڕیار دەدات کە نابێ لێپێچینەوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکرێ کە پەنا دەبەنە بەر ماڵی سەرۆك هۆز، یان بڕیار دەدات کە لە حاڵەتی ناکۆکیە توندەکاندا دەبێ بچنە لای سەرۆك هۆز بۆ ئەوەی ئامۆژگاریان بکات، یان کێشەکەیان بۆ بخاتە روو و یەکلایی بکاتەوە. ئەو خستنە رووەش خۆی بڕیار دەدات کە گاڵتەو سووکایەتی بەو ژنە بکرێت کە گوێ ناداتە بنەماکانی ژن و مێردایەتی، یان ئەو کەسە لە ناو هۆز دەر بکرێ، یان لەبەجێگەیاندنی رێورەسمە ئاینییەکان، یان بەشداریکردن

لە خواپەرستی و ژیانی گشتی بێبەشی دەکەن و لێی حەرام دەکەن لەبەرئەوەی تاوانی کوشتنی بە ئەنقەستی ئەنجامداوە. داب و نەریت خۆی جۆرە پۆلینێك بۆ ئەو رەفتارانە دادەنێ کە لە رێ لایانداوە، خۆی لە بنەڕەتدا لادان و سەرپێچییەکان کەم دەکاتەوە، دوای ئەوەش ئەو زەرەر و زیانانەی بە تاوانبارەکە دەکەوێت هەڵدەسەگێنێ. هەروەها پاداشت و سزاکانیش بە پێی سنوری کاریگەرییە ماددی و مەعنەوییەکان دەبێ. بە شێوەییێکی گشتی دەتوانین تاوان و لادانەکانی ناو هۆزەکانی کارلینجا پۆلین بکەین، بۆ نموونە دەسدرێژیکردنە سەر خەڵکی وەك کوشتن و بریندارکردن و زیناکردن و کاری جادویی و چاو پیسی...هتد، یان دەست بەسەردا گرتنی موڵك و ماڵی خەڵکی وەك داگیرکردنی زەوی و زار، یان خانوو، یان (مانگاو مەڕو ماڵات)، یان بیری ئاو و...هتد. هەروەها داب و نەریت جیاوازی لە پاداشت و سزاکانی ئەو کەسانەی سەر بە هۆزەکەن، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی هۆزەکەن دەکات، یان تاوانەکە بە چاوێکی دوولایەنە و جیاواز لەیەك و بەپێی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان تەماشا دەکرێ.

## سێیەم: سەرکردایەتی تەقلیدی: .

کەواتە داب و نەریت لە هۆزەکانی کارلینجادا هاوسەنگیە کۆمەڵایەتییەکان بە دی دێنێ و ڕۆڵی سەرۆك هۆز ئەو پیاوەی کاری بڕیاردانی پێ دەسپێردرێ دەبێ چی بێ؟ و دەبێ کاریگەری لەسەر هەڵوێستەکانی ئەوانی تردا چی بێ؟ تا چەند تاکەکان گوێڕایەڵی دەبن و ئایا ئامادەیی ئەوەیان تێدا هەیە وەك تاکێك بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی لە ئەستۆ بگرن؟ دەتوانین بڵێین: سەرکردەکان، یان سەرۆك هۆزەکان، لەبەر هەندێك هۆکاری تایبەت، لێپرسراوێتی رۆحی(ئاینی) و دونیایی (سیاسەت وئەخلاق) لە دەستی خۆیاندا کۆ دەکەنەوە.

هۆزەکانی کارلینجا، بەڵکو دانیشتوانەکانی شاخی تۆلیشی، هەر هەموویان بە سەرۆك هۆزەکانی خۆیان دەڵێین (کەجوور پاشا)[١٢٧]. ئەمەش مانای گەورەی رم، یان

١٢٧ - وشەی کەجوور لە زمانی ئەواندا لە (کەج) وەرگیراوە واتە : دابەزیوەتە ناوی، هەروەها (کەجووریش) ئەو کەسەیە کە رۆحەکان هاتوونەتە ناویەوە و پیرۆزیان کردووە و توانای دامەزراندنی چوار کەجوورەکەی تریشی هەیە، وەك ئەوەی دوای کەمێکیتر باسی دەکەین.

سەرۆکی رم، (خاوەنشکۆ) دەگەیێنیٚ، هەمان ناو لێنان لەلای هۆزەکانی (دەنکا) ی جیرانیشیاندا دەبینین، کە بە سەرۆکی هۆزەکەیان دەڵێن گەورەی رم، یان سەرۆکی کێرد، لەبەر ئەو پلە و پایە کۆمەڵایەتیەی کە هەییێتی رێزێکی زۆری دەگرن و لەسەر ئاستی تاکەکان و کۆمەڵێشدا کاریگەرییێکی بەهێزی هەیە، سەرۆکی هۆز هەردوو دەسەڵاتی ئاینی و سیاسی، (ئەخلاقیش بەشێکە لەبنەما ئاینییەکە) لەگەڵ یەکدا لەلای خۆی کۆ دەکاتەوە و بە کەسێکی پیرۆز دەژمێردریٚ، ئەو پیرۆزییە ماڵ و موڵکە تایبەتییەکانیشی دەگرێتەوە، گەورەترین تاوان ئەوە بوو کە ئەگەر تاوانێك بەرامبەر بە خودی سەرۆك ئەنجام بدرایە، چونکە نابیٚ دەسکاری موڵك و ماڵەکەی، یان کشتوکاڵەکەی ئەو بکریٚ، ئەگەر هات و یەکێك زیانی پیٚ بگەیێنیٚ ئینجا ئەمە ئەگەر بە دەستی ئەنقەست بیٚ، یان نا، وەك دەسدرێژیکردنە سەر زەوی و زارەکەی، یان دامەزراوەییێکی ئەو، دەبیٚ ئەو کەسە پەلە بکات و زوو دان بە تاوانەکەیدا بنیٚ، هەروەها دەبیٚ هەمان ئەو شتەی کە وەك زەرەر داندراوە لەهەمان کاتی رووداوەکەدا تا ژیانی ماوە ساڵانە ئامادەی بکات و بیداتەوە بە سەرۆك هۆز، تا ئەو کاتەی سەرۆك هۆز لێی خۆش دەبیٚ. لێرەدا دەبوایە خەڵکی هەمووی لە هەوڵی ئەوەدابن کە زەوی و زارەکەی بۆ دابچێنن و بۆی بدوورنەوە و ماڵەکەی بپارێزن، چونکە ماڵی سەرۆك (پاشا) بە پیرۆز دادەنرا و هەرکەسێکیش پەنای بۆ ببردایە، هەر تاوانێکی کردبایە، ئەگەر کێشەکە کوشتنیشی تێدا بووایە کەس بۆی نەبوو لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات، سەرۆك مافی پیاوەتیکردن و دیاری بەخشینیشی هەبوو، ئەگەر شتێك لە موڵك وماڵەکەی خۆی بدابایە هەر کەسێك، ئەو کەسە پیرۆز دەبوو لەبەرئەوەی ماڵەکەی سەرۆك پیرۆز بوو، بەڵام کەس بۆی نییە بە بیٚ مۆڵەت بەشێك لەو موڵك وماڵە بۆ خۆی دابڕیٚ، چونکە توانای خۆڕاگرتنی لە بەرامبەر ئەو هێزە پیرۆز و شاراوەیەی سەرۆك هۆز نییە، لەبەرئەوەی تووشی زەرەر و ماڵوێرانی دەبیٚ.

سەرەڕای ئەمانە هەمووی سەرۆك هۆز خۆی چوار کەیجوورەکەی تر دادەنیٚ، کە (کەیجووری باران و کەیجووری کشتوکاڵ و کەیجووری دروونەکردن وکەیجووری جەنگ) ن. ئەوانیش کەسانی پیرۆزن، و موڵك و ماڵەکەشیان هەر پیرۆزە و نابیٚ کەس لێیان نزیك بکەوێتەوە، یان دەستیان لێبدات و ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەیە، هەندێك کەس باوەڕیان وایە کە ئەم چوار کەیجوورە تا لە ژیاندا مابن نابیٚ یەکتری ببینن، ئەگەر دوانیشیان

یەکدی ببینن ئەوە لەو ساڵەدا یەکێکیان دەمرێ، بۆیە شوێنی نیشتە جێبوونیان دەبێ لە یەکترەوە دوور بێ و هەر یەکەیان لە بناری شاخێکدا دەژین و جموجۆڵەکانیشیان زۆر سنووردارە بۆ ئەوەی نەگەنە یەکتری.

لەناو ئەو هۆزانەدا وەك نەریتێك وا رۆیشتووە کە سەرۆکایەتی بە بنەماڵە بێت و لە رێگەی نێرەکانیشەوە بێت، کە بۆ کوڕە گەورە دەگوازرێتەوە، تەنها ئەوانە ناگرێتەوە کە نەخۆشن، یان گێل وکاڵفامن، یان گەڕوگولن. زۆر جاریش سەرۆکی هۆز براگەورەکەی لەگەڵ خۆیدا دادەنا وەك یاریدەدەرێك، بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری ڕێوڕەسم و بۆنەکان تا ئەو رادەیەی کە برا گەورە بە هەڵگری (ڕمی پیرۆز) دەژمێردرێ، هەروەها ئەو یاریدەدەرە لە دوای مردنی سەرۆك هۆزدا و پێش راگەیاندنی مردنەکەی بە فەرمی گوارە ئاسنینە پیرۆزەکە لە گوێی برا مردووەکەی دەکاتەوە. وەك نەریتێك یاریدەدەری سەرۆکی نوێ گوارە پیرۆزەکە لە گوێی سەرۆکە پاڵێوراوە نوێیەکە دادەنێ ـ هەروەها لە کاتی وەرگرتنی پلەی سەرۆك هۆزیدا دارێك دەداتە دەست سەرۆك کە لق و پۆپێکی زۆری پێوەیە. ئینجا لێرەدا خەڵکی دێن و پیرۆز بایی لە سەرۆکی تازە دەکەن، ژن و منداڵەکانیشیان بۆ ئاهەنگەکە دەهێنن بۆ ئەوەی رۆحیانەتیان پیرۆز بێت و پاك بێتەوە، سەرۆکی هۆزیش وەك نەریتێکی هەمیشەیی پیشوازیان لێ دەکات و ئاویان بە سەردا دەپرژێنێ بۆ ئەوەی ئەو رۆژەیان لێ پیرۆز بکات و بەهێز بن و تەندروستیان باش بێت.

ئەو هۆزانە باوەڕیان وایە کە نەخۆشییێکی دیاریکراو هەیە تووشی سەرۆك هۆزەکان دەبێ و هەر دەبێ تووشی بێ، نەخۆشیەکە نەخۆشییێکی نادیارە و بە چەند نهێنییێك دەورە دراوە و نیشانەکانی لە ناکاو دەردەکەوتن. کە سەرۆك کێشی زۆر دادەبەزێ و بێهێزی و لاوازی گشت گیانی دەگرێتەوە و ئەو هۆزانە هیچ شیکردنەوەییێکیان بۆ ئەو نەخۆشیە نییە تەنها ئەوە نەبێ کە دەڵێن (میسالی: خودای ئاسمان) خۆی حەز دەکات بەم شێوەیە بێت، نەخۆشیەکە پێوەندی بە ئیرەیی، یان جادو، یان چاوپیسیەوە نییە، چونکە سەرۆك هۆز، یان کەجوور پاشا بەرگرییێکی لە رادە بەدەری بۆ ئەمجۆرە شتانە هەیە. ئێمە هەمان بیرۆکە لەلای ژمارەییێك لە هۆزەکانی ئەفریقیا دەبینین، کە هەندێك لەو هۆزانە ئەگەر سەرۆکەکەیان زۆر پیر بوو، لەبەرئەوەی زۆر بەزەییان پێدا دێتەوە، بۆ ئەوەی زیاتر توانای جەستەیی کەم نەبێتەوە دەیکوژن، چونکە ئەو لاوازیە لە توانا

جادوییەکانی کەم دەکاتەوە، کرداری کوشتنەکەش بە کۆمەڵێك رێورەسم دەورە دەدرێ و ئەنجام دەدرێ[128].

بیرۆکەی ئەو پیرۆزیەی سەرۆك هۆز، یان (کەجوور پاشا) لە بیرو باوەڕی ئەواندا بەمشێوەیە وێنای کێشراوە، کە هەندێك هێزی شاراوە و نهێنی دەورەیان داوە و ئەخلاقەکانی پێشبینی پێ دەبەخشن و لە دوای ئەوەشەوە قوربانییەکان پێشکەش بە (میسالی) خوداوەند دەکات و گایێك، یان مانگاییێك دەکاتە قوربانی و زۆربەی جارەکان کەللە سەرەکەی بە کۆڵەکەی ماڵەکەیەوە هەڵدەواسرێ، خەڵکی زۆر بە ترسەوە لە ماڵەکەی نزیك دەبوونەوە، لە بەر ئەوەی نابێ کەس بێتاقەتی بکات، چونکە لەوانەیە سەرۆك بە خەیاڵ رۆیشتبێ، یان رۆحەکەی رۆیشتبێ بۆ گەڕان. و سەرۆك نابێ گۆشتی سەگ و بەراز بخوات.

سەرەرای هەموو ئەمانەش نابێ بڕیارەکانی (کەجوور پاشا) رەت بکرێنەوە و نابێ کەس لە فەرمانەکانی یاخی بێ. ئەگەرنا، ئەو کەسە سزاییێکی جەستەیی چاوەڕوانی دەکات، کە هەردوو قاچی دەبەستنەوە و بە درێژایی رۆژ لەبەر خۆر دەیهێڵنەوە. و ئەگەر هەر لە رەتکردنەوەی بڕیارەکانی پاشادا بەردەوام بوو، سزادانەکەی درێژتر دەکەنەوە. ئەوەی شایانی باسە پارەی ئەو سەرپێچیانەی کە کۆ دەکرێنەوە دەبێتە موڵکی کەجوور پاشا و لەبەکار بردنیدا ئازادە کە بیداتە هەرکەسێ وەك پاداشت، یان دیاری، لە کۆندا سەرۆك سەرپێچیەکەی لەسەر بنچینەی وەرگرتنی بە بەهاترین و گرانترین ئەو شتەی کە تاوانبارەکە هەیێتی وەردەگرت، ئەگەر بێت و تاوانبارەکە هیچی نەبوو و بە قەرەبووکردنەوەش سزادرابوو، داوا لە خزمەکانی دەکرێ کە ئەو قەرەبووکردنەوەیە لە جیاتی ئەو بدەن[129].

لێرەدا دەتوانین تایبەتمەندییە گشتییەکانی بینا کلاسیکییە کۆمەڵایەتییەکان لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە: ـ

**یەکەم: ـ** سەرەڕای بوونی ریش سپی و پیاوماقوڵان لە کاتی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی (دابی)دا بەڵام دەسەڵاتەکان هەر هەمووی لە دەستی سەرۆك هۆزدا کۆ دەبێتەوە، کۆبوونەکانی

---

١٢٨ - سوودم لە کتێبەکەی د. فاروق مستەفا ئیسماعیل (الانثروبولوجیا الثقافیة ) هەردوو بەشەکەی و لە بابەتی (القبیلة البدائیة: ثقافتها وطقوسها... الخ) وەرگرتووە.

١٢٩ - د. فاروق مستەفا ئیسماعیل (الانثروبولوجیا الثقافیة) بەشی دووەم دار ئەلمەعریفە، زانکۆی ئەسکەندەریە ساڵی ١٩٨٤ لــ١٢٢ــ.

ئەو ئەنجومەنە کە تا رادەییێکی زۆر تەنها رووکەشیە و دەتوانین بڵێین کە چالاکبوونی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چونکە سەرۆك نوێنەرایەتی هەردوو دەسەڵاتی سیاسی و رۆحی بە یەکەوە دەکات. لێرەوە دەبووایە بڕیارەکانی ئەو سەرۆکە جێبەجێ بکرێت ـ و سەرپێچی کردن لە بەرامبەریدا بوونی نەبوو.

**دووەم:** ـ بیرۆکەی دەسەڵات، بە بیرۆکەکانی رێزگرتن و پیرۆزکردن کاریگەرببوو و بەسترابۆوە، لێرەدا ئەو بنەمایانەی کە ئامانجیان حەرامکردنی هەندێك رەفتاری دیاریکراو بوو بۆ باوەڕە ئاینییەکان دەگەڕێتەوە، نەك تەنها لەبەرئەوەی کە ئەخلاق رەتی دەکاتەوە، ئەمە لەلاییێك و لەلاییێکی تریشەوە داماڵینی شتە پیرۆزەکان و ئەو رێزە زۆرەی کە سەرۆك هەیێتی، بەو پێیەی کە خۆی کەرەستەی پێوەندییەکانی نێوان خواو هۆزەکەیە. ئەو وا تەماشا دەکرێ کە وەك ئەوەی هێزێکی رۆحی پێ بەخشرابێ وایە، بۆیە نابێ کەس لە موڵك وماڵەکەی نزیك بکەوێتەوە، یان زیانی پێ بگەیێنێ.

کەیجوور پاشاو دارودەستەکەی وەك پاسەوانی داب و نەریتەکانی باب و باپیرانیانن و هەر لادانێك، یان گوێ پێنەدانێکی دەبێتە هۆی زیان پێ گەیاندنێکی زۆری تاوانبارەکە، یان ئەو کەسەی سەرپێچی کردووە.

**سێیەم:** ـ بوونی کۆمەڵێك پاداشت و سزا کە مۆرکێکی ئەخلاقی یان ئاییینیان هەیە.. و جێبەجێ کردنیان لە ئەنجامی ترسانە لە رۆحە پیرۆزەکان، یان لە ترسی دابڕانیانە لە کۆمەڵ، ئەو بڕیارانەی دەری دەکەن، کە خۆی لە ئازاردانی جەستەیی دەنوێنێ وەك (جەڵدە) لێدان و بەستنەوە و زیندانی کردن، یان سەرپێچی بۆ نووسین ئەمانە هەر هەمووی، تۆڵە سەندنەوەو بەدی هاتنی سزادانەکەیە. لەوانەیە سزادانەکە قەرەبووکردنەوە بێت، یان هەڵدەستێ بە قەرەبوو کردنەوەی داواکار و گەڕاندنەوەی ئیعتیبار بۆی، وەك لە حاڵەتی دزین، یان دەست بەسەراگرتنی زەوی وزار، یان بەرو بوومدا روودەدات.

**چوارەم:** ـ نەبوونی دارشتەییێکی دیاریکراو و یەکلاکەرەوە بۆ کۆتاییهێنان بە ناکۆکییەکان و دانانی سنوورێك بۆی، ئەو ئەحکامانە شێوەی ئامۆژگاری و رێ نیشاندان، یان سەپاندنی سزاییێك، کە بەپێی حاڵەتەکە دەگۆڕێ، هەروەها نەرمیشی تێدایە و جێگیریش نییە، بەڵکو لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ناڕوونی پێوە دیارە. بۆ نموونە: لە حاڵەتی دەست بە سەرداگرتنی زەوییێکدا و (تۆوکردنی لەلایەن کەسێکەوە)، داب بەم شێوەیە بڕیار دەدات، تاوانبارەکە دەکاتە شەریکی خاوەن

زەویەکە و نیوەی بەرهەمەکە بۆ خۆی دەبات، یان گێڕانەوەی زەویەکە بۆ خاوەنەکەی، یان بۆیان بەجێبهێڵن تا دوو وەرز دروێنەی یەك لە دوای یەك دەکەن ئینجا بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی. ئەمەش بۆ هەوڵ و کۆششەکانی تاوانبارەکە لە کاتی چاندنی زەویەکەدا و بۆ رادەی داکۆکییەکانی خاوەن زەویەکە دەگەڕێتەوە. ئەوەی گرنگە لەم هەموو شتەدا ئەوەیە کە قالبێك، یان دارِشتەییێکی دیاریکراو و یەکلاکەرەوە لەوێدا بوونی نییە ناوی سزادان بێت[١٣٠].

**پێنجەم:** ـ بە شێوەییێك تەماشای کەیجوور پاشاو ئەو پیرۆزیانەی، کە هەیێتی دەکرێ، وەك ئەوەی بلێی ئەو دەسەڵاتەکانی خۆی لە سروشێکی خوایی، یان لە سەرچاوە غەیبییەکانەوە وەردەگرێ، بۆیە گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەو بنەما دابیانە، یان (کۆمەڵێك لەو حەڵاڵ و حەرامکراوانە) لە ترسی تووڕە بوونی سەرۆك هۆزدا دەکرێ، چونکە ئەگەر سەرۆك تووڕە ببێ، ئەوە تووڕەبوونی ویستە خواییەکانە، یان تۆڵەسەندنەوەی میسالی خددچژژخت خوای ئاسمان بە دوادا دێ: کە داهێنەری رۆژ و مانگ و ئاسمان و شاخ و ڕووەك و بروسك و هەورەتریشقەو باو بارانە. کە هۆز بە سزاییێکی زۆر توند سزادەدات و تووشی نەبوونی و وشکەساڵیان دەکات، لەبەرئەوەی داب و نەریتەکانی باب و باپیرانیان پشتگوێ خستووە و سەرۆك هۆزەکەیان تووڕە کردووە.

١٣٠ - سەرچاوەی پێشوو لــ١٢٨ــ١٢٩ــ.

# (دەروازەی سێیەم)

## (تێکەڵکردنی ئەخلاق وسیاسەت لە رۆژهەڵاتی کۆندا) یان لە (دەسەڵاتی باوکسالاری)دا

# بەشی یەکەم

## ((بیری سیاسی لە میسری کۆندا))

**(( من هەڵسوکەوتی خراپم لەگەڵ کچی هیچ کەسێك لە هاوڵاتیانی خۆمدا نەکردووە، ستەمیشم لەهیچ ژنێك نەکردووە، هیچ جوتیارێکیشم نان بڕاو نەکردووە، من تاقە شوانێکیشم لەسەر کار لانەداوە و کاری زۆرەملێم بە کرێکارەکان نەکردووە، بۆیە هەرێمەکەی من غەم و دڵتەنگی تێدا نەبوو و برسێتیش هەتا من لە ژیاندا بووم، بوونی نەبوو..))**

**((نووسراوی سەر گڵکۆی یەکێك لەحوکمڕانی هەرێمەکان ـ لەبەنی حەسەن))**

## دەسپێك: .

لە بینای سیاسی رۆژهەڵاتی کۆندا مۆرکێکی بنچینەیی هەیە، کە چاو هەڵەی تێدا ناکات، ئەویش ئەوەیە، کە سیستەمە سیاسییەکانی ئەوسا پشتیان بە دەسەڵاتی باوکسالاری (پاتریارکی) دەبەست، ئەگەر ئەمە لە میسر بووبێت، یان لە چین، یان لە هەر جێگاییێکی دیکەدا بووبێت [131]. ئەگەر بێت و دەسەڵاتی باوکسالاری لە بنەڕەتدا دەسەڵاتێکی ئەخلاقی بێت، دەتوانین بڵێین: بە یەکەوە گونجان و یەککگرتنی ئەخلاق و سیاسەت لە بیری کۆندا، کە هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان ئەم دیاردەیە دەگێڕنەوە بۆ سروشتی کشتوکاڵی و ئەو سەقامگیریەی کە بە دەستی هێنابوو ((بووە هۆی رەخساندنی بوارێك بۆ دەرکەوتنی جۆرێك لە دەسەڵاتی باوکسالاری کە وردە وردە لە گەڵ فراوانبوونی چوارچێوە خێزانییەکان و لق و پۆپ هاویشتنی بەرەباب و تیرەکانیدا ئەویش بەر فراوانتر دەبوو..)) [132]. ئەگەر ئێمە ئەوە بزانین شارستانییەتە کۆنەکان لەسەر بنچینەی کشتوکاڵی دامەزراون، دەشتوانین بڵێین: شارستانییەتە کۆنەکان هەموویان لەسەر بنچینەی دەسەڵاتی باوکسالاری دامەزراون کە پشت بە هیچ هێزێکی ماددی نابەستێ، بەڵکو کۆڵەگەکانی خۆی لەسەر ملکەچبوونی خێزانەوە هەڵدەنێ، ئەو ملکەچبوونەش لە سروستی ئەخلاقدا بوونی هەیە[133].

---

١٣١ - بەرچاوترین دیاردە کە بیری سیاسی رۆژهەڵاتی کۆن دەردەخا، ئەوەیە کە تۆ ناتوانی ئایین و داب و نەریتەکان و یاسا لەیەك جیا بکەیتەوە. لەبەر ئەوەی گەلانی کۆن هەموو دەسەڵات و رێکخستنەکانیان بۆ ویست و ئارەزووەکانی خوداوەند دەگێڕایەوە. و بە پێی ئایین، گرووپە سیاسییەکانی خۆیان هەڵدەسەنگاند و هەر بە هۆی ئاینیشەوە تاکەکان بە یەکەوە دەبەسترانەوە، باوەڕیشیان وابوو، کە پاداشت و سزادانەکانی خوداوەند هەر بنەماییێك لە بنەماکانی رەفتارەکانی تاك دەپارێزێ . لەسەر ویست و رەزامەندی خودا ئەو داب و نەریتانە هاتوونەتە کایەوە کە ئێستا مرۆڤ پیادەی دەکات.

١٣٢ - د. مستەفا ئەلخەشاب (تاريخ الفلسفة والنظريات السياسية) لیژنەی ئەلباب ئەلعەرەبی ساڵی ١٩٥٣ لـ١١ـ.

١٣٣ - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەبێ تێبینی ئەوەبکەین کە (گەلانی رۆژهەلاتی کۆن هیچ کاتێك لە بیری ئەوەدا نەبوون کە هیچ جۆرە دەسەلاتێکی سیاسی تر جگە لە دەسەلاتی سیاسی پاشایەتی رەها هەبێت. ئازادی سیاسیشیان، هەر بە خەیاڵدا نەدەهات، بیرکردنەوەکانیان لە بارەی ئازادییەکان تەنها ئەوەبوو، کە مل بۆ دەسەلاتەکانی گەلێك کەچ نەکەن، کە لە رەگەزێکی تر، یان ئایینێکی تر بێ، کە لەگەڵ ئایین و رەگەزەکەی ئەواندا نەگونجێ ).

گرنگییەکانی دەسەلاتی باوکسالاری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە لە مێژووی کۆمەڵگاکاندا تاکە پاڵپشت بووە بۆ سەقامگیری و خۆشگوزەرانی و ملکەچبوونی ئەدەبی و ئەخلاقی لەناو کۆمەڵگەدا. هەروەها تاکە پاڵپشتیش بووە بۆ یاساو دارشتنی یاساکان، سەرۆکی خێزان خۆی بە پەروەردەکردن و گۆشکردن هەڵدەستا و خۆی میر و بڕیاردەر و دادوەر و پاڵپشتی ئەو داب و داب و نەریتانە بوو[١٣٤]. وەك ئەوەی لە سەرۆکی هۆز و (گەورەی رم) دا بینیمان لەو دوو بەشەی پێش ئیستا.

ئەوەی لە رۆژهەلاتدا بەدی دەکرێ ئەوەیە، کە ئایین دەست دەخاتە ناو هەموو کاروبارەکانی ژیانەوە:

(شەریعەتەکانی ئاینی براهما لە هیندستاندا بنەماکانی هەڵسوکەوتی تاك لە وردترین کاروبارەکانی ژیانی رۆژانەیاندا رێکدەخات، لە شێوەی پاککردنەوەی ددانەوە بگرە تا دەگاتە رێوڕەسمی بە خاك سپاردنی جەنازەی مردووەکان[١٣٥]. وەك ئەوەی سەرۆك هۆز، یان کەیجوور پاشا کە ئەمانە کەسایەتی پیرۆز بوون، لێرەدا فەرمانڕەواکان بە هەمان چاو تەماشا دەکرێن، کە چۆن ماڵەکەی سەرۆك هۆز شوێنێکی پیرۆز بوو، دەبینین بە هەمانشێوەش (ماڵی گەورە) کە فیرعەونی تێدا دەژیا پیرۆز بوو. چۆن تەماشای یاریدەدەرەکانی سەرۆك هۆز دەکرا، بە هەمان شێوە لە میسردا تەماشای فەرمانداری هەرێمەکانیش دەکرا چ وەکو کەسەکە خۆی، یان چ وەك موڵك وماڵەکەی...هتد. ئەمە کورتەییێك بوو لە بینای سیاسی میسری کۆن کە چۆن بووە؟ پێویستی بە نەختێك دوورو درێژی هەیە.

---

١٣٤ - د. سەروەت بەدەوی (اصول الفكر السياسي والنظريات والمذاهب السياسية الكبرى) دار ئەلنەهزەی عەرەبی ساڵی ١٩٧٦ لـ٣١ـ.

١٣٥ - هەمان سەر چاوەی پێشوو.

لەوانەیە بتوانین بڵێین: ئەو بینا سیاسیانە پشت بە سێ کۆڵەگەی سەرەکی دەبەستن کە ئەویش ئەمانەن: پاشا، وەزیر، هەروەها فەرمانداری هەرێمەکان. کەمێك لەسەر ئەم سێکوچکەیە دەوەستین.

## یەکەم: پاشا: .

سیستەمی سیاسی لە میسری کۆندا بۆ سەردەمانێك دەگەڕێتەوە کە زۆر کۆنە و بەهۆی ئەو زانیارییە کەمەشەوە، کە لە بەردەستماندایە ناتوانین دەسنیشانی بکەین. ئەوەی کە لەبنەڕەتدا لەوبارەیەوە بە دەستمان گەیشتووە نووسینی سەر کۆمەڵێك قامیشی بەردیە (البردی) لە هەمووشیان گرنگتر بەردییەکانی (ئەبیورور)ە کە هەندێك لە بیرە سیاسییەکان لە میسری فیرعەونیدا شی دەکاتەوە و ناوی نووسەرە زانایەکەشی پێوەیە کە راپۆرتێکی لە بارەی ئەو گەندەڵیانەی کە وڵات تێی کەوتووە پێشکەش بە پاشا کردووە، کە لە قۆناغی داخوران و لە یەك هەڵوەشانەوەی سیاسی بووە لە دوا ساتەکانی بنەماڵەی شەشەمی کۆندا.

بەڵام ئەوەی زاندراوە حکومەتەکەی (مینا) پاشا زۆر رێك و پێك و بە تەمەن بووە، کاری بەڕێوەبردنی دەوڵەت لە بەرەبەیانی مەملەکەتی کۆنەوە کە ماوەکەی دەگاتە نزیکەی چوار سەدە، تاکەکانی کۆمەڵ بەهەموو جۆرەکانی پلەو پاییەکانیانەوە رێزێکی زۆریان لە پاشا دەگرت و لە ناویاندا شکۆمەند بوو[١٣٦].

گرنگترین شت کە کۆمەڵگەی سیاسی میسری کۆنی لەوانی تر پێ جیا دەکرێتەوە، نەبوونی بیرۆکەی دەوڵەتە وەك دەسنیشانکردنێکی یاسایی بۆ خەڵکەکە، بەڵکو کۆمەڵگەی سیاسی لەسەر خودی کەسایەتی پاشا خۆی بنیاد نرابوو، کە خۆی خاوەنی هەموو وڵاتەکە بوو لە زەوی و موڵك ماڵ و تەنانەت تاکەکانیش. دەسەڵاتەکان هەمووی، وەك بەڕێوەبردن و یاسادانان و دادوەری لە دەستی پاشا خۆیدا بوو. پاشا دەسەڵاتێکی رەهای هەبوو و بە هیچ یاسا و دەستوورێکەوە پەیوەست نەبوو، چونکە هەر خۆی یاسای دادەڕشت و چۆنی ئەو بیویستبایە بە هەوەسی خۆی گۆڕانکاری تێدا دەکرد[١٣٧].

---

١٣٦ - جیمس هێنری برستد (تاریخ مصر من اقدم العصور الی الفتح الفارسی) وەرگێڕانی د.حەسەن کەمال و پێداچوونەوەی محەمەد حەسەنەین ئەلغەمراوی،کتێبخانەی مەدبوولی ساڵی ١٩٩٠ لـ٤٩ـ.

١٣٧ - د. سەروەت بەدەوی (اصول الفكر السياسي والنظريات والمذاهب السياسية الكبرى) لە بڵاوکراوەکانی نەهزەی عەرەبی ساڵی ١٩٧٦ لـ٣٢ـ .

ئێمە ئەوە دەزانین، کە هەر لە سەرەتای سیستەمی پاشایەتیەوە لە میسری کۆندا، وەك خودا لە پاشایان دەڕوانی، ئەم خوایەتیەش وەنەبێ تەنها هەر بەناو بێ، یان تەنها بە شێوەییێکی رەمزی بێ، یان بڵێین نیشانەی ئەو دەسەڵاتە رەهاو پلەو پایە بەرزەی بێ کەهەییێتی، بەڵکو رێکا و ڕێك تەعبیری لە باوەڕێك دەکرد، کە لەلایان چەسپابوو و ئەمە یەکێك بوو لەو مۆرکە تایبەتیانەی، کە میسری فیرعەونی پێ جیا دەکرێتەوە، ئەم باوەڕەش لە دوای چەندین ساڵ گەشەکردن وپێشکەوتن، هیچی لە توانا و چالاکبوونی کەم نەکردبۆوە[138].

پاشا لە تیۆرە سیاسییەکانی میسردا وەك مرۆڤەکانی تر کەسایەتییێکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو هەر خۆی کوڕی خوا بوو، یان هەر بۆ خۆی خوا بوو، هەروەها دەبینین میسریە کۆنەکان وەك کەسایەتییێکی پیرۆز تەماشایان دەکرد، بۆیە هەمیشە خۆیان لە ناو هێنانی پاشا دەپاراست، ئەگەر بیانویستبایە ئاماژەی بۆ بکەن دەیانگوت (ئەو کەسە چاکەی کە دەیپەرستین)، بەڵام ئەگەر دەست و پێوەندەکانی پاشا بیانویستبایە ناوی بهێنن دەیانگوت (ئەو)، یان ئەگەر (کارئاسانی زیاتر بکەین) دەیانگوت: ئێڤستا واتە (بەڕێزیان) لە کارەکە ئاگادار دەکەینەوە، یان دەیانگوت (خوداوەند) یان (ئەو حۆریسەی) لە کۆشکدایە. خەڵکە سادەکە ئەوەندە بوێر نەبوون لەو بوونەوەرە نزیك بکەنەوە کە لە سەرووی ئادەمیزادەوە بوو، ئەگەر لێشی نزیك بکەوتایەنەوە یەکسەر ترس و دڵەڕاوکێ دایدەگرتن و کڕنۆشیان بۆی دەبرد[139].

کۆشکی پاشایەتی هەر خۆی بارەگای حکومەتیش بوو، بۆیە میسرییەکان وا راهاتبوون کە پێیان دەگوت (ماڵە گەورە) و دوای ئەوەش بەو کەسەشیان دەگوت کە لە خانووەکەدا دادەنیشت، واتە وشەی پاشا لە وشە و نازناوی (فیرعەون) وەرگیراوە و تا ئەو سەردەمەی ئێستاشمان ئەم ناوە هەر بە کار دێ[140].

---

١٣٨ - ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (الطاغية : دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي) چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبوولی ساڵی١٩٩٧ لــ٢٨ــ.

١٣٩ - هێرمان رانکە (مصر والحياة المصري القديمة) وەرگێڕانی عەبدولمونعیم ئەبوبەکر لــ١٥ ـــ و هەروەها،هـ. فرانکفۆرت (ماقبل الفلسفة) وەرگێرانی جەبر ئیبراهیم و پێداچوونەوەی د. محمود ئەلئەمین کتێبخانەی ئەلحیات ـ بەغدا ١٩٦٠ لــ ٩٢_ ٩٣ ـــ .

١٤٠ - بە زمانی میسری کۆن ئەسڵی وشەی (فیرعەون) واتە (پیرۆ -Pero) واتە مانای ـ ماڵە گەورە ـــ ماڵە شکۆمەندەکە ـ دەگەیێنێ، دوای ئەوە ئەو شوێنە گۆڕا و بووە جێگای بارەگای حکومەت، چونکە

میسریە کۆنەکان پاشایان بە خاوەنێکی ڕەهای خاکی میسر و ئەو خەڵکەی کە لە سەریدا دەژین دەزانی، چونکە ئەوە فەرمانی خوداوەند بوو کە هەموو خاکی میسر و هەرچی لەسەر رووی ئەو خاکەشە موڵکی پاشایە، کە دەڵێ:

((بە فەرمانی ئاتوون هەموو هەرێم و شارەکانمان پێشکەش بە حۆرس واتە (پاشا) کرد)).

بۆیە لێرەدا پاشا ئازادییێکی بێ سنووری دەبێ، کە چۆن چۆنی هەڵس وکەوتی لەگەڵدا بکات، کە بیخاتە سەر موڵك وماڵەکەی خۆی، یان بیبەخشێتە ئەو کەسەی کە خۆی دەیەوێ، یان کۆمەڵە کریکارێکی زۆر بێنێتە سەر زەوییەکان بۆ ئەوەی بۆ خۆیان کاری تێدا بکەن و بەرهەمیان هەبێ. شوێنەوارەکان ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە ئەو جوتیارانە لەژێر فەرمانی کارمەندانی کۆشکدا، یان فەرمانڕەوایانی هەرێمەکاندا کاریان کردووە، یان لە ژێر چاودێری خودی بنەماڵەی پاشایەتیدا کارەکانیان ئەنجام داوە. هەروەها خزمەتکردنی پاشاو، ئەو کەسانەی کە خوێنی پاشایەتی لە ناو لەشیاندا دەسووڕایەوە، لەلایەن دارودەستەو رەعیەتەوە بە یەکێك لە ئەرکە پیرۆزەکان دادەنرا[١٤١].

لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە فیرعەون کەسایەتییێکی پیرۆزی هەبووە: چونکە ئەو هێزو دەسەڵاتەکانی خۆی راستەوخۆ لە خواوە وەردەگرێ، یان ئەوەتا هەر بۆ خۆی خوا بوو. بە نازناوی (ر ع)، یان (حۆریس یان) بانگیان دەکرد، ئەمەش لە تیۆری دەسەڵاتدارێتیدا لەلای فیرعەونەکان چەند ئەنجامێکی لێکەوتەوە کە کاریگەرییێکی دوور و درێژی لە سەر ژیانی سیاسیدا هەبوو، کە گرنگترینیان ئەمانەن: ـ

---

دەسەڵاتە باڵا فیرعەونییەکان لە کۆشکی پاشادا گرد ببوونەوە، لەوە بە دواوە نازناوی فیرعەون لەو کەسە دەنرا کە لەو کۆشکەدا فەرمانڕەوایەتی دەکرد لە بەر ئەوەی پیتی (ر) لە زمانی عیبریدا نەبوو، بۆیە لە دەقە تەوراتییەکاندا گۆڕا بووە فارۆ Pharo، لە دوای ئەوەشدا ئیسرائیلییەکان گۆڕیان و کردیانە (فرعەون Pharaon) کتێبی (تشریعات حور محب) بخوێنەوە کە لە وەرگێڕانی د. ماهیر لەبیب و د. سۆفی ئەبوتالیبە. بڵاوکراوەکانی : دەستەی گشتی میسری بۆ کتێب ساڵی ١٩٧٢ پەراوێزی ژمارە ٢لـــ٢ـــ هەروەها برستید لەو کتێبەی کە پێشتر ناومان هێناوە لە لـــ٤٩ـــ بەراوردی بکە. هەروەها.

The Hutchinson Encyclopedia

١٤١ - د. محەمەد عەلی سەعدوڵڵا (تطور المثل العليا في مصر القديمة) دامەزراوەی گەنجانی زانکۆ لە ئەسکەندەریە ساڵی ١٩٨٩ لـــ٥١ـــ.

١ـ پشتگیریکردنی تەواوی دەسەڵاتەکانی فیرعەون، کە هەر خۆی دەسەڵاتدار و سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکانیشە لە دەوڵەتە یەکگرتووەکەیدا و فەرمانەکانی بە یاسا دادەنرێن و دەبێ جێبەجێ بکرێن و گوێڕایەڵی بن.

٢ ـ هەردوو دەسەڵاتی ئەم دونیا و ئەو دونیاشی لە دەستی خۆیدا کۆ کردبۆوە.

٣ ـ دەبووایە لە ماف و ئەرکەکاندا بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ هاوڵاتیاندا بکات.

٤ ـ جۆریکی نوێ لە خواپەرستی هاتبووە کایەوە، کە ئەویش پەرستنی فیرعەون بوو. ئەو دیاردەیەش مەترسییێکی زۆری دروست کردبوو، چونکە بواری بۆ کاهینەکان رەخساندبوو کە دەسەڵاتەکانی خۆیان زیاتر بکەن و چاودێری هەموو دام و دەزگا و بەرژەوەندییەکانیان دەکرد. بەمەش ئەو بە خوایەتیکردنە گوازرابۆوە نێو دام و دەزگاکانی حکومەت.

٥ ـ بیرۆکەی دەوڵەت لە میسری کۆندا لە وڵاتێکدا خۆی دەنوێنی کە (خواییێکی چاکی) لێیە کە ئەویش (پاشایە) لەگەڵ وەزیرەکان و راوێژکارەکانیدا بە یەکەوە شەونخونی دەکێشن بۆ ئەوەی چاودێری کاروبارەکانی وڵات و خەڵکی بکەن، چاودێری باوکێك بۆ منداڵەکەی، ئەو باوکەیە کە دارودەستەکەی رێزی زۆری لێ دەنێن و دوژمنەکانیشی لێی دەترسن و کاهینەکانیش ریزی بێ پایانی لێ دەنێن[١٤٢].

٦ ـ بەمشێوەیە سەرە داوە سیاسی و ئەخلاقی و ئاینییەکان هەر هەمووی دەکەوێتە دەستی پاشا، کە هەمووی بێ جیاوازی لە یەك یەکێتیدا کۆ دەبێتەوە. لە بواری سیاسیدا پاشا فەرمانڕەواییێکی رەهاو بێ سنوورە، هەر خۆشی لە چاودێریکردنی رێڕەسمە ئاینییەکاندا لە پێش هەموویاندایە و خۆشی بەشداری تێدا دەکات و سەرپەرشتی کارەکانیشی دەکات و سەرۆکایەتی کاهینەکان...وهتد دەکات.

٧ ـ یەکێك لە وەزیرە باڵاکانی فیرعەون دەڵێ: (جەنابی پایە بەرزیان لە هەموو ئەو شتانەی کە روودەدەن ئاگادارن و هیچ شتێك نییە لە دونیادا نەیزانێ خۆی (تووت)ە کە خوای هەموو حیکمەتەکانە و هیچ زانست و زانیارییێك نییە پاشا نەیزانێ[١٤٣].

---

١٤٢ - د. فەتحیە ئەلبەراری و محەمەد نەسر موهەننا (تطور الفكر السياسي في الاسلام ) توێژینەوەییێکی بەراوردکارانەیە ـ بەشی یەکەم، دارئەلمەعاریف ساڵی ١٩٨٢ لـ٢٧ـ.

١٤٣ - د.فرانکفۆرت (ماقبل الفلسفه) وەرگێڕانی جەبرا ئیبراهیم جەبرا و پێداچوونەوەی د.مەحموود ئەلئەمین، کتێبخانەی ئەلحەیات بەغدا ساڵی ١٩٦٠ لــ٩٥ ــ.

تاکەکانی دەورو پشتیشی پێی دەڵێن: {تۆ لە هەڵس وکەوت کارەکانتدا لە (رع) دەچیت. و دڵت هەر چییێکی بویَ دیَتە دی. ئەگەر لە شەودا پلانیَك دابنیَی بۆ بەیانی لە گەڵ رۆژهەڵاتدا هاتۆتە دی و ئەنجام دراوە، بە بیَ ئەوەی بیبینین یا بیبیستین چۆن چۆنی دەکریَ، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو شوێنەکاندا شتەکان دیَنە دی..}[144]، ئەمەش کاریَکە لە دەرەوەی تواناکانی مرۆڤدایە.

سەرەڕای  ئەوەی پاشا دەسەلاَت و پارەوپوول و هیَز و...هتد هەمووی لە دەست خۆیدا بوو، بەلاَم  بۆ جیَبەجیَکردنی ئەرکەکانی لە ناو  کۆمەڵگەدا پیَویستی بە دەزگاییَك هەبوو، کە  یارمەتی بدات، لەسەرەتادا کارە گرنگەکان بە کوڕەکانی پاشا سپیَردران و دوای ئەوە بە تاکەکانی بنەماڵەی پاشا سپیَردران. دوای ئەوە هەڵسا بە دانانی چەند پلەو پایەییَکی دیاریکراو کە لە هەموویان گرنگتر پلەی وەزیر بوو.

## دووەم: وەزیر: .

لەو سەردەمەدا وەزیر سەرۆکی حکومەت بوو، لەهەمانکاتیشدا داکۆکیکاری مافەکانی خەڵکیش بوو، بۆیە لە ریزبەندی پلەو پاییەکاندا لەدوای پلەی پاشادا دەهات، لەبەر ترسناکی ئەو پلەیە بۆ نموونە: پاشاکانی بنەماڵەی چوارەم ئەو پلەیەیان بە جیَگری پاشا دەسپارد و هەرچی نامەو نووسراوی رەسمی هەبوو، هەروەها نووسراوە تایبەتییەکانی پاشایەتی کە تایبەت بوون بە تۆمارکردنی زەوی و زارەکان و هەموو وەسیەتنامەکان دەدرایە وەزیر، نووسینگەی وەزیر بە (نووسینگەی تۆماری حکومەتەکانی ئیَستامان دەچوو. وەسیەتنامەییَکی تەواو دۆزراوەتەوە کە وەسیەتنامەی یەکیَك لە کوڕەکانی پاشاکانی بنەماڵەی چوارەمە، وەسیەتنامەییَکی تریش کە میَژووەکەی بۆ سەردەمی سەرەتاکانی بنەماڵەی پیَنجەم دەگەڕیَتەوە، کە هەردووکیان لەسەر دیواری گۆڕستانەکان هەڵکەندرابوون. زیاتر لە پیَنج هەزار ساڵ بە سەریاندا تیَپەڕیوە، بەلاَم ئەو دەقە ئەسڵییەی، کە لە (نووسینگەی تۆمارەکاندا)، تۆمار کرابوو ون ببوو. هەروەها چەندین وەسیەتنامەی تر هەن، کە  شوێنەوارەکان بۆمانیان پاراستووە بەلاَم بایەخیان لەوەی سەرەوە کەمترە. ئەمە وەك نەریتیَك  وابوو ئەگەر پاشا پارچە

---

١٤٤ - هەمان سەرچاوە.

زەوییێکی ببەخشیبایە یەکێك لە دارو دەستەکەی خۆی، لە ڕێو ڕەسمێکی شاهانەدا لە (نووسینگەی پاشایەتی) و لە دیوانی وەزیردا تۆمار دەکرا.

وەزیر لەهەر هەموو پیاوەکانی دەوروبەری پاشاکانی میسر بەرپرسیارێتی زیاتر بوو و خەڵکیشی زیاتر بوو، چونکە سەرۆکی راستەوخۆی هەموو کارەکانی فەرمانبەرانی دام و دەزگاکانی حکومەتی فیرعەونی بوو، لەکارگێڕو نووسەرەکان لە هەرە گەورەکەیانەوە تا هەرە بچووکەکەیان. هەروەها سەرپەرشتی چەندین کاروباری تایبەت بە دەوڵەتی دەکرد، سەرەرای ئەم هەموو شتانەش دەبووایە مەرجی ئەوەی تێدا بایە، کە تواناو شارەزاییێکی باشی لە بواری بیناسازیدا هەبێ، تەنانەت زۆر جار پێیان دەگوت (سەرۆکی کارەکانی پاشا).

لەبەرئەوەی دەسەڵاتەکان هەر هەمووی لە دەستی وەزیردا کۆببۆوە، زۆرجار میسرییەکان بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی خۆیان پەنایان دەبردە بەر وەزیر، چونکە تەنها ئەو دەیتوانی هاوسەنگییەکانی دادوەری و رەوایەتی رابگرێ. ئەمەش نابێتە جێگای سەرسوڕمان ئەگەر بڵێین وەزیر لە ناو خەڵکیدا لە هەر هەموو فەرمانبەرەکانی تری پاشا خۆشەویست تر بوو. لەوانەیە ئەو پیاوە ژیر و مەزنەیە کە لە سەردەمی (زوسر) پاشادا، پێیان دەگوت (ئەموحتەب) ئەو پلەو پایەیەی هەبووبێ کە (وەزیر)ە. (قاقمنە) و (بتاح حوتب) دوو فەیلەسووفی گەورە بوون کە مێژووەکەیان بۆ بنەماڵەی سێیەم دەگەڕێتەوە. خەڵکی بە درێژایی چەندین سەدە دوای سەردەمە کۆنەکانی پاشایەتی پەند و قسە نەستەقەکانی ئەوانیان دەماودەم دەگوتەوە ـ هەردووکیان پلەی وەزیریان هەبوو، چونکە میسرییەکان ڕێزێکی زۆریان لە وەزیر دەگرت و لەبەر چاویان شکۆمەند بوو، خەڵکی وا ڕاهاتبوون، کە زۆر جار ناوی وەزیریان بهێنایە لەگەڵ ناوهینانەکەدا (لە خودا دەپاڕانەوە لەشی ساغ بێت و تەندروستی باش بێت) هەروەها لەگەڵ ناو هێنانی (پاشا) و ئەندامانی ناو بنەماڵەی پاشایەتی ناوی وەزیریشیان دەهێنا.

## سێیەم: فەرمانڕەوایانی هەرێمەکان:

بۆ کار ئاسانیکردن و بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکانی حکومەت بگاتە هەموو بەشەکانی وڵاتی میسر، ئەو وڵاتەیان دابەشکردبووە سەر چەند هەرێمێکی بچووك بچووك، کە لە رووی هۆز گەرێتیەوە دەگەیشتە نزیکەی (٢٠) بیست هەرێم و لەو سەردەمانەی دواییشدا لە رووی دەریاییشەوە بە هەمانشێوە و ژمارە بوو.

زۆربەی راو بۆچوونەکان، دەڵێن: ئەم بەشانە لە پێش فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەکانیشدا هەر هەبووە و پاشماوەی ئەو میرنشینانە یان ئەو دەوڵەتە شارانە بووە، کە لەپاشاندا پاشایەتی میسری لێ دروست بووە. فەرمانڕەواکانی ئەو بەشانە یان ئەو هەرێمانە بە فەرمانی پاشایەتی دادەمەزران و نازناوی (جێگری پاشایان لێ دەنان و بەڕێوەبردن و دادوەری کردنی ئەو بەشانەیان پێ دەسپێردرا، هەروەها لەبەرئەوەی لە کێشەو ناکۆکییەکانی خەڵکیان دەڕوانی ناوبژیوانیان تێدا دەکرد نازناوی (دادوەریشیان) لێ نابوون.

شوێنەوارەکان ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە و دەردەخەن کە ئەنجومەنێك هەبووە لە (١٠) دە کەس لە (فەرمانڕەوا و پیاو ماقوڵانی هۆزەکان) کە بە (دە سەرۆکە پایە بەرزەکەی باشوور) ناونرابوون. ئەمانە لەپلەو پایە بەرزیدا ئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنە لەوانی تر جیا بوون، زیاتر وا مەزەندە دەکرێ کە ئەو ئەنجومەنە زۆر بە (لیژنەییێکی کارگێڕی تایبەت) دەچوو.

هەر فەرمانڕەوایێك کارگێڕییێکی بچووکی خۆی هەبوو، هەر بۆ خۆشی سەرۆکایەتی ئەو کارگێڕیەی دەکرد، ئەو کارگێڕیە لەو هەرێمەدا سەرپەرشتی کاروبارەکانی حکومەتی دەکرد وەك کاروباری دارایی و کارگێڕی و دادوەری، رووپێوکردنی زەوی وزار، هەروەها دروستکردنی پردەکان و جۆگە راکێشان، هەروەها رۆڵی پۆلیس و کۆمەك کردنی دەبینی. بۆیە هەر کارگێڕییێك پێویستی بە ژمارەییێکی زۆر لە نووسەر و کارمەند هەبوو، و رێژەییێکی زۆر تۆمار و لیستیان هەبوو. بەرێوەبردنی ئەو داراییەی کە بۆ کارگێڕی حکومەت دەهات، یەکێك بوو لە گرنگترین کاروبارەکانی ئەوان، چونکە ئەو کارگێڕیە بوو سەرپەرشتی باجی ساڵانەی دانەوێڵە و مەڕو ماڵات و پەلەوەر وکارە دەسکردەکان و چنینەکان و زۆر شتی تریشی دەکرد کە فەرمانڕەوای هەرێمەکان لە هاوڵاتیانیان وەردەگرت، بێگومان ئەو کات هێشتا پارەوپوول دەرنەکەوتبوو.

ئەوەی لای ئێمە گرنگە ئەوەیە کە دەبینین تاکە یاسای بەکارهاتوو لە سەرانسەری ئەو وڵاتەدا، تەنها و تەنها ویست و ئارەزووە رەهاکانی فیرعەون بوو، هەر لەسەر هەمان بەرنامەش وەزیر و فەرمانڕەواکانی هەرێمەکان فەرمانڕەوایەتیان دەکرد، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین کە پاشا خۆی لە ژێر فەرمانەکانی (مائات ـ Maat) ی خوای دادوەری و راستیدا کارەکانی فەرمانڕەوایەتی ئەنجام دەدا.. لێرەدا پاشا تەنها بە گوێڕایەڵی کردنی ویست و

ئارەزووەكانی ئەو خوایە[١٤٥] دەیتوانی وەك فەرمانڕەواییێك كارەكانی خۆی ئەنجام بدات. وشەی (مائات) لە زمانی میسری كۆندا بە مانای (ماف و دادپەروەری) دێ، هەروەها بە مانای (سیستەمی كۆن) یان (قەوارەی ڕەمەكی ئەخلاق)یش دێ ـ بێگومان ماف و بێخەوشییەكانی تریش بەشێكن لەو سیستەمە.

ئەوەی شایانی باسە دادوەری لە سەردەمە كۆنەكاندا لە شێوەی چەمكێكی ئەخلاقیدا بوو، تا ماوەییێكی دوورودرێژیش هەر بەمشێوەیە مایەوە، لەلای یۆنانییەكاندا دادوەری یەكێك بوو لەو چوار بێ خەوشیەی كە فەیلەسووفەكان لە سەری هاوڕا بوون، كە ئەمانە بوون، (حیكمەت، ئازایەتی، هێمنی و لەسەرخۆیی، دادوەری). ئەمەش مانای ئەوەیە كاتێك كە فێرعەون گوێڕایەڵی دادپەروەرییەكان دەبێ كەواتە گوێڕایەڵی پرەنسیپە ئەخلاقییەكان بووە. بەم شێوەیە دەبینین سیاسەت و ئەخلاق لە یەك چەمكدا دەگەنەوە یەك، هەر ئەمەش بوو بووە هۆكاری ئەوەی كە ئەفلاتون ئەم چەمكە لە كتێبەكەیدا بە ناوی (كۆمار) لە دوو لایەنەوە لێك بداتەوە:

لەلاییێك ئەخلاق مەبەستم دادپەروەریە لە رەفتارەكانی تاكدا لەلاییێكی تریشەوە مەبەستم سیاسەتە كە دادپەروەریە لە رێكخستنی دەوڵەتدا، هەر بۆیەش لەكۆندا دەیانگوت (فەرمانڕەوایەتی دادپەروەرانە، راستگۆییە لەگەڵ ویژدانی قازیەكەدا). بەمشێوەیە راستگۆیی دەبێتە دادپەروەری، چونكە ـ لە سەر هەڵوێست قەناعەتی ویژدان و سەرڕاستی رەفتارەكان، لە بنچینەدا پێوەرێكە تایبەت بە كەسەكە خۆی، یان تایبەتە بە پێوەندیە لاهوتییەكانەوە. وەك ئەوەی بەڕێز مەسیح دەڵێ:{من فەرمانڕەوایەتی دەكەم، فەرمانڕەوایەتیەكەشم دادپەروەرانەیە، چونكە من بە ویستی خۆم كار ناكەم، بەڵكو بە ویستی ئەو كەسە كار دەكەم كە منی ناردووە

---

١٤٥ - (مائات ـ Maat ) كچی خوای ڕۆژ (رع) بوو و پەڕی نەعامە نیشانەی ئەو خوایە بوو، بۆیە ئەو پەڕە لەسەر هەردووتای (تەرازووی دڵاندا) دادەنرا، دەقێكی كۆن هەیە دەڵێ (مائات، مەزنە، بەهێزە، و هیچ گۆڕانكارییێكی بە سەردا نایێت ). شوێنەوارە هونەرییەكان لە وێناكردنی ئەو خوایەدا پەڕێكی نەعامەیان لەسەر سەری دادەنا. (تۆ تێبینی ئەو بۆچوونە گشتیە بەربڵاوە بكە لە نێو میسریە كۆنەكاندا، تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ دەیلێنەوە: (ئایا پەڕی لەسەر سەرە؟)، واتە ئایا (مائات) ی خوای دادوەری و ماف و سزاو پاداشتەكانە). د.ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (معجم دیانات العلم والاساطیر) بەرگی دووەم، كتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە لــ٣٥٥ــ بخوێنەوەو بەراوردی بكە.

(ئینجیل یوحەننا ـ ئیسحاحی چوارەم:٢٤)}، کەواتە دادپەروەری مانای ویست و ئارەزووەکانی خوایە. ئەو لێرەدا دەیەوێ (فەرمانڕەوایەتیکردن بە ویست و ئارەزوەکان، یان بە هەواو هەوەسەکانی فەرمانڕەوا) نەبێ، یان لێی بە دوور بگرێ، بۆیە دەبێ دادپەروەری چەندی بکرێ لە میزاج و هەواو هەوەس بەدوور بگیرێ، ئەوەی راستی بێ ئەمە لەبەردەم خاوەن هەواو هەوەسەکاندا هەر دەمێنێ، تەنانەت لە فەرمانڕەوا دادپەروەرەکانیشدا هەر دەمێنێ و کراوەیە.

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە چەمکی دادپەروەری تەم و مژاوی پێوە دیارە، دەشگوترێ رێژەییە، بەو مانایەی کە دەوەستێتە سەر قوتابخانە جۆربەجۆرە فیکرییەکان و بەپێی بیرکردنەوەی ئەو بیرمەندە لە چوارچێوەی هەر قوتابخانەیێکدا دەگۆڕێ ، هەروەکو ئەوەی لە کۆمارەکەی ئەفلاتوندا هاتووە، کە لەبارەی چەمکی دادپەروەریە لەوێدا بەروونی دەردەکەوێ.

بەڵام ئەوەی لەلای ئێمە گرنگە ئەوەیە، کە چەمکی دادپەروەری، تا ئەو کاتەی دەبێتە کۆمەڵێك یاسا، بە چەمکێکی ئەخلاقی دەمێنێتەوە. لەبەرئەمەشە قازی، ـ هەرقازییێك بێ ـ ناتوانێ بڵێ من پڕ بە پێستی دادپەروەرییەکان بڕیارەکانی خۆم دەدەم، واتە بەپێی یاساکان دەڵێن: (لیرنید هاندی دادوەر) بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی (هۆڵمز)ی سەرۆکی دادگای باڵای گەیاندە بارەگای دادگا، لە رێگا داوای لێکرد کە بە شێوەییێکی دادپەروەرانە بڕیارەکانی خۆی بدات، ئەویش لە وەڵامدا وتی: ئەمەیان کاری من نییە، بەڵکو کاری من ئەوەیە، کە بەپێی بنەماکانی ئەو یاسایانەی کە داندراون کاری خۆم بکەم. دەتوانین هەمان شت لە بارەی چەمکەکانی (میانڕەوی) و (ئازایەتی) و (حیکمەت) و (خۆ دوورخستنەوە لە هەڵچوون) و (دان بەخۆدا گرتن) و...هتد، هەموو ئەمانە بە یەك چاو تەماشا بکرێن. ئەمانە هەر هەمووی چەمکی ئەخلاقین تا ئەو کاتەی دەگۆڕدرێن و دەکرێنە چەند یاساییێك و ماناکانی (یەکسانی)، یان (میانڕەوی)،...هتد دیاری دەکات هەر بەمشێوەیە دەمێنێتەوە. تا ئەو یاسایانە لە دادوەریش سەروەرتر بێ و ئەو دادوەرە پێیانەوە پابەندبێ، ئەو کارەش لە سەردەمە کۆنەکان ئاشنایەتیان لەگەڵێدا نەبوو، هەروەك لە بەشی داهاتوودا بۆتانی روون دەکەینەوە.

# بەشی دووەم

## (بیری سیاسی لە وڵاتی چیندا)

**((پێویستە فەرمانڕەوا بە ڕێزەوە فەرمانڕەوایەتی خەڵکی بکات ئەوانیش ڕێزی دەگرن و دەبێ سۆزی بۆیان هەبێ و بەزەیی پێیاندا بێتەوە تا ئەوانیش بۆی دڵسۆزبن و پیاو چاکان لە پێش ئەوانی ترەوە دابنێ و کەم تواناکان فێر بکات و دەبێ وریابن تا بێ خەوشی خۆیان بپارێزن ))**

**(کۆنفۆشیۆس)**

ئەگەر بێت لە میسرەوە بچینە وڵاتی چین، دەبینین پەیکەری ڕێکخستنی سیاسی لە چیندا هەمان ئەو پەیکەرە سیاسییە کە لە میسری کۆندا هەبووە، لەبەرئەوەی ئیمپراتۆری چینیش بە هەمانشێوە خۆی بە (خوا) دادەنا، یان ئەو هێزو دەسەڵاتەی کە هەیبوو لە خواوە وەریگرتبوو، هەندێك جاریش دەبینین خۆی بە (کوڕی خوا)، یان نوێنەری ئەو بوونەوەرەی کە لە ئاسمانە دادەنا، بۆیەش ئەو وڵاتەیان ناو لێ نابوو (تیان شان)، واتە لە لایەن ئاسمانەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرێ!.

لەوانەیە پرەنسیپە سیاسییەکانی لای (کۆنفۆشیۆس Confucius) رووناکی بخاتە سەر ئەو پەیکەرە سیاسیەی چین کە لە بنەڕەتدا پشت بە (ئەخلاق) دەبەستێ و تیایدا مافە سیاسییەکان ون دەبن و بوونیان نامێنێ و ئەرکەکانیش جێگەی مافەکان دەگرنەوە، کە دەڵێ: حکومەتێکی چاك دەتوانێ خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکی دەستەبەر بکات، خۆشی، واتە خێر نەك سوود یان بەرژەوەندی، چونکە لە کۆتاییدا مەبەستەکانی حکومەت ئەخلاقە، بەڵکو مامەڵەکانی نێوان خەڵکی دەبێ لەسەر پرەنسیپی گۆڕینەوەی مامەڵەکاندا بڕوا بەڕێوە، یان مامەڵەکردنی هاوشێوە لەگەڵ یەکتردا. ئەو پرەنسیپەش لەلای ئەو فەیلەسووفە دەڵێ: (تاك کارێك بەرامبەر بەوانیتر ئەنجام نەدا، کە ئەو کارە ئەگەر بەرامبەر بە خۆی بکرێ پێی ناخۆش بێ، یان وەك (کانت) کە ئەو گوتەیەی مەسیح دووبارە دەکاتەوە کە دەڵێ: ـ (وا مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە کە خۆت حەز دەکەی ئەو مامەڵێەت لەگەڵدا بکرێ)، بەڵام تەنها دان نان بەو پرەنسیپە ئەخلاقیانە گیرو گرفتەکانی خەڵکی چارەسەر ناکات، بەڵکو دەبێ خەڵکی بۆ ئەم کارە پەروەردەییێکی باش و رۆشنبیر بکرێن و رۆحی هاوکاری لە ناخیاندا بچێندرێ. هەر لێرەدا بە رای ئەو دەبێ تا رادەییێك فێرکردنێکی گشتی هەبێ. واتە (لەبەرکردنی پرەنسیپەکانی ئەخلاق)، سەرەڕای ئەوەش ئەو فەیلەسووفە چینییە حەزی نەدەکرد فەرمانڕەواکان بە ئاگر و ئاسن خەڵکی بەڕێوە ببەن، یان بەزۆرو توندوتیژی فەرمانڕەوایەتی بکەن، کاتێك کە داوا لەگەل دەکات رێز لە رژێمەکەی بگرن و ئیمزا لەسەر هەموو جۆرە سزادانەکان بکات بۆ ئەوەی ئەمن و ئاسایش بەر قەرار بکات. چونکە خەڵکی لەو حاڵەتەی یەکەمدا واتە(فەرمانڕەواییێکی توندوتیژ) خۆی لە سزادان دەپارێزێ، بەڵام رێزگرتن لە فەرمانڕەوا، یان لە ویست و ئارەزووەکانی ئەو، ئەمە شتێکە لە ناو هزری خەڵکیدا بوونی نامێنێ.

(بەڵام ئەگەر فەرمانڕەوا لە پێشەوایەتیکردنی خەڵکیدا ئەخلاق و کرداری چاك بێ و هەروەها پێشەنگێکی باش بێت و پشتی بەو داب و نەریتانە بەست کە لە ناو خەڵکیدا باون و ڕێزیان هەیە و بە پیرۆزی دادەنێن، لێرەدا خەڵکی بۆ ڕاستکردنەوە و چاکترکردنی حاڵی خۆیان بەبازنەییێکی بە هێز پەیوەست دەبن کە ئەویش بازنەییێکی پتەوی ئەخلاقە).

بەڵام (کۆنفۆشیۆس) حکومەتی گەندەڵ بۆ خۆدزینەوەی فەرمانڕەواکان لە پێکهینانی حکومەتێکی چاك دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئەوەش لەبەر نیاز پیسیانە، یان نەزانین و خۆپەرستیانە، یان لەبەر بێتواناییانە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەبێ ڕەگەزە بەتواناکانی نەتەوە لەڕووی زانست و ئەخلاقەوە دەفەی دەسەڵات بگرنە دەست لە وڵاتدا. ئەمە ئەو مەرجەیە کە خۆشگوزەرانی بە دی دەهێنێت و تواناکانی مرۆڤ هیچ پێوەندییێکی بە ئەسڵ و فەسڵ، یان دەوڵەمەندی و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیەوە نییە، بەڵکو بە ئەخلاق و مەعریفەو بڵاوکردنەوەی فێرکردن دەتواندرێ ئەمە بکرێ. لێرەدا (فێرکردن) سیفەتێکی تایبەت وەردەگرێ ئەویش بە مانای (پەروەردەی ئەخلاق) دێت.

لێرەدا ئەو پوختەیەمان بۆ دەردەکەوێ کە پرەنسیپەکانی دەسەڵات لەلای کۆنفۆشیۆس فەرمانڕەوایەتی کردنە لەڕێگەی خۆشەویستی و ڕێز گرتن و ئەخلاق و پێشەنگ و سوننەتی باش. وەکو دەبیبنین ئەمانە هەر هەمووی چەند چەمکێکی ئەخلاقین، تەنانەت ئاماژەییێکیش نابینی هەوڵێك درابێ بۆ گۆڕینی ئەو چەمکە ئەخلاقیانە و بۆ ئەوەی بکرێتە چەند یاساییێك، واتە گۆڕینی ئەخلاق بۆ سیاسەت!.

ئەگەر چی (مینشیۆس ـ Mencius) چەند هەنگاوێکی هاویشت کە لە (کۆنفۆشیۆس)ی مامۆستای پێشکەووتوانەتر بوو، بەڵام ئەخلاقی هەر بە پلەی یەکەم دادەنا. لەلای ئەو مرۆڤ هەر لە زگماکیەوە حەز بە کاری چاکە دەکات و لایەنە ڕۆشنەکەی مرۆڤ خۆی لە خۆشەویستی و دادپەروەری و سۆزو بەزەیی و پابەندبوون بە ڕاستییەکان و حیکمەت و لەشی دروست و دووركەوتنەوە لە خراپە [١٤٦]... هتد پێکهاتووە.

بەڵام بیرۆکە سیاسییەکانی مینشیۆس جیاوازییێکی زۆری لەگەڵ بیرۆکە چینییە کلاسیکییەکاندا هەبوو. بۆ نموونە ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕێکخستنە سیاسییەکان

---

١٤٦ - بۆ ئەمانە هەمووی تەماشای کتێبەکەی مامۆستا فوئاد شبل (حکمة الصین) بکە بەشی یەکەم دارلمەعاریف لــ٩٧ــ.

هەر لە بنچینەدا مەبەستیان سوود و قازانجەکانی گەل و کۆمەڵانی خەڵکە، نەك بۆ بەرژەوەندیی ئورۆستۆکرات و دەسەڵاتدارەکان بێ، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا پلەو پاییەکانی حکومەتی پاشای نموونەیی بەرز دەنرخاند ئەو سیستەمە سیاسیانەی کە هەندێك لە پاشاکانیان چاوی لە بەرژەوەندییەکانی گەل و کۆمەڵانی خەڵکە، وا لە کۆمەڵانی خەڵك دەکات کە بە ئارەزوو و خوایشتی خۆیان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن (چونکە گەل یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی دروست بوون و مانەوەی دەوڵەت..). بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا مینشیۆس داکۆکی لەوە دەکرد کە ئیمپراتۆر هەر بمێنێتەوە، هەروەها مانەوەی فەرمانڕەوا دەرەبەگەکان و فەرمانبەرە گەورەکان و چەندانی تریش لە دیاردەکانی ئیمپراتۆریەتی چینی پێ قبوولڵ بوو. ئەو هەرچەندە لە گەڵ زۆرێك لە بیرۆکە چینییە کۆنەکان هاوڕا بوو، بۆ نموونە کە هەندێکیان دەیانگوت ئیمپراتۆر بۆ هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی وڵات لەلایەن خوداوە دەسەڵاتی پێدراوە. هەروەها دەشیانگوت: ئەگەر هات و پاشا بە شێوەیێکی خراپ فەرمانڕەوایەتی کرد، یان زیانی بە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی گەیاند، ئەم دەسەڵات پێدانەی دەسوتێ، لەو حاڵەتەشدا دەتواندرێ لە سەر تەخت بهێندرێتە خوارەوە، بێ ئەوەی ئەم کارە بە دەرچوونێك لە داب و نەریت و ئاین، یان ئەخلاق بژمێردرێ! بەڵکو ئاسمان جامی تووڕەیی خۆی بەسەر ئەو فەرمانڕەوایە گەندەڵەدا دەڕێژێ و بەر لە هاتنی کاتی خۆی کەشەکە دەگۆڕێ، یان هەندێك نیشانە دەنێرێ وەك برووسك، ئەمەش نموونەیێکی تێکچوونی دیاردە سروشتییەکانە.

مینشیۆس تیۆری (فەرمانڕەواییێکی چاك) ی لە بیرۆکە میساللییەکان بۆ خۆی هەڵێنجا بوو کە لە فەلسەفەی چینیدا ببووە ئەوجەمسەرەی خەڵکی لە دەوری کۆ دەبوونەوە. گەیشتبووە ئەو رایەی کە بڵێ (سەرکەوتن بەری بێ خەوشییەکانە)، حکومەتی چاك، یان بێخەوش کۆسپەکان تەخت دەکات و نایهێڵێت و بارقورسییەکانی سەرپێچییە داراییەکان کەم دەکاتەوە و بەردەوامیش لە هەوڵی ئەوەدایە باجەکان لەسەر ئەستۆی خەڵکی کەم بکاتەوە. هەروەها لە سایەی ئەو هاندانەدا خەڵکیش رویان لە کێڵگەکانی خۆیان دەکردو دەیانکێڵا و دەیانچاند و لە گژوگیا زیانبەخشەکان بژاریان دەکرد. هەر بەهۆی ئەو هاندانەشەوە بوو لەش ساغەکان لەکاتی دەست بەتاڵبوونیاندا پرەنسیپەکانی چاکە و سەرڕاستی و راستگۆیی و ئەمانەتیان لە ناو دڵ و دەروونی خەڵکیدا دەچاند و بڵاو دەکردەوە. لە ماڵەوەشدا خزمەتی باوك و برا گەورەکانی خۆیان دەکرد و پەرۆشی ئەوەبوون کەلە دەرەوەدا گوێڕایەڵی سەرۆکەکانی خۆیان و

بە تەمەنەکان بن. ئەگەر ئەمەش پەیڕەو کرا، دەوڵەت بە هێز دەبێت و لە توانایدا دەبێ سەرسەختترین دوژمن راو بنێ، چونکە رۆحی مەعنەوی لەلای گەلدا لە هەموو چەکێکی تر بە هێز ترە.

دەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە لە قسەکانی (کۆنفۆشیۆس)، یان (مینشیۆس) دا هیچ ئاماژەییێك بە مافەکانی گەل یان هاولاتیان نەدراوە، بەڵکو تەنها ئەرکەکان بوونیان هەیە، لێرەدا گرنگ ئەخلاقە کە ئەوەندە فراوان دەبێ، تا ئەو رادەیەی کە چەمکەکانی سیاسەت قووت دەدا. ئەخلاقی چینی لە خێزانەوە دەست پێ دەکات، تەنانەت (گوێڕایەڵی منداڵەکانیش) یەکێکە لە رێنماییە بنچینەییەکانی کۆنتیشیە ـ مانای ئەوەیە خزمەتکردنی دایك و باوك، تا ئەوکاتەی لەژیاندا ماون ـ بە مەش پێنج پێوەندیەکەی کۆنفۆشیۆس تەواو دەبێ، کە ئەمانەن: پێوەندییەکانی فەرمانڕەوا لەگەڵ خەڵکیدا، پێوەندییەکانی کوڕ بە باوکەوە و پێوەندییەکانی برا گەورە بە برا بچووکەکەیەوە و پێوەندییەکانی مێرد بە ژنەکەیەوە و پێوەندییەکانی برادەر بە برادەرەکەیەوە، کە ئەمانە هەر هەموویان چەند پێوەندییێکی ئەخلاقین.

لە راستیدا ئەو پێوەندیانەی کۆنفۆشیۆس داینـاون و زۆریش دووپاتیان دەکاتەوە، بەڵکو لە کتێبی (چـۆـ کینگ – Shu King) وەری گرتووە، بەو پێیەی کە یەکێکە لە پێوەندیە بنچینەییە گەورەکان و نابێ بگۆڕدرێن کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- ئەرکەکانی نیوان ئیمپراتۆر و گەل.

٢- ئەرکە هاوبەشەکانی نێوان کوڕ و باوك.

٣- ئەرکە هاوبەشەکانی نێوان برا گەورەو برا بچووك.

٤- ئەرکە هاوبەشەکانی نێوان ژن و مێرد.

٥- ئەرکەهاوبەشەکانی نێوان برادەر و برادەر.

بەمشێوەیە بۆمان روون دەبێتەوە، کە ئەو بنەما توندەی کە کۆمەڵگەی چینی لەسەر بنیادنراوە ئەخلاقە، چونکە کۆمەڵگە لەسەر چەندین گوێڕایەڵی جۆراوجۆر بنیاد دەنرێ:

گوێڕایەڵی منداڵ بۆ باوکی، ژن بۆ مێردەکەی...و هتد، ئەگەر ئەو گوێڕایەڵیانەش نەبێ ئاژاوەو بێ سەروبەری دروست دەبێ[147]. حکومەتی چینی خۆی، لەسەر بنچینەی پیادەکردنی چاودێری باوکسالاری لەلایەن ئیمپراتۆرەوە دروست بووە، کە هەموو کاروبارەکانی دەوڵەت ڕێکدەخات[148].

ئەرکەکانی خێزان لەلای چینییە کۆنەکان لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە دەبێ پابەندبوونێکی ڕەهایان هەبێ کەبەپێی داب و نەریتەکان دەسنیشان دەکرێ و ڕێك دەخرێ بەم شێوەیەی خوارەوە: ـ

١- لەوکاتەی باوك دەچێتە ژووری کوڕەکەی، کوڕەکە نابێ هیچ بڵێ، بەڵکو دەبێ بە هێواشی لە جێگاکەی خۆی لابچێ و لەلای دەرگاکە بوەستێ و ناشبێ ژوورەکە بە جێ بێڵێ تا ڕوخسەت لە باوکی وەرنەگرێ.

٢- ئەگەر باوك بمرێ دەبێ کوڕەکەی بۆ ماوەی (٣)سێ ساڵ تازیەداربێ، دەبێ لەو ماوەیەدا گۆشت نەخوا و مەی نەخواتەوە و هەر کارێکی هەبێ دەبێ ڕایبگرێ تەنانەت ئەگەر کاری دەوڵەتیش بێ ناچارە دەبێ وازی لێ بێنێ.

٣- پێویستە کوڕەکان چەند ڕێز لە باوکیان دەگرن، ئەوەندەش ڕێز لە دایکیان بگرن. (لۆرد ماکارتنی Lord Macartney ـ١٧٣٧ ـ ١٨٠٦) کە دیبلۆماتێکی ئینگلیزی بوو لە چین کاری دەکرد، خۆی ئیمپراتۆری چینی دیبوو کە تەمەنی (٦٨) ساڵان بوو ڕۆژانە هەر هەموو بەیانییێك بە پێ دەچوو سەری لە دایکی دەدا وەك ڕێزگرتنێك بۆ دایکی.

٤- پیرۆزباییەکانی ساڵی نوێ پێشکەش بە دایکی ئیمپڕاتۆر دەکرێ، نابێ پێش ئەوەی ئیمپڕاتۆر ڕێز وگوێڕایەڵی خۆی پێشکەش بە دایکی بکات، پێشوازی لە گەورە پیاوانی کۆشك بکات بۆ ئەوەی ڕێز و گوێڕایەڵی خۆیان پێشکەش بە ئیمپڕاتۆر بکەن.

٥- دایکی ئیمپڕاتۆر وەك ڕاوێژکاری یەکەم دەبێ بۆ کوڕەکەی خۆی و ڕێ و ڕەسمەکانی تایبەت بە بنەماڵە هەر هەمووی بە ناوی دایکی ئیمپراتۆرەوە دەبێ.

---

١٤٧ - وۆڵ دیۆرانت (قصة الحضارة) بەشی چوارەم وەرگێڕانی محەمەد بەدران، لێژنەی دانان و وەرگێڕان و بلاوکرنەوە لـــ٦٠ــ.

١٤٨ - هەمان سەرچاوە.

٦- ئەو کردارە چاکانەی کە ئیمپڕاتۆر ئەنجامی دەدا، بە ناوی خۆیەوە ناکریٚ، بەڵکو بە ناوی باوکیەوە دەکریٚ. کاتێك کە سەرۆکی وەزیران داوای لە ئیمپڕاتۆر کرد نازناوی شەرەفی پیٚ ببەخشیٚ، ئیمپڕاتۆر مەرسوومێکی شاهانەی دەرکرد کە تیایدا هاتبوو:ـ

(ئەوکاتەی برسێتی وڵاتی گرتبۆوە، باوکت برنجی بە سەر برسییەکاندا دابەش دەکرد، ئای ئەمە کارێکی چەند خێرخوازانە بوو!.. لەو کاتەدا ئیمپڕاتۆریەتەکەمان لە سەر لێواری داڕووخان بوو، بەڵام باوکتان پارێزگاری لیٚ کردو ژیاندیەوە، بەم کارەشی ژیانی خۆی خستبووە مەترسییەوە. ئای کە دڵسۆز وگوێڕایەڵبوو!.. باوکتان کاروبارە کارگێڕییەکانی دەوڵەتی لە ئەستۆ گرتبوو و چەند یاسایێکی زۆر باشی داڕشتبوو و ئاشتی و ئارامییەکانی لەگەڵ تاکەکانی دەوروبەری خۆیدا پاراستبوو، هەروەها پشتگیریشی لە مافە کەسایەتییەکانی تاجدا کردووە: ئای کە ئەمە چ حیکمەتێکە!.. بۆیە نازناوی شەرەفی خێرخواز و دڵسۆز و حەکیمیان پیٚ دەبەخشین..).

لێرەدا دەبیٚ ئێمە چەند تێبینییێکی گرنگ بەدی بکەین، ئەویش ئەوەیە کە هەرچی ئەو کردارانەی کە دراوەتە پاڵ باوکەکە، کوڕەکە خۆی کردوویەتی، بەم شێوەیە باب و باپیران بە هۆی کوڕەکانیانەوە پلەو پایەی شەرەفیان پێی دەدریٚ. لە بەرامبەریشدا هەر باوکێك لەو هەڵە وکەموکوڕیانەی کە کوڕەکەی ئەنجامی دەدات بەر پرسیارە.

ئەوەی لێرەدا بە روونی هەستی پێدەکەین ئەوەیە کە لە ناو کۆمەڵگادا ئەخلاق وەك بنچینەیێکە تا ئەو رادەدەیەی کە دەتوانین بڵێین تەنانەت دەستی بە سەر لایەنە سیاسییەکانیشدا گرتووە، بۆیە هەندێك لە ئەرکەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەچن، بەڵام هیچ ئەرکێك لە سەرەوە بۆ خوارەوە نایێت. لەم سۆنگەیەوە بۆمان دەردەکەویٚ کە (وۆڵ دیۆرانت) لە بارەی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی لە کۆمەڵگەی چینیدا راستی گوتووە کە دەڵیٚ: (پێشەنگی باش یەکەم هۆکارەکانی فەرمانڕەوایەتی بووە، دوای ئەوە ئامۆژگاری پاشا دەکات و دەڵیٚ (پیاو چاکان و سەرڕاستەکان بەلای خۆتدا راکێشە وکەسانی خراپ و لادەر لە خۆت دوور بخەوە، بەمشێوەیە لادەرەکانیش راست دەبنەوە...![١٤٩] ئینجا بە شێوەییێکی گشتی ئامۆژگاری فەرمانڕەوا دەکات..(با تۆ نیازت چاکە کردن بیٚ، ئەو کاتە خەڵکەکەش چاك دەبن. پێوەندییەکانی نێوان سەرەوەو خوارەوە، وەك پێوەندییەکانی نێوان گژوگیا و شنەی بایە،

---

١٤٩ - وۆڵ دیورانت (قصة الحضارة ) بەشی چوارەم، وەرگێڕانی محەمەد بەدران لـــ٦١ـــ.

کاتێك کە شنەبای دیٚ گژوگیاییەکان لەگەڵ بایەکەدا دێنو دەچن.. ئەو کەسانەی کە بێخەوشی لە فەرمانڕەوایەتیەکەی خۆیاندا پیادە دەکەن تا رادەییێك بە ئەستێرەی قوتبی (النجم القطبي) دەچن کە ئەو لە جێگای خۆی ناجوولێ، بەڵام ئەستێرەکانی تر بە دەوریدا دەسووڕێنەوە...)[150]

بۆیە دەبینین (هیگڵ) زۆر بە روونی دەڵێ: (ئەگەر مافی ئەوەمان هەبێ لەو بارەیەوە قسەییێك بکەین، ئەگەر بێت و ئەو بنچینەی، کە خێزانی چینی لەسەر دروست دەبێ، بنچینەیێکی ئەخلاقی بێ، کەواتە هەمان بنچینەشە، کە دەستوور پشتی پێ دەبەستێ..)[151]. سەرەڕای ئەوەی ئیمپراتۆر مافی پاشایەتی هەیە و لە سەرووی بینای سیاسی دەوڵەتدا دادەنیشێ، بەڵام ئەو مافانە بە شێوەی رەفتارەکانی باوك لەگەڵ کوڕەکانیدا پیادە دەکات. ئەو خۆی باوکی هەموو خەڵکیە و هەرچی ئەو شتانەی شایانی رێزگرتنە بەوەوە بەستراوەتەوە، چونکە ئیمپراتۆر خۆی سەرۆکی هەموو کاروبارە ئاینی و زانستییەکانە[152].

ئەمەش شتێکی روونە کە ئەو گرنگی پێدانە باوکانەیە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە، مانای ئەوەیە کە ئیمپراتۆر وەك منداڵێکی تەمەن بچووك و پێنەگەیشتوو تەماشای خەڵکی دەکات کە ناتوانن لە پرەنسیپە ئەخلاقییەکانی ناو خێزان زیاتر هەنگاو بنێن و نە دەشتوانن ئازادییێکی سەربەخۆ بۆ خۆیان دەستە بەر بکەن، هەروەها ئەو دەتوانێ لەو هەمووەدا ئیمپڕاتۆریەتێك و حکومەتێك و رەفتارێك دروست بکات و دەبێتە گشتێکی واقعی، بەڵام بە رای هیگڵ نە خەیاڵێکی ئازادی و نە ئەقڵێکی ئازادی دەبێ[153].

لێرەدا دەبێ ئەوەمان پێ سەیر نەبێ ئەگەر ببینین کۆنفۆشیۆس لەو باوەڕەدا بێ کە یەکەم ئەو پرەنسیپەی کە فەرمانڕەوایەتی لە سەر بنیاد نراوە هەمان ئەو پرەنسیپە سەرەتاییانەیە کە ئەخلاقی لەسەر بنیاد نراوە، کە ئەویش دڵسۆزیە، لەبەر ئەمەیە کە کەرەستە سەرەتاییەکانی دەسەڵات وەکو گوتمان: پێشەنگی چاك و سەرکردەی چاکە: ئەمەش مانای

١٥٠ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

١٥١ - هیگڵ (العالم الشرقی) وەرگێڕانی ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام لــ٧٣ــ.

١٥٢ - هەمان سەرچاوە.

١٥٣ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

ئەوەیە کە فەرمانڕەوا دەبێ نموونەیێکی بەرزی هەڵس و کەوتی چاك و کاری باش بێ تا خەڵکانی تر چاوی لێ بکەن. بۆ ئەوەی بێخەوشی هەموو تاکەکانی گەل بگرێتەوە[١٥٤].

ڕێگەییێك بە دی ناکرێ بۆ ئەوەی هاوکاری چاك بە دەست بێنین، ئەگەر ئەخلاقی خودی فەرمانڕەوا خۆی چاك نەبێ! لەبەر ئەم هەموو هۆکارەیە دەبێ حکومەت ڕۆڵی کاریگەر بگێڕێ تاوەکو بتوانێ ئەخلاقی چاك و خەسڵەتی ماقووڵ لە ناخی تاکەکانی کۆمەڵدا بچێنێ، چونکە ئەگەر بێت و ئەخلاق گەندەڵ بێ ئەو نەتەوەیە هەر هەمووی لە گەڵیدا گەندەڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر هات و ئەو پرەنسیپە مەزنە تێکڕای کۆمەڵانی خەڵکی گرتەوە، بێ گومان هەر هەموو جیهان دەبێتە یەك ئیمپراتۆریەت، یان یەك تاکە دەوڵەت، خەڵکیش بە ئارەزووی خۆی خەڵکانی خاوەن بەهرە و ئەخلاق و بەتواناکان هەڵدەبژێرێ. ئەمەش دەبێتە هۆکاری بڵاوبوونەوە و شەکانەوەی ئالای ئاشتی سەرتاسەری.

ئەگەر ئەرکە بنچینەییەکەی دەوڵەت ئەوەبێ کە بێخەوشی و ئەخلاقی چاك لە ناخی تاکە ئاساییەکانی گەلدا بچێنێ، میری هەرێمەکان لە ژێر چاودێری ئیمپراتۆر خۆیدا لە ماوەیێکی کەمی ژیانیاندا تێدەگەن کە ئیمپراتۆر خۆی سەرۆك دەوڵەتە، بۆیە دەبێ وا دەرکەوێ کە ئەو لە هەموو بوارەکاندا هەر خۆی یەکەمە و لە هەموانیش باشترە، هەروەها دەبێ ئیمپراتۆر خۆی دەوڵەت ڕێك بخاتەوە و بە شێوەییێکی ڕاستەوخۆ کارەکانی یاسادانان بەسەر بکاتەوە و سەرەڕای ئەو هاوکاریەی کە میرەکانی هەرێمەکان پێشکەشی دەکەن، دەبێ کاروبارەکانی وڵاتەکەی بە سەر بکاتەوە و ئاراستەیان بکات.

---

١٥٤ - وۆڵ دیۆرانت سەرچاوەی پێشوو لـــ٦١ــ.

## دوا گوته:

له کۆتاییدا هەندێك خاڵی گرنگ هەن، که دەبێ ئێمە تێبینیان بکەین، وەك ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- ئێمە له مێژوودا نموونەییێکی ئەوتۆمان له بەر دەستدا نییە ئەوە بسەلمێنن که ئەو حکومەتانەی پرەنسیپە ئەخلاقیە نموونەییەکانیان بە کارهێناوە لە کارەکانیاندا سەرکەوتوو بوونە، یان نا.

٢- له حوکمڕانیکردندا دەبێ پشت بە یاساکان ببەستن، نەك بە ئارەزووەکانی فەرمانڕەوا، و دەبێ کۆمەڵانی خەڵکی فێربن گوێڕایەڵی یاساکان بن، نەك گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکان بن[١٥٥].

٣- پشت بەستن بەو شێوە سیستەمە ئەخلاقیەی دەسەڵات، که فەرمانڕەواکان دایدەڕێژن و ئەو چاکسازیانەی، که دڵی خەڵکی دەیەوێ، وڵات تووشی گەورەترین مەترسی دەکات.

---

١٥٥ - (هیگڵ) وای دەبینێ که زۆرداری له ڕێگەی ڕەتکردنەوەی تاکەکاندا تێکەڵ بە یەك دەکرێن، بەڵام ئەم زۆرداریەش تاکە کارێکی باشی هەیە ئەویش ئەوەیە که تاکەکان ڕێك دەخات و فێری گوێڕایەڵیان دەکات..چونکە گوێڕیەڵی کەسێك بۆ فەرمانڕەوا ڕێخۆشکەرە بۆ گوێڕایەڵبوون بۆ یاسا. ئەوەی که ڕوودەدا ئەوەیە که خەڵکی لەدەسەڵاتی زوڵم و زۆرداری هەڵدەگەڕێنەوە و لە ناوی دەبەن، چونکە زوڵم و زۆرداری ناخۆش و تاڵە و شتی لەو بابەتانە، بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەوەیە که زوڵم و زۆرداری ڕۆژگاری بە سەرچووە.
هیگڵ: (فلسفة الواقع في فترة يينا ) لـ٢٤٧ ـ ٢٤٨ـ . له (ماركيوز العقل والثورة) لـ ١٠١ـ، وەرگیراوە.

٤- ئەوەی راستی بێ شارستانییەتە کۆنەکان بە تەواوەتی ئەو بیرۆکەیەیان پشتگوێ خستبوو کە فەرمانڕەوا بچێتە ژێر باری چەند بنەماییێك کە لە خۆی بەرزترو بالاتر بێ، یان چەند سنوورێك بۆ دەسەلاتەکانی دابندرێ، چونکە وا تەماشای ئەو فەرمانڕەوایەیان دەکرد کە(خوا) یە، یان جێبەجێکاری فەرمانەکانی خوایە، ئەمەش چۆن دەکرێ سنوور بۆ تواناکانی، یان بۆ دەسەلاتەکەی دابندرێ..؟. بەمشێوەیە بۆ هیچ کەسێك نەبوو، کە مشتومڕی لەگەلّدا بکات، یان گومانی لە جۆری مافەکان، یان لە دەسەلاتەکانیدا هەبێ، بەلّکو دەرگاکانی بۆ خرابووە سەر پشت و بە ئارەزووی خۆی دەسەلاتە رەهاکانی خۆی پیادە دەکرد کە هیچ سنوورێکیان نەبوو. لە کاتێکدا خەلّکەکە لەهەموو مافەکانی بەرەو روو بوونەوەی ئەودا بێبەش بوون، بەلّکو پاشا، وەك لە میسری کۆندا دیمان، خۆی بە خاوەنی جگە لە خاکی ولاتەکەی، خۆی بە خاوەنی هەموو ئەوانەش دەزانی کە لەسەریدا بوون لە کەل و پەل و لە مرۆڤ. کەواتە هەرچی مولّك مالّ و مرۆڤەکانیش هەیە لە ژێر دەستی ئەودا بوون و چۆنی بویستبا وا مامەلّەی پێ دەکردن[١٥٦].

لەوانەیە ئەو تێکەلّبوونەی نێوان ئەخلاق و سیاسەت، لە شارستانییەتە کۆنەکاندا چەند لایەنێکی هۆکارەکانی ئەو دیاردەیەمان بۆ شی بکاتەوە، کە بە روونیش دەیبینین، ئەویش دەسەلاتە ستەمکارەکانە لەو کۆمەلّگایانەدا. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە فەرمانڕەواکان وەك باوك، یان وەك شوانی تاکەکان ئیعتیباری بۆ دەکرێ، ئەمەش یەکسەر وای لێدەکات ببێتە کەسێکی ستەمکار، دەسەلاتەکانی باوك، کە (جۆن لۆك) زۆر بە روونی بۆی چووە دەلّێ ـ دەسەلاتی باوك دەسەلاتێکی سیاسی نییە، بەلّکو بە پلەی یەکەم دەسەلاتێکی ئەخلاقیە ـ (بەو پێیەی کە باوك بە خێوکەرو سەپەرشتیاری مندالّەکەی خۆیەتی)، هەرکاتێکیش چاودێری بە سەریانەوە نەما دەسەلاتیشی بە سەریانەوە نامێنێ، کە لەم شتانەدا خۆی دەبینێتەوە: دابینکردنی خواردەمەنی، پەروەردەکردن و چاودێری کردنیان[١٥٧]، بۆیە دەبێ گوێڕایەلّی باوکیان

---

١٥٦ - د. سەروەت بەدەوی (النظم السیاسیة ) دار ئەلنەهزەلعەرەبیە سالّی ١٩٨٩ لـ١٥١ـ.

١٥٧ - شتێك نییە کە فەرمانڕەواکانی لای خۆمان لەوە قەدەغە بکات کە وا بیر بکەنەوە گوایە چۆن باوك نان دەداتە مندالّەکانی خۆی ئەویش نانی هەموو خەلّکی دەدا، کە بلّێ (من ئیسراحەت لە خۆم ناکەم هەتا هەر ٣٠ سی ملیۆنەکە لەم دەستانەم تێر نەخۆن ـ ئەمانە هەولاتیانی میسرن لە سەرەتاکانی سەردەمی جەمال عەبدولناسر ـ وەك بلّێی هەر تەنها خۆی رزقی خەلّکی دەدا و ژیانیان پێ دەبەخشێ و لەخۆی زیاتر

بن. له بەر ئەوەی باوكان بەها ئەخلاقییەكان له ناخی مندالّەكانیاندا دەچێنن، ئەگەر گوێڕایەڵی نەبن بە كارێكی بێ ئەخلاقی دەژمێردرێ. بەلاّم ئەوەی پێویستە دەبێ ئێمە ئەخلاق تێكەڵ بە سیاسەت نەكەین، وەكو گوتمان گوێڕایەڵیكردنی باوك كردارێكی ئەخلاقییە، جیاوازییێكی تەواوی لەگەڵ گوێڕایەڵیكردنی یاسادا هەیە، چونكە رێزگرتن له باوك خۆی له خۆیدا ئەركە، ئەو رێز گرتنەش تەنانەت دوای گەورەبوونی كوڕەكەش بۆ باوكی هەر بەردەوام دەبێ، بەڵكو وەك (جۆن لۆك) دەڵێ: (تەنانەت ئەگەر كوڕەكە ئەو پاشایەش بێ كە فەرمانڕەوایەتی دەكات)، بەلاّم ئەو ئەركە هیچ سنوورێك بۆ دەسەلاّتەكانی پاشا دانانێ، بەو مانایەی كە بۆ بەڕێوەبردنی كارو بارەكانی دەوڵەت پێویست ناكات (كوڕە پاشاكە) گوێڕایەڵی فەرمانەكانی دایك وباوكی بێ[١٥٨]. (جۆن لۆك) دوای ئەو هەموو شتە دەگاتە ئەو بۆچوونەی كە بڵێ: دەسەلاّتی سیاسی و دەسەلاّتی باوك هەر زۆر زۆر له یەكتر جیان و جیاوازییێكی زۆریشیان له نێواندا هەیە. تەنانەت هەموو پاشاكان ئەگەر دایك و باوكیان زیندووبن وله ژیاندا مابن به ئەرك وگوێڕایەڵی قەرزاریانن ـ لەمەدا هیچ جیاوازییەكی لەگەڵ نزمترین كەسانی دارو دەستەكەی خۆیدا نییە بەرامبەر بە دایك و باوكی، بێ ئەوەی ئەم كارە هیچ پلەیێك له پلەكانی ئەو دەسەلاّتە بگرێتەوە كە پاشا، یان فەرمانڕەوا بە سەر خەڵكیدا پیادەی دەكات[١٥٩].

---

كەسیتر ناتوانێ ئەوە بكات. هەر خۆشی رزق دەدات و وەری دەگرێتەوە و هەرچی هەیە له دەستی ئەو دایە!). (باشوات و سوبر باشوات ) د. حوسێن موئەنەس دارئەلزەهرا لیلئیعلام ئەلعەرەبی له قاهیرە ساڵی ١٩٨٤ لـ١٦١ـ.

158 - . John locke : Twotreatises of Government (Evrey Man`s Library 1988). P.149

159 - I bid

# (دەروازەی چوارەم)

## (تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت لە بیری یۆنانیدا)

**( ئێمە لای یۆنانییەکان بە شێوەی داڕشتە یاساییەکان.**
**باس لە سیاسەت ناکەین ... بەڵکو بە شیوەی فەلسەفە**
**ئەخلاقیەکەی باسی دەکەین ...)**

**(سێر ئارنیست پارکەر)**

## دەسپێك: .

ئەگەر لە بیرە رۆژهەڵاتیە كۆنەكانەوە بچینە سەر بیری یۆنانی، دەبینین تێكەڵبوونێكی تەواو لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا هەیە، گومانیشی تێدا نییە، كە یۆنانییەكان هەردەم زانستە سیاسییەكان لەسەر شێوازی زانستەكانی ئەخلاق دەخوێنن. (سێر ئارنێست باركەر - Sir Ernest Barker) دەڵێ: (ئەو بیرە سیاسیەی كە شارە یۆنانییەكان دەخاتە بەر لێكۆڵینەوەی خۆی، دەبێ بە جۆری ئەو بارودۆخە تایبەتیە كاریگەر بێ كە خەڵكەكەی تێیدا دەژیا، چونكە شار خۆی كۆمەڵگایەكی ئەخلاقی بوو، بۆیە لەو كاتەی كە یۆنانییەكان دەسیان دایە زانستە سیاسییەكان دەبووایە تایبەت بێ بەو كۆمەڵگایە، بۆیە ئەو زانستە بووە جۆرێكی تایبەت بە دەستیانەوە و بە شێوەییێكی حاشا هەڵنەگر بووە زانستێكی ئەخلاقی. ئەرستۆ وای دەدیت كە دەستوور خۆی دەوڵەتە.. ئەمەش شێوازی ژیانە.. یان رۆحێكی ئەخلاقیانەیە. لە راستیدا ئەمەش كاكڵەو مانا جەوهەریەكەییێتی، بۆیە ئەگەر هەر بیرمەندێك بابەتێكی دەوڵەتی هاتە بەر دەست، دەبێ بابەتەكە لە روانگەی ئەخلاقەوە وەربگرێ. نابێ بە شێوەی دارِشتە یاساییەكان باس لە زانستە سیاسییەكان بكات.. بەڵكو دەبێ لە سەر شێوازی فەلسەفە ئەخلاقییەكان باسیان بكات..)[١٦٠]. هەر لێرەوە ئەو پرسیارانەی لە بارەی لێكۆڵینەوە سیاسییەكان دەهاتنە گۆرِێ، لە راستیدا پرسیارگەلێكی ئەخلاقیانە بوون وەك: ئەو مەبەستانە چین كە دەوڵەت دەیانەوێ بیان هێنێتەدی؟ ئەو رێگایانە چین كە دەبێ بیانگریتە بەر بۆ ئەوەی ژیانێكی ئەخلاقیانەی بێ گیرو گرفت بژی؟ چۆن دەتوانی بگەیتە رۆحە راستەقینەكەی ئەخلاق؟ چۆن دەتوانین دەوڵەتێكی بێخەوش بهێنینە دی؟. ئەم لێكۆڵینەوانە بە دوای مافە سیاسییەكانی مرۆڤ واتە مافە شەرعییەكان، یان بە دوای دابەشكردنی باجەكان، یان دابەشكردنی دەسەڵاتەكاندا ناگەرِێ، چونكە لێكۆڵینەوەكانیان زیاتر لە بارەی كۆمەڵگایەكی ئەخلاقین نەك كۆمەڵگایەكی یاسایی، بۆیە دەبێ لەلایەنە هەمەجۆرەكانی ژیانی كۆمەڵگاییێكی ئەخلاقی بكۆڵێتەوە. واتە زانستی سیاسەت ـ لە تێروانینەكانی ئەو لێكۆڵینەوانەدا ـ تەواوی ئەخلاقەكانی كۆمەڵگاییێك لە خۆی دەگرێ و بۆ بە دیهێنانی مەبەستە ئەخلاقیە هاوبەشەكان یەك دەگرنەوە، هەر بۆیەشە دەبێ زانستی سیاسەت خێرو بەرەكەت بۆ ئەم كۆمەڵگایە بە دی بێنێ. بۆ

---

١٦٠ - ئارنیست باركەر (النظرية السياسيه عند اليونان) وەرگێرِانی لویس ئەسكەندەر و پێداچوونەوەی د.محەمەد سەلیم سالم، بەشی یەكەم. دامەزراوەی سجل لعەرەب لە قاهیرە ساڵی ١٩٦٦. لــ١٩ــ.

یەکەمجار یەکێك دەپرسێ خێرو بەرەکەت چییە؟ دوای ئەوە ئەو رێگەچارانە چین کە خێرو بەرەکەت بە باشترین شێوە بە دی دێنن؟ چی بکەین بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە ئەو خێرو بەرەکەتەمان دەستکەوێ..؟.

بۆ نموونە، بەمشێوەیە دەبینین ئەرستۆ، جیاوازییێکی ئەخلاقی لەنێوان زانستی ئەخلاق و زانستی سیاسەتدا نابینێ، ئەگەر بەم شێوەیە لێی تێ بگەین، کەواتە خێری تاك و خێری کۆمەڵ لە رووی نموونە باڵاکاندا یەك شتن و ئەو بێخەوشیەی کە تاکێك هەییێتی، بێخەوشی کۆمەڵگەشە، بۆیە ئەرستۆ وای دەبینێ کە زانستی سیاسی وەك زانستێك تەواوی کۆمەڵگەییێکی ئەخلاقی لە خۆی دەگرێ و هەوڵیش دەدا خێرو خۆشییێکی تەواو بە دی بێنێ، ئەگەر لە رێگەی کاری هاوبەشەوە نەبێ نایەتە دی، ئەمەش لە باڵاترین شێوەکانیدا زانستێکی ئەخلاقیە، زانستێکە لە هەموو ئەرکەکانی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، ئەرکەکانی مرۆڤ لە ماڵەوە و تەواوکردنی کار و پێوەندییەکانێتی، ئەرستۆ بیرۆکەییێکی ئەوتۆی لە بارەی زانستەکانی ئەخلاق وەك زانستێکی سەربەخۆ لە لا نەبووە[١٦١].

ئەو وتەیەی کە دەڵێ: ئەرستۆ لە پاڵ کتێبەکەیدا کە لە بارەی (سیاسەت) نووسیوییێتی، لە کتێبە ناسراوەکەیدا بە ناونیشانی (ئەخلاقی نیقۆماخۆس) لێکۆڵینەوەییێکی تایبەتی لە بارەی ئەخلاق نووسیووە. ئەمە گوتەکەی ئێمە رەت ناکاتەوە و مانای ئەوەش نییە کە جێگاییێکی تایبەت و جیاوازی بۆ زانستی سیاسەت دانابێ، بەڵکو ئەوەی ئەو مەبەستێتی جیاکردنەوەی (بێخەوشیە)، وەك حاڵەتێکی سایکۆلۆژی کە لە ناخی تاکدا هەیە و (بێخەوشی)ش وەك هێزێکی بزوێنەری مرۆڤ لە ناو کۆمەڵگادایە. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە ئەرستۆ لەو باوەڕەدایە کە یەکێتییێك لەنێوان زانستی سیاسەت و فەلسەفەی ئەخلاقدا هەیە، چونکە یاسا ئەخلاقیەکەی دەوڵەت هەر خۆی یاسایە، یان مافە، یان راستییەکانە. هەروەها ئەو هیچ جیاوازییێك لە نێوان تیۆری یاسای مەدەنی و تیۆری یاسای ئەخلاقیدا نابینێ. بەو پێیەش زانستی سیاسەت دەبێتە شتێکی سێ لایەنە: کە تیۆری دەوڵەتە، هەروەها تیۆری ئەخلاقیشە، سێیەمیشیان تیۆری یاسایە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە لەو کاتەوەی لێی داماڵێندراوە، دوو بابەت لە خۆی دەگرێ، هەر یەکەیان لە بوارێکی تایبەت بە خۆیدا کار بکات [١٦٢].

---

١٦١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٢٠ـ.

١٦٢ - هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە بیری سیاسی لە یۆناندا جیاوازییێکی زۆر گەورەی لەگەڵ بیری سیاسی نوێدا هەیە و ئەو گوتەیەی کە دەڵێ: دەوڵەت دەزگاییێکی ئەخلاقیە، بۆ بە دیهێنانی بێخەوشییەکان هەوڵ دەدا، کە جۆریك لە پێوەندی نێوان تاك و دەوڵەت لە خۆی دەگرێ و جیاوازییێکی زۆری لەگەڵ ئەو بیرۆکانەدا هەیە کە لە سەردەمی ئێستاماندا باون. لە بیری سیاسی یۆنانیدا بیرۆکە سەربەخۆکانی تاك بە روونی دەر ناکەوێ و نادیارن[١٦٣]. هەروەها بیرۆکەی مافە سیاسییەکانی تاك لەلای ئەواندا زۆر کەم دەردەکەوێ. لەوانەیە هۆکارە راستەقینەکەشی ئەوە بێ کە تاکەکان لەناو ژیانی بە کۆمەڵدا هەست بە بەهاو پلەو پاییەکانی خۆیان ناکەن. لەبەر ئەمەش بوو هەوڵی ئەوەی نەدەدا مافەکانی خۆی لە بەرامبەر ئەو کۆمەڵەیەدا بسەلمێنێ، لەبەر ئەوەی بەها کۆمەڵایەتییەکان دڵنیاییێکیان پێ دەبەخشی، بۆیە پێویستی بەوە نەدەکرد  کە گرنگی بە خۆی بدات. لێرەدا بە پشت بەستن بە روانگە ئەخلاقییەکان، بۆ ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ: دەوڵەت دەزگاییێکی ئەخلاقیە ـ لە روانگەی بیری نوێدا ئەوەمان بە دەستەوە دەدا کە بیری یۆنانی هەماهەنگییێکی هاوسەنگی تێدایە، چونکە لە رووی ئامانجە ئەخلاقییەکاندا، تاك و دەوڵەت  یەك شتن، بە رادەییێك کە دەوڵەت دەبووایە هەندێك لە دەسەڵاتەکانی خۆی بە کار بێنێ کە لەلای ئێمە نامۆیە. بە نیسبەتی ئەفلاتون و ئەرستۆش هەردووکیان وەك یەك، لایان وایە کە دەوڵەت کاری ئەوەیە خێرو خۆشی زیاتر بکات و خاڵی دەستپێکردنیش لە لای هەردووکیاندا هەمووە، واتە (گشت)ە، ئینجا دوای ئەوە بە دوای رێگە چارەییێکدا دەگەڕێن کە ژیان و ئامانجەکانی ئەو گشتە بەسەر تاکدا بسەپێنن[١٦٤]. بەڵام بیری نوێ وای دەبینی کە کاری دەوڵەت نەرێنییە و ئێمە لەتاکەوە دەست پێ دەکەین و باوەڕیشمان وایە کە چەند مافێکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە (لە زۆربەی کاتەکاندا چاوەڕێی ئەوە ناکات کە کۆمەڵگە دانی پێدا بنێ) و داوا لە دەوڵەت دەکات و چاوەڕوانی ئەوەشی لێدەکات کە مافەکانی بۆ دەستەبەر بکات، بەم شێوەیەش نەش و نما کردن

---

١٦٣ - بۆ نموونە ئەرستۆ دەڵێ (دەبێ ئێمە وا هەست نەکەین کە هەر تاکێك لە تاکەکان سەر بە خودی خۆیەتی، چونکە تاکەکان هەر هەموویان سەر بە دەوڵەتن ) (السیاسة) ی ئەرستۆ ١٣٣٧ أ ـ٢٩/٢٨، بەراورد بکە.

١٦٤ - لەگەڵ وتەکانی بێرکلێزدا بەراوردیان بکە کە لە وتارە ماتەمینییەکەیدا دەڵێ (کەس شاری بۆ دانیشتوانی ئەسینا دروست نەکردووە، بەڵکو ئەسینییەکان خۆیان شاریان دروست کرد ).

و گەشەکردنە خۆڕسکەکانی تاك بە شێوەییێکی سروشتی دێنە دی، بۆیە وا باشترە بۆ مرۆڤ کە نیوەی ئەو چاکانەی کە ئەنجامی دەدا لە ناخیەوە هەڵقولابێ، نەك ئەو چاکانەی کە دەیکا لە ئەنجامی ناچارکردنییەوە بێ لەلایەن هێزێکی دەرەکیەوە، بەڵام یۆنانییەکان لە شتێکی کەم زیاتر بەولاوە شتێکی ئەوتۆیان لەو گرنگی پێدانانە لەلا نەبوو. زۆر بە کەمی بیریان لە تیۆری مافەکان دەکردەوە. تەنانەت ئەفلاتون ئامادەیی ئەوەی تیدابوو و ئەو مافانە هەڵبوەشێنیتەوە. بۆ نموونە: ئەو کاتەی رەزامەندی خۆی لەسەر رەتکردنەوەی مافی ژیان نیشاندا و رێگەیدا نەخۆش و پەککەوتەکان، ئەوانەی چاك نابنەوە وا باشترە بکوژرێن...هتد. لە (شارە بێخەوشەکەیدا) مافی موڵکدارێتی بۆ چینی پاسەوانان و...هتد رەتکردۆتەوە و بە شێوەییێك لە شێوەکان ئەرستۆ پشتگیری لە کێشەی کۆیلایەتی کردووە لە تیۆرێکدا بە شتێکی باشی دادەنێ و مافی ئازادییەکانی لەلای تاکدا و...هتد رەتکردۆتەوە.

# بەشی یەکەم

# (ئەفلاتون........)

**(( ئەوەی راستی بۆ دادوەری .. پەیوەست نییە بە ئاکارە دەرەکییەکانی مرۆڤەوە، بەڵکو پەیوەستە بەو کردارانەی کە لە ناخییەوە هەڵدەقوڵێن و ئەوەی خوی پێوە گرتووە و لە توانای دایە بیکات ...))**

**((ئەفلاتون ـ کۆمار ـ ٤٤٣ ))**

## دەستپێك: .

لە بیری یۆنانی کۆندا، یەکەم کەس کە باسی ئەخلاق و سیاسەتیان کردبێ سۆفستاییەکان بوون. ئالوودەبوون و وابەستەبوون بە سیستەمی دەوڵەتا شارەوە و ئەو سیستەمانەی ئەو دەوڵەتەی بەڕێوەدەبرد ـ وابەستەبوونێکی گشتی بوو، بێ ئەوەی خەڵکی ڕەتی بکەنەوە یان گفتوگۆ لە بارەیەوە بکەن لە سێبەری ئەو داب و نەریتە کۆنانەدا لە دایك دەبوون و دەژیان، کە کەس نازانێ ئەو داب و نەریتە لەکوێوە هاتبوو، بەڵکو هەستێکی شاراوە هەبوو کە دەیگوت لە ئاسمانەوە دابەزیوە ـ ئەوان لەو باوەڕە دابوون کە ئەمانە چەند نەریتێکی جەوهەری و نەگۆڕن، چونکە ئەوکات هێشتا هیچ یاساییێك بۆ خەڵکی دانەڕێژرابوو، ئەو داب و نەریتانەش کە جێگرەوەی یاسا بوون بەس بوون بۆ ئەوەی ژیانی ڕۆژانەی خۆیانیان پێ بە سەر بەرن. ئینجا (پرۆتاگوراس ـ ٥٠٠ ـ ٤٣٠ پ.ز)ی پێشەوای سۆفستاییەکان دەرکەوت کە لە (ئەبدێرا)وە بۆ (ئەسینا) هاتبوو، ئەو پیاوە فەیلەسووفێکی سیاسی پلە یەك بوو. ئەو بنەما ترسناکەی خۆی داڕشتبوو کە دەڵێ: (بە پێی دەسنیشان کردنی هەر تاکێك خۆی مرۆڤ پێوەری هەموو شتەکانە، چ ئەو شتانەی کە هەیە و چ ئەوشتانەی کە نیشە). ئەمەش بنەماییێکی ترسناك بوو، چونکە تەعبیر لە بیرو بۆچوونی (تاکایەتییێکی توندڕەو) دەکات بە تایبەتی ئەگەر ئەمە لەبواری ئەخلاقدا جێبەجێ بکرێ، لەبەر ئەوەی بەهای شتەکان بە پێی دیدی هەر مرۆڤێك دەگۆڕێ و جیاوازدەبێ. ئەگەر بێت و ئێمە ئەو فەلسەفەیەمان وەرگێڕایە سەر بازنەکانی ئەخلاق، ئەوە بە ڕوونی دەردەکەوێ کە ئێمە بە تیۆرێکی یەك لایەنە باسی ئەخلاق دەکەین، ئەمەش بە تەواوەتی دەیڕووخێنێ. بەڵام بە پێی سیاسەت ئەم بۆچوونە وا لە تاك دەکات کە پێوەر و بنەماییێك بێ بۆ ئەو شتانەی کە ڕاستن. سۆفستاییەکان ڕایان وا بوو کە هەموو ئەو یاسایانەی پێچەوانەی ئەو بیروڕایەن، لەوە تێناپەڕن، کە چەند شتێك بن هونەرو دابەکان بەرهەمی هێنابن. ئەمە شتێکی پڕوپووچ و بێ بەهایە کە مرۆڤ لە ژیانی خۆیدا بە جێبەجێ کردنی چەند یاساییێك، کەهیچ بەڵگەییێکی سروشتی نییە، ببێتە کۆیلەی کەسێکی تر، هەروەها خەڵکی هەر هەمووی مافی ئەوەی هەیە کە ئەو شتانەی دەتوانێ لە ڕێگەی هێزەوە دەستی بە سەردا بگرێ چێژی لێ وەربگرێ.

هەندێك لە سۆفستاییەكانی، وەك: (ئەنتیفۆن) رەخنەیان لەو یاسایانە دەگرت كە دەوڵەت پشتی پێ دەبەستێ بەو پێیەی كە ئەمە كێشەییێكی را دەربڕینە، یان دابە، یان داب و نەریتە، هەروەها بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە ئەو جیاوازیانەی لەنێوان یۆنانییەكان و هەمەجییەكاندا (یان بەربەرییەكان ـ واتە سەر بە نەتەوەكانی تر)دا هەیە هەڵبگیرێ و نەمێنێ. وەك ئەو گوتەیەی كە دەڵێ: هەردووكیان ـ وەك یەك ـ بەشداری لە (یەك سروشتدا) دەكەن، ئەویش ئەو سروشتە هاوبەشەیە كە لە نێوان هەموو خەڵكیدا هەیە.

هەر بۆیەش (هیگڵ) وای بۆ دەچێ كە سۆفستاییەكان لەلای یۆنانییەكاندا چەند فەیلەسووفێكی رووناكی بەخشن و لە مێژووی رۆحی یۆنانیدا بە چركە ساتێكی گرنگی دانان: بەم شێوەیە كاتێك روونی كردەوە كە ئەم فەلسەفەیە چركە ساتێكی گرنگ و پێویست بوو، بۆ گەشە پێدانی رۆحی یۆنانییەكان بەرەو هەستكردن بە خودی خۆیان، كە هەستكردنێكی كامڵ و تەواو بێ دەبوایە هەر رووبدات، ئەو هەستە لەلای ئەفلاتون و ئەرستۆدا گەیشتبووە ئەو پەڕی، كەواتە دیاردەییێكی لاوەكی نەبوو، یان لە دەرەوەی گەشەكرنەكەدا هاتبێ، ئەو لە ناوەڕاستی گەشە رۆحیەكەی یۆنانییەكانی دانان، كە ئەمەش جێگاییێكی چاك و دروست بوو بۆیان.

* * *

**ئەفلاتون: ـ**

**دادپەروەری لەنێوان ئەخلاق و یاسادا: ـ**

هەندێك لە لێكۆڵەرەوەكان وای بۆ دەچن كە (كۆمار)ی ئەفلاتون، هەر چەندە باس لە پێكەوەنانی (شارێكی بێ خەوش) دەكات، بەڵام خۆی لە بنەڕەتدا گفتوگۆییێكی ئەخلاقیە ((چونكە لەلای ئەفلاتون ئەخلاق و سیاسەت لە یەكتر جیا نابنەوە..))[١٦٥].

چونكە ئەمە ئەو شارە بێ خەوشەیە كە هەر چوار بێخەوشیەكەی تری تێدا دێتە دی وەك: حیكمەت و ئازایەتی و خۆپاراستن لەشتە حەرامەكان و بوونی دادپەروەری، ئەمانەش چۆن دێنە دی؟ ئەو كاتە دێنە دی، كە فەرمانڕەوا فەیلەسووفەكان كە خۆیان كەسانێكی حەكیمن، دەسەڵات دەگرنە دەست، ئەوكاتە شارەكەش حەكیم دەبێ ـ هەروەها كاتێك كە سوپاییێكی بە هێزو پێشڕەوی هەبێ ئەو شارەش بێخەوشی و ئازایەتی بە دی دێنێ، و هەركاتێكیش، كە خەڵكەكەی هێمن و لەسەرخۆ بوون ئەویش هێمن دەبێ و لە كۆتاییشدا ئەو كاتەی، كە هەر هاوڵاتییێك بە كاری تایبەتی خۆی هەڵبستێ، یان ئەو كارەی كە بەپێی هێزو تواناكانی خۆی دەتوانێ پێی هەڵبستێ، بە كورتیەكەی هەر كاتێك پیاوی گونجاو لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دانرا، شارەكەش دادپەروەر دەبێ، یان دادپەروەری تێدا باڵادەست دەبێ.

ئەفلاتون دەپرسێ و دەڵێ: پیاوی چاك كێیە؟ بە چ رێگاییێك دەتوانی بگەیتە لای؟[١٦٦]وا پێدەچێ كە ئەو پرسیارە بچێتە ناو خانەی ئەخلاقەوە و لە ئەخلاق زیاتر پێوەندی بە هیچ شتێكی ترەوە نەبێ. بەڵام لە دیدی یۆنانییەكاندا پیاوی چاك دەبێ یەكێك بێ لە ئەندامەكانی دەوڵەت و لە رێگەی ئەو ئەندامبوونەوە نەبێ ناتوانێ چاك بێ. لێرەدا لە ناو پرسیاری یەكەمماندا پرسیارێكی تری مەنتقی خۆی قوت دەكاتەوە كە دەڵێ: دەوڵەتی چاك چییە؟ و ئەو

---

١٦٥ - د. ئەحمەد فوئاد ئەلئەهوانی (افلاطون) دارلمەعاریف لە میسر ساڵی ١٩٦٥ (سلسلة نوابغ الفكر العربي) ژمارە (٥) لــ١٣٤ــ.

١٦٦ - ئەفلاتون (الجمهورية) لــ٤٢٨ ـ ٤٢٩ ــ.

دەوڵەتە بە کامە ڕێگە دێتە دی؟ بەمشێوەیە فەلسەفە ئەخلاقییەکان بەرز دەبێتەوە و دەگاتە ئاستی بواری زانستی سیاسەت.

دەوڵەت لە دیدی ئەفلاتوندا نموونەییێکی گەورەکراوەی تاکە، واتە سیاسەت تەنها نموونەییێکە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە دەبێ ئەخلاق چۆن بێ. ئەگەر سیاسەت ئەو هۆکارە بنچینەییە بێت کە هانی ئەفلاتونی دا بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکانی خۆی بە هۆی گەندەڵییەکانی شار و ئەو رق و کینانەی کە هەیبوو بەرامبەر سیستەمی دەسەڵاتی ئەو وڵاتەی کە تێیدا دەژیا بکات. ئامانجەکانی ئەو تەنها چاککردنی ئەخلاقی خەڵکی بوو. تەماشای کرد کە ئەخلاق زۆر لەوە قووڵترە کە تەنها کارێکی چاك بێ، ئەمەش وای لێکرد کە لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە بارەی سروشتە دەروونییەکانی ئادەمیزاد ئەنجام بدات، بەڵام دەوڵەت خۆی هەمان ئەو دەروونەیە، لە شێوەییێکی گەورەتردا. ئەمە بوو وای لە ئەفلاتون کرد کە بابەتە دادپەروەرییەکانی ناو دەوڵەت لێکبداتەوە بۆ ئەوەی ڕووناکی بخاتە سەر دادپەروەرییەکانی تاك. ئەفلاتون دەڵێ: ـ

(داوایان لە کەسێکی چاو کز ـ کورتبین ـ کرد کە هەندێك پیتی بچووك لە دوورەوە بخوێنێتەوە، دوای ئەوە یەکێکی تر ئاگاداری کردەوە کە دەکرێ لە شوێنێکی تردا بگەیتە هەمان ئەو پیتانە و بە شێوەیێکی گەورەتریش، بێ گومان ئەمەش دەبێتە هەلێکی چاك بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو پیتە گەورانە بخوێنێتەوە و دوای ئەوەش بێتەوە سەر پیتە بچووکەکان تا بزانێ ئایا وەك یەکن یان نا..و ئەو دادپەروەریەی ئێستا باسی دەکەین، ئەگەر لە تاکدا بوونی هەبێ بەو پێیەی کە یەکێك بێت لە بێخەوشییەکانی ئەو، کەواتە لە دەوڵەتیشدا بوونی دەبێت.چونکە لە وێنە گەورەکەی دادپەروەریدا ئاسانتر هەستی پێ دەکەین، بۆیە من پێشنیازی ئەوە دەکەم کە ئێمە بە دوای سروشتی ئەو دادپەروەریەدا بگەڕێین کە لە دەوڵەتدا دەردەکەوێ، ئینجا دوای ئەوە لە تاکدا بۆی بگەڕێین بەم شێوەیە لە گەورەوە بۆ بچووك بچین و بەراورد لە نێوان هەردووکیاندا بکەین..)[١٦٧].

تۆ تێبینی ئەوە بکە ئەمەیان ئەوە دەگەیێنێ کە ئەخلاق پەیوەستە بە ڕەفتارەکانی تاکەوە و سیاسەتیش پەیوەستە بە ڕەفتارەکانی کۆمەڵ ـ لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین ئەفلاتون هەردووکیان لە یەك وشەدا کۆ دەکاتەوە کە ئەویش (دادپەروەریە). ئەگەر لە بواری یەکەمدا

١٦٧ - ئەفلاتون (الجمهورية ) ١٩٦٨ وەرگێڕانی د. فوئاد زەکەریا لـــ٢١١ــ.

بە دی بێ کەواتە ئەو تاکە دەبێتە تاکێکی (بێ خەوش) و ئەگەر لە بواری دووەمیشدا بە دی هات ئەوە دەبێتە دەوڵەتێکی (بێخەوش).

ئەفلاتون لە دەسپێکی کۆمارەکەیدا ئەو پرسیارە دەکات: دادپەروەری چیە؟ دەبێ ئێمە ئاگاداری ئەوە بین کە بەکارهێنانی وشەی (دادپەروەری) لەلایەن ئەفلاتونەوە مەبەستی مانا یاساییەکەی نییە، بەڵکو وەك پێشتریش باسمان کرد (دادپەروەری) ئەویش وەکو (ئازایەتی و دان بە خۆدا گرتن و دوورکەوتنەوە لە شتە حەرامەکان و حیکمەتە)، یەکێکە لە چوار بێخەوشیە گەورەکە کە چاکەکانی ئەخلاقی لێ پێکدێ. ئەم چاکانەش خەسڵەتێکن لە خەسڵەتە دەروونییەکانی تاك وکۆمەڵ لە یەککاتدا. کەواتە دادپەروەری  لە هەمانکاتدا سیفەتی تاك و کۆمەڵیشە، واتە هی هەردووکیانە. ئەمەش یەکێکە لەو بەشانەی کە ئەخلاقی تاك و رەفتاری کۆمەڵایەتی پێك دەهێنێت، بەڵام ئەمە بەم شێوەیە بێت یان بە هەر شێوەیێکی تر بێت، هیچ کاتێك بە یاساوە نابەسترێتەوە، بەڵکو بە ئەخلاقەوە دەبەسترێتەوە. لە گەڵ ئەوەی کە دادپەروەری خۆی بەشێکە لە چاکەکان، بەڵام لە (کۆمارەکەی) ئەفلاتوندا تا رادەییێك لەگەڵ چاکەکاندا دەبنە یەك شت، چونکە چاکەکانی هەر یەکێك، یان ئەو ئیمتیازاتانەی کە وەری گرتوون خۆی لەخۆیدا (دادپەوەری) پێوەندییەکانی نێوان رەگەزەکانی ئەو کەسانەیە. ئەو خودە، یان ئەو کەسەی کە ئارامی و گونجان لە نێوان هەرسێ رەگەزەکەیدا بە دی بێ، ئەو کەسە دەبێتە کەسێکی دادپەروەر و شتە چاکەکانی تێدا دەردەکەوێ، واتە دەبێتە کەسێکی بێخەوش. هەروەها چاکبوونی کۆمەڵگەش دادپەروەری پێوەندییەکانە لە نێوان ئەندامەکانیدا ـ ئەو دادپەروەریەی کە لە ئەنجامی پەیوەست بوونی هەر تاکێك بە کارەکەی خۆیەوە رێك و پێکی و گونجان لەنێوان ئەندامەکانیدا بە دی دەهێنێ ـ دەبێتە دەوڵەتێکی دادپەروەر و لە ئەنجامیشدا دەبێتە دەوڵەتێکی چاك یان بێخەوش.

یەکەم بیرۆکە لەبارەی دادپەروەری، کە ئەفلاتون لە کۆمارەکەیدا گفتوگۆی لەسەر کردووە ئەوەیە، کە ئەخلاقە تەقلیدییەکان پشتی پێ دەبەستن و یەکەم کەسیش کە ئەو بیرۆکەیەی شیکردەوە کیفالۆس Cephalus بوو کە دەڵێ: دادپەروەری واتە راستگۆیی لە قسەکردندا و گەڕاندنەوەی قەرزە بۆ خاوەنەکانیان، ئەمەش پێناسەییێکی تەواو ئەخلاقیانەیە، و هیچ پێوەندییێکی بە سیاسەتەوە نییە.

بەڵام پێناسەکەی (تراسیماخۆس) کە یەکێکە لە سۆفستاییەکان بە پێچەوانەی ئەو، پێناسەییێکی سیاسیانەی تەواوی بۆ دەکات کە دەڵێ: (دادپەروەری بەرژەوەندییەکانی ئەو

کەسەیە کە لە هەمووان بەهێزترە) یان بە رستەیێکی تر (ماف لەگەڵ هێزدایە) واتە مرۆڤ دەبێ هەرچی لە دەستی بێ، با بیکات و هەرچی بە دەستی بێنێ پێی رەوا دەبیندرێ و هی خۆیەتی. ئەمەش مانای ئەوەیە هێز و یاسا هەردووکیان یەك شتن، چونکە دەسەڵاتەکانی حکومەتە وای لێدەکات ئەو یاسایانە دابڕێژێ، کە لە بەرژەوەندی خۆیەتی و دادپەروەری دەکاتە ئەو مافەی کە بۆ خۆی دەیەوێ، بەو پێیەی کە لە هەمووان بە هێزترە، ئەویش لە سایەی ئەو دەسەڵاتەدایە، کە دەتوانێ ئەو شتانە بکات، بۆیە لە دیدی (تراسیماخۆس) دا بنەماکانی کارکردن وەك ئەو پیاوەیە کە لە کۆمەڵگاییێکدا دەژی، بە پێی ئارەزووەکانی ئەو فەرمانڕەوایە دەبێ کە تەنها ئەو شتانەی دەوێ کە خێری بۆ خۆی هەیە. پیاو ئەگەر بە چاوێکی پشکێنەرانە تەماشای راستییەکان بکات دەبێ بڕیاری ئەوە بدات کە رەچاوی ئەو جۆرە دۆخانە بکات. سەرەڕای ئەوەی کە هەموو مرۆڤێك کار بۆ خۆی دەکات و هەوڵ دەدات ئەوەی لە توانای دابێ بە دەستی بهێنێ، چونکە ئەو پیاوەی کە لە هەمووان هێزی زیاترە، لە هەمووان زیاتر باوەڕی بە خۆیەتی کە بگاتە ئەو شتانەی کە حەزی لێیەتی، لەبەر ئەوەی حکومەت لە دەوڵەتدا بە هێزترین دەسەڵاتە (ئەگەر نا نەدەگەیشتە ئەو حوکمڕانییە) هەوڵدەدات بگاتە ئەو شتانەی کە خۆی حەزی لێیە، ئەمەش شتێکی مەحاڵ نییە و هەر دەگاتە ئەو ئامانجەی کە هەوڵی بۆ دەدات.

بیروڕاکانی (تراسیماخۆس) بە شۆڕشێکی ئەخلاقی توندڕەو دانرا و لەو ئەخلاقە بەرزو نوێیەی کە ئەفلاتون لە گفت وگۆیەکەی (گۆرجیاس)دا باسی کردبوو گشتگیری تر بوو، لەبەر ئەوەی هەردووکیان نموونەی شۆڕشێکی هەست و نەستی خودی تاکەکان بوون، کە راپەڕینێکی پێ بەخشین لە دژی ئەخلاقە باوەکانی ئەوکاتە، کە کۆمەڵانی خەڵکی تا رادەیێکی خراپ گیرۆدەی ببوون. ئەو لە چەند کۆت و پێوەندێك زیاترە، کە لەتوانای جموجۆڵەکانیانی کەم دەکردەوە بەولاوە هیچی تری لە ئەخلاقە باوەکەی ئەوسادا نەدەدی. ئەفلاتون بە شێوەیێکی مەنتقیانە بەرەنگاری بیروڕاکانی (تراسیماخۆس) بۆوە و رەتی کردنەوە و بۆ ئەم مەبەستەش دوو کێشە وەردەگرێ کە ئەمانەن: یەکەمیان حکومەت بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی دەسەڵات بەرێوە دەبات (و) ستەم و زۆرداری لە دادپەروەری باشترە.(بەڵام کێشەی یەکەم لە بەر رۆشنایی ئەو بیرۆکەیەدا تاوتوێ دەکات کە دەڵێ: (فەرمانڕەوایەتی هونەرە) و دان بەوەدا دەنێ کە هەموو هونەرەکان لە ئەنجامی بوونی چەند کەموکوڕییێکە لەو بابەتەی کە وەری گرتووە سەرچاوە دەگرێ. پزیشك هەوڵی ئەوە دەدا کەموکوڕییەکانی لەش چارەسەر بکات. و

مامۆستاش هەوڵ دەدا کەموکورپییەکانی بیرو هۆش و رۆح چارەسەر بکات. واتە بابەتەکانی هەر هونەرێك ئامانجی خێرو بێری ئەو ماددەیەیە کە وەری گرتووە. بۆ نموونە مامۆستای بە توانا لە چارەسەرکردنی ئەو کەم وکورپیانەی لە بیرو هۆشی قوتابیەکەدا هەیە سەرکەوتوو دەبێ و تواناکانی خۆی دەردەخا، بۆیە دەبێ فەرمانڕەوا بە تەواوەتی لەخۆپەرستی داماڵدرابێ، چونکە ئەو لە بوارەکەی خۆیدا وەك فەرمانڕەوایێك کار دەکات وەك ئەوەی لە حوکمڕانیدا پێویستە بیکات و هیچ ئامانجێکی نییە تەنها خێری ئەو هاوڵاتیانە نەبێ کە لێیان بەرپرسیارە. لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم بەوە هەیە کە ئەویش وەك هەر مرۆڤێکی تر پێویستی بەژیان هەیە، وەکو هەر مرۆڤێکیش کرێی کارەکەی خۆی وەر بگرێ، ئەو لە بەر ئەوە وا ناکات کە فەرمانڕەوایە، یان هونەری فەرمانڕەوایەتی پیادە دەکات، بەڵکو وەك ئەو کەسانەی کە کرێی هونەری کارەکانی خۆیان وەردەگرن کار دەکات.

بەڵام بۆ کیشەی دووەمیان ئەفلاتون لە گفتوگۆکانیدا ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە کە پیاوی دادپەروەر: حیکمەت و هێز و خۆشگوزەرانیشی لە پیاوی ستەمکار زیاترە. بۆیەش حیکمەتی زیاترە، چونکە رێنماییە کۆنەکانی (دەلفی) جێبەجێ دەکات و دانیش بەوەدا دەنێ کە مرۆڤ پێویستی بە بوونی سنوورێك هەیە لێوەی بوەستێ[١٦٨]. کە ئەو هەوڵی ئەوە دەدا کێبڕکێ لەگەڵ ئەوانی تردا بکات، بەڵام وەك پیاوە ستەمکارەکە ناکات، کەکێبڕکێ لەگەڵ هەر مرۆڤێکدا بکات، یان تەنها بە مەبەستی ململانێ، ململانێ بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە دڵسۆزی خۆش دەوێ. بێ گومان ئەو پیاوە دادپەروەرەی کە ئەو حیکمەتەی تێدا بە دی دەکرێ لە پیاوێکی ستەمکار کە هیچ حیکمەتێکی نەبێ حەکیمترە و لەبەر ئەوەی دان بە بوونی سنوورێکیشدا دەنێ کە لێی بوەستێ کەواتە لەویش بە هێزترە و ئەو سەرکەوتنەشی بەسەر زۆرداردا لە رووی هێزەوە لە هێزی ئەو پرەنسیپەوە وەرگیراوە

---

١٦٨ - ئاماژەییێکە بۆ ئەو رستە نووسراوەی سەر دەروازەکەی پەرستگەی دەلفی کە دەڵێ: (ئەی مرۆڤ، خۆت بناسە ) ئەمەش بە خراپی لە ماناکەی گەیشتبوون کە گوایە ئەمە بانگەوازێکە بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی مرۆڤ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە بانگەوازێکە بۆ ئەوەی مرۆڤ بزانێ (سنوور) و (پلەو پاییەکانی) خۆی چیە. ئەو لەو ڕستەیەدا قسە لەگەڵ (ئەپۆڵۆ) ی خوادا دەکات ـ ئەمە لەگەڵ وتارەکەی ئێمەدا بە ناوی(کلمات ضالة) بەراورد بکە.

کە پێوەندییەکانی نێوان خۆی و دارو دەستەکەی خۆی پتەو دەکات. ئەو بەڵگەیەی کە ئەفلاتون دەیهێنێتەوە بۆ ئاماژە کردن بەو خەسڵەتەی دواییان، بەڵگەیێکە گرنگییێکی زۆر گەورەی هەیە: کە بڕیار دەدا کاری هەر شتێك، ئەو کارەیە کە تەنها خۆی بە باشترین شێوە ئەنجامی دەدات[169].

دەبینین (ئەسپ) کارێك ئەنجام دەدات کە تەنها ئەسپ دەتوانێ بە تەواوەتی ئەنجامی بدات و چاویش کاری تەماشا کردن و دیتنە و گوێچکەش کاری تایبەتی خۆی هەیە...هتد[170]. ئەمە لە (کۆمارەکەی ئەفلاتون) دا یەکەم ئاماژەیەکە بۆ پرەنسیپەکانی بەجێگەیاندنی هەر شتێك بۆ ئەو کارەی کە بۆی دەشێ. ئەمەش پرەنسیپێکی بنچینەییە لە دەسنیشانکردنی ماناکانی دادپەروەری لەلای ئەفلاتوندا، چونکە ئەمانە ئەو بنەما بنچینەییانەن کە تیۆرەکەی خۆی لەسەر بنیادناوە لە بارەی دادپەروەری. شتێکی سروشتیە کە ئەفلاتون لە پرەنسیپەکانی کاری تایبەتەوە بچێتە سەر پرەنسیپەکانی بێخەوشی، یان نایاب، بێخەوشی، یان نایاببوون هەر شتێك لەوە دایە کە کارە دیاریکراوەکەی خۆی بە شێوەییێکی گونجاو جێبەجێ بکات. بێخەوشی چاو لەوەدایە کە بە روونی ببینێ و بێخەوشی گوێچکەش لەوەدایە کە بە چاکی ببیستێ. هەروەها خودی دەروونیش کارێکی دیاریکراوی خۆی هەیە کە ژیانە، لە بەرامبەر ئەمەشدا بێخەوشی و نایابی خۆی هەیە کە ژیانێکی خۆشگوزەران و چاکە. لەبەر ئەوەی هەر شتێك ئەگەر چێژ لە بێخەوشییەکانی کارەکەی خۆی وەرنەگرێ مەحاڵە بتوانێ ئەو کارە ئەنجام بدات. هەروەها دەروونیش ئەگەر بێ خەوشیە گونجاوەکەی خۆی لێ دابماڵدرێ و نەیدرێتێ ناتوانێ کارەکانی خۆی ئەنجامبدات، هەر بۆیەشە خودی تاك لە توانایدا نییە ئەرکەکانی خۆی بە جێ بگەیێنی ئەگەر بێخەوشی خۆشگوزەرانی نەبێت ـ ئەو بێخەوشیە ناوێکی تری هەیە کە پێی دەڵێن: (دادپەروەری). ئەگەر خودی مرۆڤ توانی بێخەوشییەکانی ژیانێکی خۆش و دادپەروەر بە دەست بێنێ واتە خۆشگوزەرانیشی لەگەڵدا بە دەست هێناوە، چونکە خۆشگوزەرانی دەرئەنجامی

١٦٩ - ئەفلاتون (الجمهورية) ـ ٣٥٣ (وەرگێڕانە عەرەبیەکەی )لــ٢١١ــ.

١٧٠ - هەمان سەرچاوە ـ ٣٥٢ هـ (وەرگێڕانە عەرەبیەکەی ) لــ٢١٠ــ .

حەتمیبوونی ژیانێکی خۆشە، و ئەو خودەی: کە رێژەییێکی زیاتری لە بێخەوشی یان دادپەروەری بە دەسهێنابێ، خۆشگوزەرانییێکی زیاتری دەبێ.

ئەفلاتون هەمیشە هەولێداوە گرێ دەروونییەکانی مرۆڤ شیبکاتەوە و هەمیشە تێکۆشاوە ئەوە روون بکاتەوە لە پێناوی خۆشیی ئەو خودەدا، ئێمە وەك پێویستییێکی زۆرمان بە دادپەروەری هەیە، لە دوای ئەوەدا لێکۆڵینەوەکەی خۆی لە بارەی دەروون درێژە پێ دەدا تا بزانێ لەناو بازنە کۆمەڵایەتیەکەیدا چۆن کار دەکات، چونکە ئەو لەو باوەڕدایە کە هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان جێ پەنجەی ئەو خودەیان پێوە دیارە. دەسنیشانکردنی ئەو جێ پەنجانەش زۆر ئاسانن بە رادەییێك کە دەیکاتە باشترین رێگەچارە بۆ تێگەیشتن لەو خودەی، کە ئەو جێ پەنجەیەی بەجێ هێشتووە. دەڵێ: (دەوڵەتەکان لە تاشە بەردو دار بەرِوو پێك نایێن، بەڵکو لە کەسایەتی ئەو پیاوانە پێکدێن کە لەسەری دەژین)، بۆیە هەرکەسێك کە بیەوێ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو کەسانە بکات دەبێ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو دەوڵەتەش بکات کەتیایدا دەژین. لەبەرئەوەی دەوڵەتەکان دەرئەنجامی خودی ئادەمیزادەکانن، بنیادنانەکەی هەمان ئەو رێبازە لە خۆیدا دەگرێ، کە ئەو بیرۆکەیە دەیداتێ و دەڵێ خودی مرۆڤ سروشتێکی سێ لایەنەیە، ئەو خودە لە سێ بەش پێکدێت کە ئەمانەن: خودی ژیر، خودی توندڕەو، و خودی هەوەسباز. ئەو تیۆرە سێ لایەنەیە بۆتە بنچینەی زۆرێك لەو شتانەی، کە لە گفتوگۆکانی کۆمارەکەی ئەفلاتوندا هاتووە. ئەفلاتون یەکەمجار دان بەوەدا دەنێ کە ئەو پرەنسیپەی کە خود شتەکانی پێ خۆش دەوێ و پێی برسی و توێنی دەبێ و پێی تووشی هەموو جۆرە هەڵچوونێك دەبێ ـ ئێمە پێی دەڵێین هەوەس، یان خودی هەوەسباز و ئەو پرەنسیپەی کە خود بیری پێ دەکاتەوە ناوی لێ دەنێین ئەقڵ یان خودی ژیر، بەڵام پرەنسیپی سێیەمیان کە ئێمە ناومان ناوە تووڕە یان خودی تووڕە و توندییەکان کە لەوانەیە ململانێی لەگەڵ ئارەزووەکاندا هەبێ، چونکە هەر یەکەیان جیاوازی لەگەڵ ئەویتردا هەیە. بەمشێوەیە دەبینین (هەمان ئەو شتەی لەناو خودی مرۆڤایەتیدا هەیە لە دەوڵەتیشدا هەیە و بەهەمان ژمارەش..)[١٧١].

---

١٧١ - (الجمهوريه )٤٤١.

زۆر گرنگە ئێمە تێبینی ئەوە بکەین، کە ئەو حیکمەتەی تاك و دەوڵەت هەیانە وەکو یەك لەلایەن یەك پرەنسیپەوە دروست بووە و هەردووکیشیان لە سایەی یەك پرەنسیپدا ئازایەتیان تێدایە و بە یەك راددەش و هەردوکیان بە هەمان شێوە هەموو بێخەوشییەکانی تریان تێدایە. دەتوانین بڵێین مرۆڤ ئەوەندە دادپەروەر دەبێ بە هەمان ئەو رادەیەی کە دەوڵەت تێیدا دادپەروەر دەبێ.

## کۆتایی:

ئەوەی روونە ئەفلاتونیش وەك فەیلەسووفە یۆنانییەکانی دیکە هیچ جیاوازییێکی ئەوتۆی لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا نەکردووە، بەڵکو دەیانکاتە یەك شت. ئەمە راستە کە ئەخلاق تەعبیر لە رەفتارەکانی تاك دەکات، لە کاتێکدا سیاسەت تەعبیر لە رەفتارەکانی کۆمەڵ دەکات، بەڵام ئەو پێی وایە کە رەفتارەکانی کۆمەڵ هەمان رەفتارەکانی تاکە، یان کۆکراوەی، یان کۆی گشتی رەفتارەکانی ئەو تاکانەیە. یان ئەوەتە دەوڵەتی چاك لە هاولاتیانی چاك پێکدێ. تاکی بێ خەوشیش لە دەوڵەتێکی بێ خەوشدا نەبێ بوونی نییە. هەر لێرەوە ئەو بیرۆکە دادپەروەریەی ئەفلاتون لە کتێبی (کۆماری ئەفلاتون) دا لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە سەری ئەنجام داوە هەر لە بنەرەتدا بیرۆکەییێکی ئەخلاقیە نەك پرۆژە یاسا، ئەگەر دادپەروەری لە تاکدا هەبێ ـ کە ئەمەش یەکێکە لە بێخەوشییەکان ـ ئەمەش مانای گونجاندنی هەر سێ کردارەکەی خودی کەسەکان خۆیانە، وەك: هەوەسبازی و شەرانگێزی و ژیریە کە خودی هیچ کەسێك دەس بە سەر کارەکانی خودی هیچ کەسێکی تردا نەگرێ، ئەگەر بێت و مرۆڤی دادپەروەر، یان بێخەوش ـ کە هەردووکیان یەك مانا دەبەخشن ـ ئەو گونجانەی تیادا بێتە دی، ئەوساکە ئێمەش دەتوانین بڵێین: هەمان شت لە بارەی دەوڵەتی دادپەروەر، یان شارە بێخەوشەکە بڵێین کە هەر هاولاتییێك بەو کارانە هەڵسێ کە لە گەڵیدا دەگونجێ و هێزو تواناکانی خۆی رێی پێ دەدەن کە ئەنجامی بدات بێ ئەوەی لە هەوڵی ئەوەدا بێت کە دەستدرێژی بکاتە سەر کارێکی تر. هەمان شتیش لە بارەی سێ چینەکەی کۆمەڵیش بڵێ: چینی گشتی کە چینەکانی کرێکار و بازرگان و جوتیار، و پیشەیی و ئەو جۆرە کارانەی وەك ئەوانن

دەگرێتەوە، دوای ئەو چینی سەربازەکان دێ، کە پارێزگاری لە وڵات دەکەن، لە کۆتایشدا چینی فەرمانڕەواکان دێ کە جڵەوی دەسەڵات بە دەستەوە دەگرن، دەبێ ئەو چینانە هەر یەکەو کاری تایبەت بە خۆی ئەنجام بدات بێ ئەوەی دەست لە کاری چینێکی تر وەربدات، هیچ کاتێك ئەوە بە بیری ئەفلاتوندا نەدەهات کە رۆژێك لە رۆژان چینی (کرێکار) فەرمانڕەوایەتی شار بگرنە دەست. کە ئەمانەش کۆمەڵێك هەڵەن، هەروەها لادانیشە لە پێکهاتەکانی شاردا و سەراوبن کردنی هاوسەنگییەکانە، ئەمەش وای لێدەکات کە ببێتە شارێکی نا دادپەروەر و دوور لە بێخەوشی!.

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ئەو تێکەڵکردنەی پێشتر لە رۆژهەڵاتی کۆندا بینیمان تا ئێستاکەش لە لای ئەفلاتوندا ماوە، هەر چەندە فەیلەسووفە گەورەکەی ئەسینا ئەوەی دەزانی کە چەند بێخەوشییێکی ئەخلاقی هەیە دەخرێنە سەر بەها سیاسییەکان کە ئەویش پێکهاتە یاساییەکانی دەوڵەتە.

لێرەدا رەگەزێکی گرنگ هەیە دەبێ ئێمە ئاوڕی لێ بدەینەوە کەوا خەریکە لەسەر بیری سیاسی یۆنانیدا لادەچێ و نامێنێ کە لە بیری رۆژهەڵاتیدا بوونی هەبوو ئەویش ئاین و پیرۆز راگرتنی فەرمانڕەواکانە، نە ئەفلاتون و نە ئەرستۆش فەرمانڕەوایان لە شێوەی خوا، یان کوڕی خوا، یان وەك ئەڵقەی پێوەندی نێوان کۆمەڵانی خەڵکی و خوادا وێنا نەکردووە، کە وەك ئەوەی میسریە کۆنەکان تەماشای فیرعەونیان دەکرد، یان وەك هاوڵاتیانی خەڵکی چین کە تەماشای ئیمپراتۆری چینیان دەکرد، ئەمەش هەنگاوێکی پێشکەوتنخوازانەی گەورە بوو، کە سەرەڕای ئەو شکستانەی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بە سەر بیری سیاسیدا دەهات لە بیری سیاسی رۆژئاواییدا بەردەوام دەبێت و پشتگیری لێدەکرێ، بەمشێوەیەی کە لە داهاتوودا دەیبینین.

# بەشی دووەم

# (ئەرستۆ...)

**(زانستی سیاسی مەبەستی خۆشگوزەرانی مرۆڤە .)**

**ئەرستۆ (ئەخلاقی نیقۆماخۆس ـ ١٠٩٤ ـ ب ـ )**

## پێشدەست: .

هەر وەك ئەوەی لە فەلسەفەکەی ئەفلاتوندا، ئەو تێکەڵ کردنەی نێوان ئەخلاق و سیاسەت هەبوو لە فەلسەفەکەی ئەرستۆشدا هەر بوونی هەیە: ئەمەش ناسنامەییێکە لەنێوان دوو بواردا، یۆنانییەکان تەنانەت لە ئەفسانەکانیشیاندا بەمشێوەیە دەریان دەبڕی: (دەڵێ ئەگەر چی ئەپۆلۆ تەفسیری ئەخلاقی کردووە، هەروەها تەعبیری لە یاساش کردووە)[172]، بۆیە ئەمە دەبێتە هەڵەییێکی گەورە ئەگەر بڵێین: (ئەرستۆ زانستی سیاسەتی وەك زانستێکی سەربەخۆ کە تایبەت بەخۆی بێت داناوە، چونکە لە هەر هەموو توێژینەوەکانی تری جیا کردۆتەوە بە تایبەتی ئەخلاق و بە شێوەییێکی سەربەخۆ چارەسەری کردووە)[173].

باس لە سێ بیرۆکەی بنچینەیی دەکەین کە بیرۆکەی تێکەڵبوونی ئەخلاق و سیاسەت دەردەخەن لەلای ئەرستۆ.

یەکەم: مەبەستدارەکان (الغائية).

دووەم: سوود... و زۆرترین سوود.

سێیەم: زانستی سیاسەتە، کە زۆرترین سوود بە دی دێنێ.

---

١٧٢ - سێر ئارنیست بارکەر(النظرية السياسية عند اليونان) وەرگێڕانی لویس ئەسکەندەر بەشی یەکەم لـــ٨٧ــ دەزگای سجل ئەلعەرەب ساڵی ١٩٦٦.

١٧٣ - د. مستەفا ئەلخەشاب (تاريخ الفلسفة ولنظريات السياسية) چاپی یەکەم ساڵی ١٩٥٣ لیژنەی بەیان ئەلعەرەبی لــ١٢٥ــ.

## یەکەم: بیرۆکە مەبەستدارەکان: .

ئەرستۆ وای بۆ دەچێ، کە رەفتارەکانی مرۆڤ مەبەستدارن، لەوانەشە بەو بایۆلۆجیە کاریگەر بووبێ، کە لەلای باوکی هەبووە وەك پزیشکێك. مەبەستم لەوەدا ئەوەیە کە ئەو ئامانجی مەبەستێکە، کە زۆربەی کاتەکان ئەو مەبەستە بە شێوەییێك لە شێوەکانی خێرو خۆشی دادەنییێن، لەبەرئەوەی رەفتارەکانی مرۆڤ مەبەستدارن، بۆیە هەر لێکۆڵینەوەییێك، یان هەر توێژینەوەییێك، یان هەر زانستێك، یان هەر هونەرێك لە هونەرەکان ئامانجیان مەبەستێك، یان خێرو خۆشییێکە. ئەمە لە یەکەم وتاری کتێبی(ئەخلاقی نیقۆماخۆس) دا دەڵێ:

(هەر هونەرێك و هەر چالاکییێکی مرۆڤ بۆ مەبەستێکە، یان بۆ چاکەییێکە، ئینجا دێت و بە جوانی چاکەمان پێ دەناسێنێت، کە ئەو مەبەستەیە هەموو شتەکانی تر هەوڵی بۆ دەدەن، ئەگەرچی ئێمە تێبینی ئەوە دەکەین کە جیاوازییێك لەنێوان ئەو مەبەستانەدا هەیە کە هەوڵی بۆ دەدەین، چونکە لەوانەیە مەبەستەکان لە هەندێك حاڵەتدا خودی چالاکییەکان خۆیان بن، بەڵام لە هەندێك حاڵەتی تردا دەبنە ئەنجامی تێپەڕاندنی ئەو چالاکیانە. ئەو چالاکییانە و بە تایبەتی لە حاڵەتەکەی دواییاندا بەهاکەی زۆر لە خودی چالاکییەکان زیاتر دەبێت[١٧٤]. ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەر رەفتارێکی مرۆڤ دەبێ مەبەستێك بکاتە ئامانجەکانی خۆی و بە شێوەییێك لە شێوەکان بە چاکە ئەژمار بکرێت، لەبەر ئەوەی جۆرەکانی چالاکی و هونەر و زانست گەلێ زۆرن، بۆیە چەندین مەبەستی جۆراو جۆری لێ دەکەوێتەوە کە مرۆڤ هەوڵی بۆ دەدا، بۆ نموونە زانستی پزیشکی ئامانجی بە دیهێنانی تەندروستییە و زانستی دەریاوانی ئامانجی دروستکردنی کەشتییە و هونەرە سەربازییەکان ئامانجیان بە دەسهێنانی سەرکەوتنە لە شەڕەکاندا و زانستی ئابووریش ئامانجی دەوڵەمەندبوونە[١٧٥]. لە هەر هەموو ئەم حاڵەتانەشدا مەبەست لە چاکەکردنە، بەڵام لەبەرئەوەی مەبەستەکانی زانستە لاوەکی و پاشکۆکان خزمەتی زانستە سەرەکییەکان دەکەن بۆیە یەکەمیان، دووەمیان باشتر دەکات. لەم حاڵەتانەشدا ئەوە گرنگ نییە کە ئەگەر کردارەکان خۆیان خودی

---

١٧٤ - ئەرستۆ (الاخلاق الی نیقوماخۆس) ١٠٩٤ ـ أ.

١٧٥ - ئەرستۆ : هەمان سەرچاوە.

مەبەستەکە بن، یان مەبەستەکە شتێکی تر بێ و بکەوێتە دوای ئەو، وەك لە حاڵەتی ئەو هونەر و زانستانەدا روو دەدەن کە پێش ئێستاکە باسمان کردن[١٧٦].

بەمشێوەیە کۆمەڵێك مەبەستی گەورە لە بەردەمی خۆماندا دەبینین، کە جیاوازییەکانیان بەپێی جیاوازی جۆرەکانی رەفتار و شێوازی زانیارییەکانە (بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتواندرێ ئەو مەبەستە زۆرانە بە شێوەیێك دابندرێن و رێکبخرێن کە یەکیان پێش ئەویتریان بخرێ، یان بڵێ هەندێك لەو مەبەستانە خۆیان هۆکارێك بن بۆ چەند مەبەستێکی باڵاتر: ئەگەر بۆ نموونە وتمان فلانە زانا لە کارگەکەی خۆیدا بێ وچان کۆشش دەکات بۆ ئەوەی بگاتە پێکهاتەیێکی کیمیایی دیاریکراو، لەم حاڵەتەدا دەبینین مەبەست لە رەفتارەکانی ئەو زانایە پێکهاتە کیمیاییەکەیە، بەڵام لەوانەیە بپرسین و بڵێین: بۆچی بگەینە ئەو مەبەستە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی گەیشتن بە دەرمانی (س) و ئەگەر جارێکی تر پرسیار بکەینەوە و بڵێین: بۆچی دەیەوێ بگاتە دەرمانی (س) لە وەڵامدا دەڵێین، چونکە لە نەخۆشی سەرما دەمانپارێزێ و لەبەرچی دەمانەوێ لە سەرما خۆمان بپارێزین؟ لە وەڵامدا دەڵێین، چونکە تووشبوون بە سەرما تەندروستیمان دەخاتە مەترسییەوە...هتد.

ئێمە لەم نموونەیەدا خۆمان لە بەردەم زنجیرەیێك مەبەستدا دەبینینەوە: هەر مەبەستێك لەمانە لە دوای مەبەستێکی باڵاترەوە دێت، ئەرستۆ وای دەبینێ، کە هەموو کاتێك مەبەستە باڵاکان بەهاکانیان لەو مەبەستە نزمانە زیاترە، کە لە دوی ئەوەوە دێن، بەڵام ئەگەر بکرێ مەبەستەکان ریزبەند بکرێن کە هەر یەکەیان بگاتە ئەوەی تریان، ناکرێ ئەو ریزبەندییە هەتا هەتایێ هەر بەردەوام بڕوا، ئەگەر نا دەبووە گاڵتەجارییێك و هیچ سوودێکی نەدەبوو، لەمەدا دەبێ سنوورێك بۆ ئەو مەبەستانە دابندرێ، دەبێ لە کۆتاییدا مەبەستێك هەبێ نەگاتەوە شتێکی تر، یان بە هۆکارێك نەژمێردرێ بۆ مەبەستێکی دیکە، دەبێ مەبەستێك هەبێ کە بۆ خۆی بێ، کە هەموو مەبەستەکانی تر لە پێناو گەیشتن بێ بەو مەبەستە.

**ئەرستۆ دەڵێ: ـ**

((لەبەر ئەوەی ئەو هەموو کردارانەی کە ئەنجامی دەدەین بۆ بە دیهێنانی هەر مەبەستێك لە حەزو ئارەزوەکانمانەوە هەڵدەقوڵێن، بۆیە دەبێ مەبەستێك هەبێ کە ئێمە بۆ خودی ئەو مەبەستە هەوڵبدەین، کە هەوڵەکانمان بۆ مەبەستەکانی تر لە پێناو ئەو مەبەستەدا بێت.

---

١٧٦ - ئەرستۆ : هەمان سەرچاوە.

ئەگەر بێت و مەبەستێکی لەمشێوەیە کە بۆ خودی خۆی هەوڵبدات بوونی نەبێ، کەواتە لەم حاڵەتەدا دەبێ ئێمە بەردەوام لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکیتر هەوڵدەین، بێگومان لەم حاڵەتەشدا ویست و ئارەزووەکانمان بێ بەر و رەنج بە خەسار دەبوو...))[١٧٧].

## دووەم: خێر.. و زۆرترین خێر: .

هەر رەفتارێك و هەر چالاکییێك، ئەوانەی کە مەبەستدارن، مەبەستم ئەوانەیە کە ئامانجیان بە دیهێنانی مەبەستێکی دیاریکراوە، وەك پێشتریش باسمان کرد کە هەر مەبەستێك جۆرێکە لە جۆرەکانی خێر و چاکە، کە زانایێکی کیمیایی دەگاتە پێکهاتەییێکی کیمیایی دیاریکراو وەك ئەوەی لە نموونەی پێشوودا باسمانکرد..بە سوودوچاکەییێك دەژمێردرێ ـ هەر وەك ئەو زانایەی کە دەرمانی (س) بە خێر و چاکەییێکی تر دەژمێردرێ، هەروەها پاراستنی مرۆڤیش لە سەرما بە خێر و چاکەی سێیەم دەژمێردرێ.. هەمان شتیش لە بارەی هونەر و زانست بڵێ، ئەو مەبەستانەی دەتواندرێ بە خێر و چاکە بژمێردرێن زۆر و جۆراو جۆرن، یەکەمیان پزیشکیە، بۆ نموونە ئامانجی پزیشك مەبەستێکی دیاریکراوە کە ئەویش تەندروستیە، هونەری پەروەردەکرنیش ئامانجی مەبەستێکی ترە کە ئەویش ئامادەکردنی هاوڵاتییێکی سوود بەخشە.. بەم شێوەیە ئێمە چەند مەبەستێکی زۆر دەبینین، لە هەمانکاتیشدا خێر و چاکەی جۆراوجۆر بە دی دێنن.

بەڵام ئەگەر بێت و مەبەستێك هەبێت تەنها بۆ خودی خۆی بێ و بەس، کە هەر هەموو مەبەستەکانی تر تەنها بۆ گەیشتن بێ بەم مەبەستە و ئەگەر بێت و هەر مەبەستێك لە مەبەستەکانی پێشوودا بە خێرێك بژمێردرێ، کەواتە ئەم تاکە مەبەستە دەبێ ئەو پەڕی خێر و چاکە بێت Summum Bonum ـ یان خێرو چاکەییێکی رەهایە Absolte Good ـ، ئەمە ئەو خێر و چاکەیەیە کە مەبەستی تەنها خودی خۆیەتی بێ ئەوەی ببێتە هۆکارێك بۆ چەند مەبەستێکی دوورتر. لێرەدا تێببینی ئەوە دەکەین کە ئەخلاقەکەی ئەرستۆ هەمان ئەو ئامانجانەی هەیە کە لە مەڕ ئەخلاقەکەی ئەفلاتونی مامۆستایدا هەبوو.

کەواتە تەنها یەك مەبەست هەیە کە شتەکانی بۆ خۆی بوێ، ئەوەی کە روونیشە ئەو مەبەستە، ئەوپەڕی خێر و چاکەیە، یان خێر و چاکەییێکی رەهایە. هیچ گومانی تێدا

---

١٧٧ - ئەرستۆ (الاخلاق الى نقوماخوس) ١٠٩٤ ـ ب ـ.

نییە کە ناسینی گەورەترین خێر و چاکە بەهاییێکی گەورەی بۆ سەر ژیان و هەڵسوکەوتەکانمان دەبێ، چونکە هەر یەکێکمان حەزی لە کارێکە کە خێر و چاکەی هەبێ. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەگەر ئێمە بزانین خێر و چاکەکان کامانەن دەتوانین بە ئاسانی بە مەبەستەکانی خۆمان بگەین. ئەمەش وەك ئەو کەسە وایە کە تیرێك تێدەگرێ، ئەگەر نیشانەیێك لە پێشی دابندرێ بۆ ئەوەی تیرەکانی تێبگرێ، دەتوانێ زۆر بە باشی نیشانەکەی خۆی بپێکێ.. دەبێ ئێمە ئەوە بڵێین: کە ئەو خێر و چاکانە سەر بە زانستێکن، کە لە زانستەکانی تر گشتگیرترن و لە هەمووشیان بە دەسەڵاتترن، کە ئەویش زانستی سیاسەتە، چونکە زانستی سیاسەت ئەو زانستەیە کە هەر هەموو ئەو زانستانە دەسنیشاندەکات کە دەبێ لە دەوڵەتدا هەبن، ئەو زانستانەش کامانەن کە دەبێ هەر گرووپێك لە هاولاتیان فێری ببن و رادەی ئەو زانیاری وکارامەییە چین، کە دەبێ هەر فەرمانبەرێك فێریان ببێ، جگە لەمانەش دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە بالاترین توانا ئەقلییەکان، وەك هونەرەکانی شەڕ و هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی ماڵەوە و کارگێڕی و وتار خوێندنەوە ـ کە زانستە سیاسییەکان لە خۆی دەگرێ، چونکە ئەو زانستە دەتوانێ زانستەکانی تر بەکاربێنێ. سەرەڕای ئەمانەش ئەو رێنماییانەش دادەنێ کە پێویستە خەڵکی چی بکەن و چی نەکەن، هەروەها مەبەستەکانی ئەو زانستە مەبەستەکانی زانستەکانی تر لە خۆی دەگرێ. لەمەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە سیاسەت مەبەستی خێر و چاکەی مرۆڤە، چونکە تەنانەت ئەگەر خێر و چاکەکانی خودی تاکیش هەمان ئەو خێر و چاکانەی شاریش بێ، شتێکی روونە کە خێر و چاکەکانی شار شتێکن زۆر گەورەتر و کامڵترن.. ئینجا دوای ئەوە خێر و چاکەکانی دەوڵەت و نەتەوە زۆر ماقووڵترو پیرۆزترن.. ئەمەش ئامانجی لێکۆڵینەوەکەمانە، بەو مانایەی کە لە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە..[١٧٨]

١٧٨ - ئەرستۆ (الاخلاق الى نقوماخوس) ١٠٩٤ ـ ب ـ.

## سێیەم: زانستە سیاسییەکان زۆرترین خێر وچاکە بەدی دێنن: .

ئەرستۆ لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا (ئەخلاقی نیقۆماخۆس) بۆ گفتوگۆکەی پێشووتری دەگەڕێتەوە و بەم شێوەیە پوختی دەکاتەوە (لەبەرئەوەی هەر زانستێك مەبەستی سوود و چاکەیێکە، دەبێ جگە لە گەورەترین خێر و چاکە، ئەو ئامانجە چیبێ کە زانستە سیاسییەکان هەیانە..؟ کاتێك کە باس دێتە سەر زانستە سیاسییەکان زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی ـ گشتییەکان و تایبەتییەکان ـ هەر هەموویان لەسەر ئەوە هاوڕان کە زانستە سیاسییەکان مەبەستیان خۆشگوزەرانی خەڵکە. ئەوان ئەوە دەزانن کە خۆشگوزەرانی مانای ئەوەیە (ژیانێکی بێ خەوش) بە سەر ببەین و (کرداری بێخەوش)ی ئەنجام بدەی، هەر چەندە لە دوای ئەوەدا لەسەر پێناسەکردنی خۆشگوزەرانی بیرورای جیاوازیان هەبوو، خەڵکی بە گشتی راییێکیان هەبوو، فەیلەسووفەکانیش رایێکی تری جیاوازیان هەبوو)[١٧٩]..

ئەرستۆ بەم شێوەیە زانستە سیاسییەکان هەڵدەسەنگێنێ، کە زانستێکە زۆرترین خێر و چاکە بۆ مرۆڤ بە دی دێنێ کە زانستی دەوڵەتە شارە Polis_ و ئەندامەکانی ئەو دەوڵەتەیە نەك بە مانا سیاسیە تەسکەکەی، بەڵکو بە مانا بەر فراوانەکەی کە هەبوونی مرۆڤێکی شارستانی دەگەیێنێ، کە ناکرێ لە هیچ شوێنێکدا بوونی هەبێ تەنها لە (شار)دا Polis نەبێ، کە ئەوانە چینە خەڵکێکن حەز لە ژیانێکی بێخەوش دەکەن، بۆیە زانستە سیاسییەکان گەیشتن بە بەرزترین بەهاکانی مرۆڤ و ئەو هەڵسوکەوتانەی کە پیادەیان دەکات بۆ گەیشتن بەو بەها بەرزانە لە ئەستۆی خۆی دەگرێ. هەر بۆیەشە زانستی سیاسەت یەکەمی هەموو زانستەکانە و لە هەمووشیان گرنگترە. لەبەرئەمەشە کە یەکەم زانستە، چونکە ئەو زانستەکانی تر رێك دەخات و رێ و شوێنەکانیان لە دەوڵەتە شاردا دەسنیشاندەکات. بۆیەش لە هەموویان گرنگترە، چونکە زۆرترین خێر و چاکە بە دی دێنێ، لەمەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە ئامانج و ناوەرۆکی زانستە سیاسییەکان بەدیهێنانی خێر و چاکەیە بۆ مرۆڤ، مەبەستم ئەوەیە ناوەڕۆك و ئامانجێکی ئەخلاقیانەی هەیە. لەبەرئەوەی تاك خۆی بەشێکە لە شار، کەواتە زانستە ئەخلاقییەکان بەشێکن لەو زانستە سیاسیانەی کە پێشەنگی زانستەکانی ترە و بۆ بە دیهێنانی مەبەستەکانی خۆی بە کاریان دەهێنێ، لە پێناوی ئەمەدا جگە لەو هونەرەش.

---

١٧٩ - ئەرستۆ (الاخلاق الى نقوماخوس) ١٠٩٤ ـ ب ـ.

هونەرەکانی شەڕ و ئابووری، یان هەڵسووڕاندنی ماڵ و وتار خوێندنەوە و بابەتەکانیتر بەکاردەهێنێ، بەمشێوەیە مەبەستەکانی ئەو زانستە هەر هەموو مەبەستە زانستەکانی تر دەگرێتەوە کە ئەویش بەدیهێنانی  باڵاترین خێر و چاکەیە. ئەگەر زانستەکانی ئەخلاق ئامانجی سوود و چاکەی تاك بێ، کەواتە زانستە سیاسییەکانیش ئامانجی خێر و چاکەی دەوڵەتن، کەواتە بۆ تاك و بۆ دەوڵەت گۆڕینەوەی خێر و چاکەیە وەك یەك، بەڵام بە دیهێنانی خێر و چاکەکانی دەوڵەت باڵاترو کامڵترن. ئەگەرچی خێر و چاکە شایانی ئەوەبێ کە خۆمانی بۆ ماندوو بکەین، تەنانەت ئەگەر بۆ تاکە کەسێکیش بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندی بازنەکە لە تاکەوە بەر فراوانتر بێت پەرە بسێنێ و تێکڕای گەل بگرێتەوە ئەوکاتە جوانترو پیرۆز تر دەبێ.

کەواتە زانستە سیاسییەکان زانستی خۆشگوزەرانییە، کە ئەمە لە ئاستی تاکدا بێت، یان کۆمەڵی مەدەنی باڵاترین ئامانجی رەفتارەکانی مرۆڤ بێت، بۆیە ئەرکی ئەم زانستەیە کە دەبێ تیۆرێك بۆ رەفتارەکانی مرۆڤ دابنێ و تیایدا ئەوە روون بکاتەوە کە ئەو شتانەی لەهەموو شتەکانی تر چاکتر و بێخەوش تر و کامڵترن کامانەن و رەفتارەکانی مرۆڤ  کامیان دەکاتە ئامانجی خۆی. مەبەستی لە مرۆڤ، ئەو مرۆڤە ئاساییەیە کە بە حوکمی ئەو سروشتەی کە هەیێتی خۆی لەخۆیدا بوونەوەرێکی سیاسیە، یان هەر بە سروشت شارستانییە[180]. کە بۆ بەدیهێنانی بەهرەکانی خۆی وگەشەپیێدانی، کە لەمەدا گرنگی بە رەفتارەکانی بنەماڵەکەی خۆیی و برادەرەکان وخەڵکانی کۆمەڵەکەی خۆی دەدات و پشت بە کۆمەڵە مرۆڤەکەی خۆی دەبەستێ، و ئەوەی نەشتوانێ لەگەڵ کۆمەڵگەکەی خۆیدا هەڵ بکات و بژی، یان بیەوێ بە تەنیا بژی، ئەو کەسە بە بەشێك لە کۆمەڵی ئادەمیزاد ناژمێردرێ، یان بە مرۆڤێکی خراپەکار ئەژمار دەکرێت، یان ئەوەتە لە سەرووی مرۆڤەوەیە و ئەو گلەیی وگازاندانەی هۆمیرۆسیان بە سەردا دەسەپێ کە ئاراستەی ئەو کەسانەی دەکات و دەڵێ: (بێ حاڵ وماڵ و بێ خێزان و بێ یاساکان) ئەو جۆرە کەسانە هەر بە سروشت لە شەڕانگێزی زیاتر هیچ شتێکی تریان خۆش ناوێ، چونکە توانای ژیانی ناو کۆمەڵیان نییە ئەمەش مانای ئەوەیە کە مرۆڤ هەر بە سروشت لە مێش هەنگوین سیاسیترە و لەو ئاژەڵە

---

١٠٩٧ - ١٨٠ ـ ب ن هەروەها کتێبی (الدولة من عمل الطبيعة، والانسان مدني بالطبع)  ١٢٥٣ ـ ب ـ.

سروشتیانەش سیاسیترە، کە بە کۆمەڵ دەژین، وەك زۆرجاری تریش باسم کردووە کە سروشت هەر لە خۆیەوە شتێك دروست ناکات کە سوودێکی نەبێ[١٨١].

ئەوەی کە روونە ئەرستۆ زۆر بە توندی ئەخلاق و سیاسەت پێکەوە دەبەستێتەوە، بەڵکو لە پێش هەموویاندا ئامانجی پێکهێنانی دەوڵەت دەکاتە ئامانجێکی ئەخلاقی، لەلای ئەودا دەوڵەت بریتیە لە کۆمەڵێك بەش کە لەگەڵ یەکتریدا بە رۆحیکی هاوکارانە کارلێك دەکەن بۆ بە دیهێنانی ئەو دەوڵەتەی ئەو ناوی ناوە دەوڵەتی هاورێیەتی[١٨٢]. ئەمە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و بەرژەوەندییە گشتییەکانە، ئامانجیشی هاوکاریکردنی تاکە بۆ بە دیهینانی زۆرترین ئەو خۆشگوزەرانییەی کە لە توانادایە[١٨٣]. ئەرستۆ لە یەکەم رستەی کتێبی (السیاسة) دا دەنووسێ و دەڵێ: (هەر دەوڵەتێك لە کۆمەڵێك خەڵك پێك دێت و هەرکۆمەڵێکیش بۆ بەدیهێنانی خێر و چاکەیێك هەوڵ دەدات، بەڵام ئەگەر بێت و هەر هەموو کۆمەڵەکان ئامانجەکانیان یەك خێر و چاکە بێ، کەواتە دەوڵەت، یان ئەو کۆمەڵە سیاسیەی کە لە سەرووی هەموو رێکخستنەکانی تر دایە و تێکرای رێکخستنەکانی تر لە خۆی دەگرێ، ئامانجەکانی لە هەموو رێکخستنەکانی تر گەورەترە بۆ بە دیهێنانی خێر و چاکە، بەڵکو دەیەوێ زۆرترین خێر و چاکە بە دی بێنێ[١٨٤].

ئەو ئەخلاقەی کە بەدیهێنانی سوود و چاکە دەکاتە ئامانجی خۆی تەنانەت لقێکە لە زانستە سیاسییەکان و ئەوەی چاوێك بە کتێبی (سیاسەت) و (ئەخلاقی نیقۆماخۆس) دا بگێڕێ دەتوانێ تێبینی رستەکانی یەکەمی هەردوو کتێبەکە بکات، لەکاتێکدا کتێبی(ئەخلاق) کاروباری سوود و چاکەکانی مرۆڤ چارەسەر دەکات کە ئامانجێکن بۆ رەفتارەکانی ئادەمیزاد، بەڵام کتێبی (سیاسەت) لە لێکۆڵینەوەکانیدا مەرجەکانی کۆمەڵگاییێکی چاك لە خۆیدا دەگرێ، شاریش بەو پێیەی کە کۆمەڵێکی رێك و پێکە، بۆیە لە توانایدا هەیە کە ئامانجە چاکەکانی ئەو هەڵسوکەوتانە بە دی بهێنێ[١٨٥].

---

١٨١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٨٢ - ئەرستۆ (السیاسة) ١٢٥٣ ـ أ ـ.

١٨٣ - عەبدولستار قاسم (الفلسفة السیاسیة التقلیدیة) چاپخانەی ئوردنی ساڵی ١٩٧٩ لـ٦ـ.

١٨٤ - ئەرستۆ (السیاسة) ١٢٥٢ ـ ٣ ـ.

١٨٥ - د. ئیبراهیم دەسووقی ئەبازە ـ د. عەبدولعەزیز غەننام (تاریخ الفكر السیاسی) دارلنەجاح بەیرووت ساڵی ١٩٥٣ لـ٦٧ ـ بەراورد بکەوە.

هەر وەك لە سەرەتای نووسینەكانی كتێبی (سیاسەت)دا بۆمان روون دەبێتەوە كە دەوڵەت بریتیە لە كۆمەڵە خەڵكێكی سیاسی، واتە بەپێی دەستوور رێكخراون كە ئەمە گرنگترین و گەورەترین كۆمەڵەن نەك تەنها لە رووی ژمارەوە، بەڵكو لەنێو كۆمەڵە خەڵكە جۆربەجۆرەكانی تریشدا گرنگن، لە كۆتاییدا شار بریتیە لە كۆمەڵە خەڵكێكی رێكوپێك، هاوڵاتیش ئەو كەسەیە كە لەلایێك ئەركەكانی خۆی جێبەجێ دەكات و لەلاییێكی تریشەوە مافەكانی خۆی وەردەگرێ و بەشداری لە كارە راوێژكاری و كاروبارەكانی شارەكەی خۆیدا دەكات. شاریش دەبێ دەستوورێكی هەبێ بۆ ئەوەی پێوەندییە جۆربەجۆرەكانی نێوان كارەكانی خەڵكی بە تایبەتی كارەگشتییەكان رێك بخات. لە هەمانكاتیشدا دەستوور خۆی شێوە رێكخستنێكی سیاسی شارەكەیە كە بۆ رێكخستنەوەی ژیانی گشتی هاوڵاتیان داندراوە بۆ ئەوەی وەك كۆمەڵە كەسێك لە شارەكەدا بەشداری لە وەرگرتنی ماف و جێبەجێكردنی ئەركەكاندا بكەن.

بەمشێوەیە بۆمان روون دەبێتەوە و بوارییش بۆ هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە، كە هەرگیز لەلای ئەرستۆ ئەخلاق لە سیاسەت جیا نەكراوەتەوە و هەركەسێكیش بیەوێ لێكۆڵینەوەییێك لە فەلسەفە سیاسیەكەی ئەودا ئەنجام بدات دەبێ كتێبەكانی (ئەخلاق) و (سیاسەت) زۆر بە باشی بخوێنێتەوە، لە سەرەتای كتێبی (ئەخلاقی نیقۆماخۆس)دا وەك پێشتریش بینیمان ئەو بە دوای بنەچەی كۆمەڵگاكاندا دەگەڕێ و دەگاتە ئەو ئەنجامەی كە بنەچەی كۆمەڵگاكان بریتیە لە پێوەندیە سروشتییەكانی نێوان نێرو مێ. هەروەها ئامانجەكانی هەر چالاكییێكی مرۆڤ دەسنیشاندەكات كە ئەویش (خێر و چاكەیە)، یان بە دیهێنانی خێر و چاكەییێكە، دوای ئەوە دەگاتە ئەوەی كە سیاسەت ئەو زانستە بنچینەییەیە كە خێر چاكەو خۆشگوزەرانی بە دیدێنێ.

لەكۆتاییدا دەبێ ئەوە بڵێین: كە (یۆنانییەكان لەو باوەڕەدا بوون، كە تاكەكان بنچینەی دەوڵەتن و یەكێتییێكی بە هێز لە نێوانیاندا هەیە). ئەگەر هەڵسوكەوتە ئەخلاقییەكان چەند خەسڵەتێكی رەفتارەكانی تاك بن، كەواتە دەبێ چەند خەسڵەتێكیش بن لە رەفتارەكانی دەوڵەت، چونكە تاك هەر چەندە هاوڵاتییێكی ئەخلاقیە ئەوەندەش هاوڵاتییێكی سیاسیە. لێرەدا یۆنانییەكان ئەوەیان رەتكردەوە كە ئەخلاق بابەتێكی سەربەخۆ بێت، بەڵكو هاتن و لەگەڵ سیاسەتدا بە یەكەوە دایاننا. هەروەها سیاسەتیشیان لە ئەخلاق جیا نەكردەوە و پیادەكردنی سیاسەتیشیان بەكارێكی ئەخلاقی دادەنا، یان لە پێشەوەی كارە بێ خەوشییەكاندا دایان دەنا. واتە ئەوان وەك زانستێكی فیقهی مامەڵەیان لەگەڵ زانستی

سیاسەتدا نەکرد، بەڵکو بەوپێیەی کە فەلسەفەییێکی ئەخلاقیە و ئامانجێکی ئەخلاقییانەی گشتی لە بێخەوشیدا دەبینیێ کە خێر و چاکەکانی تاك و دەوڵەت وەکو یەك دەسنیشاندەکات. لێرەدا هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان وای بۆ دەچن کە فەیلەسووفە سیاسییەکانی گریك تەنها فەیلەسووف نەبوونە، بەڵکو هەندێك لە خەسڵەتەکانی پێغەمبەرایەتیشیان تێدا هەبووە، چونکە ئەوان تەنها لە رووی سیاسیەوە کاریان بۆ رێکخستنی دەوڵەت نەکردووە، بەڵکو کاریشیان بۆ پتەوکردنی بەرنامەی ژیانێك کردووە کە لە سەر بڵاوکردنەوەی وشیاری بنیاد نرابێ و نموونەی پرەنسیپە ئەخلاقییەکانیش بێت. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون کە ئەمانە تەعبیر لە سروشتی مرۆڤێکی خێرخواز دەکەن...)[١٨٦]. بە کورتیەکەی واتە ئەمانە تەنها فەیلەسووفی سیاسەت نەبوون، بەڵکو فەیلەسووفی ئەخلاقیش بوون، چونکە ئەخلاق و سیاسەت لەلای ئەواندا لە یەك پێناسەدا کۆ دەبێتەوە بە جۆرێك کە ناتواندرێ لە یەکتر جیا بکرێنەوە.

---

١٨٦ - د. عەبدولستار قاسم (فلسفة السیاسة التقلیدیة ) : ئەفلاتون و ئەرستۆ چاپخانەی ئوردنی ساڵی ١٩٧٩ لـ١٤ ـ ١٥ ـ.

# دەروازەی پێنجەم

## (بیری سیاسی لەلای موسڵمانەکاندا)

**(بە کارێکی قورسی و گرینگی نازانم ئەگەر ئێمە لە ئەسینادا بە شانو باڵی ئەسینییەکاندا هەڵبدەین، بەڵکو گرنگی لەوەدایە، کە ئێمە لە ئەسبێرتە بە شانو باڵی ئەسینییەکاندا هەڵبدەین! !)**

**ئەرستۆ، (گوتاربێژی) ١٣٧٦ ـ ب)**

**(دەبێ ئێمە لە ڕابردوودا نەخنکێین و رووی خۆمان لە داهاتوو وەرگێڕین، چونکە**
**گەرانەوە بۆ ڕابردوو و چەقبەستن لە سەر شێوەکانی ڕابردوو وەك ئەوە وایە ئێمە**
**خۆمان بۆ ناشتنی شارستانییەت ئامادە بکەین)**

**(وایتهد)**

## پێشدەست: .

زۆرجار هەندێك گوزارشت وا بەرەو روومان دەبنەوە، کە هەموویان گوزارشتی چەواشەکارانەن وەك: (سیستەمی دەسەڵات لە ئیسلامدا)، یان (سیستەمی دەسەڵاتی ئیسلامی)، یان (بیری سیاسی ئیسلامی) و..هتد، بۆیە دەبێ ئەمانە روونبکرێنەوە بۆ ئەوەی لە تێکەڵکردن و شێواندن دوور کەوینەوە.

لە بنچینەدا روونکردنەوەکان دەبێ پشت بە جیاکردنەوەی نێوان (باوەڕی ئیسلام)، واتە ئەو بیروباوەڕە بنچینەییانەی کە ئاینی ئیسلام لەگەڵ خۆیدا هێناوێتی واتە (بیری ئیسلامی) ـ ئەو هزرەیە کە لە بارەی بیروباوەڕ و شەریعەتەکانی ئیسلام دەدوێ، کە بە سروش هاتوونەتە خوارەوە ـ و نێوان (هزری موسڵمانەکان)، یان بیروڕای موسڵمانەکان رووندەکاتەوە، کە گوزارشت لە بیروبۆچوونی موسڵمانەکان دەکات لەبارەی چەندین بواری وەك مەعریفەو زانست، وەك زاناکانی بیرکاری و کیمیا و فەلەکناسی و فەیلەسووف و مێژوونووس، گوتارخوێنەکان، و...هتد ـ هەروەها دەتوانین چەندین جۆری تری بخەینە سەر لە بوارەکانی نووسیندا ـ کە ئەوانە چەند بیرمەندێکن بیروڕای خۆیان لەبوارە تایبەتییەکانی خۆیاندا دەردەبڕن، وەك جۆرەها زانست و زانیاری کە بیرمەندە موسڵمانەکان پێی هەڵساون لەو بوارانەی کە تێیدا پسپۆرن و بۆتە بەشێکی گرنگی ئەو شتەی کە ئەمڕۆ پێی دەڵێین: کەلەپووری عەرەبی ئیسلامی، بەڵام ئەمانە لەو خانەیەدا ناژمێردرێن کە پێی دەڵێین: (بیرو باوەڕی بنچینەیی) کە ئاینی ئیسلام، یان هزری ئیسلامی هێنابێتی، یان بڵێ هیچ پێویست بەوە ناکات لەسەر ئاینی ئیسلام ئەژمار بکرێت، بۆ ئەوەی لە نێوان بوارێك و بوارێکی تردا تووشی شێواندن و تێکەڵکردن نەبین، کە بە شێوەییێکی پراکتیکیش ئەو تێکەڵکردنە روویداوە، ئەوەش وامان لێ دەکات داوا لەو بیرمەندە موسڵمانانە بکەین کە هەوڵی ئەوە دەدەن لە چەند بوارێکی تایبەتدا هزری خۆیان بەکار بێنن، پابەندی ئەوەبن کە شتێك لە دەرەوەی بوارە زانستیەکەی ئەودابوو پێویست بەوە ناکات بە کاری بێنن[١٨٧].

١٨٧ - زەکی نەجیب مەحموود (في تحديث الثقافة العربية) دارولشەرق لە قاهیرە چاپی یەکەم ساڵی ١٩٨٧ لـ٤٦٥ ـ ٤٦٦ ـ.

ئەو جیاوازیە بنچینەییە سەرنجمان بۆ دوو راستی گرنگ رادەکێشێ کە ئەمانەن: ـ

**یەکەم: ـ** ئەوەی لە مەیدانی بیری سیاسیدا لەلایەن موسڵمانەکانەوە دەگوترێ، ئەو بیرە ئیسلامیە نین کە بەشێك بن لە باوەڕەکە، یان ئاینەکە و ئەو بیروڕایەش نییە کە ئیسلام لەبواری سیاسەتدا گوتوییێتی، بەڵکو ئەمانە هەر هەمووی بیروڕای بیرمەندە موسڵمانەکانن کە بیناکردنی دەوڵەتێکی دیاریکراویان بەو شێوەیە وێنا کردووە. تەنانەت ئەگەر هەندێك بیرۆکەشیان لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگرتبێ وەك بیرۆکەی (شوورا)، یان بیرۆکەی (دادپەروەری) و..هتد، ئەوان توێژینەوەو شیکردنەوەییێکی تایبەت بە خۆیانیان ئەنجام داوە.

**دووەم: ـ** ئەمە نە بێتاقەتکردنە و نە بە خراپ ناوهێنانیشە ئەگەر رەخنە لەوجۆرە بیروبۆچوونانە بگرین، چونکە ئەمانە بیرۆکەی سیاسین نەك بیرۆکەی (ئیسلام)ی، یان (ئەمانە نە ئاینن و نە بیر و باوەڕی ئاینین)، بەڵکو ئەمانە هەر هەموویان بیرۆکەی (فارابی) و (ئیبن ئەبی رەبیع) و (ماوەردی) و (ئیبن ئەزرەق) و (غەزالی) و (ئیبن خەلدوون)... و کەسانی ترن، بەڵکو پێویستە بڵێی دەبێ ئەو جۆرە بیروڕایانە رەخنەیان لێ بگیرێ، چونکە پێویست بەوە دەکات ناوە ناوە بیرۆکەکانی بیرمەندە موسڵمانەکان بخرێنە تای تەرازووی رەخنەوە، کە ئەمەش کێشەییێکی بنچینەییە بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی بیرۆکەکانی مرۆڤ. ئەگەر هەر جۆرە رەخنەییێکیان ئاراستە بکرێ با رادەی توندیەکەشی گەلێ زۆر بێ، ئەمە ئەوە ناگەیێنی کە تۆ لە (ئیسلام دەرچووی) واتە (مانای ئەوەنییە کە تۆ لە بیروباوەڕ و ئایین دەرچوویتە تە دەرەوە)، بەڵکو ئەمە لە ناو ماڵی ئیسلامدا دەکرێ، گرنگیەکەشی لەوەدایە کە کار بۆ گەشەکردن و پێشخستنی بیری موسڵمانەکان دەکات.

لە بیروڕا خراپەکان بۆ نموونە نووسەرێك دەڵێ: (ماوەردی لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی ئەو مەرجانەی دەبێ لە ئیمامدا هەبێ دەڵێ: مەرجی پێنجەم دادپەروەریە.. واتە دەبێ لە ئاخاوتندا راستگۆبێت و دەستپاکی پێوە دیار بێ و دەست بۆ شتە حەرامەکان درێژ نەکات و خۆی لە لۆمەی خەڵکی بپارێزێ..هتد). دوای ئەوە هەڵدەداتێ و دەڵێ ئیسلام هەر بەوەوە نەوەستا کە فەرمانڕەواکان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بخاتە ژێر رکێفی یاسا بنچینەییەکانەوە.. دواتر جارێکیتر دەگەڕێتەوە سەر ماوەردی و لە سەری دەدوێ[١٨٨]. وەك بڵێی کە بیروڕاکانی

١٨٨ - د. فاروق ئەلنەبهان (نظام الحكم في الاسلام) لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٨٧ لـ ٤١ ـ٤٢ ـ.

ماوەردی بیروڕای ئیسلام بن و بیرۆکەکانیشی بیرۆکەی ئیسلام بن، بێ ئەوەی هیچ جیاوازییێکیان لە نێواندا بکات!.

دوای ئەوە لە لاپەڕەی دواتردا دێتەوە سەر ئاخاوتنەکانی ئیمامی غەزالی، کە لە بارەی زیندووکردنەوەی زانستە ئاینییەکان کە لە بارەی (سولتانی زاڵم) و (ئیبن حەزم) گوتوویەتی و لەو بەشەی کە دەڵێ: (ئەو ئیمامە کێیە کە دەبێ ئێمە گوێڕایەڵی بین)[189]. ئینجا دێ و دەڵێ: ئیسلام هەر بەوەندەوە نەوستاوە کە ڕێگەی داوە، بەڵکو کردوویەتی بە ئەرك بەسەر موسڵمانەکانەوە کە لەو فەرمانڕەوایە هەڵگەڕێنەوەو گوێڕایەڵی نەبن[190].

دەبێ ئێمە زۆر باش ئاگاداری ئەو جۆرە تێکەڵکردنە بین کە لەنێوان ئەو شتەی (ئیسلام) گوتویەتی و ئەوەی بیرمەندە موسڵمانەکان دەیڵێن ڕوودەدەن، با ئەو کەسانە پلەو پایەی ئاینی و کۆمەڵایەتی، یان توانا ئەقڵییەکانیشیان بەرز بێت، یان لە بوارە ئاینییەکاندا شارەزایی زۆر باشیشیان هەبێ. . هەرچییێك بن ئەمانە تاکێکن لە مرۆڤ جارێك هەڵە دەکەن و جارێك ڕاست، بۆیە بە مافی خۆمانی دەزانین کە تەماشای ئەو بابەتانە بکەین کە ئەوان دەیاننووسن، چونکە نابێ لە ڕەخنە بەرزتر بن، یان کارەکانیان شتێکی پیرۆز بن، بە کورتیەکەی خۆ (ئاینی ئیسلام نییە)، بەڵکو چەند بیرۆکەییێکن بیرمەندە موسڵمانەکان نوسیویانە، بۆیە دەکرێ بەڵکو دەشبێ لە ژێر میکرۆسکۆبی ڕەخنەدا دابندرێن، تاوەکو ئەو هزرە بەرەو پێشتر بڕوا.

نووسەر خۆی لە ژێر ناونیشانی (دعائم النظرية السياسية في الاسلام)دا دەڵێ:(تیۆری سیاسی لە ئیسلامدا لەسەر ئەو چەند کۆڵەگە بنچینەییەدا وەستاوە کە تیۆرێکی جیاوازو سەربەخۆی لێ دروست دەکات کە شێوەییێك لە خۆ دەگرێ جیاواز بێ لەگەڵ تیۆرە سیاسییە کۆن و نوێیەکاندا)[191].

ئەگەر بشپرسین ئەو کۆڵەگانە کامانەن؟ لە وەڵامدا دەڵێ: تیۆری ئیسلامی لە حوکمڕانیکردندا لەسەر چەند کۆڵەگەییێکی پتەو وەستاوە کە ئەمانەن (خواپەرستی، یەکتاپەرستی، پەیام، جێنشینی)[192]. کە ئەمانە چەند شتێکن هیچ پێوەندییێکیان بە

---

١٨٩ - هەمان سەرچاوە لـ٤٣ـ.

١٩٠ - هەمان سەرچاوە لـ١٣١ـ.

١٩١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.

١٩٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.

سیستەمی فەرمانڕەواتیەوە نییە، بەڵکو چەند پرسێکن دەچنە خانەی باوەڕەوە، مەترسیەکە خۆی لێرەدا حەشارداوە ـ چونکە هەر رەخنەگرتنێك، واتە رەخنەگرتنە لە خودی باوەڕەکە خۆی ـ کە ئەمەش هەڵەییێکی روون و بەرچاوە!.

ئەوەی کە ماوەتەوە بیلێین: ئەوەیە: ئاواتە خوازم هەر موسڵمانێك کە دەیەوێ لە بوارەکانی بیری سیاسی، یان هەر بیرێکی تردا بنووسێ، خۆی وا دابنێ کە ئاخاوتن لەگەڵ خاوەن بیرو باوەڕێکی دیکەی وەك بووزییەکان، یان هیندۆسەکان، یان جیهانی خۆرئاوا، یان تەنانەت لەگەڵ ژاپۆنییەکاندا دەکات، لەبەر ئەوەی بە ئیسلامدا هەڵدان لە ناو موسڵمانەکاندا کارێکی ئەوندە قورس وگران نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە تۆ لە ناو خەڵکێکدا باسی سەرچاوەکانی ئیسلام بکەیت کە نایزانن دەبێ بیرۆکەی بە سوودو پڕمانایان پێشکەش بکەیت، نەك ئەو شتانەیان بۆ بلێیتەوە کە مەلای مزگەوتەکان رۆژانە دەیلێنەوە کە موسڵمانەکان پێشتر هەموو شتێك لە بارەی دەزانن، وەك ئەوەی ئەرستۆ لە دەمی سوکراتی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (شتێکی ئەوەندە ناخۆش نییە کە ئێمە لە ناو ئەسینییەکاندا بین و بە شانو باڵی ئەسینییەکانیشدا هەڵبدەین)[193].

---

١٩٣ - (محاورة منكساس لأفلاتون) لــ ٢٣٥ ــ.

# بەشی یەکەم

## (فەلسەفەی سیاسی لەلای  ئیبن ئەبی رەبیع)

### ( خۆشگوزەرانی گشتی لە رێزگرتن و مەزنکردن و گوێڕایەڵبووندایە بۆ پاشاکان)

**(ئیبن ئەبی ڕەبیع ـ سلوك المالك ـ)**

ئیبن ئەبی رەبیع کتێبێکی ناسراوی بە ناونیشانی (سلوك المالك فی تدبیر الممالك) داناوە، واتە رەفتارەکانی پاشا لە هەڵسووڕاندنی وڵاتەکەیدا، هەندێك لە مێژوونووسان ئەمە بە کارێکی گرنگ دادەنێن کە موسڵمانێك لە بواری بیری سیاسیدا پێی هەڵسابێ. هەرچەندە لەسەر دیاریکردنی کاتی نووسینی کتێبەکە و ئەو خەلیفەیەی کە کتێبەکەی ئاراستە کراوە ناکۆکییەکی زۆریان لەنێواندا هەیە، کە ئایا خەلیفە موعتەسەمە (٢١٨ ـ ٢٢٧ ك ـ٨٣٣ ـ٨٤٢ ز) کە هەشتەم خەلیفەی عەباسییەکانە، یان خەلیفە موستەعسەمە کە لە (٦٥٦ ك ـ ١٢٥٨ ز) دا کۆچی دوایی کردووە، ئەگەر چی لە راستیدا ئەو ناکۆکیە بۆ یەکلاکردنەوەی ئەوەیە، کە ئایا دەبێ کامەیان (فارابی)، یان (ئیبن ئەبی رەبیع) پێشەنگی بیری سیاسی بن لەلای موسڵمانەکاندا، ئەمەش پێوەندی بە ئێمەوە نییە[١٩٤].

ئەو کتێبە لە چوار بەش پێکهاتووە، بە پێشەکییێك دەست پێدەکات و بە دوا گوتە کۆتایی پێدێنێت کە (حیکمەت و ئامۆژگارین)، بەڵام لە پێشەکی کتێبەکەدا کە لە دوو لاپەڕە تێپەڕ ناکات، دەبینین نووسەر بە (الحمدلله الذي خلق الانسان في احسن تقویم وفضلّه وامره بمکارم الاخلاق..)[١٩٥] دەست پێدەکات، دواتر نووسەر ئەو هۆکارانە دەسنیشاندەکات کە هانی داوە ئەم کتێبە بنووسێ کە دوو هۆکارن. یەکەم: کتێبێك سەرنجی راکێشاوە کە باس لە پاراستنی تەندروستی لەش دەکات، بەڵام لەبەرئەوەی دەروونی کەسەکە لە لەش گرنگترە، کەواتە چاککردن و چاودێریکردن و گۆشکردنی ئەو ئەخلاقەی کە لە خودەوە دەردەچن گرنگترە لە لەش ـ لەبەر ئەم مەبەستە کتێبەکە داندراوە ـ. هۆکاری دووەم: خۆ نواندنی هەندێك لە پیاوە بەرزەکانی نەتەوەکەی بوو وای لێکرد کە ئەو (لێکۆڵینەوانە بخوێنێتەوە، کە لەبارەی ئەو هونەرە کراون، لێرەدا مەبەستم زانستەکانی ئەخلاق و ژیاننامەکانە)[١٩٦]، بەم شێوەیە هەر لە دەسپێکی کتێبەکەیدا بۆمان روون دەبێتەوە کە مەبەستەکانی نووسەر ئەخلاقین، هەرچەندە کتێبەکە باس لە هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی وڵات دەکات)، واتە کتێبێکە لە بارەی فەلسەفەی سیاسی نووسراوە.

---

١٩٤ - د. ناجی ئەلتکریتی (الفلسفة السیاسیة عند ابن ابي الربیع) بخوێنەوە و لەگەڵ کتێبی (سلوك المالك في تدبیر الممالك) دار ئەلئەندەلوس بەیروت ساڵی ١٩٨٣ دا بەراوردی بکە.

١٩٥ - هەمان سەرچاوەی پێشو لـ٨٥ ـ.

١٩٦ - هەمان سەرچاوەی پێشو لـ٨٧ ـ.

له بەشی یەکەمی کتێبەکەدا کە زۆر لە پێشەکی دەچێت نووسەر باس لەوە دەکات کە باوەڕبوون بەو خوایەی کە هەموو بوونەوەرەکانی دروست کردووە هەر لە سەرەتاوە ئەرکی سەر شانی مرۆڤ بووە. دوای ئەوە دەبێ باوەڕی بەوە هەبێ کە باشترین بەشەکانی جیهان رۆح لەبەرەکانن و باشترین رۆح لەبەرەکانیش ئەوانەن کە بە هۆشیاریەوە ویست و ئارەزوو و جموجوولەکانی خۆیان بە کار دەهێنن، لەمانەش هەر هەمووی باشتر (مرۆڤی بێخەوشە)، مەبەستیش لە دانانی ئەو کتێبەدا خستنە رووی ئەو کامڵبوونەی مرۆڤە کە لە ئەنجامی جێبەجێکردنی ئەو کردەوە چاکانەی فەرمانی پێکراوە کردوییێتی و ئەو کردەوە خراپانەی کە نەفرەتیان لێکراوە لێی دوورکەوتۆتەوە، بە دەستی هێناوە[197].

ئەو مەبەستەی کە ئیبن ئەبی رەبیع هەوڵی بۆ داوە ئەخلاقین، ئەمەش هەر لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا دەردەکەوێ، چونکە ئەو دەیەوێ بگاتە مرۆڤێکی کامڵ ـ کە جیاوازی لەگەڵ ئەو مرۆڤە کامڵانەدا هەبێ کە لەلای سۆفییەکانی ئیسلام هەن، مرۆڤی کامڵ لە لای ئەودا ئەو کەسەیە کە گوێڕایەڵی شەریعەتەکانی ئیسلام بێت و کردەوەی چاك بکات و لە خراپە دوورکەوێتەوە. هەر لەپێناوی ئەو ئامانجەشدا ئەو کتێبەی داناوە، کە تیایدا بە ئاینێکی تۆکمەو سوننەتێکی دادپەروەرانە ئامۆژگاری هەلسووڕاندنی کاروبارەکانی خەڵکی دەکات و تاکە سەرۆکێك ئاراستە دەکات کە دەبێ کامڵترین ئەو پلەو پایانەی مرۆڤایەتی تێدا هەبێت و ئەو سێزدە بێخەوشیەی بە دەسهێنابێ وەك: (دەبێ ئەندامەکانی لەشی ساغ بن، توانای بیرکردنەوەی هەبێ، رادەی تێگەیشتنی باشبێت، شتی لە بیر نەچێتەوە، بە خێرایی بیری بۆ شتەکان بچێ، زمانی پاراو بێ، حەز بە زانست بکات، خەڵکانی راستگۆی خۆشبوێ، نەکەوێتە دوای هەوەسبازییەکانی خۆی، نەفس بەرز بێت، دادپەروەر بێت، لە کارەکانیدا رشت بێت و نەکەوێتە دوای پارەو پوول و رابواردن[198]. دوای ئەوەی هەر سێزدە خەسڵەت و بێخەوشیەکە دەژمێرێت، ئەو وای دەبینێ کە هەر هەموو ئەمانە لە (بەرێز و گەورەو خاوەنی هەر هەموومان و خەلیفەی خودا لەناو خەڵکیدا، ئەو کەسەیە کە رێگاییێکی راستی گرتووە، موستەعسەم بیللا و ئەمیری ئیماندارەکان و نەوەی خەلیفەکانی راشدین و ئیمامە رێنیشادەرەکاندا بوونی هەیە..)[199].

---

١٩٧ - هەمان سەرچاوە لـ٩٢ ـ.

١٩٨ - هەمان سەرچاوە لـ ٩٣ ـ ٩٤ ـ.

١٩٩ - هەمان سەرچاوە لـ ٩٥ ـ ٩٦ ـ.

گومان لەوەدا نییە کە (ئیبن ئەبی رەبیع) ئەخلاق و سیاسەتی وەك ئاین و فەلسەفە تێکەڵ بە یەك کردووە. (ئەو دوای ئەوەی بە گرتنە بەری رێگەی چاك و دوورکەوتنەوە لە خراپە و پیادەکردنی سوننەتەکانی دادپەروەری ئامۆژگارییەکانی دەڵێتەوە، دەبینین باس لەو خەسڵەتانە دەکات کە دەبێ لە سەرۆکی شاردا هەبێ. بێگومان فەیلەسووفەکانی ئیسلام ئاگاداری بیری گریکەکان بوونە، ئەوان کە تەماشایان کرد سیاسەتیان بە بەشێك لە ئەخلاق خوێندۆتەوە، موسڵمانەکانیش هەر وەکو ئەوان سیاسەتیان لە ئەخلاق جیا نەکردەوە..)[200].

لە بەشی دووەمی کتێبەکەشدا ئیبن ئەبی رەبیع ئەوە بە بیری مرۆڤ دەهێنێتەوە کە تەنها مرۆڤە لە ناو گیانلەبەراندا خاوەنی بیرکردنەوە جیاوازەکانە، هەر لەبەرئەمەشە کە دەبێ خودی خۆی لەسەر چاکییەکانی ئەخلاق رابێنێ و خەسڵەتە چاکەکانی تێدا هەبێ و لە خەسڵەتە خراپەکانیش دوورکەوێتەوە و دەبێ مرۆڤ ئەخلاقە جوانەکان لە خودی خۆیدا پەرە پێبدات. ئەگەر خوێکی خراپیشی هەبوو دەبێ ددان بەو خوەدا بنێ و لە دژی بوەستێتەوە، هەر وەك چۆن پزیشك کاتێك کە پلەی گەرمی لەش لە رادەی ئاسایی زیاتر دەبێ، یان کەم دەبێ هەوڵدەدات بیگێڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی[201]. دوای ئەوە نووسەر مەبەستەکانی خوو و ئەخلاقەکانی مرۆڤ و هۆکاری جیاوازییەکانی نێوان مرۆڤەکان لەسەری شیدەکاتەوە. لەبەرئەوەی مەبەستەکانی ئەم کتێبە خستنەڕووی خۆشگوزەرانییەکانی خوو و ئەخلاقە[202]، لەو شیکرنەوەیەشدا کاریگەرییێکی تەواوی بیری یۆنانی پێوە دیارە، بە تایبەتی فەلسەفەکەی ئەفلاتون و ئەرستۆ، چ لە پێناسەکردنیدا بۆ خوو و ئەخلاق، یان لە شیکردنەوەی هەر چوار بێخەوشیەکەدا کە ئەمانەن: حیکمەت، پاکیزەیی و ئازایەتی، و دادپەروەری[203]. پێش ئێستا ئەمەمان لەلای ئەفلاتون بینی، کە پێی دەگوت سێ هێزەکەی دەروون: بیرمەندی، یان ژیری و تووڕەیی و لە کۆتاییشدا هەوەسبازی، ئینجا دەڵێ: کە سروشت و ئەخلاقەکان لە سەردەمێکدا بە هۆی ئەو بێخەوشیانەی کە پێشتر باسمان کرد لەو

---

٢٠٠ - هەمان سەرچاوە لـ ١١ ـ ١٢ ـ.

٢٠١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ١٠٢ ـ.

٢٠٢ - هەمان سەرچاوە لـ١٠٣ ـ.

٢٠٣ - هەمان سەرچاوە لـ١٠٧ ـ.

بنەچەو پرەنسیپانە پەیدا دەبن و لە کاتی زیادەڕۆیی کردندا لەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدات چەندین کردەوەی جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە[٢٠٤] . لێرەدا دەتوانین بڵێین ئیبن ئەبی رەبیع باسی (سیاسەتی) مرۆڤ دەکات بۆ خۆی کە بە کار وکردەوەی چاك دێتە دی، کە ئەویش هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە کامڵبوون.

بەڵام لە بەشی سێیەمدا باسی دابەشبوونی بوونەوەرەکان دەکات کە دابەشیان دەکاتە سەر چوار بەش: بەشی یەکەمیان ئەوانەی کە ئەقڵ وحیکمەتیان هەیە و سروشت و شەهوەتیان نییە، کە فریشتەکانن. بەشی دووەمیشیان کە سروشت و شەهوەتیان هەیە، بەڵام ئەقڵ وحیکمەتیان نییە ئەوانەش ئاژەڵەکانن بێ مرۆڤ. بەشی سێیەمیشیان ئەوانەن کە نە ئەقڵ وحیکمەتیان هەیە و نە سروشت شەهوەتیش، کە ئەمانەش بێ گیان و رووەکەکانن. بەشی چوارەمیش ئەقڵ وحیکمەتیان هەیە و لە هەمانکاتدا سروشت و شەهوەتیشیان هەیە کە ئەمانە مرۆڤەکانن. هەروەها ئیبن ئەبی رەبیع باسی جۆرەکانی ئەو رێچکە ئەقڵیە دەکات کە دەبێ مرۆڤ وەك ئەرکێك پەیرەوی بکات وکاری پێبکات، تێبینی ئەوەش دەکرێ کە ئەو ئامۆژگاریانەی لە هەردوو بەشەکەی پێشتردا باسی کردبوون لێرەدا زۆر دووبارەیان دەکاتەوە ـ لە گرتنە بەری رێگەی ئەو بێخەوشیەی کە ئەقڵ هاندەرێتی، واتە لەم بەشەشدا هەر لە بازنەکانی ئەخلاقدا دەخولێتەوە: وەك بێخەوشی و خراپەکاری و بوار و بەشەکانی و هەروەها بێخەوشییەکان و خراپییەکانی هەر هێزێك لە هێزەکانی دەروون هەر یەکە و بەجیا.[٢٠٥]

لە بەشی چوارەم وکۆتایی کتێبەکەشدا ـ کە دوا بەشی کتێبەکەیە و تایبەتە بە سیاسەت و حوکمەکانی سیاسەت ـ بە باسکردنی ئەو هۆکارە ئەرێنیانە دەست پێدەکات کە بۆ دامەزراندنی سیاسەت لە جیهاندا، شارەکان وەردەگرێ. دوای ئەوە دێتە سەر باسی ئەو هۆکارانەی پاڵی پێوە ناوە بۆ ئەوەی ئەو بەشە بنووسێتەوە کە مەزنکردن و ڕێزگرتنە لە پاشاکان، چونکە خودای مەزن بەشێك لە کەرامەتەکانی خۆی بە پاشاکان بەخشیوە، و تواناکانی خۆی پێداون لەسەر زەوی، دەبێ زاناکان رێزیان لێ بگرن و شکۆمەندیان بکەن (چونکە خودا خۆی ئەو فەرمانڕەوایانەی داناوە): ئینجا دوای هەموو ئەم شتانە دێ و بەم گوتەیە کۆتایی بە ئاخاوتنەکانی خۆی دەهێنێ و دەڵێ: (خۆشگوزەرانی گشتی لە رێزگرتن و

---

٢٠٤ - هەمان سەرچاوە لـ ١١٠ ـ.

٢٠٥ - هەمان سەرچاوە لـ ١١٤ ـ.

شكۆمەند راگرتن و گوێڕایەڵبوونی  پاشاكاندایە) ئەم گوتەیە ئەگەرچی تیۆرێكی رۆژئاواییە، بەڵام لەگەڵ ئەو پیرۆزیانەدا دەگونجا كە خەلیفەی عەباسییەكان چواردەوری خۆی پێ تەنیبۆوە، گەیشتبووە رادەیێك كە پێیان دەوت سێبەری خودایە لەسەر زەویدا. یان وەك ئەوەی كە مەنسوور زۆر بە روونی و راشكاوانە دەیگوت: (من سوڵتانی خودام لەسەر زەویەكەی ئەودا..)[٢٠٦]. بۆیە ئەو گلەییانە لە ئیبن ئەبی رەبیع دەكرێ، چونكە دەبووایە لە كۆمەڵگا بكۆڵێتەوە تا بزانێ ئەو هۆكارانە چین خۆشگوزەرانیان بۆ دەهێنن، بەڵام ئەو ئەوە لە بیری خۆی دەباتەوە: (كە كۆمەڵگە لەو كاتەدا شێوەیێكی هەرەمی هەبوو، واتە لە سەرەوە لە خەلیفەوە دەستی پێ دەكرد كە لە توانایدایە فلان و فیسار زانا لە دەوری خۆی كۆ بكاتەوە، یان دووریان بخاتەوە، هەروەها ئەگەر حەز بكات توانای لادان و دامەزراندنی هەركەسێكی هەیە لە سەركردە و وەزیرەكان ، هەروەها دەتوانێ هەرتاكێك لە كۆمەڵگادا دەوڵەمەند بكات، یان هەژار بكات..)[٢٠٧]. ئەمە مۆركێكە و لە كتێبە ناسراوەكەی فارابیشدا بە ناونیشانی (اراء اهل المدینة الفاضلة)دا دەیبینین.

ئیبن ئەبی رەبیع لەو باوەڕەدایە، كە دروستبوونی شارەكان وەك ـ پێشتریش ئەفلاتون ئاماژەی پێداوە ـ بۆ كەم توانایی مرۆڤ دەگەڕێتەوە لە هەندێك كاری بنچینەییدا وەك: خۆراك و جل و بەرگ و خانووبەرە و جووتبوون و چارەسەركرنی نەخۆشییەكان..هتد، چونكە  ئەو بە تەنیا ناتوانێ هەموو كارەكان ئەنجامبدا، لە بەر ئەوەی پێویستی بەو پیشە و زانستانە دەبێ كە ئەو كەل و پەلانەی پێ دروست بكات، بۆیە خەڵكی هەندێكیان پێویستیان بە هەندێكیان بوو، وای لێهات زۆربەیان لە شوێنێكدا كۆبوونەوە و هاوكاری یەكتریان كرد و شاریان هەڵبژارد بۆ ئەوەی لە نزیكەوە هەندێكیان سوود لەوانی تر وەربگرن [٢٠٨]. بەمشێوەیە بۆمان روون دەبێتەوە كە خەڵكی بەهۆی مشوور خواردن و سیاسەت كردن و فەرمان جێبەجێكردن ناچاری دەسبەرداری هەندێك لە مافەكانی خۆیان دەبن، ئەوانەی بەجۆرەش دەئاخافتن دەبێ ببنە دەسپێشخەر و نموونەی

---

٢٠٦ - ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (الطاغیة : دراسة فلسفیة لصور من الاستبداد السیاسي) لـ٢٥٣ ـ، چاپی سێیەم كتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٧ بەراورد بكە.

٢٠٧ - د. ناجی ئەلتكریتي (الفلسفة السیاسیة عند ابن ابي الربیع) لـ٢١ ـ.

٢٠٨ ـ هەمان سەرچاوە لـ١٧٥ ـ.

بەرزی خەڵکانی تر، چونکە ئەگەر یەکێك فەرمانی بە شتێك کرد، یان شتێکی ڕەت کردەوە، (دەبێ ئەو شتە یەکەمجار لە خۆیدا هەبێ ئینجا دوای ئەوە داوا لە خەڵکانی تر بکات بۆ ئەنجامدانی)[٢٠٩]. دوای ئەوە دەبینین زۆر ڕاشکاوانە هەموو جۆرە حوکمڕانییەکانی تر ڕەت دەکاتەوە تەنها حوکمڕانی پاشایەتی نەبێ کە تاکە یەك کەس حوکمڕانی تێدا دەگرێتە دەست کە ئەویش خودی پاشایە، (لەبەرئەوەی ئەگەر سەرکردەکان زۆربن سیاسەت گەندەڵ دەکەن..)، بۆیە شارێك، یا چەند شارێك تەنها پێویستی بە یەك سەرۆك هەیە و ئەوانی تریش بۆ تەواو کردنی کاریگەرییەکان و سیاسەتکردن دادەمەزرێندرێن، (دەبێ هاوکار و گوێگر و گوێڕایەڵ و جێبەجێکاری فەرمانەکانی ئەو بن، کە دەبێ وەك ئەندامەکانی لەش بن بۆ پاشا بۆ ئەوەی چۆنی بوێ وا بەکاریان بێنێ..)[٢١٠]، ئەمەش داوایێکی ڕاست و ڕەوانە بۆ حوکمڕانیکردنێکی ڕەها، سەرۆکی دەوڵەت دەبێ یەك کەسێك بێت بۆ ئەوەی سیاسەت گەندەڵ نەکات و دەبێ فەرمانەکانیشی وەك ئەرکێك جێبەجێ بکرێت و ڕەت نەکرێتەوە و دەبێ هاوکار و سیاسەتمەدارەکانی دەوروبەریشی گوێڕایەڵ و دەست لەسەر دەست بن بۆی، هەر فەرمانێکیش کە ئەو بیکات دەبێ جێبەجێبکرێ. ئیبن ئەبی ڕەبیع بەوەشەوە نەوەستاوە کە هاوکارەکان گوێڕایەڵ و دەست لە سەر دەست بن بۆی، بەڵکو دەڵێ: دەبێ ئەوانە وەك ئەندامەکانی لەش بن بۆی کە چۆنی بوێ وا بە کاریان بهێنێ. لێرەدا کەسایەتی پاشا چەند بەو کەسایەتیە دەچێ کە (فیرعەون) هەیبوو لە میسری کۆندا لە رووی پیرۆزی و شان و شەوکەت شکۆمەندییەوە!. ئیبن ئەبی ڕەبیع باسی داب و نەریتەکانی خۆ بە کەم زانینمان بۆ دەکات لە بەردەم حوکمرانێکی ڕەهادا: (کە ئەوەی بیەوێ بچێتە لای پاشا دەبێ بە پێوە بوەستێ و لە دوورەوە سڵاوی لێبکات، ئەگەر هات و ڕێی پێدا لێی بچێتە پێشەوە، کە لێی نزیك دەکەوێتەوە دەبێ زەویەکە ماچ بکات و لە لاییێکەوە بوەستێ)[٢١١]. و ئەو کەسانەی کە لەلای پاشا دانیشتوون، پێش

٢٠٩ - هەمان سەرچاوە لـ١٧٦ ـ.

٢١٠ - هەمان سەرچاوە لـ ١٧٦ ـ.

٢١١ - جاحظ بۆچوونێکی هاوشێوەی ئەو رایەی هەیە لە کاتی چوونە ژوورەوەدا بۆ لای پاشا، دەڵێ (ئەوانەی لە پیاو ماقوڵان و چینی بەرزن کە دەچنە ژوورەوە، ئەگەر پاشا ڕێگەی پێدان بچنە پێشەوە، کە لە پاشا نزیك

ئەوەی پرسیار و وەڵامی ئاراستە بکرێ نابێ هیچ قسەییێك بكات، ئەگەر پرسیاریشی ئاراستە کرا، کە پاشا لە پرسیارەکەی بۆوە دەبێ یەکسەر هەستێتەوە سەر پێ و لەکاتی وەڵامدانەوەدا دەنگی بەرز نەکاتەوە و نابێ لە بەردەمیدا ئەندامەکانی لەشی بجووڵێنێ، یان زۆر ئاوڕی دواوە بداتەوە، یان قسەی پێ ببڕێ، هەروەها ئەگەر پاشا خۆی داوای لێ نەکردبێ نابێ دووجار بابەتێکی بۆ دووبارە بکاتەوە هەروەها دەبێ بە ئامۆژگاری و سوپاسگوزاری و چاکە و پاراستنی نهێنی خزمەتی پاشا بکات، ئەگەر بێت و ئەو کەسەی ئەو ڕێنماییانەی سەرەوە پەیڕەو بکات، ئەو کەسە شایانی کرانەوەی بەخت و سەلامەتی و دڵخۆشی و بەدیهاتنی ئاواتەکانی دەبێ[٢١٢]. (دەبێ ئەوەش بزانی کە سەرۆك وەك ئەو لێزمە بارانەیە کە بە گوڕ لە ئاسمانەوە دادەبارێتە خوارەوە، ئەوەی بەرەنگاری ببێتەوە خۆی تێدەچێ..)[٢١٣].

هەروەها ئیبن ئەبی رەبیع دێتە سەر کۆڵەگەکانی دەوڵەت و لەبارەیانەوە دەڵێ: کۆڵەگەکانی دەوڵەت چوار کۆڵەگەن کە ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ پاشا. ٢ ـ کۆمەڵانی خەڵك. ٣ ـ دادپەروەری. ٤ ـ هەڵسووڕاندنی کارەکان.

واتە پاشا و کۆمەڵانی خەڵك و ئەو پێوەندیانەی لە نێوانیاندا هەیە.

بەڵام هەرچی پاشایە پێش ئیستا باسمان لەو کەسایەتیە پیرۆز و نیمچە خواوەندیەی پاشا کرد، نووسەر چەند خەسڵەتێکی تری بۆ زیاد دەکات وەك: ورەی بەرز و ئارامگرتن لە رۆژانی تەنگانەدا و بیروڕای بەهێز و بەهێزی و ئازایەتی و ئەمانە سەرەڕای مراندنی شەهوەت و هەوەسەکانی و دوورکەوتنەوە لە ئەخلاقی توند و تەمبەڵ نەبێ و لە جموجۆڵدا لەسەرەخۆ بێت و ئەندامەکانی لەشی ساغ و دروست بن و شێوەی ڕێك و پێك بێت و شەوانە کارەکانی رۆژانەی تاوتوێ بکاتەوە و بتوانێ سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا رابکێشێ و خۆی بە ناو هێنانی خوا و سوپاسگوزاری خواوە خەریك بكات و دادپەروەری لە بەر چاو بگرێ..هتد.

---

دەکەوێتەوە دەبێ لە سەر دەستەکانی بەدەمدا بکەوێت و دەست و پێی پاشا ماچ بکات و دوای ئەوە لە لاییێکەوە بوەستێ) تەماشای سەرچاوەی پێشوو بکەن لـــ٦٥ ــــ.

٢١٢ - هەمان سەرچاوە لـــ١٦٥ ــــ.

٢١٣ - هەمان سەرچاوە لـ٦٤ ـــ.

بەڵام نووسەر کۆمەڵانی خەڵکی دابەش دەکاتە سەر چەند توێژێك، لەوانە خواپەرستەکان ئەوانەی وازیان لە دونیا هێناوە و خەریکی خودا پەرستین و حەکیمەکان ئەو کەسانەن کە رویان لە زانست کردووە، وەك پزیشکی و بیرکاری و ئەندازە و هەندێك لە زاناکان ئەوانەی کە میراتگری پێغەمبەرەکانن و خاوەنی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکانن و ئینجا خەڵکی گوندەکان دێ کە کاری چاندن وکێڵانی زەوی وزار و نەوە خستنەوە ئەنجام دەدەن، دابەشیان دەکاتە سەر سێ بەش: هەڵبژاردەکان و پیاو چاکەکان، یان شەڕخواز و خراپەکارەکان کە وەك شێری ئازار بەخش وان و مام ناوەندەکان، ئەمانە هەندێك جار بەلای چاکەدا و هەندێك جاریش بەلای خراپەدا دەشکێنەوە. ئیبن ئەبی رەبیع دێ و هەندێك بیروڕای نامۆ دەخاتە روو، (وەك پاڵپشتێك بۆ حوکمڕانییە رەهاکەی پاشا) دەڵێ: دەبێ پاشا هاوڵاتیان بە ئیشوکارەوە سەرقاڵ بکات بۆ ئەوەی کاتی ئەوەیان نەبێ دەست لە کاروبارەکانی پاشا وەربدەن، چونکە دەست خستنە ناو کاروبارەکانی دەسەڵاتەوە ئیشی ئەوان نییە! ئەو وای بۆ دەچێ کە پاشا لە بەرامبەر خەڵکیدا وەك پزیشك وایە لە بەرامبەر نەخۆشەکەیدا، پزیشك ئامانجی ئەوەیە نەخۆشەکەی خۆی چاك بکاتەوە، هەروەها ئامانجی فەرمانڕەوای رەهاش ئەوەیە بەرژەوەندییەکانی خەڵکەکەی خۆی بهێنێتە دی!.

ئیبن ئەبی رەبیع بەم شێوەیە پێناسەی دادپەروەری دەکات، کە حوکمڕانی خودای مەزنە لەسەر زەویدا. نووسەر ئاماژە بەوە دەکات کە هەر هەموو نەتەوەکان سەرەڕای جیاوازی ئاینزاکانیشیان، پەنجە بۆ شەرەفمەندی دادپەروەری درێژ دەکەن وکەسیان نییە داوا نەکات پەیڕەو بکرێت و چاکەو بێخەوشییەکانیشی نەزانێ چیە. یەکێك لە کارەکانی دادپەروەری ئەوەیە کە هەر کەسەو بەپێی مافی خۆی مافەکانی خۆی بدرێتێ و لە جێگەی خۆی بێ و لەو رێ و ڕەسمانەی کە بۆی دانداروە لانەدات، هەروەها راستگۆ بێت و پەیمانەکان بپارێزێ و دڵنەرم بێ و لە خراپەکاری بە دووربێ و وەفادار و دەسپاك بێت...هتد.

لەلای ئیبن ئەبی رەبیع هەڵسووڕاندنی کارەکان بە مانای: ئاوەدانکردنەوە و دروستکردنی شار و پاراستنی خەڵکی بە هۆی سەربازەکانییەوە و بە هێزکردنیان و خەملاندنی پارە و پوول ومولك ومالەکان بۆ ئەوەی لە رۆژی تەنگانەدا بە کەڵك بێت، بۆ دروستکردنی شاریش چەند مەرجێك دادەنێ وەك: راکێشانی ئاوی خواردنەوە، و

دروستکردنی ڕێگا و بان و شەقامەکان و دروستکردنی مزگەوتێك لە ناوەڕاستی شار و چەند بازاڕێکیشی بۆ دابنێ.. هتد.

ئەگەر کەسایەتی پاشا ئەو کەسایەتییە سەرەکییە بێ و لە هەمووان گرنگتر بێ وکەسایەتی وەزیریش لە دوای ئەو بێ، وەك ئەوەی لە میسری فیرعەونیدا لە کاتی باسکردنی ڕێکخستنە سیاسییەکان تێبینیمان کرد ـ بەڕای ئیبن ئەبی ڕەبیع وەزیر لە هەموو شتێکدا بەشدارە و هەڵیاندەسووڕێنێ و پارێزگاری لە کۆڵەگەکانی دەوڵەت دەکات، بۆیە ئەو کەسەی کە دەبێتە خەلیفە، یان پاشا دەبێ وەزیرێك بۆ خۆی دابنێ کە توانای ڕێکخستنی کاروبارەکانی وڵاتی هەبێ و بتوانێ دیاردەکانی ڕۆژگار چارەسەر بکات. یەکێك لە خەسڵەتەکانی وەزیر ئەوەیە کە دەبێ شارەزاییێکی باشی لە کاروبارە ئاینییەکاندا هەبێ، لەبەرئەوەی بڕبڕەی پشتی پاشا ئاینە. هەروەها دەبێ ژیر و نەرم و نیان بێ، زمانی شیرین بێ و لە نووسیندا ڕاستییەکان بپارێزێت و لەناو خەڵکیدا ئەخلاقی باش بێت و کەم خەریکی ڕابواردن بێ و زوو هەڵنەچێ و نهێنی پارێز بێ و ئارام و لەسەرخۆ بێ و لەش ساغ و بیر تیژ بێ.. هتد[٢١٤]. دوای ئەوە ئیبن ئەبی ڕەبیع دێتە سەر باسکردنی (نووسەرەکان) بە هەر چوار جۆرەکەیەوە و هەروەها سکرتێرەکەی پاشا کە ڕێخەری پێوەندییەکانی نێوان پاشاو ئەو کەسانەیە کە دەیانەوێ چاویان بە پاشا بکەوێ و بە شێوەییێك خەڵکەکە ڕێکدەخات کە لەگەڵ پلەو پایەی پاشادا بگونجێ. دوای ئەوەش دێتە سەر باسی (دادوەر) کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان تەرازووی پاشایە و خەسڵەتەکانی دادوەر دەبێ ئارام و لەسەرخۆبێ و بە شان و شەوکەت و ژیر و زانابێ، زیرەك بێ و زوو شت وەربگرێ و لەکاروبارەکانی دادوەریدا شارەزابێت.. هتد. هەروەها دێت و باس لە بەڕێوەبەری پۆلیس دەکات و دەڵێ: دەبێ بە شان و شەوکەت و لەسەرخۆ بێت و دەستپاکبێ و لەگەڵ پیاوخراپانیشدا توندو تیژبێت.. هتد. لە بارەی ئەو سەرکارەش دەدوێ کەپارە کۆ دەکاتەوە و دەڵێ: (دەبێ شارەزای کاروبارەکانی خەڵکی بێت و پاك وبە ویژدان بێ، دەبێ مەبەستی لە کۆکردنەوەی ئەو پارەو پوولەی کە لە خەڵکی وەردەگرێ ئەوەبێ بیخاتە سەر موڵك و ماڵی سوڵتان. دوای ئەوە دێتە سەر باسی (حەکیمەکان) واتە ـ

٢١٤ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ١٩٤ ـ.

پزیشك ـ كه دەبێ شارەزای كاروبارە پزیشكییەكان بێ و كتێبە كۆنەكان بەباشی بخوێنێتەوە و وریا و نەرم و لە سەرخۆ بێ. ئینجا دێتە سەر باسی ئەو كەسانەی كە لەلای پاشا دادەنیشن كە دەبێ ژیر وگوێڕایەڵ و رۆح سووك بن و ئەخلاقیان باش بێ و جل و بەرگەكانیان پاك و خاوێن بێ، وشارەزاییان لە زمان وزانستی رێزمان و رۆشنبیریدا هەبێ، و لە قسەكردندا زمانیان پاراو بێ. دواجار دێتە سەر باسی بەرپرسی خواردن و خواردنەوە، كە دەبێ دەسپاك و جێگای متمانە بێ و ژیرو سەربەست بێ، و بە شان وشەوكەتی پاشادا هەڵبدا و پاشا رازی بكات [215].

ئیبن ئەبی رەبیع بە كۆمەڵێك پەندو ئامۆژگاری و نوكتە، و حەكایەت و قسەی نەستەق و قسەی پێشینان و قسەكانی كەسانی زیرەك و بلیمەت كۆتایی بە كتێبەكەی دەهێنێ [216].

٢١٥ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٢٠٤ ـــ.

- ٢١٦ هەمان سەرچاوە لـــ ٢٠٧ـ ٢١٩ ـــ.

## دوا گوتە:

دوای ئەوەی کتیبی (سلوك المالك فی تدبیر الممالك)ی ئیبن ئەبی رەبیعمان خستە روو، دەتوانین ئاماژە بە کۆمەڵێك سەرنج و تێبینی بدەین کە بە شێوەییێکی بەردەوام لەلای نووسەرانی بیری سیاسی لەناو موسڵمانەکاندا وەك: فارابی و ماوەردی.. هتد دووبارە دەبنەوە، کە ئەمانەی خوارەوەن: ـ

**یەکەم:** دەبینین گرنگییێکی زۆر بە سەرۆکی شار دەدرێ، چونکە کەسایەتییێکی سەرەکییە و شایانی چاودێریکردنە، هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین کە سەرۆك فەرمانڕەواییێکی رەهایە و بەتەنیا حوکمڕانی دەکات و کەس ناتوانێ قسە لە قسەیدا بکات و هەرچی پلەدارەکانی تریشە تەنها یاریدەدەر و دارو دەستەی ئەون، دەبێ گوێڕایەڵ و دەست لە سەر دەست بن بۆی و فەرمانەکانی (ئەمیری باوەڕداران) و (خاوەنی خێرو خۆشییەکان) جێبەجی بکەن.

**دووەم:** گرنگییێکی زۆر بەو خەسڵەتە ئەخلاقیانەی سەرۆکی شار دەدرێ، کە ئیبن ئەبی رەبیع سێزدە خەسڵەتی لێ باس کردووە، دوای ئەوە لە دوو روویێکی روون و ئاشکرادا دەڵێ: ئەمانە هەرهەمووی لە کەسایەتی گەورەو خاوەنشکۆ و مەولاو خودانماندا بوونی هەیە، چونکە ئەو خەلیفەی خودایە بە سەر بەندەکانییەوە و رێگاییێکی راستی گردتۆتە بەر.. هتد[٢١٧]. ئێستا دەبێ هەمان ئەو رستەیە بە شێوەییێکی بەردەوام بەو فەرمانڕەوا رەهایانەی کە ئێستا لەسەر کورسی دەسەڵاتدا دانیشتوون بگوترێتەوە.!

**سێیەم:** زۆر گرنگی بە هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا، یان (سەرۆکی شار) داوە، چونکە ئەو لە ئاسمانەوە بۆ خەڵکی هاتۆتە خوارەوە، وەك ئەوەی پێشتر بینیمان کە دەڵێ: (خودا خۆی ئەو پاشایانەی داناوە، وەك ئەرکێك دەبێ زاناکان رێزیان لێ بنێن بە شکۆمەندی لێیان بڕوانن و شان و شەوکەتیان بەرز راگرن...هتد).

**چوارەم:** لێرەدا تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت بە روونی دەردەکەوێ، ئەو کتێبەی لە بارەی (تدبیر المالك) واتە لە بارەی فەلسەفەی سیاسی نووسیوێتی و لە چوار بەش پێك

---

٢١٧ - هەمان سەرچاوە لـ٩٦ ـ.

دێ، سێ بەشیان باس لە بێخەوشی و چاکەکانی ئەخلاق دەکات. تەنها لە بەشی چوارەمیدا باسی سیاسەت دەکات، کە ئەویش لە باسکردنی بێ خەوشی و نەریتە گشتییەکاندا بێ بەش نییە...هتد.

**پێنجەم:** تێبینی ئەوە دەکەین کە بنیاتنانی دەوڵەت لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێدەکات، کە تێیدا گرنگترین کەسایەتی، کەسایەتی پاشایە، یان خەلیفەیە، یان سەرۆکی دەوڵەتە، یان فەرمانڕەواییێکی رەهایە و دوای ئەو کەسایەتی وەزیر دێ، ئینجا حوکمڕانی هەرێمەکان و دادوەرەکان دێ... تا دەگاتە گەل کە پێی دەڵێن: (خەڵکی رەشۆکی)، کە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا نە پرس و رای پێ دەکرێ و نە هیچیشی بە دەستە، بەڵکو ئەگەر هات وخۆی لەکارێکدا هەڵقورتاند یەکسەر پێی دەڵێن: ئەمەیان کاری تۆ نییە. ئەمەش پێچەوانەی ئەو سیستەمە سیاسییانەی ئێستایە کە گەل خۆی تاکە سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە و هەرخۆی خاوەن وشەی یەکەم وکۆتاییە، هەرخۆشی فەرمانڕەواکان هەڵدەبژێرێ و تەنهاخۆشی دەتوانێ لە دەسەڵات بیانهێنێتە خوارەوە...هتد.

**شەشەم:** هەروەها ئەو بینا قوچەکیەی کە باس لە وشەی (سیاسەت)ی عەرەبی دەکات، کە ئەو وشەیە لە (ساس، یسوس، سائس) ی عەرەبی وەرگیراوە کە مانای راهێنانی (بەرزە وڵاخە) وەك ئەوەی بڵێی ئەو فەرمانڕەوایە، یان ئەو پاشایە، یان ئەو خەلیفەیە ـ وەك کۆمەڵە ئاژەڵێك!ـ یان لانی کەم کۆمەڵە خەڵکێکی (نەفام) ـ و بۆ خێرو چاکەی ئەوان خەڵکەکە رابهێنێ. ئەمەش پێچەوانەی ئەو وشە ئینگلیزیەیە کە دەڵێ (Politics)، یان ئەو وشە فەرەنسیەیە (Politique) کە لە وشەی Polis)) ی یۆنانی وەرگیراوە کە مانای ئەو هاوڵاتیانە دەگەیێنێ کە شاریان پێکهێناوە، بگرە هەندێك جاریش بە (مانای هاوڵاتی تاکیش بە کار دەهێندرێ و بە خەسڵەت و مافەکانی هاوڵاتیان، یان ژیانی هاوڵاتیانیش بە کاردێ بەو پێیەی کە هاوڵاتین[٢١٨]). کەواتە لێرەدا سیاسەت لە خوارەوەڕا، واتە لە خەڵکیەوە، لەگەلەوە دەست پێدەکات و لە لووتکە واتە لە فەرمانڕەوا کۆتایی پێ دێ و لە نەریتەکانی ئێمەدا ئەمە بە پێچەوانەوەیە: بۆیە زۆرجار خەلیفە، یان پاشا بەو پزیشکە وەسف دەکرێ کە نەخۆشییەکانی خەڵکی چارەسەر دەکات، یان بە راهێنەری وڵاخ (بەمانا حەرفیەکەی

٢١٨ - سەرچاوەی پێشوو : (النظم السیاسیة ) دار ولنەهزە ئەلعەرەبیە ساڵی ١٩٨٩ لـــ٤ـــ.

وشەی (سائس))، یان بەو شوانە وەسف دەکرێ کە خەڵکی وەك رانە مەڕ بەڕێوەدەبات ـ لێرەدا وشەی سیاسەت)ی عەرەبی(ئەخلاق و سیاسەتی لە یەك پێناسەدا کۆکردۆتەوە، ئیبن مەنزوور لە (لسان العرب)دا دەڵێ: (بنەچەی سیاسەت لە (سوس)ەوە هاتووە واتە سەرۆکایەتی. هەروەها سوس بە مانای سروشت، رەفتار و ئەخلاقیش دێ. سیاسەت، بەڕێوەبردنی ئەو کاروبارانەیە کە بۆ خەڵکی باشن. هەروەها سیاسەت بە مانای کاری راهێنانی ئەسپیش دێ کاتێك کە مەشق بە ئەسپەکە دەکات. والیش خەڵکی و دارودەستەکەی رادەهێنێ و سوس واتە: خو و ئەخلاق..)[٢١٩].

**حەوتەم:** لەوانەیە سەیرترین شت ئەوەبێ کاتێك کە لێکۆڵەری کتێبەکە دەڵێ (ئێمە دەبینین ئیبن ئەبی رەبیع لە چارەسەرکردنی کێشە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئیدارییەکاندا کەسێکی سەردەمیانەیە. ئێمە دەتوانین سیفەتی نەمری بدەینە زۆرێك لەو بیرۆکانەی کە کێشەکانی سەردەمی خۆی پێ چارەسەرکردووە، ئێمە کاتێك لێی ورد دەبینەوە دەبینین چاکەیێکی زۆری بۆ ئەو سەردەمەی ئێمە کردووە. لە هەمان کاتدا پابەند نییە بە شوێنێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو لە هەموو شوێنێکدا بە کەڵك دێ جێبەجێ بکرێ..)[٢٢٠]. ئەگەر پرسیارێك لە بارەی ئەو بیرۆکانە بکەین کە دەڵێ: جێبەجێکردنی لە هەموو کات و شوێنێکدا باشە، لەوکاتەدا وەڵامێکی زۆرنامۆمان دەست دەکەوێ، ئەویش (ئەو خەسڵەتانەیە کە ئیبن ئەبی رەبیع باسی دەکات کە دەبێ لە سەرۆکی شاردا هەبێ..) ئایا ئێستا کام گەل لە گەلانی جیهاندا هەیە حەز بکا سەرۆکەکەی ئەو خەسڵەتانەی تێدا هەبێ، یان کامە بیرمەند خەو بە (شارە بێخەوشەکەوە) دەبینێ و حەز بەوە دەکات کە سەرۆکی ئەو شارە بێخەوشە ئەو خەسڵەتانەی تێدابێت)!. ئەوەی راستی بێ ئێستا تۆ هیچ بیرێکی سیاسی نادۆزیتەوە بە لای ئەو (شارە بێخەوشەدا) بچێ، یان فەرمانڕەواییێك یەك بەیەکی خەڵکی بەسەر بکاتەوە (یان گرنگترین ئەو شتانەی تێدا بێ وەك: دەبێ ئەندامەکانی لەشی ساغ و سەلامەت بن[٢٢١]، و ئاستی تێگەیشتنی باش بێت و شارەزایی لە کاروباری

---

٢١٩ - ئیبن مەنزوور (لسان العرب) دار ئەلمەعاریف لە میسر بەرگی سێیەم لـ ٢١٤٩ـ .

٢٢٠ - د. ناجی ئەلتکریتی (الفلسفة السياسية عند ابن ابي الربيع) لــ٧٢ــ.

٢٢١ - لەوانەیە ئەو مەرجەی کە تایبەتە بە لەش ساغیەوە کە دەبێ لە فەرمانڕەوادا هەبێ بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە فەرمانڕەوا خۆی لە شەڕەکاندا پێشەوایەتی سوپای دەکرد ئەم شێوە کارەش لە کۆمەڵگا

ئاینیدا هەبێت!). ئینجا تۆ بیهێنەوە پێش چاوی خۆت کە سەرۆکی ئەمریکا وەستابێ و شانازی بە لەشساغی خۆیەوە بکات، بە بۆچوونی تۆ دەبێ گەلی ئەمریکا کاردانەوەیان چی بێ و چی پێ بڵێن؟. بێگومان یەکسەر پێی دەڵێن، پیاوێکی سەر جادەش بێنە لەشی ساغ و سەلامەتە و ئاستی تێگەیشتنی باشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانای بەڕێوەبردنی وڵاتی نییە، لە کاتێکدا (فرانکلین رۆزفێلت) (١٨٨٢ ـ١٩٤٥) لە سەردەمی شەڕی جیهانی دووەمدا ـ واتە لە کاتێکی زۆر ناخۆش و دژواردا ـ لە سەر کورسییێکی گەڕۆکدا سەرۆکایەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای دەکرد ـ کە نەخۆشی ئیفلیجی هەبوو ـ ئینجا لە ساڵی ١٩٤٠ دا بۆ جاری سێیەم بە سەرۆکی ئەمریکا هەڵبژێردرایەوە کە تا ئەو کاتە شتی وا رووی نەدابوو ـ و سەرکەوتنێکی زۆر گەورەی بە دەست هێنا! یان لەگەڵ مندا بیهێنە پێش چاوی خۆت کە سەرۆکی حیزبی کرێکاران ـ یان پارێزگاران لە بەریتانیا لە شوێنێکدا وەستاوە و دەڵێ: من شارەزاییێکی باشم لەکار و بارەکانی دونیا و دوارۆژدا هەیە ـ ئایا ئەمە دەبێتە ئەو شتەی کە خەڵکی بەریتانیا پێی رازی بن و بۆ سەر کورسی دەسەڵات هەڵیبژێرن؟ ئەگەر بێت و بڵێین گوتەکانی ئیبن ئەبی رەبیع ئاراستەی رۆژئاواییەکان نەکراوە، بەڵکو تەنها ئاراستەی رۆژهەڵاتییەکان کراوە، ئەوسا ئێمەش دەڵێین کەواتە ئەمە مانای ئەوە دەگەیێنێ کەبەشوێنێکی دیاریکراوەوە بەستراوەتەوە! هەروەها کام فەرمانڕەوا خودی خۆی دەتوانێ هەموو کاروبارەکانی خەڵکی بە سەر بکاتەوە، لەوانەیە سەرۆك هۆزێك، یان فەرمانڕەوای شارێکی بچووك و دواکەوتوو بتوانێ ئەمە بکات، واتە پشت بە کەناڵەکانی دیموکراسی نەبەستێ کە نوێنەرەکانی گەل رووداو و داواکارییەکان دەخەنە بەر دەستی حکومەت و داوای وەڵامەکەشی دەکەنەوە.

---

کۆنەکاندا باو بوو، هۆزە عەرەبەکانی پێش ئیسلام کاریان پێ دەکرد کە دەبووایە لە کاتی جەنگدا پیاوەکانی عەرەب لەژێر فەرماندەیی ئەمیر بوونایە).. هەروەها بە فەرمانڕەوایان دەوت (ئەمیری سوپاکان)، بۆیە دەبووایە سوارچاکێکی ئازا بووایە و لە سواری ئەسپدا شارەزابووایە...هتد ـ ئەمانە چەند خەسڵەتێك بوون بۆ ئەو سەردەمە زۆر پێویست بوون، بەڵام ئێستا ئەو مەرجانە بۆ ئەو کەسەی دەبێتە دەسەڵاتدار هەر بیریشی لێ ناکرێتەوە، (تەها حوسێن) (کە هەردوو چاوی کوێر بوو) وەزیری پەروەردە بوو و لە هەموو ئەو کەسانەش باشتر بوو کە هەمان ئەو پۆستەیان پێ سپێردرابوو! ئێستا ئەو مەرجانە بۆ ئەو کەسانەی دەسەڵات دەگرنە دەست نەماون کە دەبێ نێر بێ وهەموو هەستەکانی دروست بن.

**هەشتەم:** لەو حاڵەتەدا گەل هیچ ڕۆڵێکی نابێ و هیچ بەهاییێکی بۆ داناندرێ، ئەرکی سەرەکی ئەو ئەوەیە کە گوێڕایەڵ بێت و دەست لە سەر دەست بوەستێ، وەك مێگەلە مەڕێك کە شوانەکە دەیداتە پێش خۆی بۆ ئەو شوێنەی کە خێر و چاکەی لێیە و دەیانباتە ئەو شوێنەی لەوەڕی باش و ئاوی سازگاری لێیە.! بەڵکو ئیبن ئەبی ڕەبیع بڕیارێکی زۆر سەیر دەدات، کە ئەویش ئەمەیە، (خۆشگوزەرانی گشتی لە مەزنکردن و ڕێزگرتن و گوێڕایەلبووندایە بۆ پاشاکان...)[222]. ئەمە ئەو پەڕی کۆیلایەتیە! لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لێکۆڵەرە وای دەبینێ کە ئێمە (ناتوانین بە چاوێکی سەردەمیانە سەیری کێشەکان بکەین، بەڵکو لە ڕاستیدا دەبێ ئێمە ئەوە بهێنینەوە بیری خۆمان کە خەلیفەکانی عەباسی خۆیان بە سێبەری خودا حسێب دەکرد لەسەر زەوی، خەلیفە هەردوو سەرۆکایەتی دونیایی و ئاینی لە دەستی خۆیدا گرتبوو)[223]، بەڵام ئەمەش بەس نییە بۆ پاکانە کردن لەو گوتەیەی کە دەڵێ ئەرکی خەڵکی ئەوەیە کە خۆشترین خۆشگوزەرانییەکانی خۆی لەوەدا بدۆزێتەوە کە ببێتە کۆیلەو  گوێڕایەڵ و ملکەچی پاشا بێ و لەوە زیاتر هیچی تر نەکات! و نەشتوانێ هیچ رەخنەییێك ئاراستەی ئەو کۆکردنەوەیەی نێوان دەسەڵاتی دونیایی و ئاینی بکات، ئینجا پێشمان بڵێن ئەم گوتەیە بۆ هەموو شوێن سەردەمێك دەس دەدات!.

---

٢٢٢ - (سلوك المالك فی تدبیر الممالك) لێکۆڵینەوەی ناجی ئەلتکریتی ـدار ئەلئەندەلوس بەیروت چاپی سێیەم ١٩٨٣ لـ١٧٤ـ.

٢٢٣ - هەمان سەرچاوە.

# بەشی دووەم

## (فەلسەفەی سیاسی لەلای فارابیدا)

**(هۆکاری یەکەم کە (خوداوەندە) بە پێی پلەو پایەکەی بەرامبەر بە بوونەوەران چۆنە، پاشای شارە بێخەوشەکەش بەرامبەر بە دانیشتوانی ئەو شارە لەهەمان پلەو پایەدایە )).**

**(فارابی): (آراء اهل المدينة الفاضلة)**

**(هەڵسووڕێنەری ئەو شارە زۆر بەهۆکاری یەکەم دەچێ، کەبوونی هەر هەموو بوونەوەرەکان بە هۆی ئەوەوە بوونیان هەیە)**

**(فارابی) کتێبی (السياسة المدنية)**

## یەکەم: دەسپێك:

ئەبو نەسری فارابی (٢٥٩ ـ٣٣٩ ك)(٨٧٠ ـ ٩٥٠ ز) چەندین کتێب و نووسراوی لەبارەی هەموو لایەنەکانی زانست و مەعریفە نووسیوە تا ئەو رادەیەی کە ناویان نابوو (مامۆستای دووەم) لە بارەی لاهووت یان میتافیزیك، فقـه و سروشت و کیمیا و بیرکاری و فەلەکناسی ومۆزیك و کۆمەلایەتی و سیاسەت، لە زۆربەی کتێبەکانیدا لێکۆلینەوەی لەسەر بابەتی خۆشگوزەرانی کردووە تا وای لێهاتبوو لەنێو بیرمەندە ئیسلامییەکاندا ناوی بنێن (فەیلەسووفی خۆشگوزەرانی). ئەو خۆشگوزەرانی بە یەکێك لە بەها بەرزەکان دادەنێ کە ئەگەر لەژێر سێبەری سیستەمێکی سیاسی دیاریکراودا نەبێ نایێتەدی کە ئەو ناوی لێنابوو سیستەمی شار، یان دەولەت. ئەو شارەی کە خۆشگوزەرانی بۆ خەلکی بەدی دێنێ مەبەستی ئەو شارە بێخەوشەیە، کە دوای کەمێکی تر باسی دەکەین. لەبارەی سیاسەتیش فارابی دەلێ: (خۆشگوزەرانی خۆی لەخۆیدا خێروخۆشیە و هەرچی بە کەلك بێ بۆ گەیشتن، یان بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی، نەك لە پێناو خۆیدا، بەلکو لە پێناو سوود گەیاندن بە خۆشگوزەرانی ئەویش هەر خێر و چاکەیە. هەر شتێکیش رێگر بێت لەبەردەم گەیشتن بە خۆشگوزەرانی خۆی لەخۆیدا شەڕانگێزیە. خێرو چاکەی بە سوودیش بۆ گەیشتن بە خۆشگوزەرانی لەوانەیە ویست و بڕیاری بویَ...هتد)[٢٢٤]. ئەگەر مرۆڤ بتوانێ بگاتە ئەو خۆشگوزەرانییە، واتە گەیشتۆتە بەرزترین رادەی کاملبوون[٢٢٥]. لێرەدا ئەو گرنگی پێدانەی فارابی بۆ ئەوەی هەر تاکێك بگاتە خۆشگوزەرانی تەواو پالی بە فارابییەوە نا، بۆ ئەوەی بەدوای باشترین سیستەمی سیاسیدا بگەڕێ، کە بتوانێ ئەو هیواو ئاواتە چاوەڕوانکراوەی خۆی بێنێتە دی. بە هەمان شێوەش گرنگی بە فەرمانڕەواییێکی بێخەوش دەدا و جەختیشی لەسەر رۆلی ئەو فەرمانڕەوایە دەکردەوە، کە بە هۆی وەزیفەکەیەوە بتوانێ خۆشگوزەرانی و

---

٢٢٤ - ئەبو نەسری فارابی کتێبی (السیاسة المدنیة) کە بە (مبادیءالموجودات) ناو نرابوو لێکۆلێنەوەی د. فەوزی مەتری نەجاڕ دار ئەلشەرق بەیروت چاپی دووەم سالی ١٩٩٣ لـــ ٧٢ ـ٧٣ـــ.

٢٢٥ - هەمان سەرچاوە لـــ٧٤ـــ.

ژیانێکی بێخەوش بۆ خەڵکی بێنێتە دی، کە بە داواکارییێکی پێشینە دەژمێردرێ، بەو پێیەی خۆشگوزەرانی دوا ئامانجە کە مرۆڤ پێی بگات و هیچ ئامانجێکی دیکەی لە دوادا نییە[٢٢٦].

ئەمەش ئەوە دەگەیێنی کە توێژینەوەکانی فارابی لە بارەی کۆمەڵگەی ئادەمیزاد و لە بارەی فەلسەفەی سیاسی، هەر لە بنچینەدا مەبەستی بە دی هێنانی (خۆشگوزەرانی) بووە، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا داواکارییێکی ئەخلاقیە، بەڵکو بەرزترین راددەی خێرو چاکەیە. وەك چۆن لە پێش ئەویشدا ئەفلاتون و ئەرستۆ بۆی چووبوون، کە بۆ بەدیهێنانی ئەو داواکاریە هەوڵ دەدات (یۆتۆپیاییێك) بنیاد بنێ و پیاوێکی بێخەوشیش فەرمانڕەواییێتی تێدا بکات، کە چەند خەسڵەتێکی بێ وێنە و زۆرترین بێخەوشی تێدا بێ..[٢٢٧]. بەڵام ئەو دیاردەیەی کە هەر لە سەرەتاوە سەرنجی پیاو رادەکێشێ ئەوەیە کە کتێبی بۆچوونەکانی خەڵکی شارە بێ خەوشەکە (آراء اهل المدينة الفاضلة) کراوەتە دوو بەش کە یەکەمیان لە بارەی میتافیزیکیە، کە بریتیە لە لێکۆڵینەوەییێك لەبارەی بوونەوەرەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە، کە باس لە شێوەی ریزبەندیان دەکات لە سەرەوە دەست پێ دەکا کە بوونی خودایە و فارابی ناوی هۆکاری (یەکەم)، واتە هۆکاری دروست بوونی هەر هەموو بوونەوەرەکان و هیچ کەم وکورییێکی تێدا نابینی. بوونەوەرەکانی تریش هەموویان لەوەوە هەڵدەقوڵێن، یان لە رۆشنایی ئەو دروست دەبن. لە یەکەمیشەوە دووەم دروست دەبێ کە کاکڵەییێکی نا ماددی و ئەقڵێکی بێ گەردە، و خودی خۆی ئاقڵ دەکات و یەکەمیش ئاقڵ دەکات و لەو ئەقڵە دوولایەنەیەدا ئەقڵەکانیتر و ئەستێرە گەڕۆك و جێگیرەکان دروست دەبن، کە ژمارەیان حەوت دانەیە تا دەگەینە جیهانی بوونەوەرو گەندەڵی، جیهانی ژێر ئەستێرەی مانگ. وەك ئەرستۆ دەڵێ: تێکەڵەکان بە هۆی تەنە ئاسمانییەکانەوە دەردەکەون، تەنە جۆراوجۆرەکانیش لە ئەنجامی

---

٢٢٦ - د. حوريه تەوفيق موجاهيد (الفكر السياسي: من افلاطون الى محمد عبده) کتێبخانەی ئەنگلۆمیسری چاپی دووەم ساڵی ١٩٩٢ لـ١٨٥ـ.

٢٢٧ - تاکو ئێستاش هەندێك کەس واتێدەگەن، کە (ئامانجی فەرمانڕەوایەتیکردن خۆشگوزەرانی خەڵك و دابینکردنی ئاسایشە بۆیان لەناوەوە ودەرەوەدا. ئەو فەرمانڕەوایەی کە نەتوانێ ئەو خۆشگوزەرانییە بە دی بێنێ گوناهێکی زۆر گەورە دەکات ئەگەر یەك رۆژ لەدوای ئەو بێ توانایییەدا لە سەر کارەکەی خۆیدا بمێنێتەوە..) د.ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر السياسي) کتێبخانەی ئەلنەهزەی میسری. ساڵی ١٩٨٣ لـ٢٨ـ.

یەکگرتنەوەی ئەو تێکەڵەیە لەگەڵ ڕەگەزەکانی تردا دەردەکەون، هەروەها ڕووەك و ئاژەڵ و مرۆڤەکانیش دەردەکەون. لەگەڵ بەردەوام بوونی جۆرەکاندا، بەخۆیان و تاکەکانیانەوە هەر هەموویان ڕووبەڕووی لە ناوچوون دەبنەوە.

فارابی لە بەشی (بیست و شەشەمدا) لە بارەی پێویستبوونی بە کۆمەڵی ژیانی مرۆڤ و هاوکاریکردنی یەکتر دەدوێ ـ واتە دەست بە بەشی دووەمی کتێبەکەی دەکات کە لە بارەی فەلسەفەی سیاسیە. بێگومان لێرەدا پرسیارێك خۆی ڕەپێش دەکات و ئەویش ئەمەیە: ئەگەر فارابی لەمەدا مەبەستی دروستکردنی (یۆتۆپیاییێك) بێت ئەی چی وای لێدەکات کە لە ماوەی بیست و پێنج بەشدا تەنها بابەتە میتافیزیکییەکان چارەسەر بکات، کە زۆر لە دروستکردنی دەوڵەتەوە دوورە، بەڵکو تەنها لە دوازدە بەشدا باس لە بنیادنانی سیاسی دەوڵەت دەکات، مەبەستم ئەوەیە کە ڕووبەری چارەسەرکردنە میتافیزیکیە کە دوو ئەوەندەی ئەو ڕووبەرەیە کە بۆ سیاسەت تەرخان کراوە. باشە دەبێ چی وای لێکردبێ کە یەکەمجار پێش ئەوەی باس لە بابەتێکی پراکتیکیدا بکات کە ئەویش سیاسەتە، دێ باس لە بابەتە میتافیزیکیە تیۆرییەکان دەکات.

دکتۆر وافی دەڵێ: (ئەوەی ڕاستی بێ فارابی هەرچەندە لە بەشی دووەمی کتێبەکەیدا ئەوەندە هەڵوەستە ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مەبەستی بەشی دووەمی کتێبەکەی بووە، کە یەك لە سەر پێنجی کتێبەکەی داگیر کردووە، لە کاتێکدا بەشی یەکەمی سێ لە سەر پێنجی کتێبەکەی گرتووە..)[٢٢٨]. بە ڕای ئێمە هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە (ئەمە ئەو بنچینە میتافیزیکیەیە کەبینای سیاسی شارە بێخەوشەکەی لە سەر بنیاد دەنرێ، چونکە ئەگەر فەرمانڕەوای شارەکە بە (هەڵسووڕێنەری گەردون) نەچێ و پلەو پایەی خەڵکە سروشتیەکەشی لە ئاستی پلەو پایەی بوونەوەرەکانی جیهاندا نەبێ (نە بە تەواوەتی بێخەوش دەبێ و نە بە تەواوەتیش کامڵ دەبێ)!!.

دەبێ وا بیری کردبێتەوە کە پێویستە بنیادی دەوڵەت لەسەر شێوەی دروستبوونی (گەردون) دا بێت و دانانی بەشەکانیشی هەمان شێوەی دانانی بوونەوەرەکانی هەبێ، واتە دەبێ بینا سیاسیەکە لەسەرەوە بۆ خوارەوە بێ، وەك چۆن بوونەوەرەکان لە گەردوندا هەمان

---

٢٢٨ - د. عەلی عەبدولواحید وافی (المدينة الفاضلة) کۆمپانیای کتێبخانەکانی عەکازی عەرەبی سعودی بۆ بڵاوکردنەوە و دابەشکردن چاپی دووەم ساڵی ١٩٨٤ لل‍ـ٢٧ـ.

شێوەی قوچەکیان هەیە، کە لەسەر سەرەوە (خودایە) ـ تا دەگاتە خوار خوارەوە کە تەنە رەق و بێ گیانەکانە بەشەکانی دەوڵەتیش دەبێ لەسەرەوە دەست پێ بکات ـ واتە گرنگترین بەش لە شارەکەدا فەرمانڕەوایە لەوەوە پلەکان بەرەو خوار دێنە خوارەوە بۆ ئەو کەسەی کە گرنگی لەویتر کەمترە تا دوایی.

## دووەم: دروستکردنی یۆتۆپیایێك: .

ئێمە هەر لەسەرەتای ناونانەکەوە هەست بەوە دەکەین کە لە بەردەم کۆمەڵگەییێکی ئەخلاقیدایین، چونکە ئێمە شارێکی (بێخەوش) مان دەوێ کە هاوڵاتییەکانیشی (بێخەوش) بن، کە گەیشتبنە رادەی ئەو کامڵبوونە کە ئادەمیزاد دەتوانێ بیگاتێ. لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە بێ خەڵکانی تری ناو کۆمەڵگە نە دەتوانێ بژێت و نە دەشگاتە باشترین رادەی کامڵبوونەکانی خۆی. فارابی لە نووسینەکانیدا گرنگی بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگاکانی ئادەمیزاد دەدات، هەروەها بە شێوەیێیکی ئەخلاقیانە بە پێی پلەکانی کامڵبوون و توانای گەیشتنیان بە زۆرترین خێروچاکە دابەشیان دەکات، کەواتە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەندێکیان گەیشتوونەتە رادەی کامڵبوون وهەندێکیشیان نەگەیشتوونەتە رادەی کامڵبوون، کامڵبوون سێ جۆری هەیە: لە هەموویان مەزنتر کە هەر هەموو دانیشتوانی سەر گۆی زەوی دەگرێتەوە، دوای ئەو مامناوەندیەکەییێتی کە نەتەوەییێکی دیاریکراو، یان گەلێکی دیاریکراو دەگرێتەوە، بچووکەکەشیان کە شارێك، یان دەوڵەتێك دەگرێتەوە ـ ناکامڵەکانیش دێهاتەکان دەگرێتەوە کە ئەو دەڵێ ئەو دێهاتانە لە خزمەتی شارەکاندان. لە دوای ئەوەدا دێتە سەر بەشەکانی ناو شار، وەك گەڕەك وکۆڵان و ئینجا ماڵەکان. فارابی وای بۆ دەچێ کە کامڵبوون و بێخەوشی لەو کۆمەڵگایانەدا نایەتە دی، کە رێژەکەیان لە شار بچووکتربن، دەڵێ باشترین خیرو چاکە و کامڵبوونی تەواو یەکەمجار لە شاردا دێتە دی نەك لە کۆمەڵگەییێکدا کە زۆر لەشار کەمتربێ...)[٢٢٩]. ئەگەر گەیشتن بە خێرو چاکە، یان شەڕانگێزی لە رێگەی ویست و ئارەزوو و هەڵبژاردنەوە بێت، شار

---

٢٢٩ - ئەبونەسر ئەلفارابی: (كتاب آراء اهل المدينة الفاضلة) د. ئەلبێر نەسری نادر پێشەکی بۆ نووسیوەو لە سەری هەڵیداوەتێ ـدارئەلمەشریق بەیروت چاپی حەوتەم لـ١١٨ـ.

دەتوانێ هاوكاری هەندێك لە مەبەستە شەڕانگێزییەكان بكات. لەهەمانكاتدا لە لاییێكی ترەوە دەتوانێ هاوكاری بەدیهێنانی خۆشگوزەرانییەكانیش بكات: (لە راستیدا مەبەستی لەو شارەی كەتێیدا كۆدەبنەوە و هاوكاری یەكتر دەكەن لە سەر ئەو شتانە كە خۆشگوزەرانی لە خۆی دەگرێ، ئەوە (یۆتۆپیاییێكە). ئەو گردبوونەوەیەی كە بەهۆیەوە هاوكاری بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی دەكەن گردبوونەوەییێكی بێخەوشە و ئەو نەتەوەیەی كە بۆ بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی هەر هەموو شارەكانیان هاوكاری یەكتری دەكەن، ئەو نەتەوەیە نەتەوەییێكی بێخەوشە. هەروەها ئەگەر هەموو نەتەوەكانی سەر گۆی زەوی بۆ گەیشتن بە خۆشگوزەرانی هاوكاری یەكتر بكەن، ئەو كاتە جیهانێكی بێخەوش دێتە دی...)[٢٣٠]. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ كە خۆشگوزەرانی ـ كە بەرزترین رادەی خێرو چاكەیەـ ئەو ئامانجەیە، كە كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە سەر ئاستەكانی شار و نەتەوەو جیهاندا دەیەوێ بیگاتێ ـ ئەو كۆمەڵگەیەی كە بەدیشی دەهێنێ (كۆمەڵگەییێكی بێخەوشە) ئەو شارەی كە فارابیش دەیەوێ دروستی بكات (یۆتۆپیاییێكە)، چونكە ئەو ئامانجە ئەخلاقیە بەدی دەهێنێ كە ئەویش خۆشگوزەرانییە ـ و ئەوەی لەو هەموو شتەدا تێبینی دەكرێ ئەوەیە كە مامۆستای دووەمان هیچ كاتێك جیاوازی لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا نەكردووە، بەڵكو لە یەك ناسنامەدا كۆی كردوونەتەوە.

## كۆڵەگەكانی ئەم شارە بێخەوشە چین؟

یەكەم كۆڵەگەو لە هەموویان بنچینەییتر (سەرۆكی شارە) كە ئەو لووتكەیە و لە سەرووی سیستەمێكی سەرەوژووری (هیرارکسی) دا دادەنیشێ، وەك چۆن خودا لە سەرووی ئەو بوونەوەرانەوە دادەنیشێ، كە گەردونی پێ رازاندۆتەوە، فارابی ـ لەو بەشەی كە تایبەتە بە میتافیزیكا لە كتێبی (آراء اهل المدینة الفاضلة) دا ـ ئەو پلە و پایەیەی كە خودای پێ وەسف دەكات، هەمان ئەو پلە و پایەیە، كە بە باڵای سەرۆكی شاریدا دادەبڕێ زۆر بە روونی و سەرڕاستانە دەڵێ: (ئەمەش حاڵی بوونەوەرەكانە. هۆكاری یەكەم كە (خودا) یە بەرامبەر بە بوونەوەرەكان چۆنە، پاشای شارە بێخەوشەكەش بەرامبەر بە تەواوی بەشەكانی شار وەك ئەو

---

٢٣٠ - سەرچاوەی پێشوو لـــ١١٨ــ.

وایه..)[231]. وەك چۆن بوونی خوداوەند كاملترین جۆرەكانی بوونە لە پلەی بوونەوەرەكاندا (هەروەها سەرۆكی شاریش كاملترین بەشەكانی ئەو شارەیە كە تایبەتە بەو...)[232]. هەندێك جاریش ئەو سەرۆك لەگەڵ (دڵ) دا بەراورد دەكات بەرامبەر بەش و دەڵێ: (هەر وەك چۆن یەكەمجار دڵ دروست دەبێ، كە هۆكاری یەكەمە بۆ دروستبوونی باقی ئەندامەكانی لەش... هەروەها دەبێ سەرۆكی ئەو شارەش یەكەمجار هەبێ، ئینجا ئەو ببێتە هۆكاری دروستبوونی شار و بەشەكانی شار..)[233]. ئەمەش دەربڕینێكی زۆر سەیرە، ئەمە زۆر لەوە دەچێ كە بڵێین چۆن خودا بوونەوەرەكانی تر دروست دەكات و دڵ چۆن یەكەمجار دروست دەبێ، ئینجا بە هۆی دڵەوە تەواوی ئەندامەكانی تری لەش دروست دەبن، هەروەها سەرۆكی شاریش دەبێ یەكەمجار ئەو هەبێ، ئینجا لە دوای ئەودا شار و بەشەكانی تری شار پێكدێ و دروست دەبێ!. ئەم دەربڕینە بە ئاشكرا پیرۆز كردنی فەرمانڕەواكان لە خۆیدا دەگرێ، هەرخۆشی دەبێتە سەرەتا و بنچینەی دەسەڵات و خۆی دڵ و بزوێنەرەكەییێتی، بگرە (هەڵسووڕێنەری ئەو شارە بێخەوشە بە هۆكاری یەكەم دەچێ كە بە هۆی ئەوەوە تەواوی بوونەوەرەكانی تر هاتوونەتە وجوود..)[234]. ئەو هەڵسووڕێنەرە، یان ئەو سەرۆكە هیچ مرۆڤێك ناتوانێ ئامۆژگاری، یان سەرپەرشتی بكات (.. بەڵكو دەبێ بە شێوەییێكی پراكتیكی زانست و مەعریفەكانی بە دەست هێنابێ و بۆ هیچ شتێك پێویستی بە مرۆڤی تر نەبێ بۆ ئەوەی رێنمایی بكات...)[235]، بەڵام دەبێ ئەو زانستە زۆرەی لە كوێوە بۆ هاتبێ؟ ئایا بە هەوڵ كۆششی خۆی ئەو هەموو زانستەی پەیدا كردووە؟ بێ گومان نەخێر! بەڵكو ئەو زانستانەی بە سروش بۆ دابەزیوەتە خوارەوە. لێرەدا فارابی سەرۆكی ئەو شارە دەكاتە پێغەمبەرێك كە زانیارییەكانی خۆی لە ئاسمانەوە وەربگرێ و دەڵێ: (پێشینان بەو مرۆڤە دەڵێن پاشا، بەڵام ئەوەی راستی بێ ئەو مرۆڤە دەبێ پێی بگوترێ، ئەو

---

٢٣١ - (آراء اهل المدينة الفاضلة) چاپەكەی د.ئەلبێر نەسری لـ١٢١ـ.

٢٣٢ - سەرچاوەی پێشوو لـ١٢٠ـ.

٢٣٣ - هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

٢٣٤ - كتێبی (السياسة المدنية) كە بە (مبادىء الموجودات) ناسراوە لە لێكۆڵینەوەی د.فەوزی مەتری نەجارە دار ئەلشەرق بەیروت چاپی دووەم ساڵی ١٩٩٣ لـ٨٤ـ.

٢٣٥ - ئەبو نەسری فارابی (السياسة المدنية) كە بە پرەنسیپی بوونەوەرەكان ناوی دەركردوە ـ د. فەوزی مەتری نەجار/دار ئەلشەرق بەیروت چاپی دووەم ساڵی١٩٩٣لـ٨٤ـ.

کەسەیە کە سروشی بۆ دێتە خوارەوە، چونکە مرۆڤ کە گەیشتە ئەو پلەیە سروشی بۆ دێتە خوارەوە، ئەمە لەو کاتەی کە هیچ هۆکارێك نەکەوێتە نێوان خۆی و ئەقڵی کاریگەرەوە.. ئەوسا لە ئەقڵە کاریگەرەکەوە ئەو هێزە هەڵدەقوڵێ کە بە هۆیەوە دەتوانێ شتەکان و ئەو کردارانە دەسنیشان بکات کە بەرەو خۆشگوزەرانی ئاراستەیان بکات..)[236]، بۆیە ئەو سەرۆکە توانای ئەوەی هەیە کە خەڵکانی دی ئاراستە بکات و ڕێیان پێ نیشان بدات: ئەو فەرمانڕەوا رەهایەیە کە دەزانێ خێر و شەڕ لە چی دایە و خەڵکیش بەرەو ڕێی ڕاست ئاراستە بکات و نابێ نە کەس قسە لە قسەی ئەودا بکات و نە کەسیش بێنە و بەردەی لەگەڵدا بکات، بەڵکو ئەو تەنها فەرمان دەدات و دەبێ خەڵکیش گوێڕایەڵی بن! ئەمەش ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە دەبێ: لەبەر ئەوەی سەرۆکایەتیەکەی ئەو مرۆڤە، سەرۆکایەتی یەکەمە و هەموو سەرۆکایەتیە مرۆڤایەتییەکانی تر لە دوای ئەوەوە دێن و لەوەوە هەڵدەقوڵێن، ئەمەش لە کتێبەکەیدا بە ڕوونی دیارە..)[237]. ئەم سەرۆکە خۆی خەڵکی شارەکە ڕێك دەخا: (واتە سەرۆکی یەکەم خۆی تیرەکان ڕێك دەخات و هەر مرۆڤێکیش لەهەر تیرەییێکدابێ لەو پلەوپایەی دادەنێ کە شایانی ئەو کەسە بێ، ئەمەش یان پلەی خزمەتگوزاریە، یان پلەی سەرۆکایەتیە..)[238]. هەروەها تەنها خۆی بیرمەند و یاسا داڕێژەرە و هەم (پاشایە) هەم پێشەوایە...هتد. فارابی دەڵێ: کەواتە مانای پێشەوا و فەیلەسووف و دانەری هەموویان یەك مانا دەبەخشن.. ناوی فەیلەسووف ئاماژەیە بۆ بێخەوشیە تیۆرییەکان و دانەری داب و نەریتیش ئاماژەیە بۆ باشی ئەو زانیاریانەی کە لە بارەی ئەو شتە ماقووڵە پراکتیکیانەیە کە هەیێتی و ئەو هێزەیە کە دەری دەهێنێ و ئەو هێزەشە کە لە نێو نەتەوەو شارەکاندا پەیدای دەکات... و ناوی پاشاش ئاماژەیە بۆ توانا و دەسەڵات. توانای تەواویش واتە دەبێ لە هەر هەموو تواناکانی تر بە هێزتر بێ، نەك تەنها بە هۆی شتە دەرەکییەکانەوە توانای بە سەر شتەکاندا هەبێ...هتد)[239].

٢٣٦ - سەرچاوەی پێشوو لـ٧٩ـ.

٢٣٧ - سەرچاوەی پێشوو لـ٨٠ـ.

٢٣٨ - کتێبی (السیاسە المدنییە) لـ٨٣ـ.

٢٣٩ - (تحصیل السعادة) لێکۆڵینەوەی جەعفەر ئال یاسین ـ دار ئەل ئەندەلوس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە بەیروت چاپی یەکەم ساڵی ١٩٨٣ لـ١٢٢ ـ.

## سێیەم مەرجەکانی سەرۆك:

فارابی لەوبڕوایەدا نییە کە هەموو مرۆڤێك بە کەڵکی ئەوەبێ ببێتە فەرمانڕەوا، یان سەرۆکی دەوڵەت: (لەبەرئەوەی نابێ هەرکەسێك بێ و ببێتە سەرۆکی ئەو شارە بێخەوشە..)[240].بەڵکو دەبێ ئەو کەسە کۆمەڵێك خەسڵەتی سروشتی تێدا بێت، کە مامۆستای دووەم لە دوازدە خەسڵەتدا کۆی کردونەتەوە، ئەم شتەش بەزۆری لای بیرمەندە سیاسیە موسڵمانەکان دووبارە دەبێتەوە، لەوانە دەبێ: ئەندامەکانی لەشی کەم وکوڕی تێدا نەبێ و ئاستی تێگەیشتنی باش بێت و شتی لەبیر نەچێتەوە، زیرەك بێ، گوتارو دەربڕینەکانی جوان بن، خوێندن و فێرکردن و سوود وەرگرتنی خۆش بوێ، برسی خواردن و خواردنەوە و ژنان نەبێ، نەفس بەرزبێ وکەرامەتی خۆی خۆش بوێ، ئەوەندە شتی دونیایی بە هەند هەڵنەگرێ...هتد[241]. ئەمە سەرەڕای ئەوەی بوونی ئەو هەموو خەسڵەتە لە یەك تاکە کەسێکدا کارێکی نەگەنجاو و قورسە، ئەگەر هەشبێت ئەوە هەر تەنها خۆی سەرۆکە و هیچ کەسێکی تر ناتوانێ شان لە شانی بدات، تەنها هەر خۆی پێشەوا و سەرۆکی شارە بێخەوشەکە و سەرۆکی هەموو ئاوەدانییەکانی سەر رووی زەویشە[242]. گرنگ ئەوەیە کە بزانین دەکرێ سەرۆکایەتی هەبێ و دەبێ ئەو سەرۆکایەتیەش بێخەوش بێت، تەنانەت ئەگەر شاریش بوونی نەبوو[243]. پاشا، یان پێشەوا هەر بە پێکهاتە و پیشەکەی خۆی پاشایە یان پێشەوایە، ئینجا خەڵکی پێی رازی بن یان نا، گوێڕایەڵی بن یان نا، ئەگەر نەتەوە بوونی هەبێ یان نەبێ، ئەمە گرفتێك

---

٢٤٠ - (آراء اهل المدينة الفاضلة ) لـ١٢٢ـ.

٢٤١ - تەماشای کتێبەکەی ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي) بکە کە پێشتر باسمان کردووە، هەروەها تەماشای کتێبەکەی د.محەمەد یوسف موسا (نظام الحكم في الاسلام) و کتێبی تریش بکە دەبینین هەمان ئەو خەسڵەتانەیان تێدا دووبارە دەبێتەوە.

٢٤٢ - (آراء اهل المدينة الفاضلة)لـ١٢٧ ـ١٢٨ ـ.

٢٤٣ - هەمان سەرچاوە لـ٩٧ ـ.

نییه[٢٤٤]. وەك چۆن پزیشك لە پیشەكەی خۆیدا توانای چارەسەركردنی نەخۆشەكانی هەیە، ئەگەر نەخۆش هەبێ یان نەبێ، چونكە ئەو كەرەستەكانی چارەسەركردنی نەخۆشییەكانی هەیە، ئینجا ئەگەر باری ژیانی باش بێ یان خراپ[٢٤٥]. پێش ئێستاش باسی ئەوەمان كرد كە سەرۆكایەتی كارێكی گرنگە، بەڵكو ئەمە مەرجێكی گرنگە تەنانەت لە پێش بوونی شاریشدا دێ، چونكە دەبێ سەرۆكی شار یەكەمجار دابندرێ، ئینجا دوایی ئەو دەبێتە هۆكاری دروستبوونی شار و بەشەكانی تری شار[٢٤٦].

پاشا بە خۆشی بێ یا ناخۆشی دەبێ خەریكی پەروەردەكردنی خەڵكی بێ (وەك چۆن لە ماڵەكاندا باوك منداڵ و هەرزەكارەكانی خۆی پەروەردە دەكات و فێری داب و نەریتیان دەكات، ئەگەر بە خۆشی جێبەجێیانكرد باشە، ئەگەر نا بە زۆر پێیان جێبەجێدەكەن، پاشاش بەو شێوەیە تەنها خۆی ئامۆژگاریكار و مامۆستای خەڵكەكەیە پێیان خۆشبێ یان نا[٢٤٧].

چونكە سەرۆكی شار، یان پاشا، یان فەرمانڕەوا بە گشتی وەك (باوك) وایە هەر خۆی (بەخێوكەر) و (ئامۆژگاریكار) و (مامۆستای خەڵكیشە، یان وەك راهێنەری (ئەسپ) وایە كاتێك كە ئەسپەكەی رادەهێنێ! لە لای مامۆستای دووەمدا سەیركردنی خەڵكی بە چاوی (منداڵ)، یان (نەفام) كە پێویستیان بە پەروەردەكردن و ئامۆژگاریكردن هەیە لەلایەن فەرمانڕەواوە، شتێكی زۆر ئاساییە، ئەمەش رێك وەك ئەوە وایە كە باوك منداڵەكانی خۆی پەروەردە دەكات لە ناو خێزاندا..)[٢٤٨]، ئینجا ئەو كارە بە خۆشی بێ، یان بە ناخۆشی، فەرمانڕەوا ناچاریان دەكات كە رێگەی راست بگرنە بەر (بەمشێوەیە دەبینین گرنگترین ئەركی پاشا، یان فەرمانڕەوا، یان خەلیفە دەبێتە تەمێكردنی خەڵكی، بەڵكو تەمێكردنی

---

٢٤٤ - تەماشاكە، ئەگەر بێت و پاشا هەرخۆی بە سروشت پاشا بێت (هەروەها خزمەتكارەكانیش بە سروشت خزمەتكار بن ) (تحصیل السعادة) لـ٧٧ ـ. خەڵكی هەر لە سروشتدا پلە پلە رێزبەند كراون و (چاویش ناچێتە سەر برۆ ) ئای لەو داب و نەریتە سەیرە !.

٢٤٥ - (تحصیل السعادة)لـ٩٧ ـ.

٢٤٦ - (آراء اهل المدینة الفاضلة) لـ١٢١ ـ.

٢٤٧ - (تحصیل السعادة) لـ٨٠ ـ.

٢٤٨ - هەمان سەرچاوە لـ٨٠ ـ.

شارەکە و بگرە شارەکانیش..) و ئەو هۆکارە بە هێزەی کە بۆ تەمێکردنی خەڵکی پێویستی پێی دەبێ (سوپا) و کەرەستەکانی جەنگە [٢٤٩].

ئەوەی بە روونی دەردەکەوێ ئەوەیە کە مامۆستای دووەم لە هەموو نووسینەکانیدا ئەخلاق و سیاسەت لە یەك پێناسەدا کۆ دەکاتەوە، بەڵکو ئامانجی یەکەمی ئەو تەنها پێکەوەنانی دەوڵەتە و ئەویش دەکاتە ئامانجێکی ئەخلاقیانە ـ هەروەها ئەرکە یەکەمەکەی سەرۆکی شار ئەرکێکی ئەخلاقیە، لە لای فارابی بەدیهینانی بێخەوشیە جۆراوجۆرەکان کێشەیێکی زۆر گەورە و بنچینەییە، ئەویش بە دوو شێواز جێبەجێ دەکرێ: ئەوانیش فێرکردن و تەمێ کردنن، بەڵام فێرکردن بە دەستهێنانی بێخەوشیە تیۆرییەکانە لەناو نەتەوەو شارەکاندا، تەمێ کردنیش رێگە چارەیێکە بۆ بە دەسهێنانی بێخەوشی و رەفتارە پراکتیکییەکان لە نێو نەتەوەکاندا. فێرکردن تەنها بە گوتارە و تەمێ کردنیش راهێنانی نەتەوە و خەڵکە مەدەنییەکەیە لە سەر ئەو کردارانەی کە لە بواری پراکتیکیدا هەیە و هان بدرێن بۆ ئەوەی جێبەجێی بکەن...هتد [٢٥٠].

## چوارەم: دوا گوتە:

ئێمە نامانەوێ لەسەر بنیادنانی سیاسی دەوڵەتدا لەگەڵ فارابیدا درێژدادڕی بکەین، بەڵکو دەمانەوێ ئاماژە بەو چەند خاڵەی خوارەوە بدەین: ـ

**یەکەم:** ئەوەی بە روونی دیارە ئەوەیە مامۆستای دووەم بنیادنانی ئەو شارە بە وێنەیێکی هاوشێوەی بنیادنانی هەموو گەردون دەچوێنێ، وەك چۆن خودای مەزن لە سەرەوەی ئەو بنیادنانە (گەردونییە)دا دەوەستێ، بەو شێوەیە فەرمانڕەواش لە شارەکەی خۆیدا تەنها خۆی هەڵسووڕێنەری ئەو شارەیە، کە لە بەڕێوەبردنی شارەکەدا زۆر بە خودای مەزن دەچێ، چونکە تەنها خۆی رێکخەری ئەو شارەیە و هەرخۆی گرنگترین کەسایەتی شارە، بەڵکو ئەگەر شاریش بوونی نەبێ ئەو هەر سەرۆکە، چونکە ئەو هەر بە سروشت، یان هەر لە زگماکیدا سەرۆکە.

**دووەم:** ئەوەی لێرەدا بەدی دەکەین، ئەوەیە کە بنیادنانی شار لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەستپێدەکا، کەسایەتی یەکەم فەرمانڕەوا، یان (پاشا)، یان ئیمامە، ئینجا کەسایەتییەکانیتر

---

٢٤٩ - هەمان سەرچاوە لـ٨١ ـ.

٢٥٠ - فارابی کتێبی (تحصیل السعادة ) لـ٧٨ ـ.

که پلەیان لەو نزمترە لە دوای ئەوەوە دێن، ئیتر بەم شێوەیە پلەکان بەرەوخوار دەبنەوە تا دەگاتە ئەوەی کە پێی دەڵێن: (گەل) کە خەڵکە رەشۆکیەکەیە و هیچ بەهاو رێزێکی ئەوتۆی نییە. پێشتریش هەمان ئەو تێبینییەمان لەلای ئیبن ئەبی رەبیع هەبوو.

**سێیەم:** لێرەدا تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت بە روونی دەردەکەوێ، کە ئەو شارە لە ئەخلاق زیاتر هیچ ئامانجێکی دیکە لەخۆی ناگرێ، کە ناوەکەی یۆتۆپیاییێکە، هاوڵاتییەکانیشی دەبێ بێخەوش بن، ئەگەر هاوڵاتییەکانیشی بیخەوش نەبن فەرمانڕەوا بۆ خۆی پەروەردەو تەمێیان دەکات و ڕەفتارە بێخەوشەکانیان تێدا دەچێنێ، ئەگەر خۆشیان بێ، یان ترشی.

**چوارەم:** لێرەدا پیرۆزکردنی فەرمانڕەوا، تەنانەت ئەگەر نەڵێین بە (خودا) کردنی فەرمانڕەوا، کە ئەمە بە روونی دەردەکەوێ، بە شێوەییێك کە هەر خۆی (سروش)ی بۆ دێتە خوارەوە، هەر خۆشی ئەڵقەی پێوەندییەکانە لەنێوان خوداوەند و خەڵکیدا، کە تەنها خۆی دەزانێ بەرژەوەندییەکانی خەڵکی لە کوێدایە و هەر خۆی مامۆستا و خاوەنی ئیلهامەکانە و تەنها خۆی فەرمانەکان دەردەکات و خەڵکیش دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو بن. لە هەمانکاتدا تێکڕای خەڵکی لە بەرامبەر ئەودا (منداڵ) و (هەرزەکار) و (نەفام) ن، تەنانەت مافی ئەوەشیان نییە هیچ کاتێك لێپێچینەوە لەگەڵ فەرمانڕەوادا بکەن، چونکە (هەرچی ئەو بیانکات ئەوانە کاری بێخەوشن و لێپێچینەوەیان لەسەر نییە!) ئینجا چ بە رەخنەگرتن بێ، یان بە بەرهەڵستیکردن، بەڵکو دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن و لە بەردەمیدا دەست لە سەر دەست بوەستن! کە لە سەرەتاوە خەڵکی وابووە و ئێستاکەش هەر دەبێ وابن!!.

**پێنجەم:** شتێکی روونە کە وشەی (سیاسەت) وەرگێڕانێکی دەقاودەقی وشەی (سائس)ی عەرەبیە کە مانای رامکردن، یان دەستەمۆ کردنی خەڵکە وەك (ساس) واتە دەستەمۆی کرد،(یسوس) واتە دەستەمۆی دەکا، گەلیش بەم شێوەیە دەستەمۆ دەکرێ، تەنانەت ئەگەر بە ناخۆشیش بێ بەرەو بێخەوشی و رێی راست، و ئەو شتانەی کە فەرمانڕەوا بە باشی دەزانێ و سوودی خەڵکی تێدایە لێیان دەخورێ، فەرمانڕەوا موسڵمانەکان بە درێژایی مێژوو تەنها ئەو بیرۆکەو تیۆرەیان لە فەرمانڕەوایەتی کردنەکانیاندا بە شێوەیێکی پراکتیکی پیادە کردووە و لەوەش زیاتر هیچ سیستەمێکی تریان جێبەجێنەکردووە! عەبدولمەلیك کوڕی مەروان دوای ئەوەی کە بووە خەلیفە لەسەر مینبەر رادەوەستێ دەڵێ: (.. بە خوای گەورە لە دوای ئەو پلەو پایەیەمدا، هەرکەسێ

پێم بڵێ خوا پەرستی بکە لە سەری دەدەم..)[٢٥١]. یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیکیش (چل پیاوی بە تەمەن بانگهێشت دەکات بۆ ئەوەی شایەدی ئەوەی بۆ بدەن کە خەلیفە هیچ حیساب و کیتابێکی لە سەر نەماوە) [٢٥٢]. ئەبو جەعفەری مەنسووریش لە رۆژی (عەرەفە)دا بەپێوە رادەوەستێ و لە گوتارێکدا بەرنامە سیاسیەکەی خۆی بۆ خەڵکی ئاشکرا دەکات و دەڵێ: (ئەی خەڵکینە من لەم سەر زەویەدا سوڵتانی (خودا)م بە پشتیوانی و رێنماییەکانی ئەو راتان دەهێنم (اسوسکم) و من پاسەوانی موڵك و ماڵی خودام و بە فەرمان و ویست و ئارەزووی ئەو کاری تێدا دەکەم و بە رەزامەندی ئەو بەسەر خەڵکیدا دابەشی دەکەم...هتد). ئایا فارابی و بیرمەندەکانی تریش لە بارەی بیرۆکە سیاسییەکان هەمان ئەو شتە ناڵێنەوە؟! ئایا چەندەها رووداوی مێژوویی بوونیان نییە کە (ئەوە روون دەکەنەوە خەلافەتکردن لە ئیسلامدا لە سەر هێزو باڵادەستی بنیادنراوە، نەك لە سەر بنچینەی هەڵبژاردن و رازیکردن؟)[٢٥٣]. چونکە گەل هیچ حیسابێکی بۆ نەکراوە و ئێستاش هەر بۆی ناکرێ!!.

**حەوتەم:** ئەو تێگەیاندنەی خەڵکی کە گوایە ئەوان کەسانێکی (هەرزەکار) و (منداڵ)ن، یان (نەفام)ن.. فەرمانڕەواش باوکی هەموانە...هتد. ئەمە لەلاییێك مانای تێکەڵکردنێکی روون و ئاشکرای نێوان ئەخلاق و سیاسەتە ـ لەلاییێکی تریشەوە ئەوە دەگەیێنێ کە ئەو فەرمانڕەوایە ببێتە دیکتاتۆر: چونکە دەسەڵاتەکانی باوك هەر لە بنچینەدا چەند دەسەڵاتێکی ئەخلاقیانەن، رێزگرتنی دایك و باوکیش دەست لە سەردەست وەستان بەرامبەریان ئەرکێکە ئەخلاق بەسەر هەموو کوڕێکیدا سەپاندووە، بەڵام باوك هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی بە دەستەوە نییە، بۆیە نابێ فەرمانڕەوا کە خاوەن دەسەڵاتێکی سیاسیە ببێتە (باوك)، یان (مامۆستا)، یان تەمیێ خەڵکی بکات...هتد، چونکە لە راستیدا خەڵکی دەبێ خۆی فەرمانڕەوایەتی خۆی بکات. هەر لێرەشەوە مافی

---

٢٥١ - ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (الطاغية : دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي) لـ٢٤٣ ـ چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٧.

٢٥٢ - هەمان سەرچاوە لـ٢٤٥ ـ چاپی سێیەم.

٢٥٣ - لەگەڵ د. محەمەد کامیل لەیلە (النظم السياسية: الدولة والحكومة)دار ئەلفكر لعەرەبی لـ ٨٨ـ بەراوردی بکە.

خۆیەتی کە ئەو فەرمانڕەوایە لەسەر کار لاببات، یان ئەگەر شایانی ئەو پلەو پایەیە نەبوو بە زۆر بیڕوخێنێ.

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوە بڵێین: کە ئامانجەکانی دەوڵەت چەند ئامانجێکی ئەخلاقی نین، بەڵکو ئامانجەکانی سوود گەیاندنە، واتە ئامانجی یەکەم وکۆتایی دەبێ لە بەرژەوەندی خەڵکیدابێ. ئەگەرچی یەکەمجار ئەخلاق دەردەکەوێ ئینجا بینای سیاسی دوای ئەو دێ بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگیرێ و بتوانێ چەمکە ئەخلاقییەکانی وەك (یەکسانی) و (دادپەروەری) و (ئازادی) بکاتە چەند یاساییێك، بۆ ئەوەی هیچ بوارێك بۆ فەرمانڕەوا نەهێڵێتەوە تا بە ئارەزووی خۆی لێکیان بداتەوە، یان بە پێی پێوەرەکانی ویژدانی خۆی جێبەجێیان بکات!.

فارابی لە (آراء اهل المدینة الفاضلة)دا لەسەر ئەو ریزبەندییەی کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێدەکات راهاتبوو و لەبەشە میتافیزیکیەکەیدا کە باس لە ریزبەندی بوونەوەرە رۆحی ومادییەکان دەکات، یان لە بەشە سیاسیەکەیدا کە باس لە پێکەوەنانی دەوڵەت دەکات دەڵێ: (بوونەوەرە رۆحییەکان پلەکانیان لە سەرەوە بۆ خوارەوە ریزبەند دەکات، کە لە شەش پلەدا ریزیان دەکات، یەکەمیان بوونەوەری یەکەمە، یان هۆکاری یەکەمە کە (خودا)ی پەروەردگارە، دووەمیان نۆ ئەقڵە بزوێنەرەکەی هەسارەکانی ئاسمانە...هەروەها فارابی بوونەوەرە ماددییەکانیش لەسەرەوە بۆ خراپترینیان (الاخس) لە شەش پلەدا سەرەوژێر ریزیان دەکات)[٢٥٤]. بەهەمانشێوە مامۆستای دووەم شارە بێخەوشەکەی خۆی بنیاد دەنێ و لە بەرزترین پلەوە ریزبەندیان دەکات کە وەزیفەی فەرمانڕەوایە ئینجا وەزیفەی دوای ئەو دێ تا دەگەینە خراپترین پلەکانی ئەو ریزبەندیە کە چینی خەڵکە رەش و رووتەکەیە. ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو بینا سیاسیە نوێیەی ئێستایە کە لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەست پێدەکات، واتە لە گەلەوە دەست پێدەکا بۆ سەرەوە تا دەگاتە فەرمانڕەوا. کە وشە بیانییەکان بەمشێوەیە دەریدەبڕن Politics کە لە وشەی Polis)) ەوە وەرگیراوە، واتە شار، یان کۆمەڵە خەڵکێك. کەواتە جیاوازییەکانی نێوان بینای سیاسی کۆن و بینای سیاسی نوێ هەمان ئەو جیاوازیەیە کە لەنێوان وشەی (سیاسەتی) عەرەبی و وشەی Politics)) ی بیانیدا هەیە ـ وەك پێشتریش تێبینیمان کردووە.

---

٢٥٤ - عەلی عەبدولواحید وافي (المدینة الفاضلة) فارابی لـ٣٠و ٣٢ ـ.

**هەشتەم:** فارابی و چەندین کەسی تر لە بیرمەندە موسڵمانەکان بە شێوەیێك بیردەکەنەوە کە کۆمەڵگەی بێخەوش، یان شارە بێخەوشەکە لە هاوڵاتیانی بێخەوش پێکدێن، ئەگەر بێت و (أ) هاوڵاتییێکی بێخەوش بێ (ب) هاوڵاتییێکی بێخەوش بێ (ج) و (د) و (ه)...هتد بێخەوش بن کەواتە لەکۆتاییدا ئەو کۆمەڵگە بێخەوشەمان بۆ دروست دەبێ کە مەبەستمانە، ئەمەش بیرکردنەوەییێکی زۆر هەڵەیە، چونکە فارابی ئەوە نازانێ کە بێخەوشی ناتواندرێ وەك شتە ماددییەکان کۆبکرێنەوە، ئەمەش لە زانستی مەنتیقدا پێی دەگوترێ تێکەڵکردنی پێکهاتەکان (Fallacy Of Compositon ) کە ئەرستۆ هەر لە کۆنەوە بەم گوتەیە رroونی کردۆتەوە کە ژمارە(٢) ژمارەییێکی جوتە (٣) ژمارەییێکی تاکە، ئینجا ژمارە (٥) کە کۆی هەردوو ژمارەکەیە لە هەمانکاتدا ئەو ژمارەیە جوتە و تاکیشە!! ماکنزی بۆچوونی وایە کە لەو بێژەیەمان دەچێ کە دەڵێ: تیپێکی سەربازی کە لە (٢٠٠) سەرباز پێکدێ و درێژی هەر سەربازێك (٦) پێ بێت کەواتە درێژی هەرهەموویان دەکاتە (١٢٠٠) پێ!! ئەمەش بە شتێکی راست نازاندرێ، چونکە مەگەر هەر سەربازێك لەسەر تەوقی سەری سەربازەکەی تر رابوەستێ![255].

255- Mackenzie Manual Of Ethis P. 169.

# بەشی سێیەم

## ((ئەبوحەسەنی ماوەردی.. و حوکمە سوڵتانییەکانی))

**( لە راستیدا ئیمامەتیکردن خۆی جێنشینی کردنێکە لە خاوەن شەرعەوە بۆ ئەوەی پاسەوانی لە ئاین و سیاسەتی دونیا بکات..)**

**(ئەلماوەردی)**

## یەکەم: پێشەکی:

ئەبولحەسەن عەلی کوڕی محەمەد ئەلماوەردی (٩٧٤ ـ ١٠٥٨ز) (٣٦٤ ـ٤٥٠ ك) لە شاری بەسرە و لەخێزانێکی بەناوبانگ کە ئاوی گوڵیان دەردەکرد و دەیانفرۆشتەوە لە دایك بووە، ناوەکەشی هەر لەو پیشەیەوە وەرگیراوە. یەکێکیش بووە لە شەریعەتناسەکانی ئاینزای شافعی. لە زۆر وڵاتیشدا کاری دادوەری کردووە، پیاوێکی ئازاو دادپەروەر و بە ویژدان بووە. لە پلەو پایەدا گەیشتۆتە پلەی سەرۆکی دادوەران (قاضي القضاة).

شاری بەغدا لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەم و سەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا کانگەی زۆرێك لە ئاژاوەکان بوو، لەوانەشە هەر لەبەر ئەوە بووبێ ماوەردی گرنگی بە دروستکردنەوە و بنیادی دەوڵەت داوە، لە هەندێك لەو کتێبانەی کە نووسیویەتی کە گرنگترینیان کتێبی (الاحكام السلطانية والولايات الدينية..)یە کە لە پێشەکیەکەیدا دەڵێ: ئەو هۆکارانەی کە پاڵی پێوەنام ئەم کتێبە بنووسم، ئەوە بوو کە دەمبینی کاربەدەستەکان سەرقاڵی (زانستە سیاسییەکان و هەڵسووڕاندنی کاروبارەکان بوون) لەگەڵ ئەوەی کە دەبووایە ئەو حوکمە سوڵتانیانە فێر ببان کە لەگەڵ سەرجەم حوکمەکانی تردا تێکەڵ بە یەك دەبن[٢٥٦]. (هەر لەبەر ئەمەشە کە کتێبێکم بۆی تەرخان کردووە، باسی ئەوەم تێیدا کردوە کە پێویستە گوێڕایەڵی کێ بن و بۆ ئەوەی لەبڕیاردان و جێبەجێکردندا دادپەروەر بن و لە پێدان و وەرگرتنەوەشدا بە ویژدان بن، دەبێ ئاینزا فیقیهەکان ئەوە بزانن کە هەر مافێکیان دەکەوێ بیبەنەوە و هەر مافێکیش بکەوێتە سەر شانیان دەبێ بیدەنەوە،..)[٢٥٧]. (ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەر لە سەرەتای کتێبەکەدا روو لە فەرمانڕەوا خاوەن دەسەڵاتەکان دەکات. فەرمانڕەواش کەسایەتییێکی وا ئاسان نییە، بەڵکو ئەو کەسەیە کە خودای پەروەردگار وەك سەرۆکێك بۆ نەتەوەکەی ناردووە کە لە جێگەی پێغەمبەریشە و خەڵکی لە چوار دەوری کۆ

---

٢٥٦ - ئەبو لحەسەن ئەلماوەردی (الاحكام السطانية. والولايات الدينية) بڵاوکراوەی مستەفا ئەلباب ئەلحەلەبی قاهیرە چاپی دووەم ساڵی ١٩٦٦ لـ٣ ــ .

٢٥٧ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

کردۆتەوە و کاری سیاسیشی پێ سپاردووە[258]. کەواتە ئیمامەتیکردن ئەو بنەچەیەیە، کە بنەماکانی نەتەوەی لەسەر گیرساوەتەوە و بەهۆی ئەوەوەیە کە بەرژەوەندییەکانی نەتەوە پارێزراوە، تا ئەو رادەیەی کە کاروبارە گشتییەکانیش سەقامگیر بووە و هەرێمە تایبەتییەکانیشی لێکەوتۆتەوە و بڕیارەکانیشی لە سەرووی هەر بڕیارێکی سوڵتانییەوەیە..)[259]. ماوەردیش دێ و ناوەڕۆکی کتێبەکەیمان بۆ دەخاتە روو و دابەشی دەکاتە سەر چەند بابەتێك، کە دەبینین زۆر بە شێوەییێکی ئاسایی لە سەرەوە بۆ خوارەوە و لە گرنگترەوە بۆ گرنگەکان دابەشی کردووە..و دەڵێ: (ئەو کتێبە بیست دەروازە لە حوکمە سوڵتانییەکان و ولایەتە ئاینییەکان لە دووتۆی خۆیدا دەگرێ، کە دەروازەی یەکەمیان لە بارەی بە ئیمامبوونە و دووەمیان لەبارەی وەرگرتنی پۆستی وەزارەتە. سێیەمیشیان لە بارەی وەرگرتنی ویلایەتەکانە..)[260]. بەم شێوەیە لە بارەی هەموو پلەو پایە گرنگەکان دەدوێ، ئینجا دێتە سەر ئەوانەی کە گرنگیان کەمترن، تا دەگاتە پلەکانی دادوەر و پێشنوێژ و حەج و سەدەقە و باج و سەرانە تا دەگاتە دەسەڵاتەکانی دەرەبەگ و بارودۆخی دیوان و بە دەسەڵاتەکانی ژمێریاری کۆتایی پێدەهێنێ[261]. ئەو لەو هەموو شتانەدا دەیەوێ دەوڵەتەکەی خۆی لە سەرەوە بۆ خوارەوە بنیاد بنێ، لە فەرمانڕەواوە بۆ گەل، لە بەرزترین پلەو پاییەکانی دەوڵەتەوە بۆ نزمترین پلەو پایە و لەهەمووان کەم بایەختر، تا دەگاتە ئەو چینە خەڵکەی کە تەنانەت مافی سیاسیشیان نەدراوەتێ، فەرمانڕەواش شتێکی ئەوتۆی لە ئەستۆدا نییە تەنها ئەوە نەبێ کە ویژدانی خۆی چی پێ بڵێ و بۆ خواپەرستی چ ئەرکێکی دەخاتە سەرشان تەنها ئەوە دەکات.

---

٢٥٨ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢٥٩ - هەمان سەرچاوە لـ٣ ـــ .

٢٦٠ - هەمان سەرچاوەلـ٤ ـــ .

٢٦١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

## دووەم: ئیمامەتیکردن: ـ

### ١ـ بە ئەرکبوونی ئیمامەتی: ـ

(ماوەردی لە کتێبەکەیدا لەبارەی ئیمامەتی، باس لەوە دەکات کە پلە و پایەی ئیمامەتیکردن جگە لەوەی پلەو پایەیێکی ئاینییە پلەو پایەیێکی سیاسیشە، بەڵکو وای دەبینێ کە (ئیمامەتیکردن بۆ جێگرتنەوەی شوێنی پێغەمبەرەکان داندراوە تا بتوانێ پارێزگاری لە ئاین بکات..) ئەمەش گرنگترین پلەو پایەکانی بنیادی دەوڵەتە، بەڵکو هەندێك پیرۆزیشی پێ بەخشراوە، لەبەر ئەوەی ئیمامەتیکردن شوێنگرتنەوەی پێغەمبەرەکانە و مەبەستی پارێزگاریکردنە لە ئاین و بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانەکانە، کە ئەمەش ئەرکێکی شەرعیە (لەراستیدا ئەمە شوێنگرتنەوەیێکە (خلاقة) لە خاوەن شەرعەوە رێی پێدراوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە دونیا و دین بکات..)[٢٦٢] ئەگەر بێت فەرمانڕەوا نەبوایە (خەڵکی هەر هەمووی نا ئارام و سەرگەردان دەبوون)[٢٦٣].. (تۆ ناتوانی بیر لە دەوڵەتێك بکەیتەوە کە فەرمانڕەوایێکی نەبێ، چونکە فەرمانڕەوا ئەو دەوڵەتە رێکدەخات و بنەماکانی بۆ دادەنێ) بەم شێوەیە ماوەردی بوونی ئیمامێك بە ئەرك دەزانێ و هەر وەك جیهاد کردن و گەڕان بە دوای زانستی کردووە بە ئەرکی سەرشانی موسڵمانەکان. ئەگەر هات و خەڵکانێکی شایستە دەسەڵاتیان گرتە دەست و بە جوانی ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێکرد بێگومان هیچیان لەسەر نامێنێ، بەڵام ئەگەر هات و هیچ کەسێك بەو ئەرکە هەڵنەستا، ئەو کاتە دوو گرووپ لە ناو خەڵکەکە دێنە دەرەوە، یەکەمیان: ئەو خەڵکەن کە دەنگ دەدەن بۆ ئەوەی ئیمامێك بۆ نەتەوە هەڵبژێرن. دووەمیشیان: ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە بۆ ئیمامەتیکردن خۆیان هەڵدەبژێرن. جگە لەو دوو گرووپەش کەسیتر بەر پرسیار نابێ و تاوانی ناکەوێتە سەر شان لە دوا کەوتنی دانانی ئیمامدا[٢٦٤]، بۆیە دەبێ ئەم دوو گرووپە بە لەبەرچاو گرتنی چەند مەرجێکی دیاریکراو ئیمامێك بۆ خەڵکەکە دابنێن.

### ٢- خەڵکانی دەنگدەر:-

مەبەستمان لە دەنگدەر (پیاوانی چارەسەرکردنی گرفتەکانە) ئەو خەڵکە ئەو کەسانەن کە دانان و هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایان دەخرێتە ئەستۆ، لەبەرئەوەی ئەو پلەو پایەیە پلەو پایەیێکی ترسناکە و نابێ هەمووکەسێك قسەی تێدا بکات و دەنگی بۆ بدات، بەڵکو دەبێ ئەو

---

٢٦٢ - د.ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي) لـ ٤٠ ـ .

٢٦٣ - (الاحكام السلطانية) لـ٥ـ .

٢٦٤ - هەمان سەر چاوە لـ٦ـ.

کەسانەی بۆ ئەو کارە دەسنیشان دەکرێن سێ خەسڵەتیان تێدا بەدی بکرێ کە ئەمانەی خوارەوەن:

ا- ئەو دادپەروەریەیان تێدا هەبێ، کە مەرجەکانی هەڵبژاردن لە خۆ دەگرێ.

ب- ئەو زانیاریانەیان هەبێ، کە بزانن کێ شایستەی پلەی ئیمامەتیکردنە.

ج- ئەو حیکمەت و بڕیاردانەی تێدا بەدی بکرێ کە بتوانێ کەسێکی باش بۆ ئیمامەتیکردن هەڵبژێرێ و لە هەڵسووڕاندنی بەرژەوەندییەکانی خەڵکیدا سەر راست و شارەزا بێ [٢٦٥].

هەندێك لە لێکۆڵەر و بیرمەندەکان وای بۆ دەچن کە مەرجەکانی دادپەروەری لێرەدا بە مانای خوداپەرستی دێ، ئەو حیکمەتەی ماوەردیش وەك مەرج دایناوە بە بۆچوونی زاناکان دوو جۆرن: یەکەمیان تیۆری و دووەمیان پراکتیکی. تیۆری، واتە سەرڕاستی و گوتەی راست، پراکتیکیش واتە کرداری چاك [٢٦٦]. جگە لەوان خەڵکانێکی تر هەن پێیان وایە کە مەرجەکانی دادپەروەری، واتە: دەبێ موسڵمان بێ، ئازا بێ، کۆیلە نەبێ، نێر بێ نەك مێ، خواپەرست و سەر ڕاست و پاك بێ. ئەمە مانای ئەو (دادپەروەریەیە کە کە یەکێکە لە مەرجەکان) کە لە لای بیرمەندە موسڵمانەکاندا زۆر دووبارە دەبێتەوە.

بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان دادەنرێن، زاناکان زۆر لەسەری کۆك نین و جۆرەها بۆچوونیان لە بارەیەوە هەیە، یەکێك لەو گرووپانە دەڵێن: دەبێ ئەندامەکانی ئەو گرووپە هەر یەکەیان لە ناوچەییێکەوە هاتبن، بۆئەوەی رازیبوونەکە شێوەییێکی گشتگیری بە خۆیەوە ببینێ تا هەموو خەڵکی بەو ئیمامەتیە رازی بن...هەندێکی دیکەشیان دەڵێن: ئەو گرووپە دەکرێ لە سێ کەسیش پێك بێ، کە بە ڕەزامەندی دووانەکەی تر یەکێکیان دەبێتە فەرمانڕەوا، کە دەکاتە فەرمانڕەواییێك و دوو شاهید، هەروەك چۆن لە مارەبڕینی ئافرەتدا بە ئامادەبوونی باوکی کچەکەو دووشاهید کارەکە ئەنجام دەدرێ، ئەمەش هەروەك ئەو وایە و هەندێ کەسانی تر دەڵێن: هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا بە یەك کەسیش ئەنجام دەدرێ..) [٢٦٧].

---

٢٦٥ - هەمان سەر چاوە لــ٦ـــ.

٢٦٦ - د.سەلاحەددین رسلان (الفكر السياسي عند الماوردي) کتێبخانەی نەهزەتولشەرق لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٥ لــ١٢٤ ــ .

٢٦٧ - الاحكام السلطانية لــ٧ ــ .

لەهەموو حاڵەتێكدا هەڵبژاردنی ئیمام لەلایەن (گرووپی چارەسەركردنی كێشەكان) ئەنجام دەدرێ، ئەوەیان گرنگ نییە ژمارەیان هەر چەندێك بێ، چونكە ئەوان بێ ئەوەی كەس پێی بزانێ ئەو هەڵبژاردنە چۆن ئەنجام دەدرێ، بە دامەزراندنە، یان هەڵبژاردن، نوێنەرایەتی خەڵكی دەكەن.

**٣- گرووپی ئیمامەتیكردن: -**

ئەو گرووپە لەو كەسانە پێك دێن كە بۆ ئیمامەتیكردن داندراون و ئیمام لە ناو ئەواندا هەڵدەبژێردرێ، ماوەردی حەوت مەرجی بۆ ئەو كەسانە داناوە، كە دەبێ تیایاندا هەبێ، ئەو مەرجانەش بە مەرجی بنچینەیی دادەنێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

- ئەو دادپەروەریەی هەبێ كە مەرجەكان لەخۆی دەگرێ.
- ئەو زانستانەی هەبێ كە بەرەو ئیجتیهاد دەیبات.
- هەستەكانی ساغ و سەلامەت بن، وەك بیستن و دیتن و زمان.
- ئەندامەكانی لەشی تەواو بن و كەم وكورتیان تێدا نەبێ كە ببنە رێگر لە جموجۆڵ وخێرایی ولە هەستانەسەرپێدا.
- ئەو بیروڕایەی هەبێ كە دەیگەیێنێتە سیاسەتی دارو دەستەكەی وهەڵسووڕاندنی بەرژەوەندییەكانیان.
- ئەو ئازادی و بە دەنگەوە هاتنەی هەبێ كە دەبێتە هۆی جیهادكردن لە دژی دوژمنان بۆ پاراستنی ئەو هێلكەیەی كە لە ناو دەستیدایە.
- رەچەڵەك وبنەچەی ئەو كەسە دەبێ لە قورەیشییەكان بێ.

بەڕای خاوەنی كتێبی (الاحكام السلطانیة)،(گرووپی چارەسەركردنی گرفتەكان) كاریان ئەوەیە كە ئیمامێك لە ناو گرووپی ئیمامەتیكردن هەڵبژێرن، ئەو حەوت مەرجەی تێدابێ كە پێش ئێستا باسیمانكرد. لێرەدا وەك ماوەردی دەڵێ: رێگاییێكی تریش بۆ هەڵبژاردنی ئیمام بوونی هەیە كە خۆی لە دوو شێوەدا دەنوێنێ، یەكەمیان هەڵبژاردنی ئیمامە لەلایەن گرووپی چارەسەركردنی كێشەكانەوە، دووەمیشیان دەكرێ ئەو ئیمامەی پێش ئەو دەسنیشانی كردبێ.[٢٦٨]

---

٢٦٨ - هەمان سەرچاوە لـ٩ ـــ .

### ٤ـ دانانی جێنشین (ولاية العهد):

ڕێگای دووەمی هەڵبژاردنی شوێنگرەوەی پاشا، یان دەسنیشانکردنی ئیمامێك لەلایەن ئەو ئیمامەی کە هێشتا لەسەر دەسەڵاتە دادەنرێ. ماوەردی بۆ ڕێگەدان بە دانانی شوێنگرەوە ئاماژە بەو نموونەیە دەدا کە لەسەردەمی ئیمامی عومەرەوە ئەم شێوە دانانە جێگیر کراوە، چونکە خەلیفە ئەبوبەکری سەدیق پێش ئەوەی وەفات بکا ئەوی لە شوێنی خۆی بە خەلیفە دەستنیشان کرد.

هەروەها عومەری کوڕی خەتابیش (ر.خ) ئەنجومەنی شوورای ڕاسپارد بۆ دانانی خەلیفەی دوای خۆی، ئەنجومەنیش لەسەری ڕازی بوون و چوونە ناو ئەو شوورایە، کە ئەو جەماعەتە پیاو ماقولانی ئەو سەردەمە بوون و یاوەرەکانی تریش لێی هاتنە دەرەوە..)[٢٦٩]. هەموو ئیمامێك لە توانایدا هەیە جێگرێك بۆ خۆی دەسنیشان بکات و لەدوای خۆی بیکاتە خەلیفە (بێ ئەوەی ڕاوێژ بە یەك کەسی دەستەی هەڵبژادن بکات...). ئەوەی لەسەر شانی خەلیفەیە ئەوەیە کە دەبێ بزانێ کێ شایستەی ئەو پلەیەیە و مەرجەکانی ئیمامەتی تێدا هەیە، (ئەو دانان و دەسنیشانکردنەش دەکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە و ڕازیبوون، یان ڕازینەبوونی ئەوانیتر نابێتە جێگەی بایەخ، لەبەرئەوەی لە دانانی عومەردا(ر.خ) بە خەلیفە پرس و ڕا بە هیچ یەکێك لە یاوەرەکان نەکرا، چونکە ئیمام لە هەموو کەسێك زیاتر مافی دانانی خەلیفەی دوای خۆی هەیە، ئەو دەسنیشانکردنەشی جێگەی باوەڕ دەبێ و قسەکانیشی لە بارەی بابەتەکە جێگیرترە..)[٢٧٠]. خەلیفە دەتوانێ تەنانەت دوو کەسیش لە دوای خۆی یەك لە دوای یەك بکاتە جێنشینی خۆی و ئیمامەتیەکەش لە نێوانیاندا ڕێك بخات، دەڵێ: فلانە کەس لە دوای من دەبێــتە خەلیفە، ئەگەر ئەویش وەفاتی کرد فلانە کەس لە جێگاکەی دەبێتە خەلیفە و ئەگەر ئەویش وەفاتی کرد فلانە کەس لە جێگاکەی دەبێتە خەلیفە، بەم شێوەیە دەبینین، کە خەلیفە لە توانایدا هەیە تا سێ کەسیش لەدوای خۆی بۆ خەلیفایەتی دەسنیشان بکات...[٢٧١]. وەك ئەوەی کە پێغەمبەری خودا کردی کاتێك کە زەیدی کوڕی حارسی کردە سەرکردەی سوپایەکەو فەرمووی: ئەگەر زەید لە شەڕدا بەرکەوت جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب جێی

---

٢٦٩ - الاحكام السلطانية لــ ١٠ ــ .

٢٧٠ - هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە .

٢٧١ - د. سەلاحەدین رسلان (الفكر السياسي عند الماوردي) لــ١٢٩ ــ.

دەگرێتەوە، ئەگەر  ئەویش پێکرا عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە جێی دەگرێتەوە. بێ ئەوەی ئەو جیاوازیە گەورەیەی نێوان سەرکردەی سوپاو ئیمامەتیکردنی نەتەوەیێك لەبەرچاو بگیرێ، چونکە یەکەمیان لە زۆربەی کاتەکاندا بە دامەزراندن دەبێ، بەڵام دووەمیان لە هەموو کاتێکدا دەبێ بە هەڵبژاردن بکرێ. هیچ فەرمانڕەواییێك ئەگەر بە هەڵبژاردنیش هاتبێتە سەر دەسەڵات ئەو مافەی نییە تا سێ فەرمانڕەوا لە دوای خۆیدا دەستنیشان بکات، تا ئەو فەرمانڕەوایەتیەیان بۆ نزیکەی سەدەییێك درێژببێتەوە، تەنها لەبەرئەوەی کە خەڵکی ئەویان هەڵبژاردووە. ئەمە  ئەگەر وامان دانا کە خەلیفە بە راستی لە رێگەی هەڵبژاردنێکی ئازادەوە هاتبێتە سەر دەسەڵات.

### ٥- مەرجەکانی ئیمامەتیکردن و ئەرکەکانی ئیمام:-

لێرەدا کۆمەڵێك مەرج هەیە کە دەبێ لە ئیمامدا بوونیان هەبێ،  (ماوەردی) کە دێتە سەر باسی (خەڵکانی ئیمامەتیکردن) باس لە شەش لەو مەرجانە دەکات کە دەبێ لە ئیمامدا هەبێ، هەرچەندە ناکۆکی لەنێوان بیرمەندە موسڵمانەکاندا هەیە لەسەر هەندێك لەو مارجانەدا، وەك ئەو مەرجەی کە تایبەتە بە (ڕەچەڵەك و بنەچە) ئەو مەرجەی کە دەڵێ: دەبێ ئیمام لە رەچەڵەکی (قورەیش) بێ، هەندێك لە بیرمەندەکان وەك ماوەردی پێیان وایە کە دەبێ وابێ وەك لەو فەرموودەیەی پێغەمبەرمان(د.خ) دەڵێ: (دەبێ ئیمامەکان لە قورەیش بن)، هەروەها لە فەرموودەییێکی تردا دەڵێ: (قورەیشییەکان بە پێش خۆتان بدەن و پێشیان مەکەون)، بۆیە دەبینین ماوەردی دەڵێ: (ئەم دەقە زۆر راستە و هیچ کێشەییێکی تێدا نییە و هیچ گوتەییێکی پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەش بوونی نییە..)[٢٧٢].

یەکێ لەو کەسانەی کە مەرجی قورەیشی بوون رەت دەکاتەوە قازی ئەبوبەکری باقلانییە کە لە ساڵی ٤٠٣ ك کۆچی دوایی کردووە[٢٧٣]. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە دیتیان خەلیفەکان

---

٢٧٢ - الاحكام السلطانية لــ٦ ــ .

٢٧٣ - ئیبنولئەزرەق دەیگێڕێتەوە و دەڵێ : چەندین کەس هەن کە رەچەڵەکی قورەیشیان رەت کردۆتەوە (ئەمەش لە لای قازی ئەبوبەکر)*لە عەرەبیەوە* و کۆمەڵێك لە گروپەکان تا هەندێکیان توندیەکەیان گەیشتە ئەو رادەیەی کە بڵێن (ئەگەر مەرجەکانی قورەیشییێك و نەبەتییێك بۆ ئیمامەتیکردن وەك یەك بوون،

لاوازو بێهێز بوونە و پاشاکانی عەجەم زوڵم و زۆریان لێ دەکەن[٢٧٤]. ئیبن خەلدون وای بۆ دەچێ کە دەبێ ئیمام نەتەوە پەرستێکی زۆر توند بێ، ئینجا ئەگەر ئەو ئیمامە قورەیشی بێ، یان قورەیشی نەبێ. ئەگەر چی جەماوەری فەقێیەکان داکۆکییێکی زۆر لەو مەرجە دەکەن، کە هەر دەبێ ئیمام لە قورەیشییەکان بێ، ئەگەر توانای ئەوەشی نەبێ کاروباری موسڵمانەکان بەڕێوە ببات، ئەمەشیان هەر بۆ زەرورەتە[٢٧٥].

هەروەها لەبارەی ساغ و سەلامەتی ئەندامەکانی لەش و تەندروستی هەستەکانی ئیمام ئەو بیرمەندانە لە نێوان خۆیاندا ناکۆك بوون، ماوەردی دەڵێ: لە دەستدانی هەندێك لە ئەندامەکانی لەش کاریگەری لەسەر بیروڕا و کارکردن و هەڵسان و دانیشتنی ئیمام ناکات و شێوەی لەش و لاریشی ناشرین ناکات، وەك بڕینی ئەندامی زاوزێ و (جوتەگون) [٢٧٦]، کە رێگە لە دانان و بەردەوامبوونی ئیمام ناگرێ، لەبەرئەوەی ئەو دوو ئەندامە تەنها رێگە لە زاوزێ دەگرن، نەك لە بیروڕاکان و چاپوکی پیاو، و وەك ئەو کەسەی لێدێ کە تەرکی دونیای کردبێ. ماوەردی بۆ پشت راستکردنەوەی بیرو راکانی خۆی ئاماژە بەوە دەکات کە لە قورئانی پیرۆزدا (باسی یەحیای کوڕی زەکەریا دەکات کە پیاوێکە شەوانە توانای چوونە لای خێزانەکەی خۆی نییە.. لە هەمان کاتیشدا یەکێکە لە پێغەمبەر و پیاوچاکەکان). لێرەدا وشەی (حصور) ی وا لێکداوەتەوە کە بە مانای ئەوە دێ کە ئەندامی زاوزێی مردووە و توانای جووتبوونی نییە.. یان بە کەسێك دەوترێ کە هەستی چوونەلای ژنانی نەبێ، لەبەرئەوەی ئەمە نەبۆتە رێگر لە بوون بە پێغەمبەر، کەواتە باشتر وایە نەشبێتە رێگر لە بەردەمی بوون بە

---

نەبەتیەکە هەلدەبژێرین، چونکە کەمتر زوڵم و زۆر دەکات، ئیبن خەلدون وای بۆ دەچێ کە (خەڵکی سەر شەقام لە مەرجەکانیاندا مەبەستیان ئەوە بوو کە قورەیشییەکان توندوتیژ و زۆردار بوون.. و ئێستا هەر وڵاتێك تایبەتمەندی خۆی هەیە لە رووی نەتەوایەتی و زۆرینەوە ) (بدائع السلك في طبائع الملك) کە لە لێکۆڵینەوەی ئەبی عەبدوڵڵای کوڕی ئەزرەق و تەعلیقی د. عەلی سامی ئەلنەشارە. لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی راگەیاندنی کۆماری عێراقە ساڵی ١٩٧٧ لــ٧٥ ــ.

٢٧٤ - د. محەمەد یوسف موسا (نظام الحكم في الاسلام ) دار ئەلکاتب ئەلعەرەبی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە لە قاهیرە لــ٦٥ ــ.

٢٧٥ - هەمان سەرچاوە لــ٦٥ ـــ .

٢٧٦ - الانثیان = هەردوو جوتە گون .

ئیمامیش..)[٢٧٧] بەلاّم ئیبنولئەزرەق رای وایە کە توانای سێکسی یەکێکە لە مەرجە گرنگەکانی بوون بە ئیمام و لە دەسدانی ئەو ئەو ئەندامە کاریگەری لەسەر ئەو پلەو پایەیەدا دەبێ، وەك چۆن ئەندامە گرنگەکانی تر، وەك چاو کاریگەریان هەیە، ئەو بۆچوونی وایە کە کاریگەریان لەسەر رەفتارەکانیشی دەبێ وەك: (کوێری و کەڕولاّلی و لە دەسدانی هەردوو دەست، هەردوو قاچ و جوتە گون...هتد)[٢٧٨].

بەم شێوەیە کاروبارەکانی گرنگیدان و پیرۆز راگرتنی فەرمانڕەوا بەم ئاکامە گەیشت ـ کە هەموو شتێکە لە دەولّەتدا ـ کە تەنانەت مشتومر لەسەر توانا سێکسییەکانیشی بکرێ: ئایا ئەگەر یەکێك توانای سێکسی نەمێنێ، یان نەیبێ بە کەلّکی ئەوە دێ ببێتە فەرمانڕەوا وکاروبارەکانی خەلّکی بەڕێوە ببات، یان ئەمە کاریگەری لەسەر کورسی دەسەلاّت نابێ.

ئایا لە دوای ئەو بێنەو بەردانە دەبێ ئەوە تووشی شۆکمان بکات ئەگەر هات و هەندێك لە سەرکردەکانی ئێستامان شانازی بە توانا سێکسییەکانی خۆیانەوە بکەن؟ کە زۆر بە توندی ئەوە رەت دەکەنەوە توانا سێکسییەکانیان لاواز بووە، یان نەماوە و گوایە ئەمە چەند پڕوپاگەندەییێکن دوژمنان دایدەڕێژن و ئاراستەیانی دەکەن. یان ئەوەتا دەبێ بلّێین هەر خۆی لە سەرەتاوە نەریتەکەمان وا بووە؟!.

برادەرێکی تونسیم بۆی گێڕامەوە کە (حەبیب بورقێبە) ی سەرۆکی پێشووی تونس وا راهاتبوو لەسەر تەلەفزیۆنی تونسی وانەی مێژوویی بۆ هاولاّتیان دەگوتەوە. ئەو وانانەش خۆی لە بنەڕەتدا لەبارەی خەباتە نیشتمانییەکانی خۆی بوو و هیچ شەرمیشی لە خۆی نەدەکردەوە، باسی لە توانا سێکسییەکانی خۆی و نێرایەتی خۆی دەکرد، کە چۆن دوژمنان و ناحەزانی ئەو پڕوپاگەندەیان لە دژیدا کردووە، کە گوایە توانا سێکسییەکانی لاواز بووە، یان هەر نەماوە، رق وکینەیان گەیشتبووە ئەو رادەیەی کە پێی بلّێن (نێرەمووکە)، لەگەلّ ئەمانەشدا وەك بەڕێزیان دەلّێ: هەمیشە نێر بووە و دووجار ژنی هێناوە و کوڕێکی بووە ـ تەنانەت ئەو کاتانەی کە توانا سێکسییەکانیشی نەمابوو هەمیشە وەك باوکێك رۆلّێکی سیاسی بەرچاوی لە تونسدا گێڕاوە، کە ئەمە خێرو بەرەکەتێك بوو بۆ ولاّت، چونکە ئەو هێزو توانا سێکسیە

٢٧٧ - هەمان سەر چاوە لــ ١٨ ــ .

٢٧٨ - ئەبو عەبدوللاّی کوڕی ئەزرەق : (بدائع السلك في طبائع الملك) لێکۆلّینەوەی د. عەلی سامی ئەلنەشار لە بلاّوکراوەکانی وەزارەتی راگەیاندن ـ کۆماری عێراق سالّی ١٩٧٧ لــ ٧٢ــ .

زۆره ببوونه چالاکی سیاسی گەرم وگوڕ، کە بە روونی لە کارە نیشتمانی و چالاکیە بە هێزو ناوازەکانی بەڕێزیاندا دەردەکەوتن!.

برادەرێکی تری تونسیم بۆی گێڕامەوە، کە تەلەفزیۆنی تونس، یەك رۆژی تەواو تەنها دیمەنەکانی بەڕێز سەرۆك ئەلحەبیب بورقێبەی نیشانی هاولاتیان دەدا، کە چۆن لە کەنارەکانی دەریادا مەلەوانی دەکات و غاردەدا، تاوەکو بۆ خەڵکی بسەلمێنێ کە سەرۆك هێشتا تەندروستی باشە و تا لە ژیاندا مابێ بە کەڵکی فەرمانڕەوایەتیکردن دێت.

بەم شێوەیە هەواڵەکانی مەلەوانیکردنی سەرۆکی بەخشندە سەردێری سەرجەم ئێزگەو تەلەفزیۆنەکانی ولاتی دەگرتەوە. برادەرە تونسیەکە هەر لە قسەکانیدا بەردەوام بوو دەیگوت: هاولاتیان لە تونس لە دیتن و بیستنی هەواڵەکانی سەلامەتی لەشی سەرۆك بێتاقەت و بێزار ببوون، گەیشتبووە ئەو رادەیەی خەڵکی توانای کردنەوەی تەلەفزیۆنی تونسی نەمابوو.

ئەمە وێنەییێکی زیندووی ئەم سەردەمەیە کە گرنگییێکی زۆر بە ساغ و سەلامەتی لەشی فەرمانڕەوا دەدرێ، ئەمە ئەوەمان بۆ بەرجەستە دەکات کە پێشینان ئەمەیان کردبووە یەکێك لە مەرجەکانی بوون بە فەرمانڕەوا.

بەلام ئەو ئەرکانەی کە دەبێ ئیمام پێیان هەڵبسێ و ئاگای لێیان بێ، ماوەردی دەڵێ: (ئەو ئەرکانەی کە دەبێ لە کارو بارە گشتییەکاندا ئەنجام بدرێ ١٠دە ئەرکن وەك ئەوانەی خوارەوە: ـ

**یەکەم: ـ** پاراستنی ئاین لەسەر بنەما جێگیرەکانی خۆی و ئەو شتانەی کە پێشینانی نەتەوەی ئیسلام لەسەری هاوڕا و کۆك بوونە. بە تایبەتی ئەو شتانەی پێوەندیان بە بیدعەوە هەیە..). ئەگەر هات یەکێك بیدعەییێکی کرد، یان شتێکی بلاوکردەوە کە گومانی لەسەر بوو، ئەو کەسە تێدەگەیێندرێ و راستییەکانی بۆ روون دەکرێتەوە و ماف سنوور و ئەرکەکانیش چی بەر دەکەوێ دەیدرێتێ. (بۆ ئەوەی بتواندرێ ئەو ئاینە لەهەر گرفتێك، کە دێتە رێی بپارێزرێ و نەتەوەش لە هەر خلیسکانێك دوور بخرێتەوە..)[٢٧٩]. یەکەم ئەرکی فەرمانڕەوا، ئەرکە ئاینییەکەیێتی کە (دەبێ پارێزگاری لەو شتانە بکات کە پێشینان و پیاو چاکان و ئاینپەرەرەکان لە سەری هاوڕاو کۆك بوونە، هەروەها ئەو شتانەی کە کێشە گەلێکی

٢٧٩ - الاحكام السلطانیة لـــ ١٥ ـــ .

ئیجتیهادین، ئەوە دەبێ ئازادیان بدرێتێ کە لە رێگەی راوێژکردنەوە لەگەڵ گرووپی چارەسەری گرفتەکاندا چارەی بکەن، بە تایبەتی ئەگەر هات و ئەو فەرمانڕەوایە لەو کەسانە نەبوو کە ئیجتیهاد لە شەرعدا بکات. (زانا ئاینییەکان ئەگەر شتەکە پێچەوانەی بیروڕاکانی ئەوانیش بووایە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خەلیفە دەبوون لە کاروبارەکانی حیکمەتدا..)[٢٨٠]. ئەم ئەرکە یەکەمەش لە رۆژگاری ئێستاماندا مەترسییەکانی خۆی هەیە. هەر وەك چۆن لە رۆژگارەکانی رابردوودا مەترسی خۆی هەبووە[٢٨١].

**دووەم:** ئەرکی نموونەیی فەرمانڕەوا جێبەجێکردنی بڕیارەکانە لەنێوان لایەنە ناکۆکەکاندا، و کۆتایی هێنانە بە ناکۆکییەکانی نێوان خاوەن کێشەکان، تا ئەو کاتەی دەگەنە مافەکانی خۆیان، ئەو کاتە نە هیچ زۆردارێك دەسەلاتی دەبێ و نەهیچ هاولاتییێکیش بە لاوازی دەردەکەوێ[٢٨٢]. ئەمەش ئەوە دەگەیێنی کە دادپەروەری لەناو خەڵکیدا بڵاو دەبێتەوە، ستەم و زۆرداری لەسەر هەژارەکان هەڵدەگیرێ و رێ لە ستەم و زۆرداری خاوەن دەسەلاتەکان دەگیرێ.

**سێیەم:** پاراستنی شیرازەی نەتەوە و قەدەغەکردنی شتە حەرامەکان[٢٨٣]. و خەڵکی خەریکی کار و کاسبی خۆیان بن و لەهاتوچۆو سەفەرکردندا لەخۆیان دڵنیا بن و لەسەرو ماڵی خۆیان نەترسن[٢٨٤]. واتە گرنگیدان بە کات لە ناوەوەو دەرەوەدا، بۆ ئەوەی خەڵکی ئەگەر لە ماڵەوە بێ، یان لە سەفەر بتوانێ بە دڵنیاییەوە بژی.

**چوارەم:** بۆ پاراستنی مەحرەمەکانی خودای گەورە لە دەستدرێژیکردنە سەریان دەبێ چەند سنوورێك دابندرێن و مافەکانی بەندەی خوداش لە دەستدرێژی و تێکدان بپارێزرێن[٢٨٥].

---

٢٨٠ - د. سەلاحەددین رسلان (الفکر السیاسي عند الماوردي) لـــ١٢٥ ـــ.

٢٨١ - د.محەمە یوسف موسا (نظام الحکم في الاسلام) لـــ١٤٠ ـــ.

٢٨٢ - (الاحکام السلطانیة) لـــ١٥و ١٦ ـــ.

٢٨٣ - حەرا مەکان = ئەو قەدەغە کراوانەی کە نابێ دەستیان بۆ ببردرێ. ئەو حەرامانەی کە مرۆڤ دەیانپارێزێ و خۆی لە پێناویاندا دەکاتە قوربانی.

٢٨٤ - (الاحکام السلطانیة ) لـــ١٦ ـــ.

٢٨٥ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

**پێنجەم:** هەرچی کون وکەلەبەر هەیە بە کەرەستەکانی جەنگ و هێزی پارێزەر پتەو بکرێن، تا دوژمنان نەتوانن لە ناکاو هێرش بێنن و دەستدرێژی بکەنە سەر یەکێك لە مەحرەمەکان، یان خوێنی هەر موسڵمانێك یان هەر غەیرە موسڵمانێك بڕێژن[٢٨٦].

**شەشەم:** جیهادکرن دژی ئەو کەسانەی کە داوایان لێکراوە ببنە موسڵمان و نەبوونەتە موسڵمان، یان بچێتە ناو ئەهلی زیمەوە بۆ ئەوەی شەریعەتەکانی خودا بچەسپێ و ئایینی ئیسلام بۆ خەڵکی روون ببێتەوە[٢٨٧].

**حەوتەم:** کۆکردنەوەی ئەو باج و سەدەقانەی کە شەرع و ئیجتیهاد وەك بە ئەرك ئەژماری کردوون بێ ئەوەی خەڵکی بترسێنن، یا زۆری لێ بکەن.[٢٨٨]

**هەشتەم:** دیاریکردنی دیارییەکان و ئەوانەی مافیان لە گەنجینەی دەوڵەتدا هەیە بە بێ ئەوەی زیادەی بخرێتە سەر، یان لێی کەم بکرێتەوە، یان دوایبخەن، یان پێشی بخەن بیاندرێتێ[٢٨٩].

**نۆیەم:** پاداشتکردنی دەستپاکەکان و پێشخستنی راوێژکارەکان لە پێدانی کارەکاندا و ئەو بڕە پارەیەیان بدرێتێ بۆ ئەوەی لە کارەکانیاندا رێکوپێك وسەرکەوتوو بن، موڵك وماڵەکانیش بەو دەستپاکانە دەپارێزرێن[٢٩٠]. لێرەدا مەبەست لەوەیە کە لە دامەزراندنی فەرمانبەرەکانی دەوڵەتدا وورد بن، بۆ ئەوەی لە پاراستنی موڵك و ماڵی خەڵکی دڵنیا بین دەبێ ئاگامان لەوە بێ کە باشترین رەگەز بۆ ئەم کارەدابنێین ـ بە کورتیەکەی وەك ئەوەی ئێستا دەیڵێین، پیاوی شیاو لە شوێنی شیاودا دابندرێ.

**دەیەم:** دەبێ خودی خۆی سەرپەرشتی کارەکان بکات و بارودۆخەکە هەڵبسەنگێنێ و سیاسەتی نەتەوەکەی بەرەو پێش ببات و پاسەوانی لە میللەتەکەی خۆی بکات، لە بەڕێوەبردنی کارەکانی دەوڵەتدا نابێ بە بیانووی خواپەرستی، یان رابواردنەوە کەس لە جیاتی

---

٢٨٦ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢٨٧ - هەمان سەرچاوە.

٢٨٨ - (الاحكام السلطانية) لــ ١٦ ــ.

٢٨٩ - هەمان سەرچاوە.

٢٩٠ - هەمان سەرچاوە.

خۆی دابنیٚ، چونکە لەوانەیە ئەو کەسەی کە لە جیاتی خۆی دایدەنیٚ خیانەت لە خەڵکی بکات و ئەو کەسەی بۆ ئامۆژگاریکردنیش دانراوە لە خەڵکی بە فیٚڵ بیٚ[٢٩١].

ئەمە ئەو ئەرکانەی سەرشانی ئیمامە کە ماوەردی نەختیٚك بە دوور و دریٚژی خستویٚتیە روو، بەڵام ئەوەی بە وردی تەماشای بکات دەبینیٚ کە هەندیٚکیان دەچنە ناو هەندیٚکیانەوە، هەرچەندە هەر هۆییٚکیان بۆ دوو هۆکار دەگەڕیٚتەوە: (پەیڕەوکردن و روونکردنەوەی ئاین و فیٚرکردنی خەڵکی کە بەپیٚی حوکم و ریٚنماییەکانی ئایین بجووڵیٚنەوە و کاروبارەکانی دەوڵەتی پیٚ بەریٚوە ببردریٚ کە چی پیٚویستە بکریٚ، ئەمەش خۆی لەخۆیدا خیٚری هەر هەموو نەتەوەی تیٚدایە بە تاك وکۆمەڵیٚشەوە، لە ناوەخۆو لە دەرەوەشدا..)[٢٩٢].

ئەگەر هات و ئیمام ئەو ئەرکانەی ئەنجامدا کە پیٚش ئیٚستا باسمانکردن، واتە ئەو ئیمامە مافەکانی خودا و نەتەوەی لەو ئەرکانەی کە دەیانکەویٚ و ئەوەی لەسەریانە بە جیٚ گەیاندووە.. دوو مافیان دەکەویٚتە سەر وەك ئەرك: گویٚڕایەڵی و پشتیوانی، ئەگەر هیچ گۆڕانکارییٚك بە سەر باریدا نەییٚت..)[٢٩٣]. ئینجا دیٚ و ئەوەمان بۆ لیٚکدەداتەوە کە گوایە مەبەست لە گۆڕانکارییەکانی بارودۆخدا چیە و دەڵیٚ: (.. ئەوەی کە حاڵ و باری ئیمام دەگۆڕیٚ و بە دەرکردنی دەدات دوو شتە: یەکەمیان لەکەداربوونی دادپەروەریەکەییٚتی و دووەمیشیان بوونی کەموکوڕیە لە لەشیدا..) ـ واتە لە دەستدانی یەکیٚك لەو مەرجە گرنگانەی پیٚش ئیٚستا باسمان کرد، لەگەڵ (دادپەروەری) واتە ئەگەر هات و لە دادپەروەریدا کەم و کوڕی هەبوو، لیٚرە مانای گەندەڵی و ئەنجامدانی کارە قەدەغەکراوەکان و بە دوای ئەو شتانەدا بگەڕیٚ کە کۆمەڵگە رەتیدەکاتەوە و هەروەها بکەویٚتە دوای هەوەس و شەهوەتەکانی خۆی، دەگەییٚنیٚ).. ئەمەش خۆی لەخۆیدا گەندەڵیە و ریٚ لە بە ئیمام بوون، یان بەردەوامبوون لە ئیمامەتی دەگریٚ..)[٢٩٤]. ئەگەر بیٚت و ئیمامیٚك گۆڕانکاری بە سەر لەشیدا هات و ئەندامیٚکی لەشی لە دەستدا، کە ئەمەش دەبیٚتە سیٚ بەش: یەکەمیان نەمانی

---

٢٩١ - هەمان سەرچاوە.

٢٩٢ - د.محەمە یوسف موسا (نظام الحكم في الاسلام) لـ١٤٠ ـ دارولکاتب ئەلعەرەبی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە لە قاهیرە چاپی دووەم.

٢٩٣ - الاحكام السلطانية لـ١٧ ـ.

٢٩٤ - الاحكام السلطانية لـ١٧ ـ.

هەستەکانە، دووەمیان نەمانی یەکێك لە ئەندامەکانی لەشێتی و سێیەمیشیان دروستبوونی کەم وکوڕییە لە هەڵسوکەوتەکانیدا. یەکەم  وەك لە دەستدانی ئەقڵ و چاو، دووەمیش وەك لە دەستدانی هەردوو دەست، یان هەردوو پێ، یان بڕینی هەردوو گونی، هەرچەندە ئەم خاڵەیان لە لای ماوەردی نابێتە ڕێگر لە بوون بە ئیمام، یان بەردەوام بوونی ئیمام لەسەر کارەکەیدا هەر وەکو پێشتریش ڕوونمان کردۆتەوە، بەڵام کەم وکوڕی لە هەڵسوکەوتدا بە بەندکردن، یان بە دیلگرتنی لە لایەن دوژمنانەوە دەبێ. بەندکردن ئەوە دەگەیێنێ کە (هاوکارە دەستڕۆیشتووەکانی خۆی دەستی بە سەردا دەگرن و بەندی دەکەن..)[295]، بەڵام بە دیل گرتن واتە لە لایەن دوژمنێکی سەرسەختەوە بە دیل دەگیرێ و ناتوانێ لە دەستیان رزگاری بێ، ئەمەش ڕێگە لە ئیمامەتیەکەی دەگرێ، لە بەر ئەوەی ناتوانێ سەرپەرشتی کاروباری موسڵمانەکان بکات[296].

دوای ئەوەی ماوەردی لە چەند بەشێکی دوور و درێژی کتێبەکەیدا چۆنێتی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتمان بۆ دەخاتە ڕوو  لەناو دەوڵەتدا، پلەو پایە گرنگەکانمان بۆ دیاری دەکات و چۆن پڕ دەکرێنەوە کە چوار پلەو پایەن: ـ

١- ئەو پلە و پایە گشتیانەی کە وەزیرەکان پڕی دەکەنەوە، لەبەر ئەوەی وەزیرەکان لە هەموو بوارەکاندا و بەپێی تایبەتمەندێتی خۆیان نوێنەری ئیمامن.

٢- ئەو پلەو پایە گشتیانەی هەرچەندە چەند بوارێکی تایبەتیان هەیە وەك: فەرمانڕەواکانی هەرێم و ناوچەکان.

٣- ئەو پلەو پایە تایبەتیانەی کە لە چەند بوارێکی تایبەتیدا دان وەك: (قازی) وڵاتێك، یان هەرێمێك، یان ئەو کەسانەی کە باج کۆ دەکەنەوە، یان ئەو کەسانەی کە داهات و سەدەقەکان کۆ دەکەنەوە، یان ئەو کەسانەی پاراستنی ناوچەکان، یان سەر لەشکری سەربازەکانیان پێ دەسپێردرێ. چونکە ئەمانە هەر یەکەیان تایبەتن بە بوارێکی تایبەت[297].

ماوەردی لە بەشەکانی تری کتێبەکەیدا ئەو چوار پلەو پایەیە لەگەڵ چەندین لقی تر و لەسەر ڕۆیشتنێکی زۆرەوە دەیانخاتە ڕوو. ئێمە ـ لە زۆربەی کاتەکاندا ـ دەبینین کە بەها ئەخلاقییەکانن لە لێکۆڵینەوە و ڕێبازەکەیدا ڕێنمایی دەکەن. بۆ نموونە بۆ دانانی وەزیرێك بیرو

---

٢٩٥ - هەمان سەرچاوە لـ ١٩ ـ.

٢٩٦ - هەمان سەرچاوە لـ ٢٠ ـ.

٢٩٧ - هەمان سەرچاوە لـ ٢١ ـ.

بۆچوونەکانی مەئموونمان وەك نموونە بۆ دێنێتەوە، کە ئەو وەزیرە دەبێ چەند خەسڵەتێکی تێدا بێ وەك ئەوەی دەڵێ: (من بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆم پیاوێکم دۆزیوەتەوە کە خەسڵەتە چاکەکانی تێدا بەدی دەکرێ و لەڕەفتارەکانیدا ڕۆح سووکە و سەرڕاستە و دانیشتن لەگەڵیدا خۆشە و لەگەڵ داب و نەریتەکاندا پەروەردە بووە، دونیا دیدەو نهێنی پارێزە و هەرکارێکی پێ بسپێردرێ رایدەپەڕێنێ.. لە هەڵسوکەوتدا بە میرەکان دەچێ و لە ئارامیدا بە حەکیمەکان دەچێ و لەگوێڕایەڵیدا وەك زاناکانە و تێگەیشتنی فەقیهەکانی هەیە و ئەگەر چاکەیێکی لەگەڵدا بکەی سوپاست دەکات، کە تووشی نەهامەتییێك ببێ ئارام دەگرێ و بەشی ئەمڕۆکەی نافرۆشێ بۆ بەیانی بە روونکردنەوەی جوان و زمانی شیرین دڵی پیاو بۆ خۆی رادەکێشێ...هتد)[298].

ماوەردی وەزارەت دەکاتە دوو بەشەوە: وەزارەتی ڕێپێدراو (تفویض)، ئەمەیان ئیمام وەزیرێك دادەنێ و ڕێپێیدەدا کاروبارەکان بە بیروڕای خۆی و پەنجەمۆری خۆی و توێژینەوەی خۆی بەڕێوە ببات[299]. لێرەدا وەزیری ڕێپێدراو، سەرجەم کاروبارەکان لە جیاتی ئیمام بەڕێوە دەبات، بۆیە ئەم پلەیە زۆر مەترسیدارە، لە هەمان کاتدا هەمان ئەو مەرجانەی تێدا هەیە کە لە ئیمامدا هەیە، تەنها بنەچە (اصل) قورەیشیەکەی نەبێ، بەڵام وەزارەتی جێبەجێکردن، وەزیر لە کارەکانیدا سەربەخۆ نییە و پلەوپایەی ئیمامیشی نییە، بەڵکو تەنها جێبەجێکردنی کاروبارەکانی پێ سپێردراوە، هەروەها دەبێ ئەوەندە لە ئیمام دوور نەکەوێتەوە لەبەر ئەوەی زۆربەی رووداو و کاروبارەکان پێویستیان بە بیروڕا وەرگرتن و ئیجتیهاد هەیە، ئەمانەش کاروبارێکن تەنها لە دەسەڵاتی ئیمامدایە. واتە دەسەڵاتەکانی وەزیری جێبەجێکردن ـ وەك لە ناوەکەشیەوە دەردەکەوێ تەنها جێبەجێکردنی بڕیارەکانە ـ یان راگەیاندنی فەرمانەکانی ئیمامە بە خەڵکی، چونکە ئەو تەنها ئەڵقەییێکی پێوەندیە لەنێوان ئیمام وخەڵکیدا. ماوەردی دەڵێ: (بەڵام وەزارەتی جێبەجێکردن دەسەڵاتەکانی لاوازترە و مەرجەکانیشی کەمترن، چونکە تایبەتە بە جێبەجێکردنی بیروڕا و بڕیارەکانی ئیمام. وەزیریش تەنها ئەڵقەیێکی پێوەندیە لەنێوان ئیمام و دارودەستەکەی و والییەکاندا و فەرمانەکانی ئەو جێبەجێدەکات و ئەنجامیان

---

٢٩٨ - الاحكام السلطانية لــ٢٢ ــ.

٢٩٩ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

دەدات، تەنها ئەو نووسراوانە ئیمزا دەکات کە ئەو بڕیاری پێشینەی لەسەر داوە، هەروەها والییەکانیش لە وەرگرتنی کارەکانیاندا ئاگادار دەکاتەوە..)[300].

ئێمە مەبەستمان لە خستنە رووی پلەو پایەی وەزیر ئەوە نییە کە ئەو قسەیە بخەینە دوای ماوەردی کە (وەزیر ئەرکی بەرگریکردنە لە پاشا پێش ئەوەی بەرگری لە وڵات بکات)[301]. بەڵکو ئەوەی بە راستی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە ئەو چەند مەرجێکی بۆ وەزیر داناوە کە (دەبێ حەوت خەسڵەتی تێدا بێ) ئەو خەسڵەتانەش هەر هەموویان ئەخلاقین، وەك پاراستنی ئەمانەتەکان و فرت و فێڵ نەکردن و راستگۆیی و چاوچنۆك نەبێ و لەنێوان ئەو و خەڵکیدا هیچ دوژمنداریێك، یان گرژییێك نابێ هەبێ، و دەبێ نەکەوێتە دوای هەوەسەکانی خۆی و ئەو هەوەسبازیەش لە سەر رێی راست لای بدات و تووشی خراپەکاری بکات...هتد)[302]. ئەو مەرجی هەشتەمیش دەخاتە سەر ئەو حەوت مەرجە و دەڵێ: (ئەگەر بێت وەزیرەکە بەشداری لە بیروڕاکاندا بکات پێویستی بە خەسڵەتی هەشتەم دەبێ، کە ئەویش ئەزموون و شارەزاییە کە دەبێتە هۆی ئەوەی بیروڕاکانی راست بن و بە چاکی کارەکانی هەڵسووڕێنێ، چونکە پیاو لە ئەزموونەکاندا شارەزایی لە کاروبارەکاندا پەیدا دەکات. ئەگەر بێت بەشداری بیرو راکانیش نەکات، ئەو کاتە پێویستی بە مەرجی هەشتەم نابێ، ئەگەرچی لە ئەنجامی پیادەکردنی کارەکاندا پێویستی پێی دەبێ، ناشبێ ژن ئەم کارە ئەنجامبدات..)[303].

لە دەروازەی سێیەمی کتێبەکەیدا ماوەردی دێتە سەر باسی (میرایەتی)، مەبەستی ئەوەیە کە خەلیفە میرێك بۆ هەرێمێك لە هەرێمەکان دابمەزرێنێ، کە کاری ئەوە دەبێ باجەکان کۆبکاتەوە و پارێزگاری لە ئایین بکات و کیشەکانی خەڵکی چارەسەر بکات و ئاسانکاری بۆ حاجییەکان بکات وکاروبارەکانیان رێك بخات، مافەکانی خوداو خەڵکی دیاری بکات و بیانپارێزێ و لە رۆژانی هەینی و جەژنەکاندا پێش نوێژی بۆ خەڵکی بکات و سەرپەرشتی کارەکانی هەرێمەکە بکات و ئاراستەیان بکا و جیهاد لە دژی دوژمنان رابگەیێنێ...هتد.

---

٣٠٠ - الاحكام السلطانية لــ٢٥ ــ.

٣٠١ - د. حوریە تۆفیق موجاهید (الفكر السیاسی : من افلاطون الی محمد عبده ) کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری چاپی دووەم ١٩٩٢، لــ٢٣٢ و ٢٣٣ ــ، پەراوێزی ژمارە/٢٠.

٣٠٢ - الاحكام السلطانية لــ٢٦ ــ.

٣٠٣ - هەمان سەرچاوە لــ ٢٧ ــ.

هەروەها ماوەردی دوای ئەوە دێتە سەر باسی والییەکان و لە دەروازەی شەشەمیشدا دێتە سەر باسی (ویلایەتی دادوەری) (ولایةالقضاء) و حەوت مەرجەکەی، کە دەبێ پیاو بێ نەك ژن، ئازاد بێ نەك کۆیلە، موسڵمان بێ نەك گاور: (مەرجی پێنجەمیش دادپەروەریە کە لە هەموو ویلایەتێکیشدا ڕێزی خۆی هەیە، دادپەروەریش دەبێ: ڕاستگۆیی لە قسەکانیدا دیار بێ، دەسپاکی پێوە دیار بێ، خۆی لە حەرامەکان بپارێزێ، لە زۆرداری بترسێ، ڕەزامەندی و تووڕەبوونەکانی لە کاتی خۆیدا بێ... هتد مەرجی شەشەمیش ساغ و سەلامەتی بیستن و دیتنییێتی تا بە هۆی ئەو دوانەوە مافەکان دەستنیشان بکات...هتد)[٣٠٤].

٣٠٤ - الاحكام السلطانية لــ٦٦ ـــ.

## کۆتایی:

١- بەمشێوەیە دەبینین بنیادی دەوڵەت لەلای ماوەردیدا، هەمان حاڵی (ئەو سیستەمی دەسەڵاتەی ئیسلامی) هەبوو کە لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێدەکات، لەسەرووی هەمووشیانەوە فەرمانڕەوایە کە چوار مەشقی لەسەر سەرەوە دانیشتووە ئینجا بەرەو خوارەوە شۆڕ دەبێتەوە تا دەگاتە سادەترین تاکەکانی کۆمەڵ.

٢- لە راستیدا ئەم بینا هەرەمیە خۆی لەخۆیدا بنیاتنانێکی ئەخلاقیە، بە تایبەتی لە شێوەی دەسنیشانکردنی فەرمانڕەوادا، کە دەبێ دادپەروەر بێ، دادپەروەریش مانای راستگۆیی، ئەمانەتپارێزی و دەستپاکی و چەند لایەنێکیتری ئەخلاق دەگرێتەوە، بێ ئەوەی هیچ مانایێکی فیقهی، یان یاساییان تێدا هەبێ.

٣- ئەو مەرجانەی کە ماوەردی، یان فارابی، یان ئیبن ئەبی رەبیع دایانناوە بۆ فەرمانڕەوا، دەبێ خەلیفە خودی خۆی لەناو خەڵکیدا کاری دادوەری بکات و راستەوخۆ بڕیارەکانی خۆی بدات، لە کۆتاییشدا هەر دەبێ دادپەروەر بێ و ویژدانی خۆی بەکار بهێنێ و نەکەوێتە دوای هەوەسەکانی خۆی...هتد. ئەمجۆرە بۆچوونانەش لە بنیادی دەوڵەتی نوێدا شتێکی زۆر مەحاڵە و هیچ فەرمانڕەوایێك لەناو دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا ناتوانێ پەیڕەوی بکات.

٤- ئەو بینا هەرەمیەی دەوڵەت کە تیایدا فەرمانڕەوا بە گرنگترین کەس دادەنرێ، دژی بوونی یاسایە کە تیایدا فەرمانڕەوا بێ، ئینجا لە کاتی مردن، یان دیارنەمانی فەرمانڕەواشدا پێکهاتەی دەوڵەت هیچ شڵەژانێکی بە سەردا نایێ لەبەرئەوەی چەند (یاساییێکی) جێگیر لەوێدا بوونیان هەیە و دەسەڵات پشتیان پێ دەبەستێ، لە راستیدا نەبوونی یاسا گرفتی گەورەی داب و نەریتەکانی ئێمە بووە: (ئەوەی راستی بێ فەقیهـ و زاناکان لە توێژینەوەی خەلیفایەتی کردندا زۆر بە پەرۆش نەبوونە.. ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەك رووبەڕووی رژێمە ستەمکارەکان ببنەوە، کە لە سەردەمی ئەمەوییەکانەوە تا ئیستا باڵی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا کێشاوە. ئینجا لێرەدا هۆکار وگرفتەکە هەر چییێك بێ، ئەوەی کە گفت وگۆو قسەو باس

هەڵناگرێ لایەنە فیقهیەکەی ئیسلامە، کە پەیوەستە بە یاسای گشتییەوە[٣٠٥]. کە بە هۆی ئەم کارەوە تا ئێستاکە بە ساوایی ماوەتەوە...هتد)[٣٠٦].

دەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە ماوەردی تەنها لە چەمکە ئەخلاقیەکەی (دادپەروەری) گەیشتووە نەك لە چەمکە یاساییەکەی، دادپەروەری لەلای ئەودا، هاوشانی (راستگۆیی) و (ئەمانەتپارێزی) و (خۆپاراستن لە حەرامەکان) و (پیاوەتی) و (دوورکەوتنەوە لە گوناحەکان)ە...هتد. دەڵێ (دادپەروەر) دەبێ لە گفتوگۆدا راستگۆ و ئەمانەتپارێز بێت و خۆی لە شتە حەرامەکان بپارێزی و لە گوناحەکان دووربکەوێتەوە، لە گومان بە دوور بێ و لە کاتی رەزامەندی و رەتکردنەوەدا مافەکانی خەڵکی بدات و پیاوەتی خۆی لە کارە دونیایی و ئاینییەکاندا بنوێنێ...)[٣٠٧]. ئەو چەمکانە لەلای ئەودا زۆر دووبارە دەبنەوە، وەك چۆن لەلای بیرمەندە کۆن و نوێییەکانیش بە هەمان شێوە دووبارە دەبنەوە[٣٠٨].

٥ - ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە ماوەردی لەهەر هەموو زانا شافعییەکانی تر لە رق وکینە و ستەمەکانی خەلیفە عەباسییەکان دەترسا، هەر لەبەر ئەو هۆکارەشە دەبینین دوای ئەوەی کە کتێبە بەناوبانگەکەی تەواو دەکات، وەسیەتی ئەوە دەکا کە لەدوای مردنیدا ئەو کتێبە بڵاو بکەنەوە! بەمشێوەیە دەبینین هەندێك لە بیرمەندەکانی لێکۆڵینەوە لە کەش و بارێکی مەترسیدار و تۆقێنەردا شت دەنووسن، بەڵام هەندێکی تریان بە مەبەستی ئارەزوو و خۆ نزیك کردنەوە شتیان دەنووسی[٣٠٩]. ئەمانە لە هەردوو حاڵەتەکەدا نووسینێکی پڕ لە ویژدان و بێ مەبەست نانووسن.

٦- ئەم شێوە بنیادنانە قوچەکی و ئەخلاقیەی دەوڵەت، یەکسەر خاوەن دەسەڵات دەکاتە کەسێکی تاکڕەو و ستەمکار، لێرەدا دەبینین ماوەردی هاوبەشیکردن لە خیلافەتدا رەت دەکاتەوە،

---

٣٠٥ - زاراوەی (یاسای گشتی) لێرەدا مەبەستی (یاساکانی دەستووری کارگێڕیە). تەماشای د.عەبدولحەمید متەوەللی کتێبی (ازمة الفكر السياسي الاسلامي في العصر الحديث ) بکە دەستەی میسری گشتی قاهیرە ساڵی ١٩٨٥ لــ٥١ــ.پەراوێزی ژمارە ١٥.

٣٠٦ - د. عەبدولڕەزاق ئەلسەنهوری (فقه الخلافة و تطورها) وەرگێڕانی د. نادیە عەبدولڕەزاق ئەلسەنهوری، دەستەی میسری گشتی بۆ کتێب لە قاهیرە سالی ١٩٨٩.

٣٠٧ - الاحكام السلطانية.

٣٠٨ - د. محەمەد یوسف موسا (نظام الحكم في الاسلام). و د.ئەحمەد چەلەبی (السياسة في الفكر الاسلامي) بەراورد بکە.

٣٠٩ - د. عەبدولحەمید متەوەللی (ا زمة الفكر السياسي الاسلامي) لــ ٥٠ــ.

بۆیە زۆر بە ڕەوانی دەڵێ: (نابێ هاوبەشیکردن لە ئیمامەتیکردندا هەبێ..)[310]. ڕێك وەك ئەوەی نابێ هاوبەشیکردن لە مارەبڕیندا هەبێ[311]، بۆیە دەبێ ئیمام تاکڕەوانە و بە بێ یاسا جڵەوی دەسەڵات بگرێتە دەست، بۆیە لە ویژدان وکتێبی خوداو سوونەتەکانی پێغەمبەر (د.خ) زیاتر هیچی تری نییە پەیڕەوی دەسەڵاتی پێ بکات، بەڵام لەبەرئەوەی قورئانی پیرۆز (کۆڵەپشتێکی بەرفراوانە) وەك ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ر.خ) دەڵێ: (لەبەرئەوەی توێژینەوەو تەفسیری ئایەتەکان ئەوەندە زۆرن بەینی خۆمان بێ هەر فەرمانڕەوایێك دەتوانێ ئایەتەکانی بە ئارەزووی خۆی لێکبداتەوە، لەکۆتاییشدا شتێك نامێنێتەوە تەنها میزاج ویژدانی فەرمانڕەواکە خۆی نەبێ کە چ بڕیارێك دەدات. لەوانەیە (وشەی جوان) ئەو کلیلەی فەرمانڕەوا بێ کە کردنەوەی دەرگا داخراوەکانی بۆ ئاسان دەکات و ڕێگا لە بەردەم پلەوپایە گەورەکانی دەوڵەتدا بکاتەوە و دەرگای گەنجینەکانیش بۆ رزق والا بکات. لەوانەیە ئەوەندە بەس بێ کە ئەگەر یەکێك ئەو بەهرەیەی تێدا نەبوو کە قسەکانی خۆی بە جوانی ڕێك بخات و لە وەرگرتنی پێداویستییەکانیدا دەست بە روویەوە بندرێ و نەیدرێتێ، تا ئەو رادەیە چارەنووس و نانی خەڵکی لە مەترسیدایە کە دەبێ پەیوەست بێ بە رەوانبێژی و ئاخاوتنی دروست، تەنانەت دەبینی کابرایێك کە بە حیکمەت و دادپەروەری و بە ویژدانی ناوبانگی دەرکردووە، یەکێکی وەك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کە دەکاتە پێنجەمین خەلیفەی راشدین، بەمشێوە نامۆیە دێتە ئاخاوتن: (ئەو پیاوەی کە دێت داوای پێداویستییێکم لێ دەکات ئەگەر موستەهەقیش بێ، بەڵام لەبەر ئەوەی زمان دەگرێ و نازانێ قسە بکات، پێداویستیەکەی نادەمێ، ئەمەش لەلای من وەك ئەوەی دەنکە هەنارێکی ترش داکرۆژم وایە. لەبەرئەوەی من زۆر رقم لە زمانگرتن دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکی تر بێ و داوای شتێکم لێ بکات ئەگەر موستەهەقیش نەبێ، بەڵام بە جوانی قسەم لە گەڵدا بکات پێداویستیەکەی دەدەمێ، هەر لەبەرئەوەی چێژ لە قسەکانی وەردەگرم..)[312]. بێ ڕێزی دەگاتە ئەو راددەیەی کە لەلای فەرمانڕەوایێکی دادوپەروەردا، کابرایێك کە مافی خۆیەتی ئەو شتەی پێویستی پێی هەیە بیدرێتێ، بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانێ ئەو پێداویستیە بە زمانێکی پاراو داوا بکات لێی بێبەش دەکرێ، لە کاتێکدا یەکێکی تر کە مافی ئەوەی نییە ئەو پێداویستیەی بدرێتێ، بەڵام لە بەر ئەوەی قسەکانی خۆشە داواکەی جێبەجێ دەکرێ!. ئەم شێوە دەربڕینە ئەو مەودا ترسناکانەی

---

٣١٠ - الاحكام السلطانية لــ٩ــ..

٣١١ - هەمان سەرچاوە.

٣١٢ - لە کتێبەکەی د. زەکی نەجیب مەحموود (تجدید الفکر العربي) وەرگیراوە لــ ٢٣٣ــ.

دەسەلاتمان بۆ دەردەخا کە پشت بە دادپەروەری و ویژدانی فەرمانڕەوا دەبەستێ، بێ ئەوەی پشت بە هیچ یاسایێك ببەستێ کە ماناکانی دادپەروەری و یەکسانی و ویژدان دیاری بکات!.

٧- تۆ تێبینی ئەوە بکە کە فەرمانڕەوا وەك باوکێك مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە، کە لەو حاڵەتەدا خەڵکی وەك کۆمەڵە (هەرزەکارێك)، یان کۆمەڵێك منداڵی (پێنەگەیشتوو) و نەفام کە پێویستیان بە یەکێکە سەرپەرشتیان بکات، یان وەك کۆمەڵە (مەڕێکن) پێویستیان بە شوانێکە بیان لەوەڕێنێ و بیانپارێزێ، نەك تەنها لە دوژمنەکانیان، بەڵکو لە نێوان خۆشیان. ئەمەش شێوازێکە زۆر لە شێوازەکانی دەسەلاتی نوێ بە دوورە.

٨- هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا پرسێکی زۆر رووکەشانەیە:

**یەکەم:** لەبەرئەوەی ماوەردی خۆی رێگەی بەوە داوە کە فەرمانڕەوا بە دامەزراندن بێ نەك لە لایەن خەڵکیەوە هەڵبژێردرێ، وەك پێشتریش باسمان کرد، لەو حاڵەتەی کە خەلیفە خۆی خەلیفەی دوای خۆی دادەنێ.

**دووەم:** لەبەرئەوەی ئێمە نازانین ژمارەی ئەندامەکانی گرووپی (چارەسەرکردنی گرفتەکان) چەند کەسن: کە ئایا شەشن، یان پێنجن، بەڵکو بەردەوام لە دابەزیندایە، تەنانەت دەیان گوت کە ژمارەیان سێ کەسە کە بە رەزامەندی دووانەکەی تر یەکێکیان دەبێتە خەلیفە وەك دوو شایەتحاڵ، وەك چۆن لە مارە برینی ژناندا بە باوکی کچەو دووشایەتحاڵ دەکرێ، بۆیە ئەو دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنەی ئەوان پێی هەڵدەستن بۆ هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا بەهایێکی ئەوتۆی نییە. گرووپێکی دیکە دەڵێن تەنانەت ئەو لێژنەیە بە تاکە یەك کەسیش ئەنجام دەدرێ[٣١٣].

**سێیەم:** (ئەگەر دانانی خەلیفە، یان ئیمام بە هەڵبژاردن بێ، یان بە دامەزراندن بێ، کەس نایزانێ ماوەی حوکمڕانیکردنەکەی چەندە، بە زۆربەی مەزەندەکان تا لە ژیاندا بمێنێ حوکمڕانی دەکات. هەر لەبەرئەمەشە کە هەندێك لە نووسەرە نوێییەکان دەڵێن (ئیسلام) نازانێ ماوەیێکی دیاریکراو بۆ خەلیفە دەسنیشان بکات تا لەو ماوەیەدا کاروبارەکانی نەتەوە هەڵسووڕێنێ و دوای ئەوە لە دەسەلات بێتە خوارەوە و یەکێکی تر لە رێگەی هەڵبژاردنەوە، یان هەر رێگەیێکی ترەوە بێ جێگاکەی بگرێتەوە، بەلام ئەوە دەزانێ کە خەلیفە چەند ئەرکێکی لەسەر شانە دەبێ جێبەجێیان بکات و لە دەسەلاتیشدا دەمێنێتەوە و تا ئەو کاتەی کە بۆ ئەو کارە بگونجێ بەرپرسیارێتییەکان لە ئەستۆ دەگرێ، هەروەها بۆی هەیە تا لە ژیاندا

٣١٣ - ئەبو لحەسەن ئەلماوەردی (الاحکام السلطانیة ) لــ٧ــ.

ماوه له کارەکەیدا بمێنێتەوه. ئەمەیە کە ئیسلام دەیزانێ و بڕیاری لەسەر داوه کە ئەوپەڕی خێرو بەرەکەتە بۆ نەتەوەی ئیسلام..)[٣١٤].

٩- گرنگیدانی بیرمەندە موسڵمانەکان بە کەسایەتی کاریگەرو بەهێزی فەرمانڕەوا، ڕێك بە پێچەوانەی ئەو ئاراستەیەیە کە بیرمەندەکانی ئەو سەردەمەی ئێستا کە لە ترسی ئەو کاریگەریە بە هێزانەی کە لەسەر خەڵکیان هەیە نەوەك بە سەریاندا زاڵ بێ، بۆیە بانگەشەی ئەو بۆچوونە بڵاو دەکەنەوە کە (کەسایەتیە کاریزماکان) لە دەسەڵات دوور بخەنەوە. (لە هەندێك وڵاتی ڕۆژئاوادا وەك فەڕەنسا: ڕێڕەوەکە بەرەو هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار لە ناو ئەو کەسانەدا دەبێ کە کاریگەریان بەسەر جەماوەرەوە نابێ، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەك کەسایەتیە بەهێزەکەی سەرۆك کۆمار کاریگەری لەسەر رای گشتی دروست بکات، کە لە کۆتاییدا ئەنجامەکەی دەبێتە هۆی زۆربوونی هێزو دەسەڵاتەکانی ئەو سەرۆکە..)[٣١٥].

١٠- لە کۆتاییدا ئایا ئەو کەسایەتییە ئەخلاقیە ـ مەبەستم ئەو پیاوە بێخەوشە خواپەرست و لەخواترسە خاوەن ویژدانە زیندووەیە...هتد) ـ کە بۆ دەسەڵات دەگونجێ، یان ئەمە تەنها بیرۆکەیێکی یۆتۆپییە و بەس کە هەر بگاتە سەر ئەرزی واقیع ورد و خاش دەبێ و نامێنێ، لەبەرئەوەی کەسایەتی پیاوی دەوڵەت پێویستی بە چەند خەسڵەتێکی تایبەتی هەیە؟ نموونەیێك دێنینەوە کە لە مێژووی ئیسلامیدا روویداوە: (ئەبو موسای ئەشعەری پیاوێکی بێخەوش وخواپەرست و لە خواترس بوو و هەرهەموو مەرجەکانی دادوەری تێدا هەبوو، عومەری کوڕی خەتابیش دوای ئەوەی لێی دڵنیا بوو کردی بە دادوەر (قاضي)...هتد.

بەڵام ئایا بە تەنها ئەو خەسڵەتە ئەخلاقیە بەرزانە بەس بوو بۆ ئەوەی ببێتە پیاوی دەوڵەت، تەنانەت پیاوێکی سیاسیش بێ؟ ئەمەیان لە واقعێکی پراکتیکی زیندوودا لە رۆژی ناوبژیوانیکردنەکەدا بە (نەخێر) وەڵام دەدرێتەوە، ئەوکاتەی ئەبو موسای ئەشعەری ئەو پیاوە بێخەوشە، رووبەرووی عەمری کوڕی عاس بۆوە کە پیاوێکی سیاسەتمەدار بوو، ئەنجامەکەشی هەموو کەس دەیزانێ چی بوو.

---

٣١٤ - محەمەد یوسف موسا (نظام الحکم في الاسلام) لـ١٤٦ـ.

٣١٥ - د. ئەحمەد عەبدولقادر ئەلجەمال (مقدمة في اصول النظم الاجتماعية والسياسية)لـ٤٦٩ـ، چاپی دووەم ساڵی ١٩٨٥ کتێبخانەی نەهزەی میسری.

# بەشی چوارەم

## (ئەبوبەکر ئەلتەرتووشی.. و (سراج الملوك)[316]

**((سوڵتان وەك تاوی باران وایە ئاودێری خودای گەورە و بەرەکەتی ئاسمانە کە ژیان بە زەوی و هەرچی لە سەریدا دەژی دەبەخشێ ...))**

**ئەلتەرتووشی (سراج الملوك) لـ٤٩ـ))**

٣١٦ - ئەمە ئەبوبەکری محەمەد بن ئەلوەلید ئەلتەرتوشی (٤٥٠ ـ ٥٣٠ ك) دانەری کتێبی (سراج الملوك) ە کە لە چاپخانەی میسری لە ساڵی ١٣٨٩ ك چاپکراوە.

## یەکەم: پێشەکی:

ئەو توێژینەوانەی، کە موسڵمانەکان لەبارەی سیاسەت و ڕێکخستنی دەوڵەت نووسیویانە وەك نەریتێك هەر هەموویان لە لووتکەوە بۆ لای خوارەوە دەست پێ دەکەن و لە خەڵکە ڕەشۆکیەکە کۆتایی دێ. مەبەستم ئەوەیە کە لە فەرمانڕەواوە، یان لە سوڵتانەوە دەست پێدەکات، ئینجا دوای ئەو وەزیرەکان و والییەکان و دادوەرەکان دێن، تا دەگاتە سەر باسی پێوەندییەکانی نێوان فەرمانڕەواو خەڵکی!.

(سراج الملوك) ئەو کتێبەیە کە تەرتوشی دایناوە و ئێستا لە بەر دەستماندایە، توێژینەوە بۆ کارو بارە سیاسییەکانی شەش نەتەوە دەکات که لە سەردەمی خۆیاندا هەبوونە، دوای ئەوە دێت و پوختەی ئەو لێکدانەوانە کۆدەکاتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە چراییێك بۆ پاشاکان کتێبەکەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە: ـ

بە پێی بۆچوونەکانی نووسەری کتێبەکە (ئەو کتێبە لە رووی هونەرکاری و هۆکارەکانیدا شتێکی نامۆیە و زۆر قورس نییە و سوودی بۆ خەڵکی زۆرە، هیچ نووسەرو زاناییێك وەك ئەوی نەنووسیوە مەترسی ئەو کەسانەش کە حەز لە خۆتێهەڵقورتاندن دەکەن بە سەر هۆنراوەکانیدا گوزەری نەکردووە و لە خەزێنەی سەرۆك و پاشاکانیشدا بوونی نییە[٣١٧].

تەرتوشی لە دەروازەی یەکەمی کتێبەکەیدا بە کۆمەڵێك ئامۆژگاری بۆ پاشاکان دەست پێ دەکات. لە دەروازەی دووەمیشدا باس لە گرنگی (زاناو پیاوچاکەکان) دەکات لەلای میرو سوڵتانەکاندا، هەر ئەوانن کە دەتوانن وەعز و ئامۆژگاری و ڕێنماییە ئەخلاقیەکان بڵێنەوە کە تەرتوشی هەندێکیان لێ دەگێڕێتەوە ـ ئەو لێرەدا دەگاتە ئەوەی کە بڵێ ئەگەر پاشا، یان سوڵتان بە ڕاستی خوای خۆی خۆش بوێ، دەبێ ئەو پاشایە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا بێ، ئەو شیعرەش بە نموونە دێنێتەوە:

٣١٧ - تەرتوشی (سراج الملوك ) چاپی میسری ساڵی ١٣٨٩ ك لــ٤ــ.

تعصى الاله وأنت تظهر حبه هذا لعمري في المقال بديع
لو كان حبك صادقا لاطعته ان المحب لمن يحب مطيع
في كل يوم يبتديك بنعمة منه وأنت لشكر ذاك مضيع[318].

واتە: دژی خوا رەفتار دەکەیت وا خۆت پێشان دەدەیت گوایە خۆشت دەوێ، ئەگەر بە راستی خۆشت ویستبا گوێڕایەڵی دەبوویت، چونکە ئەگەر یەکێك یەکێکی خۆش بوێ بە گوێی دەکات، ئەو هەر رۆژەی نیعمەتێکت پێ دەبەخشێ، کەچی تۆ سوپاسگوزاری نابیت.

لە دەروازەی سێیەمیشدا باس لە (والییەکان و دەزگای دادوەری) و شێوەی حوکمڕانیکردن دەکات لەنێو خەڵکیدا، هەروەها باس لەوە دەکات، کە حوکمڕان نابێت بکەوێتە دوای ئارەزووەکانی خۆی.

## دووەم: هەڵێنجانی چەند بابەتێك لە کتێبەکەی تەرتوشیدا:

تەرتوشی دێت کۆمەڵێك چیرۆك و بەسەرهاتی هەڵبەستراومان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لە بنەڕەتدا بۆ رێنمایی و ئامۆژگاریکردن بە چاکە دەیانگێڕێتەوە، هەر هەمووشیان (ئامۆژگاریکردنی پاشاکانە)، کە تیایدا پاشاکان لەسەر دادپەروەری و پیاو چاکی و رەفتاری راست و رەوان هاندەدات. ئەم شێوە ئامۆژگاریکردنەش تا ئێستا وتاربێژی مزگەوتەکان لە وڵاتەکانماندا بەکاری دەهێنن، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی کە هەندێکجار شتەکان هەڵبەستراون و هەندێك جاریش درۆ و دەلەسەن. (لەوانەیە خۆشیان نەزانن کە ئەم چیرۆکانە هەڵبەستراون، لەبەرئەوەی نایخەنە ناو تەرازووی ئەقڵەوە، چونکە چیرۆکەکان مەبەستیان چاکەکردنە و هیچ زیانێکیان نییە، مەبەستەکەش ئەخلاقیە ئەوەندەش بەسە بۆ ئەوەی بیری لێ نەکەنەوە ـ ئەمە ئەو چیرۆکە کۆن بە ناوبانگەمان بیر دەخاتەوە، کە لەبارەی یەکێك لە زانا ئاینییەکانە لە شەقامەکانی شاری بەغدا بە رێگادا دەڕۆیشت لە کاتێکدا گوێی لە پیاوێك بوو کە بە ناوی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە قسەی بۆ خەڵکی دەکرد کەچی قسەکانیشی هەڵبەستراو بوون، ئەو کابرایە لەبەرئەوەی مەبەستی چاکەکردن بوو وای دەزانی کە شتێکی باش دەکات زاناکەش لێی دێتە قسە و پێی دەڵێ: هۆ کابرا، ئەگەر تۆ بەراستی خۆت لە فەرمودەکانی پێغەمبەر(د.خ) بە شارەزا دەزانی؟ گوێت لەو فەرمودەیە نەبووە کە

٣١٨ - هەمان سەرچاوە لـ٣٨ـ.

دەڵێ: (ئەوەی درۆ بە زمانی مندا بکا، دەبێ ئەوە بزانێ کە جێگای ناو ئاگری دۆزەخە)، پیاوەکەش بە هەمانشێوەی پێشتر وەڵامی دایەوە گوتی: (وەڵڵاهی درۆم پێدا نەکردووە، بەڵکو درۆم بۆی کردووە!). کابرا هەست بەوە ناکات کە درۆ هەر درۆیە، ئەگەر بۆی بکات، یان درۆکە بەودا بکات، ئەمە رەفتارێکی خراپ و ناشیرینە، چونکە ئەم کارە دەروازەی خراپەکاریە.

(تەرتوشی لەم بارەیەوە چیرۆك و بەسەرهاتی زۆری لە کتێبی (سراج الملوك) دا گێڕاوەتەوە کە ئەمە هەندێك لەو چیرۆکانەیە: ـ

لە ئیبن عەباس دەگێڕنەوە کە یەکێك لە پاشاکان جلوبەرگی خۆی گۆڕیبوو و بە ناو وڵاتەکەی خۆیدا دەگەڕا و دەسوڕایەوە رێی کەوتە لای پیاوێك، پیاوەکە مانگاییێکی هەبوو، ئەو مانگایە لە کاتی دۆشینیدا ئەوەندەی (٣٠) مانگا شیری هەبوو، پاشاش ئەم شتەی پێ سەیر بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی وا باشە من ئەو مانگایە بۆ خۆم ببەم، کە بۆ رۆژی دواتر گەڕایەوە ئەوێ دیتی مانگاکە نیوەی شیری رۆژی پێشتری هەبوو. پاشا بە خاوەنەکەی گوت ئەوە چییێتی بۆ شیرەکەی وا کەمی کردووە: وا پێ دەچێ دوێنێ لە لەوەڕگاییێکی تر لەوەڕابێ؟ پیاوەکە لە وەڵامدا گوتی نەخێر! بەڵام وابزانم پاشاکەمان بە تەمای بردنی مانگاکە بوو، بۆیە شیرەکەی وا کەمی کردووە، چونکە ئەگەر پاشا زۆرداری بکا، یان بیەوێ زۆر لە خەڵکی بکا بەرەکەت نامێنێ! پاشاش لە دڵی خۆیدا پەیمانی لەگەڵ خۆیدا بەست، کە ئەو مانگایە نەبات، بۆ رۆژی دواتر گەڕایەوە هەمان ماڵ تەماشای کرد مانگاکە ئەوەندەی (٣٠)مانگا شیری هەبوو، پاشا لەوساوە تۆبەی کرد و پەیمانیدا و گوتی: (دەبێ تا لە ژیاندا مابم دادپەروەری بپارێزم..)[٣١٩].

تەرتوشی لە گێڕانەوەی ئەمجۆرە چیرۆکانە بەردەوام دەبێ کە لە کۆتاییدا چەند ئامۆژگارییێکیان لە بارەی ئەخلاق تێدایە بۆ پاشاکان. دەڵێ: لە (خاکی مەغریبدا) پاشاییێك هەبوو ویستی دەست بە سەر باخچەی ژنێکدا بگرێ کە قامیشی شەکری تێدا چاندبوو، لەبەرئەوەی هەر (کەڵە) قامیشێك پەرداخێك شەکراوی دەدا، بەڵام دوای ئەوەی پاشا دەستی بە سەر باخچەکەدا گرت و دوایە باخچەکە چۆن بەرەکەتی تێدا نەما!، (بۆیە

---

٣١٩ - تەرتوشی (سراج الملوك ) لـ٤٥ـ.

پاشا لەو نیازەی کە هەیبوو پاشگەز بۆوە و تۆبەی کرد و رووی لە قاپی خودا کرد!. هەروەها سەربردەی ئەو دارخورمایەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە دێهاتەکانی میسردا بوو، کە ساڵانە ١٠ دە حەسیرە خورمای دەدا، کە پاشا دەستی بە سەردا دەگرێ لەو ساڵەدا یەك دەنکە خورماش چییە نەیگرت!![٣٢٠].

ئەمانە هەر هەمووی چەند چیرۆکێکی هەڵبەستراون، ئەو کەسەی کە چیرۆکەکانی هەڵبەستووە وا هەست دەکات کە ئەو مەبەستە ئەخلاقیەی کە ئەو کردوویەتیە ئامانج، پاکانە بۆ هەڵبەستانەکەی دەکەن، کە سەرجەمیان کۆمەڵێ ئامۆژگارین بۆ پاشاکان.

لەراستیدا ئەگەر پاشا بشزانێ ئەمە لەناوەرۆکدا زانستێکی ئەخلاقیانەیە، هۆکارەکەشی ئەوەیە قەوارە سیاسیەکەی خۆی لەسەر بنچینەی پاشایەکی چاك دامەزراوە، کە ئامانجی ئامادەکردنی خەڵکێکە کە کردەوەی چاك ئەنجام بدەن بۆ رۆژی قەیامەت. هەر لێرەوە ئەم جۆرە زانست و مەعریفەتەی کە ئەم سیستەمە پێویستی پێیان دەبێ ئەخلاقیانەن هەروەها ئاراستەکانیشیان ئەخلاقین، بۆیە ئەم نمونەیەت بۆ دێنمەوە.

یەکێك لە پاشاکانی مەغریب کە لەگەڵ وەزیرێکدا بوو، کۆمەڵێك بازرگانی دیت بە وەزیرەکەی گوت: (دەتەوێ سێ گرووپت نیشاندەم، کە گرووپێکیان دین و دونیایان هەیە، گرووپێکیشیان نە دونیایان هەیەو نە دین، گرووپی سێیەمیشیان دونیایان هەیە، بەڵام دینیان نییە؟ ئەویش گوتی: جەنابی پاشا ئەمە چۆن دەبێ؟. پاشاش گوتی: ئەوانەی دین و دونیایان هەیە، ئەو بازرگانانەن کە رۆژانە بژێوی خۆیان پەیدا دەکەن و نوێژەکانی خۆشیان دەکەن و کەسیش ئازار نادەن. ئەوانەی کە نە دینیان هەیە و نە دونیا، ئەوانە پۆلیس وخزمەتگوزارەکانی بەردەستی ئێمەمانانن. ئەو گرووپەی کە تەنها دونیایان هەیە و دینیان نییە، ئەوانە من و تۆ و پاشاییەکانی ترن..)[٣٢١].

تەرتوشی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: رۆژێکیان یەکێك لە پاشاکان بە هاوڕێکەی خۆی دەڵێ: (ئەوە چاك بزانە کە بەهەشت و پاشا لەگەڵ یەك کۆنابنەوە)[٣٢٢].

تەرتوشی زۆرجار دەگێڕێتەوە کە رۆژێکیان یەکێك لە پاشاکان دەنێرێتە لای پیاوێکی ماقووڵ و داوای لێدەکات کە ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات، چونکە دەیەوێ بۆ برادەرێکی خۆی بێ، و

---

٣٢٠ - هەمان سەرچاوە لـــ٤٦ـــ.

٣٢١ - هەمان سەرچاوە لـــ٤٧ـــ.

٣٢٢ - هەمان سەرچاوە.

چەندینجار ئاگاداری دەکاتەوە، بەڵام پیاوەکە قایل نابێ. بەڵام دوایی یەکێك پێی دەڵێ: (هیچ چارەیێکت نەماوە و دەبێ قایل بی، چونکە پاشا نەدەزانێ عەیبەی دونیا چیە و نە لە ئاگری دوارۆژیش دەترسێ)، بۆیە ناچار پیاوەکە قایل دەبێ و ژنەکەی خۆی بۆ کابرا تەڵاق دەدات!!.

### چەند نموونەییێکی تر

أـ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان لەو رۆژەوەی کە بووە خەلیفە قورئانی پیرۆزی بە لاوە نا.

ب ـ هارونە رەشید:

(کە هارونە رەشید دەچێ بۆ حەج لە کاتی (تەوافدا) (عەبدوڵڵای عومەری) چاوی پێی دەکەوێ و پێی گوت: هارون، ئەویش گوتی بەڵێ مامە! گوتی: لێرەدا چەند خەڵك دەبینی؟ ئەویش گوتی: مەگەر تەنها خوا بزانێ چەندن. گوتی: ئەوە چاك بزانە کە هەرکەسەو تەنها دوعا بۆ خۆی دەکات، بەڵام تۆ بە تەنها دوعا بۆ هەر هەموویان دەکەیت، ئینجا ئەو شتە بزانە! هارون یەکسەر دانیشت و دەستی بە گریان کرد، ئەوانیش بە دیاریەوە دانیشتن دەسەسرێکیان دایە دەستی تا فرمێسکەکانی خۆی پێ بسرێتەوە)!!.

## سێیەم: روونکردنەوەی حیکمەتەکانی بوونی سوڵتان لە سەر زەویدا:

دەبێ ئەوە بزانن کە خودا ئێوەی خۆش دەوێ، چونکە بوونی پاشا لەسەر زەویدا خۆی لەخۆیدا یەکێکە لە حیکمەتەکانی خودای مەزن و نیعمەتێکی گەورەیە داوێتیە بەندەکانی خۆی، لەبەرئەوەی خودای گەورە مرۆڤی لەسەر بنچینەی خۆشەویستی و تۆڵەکردنەوە و بێ ویژدانی دروست کردووە، ئەگەر گەورەییێکیان نەبێ وەك نەهەنگەکانی ناو دەریایان لێ دێ، کە گەورەکان بچووکەکان[٣٢٣] قووت دەدەن، ئەگەر بێت پاشاییێکی دەسەڵاتدار و تۆڵەسێنیان نەبێ لەنێوان خۆیاندا رێك ناکەون و بژێوی رۆژانەشیان راستە رێ نابێ و چێژیش لە ژیان وەرناگرن[٣٢٤].

---

٣٢٣ - بۆیە ئێمە لاریمان لەوەدا نییە کە پاشا بنێرێتە دوای یەکێك لە حەکیمەکان و لەبارەی ئەوەی کە کام لەمانە لە پێشترن و پێی دەڵێ : من سێ شتت لێ دەپرسم ئەگەر بە راستی وەڵامیان بدەیتەوە ئەوساکە من دەبمە یەکێك لە قوتابییەکانی تۆ : پرسیارەکانیش ئەمانەن، چ جۆرە خەڵکێك بۆ بەزەیی پێدا هاتنەوە لەپێشترن و کارو بارەکانی خەڵکی کەی تێ بزر دەبێ و بە چ و رێگاییێك نازو نیعمەتەکان لە خودای گەورە وەردەگیرێ ؟!.(سراج الملوك) لــ٣٧ــ.

٣٢٤ - ئەم چیرۆك و سەربردانە هەر هەمووی لە کتێبەکەی تەرتووشی (سراج الملوك) لــ٤٧ــ. وەگیراوە.

ئەگەر تەرتوشی لە (بوونی پاشادا) مەبەستی ـ دانانی چەند یاسایێك با، بۆ ئەوەی پێوەندییەکانی نێوان خەڵکی رێك بخات، لەبەرئەوەی بە بێ یاسا وەك کۆمەڵە ئاژەڵێکیان لێ دێ و ورگی یەکتر هەڵدەدڕن، ئەو کاتە ئێمەش لە گەڵیدا هاوڕا دەبووین: بەڵام ئەوەی جێگەی داخ وپەژارەیە، ئەوەیە کە ئەو مەبەستی لە پاشا (فەرمانڕەوا)یە ـ بەڵکو ئەو لە نێوان بوونی ئەو تاك و تەنیاییەی کە خودای گەورە هەیێتی لە هەڵسووڕاندنی گەردوندا و نێوان بوونی یەك پاشادا بەراوردی دەکات.

(وەك چۆن لە وڵاتێکدا بوونی دوو پاشا سەر ناگرێ، گەردونیش بە بوونی دوو خوداوەند سەر ناگرێ، سەرتاسەری گەردون لە ژێر دەسەڵاتی خودای مەزندایە، هەروەك ئەو وڵاتەیە کە لە ژێر دەسەڵاتی پاشاییێکدایە لەسەر زەویدا..)

دارو دەستەی بێ پاشا، وەك ئەو ماڵە وایە کە چرایێکی تێدا نەبێ رووناکی بکاتەوە و کۆمەڵە خەڵکێکیش لە چواردەوریدا کۆ ببنەوە و کارە دەستییەکانی خۆیان بە چاکی جێبەجێبکەن، تەماشا دەکەی لە ناکاودا چرایەکە دەکوژێتەوە و خەڵکەکە هەر هەمووی بۆ ماوەییێك دەستی لە کارکردن دەوەستێ و هەموو کارەکانیش دەوەستێن و جرِوجانەوەرە زیانبەخشەکان دەست بە جموجۆڵ دەکەن و سەر دەهێننە دەرەوە و دوپشك لە جێگاکانی خۆیان دێنە دەرەوە و مشکەکان دەست بە تەراتێن دەکەن و مار و مۆر سەریان لە کون دەهێننە دەرەوە...هتدی.

(سوڵتانیش وەك تاوی باران وایە کە ئاودێریکردنی خودا و بەرەکەتی ئاسمانە و بەرهاتنەوەی ژیانی زەوی و هەرچی بە سەریەوە دەژی..)[325].

ئەگەر فەرمانرەوا بارانی هەبێ، خۆ تاوی باران زیانی بۆ ئەو کەسانە هەیە کە لە سەفەرکردندان، هەروەها باری خانوەکانیش قورس دەکات، بێجگە لەوەی کە بروسك و باو بۆرانیشی لە گەڵدایەو دەبێتە هۆی هەڵسانی لافاو و شەپۆلەکانیشی کەف وکوڵ دەکەن و زەرەر و زیانێکی زۆر بە خەڵکی و ئاژەڵ و زاد و زەخیرە دەگەیێنێ و تووشی نەهامەتیان دەکات.[326]

---

٣٢٥ - بە پێی شەرع دەبێ ئیمامێك، یان فەرمانڕەواییێك لەو نەتەوەیەدا دابندرێ و چەند فەرمانڕەواو والییێکی تر لە ژێر دەستیدا بێ و لە بەرێوەبردنی کارەکانیدا هاوکاری بکەن./ محەمەد یوسف موسا لـ٤٧ـ.

٣٢٦ - سراج الملوك لـ٤٨ و ٤٩ ـ.

## چوارەم: ڕێزو حورمەتی پاشا لە ناو خەڵکیدا، یان (پیرۆزڕاگرتنی فەرمانڕەوا):

دەروازەی نۆیەم لە هەر هەموو دەروازەکانی تری کتێبەکە گرینکترە، کە تەرتوشی تیایدا باسی ڕێزو حورمەتگرتنی پاشا دەکات لەلای دارو دەستەکەی[٣٢٧]، خۆیدا و دەڵێ:

دەبێ ئەوە بزانن کە پێوەندی پاشا لەگەڵ دارو دەستەکەیدا، وەك ئەو پێوەندیەیە کە لەنێوان ڕۆح و جەستەدا هەیە، ئەگەر ڕۆحەکە لە خڵت وخاش پاك ببۆوە، ئەو کاتە بە شێنەیی بە ناو دەمارەکان و هەموو ئەندامەکانی لەشدا دەڕوا و ئەندامەکان و هەستەکان ڕاستەڕێ دەبن و ئیش وکارەکانی لەش ڕێك دەکەوێتەوە[٣٢٨]. ئەگەر بێت و ڕۆحیش گەندەڵ بێ و میزاجی تێکچووبێ قوڕ بە سەری ئەو لاشەیەی کە ئەو ڕۆحە بە ناو هەست و دەمارەکانیدا گوزەر دەکات، چونکە تێکوپێکی دەدات و لە ڕێی ڕاست لایدەدات و هەر ئەندامێك، یان هەستێك بەشی خۆی لە گەندەڵی بەردەکەوێ و دەمارەکانیش نەخۆش دەکەون و لە کار دەکەون، هەروەها سیستەمی لەشیش تێکدەدات و بەرەو گەندەڵی ڕایدەکێشێ.

هەروەها پاشا لە شێوەی ئاگرەو خەڵکیش وەك دار و چیلکە وان. ئینجا ئەو کەسەی ڕاستی و خوار و خێچی تێدا نییە پێویستی بە هیچ کەسێکی تر نابێ، ئەو کەسەی کە خواریشە ئەوە پێویستی بە ئاگر دەبێ تا ڕاستیکاتەوە، ئینجا ئەگەر ئاگرەکەی خۆش بوو، پێش ئەوەی دارەکە خۆی ڕاستکاتەوە دەسووتی، ئەگەر ئاگرەکەش کز بوو، ئەو کاتە دارەکە ڕاست نابێتەوە.

هەروەها پاشا وەك (کانییێکی بەخوڕ وایە لە زەوییێکی تینوودا) ئەگەر ئاوەکە پاك وبێگەرد بوو و پیس نەبوو، ئەو کاتە زەویەکە تێر ئاو دەکات و ڕەگی دارەکانیش تێر خۆراك دەبن و لقەکانیشی بە هێز دەبن، لق و پۆپەکانی خۆی بە هەموولاییێکدا بڵاو دەکاتەوە و دوای ئەوەش گەڵاکان سەر دەردەهێنن وگوڵەکان دەپشکوێن، ئەو کاتەش بەر دەگرێ[٣٢٩].

---

٣٢٧ - پاشا دەبێ ووتاری نەتەوەکەی خۆی یەکخات و کاروبارە ئاینی دونیاییەکانیان بۆ هەڵسووڕێنێ. (نظام الحكم في الاسلام)محەمەد یوسف موسا لـ٤٧ ـ.

٣٢٨ - ئەم بە یەك چواندنەی (شارە بێخەوشەکە) بە ڕۆح و لاشەی مرۆڤ لەلای فارابیشدا باس کراوە، لـ٣٨ـ لە بڵاوکراوەی عەلی عەبدولواحید وافی.

٣٢٩ -تەرتوشی (سراج الملوك) لـ ٤٩و٥٠ ـ.

## پێنجەم: ئەو خەسڵەتانەی کە دەبێ لە پاشادا هەبن:

ئەو خەسڵەتانەی کە دەبێ لە پاشادا هەبن سێ خەسڵەتن کە ئەمانەن (نەرم و لەسەرخۆ بێ، و زۆرردار نەبێ و کارەکانی خۆی بە راوێژکردن ئەنجام بدات و لە هەرێمەکاندا کەسانی ماستاوچی لەسەر کار دانەنێ ـ دەبێ ئەوە بزانی کە ئەمانە لە خەسڵەتە بنچینەییەکانی پاشان، کە دوانیان لە ئاسمانەوە دابەزیون، ئەویتریشیان پێغەمبەر (د.خ) باسی کردووە: ئەو دووانەی کە لە ئاسمانەوە دابەزیون خودای گەورە لەو ئایەتەدا دەفەرموێ (فبما رحمة من الله لنت لهم ولو كنت فظا غليظ القلب لانفضوا من حولك فأعف عنهم واستغفرلهم وشاورهم في الامر) آل عمران: ١٥٩. واتە: ئەوە رەحمەتێکی خودایە ئەگەر لە گەڵیاندا دڵنەرم و لەسەر خۆ بی، ئەگەر لە گەڵیشیاندا زۆردار و دڵڕەق بووی لێت رادەپەڕن و دژایەتیت دەکەن تۆش لێیان ببورە و داوای لیبوردنیان لێبکە و راویژیان پێبکە. لەم ئایەتەدا دەبینین دوو ئاماژەمان بەر چاو دەکەوێ، (یەکەم ئاماژە ئەوەیە کە زۆرداری، هاوڕێ و هاودەمەکانت لێ دوور دەخاتەوە، ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لە دەور و بەرتن پەرتەوازە دەبن، چونکە پاشا بەو هاودەم و هاوڕێ و لایەنگرانەوە بۆتە پاشا..)[٣٣٠].

(یەکەم خەسڵەت و لە هەمووشیان رەوا تریان بۆ ئاگاداربوون لە خەڵکی (دادپەروەری)ە کە ئەم خەسڵەتە کۆڵەگەی سەقامگیری و بەردەوامبوونی پاشا و وڵاتە و بنچینەی هەر هەموو مەملەکەتەکەیە، ئینجا ئەمە هی سوننەتی پێغەمبەرەکان بێ ی، یان چاکسازی بێ (ان الله يأمر بالعدل والاحسان وايتاء ذي القربى..) ﴿ النحل: ٩٠﴾. واتە خودا فەرمانی ئەوەمان پێ دەکات کە دادپەروەر و چاکەخواز بین و سەردانی نزیکەکانی خۆمان بکەین.

دادپەروەری تەرازووی خودایە لەسەر رووی زەویدا و بە هۆی ئەو تەرازووەوە دەتوانین مافەکانی خەڵکی بێ هێز لە خەڵکانی بەهێز و لە ناڕەوا بۆ خاوەن مافەکان وەر بگرینەوە، ئەو تەرازووە بە تەنها بۆ ناو خەڵکی نییە، بەڵکو بۆ کێشەکانی نێوان پاشا و دارو

---

٣٣٠ - هەمان سەرچاوە.

دەستەکەشێتی، هەر کەسێکیش کار بە تەرازووی خودا نەکات کە بۆ دادوەری دایناوە، بەرەو رووی رق و تووڕەیی خودای مەزن دەبێتەوە.[331]

ئەی والی دەبێ ئەوە بزانی کە پاشایەتی لە شێوەی پیاوێکدایە، خۆت سەری ئەو پیاوەی و وەزیرەکەشت دڵییێتی و هاوکارەکانیشت هەردوو دەستەکانێتی، دارو دەستەکەشت هەردوو پێییەکانێتی و رۆحەکەی و دادپەروەریەکەشی تۆی، دەبێ ئەوەش بزانی کە لاشە بە بێ رۆح ناتوانێ بژی. ئەگەر بتەوێ بگەیتە ترۆپکی دادپەروەری دەبێ ئەوە بزانی کە هاولاتیان سێ جۆرە کەسن: گەورە، مام ناوەندی، و بچووك، دەبێ گەورەکەیان بکەیتە (باوکت)، ناوەنجیەکەشیان بکەیتە (براکەت) و بچووکەکەشیان بکەیتە (کوڕەکەت): ئینجا دەبێ چاکە بەرامبەر بە باوکت بکەیت و رێز لە براکەت بگری و بەزەییشت بە کوڕەکەتدا بێتەوە، لەم کارەشتدا دەبێ بەردەوام بی تا دەگەیتە ئاستی لێبوردن و سۆز و بەزەیی خودای گەورە[332].

(چل ساڵ پاشاییێکی زۆردار حوکمڕانیت بکا، لە یەك کاتژمێری دار و دەستەییێکی بێخەم و بێ ئاگا باشترە).

ئەگەر لە سیاسەتی رۆژانەتدا دادپەروەری بکەیتە سەرمەشقی کارەکانت، لە نەخۆشی و گەندەڵییەکانی سیاسەت رزگارت دەبێ، ئەوساکە هەر هەموو ئەو مەرجانەت بۆ دێتە دی کە ولاتی لەسەر بنیاد دەنرێ.

(ئیمامێکی دادپەروەر لە بارانێکی بە خوڕ باشترە و شێرێکی تێکشکاو لە پاشاییێکی زۆردار باشترە و پاشاییێکی زۆردار لە شەڕو شۆڕێکی بەردەوام باشترە).

(ئەی پاشا زاناکان بکە دروشمی خۆت و پیاوچاکانیش بکە پۆشاکێك بۆ خۆت، ئەوسا کە ولات بە ئامۆژگارییەکانی زاناکان و دوعا و بانگەشەی پیاوچاکەکان بەڕێوە دەچێت[333].

---

٣٣١ - سراج الملوك لـــ ٤٩و٥٠ ـــ.

٣٣٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣٣٣ - تێبینی ئەوە بکە کە راوێژکردن تەنها مانای ئامۆژگاریکردن دەگەیێنێ ! چونکە رۆڵی زاناکان تەنها ئامۆژگاریکردنی پاشاکانە لە سۆنگەییێکی تەواو ئەخلاقیەوە، بەلام ئەگەر بێیتە سەر ئەو مافە سیاسیانەی کە تاك پیادەی دەکات، ئەمەیان بوونی نییە.. بەو مانایەی کە تاك فەرمانپێکراوە و مافی ئەوەی نییە بەشداری لە رادەربڕینەکانی پاشادا بکات، یان لەو بڕیارەدا بەشدار بێت وەك ماوەردی دەڵێ (ئەمە رێگەی پێ نادرێ، چونکە ئەمە وەك هاوبەشیکردنە لە مارەبڕینی ژنێکدا. (الاحكام السلطانيية) لـــ٩ـــ.

(سولەیمانی کوڕی داود هەرچی موڵك ومالی هەبوو خودای گەورە لێی ستاندەوە، ئەویش لەبەرئەوەی جارێکیان دادوەری لە نێوان دوو کەسدا دەکرد، کە یەکێکیان پیاوی خۆی بوو و لە دڵی خۆیدا گوتی واباشە هەقەکە بدەمە ئەو پیاوەی خۆم و لای ئەوی گرت، بۆیە خودا هەرچی موڵك ماڵی هەبوو لێی سەندەوە و شەیتان لەسەر کورسیەکەی دانیشت ـ بۆیە پێت دەڵێم دادپەروەری بکە سەرمەشقی کارە سیاسییەکانی خۆت)لـ٥٢ـ.

(بە ئەسکەندەریان گوت: لەبەرچی تۆ ژنی زۆر ناهێنی، بۆ ئەوەی نەوەکانت زۆربن و ناو و ناوبانگیشت بەردەوام بمێنێتەوە؟. لە وەڵامدا گوتی: ئەو شتەی ناو و ناوبانگی مرۆڤ بە زیندوویی دەهێڵێتەوە، کاری جوان و رەفتاری چاکە).

ئیمامی ستەمکار ئەو کەسەیە کە دووعا و نزای زۆری لەلای خودا لێ دەکرێ[٣٣٤].

## شەشەم: خەسڵەتە خراپەکانی فەرمانڕەوا:

ئەگەر خەسڵەتە بنچینەییەکانی پێش ئیستا ئاماژەیێك بووبن بۆ پاڵپشتیکردن لە وڵات. ئەی دەبێ ئەو خەسڵەتە خراپانە چی بن کە کار بۆ رووخاندنی وڵات دەکەن؟!.

تەرتوشی دەڵێ، ئەم چەند خەسڵەتەش هەر ئەخلاقین[٣٣٥]: ـ

عەرەب و عەجەم دەڵێن: شەش خەسڵەت هەیە کە لە پاشا، یان لە سوڵتان قبووڵ ناکرێن: درۆ و لەدەستدانی ئەقڵ و ئیرەیی و تاکڕەوی، چاوچنۆکی و ترسنۆکی ـ وەك ئەو شاعیرە دەڵێ: ـ

---

٣٣٤ - ئەگەر خەڵکێکی ئاژاوەچی ڕێنیشاندەرێکیان نەبێ چاك نابن، ڕێنیشاندەریان لە کوێ دەبێ گەر نەزانەکانیان حوکمڕانیان بکەن.

(السراج: ڕێنیشاندەری هەرشتێکی سەرەوە). تێبینی ئەوە بکە کە خەڵکی لە خودا بپاڕێتەوە و دوعای لێبکات، یان فەرمانڕەوا بدرێتە دەست ئەنجومەنی نوێنەران بۆ دادگاییکردنی، وەك ئەوەی ئەمریکییەکان لەگەڵ کلنتۆندا کردیان، یان بدرێتە دادگا، وەك ئەوەی ئیسرائیلییەکان و وڵاتانی دی بەرامبەر بە سەرۆکەکانیان کردیان ـ بە ڕاستی ئەمە شتێکە نابێ ئەقڵی عەرەبی بیری لێ بکاتەوە نە لە کۆن و نە لە ئیستاکەشدا.

٣٣٥ - (سراج الملوك ) لـ٥٦ـ.

| | |
|---|---|
| حسب الكذوب من المهانة | بعض ما يحكي عليه |
| اذا ســـــمعت بكذبـــــــه | من غيره نســـبت اليه |

واتە: وەك ئەو درۆزنەی کە هەمیشە سەرزەنشت دەکرێ، ئەگەر درۆییەکانی لە یەکێکی تریش ببیستی هەر دەڵێی ئەوە.

**شاعیرێکی دیکە دەڵێ: ـ**

| | |
|---|---|
| لـــي حيلة فيمن ينـــم | وليس في الكذب حيلة |
| من كان يخلق ما يقول | فحيلتـــــــي فيه قليل |

واتە: من فێڵێکم هەیە گەر کەسێ بیەوێ، بەڵام درۆ هیچ فێڵێکی تێدا نییە، هەر کەسێکیش لە خۆیەوە قسە هەڵبەستێ، بۆ ئەوەیان من هیچ فێڵێکم نییە.

لە خەسڵەتە ناپەسەندەکانی فەرمانڕەوا: ـ زۆرداری و درۆکردن، دڵڕەشی و ستەم و بێ ئەخلاقی و گوێڕانەگرتن لە خەڵکی و ئەو خۆ بە زلزانینەی خەڵکی بێزار دەکات[٣٣٦].

دەروازەی چواردەمین: (لەبارەی خەسڵەتە چاکەکانی پاشایە).

ئەوانەی کە زاناو حەکیمەکان لەسەری کۆك و هاوڕا بوون بە پاشایان گوت: (ئەی پاشا ئەگەر هات و تۆ هێزت لە دوژمنەکەت کەمتر بوو، دەبێ چەند خەسڵەتێکی بەرز و باش هەیە لە خۆتدا بەر جەستەی بکەیت، کە دوژمنەکەی بەرامبەرت ئەو خەسڵەتانەی نەبێ. ئەمەیان باشترە لە هێرشێکی بێ سەروبەر)[٣٣٧].

بە ئەسکەندەریان گوت: (تۆ بە چی ئەم هەموو سەرکەوتنانەت بە دەست هێنا؟ لە وەڵامدا گوتی: بە راکێشانی دوژمنەکانم بەلای خۆمدا و بە چاکەکردن لەگەڵ دۆستەکانمدا..!).

---

٣٣٦ - (سراج الملوك ) لـــ٥٧ـــ .

٣٣٧ - (سراج الملوك ) لـــ٥٨ـــ .

# دەروازەی شەشەم

## (جیابوونەوەی ئەخلاق لە سیاسەت)

**(لە پێناو بەرژەوەندییەکانی بەریتانیادا هەندێك تاوانم ئەنجام داوە، ئەگەر ئەو تاوانانەم لەناو بەریتانیادا ئەنجام بدابا گومانی تێدا نەبوو هەر هەموو ژیانی خۆم لە بەندیخانەکاندا بە سەر دەبرد)!.**

**(وینستۆن چەرچل)**

# بەشی یەكەم

## (نیكۆلای ماكیاڤیللی)

**(هاولاتییەكانی هەر ولاتێك ئەگەر لە خۆیانەوە و بەبێ ئەوەی لە سزاكانی فەرمانڕەوا بترسن بۆ بەرزی ولاتەكەیان كار نەكەن ئەو ولاتە گەشە ناكات)**

**(ماكیاڤیللی)**

**( ناكرێ تەنها لەرێگەی گوتارەوە پارێزگاری لەولاتان بكرێ..)**

**(ماكیاڤیللی)**

## یەکەم: پێشەکی:

ماکیاڤیللی (١٤٦٩ ـ ١٥٢٧) لە سەردەمی راپەڕینەکانی ئەوروپادا ژیاوە، کە پڕی بوو لە گۆڕانکاری و توندوتیژی، شێوەکەی لەشێوەی گۆڕانکاریە سروشتییەکانی دەکرد و کەشێکی نوێ چواردەوری مرۆڤەکانی تەنیبۆوە و هەواییێکی نوێیان هەڵدەمژی و لەبارودۆخێکدابوون کە پێشتر نەیاندیبوو و بە شێوە جۆربەجۆرەکانی ئەو سەردەمە سەرمەست ببوون و چێژیان لێ وەردەگرت ـ ئەو سەردەمەش سەردەمی راپەڕین بوو: سەردەمی گۆڕانکاریە گەورەکان بوو لە کۆمەڵگەی ئەوروپیدا، بە تایبەتی لە ئیتاڵیا، لەهەر هەموو ئاستەکانیدا، وەك کۆمەڵایەتی، زانستی، رۆشنبیری. هەرچەند جاری تێزەکانی راپەڕین لە خۆرئاوای ئەوروپاوە دەستی پێکردبایە، لە ئیتاڵیادا بە گوڕتر دەبوو، ئەو راپەڕینە لە هەر وڵاتێکدا شێوەییێکی تایبەتی لەخۆ گرتبوو و بە پێی تایبەتمەندێتی ئەقڵیەت و جیاوازییە رۆحییەکان و بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکەی ئەو وڵاتە دەگۆڕا. ئەدیبی فەڕەنسی (فرانسوا رابلیە ـ Francois Rabplais) (١٤٩٣ ـ ١٥٥٣) ئەم هەمەڕەنگیەی سەردەمی راپەڕینەکان کە لە هەموو وڵاتێکدا هەبوو بە گوتەی خۆی بە کۆمەڵێك لێکۆڵەرەوەیان دەچوێنێ کە بە دوای پەرستگای باك بۆك (Back Buck)دا دەگەڕێن و لە کۆتایشدا دەیدۆزنەوە، کاتێك کە دەگەنە شوێنی سەربڕینی قوربانییەکان و لێی دەچنە ژوورەوە، کاهینەکە شەرابی پێشکەش دەکردن، ئەوانیش هەتا مەست دەبوون دەیانخواردەوە. هەرچەندە جۆری خواردنەوەکە یەك جۆرێکی بێگەرد بوو و لە یەك قەرابەدا بوو، یەك تامیشی هەبوو، بەڵام تام و چێژەکەی بە پێی ژمارەو ئارەزوەکانی ئەو کەسانەی کە دەیانخواردەوە دەگۆڕا. بارودۆخ و تامی سەرمەستیەکەی راپەڕینیش بەو شێوەیە بوو[٣٣٨].

سەرەڕای ئەمانەش هەمووی، ئیتاڵیا لە سەردەمی راپەڕیندا دابەشببووە سەر پێنج هەرێمی سەرەکی ـ ڤالێنسیا و میلانۆ، فلۆرەنسا و دەوڵەتی پاپا(فاتیکان) و شانشینی

---

٣٣٨ - محەمەد موختار ئەلزەقزوقی (نیقولای ماکیافیلی ) کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری، قاهیرە ساڵی ١٩٥٨ لـــ٧ـــ.

ناپۆلی ـ ماکیاڤیللی له شاری فلۆرەنسادا دەژیا کە جێگەی لە دایکبوونی خۆیەتی لەو سەردەمەدا بوو کە ئەزموونی چاکسازیە ئاینییەکەی راهیبە دۆمۆنیکانییەکە (ساڤۆنا رۆلا ـ (١٤٥٢) Savona rola ـ١٤٩٨) لە ئارادا بوو، کە هێرشێکی توندی دەکردە سەر ئەو گەندەڵیە ئەخلاقیانەی لەو سەردەمەدا کلێساکان بە خۆیانەوە بینیبوو و دوای ئەوەی کە توانیان ـ لە ئەنجامی هێرشێکی توندا ـ ئال مدیچی Medici لە فلۆرەنسادا دەرپەڕێنن. هەر لەو شارەدا کۆمارێکی پێکهێنا، کە دیکتاتۆریەتێکی ئایینی بوو و بۆ ماوەی سێ ساڵی تەواو بەردەوام بوو، ئەو کۆمارە پشتی بە سیستەمێك دەبەست کە ئەویش دوورکەوتنەوە بوو لە حەرامەکان و گوتاردان و بڵاوکردنەوەی بێخەوشیە ئەخلاقییەکان و بەها ئاینییەکان. ئەم راهیبە مەسیحیە پاك و سادەیە هەوڵی ئەوەی دەدا کە لە رێگەی ئایینەوە کۆمارێکی بێخەوش بنیاد بنێ و لە رێگەی سیستەمێکی چاودێری و دیسپلینە کۆمەڵایەتییەکانەوە ئەخلاقی باش و خۆشەویستی بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێ. ساڤۆنا رۆلا توانی بۆ ماوەییێك سەرکەوتن بە دەست بێنێ، بەڵام ئەوەی راستی بێ دەسەڵاتە راستەقینەکەی ئەو تەنها ئەو شتانە بوون، کە خۆی پشتی پێ دەبەست، وەك ئەو ناوبانگەی کە لە توانا جادوییەکانیدا هەیبوو، کاتێکیش کە لە توانایدا نەبوو هیچ کارێکی موعجیزە ئاسا ئەنجام بدات، خەڵکی فلۆرەنسا لێی هەڵگەڕانەوە و سووتاندیان[339].

ماکیاڤیللی لەو کەش و هەوایەی کە تێیدا دەژیا چەندین وانە فێر بوو.

١- لە سەردەمی راپەڕیندا فێری شۆڕشکردن بوو لە دژی بیرۆکەو داب و نەریتە کۆنەکان کە زۆر لەکۆنەوە بۆیان بە جێ مابوو و زۆربەیان راست نەبوون و جێگەی ئەوە نەبوون رێزیان لێ بگیرێ.

٢- لە ئەزموونەکەی (ساڤۆنا رۆلا)دا کە کۆمارەکەی سەری نەگرت و رووخا، فێری ئەوە بوو کە گوتاردان و ئامۆژگاری کردن بە تەنها بەس نییە بۆ بنیادی دەوڵەت. وەك خۆی دەڵێ ناتواندرێ تەنها لە رێگەی گوتاردانەوە بەرگری لە وڵات بکرێ.

٣- ئەزموونەکەی (ساڤۆنا رۆلا)، ماکیاڤیللی زیاتر لە ئایینی مەسیحی دوورخستەوە، چونکە بەو چەند بەها ئەخلاقیە بێهێزەی کە هەییێتی، سوودی بۆ بنیادی دەوڵەت نابێ، بە رای ئەو، دەبێ لە بنیادی دەوڵەتدا پشت بە (شمشێر) واتە بە هێزو توندو تیژی ببەسترێ.

339 - Ernesto Landi: Machiavelli in:Western Political Philosopers. Eaited by Maurice Cranston Back Ground Book London 1964 P.37.

٤- ئەوە راستە کە ماکیاڤیللی زۆر گوێی نەدەدایە گەندەڵییەکانی کاردینالّ و پیاوە ئاینییەکان و رەخنەکانیشی بە پلەی یەکەم رووی لەوان نەبوو ـ بەڵکو راستەوخۆ تیرەکانی خۆی دەگرتە مەسیحیەت خۆی، کە هەندێکك پیاوماقووڵی وەك (ساڤۆنا رۆلا) دەیانویست بەرگری لیّ بکەن. لێرەدا ماکیاڤیللی وای بۆ دەچوو کە مەسیحییەت لە باشترین حاڵەتەکانیدا خەڵکی فێری بێخەوشیە چەوتەکان دەکات، لەبەر ئەوەی بە ناوی فرۆتەنی و وازهێنان لە دونیا و شتە ماددییەکان، وەك دەڵێ ئەگەر زللەییێکیان لێتدا، رووی خۆتی بۆ وەرسووڕێنە بۆ زللەییێکی تر و خۆشییەکانی ئەو دونیا، واتە خۆشییەکانی دوای مردن فێری سەرکزی و ملکەچی و سەرشۆڕکردنیان دەکات[٣٤٠].

٥- ماکیاڤیللی سوودێکی زۆری لەو پلەو پایانەی کە لە ماوەی بیست و چوار ساڵ لە شاری فلۆرەنسادا دیبووی وەرگرتبوو، کە لە دیوانی کونسولێدا کاری دەکرد و سکرتێری ئەنجومەنە دە کەسییەکەش بوو کە گرنگی بە کێشەکانی جەنگ وکاروبارەکانی دەرەوە دەدا و ئەو نامانەی دەنووسیەوە، کە ئاراستەی نوێنەرە دیبلۆماسییەکانی کۆماری فلۆرەنسا لە دەرەوەدا دەکران.

٦- لە دواتەمەنی ژیانیدا، چووە ناو خانووێکی بچووکی گوندێك و ژیانی خۆی لەوێدا بەسەربرد کە ناوی سان کاسیانۆ بوو. لەوێدا بە شێوەییێکی گشتی سەرنجی خۆی دابووە سیاسەت، بە تایبەتی چارەنووسی ئیتالّیا، وەك دابەشبوونە ناوخۆییەکانی وڵاتەکەی کە خەریك بوون لە ناوەوە دەیانخواردەوە و بنەماڵەی فەرمانڕەواکانیش خەریکی بە یەکجاری وێرانکردنی بوون. لە ئەنجامی ئەو هەموو سەرنج تێڕامانانەدا، ئەو فەیلەسووفە دوو کتێبی گرنگی دانا: کە یەکەمیان کتێبە بچووکە بەناوبانگەکەی بوو بە ناوی (میر)[٣٤١]. دووەمیشیان کتێبی (پێشنیازەکان)[٣٤٢] بوو.

---

340 - Ibid – P.39.

٣٤١ - محەمەد موختار ئەلزەقزوقی لەگەڵ لیکۆڵینەوەو چەند سەرنجێکی تێر و تەسەل وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و کتێبخانەی ئەنگلۆ میسریش لە ساڵی ١٩٥٨ دا بلاّوی کردۆتەوە.

٣٤٢ - مامۆستا خەیری حەماد بە ناونیشانی (مطارحات ماکیافیلی) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، دارو لئافاق ئەلجەدید ـبەیروت ساڵی ١٩٨٢ چاپی سێیەم.

## دووەم:کتێبی میر:

دوای ئەوەی بۆ گوندەکان دووریان خستبۆوە ماکیاڤیلی دەیویست سۆز و ڕەزامەندی بنەماڵەی مدیچی بۆ خۆی ڕابکێشێ، هەر ئەو هۆکارەش بوو وای لێکرد کە کتێبەکە پێشکەش بە (لۆرنتۆی گەورەو بەڕێزی) بکات، وەك خۆی دەری بڕیبوو، بەڵام ناوی خۆی (لۆرەنتۆ مدیچی)ە (١٤٩٢ ـ ١٥١٩) لە پێشکەشکردنەکەیدا پێی دەڵێ: ئەو کەسانەی کە بیانەوێ سەرنج و سۆزی میرێك بۆ خۆیان ڕابکێشن وا ڕاهاتوونە کە شتێکی گرانبەهای پێشکەش بکەن.. وەك ئەسپ، یان چەکێك، یان جلوبەرگێکی مووشی، یان زێڕو گەوهەر.. بەڵام من، (ئەم کتێبە وەك نیشانەیێکی بچووکی دڵسۆزیم بۆ ئێوە پێشکەش بە فەخامەتی بەڕێزتان دەکەم..)[343]. ئەم کتێبە لەو جۆرە لێکۆلینەوانە نەبوو کە زاناکان لە (قوتابخانەکاندا) بیخوێنن و فەیلەسووفەکانیش بیدەنە بەر شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەکانی خۆیان. هەروەها لەو جۆرە کتێبانەش نەبوو کە خەڵکی بە مەبەستی تێرکردنی ئەو حەزەی هەیانە بۆ زانیارییە تیورییەکان بیخوێننەوە. ئەوەندەی نەبرد خوێنەرە بەراییەکانی ئەم کتێبە بەشێوەیێکی پراکتیکی دەستیان بە جێ بەجێ کردنی ناوەرۆکی ئەم کتێبە کرد[344]، چونکە ئەمە کتێبێکی زۆر پراکتیکی بوو، هەتا بڵێی واقیعیە، خاوەنەکەشی هەر مەبەستی ئەوە بوو شێوەکانی ئەو ژیانە سیاسیە واقیعیە کە هەبووە باس بکات و سەرنجی ((میر)) بۆ ئەو مەرجە پێویستانە ڕابکێشێ کە بۆ پێکەوە نانی کۆمارێك یان میرنیشینێك لە جیهانێکی واقعیدا بنیاد بنێت و پارێزگاری لێبکات، نەك یۆتۆپیاییێك، ـ یان یۆتۆپیاییێك لە جیهانی خەیاڵدا بنیاد بنێ ـ. ماکیاڤیللی دەڵێ: (لەبەر ئەوەی هەموو ئامانجی من ئەوە بوو کە بتوانم شتێك بنووسم سوودی هەبێ بۆ خەڵکی و لێی تێبگات، بۆیە بۆم ڕوون بۆوە کە لەهەموو شتێك باشتر ئەوەیە بە واقیع و ڕاستییەکانی ناو بابەتەکەوە پابەندبم،، لە جیاتی ئەوەی وێنەیێکی خەیاڵی لە بارەی

343 - N.Machiavelli Th Prince. Trance by W.K.Mariot Evrey Man`s Library.London 1958. p.3.

تەماشای مامۆستا محەمەد موختار ئەلزەقزوقی بکە لە کتێبەکەی بە ناونیشانی (نیکولای ماکیافیلی) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری لە قاهیرە ساڵی ١٩٥٨ لـــ١٩٣ــ.

٣٤٤ - ئارنێست کاسپێر (الدولة والاسطورة) وەرگێرانی د.ئەحمەد حەمدی مەحمود و پێداچونەوەی ئەحمەد خاکی دەستەی میسری گشتی بۆ کتێب لە قاهیرە ساڵی ١٩٥٨ لـــ١٦١ــ.

کتێبەکە پێشکەش بە خەڵکی بکەم. زۆر کەس وابووە کە وێنەی کۆمارێك، یان میرنشینێکی کێشاوە کە نە کەس گوێی لێبووە و نە کەسیش دیوێتی، چونکە جیاوازییێکی زۆر لە نێوان (ژیانی مرۆڤ وەك ئەوەی کە هەیە و وەك ئەوەی کە پێویستە چۆن بژی) دا هەیە. ئەو کەسانەی کە خۆشیان لەو کارانە لە گێلی دەدەن کە بە شێوەییێکی پراکتیکیانە ئەنجام دەدرێن و بە سەریدا بازدەدەن بۆ ئەوەی بگەنە ئەو کارە خەیاڵیانەی کە دەیانەوێ ئەنجامی بدەن. ئەوەندە نابا خۆیان دەرك بەوە دەکەن کە لە جیاتی پارێزگاریکردن لە مانەوەیان، بەرەو لەناوچوون دەڕۆن..)[345].

سەرەڕای ئەمانە ئەم کتێبە کتێبێکی پراکتیکی و واقیعیە و هەوڵی ئەوە نادات، کە یۆتۆپیاییێك لە ناو خەیاڵدا دروست بکات، بەڵکو ئەو شتانەمان بۆ وێنا دەکات کە لەسەر ئەرزی واقیعدا روو دەدەن ـ و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو سیستەمە دەسەڵاتەی کە ئێستا لە ئارادایە دەکات و دابەشی دەکاتە سەر چەند کۆمار و شانشینێك، (سیستەمی دەسەڵاتەکانی هەر هەموو وڵاتانیش لە سیستەمی کۆماری و شانشینی پێکدێت)[346]. کە کۆماری دەوڵەتێکی ئازادە و شانشینیش وەك ئەو نییە، بەڵکو لەبارەی سروشتی هەردوو سیستەمەکەدا، کۆماری پلەو پایەی لە شانشینی بەرزترە، بۆیە دەبینین لە جێگەیێکی تردا دەڵێ: لەهەر هەموو ململانێ سیاسییەکاندا سێ سیستەم دێنە کایەوە: ـ کە سیستەمی تاکڕەوی و ئازادی و گێرەشێوێن و رەمەکیە ـ ئەمەی دواییان بە کەڵکی ئەوە نایێت لێی بدوێین، لەبەرئەوەی هیچ جۆرە رێکخستنێکی سیاسی ئەوتۆی تێدا نییە. لێرەدا جارێکی تر ماکیاڤیللی دەگەڕێتەوە و سیستەمەکان دابەش دەکاتەوە سەر کۆماری و شانشینی ـ سیستەمی کۆماری لە پلەو پایەدا بەرزترە و ئازادیشی زیاترە، بەڵام ئەم شێوە دەسەڵاتە لەگەڵ هەموو نەتەوەییێکدا ناگونجێ، کەواتە دەبێ رادەییێکی زۆرتر (هێزو توانا) هەبێ Virtu لەمەدا مەبەستی هێزی زاڵبوونە بەسەر کاروبارەکاندا و بەسەر گەلێکدا جێبەجێ بکرێ تا ئەو کاتەی سیستەمی کۆماری بۆی دەگونجێ، بۆ ئەوەی ئەو گەلە بتوانێ پارێزگاری لە سیستەمەکە بکات. ئەو وای بۆ دەچێ کە لە سەردەمی ئەودا هێشتا زۆربەی هەرە زۆری هاوڵاتیان نەگەیشتبوونە ئەو رادەیەی کە حکومەتێکی شێوە کۆماریان هەبێ، چونکە ئەو سیستەمە ئازادییەکانی زیاترە و

---

٣٤٥ - تەماشای ئەو وەرگێڕانە عەرەبیەی کە پێشتر ئاماژەمان پێی داوە بکە لـ٢٧١ ـ ٢٧٢ـ.
p.83. N.Machiavelli The Prince.

٣٤٦ - وەرگێڕانە عەرەبیەی کە پێشتر ئاماژەمان پێی کردبوو لـ٢٧١ ـ ٢٧٢ـ.

ناشتواندرێ خەڵکەکە لە ماوەی شەو و رۆژێکدا بۆ ئەو ئازادیە ئامادە بکرێن. لەبەرئەوەی یەکێك لە مۆرکە بنچینەییەکانی حکومەتی کۆماری ئازادیە، ئەمەش شتێکی پڕ مەترسی دەبێ ئەگەر لە ناکاوێکدا ئەو ئازادیە بدرێتە خەڵکی کە هێشتا لەسەری رانەهاتوون و دەڵێ: (نموونەی ئەو جۆرە گەلانە زۆر لە شێوەی ژیانی ئەو ئاژەڵە درندانە دەچن کە سروشت لەو شێوەیە دروستی کردوون و لە سەر ژیانی ناو دارستان راهاتوون. دوای ئەوەی راو دەکرێن و ژیانی خۆیان لەگەڵ ئەو دەست بە سەرکردنە بەسەر دەبەن و لەگەڵیدا گەورە دەبن و رادێن. دوای ئەوەی خۆزگەکانیان دێتە دی، ئەوساکە بەرەڵایان دەکەن کە بە ئارەزووی خۆیان بە گوندەکاندا بگەڕێن و بسووڕێنەوە، بەڵام کاتێك کە هیچ خۆراکێکیان دەست ناکەوێ و لە گەڕان و سووڕانەوە بێزار دەبن هەست بە تەنیاییێکی زۆر دەکەن و هیچ جێگاییێکیش شك نابەن رووی تێبکەن، ئەو کاتە زۆر بە ئاسانی دەبنە نێچیری یەکەم کەس کە لە رێگادا تووشیان دەبێ و دەیگێڕنەوە ناو کۆت بەندەکەی پێشووتری[٣٤٧]. بەمشێوەیە دەبینین ماکیاڤیللی لەو بڕوایەدا بوو کە دەبێ کەش و هەواییێکی باش بۆ خەڵکی بڕەخسێنرێ تا بتوانن ئازادییەکانی خۆیان بە تەواوەتی پیادە بکەن، ئەمەش زۆر لەو بیرۆکەیەوە نزیکە کە لە سەردەمی ئێستاماندا دەگوترێ، کە دەڵێ: دەبێ ماوەییێکی ئینتقالی هەبێ بۆ ئەوەی بتوانرێ خەڵکی بۆ پیادەکرنی دیموکراسی، یان بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان حوکمی خۆیان بکەن ـ ئەمەش هەڵەییێکی گەورەو مەترسیداری تێدایە کە پێش ئێستا و لە شوێنێکی تردا چارەسەرمان کردووە[٣٤٨].

ئەوەی لێرەدا بە دی دەکرێ ئەوەیە کە ماکیاڤیللی لە کتێبەکەیدا هیچ کاتێك هەوڵی ئەوەی نەداوە ئەگەر بۆ جارێکیش بێت، سیستەم و بنەما گشتییەکان، یان راستییە رەهاکانی ناو کۆمەڵگە بخاتە روو. هەروەها لە چەند لێکۆڵینەوەییێکی سەرپێیی زیاتر هیچ لێکۆڵینەوەییێکی قووڵی لەبارەی شەرعیەتبوونی دەسەڵات نەکردوە، بەڵکو هەر هەموو شیکردنەوەکانی خۆی لەسەر جۆر و شێوەکانی دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات و دروستکردنی هێزدا چڕ کردۆتەوە. بە مانایێکی تر بە شێوەییێکی تەواو خۆی بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی

---

٣٤٧ - نیکۆلای ماکیاڤیللی (المطارحات) لـ٢٧٨ـ. خەیری حەماد دارو لئافاق ئەلجەدید بەیروت چاپی سێیەم ساڵ ٩٨٢ لـ٢٧٨ـ.

٣٤٨ - ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (مسیرة الدیمقراطیة..رؤیة فلسفیة ) دار رویل لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٩ هەروەها تەماشای کتێبی (الطاغیة)بکە چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبوولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٧ بڵاوی کردۆتەوە لـ٣٦ ـ و دوای ئەو.

دەسەڵاتێکی داماڵدراو لە شەرعیەت ئامادە کردبوو، هەروەها بە هیچ کلووجێك خۆی لە قەرەی گرفتی مافەکان نەداوە.

ماکیاڤیللی لەو کتێبە بچووکەیدا باسی لە کۆمەڵێك بنەمای پراکتیکی کردووە کە یارمەتی (میر) و پاشاکان دەدات، کە چۆن لە رێگەیەوە پارێزگاری لە هێزو دەسەڵاتەکانی خۆیان بکەن. هەروەها وێنەی رێبازێکی دیاریکراوی لەبارەی سیاسەتەکانی ناوەوە و دەرەوەی بۆ میر کێشاوە و ئامۆژگاری ئەوەی کردووە کە بە وردی پەیڕەویان بکات. بێگومان ماکیاڤیللی ئەم رێبازانەی لە کار وکردەوەکانی دەوڵەت و لە سروشتی خەڵکەکە وەرگرتووە و هەڵیهێنجاوە، لە کۆتایی و دوا بەشی کتێبی میردا دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە دەبێ پیاوێکی بەهێزو دەسەڵاتدار بتوانێ ئیتاڵیای پارچە پارچە کراو یەکبخاتەوە کە لەژێر دەسەڵاتی بێگاناندا دەناڵێنێ[349]. کە لەو کاتەدا پێویستییەکی زۆری بە یەکێکی وەك ئەو پیاوە بە هێزە بوو تا لە سووتان و پارچە پارچەیی و ونبوون بیپارێزێ: (بۆ ئەوەی هێزو تواناکانی مووسا دەرکەوێ، دەبووایە ئیسرائیلییەکان ببنە کۆیلە لە میسردا. هەروەها بۆ ئەوەی بوارێك بۆ دەرخستنی ئازایەتییەکانی (کۆرش) بڕەخسێنێ (میدییەکان) فارسەکانیان کوشت و بڕدەکرد، ئیستاش هەمان حاڵەت لەلای ئێمەدا دروست بووە، بۆیەش ئیتاڵیا گەیشتۆتە ئەو راددەیە بۆ ئەوەی هێزو توانا و بلیمەتی ئیتاڵییەکان دەربخات..)[350].

سەرەڕای ئەمانەش کتێبەکە چەند بابەتێك لەبارەی جۆری هەرێمەکان و چۆنێتی دروستبوون و گەشەکردن و پارێزگاری لێکردنی ئەو هەرێمانە لە خۆ دەگرێ، ئەو لە بەشی دووەمەوە تا دەگاتە بەشی یازدەم باسی جۆرەها سیستەمی دەسەڵاتی تاکڕەوی دەکات و چارەسەری بۆ دەدۆزێتەوە ـ هەروەها لە بەشی دوازدەمەوە تا دەگاتە بەشی چواردەم گیرو گرفتە هەمەجۆرەکان و سەربازەکان و توانا سەربازییەکان لە خۆی دەگرێ، دوای ئەوەش لە بەشی پازدەمەوە تا دەگاتە بەشی بیست و سێ، ئەو جۆرە رەفتار و هەڵس وکەوتانە لە خۆی دەگرێ کە دەبێ فەرمانڕەوا پیادەیان بکات، یان لێیان دوور کەوێتەوە.[351]

---

٣٤٩ - لەو کاتەدا ئیتاڵیا لە ناوخۆدا ببووە پێنج هەرێم کە خەریکی خۆخواردنەوە بوون، هەر تاو نا تاوێکیش هێزەکانی فەرەنسا و سویسرا و ئەڵمانیا داگیریان دەکردن و دەستیان بە سەردا دەگرتن.

350 - N.Machiavelli : The Prince P.145 .

٣٥١ - لەگەڵ (تاريخ الفكر السياسي) دا بەراوردی بکە، کە لە دانانی د. ئیبراهیم دەسوقی ئەبازە و د. عەبدولعەزیز ئەلغەننامە، دارلنەجاح بەیروت ساڵی ١٩٧٣ لــ١٧٨ـــ.

### ١- جۆری میرنشینەکان:

لە کاتێکدا سیستەمی (کۆماری) پلەو پایەی لەوانی تر باڵاترە و خەڵکی بە شێوەیێکی تۆکمەتر ئازادییەکانی خۆی تێدا پیادە دەکەن ـ بەڵام لە ئێستادا دەستمان پێی ناگا، لێرەدا ماکیاڤیللی گرنگی بە  شێوەی دووەمی دەسەڵات دەدات کە ئەویش دەسلاتی (میرنشین)یە و دابەشی دەکاتە سەر دوو جۆرە دەسەڵات، یەکەمیان میرنشینێکە کە بە میرات بۆ بنەماڵەیێك ماوەتەوە، دووەمیشیان ئەو میرنشینانەیە کە تازە دروست دەبن و دەڵێ: (میرنشین ـ یان (سیستەمی پاشایەتی) ئەم سیستەمەیان هەر لە کۆنەوە و لە بنەماڵەکەدا بە میراتە بۆیان بە جێ ماوە، یان ئەو میرنشینەی کە لە نوێ دروست بوونە، ئەو میرنشینەی دواییان زۆر نوێیە.. یان وەك بەشێکی نوێ دەخرێتە سەر ئەو موڵك ومالّەی کە بەمیرات بۆ پاشا بە جێماوە و دەبێتە موڵکی ئەو وەك میرنشینی میلانۆ کە لە سەردەمی پاشای ئیسپانیادا روویدا..)[٣٥٢].

### ٢- رێگاکانی گەیشتن بە دەسەڵات: ـ

ماکیاڤیللی لەو بڕوایە دایە کە چوار  رێگە هەیە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، کە دەتوانین بەمشێوەیەی خوارەوە کورتی بکەینەوە: ـ

أ- ئەو فەرمانڕەوایەی کە بە هێزو تواناکانی خۆی بگاتە سەر دەسەڵات، Virtu.

ب- گەیشتن بە دەسەڵات لە رێگەی بەختەوە، Fortuna.

ج- گەیشتن بە دەسەڵات لە رێگەی تاوانکردنەوە.

د- گەیشتن بە دەسەڵات لە رێگەی یارمەتی وەرگرتن لە هاولاتیانەوە.

أ — رێگەی یەکەمیان ـ واتە هاتنە سەر دەسەڵات لە رێگەی هێزو توانای کەسەکە خۆی، لێرەدا ماکیاڤیللی چەند نموونەیێکمان بۆ دێنێتەوە، وەك: (موسا) پێغەمبەر و (کۆرش) لە وڵاتی ئێران و (رۆمرلوس) وەك خۆی دەڵێ ماوەیێك لە رۆما فەرمانرەوایەتی کردووە، هەروەها (سیسیۆس) کە لە ئەسینای یۆنانی فەرمانڕەوایەتی کردووە، لەگەڵ چەندانی تریش. ئەمانە هیچیان نەکەوتوونەتە ژێر باری قەرزەکانی بەختەوە، بەڵکو هەلیان بۆ رەخساوە و ئەوانیش قۆستویانەتەوە و کردویانەتە بۆنەی سەرکەوتن، ئەگەر ئەمانە خاوەنی هێزو توانایێك نەبوونایە، ئەو هەلانە بە فیڕۆ دەڕۆیشت و سوودیان نەدەبوو.

---

352 -. 68 N.Machiavelli : The Prince P.

ب- هەرچی ئەوانەشن کە لە ڕێگەی بەختەوە گەشتوونەتە دەسەلآت، ئەو جۆرە کەسانە خۆیان خەڵکێکی سادەن بەلآم بەخت یاوەریان بووە و بەرزبوونەتەوە و بەبێ هیچ ماندووبوونێك دەسەلآت و کورسی پاشایەتیان بە دەسهێناوە، هەرچەندە لە دوای وەرگرتنی دەسەلآتەکە ماندووبوونی زۆریان چەشتووە. وەك ئەوەی کە لە زۆربەی شارەکانی یۆناندا روویاندا، وەك (ئەیۆنیا) و چەندین شاری تر کە (دارا)ی ئیمپراتۆری ئێران میر و پاشاکانی بۆیان دانا بۆ ئەوەی بتوانێ کۆنترۆڵیان بکات. دەبینین هیچ کام لەو میرو پاشایانە زیرەکی و بلیمەتییێکی ئەوتۆیان نەبوو کە شایستەی پڕکردنەوەی ئەو پلەو پایانە بن.

ج- بەلآم ڕێگەی سێیەمیان ئەوانەی کە لە ڕێگەی ئەنجامدانی تاوانەوە دێنە سەر دەسەلآت، ماکیاڤیللی(ئەگاسۆکلیس ـ Agathocles) مان بە نموونە بۆ دێنێتەوە کە چۆن توانی بگاتە دەسەلآت، لە کاتێکدا ئەو لەناو خەڵکیدا کەسێکی بەرچاو نەبوو، بەڵکو لە شوێنێکدا کاری دەکرد کە نزمترین پلەو پایەی لە ناو کۆمەڵدا هەبوو. باوکی ئەو کوڕە (کوورە)ی جەرە وکوپەو شەربەی هەبوو، ئەو کوڕەشی ناخۆشترین ژیانی تێدا بە سەر دەبرد، بەلآم زۆر شەڕانی و سەر بە گۆبەند بوو، لە شەڕەکانیشیدا زیرەکی چوست چالآکی تێدا بەدی دەکرا. ئینجا ڕۆیشتە خزمەتی سەربازی لەوێش پلە لە دوای پلەی وەردەگرت، تائەو کاتەی لە (سەرقستە) کردیان بە پراکتۆر ـ زرژحچزت.[353] هەر لەو کاتەوە ئەو بڕیاری ئەوەیدا کە ببێتە (میر)ی ولآت، بۆیە بە ئاماژەیێکی تایبەت هەر هەموو سەربازەکانی ئەندامانی ئەنجومەنی پیران و گەورە دەوڵەمەندەکان سەریان پەل درا، هەر لەو کاتەوە ئەو ستەمکارە بەبێ هیچ هەوڵێکی مەدەنیانە جڵەوی دەسەلآتی گرتە دەست[354].

د- ڕێگەی چوارەم وکۆتاییش ئەوەیە کە یەکێك بە ویست ئارەزووی کۆمەلآنی خەڵکی بێتە سەر کورسی دەسەلآت، نەك لە ڕێگەی کوشتن و بڕینەوە بگاتە دەسەلآت. بەم

---

٣٥٣ - لەلای رۆمانییەکان بە پلەی (قازی) دێ. هەموو ساڵێکیش هەڵبژاردنی بۆ دەکرا. هەندێکجاریش ئیشوکاری گونسولگەری دەکرد.

354. 44- 43 N.Machiavelli : The Prince P 

هەروەها تەماشای وەرگێڕانە عەرەبیەکەی بکە کە موحەمەد موختار ئەلزەقزوقی وەریگێڕاوە لـــ٢٣٥ ـ ٢٣٦ ــ.

شێوەیە ئەم  ڕێگەیەیان بە هیچ شێوەیێك ناوەستێتە سەر هێزو توانا، یان بەخت و چانس، بەڵکو ئەمەیان هەندێك جار پشت بە زیرەکی دەبەستێ و هەندێك جاریش پشت بەو هەلە دەبەستێ کە بۆی ڕێك دەکەوێ، لەبەر ئەوەی پیاو بە ویست و ئارەزووی کۆمەڵانی خەڵکی و چینە ئۆروستۆکراتەکان دەگاتە سەر کورسی دەسەڵات، زۆربەی ئۆروستۆکراتەکان وا هەست دەکەن کە ناتوانن ڕووبەڕووی گەل ببنەوە، بۆیە لە نێوان خۆیاندا یەکدەگرن و یەکێك هەڵدەبژێرن و دەیکەن بە (میر) تا بتوانن لە سایەی دەسەڵاتەکەی ئەودا پرۆژە تایبەتییەکانی خۆیان بە دی بێنن.  لەلاییێکی دیکەشەوە کۆمەڵانی خەڵکی کە ناتوانن ڕووبەڕووی پیاوە ئۆروستۆکراتەکان ببنەوە، بۆیە هەوڵ دەدەن یەکێك لەنێو خۆیاندا هەڵبژێرن و بەرزی بکەنەوە و بیکەن بە (میر) تا لە سایەی دەسەڵاتەکەیدا خۆیانی پێ بپارێزن. ئەو میرەی کە بە هاوکاری ئۆروستۆکراتەکان دێتە سەر کورسی دەسەڵات، بۆ ئەوەی بتوانێ پارێزگاری لە دەسەڵاتەکەی خۆی بکات گیرو گرفتی لەو کەسە زیاتر دێتە پێش کە هاوڵاتیان بۆ وەرگرتنی دەسەڵات بەرزی دەکەنەوە، لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی لە چواردەوری ئەو میرەن کە ئۆروستۆکراتەکان هەڵیانبژاردووە، خۆیان بە هاوشێوە، یان ڕکابەری ئەو میرە دەزانن، بۆیە ئەو میرە ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی دەسەڵاتەکان بەڕێوە ببات! بەڵام ئەو کەسەی کە لەلایەن هاوڵاتیانەوە بەرز دەکرێتەوە بۆ وەرگرتنی دەسەڵات خۆی بە تەنیا دەبینێتەوە و هەست بە بوونی کەس ناکات لە چواردەوریدا تەنها خەڵکانێکی کەم نەبێ[٣٥٥]!.

## سێیەم: دەسەڵاتە ئاینییەکان:

ماکیاڤیللی بەشی یازدەمی کتێبی (میر)ی بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی میرنشینەکانی کلێسا تەرخان کردووە. یان دەکرێ ناوی بنێین (دەسەڵاتی ئاینی). ماکیاڤیللی لەو بڕوایەدایە کە پیاوە ئاینییەکان دەتوانن بە یەکێك لەو دوو ڕێگایەدا بگەنە دەسەڵات واتە لە ڕێگەی هێزو توانا و ڕێگەی بەختەوە بگەنە دەسەڵات، بەڵام ناتوانرێ بە هۆی ئەو دوو ڕێگایەوە پارێزگاری لەو سیستەمی دەسەڵاتە بکرێ، لەبەرئەوەی داب و نەریتە ئاینییەکە خۆی پارێزگاری لێ دەکات. ئەو لەو باوەڕەدایە کە (ئەو میرانە میرنشینەکان بە هی خۆیان دەزانن بە بێ ئەوەی

355 - I Bid.P. 52 .

پارێزگاری لێ بکەن و دارو دەستەی خۆیان هەیە بێ ئەوەی فەرمانڕەوایەتیان بکەن. هەرچەندە هیچ هێزێکیان نییە پارێزگاری پێ لە خۆیان بکەن، بەڵام میرنشینەکان لە فەرمانەکانیان دەرناچن. هاوڵاتیانی ئەو وڵاتانەش گوێ نادەنە ئەوەی کە لەژێر فەرمانی کەسدا نین، ناشتوانن، بەڵکو ناشیانەوێ لە فەرمانەکانی فەرمانڕەوا دەرچن. لەو میرنشینانەدا، نەك ئەوانی تر ئەمن و ئاسایش بەرقەرارە و خۆشگوزەرانی بوونی هەیە. لەبەرئەوەی ئەوان بەپێی یاسا ئاسمانییەکان کار دەکەن، ئەقڵی مرۆڤ توانای ئەوەی نییە تێی بگات، من لێرەوە هیچی تری لەسەر ناڵێم تەنها ئەوە نەبێ: تاوەکو خودا خۆی دامەزرێنەرو پارێزەری بێ، ئەو کەسە بە هەڵەدا چوە مشتومڕی لەسەر بکات و بڕیاری خۆی لە سەر بدات..[٣٥٦]).

سەرەڕای ئەوەی ماکیاڤیللی گاڵتەی بەوجۆرە میرنشینانە دەهات و زۆربەی جارەکان رەخنە و لۆمەی خۆی ئاراستەیان کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دەتوانین ئەوە بڵێین، کە ئەو دژایەتی ئاینی نەکردووە، بەڵکو لەهەموو کاتێکدا رێزی لە ئاین دەگرت، بۆ نموونە ئەو دەیگوت: (هیچ ئاماژەیێك لەوە راستتر نییە ئەگەر بڵێین وڵاتێك لە وڵاتەکان تێکشکاوە، لەبەرئەوەی (خواپەرستی) لە ناویدا پشتگوێ خراوە و گرنگی پێ نەدراوە..[٣٥٧]). بۆیە دەبینین لەناو وڵاتدا گرنگییێکی تایبەت بە ئایین دەدات، بەوپێیەی کە ئاین ئەو هێزەیە کاریگەرییێکی زۆری لەسەر تاکەکانی ناو کۆمەڵدا هەیە، چونکە ئایین رەگەزێکی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ تەندروستی وڵات تاوەکو گەندەڵ نەبێ، لەبەرئەوەی هەرچی وڵات هەیە لە جیهاندا ئەگەر گەلەکەی بە گوڕو تینێکی زۆرەوە، گوڕو تینێك کە لە ترسی سزادانی فەرمانڕەوا نەبێ روو لە کار نەکەن بۆ ئەوەی وڵاتەکەیان بەرز راگرن، ئەو وڵاتە گەشە بە خۆیەوە نابینێ، ئەگەر دەوڵەتیش رێز لە ئایین بگرێ دەگاتە ئامانج و مەبەستەکانی خۆی، بە مەرجێك کە ئایین لەژێر چاودێری دەوڵەتدا بێ، نەك لە سەرووی دەوڵەتەوە بێ، یان هاوشانی دەسەڵاتی دەوڵەت، یان هەمان مافی هەبێ، بەڵام ئەو لە هەندێك رووەوە دژایەتی ئاینی مەسیحی دەکرد وەك دەڵێ: (گەلێ کەس لایان وایە کە گەشەکردنی شارەکانی ئیتالیا بۆ کلێسا دەگەڕێتەوە، بەڵام من لە گەڵ ئەو رایەدا نیم..)[٣٥٨]. ئەو دوو نموونەمان بۆ دەخاتە روو، یەکەمیان: ئەوە بوو کە

---

356 - I Bid ,P-61.

٣٥٧ - نیکۆلای ماکیاڤیللی (المطارحات) پێناسەی خەیری حەداد ـ دارولئافاق ئەلجەدیدە بەیروت لــ٢٦٥ ــ.

٣٥٨ - هەمان سەرچاوە لــ٢٦٧ ــ.

ئیتاڵیا لەژێر کاریگەری ئەو نموونە خراپەی فەرمانڕەوکانی رۆما بوو کە ئەوپەڕی شکۆمەندی بە ئاین دابوو.. بەمشێوەیە ئێمەی خەڵکی ئیتاڵیا یەکەم شت کە قەرزاری کڵێساو پیاوەکانی کڵێسای دەکردینەوە، ئەوە بوو ئێمە بووینە لەڕێ لادەر و لە ئایین هەڵگەڕاوە..)[359].

نموونەی دووەمیان: ماکیاڤیللی دەڵێ: (بەڵام ئێمە بە شتێکی لەوە گەورەتر قەرزارباری کڵێساو پیاوەکانی کڵێسا دەبینەوە و لەوانەیە کڵێسا هۆکاری دووەمی ئەو وێرانکاریە بووبێ کە تووشمان هات هەر کڵێساش بوو ئیتاڵیای پارچە پارچە کرد و ئێستاش پارێزگاری لەو پارچە پارچەییە دەکات. دەسەڵاتی کڵێسا ئەوەندە لاوازبوو کە نەتوانێ ئیتاڵیا یەکخاتەوە، بەڵام ئەوەندەش بە هێزبوو کە نەیهێشت ئیتاڵیا یەکبگرێتەوە...)[360]. ئەوەی کە زۆر سەیرە ئەوەیە ماکیاڤیللی لەبەر چەند هۆکارێکی ئەخلاقی دژایەتی ئاینی مەسیحی دەکرد، چونکە هیچ هەوڵێکی نەداوە خەڵکی فێری ئەوە بکات کە تواناکانی Virtu خۆیان بخەنە گەڕ. ئەو فەیلەسووفێکی واقیعبین بوو، بەو مانایەی کە ئەو بەردەوام ئەو راستیانەی کە بە شێوەییێکی گشتی لەبارەی سروشتی مرۆڤایەتی و ژیانی سیاسی بوون دووپات دەکردەوە، کە لە واقیعدا بوونیان هەبوو و بە چاوی خۆی دەیانیبینی. ئەمە سەرەڕای ئەوەی حەزی لەوەبوو شێوەییێك لە شێوەکانی کۆماری زیندوو بکاتەوە کە لە کاتی خوێندنەوەی کتێبە مێژووییەکاندا بە تایبەتی مێژووی رۆمای کۆن سەرنجی راکێشابوو[361].

## چوارەم: ئەخلاق..و سیاسەت: .

بێگومان ئەو کاتەی ماکیاڤیللی بانگەشەی ئەوەی کرد، کە گوتنەوەو جوینەوەی بیرۆکە سیاسیە کۆنەکان رەت دەکاتەوە، لێکۆڵینەوە سیاسییەکانی خۆی بە ئاراستەییێکی نوێدا برد، چونکە ئەو یۆتۆپیاییێك دروست ناکات، یان لە کۆمارێکی تۆکمەو توندا بەدوای مەرجەکانی خۆشگوزەرانیدا ناگەڕێ. لەهەمان کاتدا لە توێژینەوەکانیدا مەبەستی لە پێوەندییەکانی نێوان شاری خوداوەند و شاری مرۆڤ نەبوو، وەك ئەوەی کە لەکاتی خۆیدا قەشە ئۆگەستین کردی، بەڵکو ئەرکی ئەو تەنها تێگەیشتنی یاساکانی دەسەڵات و بەراورد کردنیان بوو، لێرەدا

---

٣٥٩ - هەمان سەرچاوە لـ٢٦٨ ـ.

٣٦٠ - هەمان سەرچاوە لـ٢٦٨ ـ.

361 - .P.38. M.Cranston, (ed) "Western Political Philosophers,,

مەبەستم ئەوەیە، کە ئەرکەکەی ئەو تەنها ئەرکێکی سیاسی بوو، نەوەك ئەخلاقی بێت. ماکیاڤیللی سیاسەتەکانی خۆی لەسەر ئەو بنچینە بە ناوبانگە بنیادنابوو کە دەڵێ: (ئامانج پاساو بە ئامراز دەدات ـ الغاية تبرر الوسيلة ـ) ئەو مەبەستەشی لە بنچینەدا بۆ بەرژەوەندییەکانی وڵات بوو، چونکە وڵات ئەو مەڵبەندەیە کە ئەخلاقەکەی ماکیاڤیللی لە چواردەوریدا دەخولێتەوە و ئەو سنوورەشە کە ماکیاڤیللی بۆ ئەو ئەخلاقە دایناوە. هەر بۆیەش ئەو کەسەی کە بۆ مەبەستێك هەوڵدەدات کە پێوەندی بە وڵاتەوە نەبێ، ئەو کەسە (بێ ئەخلاقە)، چونکە ئەوەی لەسەر شانی هاوڵاتییێکی سادەیە هەمان ئەو ئەرکەیە کە لەسەر شانی پیاوانی دەوڵەت و فەرمانڕەواکانە و بەرژەوەندییە تاکە کەسییەکان، یان شتە تایبەتەکان، یان مافەکانی تاك، یان کاروبارە ئاسایی و هەست و سۆزەکان، بەرامبەر بە پێداویستییەکانی دەوڵەت هیچ بەهاییێکی نامێنێ و دەبێ لەوکاتەی دەوڵەت رووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە هیچ حیسابێك بۆ ئەو ئەخلاقە باوەی کە هەیە نەکرێ: ئەگەر ئەو مەترسیانە لە دەرەوەڕا بێ وەك چاو تێبڕینی وڵاتە دراوسێکان، یان ئەو مەترسیانەی کە لە ناوەوە بەرەو رووی دەبنەوە، وەك گەندەڵی و ئەو ئاژاوەگێڕیەی دەوڵەت رووبەڕووی دەبێتەوە ئینجا لە بەر هەر هۆکارێك بێ، چونکە رزگارکردنی نیشتمان و پارێزگاریکردن لە سەربەخۆیی و ئازادییەکان و سەقامگیری و ئاسایشی دەوڵەت مەبەستی یەکەم دەبێ، هەر مەبەستێکی تر لە بەرامبەریدا بەهاییێکی ئەوتۆی نامێنێ، تەنانەت بەرژەوەندییە تاکە کەسییەکان لەگەڵێدا ون دەبن، چونکە تاك و بەرژەوندییە تاکە کەسییەکان دەبێ لەگەڵ دەوڵەتدا تێکەڵ بن. لەوانەیە هەر لەبەرئەو هۆکارەش بێ مۆسۆلینی - Benito Mussolini (١٨٨٣-١٩٤٥) زۆر بە ماکیاڤیللی و کتێبی (میر) سەرسام بووە، تەنانەت لە وتارە بەناوبانگەکەیدا لە ساڵی ١٩٣٤ باسی کردووە و بە شیکردنەوەوە خستویێتیە روو.

ئەوەی راستی بێ ماکیاڤیللی لە کێشە سیاسییەکاندا دانی بە هیچ یاساییێکی ئەخلاقیانەدا نەدەنا، چونکە لەلای ئەودا سیاسەت وەك ئەوەی لەلای هیتلەر و مۆسۆلینی هەبوو وابوو ـ کە ئەو یاریەیە کە تیایدا رێگە بە هەر هەموو فرت و فێڵەکان دەدرێ پیادە بکرێن ـ بنەمای ئەو یاریانەش لەسەر دەستی یاریزانەکان و بەپێی ئارەزووەکانی خۆیان دەگۆڕێ. (هیتلەر) دەیگوت: (هیچ حەز بەوە ناکەم کە بە شێوەیێك دەربکەوم کە لە یەکێکی دیکە زیاتر یاسا ئەخلاقییەکان پێشێل بکەم. من زۆر بە ئاسانی دەتوانم شێوییێك لە ئەخلاق بە سیاسەتەکەم ببەخشم و واشی نیشان بدەم کە سیاسەتی ناحەزەکانم

سیاسەتێکی چەواشەکاریە لەبەرچی رێگە بۆ خەڵکی خۆش بکەم هێرشم بکەنە سەر؟. هیچ شتێك لەوە هەڵەتر نییە کە سیاسەتمەدارێك خۆی وا نیشان بدات کە لە خەڵکانی تر بەرزترە و بنەما ئەخلاقیە باوەکان پێشێل بکات، چونکە بنەما ئەخلاقیە گشتییەکان بۆ گەل پێویستن و دەبێ هەبن..) [٣٦٢].

لێرەدا ئەویش رێك ئەو بۆچوونانە دەردەبڕێ کە ماکیاڤیللی بەرامبەر بە ئەخلاق هەیێتی. لەبەرئەوەی دەوڵەت لە تاك و تەنانەت لە کۆمەڵە ئادەمیزادێکیش باڵاترە. هەر بۆیەش کرا بەو ئەرکەی کە لە سەرووی پەیوەستبوونی تاکەکانەوە بێ. ـ ئەگەر ئەم بۆچوونەم رێی تێبچێ، کە دەڵێ ـ ئەگەر سیاسەت هونەرێکی سەربەخۆ بێت و لەسەرووی هەر هونەرێکی ترەوە بێ، کەواتە دەبێ ئامانجەکانیشی زۆرترین (خێرو خۆشی) بهێنێتە دی کە لەسەرووی هەر خێرو چاکەییێکی ئەخلاقیەوە بێت، چونکە ئەخلاقە باوەکان لە بنچینەدا چەند بێخەوشییێکن بۆ رەفتارەکانی تاك دانراون، بەڵام خێرو چاکە باڵاکانی سیاسەت بۆ سەلامەتی و بەرژەوەندییەکانی خەڵکی دانراون، بۆیە نابێ ئەو مەبەستانە رێگاییێك بن بۆ چەند مەبەستێکی تر تەنانەت ئەگەر ئەخلاقیش بن. هەروەها ئەخلاقە تاکە کەسییەکان لەگەڵ ئەوەی کە گرنگی و پێویستی و بەها و مەترسی زۆری بۆ هەر هەموو تاکەکان هەیە، بەڵام بۆ دەوڵەت بەوشێوەیە نییە، لە بەر سروشت و مەنتیق و ئەو مافە تایبەتیانەی کە هەیێتی، چونکە دەوڵەت بۆ پارێزگاریکردن لە (ساغ و سەلامەتی گەل) بکوژەکان سزا دەدات، لەبەرئەوەی (ژیانی بە کۆمەڵ) باشتر و تەمەن درێژترە لە ژیانی تاك. هەروەها بەرژەوەندییە گشتییەکانیش لە سەرووی بەرژەوەندییەکانی تاکەوەیە، چی تێدا بە سەر نییە ئەگەر لەبەر خاتری پاراستنی مافەکانی کۆمەڵ ژیان لە تاکێك بستێنینەوە، یان چەند مافێکی ئەو تاکە رەتبکەینەوە. ئەگەر بێت و دەوڵەت لە خزمەتی بەرژەوندییەکانی کۆمەڵدابێ نەك تاك، وا پێویست دەکات کە لەگەڵ تاکەکاندا وەك یەك رەفتار نەکات، وەك ئەو رەفتارەی کە پیاوانی ئەخلاق داوای دەکەن، چونکە ئەرکی دەوڵەت ئەوەیە کە لە کاتی پێویستدا و بۆ پارێزگاریکردن لەگەل و سەلامەتی کۆمەڵ بە هیچ ئەخلاقێکی تاکەوە پابەند

---

٣٦٢ - لە مامۆستا محەمەد موختار ئەلزەقزوقی کتێبی (نیکولای ماکیافلی) لــ١١٦ وەریگرتووە.

نەبێ، لەبەرئەوەی کارەکانی دەوڵەت نە دەچێتە خانەی ئەخلاقەوە و نە سروشتی خێرو شەڕیشی هەیە و نە سەر بە هیچ یەکێکیشە لەوانە [٣٦٣].

بە یەکەوە گرێدانی ئەخلاق و سیاسەت لەلای ماکیاڤیللی جۆرێکە لە شێتی و کەم ئەقڵی، بەڵکو هەوڵدانێکە بەرەو شتێکی مەحاڵ، سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە دان بەوەدا دەنێین کە ئەخلاق پرسێکی بنچینەیی ڕەفتارەکانی تاکە، لەوانەشە لەکاتی خۆیدا دەسەڵاتی ویژدان لە دەسەڵاتی یاسا بۆ هاوڵاتیان باشتر بووبێ، بەڵام دەبێ دەوڵەت هانی تاکەکان بدات بەها ئەخلاقییەکان لە ڕەفتارەکانی خۆیاندا پیادەبکەن و داوا لە هاوڵاتیان بکات کە بە جێبەجێکردنی ئەرکەکان و ئابڕوو و ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزی و هاوکاری، سۆزی نیشتمانپەروەری یەکانگیری خۆیان بپارێزن، بۆ ئەوەی تاکەکان بتوانن پارێزگاری لە سروشت و مانەوەی دەوڵەت بکەن، بەڵام دەبێ دەوڵەت لەوە ئاگادار بێ کە دانەبەزێتە ئاستی ئەخلاقی تاکەکان، چونکە درۆکردن ئەگەر تاکێك بیکات ئەوە دەبێتە کارێکی بێئەخلاقی و خراپ، بەڵام ئەمە چۆن دەبینی ئەگەر دەوڵەتێك درۆ بکات کە خۆی لە سەرۆکەکەیدا بنوێنێ؟. ئەو سەرۆکە کە بەو کارە هەڵدەستێ بۆ پاراستنی (مەبەستێکی) باڵاترە کە ئەویش مانەوەی نەتەوەکەیی و سەلامەتی گەل و وڵاتەکەییێتی، ئەم مەبەستەش یەکەم ئەرك و دوا ئەرکی دەبێ. نموونەییێکی ترت بۆ بێنمەوە: بێ وەفایی بەرامبەر بەڵێنەکان کارێکی بێئەخلاقیە، بەڵام ئایا ئەمە دەبێتە کارێکی بێئەخلاقی و شەڕانگێزی ئەگەر پەیماننامەییێك بە زەرەری وڵاتەکە تەواو ببێ هەڵی بوەشێنیتەوە، کە لەوانەیە سەروەری و سەلامەتی وڵاتەکە بخاتە مەترسیەوە؟!. نموونەییێکی ترت بۆ دێنمەوە: پیاو کوشتن کردەوەییێکی خراپ و بێئەخلاقیە بەڵام ئایا بەردەوام بەم شێوەیە دەمێنێتەوە؟ ئایا دەبێ دەوڵەت بەرامبەر بەو کەسانەی کە شەڕیان پێی فرۆشتووە، یان ئەو کەسانەی لەکاتی شەڕ و ناخۆشییەکاندا خیانەتیان لێکردووە و نیشتمانیان فرۆشتۆتە دوژمنان و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیانیان پێ باشتر بووە لە بەرژەوەندی وڵات پیادەی نەکات و لێی رابکات؟ وا پێ دەچێ کە تەنها سیاسەتمەدارە لاواز و نەزانەکان نەتەوەکەی خۆیان بخەنە ژێر مەترسیەوە. بە رای ماکیاڤیللی ئەو کەسە ئەو بیرۆکەیە بە شێوەییێکی کوێرانە

---

٣٦٣ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ١٤٥ ـ ١٤٦ـ.

پەیڕەو دەکات، کە دەڵێ: بەها ئەخلاقییەکان ڕەهان و بێخەوشی هەر بە بێخەوشی دەمێنێتەوە و خراپەکاریش هەر بە خراپە دەمێنێتەوە.. لەکاتێکدا سیاسەتمەداری بە هێزو توانا، کە لە ناخی کاروبارەکاندا شارەزایی هەیە، لەوانەشە هەر خۆشی پیاوێکی بێخەوش و چاکبێ ـ کە ئەمە چەندین جیاوازی تێدایە ـ چونکە هەستێکی هەیە کە ڕێگەی پێ نیشان دەدات، کە ئاسمان ئەو هەستە تەنها بە خەڵکانێك دەبەخشێ کە بێگەرد و چاك بن، ئەو هەستەش خاوەنەکەی بەرەو ڕێگەی ڕاست ئاراستە دەکات بۆ چەسپاندنی بنەماکانی ئەخلاق بە شێوەیێك کە هەرگیز بێخەوشی لە مانا ڕاستەقینەکەی خۆی دەرناچێ.

ئەگەر لە چوارچێوە و سنوورەکانی دەوڵەت بچینە دەرەوە و تەماشای پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان بکەین ڕووبەڕووی واقیعێکی تاڵ و زەق دەبینەوە، کە خۆی لەم گوتەیەدا پوخت دەکاتەوە، ئەو وڵاتەی لەو ڕێگایەدا واتە لە ڕێگەی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ئەخلاق بکاتە هاوڕێ و چاوساغی خۆی، ئەو وڵاتە وڵاتێکی بێ ئەقڵ و خەواڵوە و هەردەم هەگبەی بەتاڵ دەبێ و بەرەو وێرانبوون دەچێ. سەرکردایەتیکردنی وڵاتێك شتێکی مەترسیدارە، چونکە پێچ و پەنا و کەند و کۆسپی زۆرە، بۆیە سەرکردە کورتبینەکان توانای ئەوەیان نییە سەرەدەری لێ دەرکەن، لەو بارەیەوە وینستۆن چەرچڵ (١٨٧٤ ـ ١٩٦٥) کە سیاسەتمەدارێکی بەریتانی درەوشاوەیە، لە شەڕی جیهانی دووەمدا توانی بەریتانیا بەرەو سەرکەوتن بەرێ ـ لەم ڕستەیەدا ئەخلاقی سیاسەتی نێودەوڵەتی دەربڕیوە و دەڵێ: (من بۆ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا هەندێك تاوانم ئەنجام داوە، ئەگەر لە ناوەوەی بەریتانیا ئەو تاوانانەم ئەنجام بدابا هەر هەموو ژیانی خۆم لە بەندیخانەکاندا بە سەردەبرد). ئەو پیاوە پیرە ئەو ڕستەیەی لە بارەی ئەخلاقی سیاسەتمەدارێك دەربڕیوە، بە تایبەتی لە کاتی پێوەندییەکانیدا بەو وڵاتەی کە پێوەندی لەگەڵ وڵاتەکەی ئەودا هەیە. ئایا لە کاتی مامەڵە کردنیدا لەگەڵ ئەو وڵاتەدا دەبێ (مرۆڤێکی بێخەوش بێت)؟! مەبەستم ئەوەیە دەبێ درۆی لەگەڵدا نەکات و بەرامبەرەکەی بە هەڵەدا نەبات ولە بەڵێنەکانیدا پاشگەز نەبێتەوە، یان هیچ فرتوفێڵ و خیانەتێکیشی لێ نەکات...هتد. بەڵکو بۆ ئەوەی ڕێگەی خوار و خێچ نەگرێتە بەر، دەبێ ڕاستی و ئەمانەت و دڵسۆزی و وەفاداری بگۆڕێ و بیکاتە کاری جیددی و لەخۆ بووردەیی بەردەوام لە ناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا، بەڵکو دەبێ وەك ئەو گوتەیەی کە لە

کتێبی پیرۆزدا هاتووە وابێ، کە دەڵێ: (هەر هەموو ڕێگاکانی ڕاستن)؟! چونکە پیاوی دەوڵەت بۆ ئەوەی بتوانێ پارێزگاری لە دەوڵەت بکات زۆرجار وا دەبێ بە ناچاری بە سەر لاشەی پرەنسیپەکانی ئەخلاقدا بڕوات، ڕێك وەك ئەوەی وڵاتان لە کاتی شەڕەکانیاندا دەیکەن، کە هەرچی پرەنسیپ و بەها ئەخلاقیەکان هەن وەلا دەنرێن، تەنانەت بە پۆستاڵە قورسەکانی سەربازەکانیش لەوکاتەی کە دەیەوێ بە پەلە بگاتە گۆڕەپانی شەڕ بە سەری دەکەون. لێرەدا دەبینی ئەو بۆشاییەی لەنێوان تاك و دەوڵەت و نێوان ئەخلاق و سیاسەتدا هەیە هەر دەمێنێ بێ ئەوەی بتوانن لێی تێپەڕن.

بەڵام دەبێ ئەوە بزانین و لامان روون بێ کە ماکیاڤیللی هیچ کاتێك داوا لە تاك ناکات خۆی لە پرەنسیپ و بەها ئەخلاقییەکان داماڵێنێ، یان لێیان دەرچێ، یان ویژدانی خۆی بەلاوە بنێ، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەو گرنگییێکی زۆر بە چاندنی پرەنسیپەکانی ئەخلاق دەدات لەلای تاکدا، کە درۆ نەکات و کەس نەخەڵەتێنێ و مەرایی و دووزمانی نەکات...هتد. هەر هەموو ئەو شتانەی کە ئەو فەیلەسووفە هەوڵی بۆی دەدا ئەوە بوو، ئەخلاق، کە پرەنسیپێکی رەفتارەکانی تاکە، لە سیاسەت کە گەڕانە بە دوای بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵدا و پاراستن و پارێزگاریکردن و پشتگیری کردنە لە بوون، مانەوەی دەوڵەت جیا بکاتەوە. ماکیاڤیللی خۆی لە ناخۆشترین و تاڵترین رۆژگارەکانی ژیانیشیدا بە پرەنسیپەکانی ئەخلاقەوە پابەند بوو و پاریزگاری لێدەکرد. ئەو نموونەی هاوسەرێکی بە وەفا و باوکێکی لێهاتوو بوو، لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا بە شێوەییێکی ئەخلاقیانە غافڵ نەدەبوو و پرەنسیپە ئەخلاقییەکانی تێدا دەچاندن، هەروەها لە ئەرکەکانی بەرامبەر بە هاوڕێکانیدا دڵسۆز و بەوەفابوو. هەروەها ئەوەی رەت دەکردەوە کە ویژدان، یان قەڵەمەکەی خۆی بفرۆشێ[٣٦٤].

---

٣٦٤ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ١٥٤ ـ ١٥٥ ـ.

# بەشی دووەم

## (تۆماس هۆبز ١٥٥٨ . ١٦٧٩)

**(من لاریم لەوەدا نییە کە خەڵکی حەز بەوە دەکەن لە گەڵ یەکتردا کۆببنەوە، بەڵام کۆمەڵگەی مەدەنی شتێکە و تەنها بە یەککگەیشتن و گردبوونەوەی خەڵکیش شتێکیترە، چونکە کۆمەڵگەی مەدەنی لە چەندین کۆت و رێککاری پێکهاتووە.)**

**(تۆماس هۆبز)**

**(بڕواییێکی پتەوم بەوە هەیە، کە هەر هەموو شتەکان بە شێوەییێکی ریشەیی بە سیاسەت بەستراونەتەوە ، ئەگەر رووی خۆمان بە هەر لاییێکدا وەرچەرخێنین دەبینین هەر گەلێك تەنها دەتوانێ گوزارشت لە سروشتی ئەو حکومەتە بکات کە خۆی دروستی کردووە).**

**جان جاك رۆسۆ ـ دانپێدانانەکان ـ کتێبی نۆیەم)**

## پێشەکی:

گومان لەوەدا نییە کە (تۆماس هۆبز) گەورەترین فەیلەسووفی سیاسی ئینگلیزە لە سەردەمی نوێدا و لەهەر هەمووشیان زیاتر شتەکانیان ورووژاندوە[٣٦٥]. هەروەها یەکەم کەسیشە، کە تیۆرێکی سیاسی لەسەر بنچینەی ئەقڵیەتێکی پتەو دامەزراندبێ کە بتوانێ هەرچی ئاژاوە و تێکەڵایی هەبوو کە ئەو کات ژیانی ئینگلیزەکانی تەنیبێوە لەناو ببا، شەڕە ناوخۆییەکەی ـ نێوان پاشاو پەرلەمان ـ لە سەردەمی ئەودا روویاندا. ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە ئەمانە هەمووی لەسەر چەند بیرکردنەوەییێکی کەمی تاکلایەنە دروست دەبن و ئەو ململانێکردنانەش بە هۆی لێك تێنەگەیشتنەوە دێنە ئاراوە[٣٦٦]. وڵات پڕە لەو کەسانەی کە تەنها باوەڕیان بە قسەکانی خۆیان هەیە و وادەزانێ کە تەنها خۆی راستە. هەر خۆی دەزانێ کە دەوڵەت چۆن و بە چ شێوەییێك بنیاد دەنرێ و هەروەها کاروبارەکان لەناو وڵاتدا چۆن بەڕێوە دەچن، و ئامادەشە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بیروڕاکانیان لەگەڵ ئەودا یەك ناگرێتەوە بەرگری لە بیروڕاکانی خۆی بکات و بکەوێتە

---

365 - J. Plamenatz Introduction to Leviathan.P.5 .

٣٦٦ - بە هۆی ئەو ناکۆکیانەی نێوان (شارل پاشای یەکەم و هێزەکەی لەلایێك و نێوان پەرلەمانی ئینگلیزی بە سەرۆکایەتی ئۆلیڤەر کرۆمویل (١٥٩٩ ـ ١٦٥٨) لە لاییێکی ترەوە، لە ئینگلتەرادا شەڕێکی ناوخۆیی روویدا کە حەوت ساڵ درێژەی کێشا، دوا ئەنجامیش لە بەرژەوەندی پەرلەماندا کۆتایی پێهات و لە ساڵی ١٦٤٩ پاشا لە قەسابخانەکەدا لە سێدارە درا، هەر لەوکاتەشدا کۆماری کرۆمویل راگەیێندرا و لە ساڵی ١٦٥٨ یش لەگەڵ مردنیدا ئەو کۆمارە کۆتایی پێهات و لە ساڵی ١٦٦٠ دا شارل پاشای دووەم (١٦٤٩ ـ ١٦٨٥ ) گەڕایەوە وکرایە پاشای ئینگلتەرا، بۆیە دەبووایە ئەو شەڕە کوشندەیە کە بووە هۆی ئەوەی ئاژاوە هەر هەموو وڵات بگرێتەوە ببێتە جێگەی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی فەیلەسووفەکان، هەر لەبەرئەمەش بوو هۆبز گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە دەبێ دەسەڵاتێکی بەهێز لەناو کۆمەڵگەدا هەبێ کە یاسا بسەپێنێ و ئاژاوەکان بنەبڕ بکات ـ بەمشێوەیە هۆبز پشتگیری لە دەسەڵاتێکی رەها کرد. لە کاتێکدا (جۆن لۆك. ١٦٣٢ ـ١٧٠٤) کە هاونیشتمانییێکی خۆی بوو، گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە دەبێ پشتگیری لە دەسەڵاتەکانی گەل بکرێ و هاوڵاتیانیش مافی ئەوەیان هەبێ کە ئەگەر پاشایان بە دڵ نەبوو بیهێننە خوارەوە.

ململانێیەکی توند لە گەڵیاندا ـ ئەنجامەکەشی ئەو ئاژاوە کۆمەڵایەتیەی لیّ کەوتەوە و توندوتیژیە سیاسییەکان زیاتر بوون کە دواجار بووە هۆی شەڕێکی ناوخۆیی کوشندە (ئەوەی روون و ئاشکرایە رزگارکردنی کۆمەڵگە تەنها بە دەرکەوتنی ئیقلیدسی سیاسەتمەدار دەبیّ، کە گرەو لەسەر راستییە سیاسییەکان دەکات و لە سەرووی هەر مەزەندەو گومانێکەوەیە). بە پێی لێدوانەکەی (واتکنز ـ R.W.Watkin) ئەمە یەکێك بوو لەو سێ ئاواتەی کە هۆبز دەیویست بە تیۆرە سیاسی و ئەخلاقییەکانی خۆی بیهێنێتە دی [٣٦٧]. هەر لەبەر ئەمەش بوو رێبازەکەی هۆبزی بە (ئەقلانی سیاسی وەسف کردووە، یان بەو رێبازە ئەقڵیەی کە لە مەیدانی زانستە سیاسییەکاندا جێبەجێ دەکریّ، یان بڵێ ئەو ویستی بگاتە دڵنیابوونێکی وەرزشیانە، هەر لەبەر ئەمەش بوو دەیانگوت دەیویست ببێتە ئیقلیدسی زانستە سیاسییەکان [٣٦٨]. لە بەر ئەوەی ئەو دەیویست لەسەر بنچینەی ئەقڵیەتێکی پتەو بینای سیاسی دەوڵەت بنیاد بنێ. نامانەوێ رێبازەکەی هۆبز زۆر بە دوورودرێژی بخەینە روو، چونکە پێشتر و لە شوێنێکی دیکەدا ئەمەمان کردووە [٣٦٩]. لێرەدا بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێستامان دەمانەوێ ئاماژە بە چوار بیرۆکەی بنچینەیی بدەین کە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** دەوڵەت کۆمەڵگەیێکی دەستکردە.

**دووەم:** گرێبەستە کۆمەڵایەتییەکان.

**سێیەم:** ئەخلاق..و سیاسەت.

**چوارەم:** ئاین..و دەوڵەت.

## یەکەم دەوڵەت کۆمەڵگەیێکی دەستکردە:

(تۆماس هۆبز) یەکەم فەیلەسووفی سیاسی بوو لەسەردەمی نوێدا رووبەڕووی کەلەپوورە کۆن و ناوەنجییەکانی یۆنانی کۆن ببێتەوە و زانستە سیاسییەکان بەرەو

---

367 - K.W. Watkins Thomas in M.Cranston "Western Political Philsophers P. 46-47 .

368 - M.Oakeshou : Hoobes On Civil Association Oxford ,Blakwell 1975, P.3 .

٣٦٩ - کتێبەکەی من (توماس هوبز فیلسوف العقلانیة) چاپی یەکەم دارولسەقافە لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٥ و چاپی دووەمی لە دارولتەنویر، بەیروت بەراورد بکە.

ئاراستەییێکی نویێ بەرێت و شێوەکانی دروستبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی شیبکاتەوە، هەروەها بە شێوەییێکی ئەقلانی و بێگەرد دەوڵەت شیبکاتەوە. ئەو بیرۆکەکەی ئەرستۆ رەت دەکاتەوە کە دەڵێ: (دەوڵەت: گەشەکردنێکی سروشتیە لە خێزانەوە بۆ گوند، لەوێشەوە بۆ شار روودەدات، چونکە مرۆڤ هەر لە زگماکیەوە بەوە قایلە کە لە ناو کۆمەڵێکی سیاسی رێکوپێکدا بژی، لەبەرئەوەی مرۆڤ هەر بە سروشت ئاژەڵێکی سیاسیە و حەز بە ژیانێکی سیاسی دەکات لە ناو کۆمەڵێکی رێکوپێکدا، خۆی هەر بە سروشت مەدەنییە)[٣٧٠]. هەروەها هۆبز ئەو بیرۆکە ئاینییەشی رەتکردەوە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا باو بوو، کە دەڵێ: (پاشا بە فەرمانی خوا حوکمڕانی دەکات و تەنها لەبەرامبەر ئەویشدا بەر پرسیارە، نەك لە بەرامبەر تاکەکانی هاولاتیانی خۆی، هەروەها لە بەرامبەر هیچ ئەنجومەنێك لە ئەنجومەنەکانی نوێنەران، یان ئەنجومەنە ئاینییەکان بەر پرسیار نییە. ئەو تەنها بەرامبەر بە خوا بەرپرسیارە و دەبێ دارودەستەکەش بە شێوەییێکی کوێرانە گوێڕایەڵی پاشاکەیان بن، هەر کەسێکیش لە فەرمانەکانی ئەو دەرچێ واتە تاوانی ئەنجامداوەو لە فەرمانەکانی خوا دەرچووە[٣٧١]. بەم شێوەیە دەبینین خوا دەبێتە سەرچاوەی دەسەلاتە سیاسییەکان، فەرمانڕەواش خۆی دەبێتە خاوەنی ئەو دەسەلاتە لەسەر زەویدا ـ واتە ئەو سێبەری، یان خەلیفەی خودایە لەسەر زەوی، کە هەر رووبەڕوو بوونەوەییێك لەگەڵیدا بە خراپەکاری و تاوان دەژمێردرێ[٣٧٢]. هۆبز هەر هەموو کلتورە ئۆروسستۆکراتی و ئاینییەکان رەتدەکاتەوە،

---

٣٧٠ - ئەرستۆ: السياسة ١٥٣٢ ـ أ.

٣٧١ - شەریعەتی موسایی خۆی لە هەموو شتێك هەڵدەقورتاند لەبارەی بنەمای رەفتارەکانی هەر تاکێك لە ژیانی رۆژانەیدا، تەنانەت چەند داب و نەریتێکیشی بۆ خێزانەکان دانابوو، دەبووایە ئاگاداری داب و نەریتەکانی نانخواردن بن، هەروەها شێوەی داهێنانی قژی سەر و ریشتاشینیشی بۆ تاکەکان دەسنیشانکردبوو...هتد. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە شێوەی پیشە جۆربەجۆرەکانیشی رێکخستبوو: لە راستیدا شێوەی چاندن و تۆوکردنی زەوییەکان و شێوەی چاندنی دارمێویشی رێکخستبوو. د. سەروەت بەدەوی (اصول الفكر السياسي والنظريات والمذاهب السياسية الكبرى) دارولنەهزە ئەلعەرەبیە ساڵی ١٩٧٦ لـ ـــ.

٣٧٢ - ئەوەی راستی بێ ئەو تیۆرانەی، کە داوای دەوڵەتێکی ئاینی دەکەن و دەڵێن فەرمانەکانی (خودا)ی تێدا جێبەجێ دەکرێت ـ ئەمە خۆی لە بنچینەدا تیۆری جولەکەکانە، هەمان ئەو دەقەیە کە

لە کتێبی پیرۆزدا هاتووەو شیکراوەتەوە کە لەبارەی (وڵاتی خوداوەند) هاتووە، دەبێ ئەو وڵاتەش لە کەسانی بەنی ئیسرائیل پێکهاتبێ، خودای گەورەش پاشای گەورەیانە. ئەمە دەقی ئەو پەیمانەیە کە لە خۆیانیان گرتبوو، بەرامبەر بەو پەیمانەی کە خودای مەزن زەوییەکانی کەنعانیان پێ دەبەخشێ کە دەڵێ : (پەیمانێك لەنێوان خۆم و ئێوەو ئەو نەوانەی ئیسرائیل کە لە دوای ئێوەوە دێن دەبەستم کە پەیمانێکی هەتا هەتایی بێ، کە من ببمە خودای تۆو نەوەکانی تۆ کە لە دوای تۆوە دێن، هەروەها زەوییەکانی کەنعانیش بۆ هەتا هەتایێ بە تۆ و نەوەکانی تۆ ببەخشم ) (سفر التکوین ـ ئسحاحی حەڤدەم :٧ ـ ٨) . یەکەمجار ئیبراهیم ئەو پەیمانەی دەست پێکرد، دوای ئەویش موسا لە سەر کێوی سینا نوێی کردەوە کە دەڵێ : (ئەگەر ئێوە گوێ لە فەرمانەکانم بگرن و پەیمانەکانم جێبەجێ بکەن ئەو ساکە ئێوە لە ناو گەلاندا دەبنە گەلێکی تایبەت بە خۆم )(سفر التکوین ئیسحاحی نۆزدەم :٥) ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە مەملەکەتی خودا بە توێژینەوەی پیتەکانی ئەو وشەیە مانای ئەو دەوڵەتە دەگەیێنێ کە لە سەر بنچینەی پەیمان و رەزامەندی دارو دەستەکەو رازیبوونیانە بەم دەوڵەتە مەدەنییەی کە هەڵسوکەوت رەفتارەکانیان نەك تەنها بەرامبەر بە خودا و پاشا بەڵکو بەرامبەر  بە یەکتریش رێکدەخات. بە مانایێکی وردتر ئەمە دەوڵەتێکە کە خودا تیایدا پاشایە ! دوای ئەوە مەسیحییەکان لە سەردەمەکانی ناوەڕاستدا ئەو بیرۆکەیەیان بۆ خۆیان قۆستەوە و وای بۆ چوون کە مەسیح زۆر بە ئاشکرایی خۆی بە (پاشای جولەکەکان داناوە)، هەروەها هۆکاری هاتنەکەشی نوێکردنەوەی ئەو پەیمانە کۆنەیە (العهد القدیم) کە جولەکەکان نەیانگەیاندبووە سەر، هەر بۆ ئەوەشە کە مەسیح گەڕاوەتەوە تا حوکمی خۆی تێدا بدات (ئەو کوڕە مرۆڤە بۆ  بەرزڕاگرتنی باوکی رۆژێك لەگەڵ فریشتەکانی خودادا دێن، لەو کاتەدا هەر کەسەو بەپێی کارەکانی خۆی سزاو پاداشت دەکرێن ) (ان الابن الانسان سوف یأتي في مجد ابیه مع ملائکته، و عندئذ یجازي کل واحد حسب عمله ) (مەتی ئیسحاحی شازدەم :٢٧). ناوەڕۆکی نامەکەی کڵێسا بەمشێوەیە هەر لە سەرەتای هاتنیدا بووە (یەسوع هەر خۆی مەسیحە مەبەستم ئەو پاشایەیە کە خەڵکی  رزگار دەکات و حوکمێکی سەرمەدی دەکات لە جیهانی داهاتوودا، مەسیح خۆی لە وڵاتی ئاشتیدا دەبێتە پاشا) (عیبرانییەکان ـ ئیسحاحی شەشەم :٢ ) بۆ قسەکانی هۆبز تەماشای کتێبی (الاعمال الکاملة) بەرگی سێیەم لــ٥١١ ــ، وکتێبەکەی ئێمە بکە : (توماس هوبز: فیلسوف العقلانیة )لــ ٤٠٧ ـ ٤٢٨ ــ لە چاپی دارو لسەقافە. دەبێ زۆر چاك لەو بیرۆکەیەی، کە چۆتە ناخی کلتورەکانی ئادەمیزادەوە وریا بین، دەبینین زۆران کەس ئەو رستەیە دووبارە دەکەنەوە کە دەڵێ (الحکم لله ) و(الله هو الحاکم) واتە (دەسەڵات هەر بۆ خوایە ) و (خوا هەر خۆی فەرمانڕەوایە) بێ ئەوەی بزانین سەرچاوە راستەقینەکەی لەکوێوەیە هاتووە. ئەمەش دەتگەیێنێتە فەرمانڕەوایەتییێکی رەهای

بۆ ئەوەی بتوانێ کۆمەڵگە بە شێوەییێکی ئەقلانی شیبکاتەوە، وەکو گوتیشمان ئەو دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە دەوڵەت کۆمەڵگەییێکی دەستکردە، بەڵام دەبێ فەیلەسووفەکەمان مەبەستی لە بوونی سروشتی و بوونی دەستکرد چی بێت؟ وەڵامەکەشی ئەوەیە کە سروشتی ئەوە دەگەیێنێ کە خۆی لەخۆیدا هەیە، مەبەستم ئەوەیە، کە لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتەکانی ئێمەی مرۆڤدایە، ئەو شتانەی کە هەن و ئێمە دەستیان تێوەرنادەین و لە خۆیانەوە دروست دەبن و پێی دەڵێین: (جیهانی سروشت)، ئەو جیهانەیە کە مرۆڤ داینەهێناوە و جێ پەنجەی ئادەمیزادیشی پێوە نییە، بەڵکو دەستکردی خودایە مرۆڤیش بەمشێوەیە بینیوێتی، بەڵام (دەستکرد) ئەوەیە کە دەکەوێتە ناو سنووری کردارەکانی ئادەمیزادەوە، واتە ئەوەی دەچێتە ژێر باری هێزو تواناکانی مرۆڤەوە، کەواتە لە دروستکردنی سروشتدا مرۆڤ دەتوانێ لاسایی هونەرە خودایییەکان بکاتەوە و جیهانێکی تایبەت بە خۆی دروست بکات، کە بەمانایێکی فراوانتری ئەم وشەیە ئەویش کۆمەڵگەیە، یان دەوڵەتە. لێرەدا هۆبز وای بۆ دەچێ کە دەوڵەت ئاژەڵێکی دەستکردە، یان بڵێ بە مرۆڤێکی (دەستکرد) دەچێ لێرەدا وشەی (دەستکرد) مانای ئەوە نییە کە تەنها لەبەرئەوەی دەوڵەت بەپێی پەیمانە کۆمەڵاتییەکان دروست بووە، بۆیە وایە هەروەها پێویستی بەوە هەیە، کە بە جیددی پارێزگاری لە مانەوەی بکەین، رێك وەك ئەو کاتژمێرە وایە کە دەبێ پیاو ماوە ماوە پاتری بخاتە سەر بۆ ئەوەی لەکارەکەیدا بەردەوام بێ، یان وەك ئەو شەمەندەفەرە وایە کە دەبێ بەردەوام (سوتەمەنی) تێ بکەیت بۆ ئەوەی لە رێڕەوەکەی خۆیدا بەردەوام بێت. ئەو دەوڵەتەش هەمان حاڵەتی هەیە. ئەگەر لێی بگەڕێیت ئاگات لێی نەمێنێ بێگومان دەبێتە نێچیری شەڕی ناوەخۆ و ئاژاوەگێڕی، مەبەستم ئەوەیە کە چیتر وەك دەوڵەتێکی (خاوەن دیسپلین) نامێنێتەوە، بەڵکو هەر ناشبێتە دەوڵەت. ئەمەش مانای

---

ستەمکار، لەبەرئەوەی هەتا ئەو کاتەی خوا فەرمانڕەوا بێ ـ پاشاش خەلیفەکەیێتی ـ هەر کەسێکیش دژایەتی بکات واتە دژایەتی خودا دەکات، بە مانایێکی تر واتە ئەو کەسە (زەندیق وکافرە) و دەبێ لێی رزگار بین. ئەمەش هەر هەموو پاشا و خەلیفە و فەرمانڕەواکان سەر بە هەر ئاینێکیش بووبن توانیویانە زۆر زیرەکانە لە سەردەمە جۆربەجۆرەکانی مێژوودا بە کاریان بێنن !! وەرگێڕانی د. سەروەت بەدەوی (اصول الفکر السیاسی) لــ١٠٢ ـ١٠٣ـــ.

ئەوەیە: کە دەوڵەت (ڕێکخراو) بێت واتە (دەستکرد) بێت، لە کاتێکدا شەڕی ناوەخۆ و ئاژاوەگێڕی چەند شتگەلێکی (سروشتین).

کەواتە دەتوانین بڵێین کە ئاژاوە شتێکی سروشتیە ـ هەمان ئەو شێوە ڕووداوانەن کە لە حاڵەتی شەڕی ناوەخۆ، یان لە تێکهەڵچوون و شەڕوشۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕوودەدەن ـ لە کاتێکدا ئەو کۆمەڵگایانەی کە ڕێکخراون و خاوەنی دەسەڵاتی خۆیانن، کۆمەڵگەییێکی دەستکردن مرۆڤ بە ویستی خۆی دروستیان دەکات. ئەمەش ئەو مانایە دەگەییێنیٚ کە (حوکمڕانیکردن)، یان (سیستەمی دەسەڵات) لە کۆمەڵگەی ئادەمیزاددا چەند سیفەتێکی دەوڵەتی دەستکردن نەك سروشتی.

ئەمەش بەو بنەما یاساییانەی، کە دەیسەپێنیٚ و ئەو داب و نەریتەی کە لێیەوە دروست دەبێت، کە دەبیٚ هاوڵاتیان پێیەوە پابەند بن، مانای ئەوە دەگەییێنی کە دەوڵەت (دروستکراوێکی بێگەردی ئادەمیزادە، ئەمەش بۆ بوون و مانەوەی تاك و سەلامەتی گەل (Salus populi) زۆر پێویستە ئەگەر تۆ وا بێنیتە بەر چاوی خۆت کە ئەم ڕێنمایی و یاساو بنەماو داب و نەریتانە...هتد لە هەر کۆمەڵگەییێکدا بوونی نەبوو، ئەوە مانای ئەوە دەگەییێنیٚ کە تۆ دەتەویٚ ئەو بارە دەستکردەی لەسەر لابەریت کە مرۆڤ دروستی کردووە. بۆ ئەوەی (دۆخێکی سروشتی) جێگەی بگرێتەوە کە ئەمەش حاڵەتێکی بیٚ سەروبەری و ململانێی نێوان تاکەکان لەگەڵ خەڵکانی تردا دروست دەکات لەپێناو پاراستنی خۆی، هەروەها بۆ ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر ئەوانی تردا بشکیٚ. مەبەستم ئەوەیە کە تۆ دەگەیتەوە (دۆخە سروشتیەکە). یان ئەوەی فەیلەسووفەکەمان ناوی ناوە (شەڕی هەمووان لە دژی هەمووان)، کە هەر مرۆڤێك وەك گورگێکی لێدیٚ بەرامبەر بە برا مرۆڤەکەی خۆی، چونکە ئارەزووە سروشتییەکانی هەر بوونەوەرێکی زیندوو وای بە سەردا دەسەپێنیٚ کە پارێزگاری لە مانەوەی خۆیدا بکات، بەپێی ئەو پرەنسیپانەش دەبینین لە حاڵەت سروشتییەکاندا حەز دەکات پارێزگاری لە مانەوەی خۆی بکات و بوونی خۆی بسەلمێنیٚ، ئەم قسەیەش بایەخێکی ئەوتۆی نییە کە دەڵیٚ: با واز لە حەزەکانی خۆی بهێنیٚ، یان ئارەزووەکانی خۆی پشتگویٚ بخات، چونکە ئەمە مانای ئەوەیە کە داواکارییەکانی ئێمە لە گەڵ سروشتی بوونی ئەودا دژ بە یەکن، بەڵکو بوونی ئەو لەناودەبات، چونکە ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی خۆکوشتن کە ئەقڵی مرۆڤ پەسەندی ناکات، چونکە ئارەزووەکانی

مرۆڤ بۆ پارێزگاریکردن لە خودی خۆی هێزو پاڵنەرێکی بنچینەیین لای مرۆڤ: بە هیچ شێوەیێك ناکرێ پاڵنەرێکی تری کاریگەری لەلا دروست بێ بۆ مانەوەی خۆی دژ بەو پارێزگاریکردنە بێ. (هەر مرۆڤێك بۆ پارێزگاریکردن لە ژیانی خۆی و ئەندامەکانی لەشی بۆی هەیە (هەرچی هێزو توانای هەیە) بە کاری بهێنێ، چونکە هەموو مرۆڤێك مافی مانەوەی لە ژیاندا هەیە، هەروەها دەبێ ئەو مافەشی بدرێتێ کە بۆ سەلماندنی بوون و مانەوەی خۆی هەموو رێگەیێك بە کار بهێنێ)[٣٧٣]. (ئێمە لەو حاڵەتەدا بە مافی خۆمانی دەزانین کە بە هەموو شێوەیێك بەرگری لە خۆمان بکەین..)[٣٧٤]. دەبێ بەردەوام ئەمە لە هزری خۆماندا گەلاڵە بکەین، کە (دۆخی سروشت) ئەو حاڵەتەیە کە بە خەیاڵ، یان بە مەزەندە دانراوە، یان مەزەندەیێکی مەنتیقیە، بەلام ئەو قۆناغە مێژوویيە نییە کە کۆمەڵگەی ئادەمیزاد لە کاتی گەشەکردنەکانیدا پێیدا تێپەڕیبێت، لێرەدا ئێمە وای دادەنێین کە هەرچی یاسا و بنەما و رێنمایی و داب و نەریت و...هتد هەیە لەهەر کۆمەڵگەیێکدا سڕیومانەتەوەو لاماندواە، باشە لە دوای ئەمە چی دەبینین؟. لەو حاڵەتەدا ئەوە دەبینین کە تاکەکان بە هەر شێوەو رێگەیێك کە بۆیان بگونجێ بۆ پارێزگاریکردن لە مانەوەی خۆیان بەرگری لە خۆیان دەکەن، چونکە هیچ سیستەمێك نییە پاریزگاری لە مانەوەی ئەو تاکانە بکات، بۆیە دەبینین مرۆڤەکان چاودێری هەر چوار دەوری خۆیان دەکەن، هەر کاتێك بۆیان رێکبکەوێ هێرش دەکەنە سەر بەرامبەرەکەی خۆیان و شەڕێکی توندو بێ بەزەییانەی لەگەڵدا دەکەن. لەو کاتەدا هەر تاکێك دەیەوێ لەسەر حیسابی ئەویتر هەموو شتەکان بۆ خۆی ببا.

## دووەم گرێبەستی کۆمەلایەتی[٣٧٥]:

---

373 - Thomas Hobbes ;Decive.P.115.

374 - Thomas Hobbes Leviathan.P. 146 .

٣٧٥ - لە کتێبخانەی عەرەبیدا بە باشی لە بیرۆکەی گرێبەستە کۆمەلایەتییەکان و هەروەها لە بارەی ئەو (حاڵەتە سروشت)یەی کە هۆبز وجۆن لۆك دایان رشتبوو تێنەگەیشتوونە. زۆرێك لە لێکۆڵەرەوەکان وای بۆ چووبوون کە ئەمە قۆناغێکی مێژووییە، خەڵکی لەنێوان خۆیاندا بە لێك تێگەیشتن گرێبەستێکیان ئەنجام داوە، وەك ئەو حاڵەتەی لای هۆبز هەیە، یان ئەو گرێبەستەیان لەنێوان خۆیان و فەرمانڕەوادا بەستووە وەك ئەوحاڵەتەی لای جۆن لۆك و کەسانی تردا هەیە. بۆ نموونە یەکێکیان دەڵێ : (ئەم گرێبەستە هیچ بەڵگەیێکی مێژوویی نییە، چونکە لەرووی مێژووییەوە ئەوە نەسەلمێندراوە کە ئەو پێکهاتنە، یان ئەو گرێبەستە ئەسڵی ئەو گواستنەوەیە

ئەگەر بێت و (حاڵەتی سروشتی) ببێتە هۆکاری ململانێکان، بەڵکو ببێتە شەڕێکی بەردەوام لەنێوان تاکەکاندا، لێرە کۆمەڵێك هۆکار هەن، کە بەردەوامی دەدەنە ئەو ململانێیانە و توندو تیژییەکانیش زیاتر دەکەن: ـ

**أ ـ یەکسانی لە تواناکاندا: ـ**

سروشت وای کردووە مرۆڤ لە رووی توانا جەستەیی و زەینییەکاندا یەکسان بن، بە رادەیێك کە تۆ تێبینی ئەوە دەکەیت پیاوێك لە رووی توانا جەستەییەکانەوە لە یەکێکی تر بە هێزترە، یان دەبینی یەکێکی تر ئاستی زیرەکی لەوانی تر بەرزترە، بەڵام ئەگەر بێت و هەردوو تواناکە واتە زەینی و جەستەییەکە بە یەکەوە وەر بگرین: ئەو کاتە ئەو جیاوازیە گەورەیە بە دی ناکەین کە یەکەمجار دەردەکەوێ، تا ئەو رادەیەی کە شتێکی ئاستەنگ بێ، یەکێك ببینی بە تەنیا شانازی بە شتێکەوە بکات، یەکێکی تر شانازی بە شتێکی ترەوە نەکات کە لە ئاستی

---

بێت کە لە حاڵەتە خۆڕسکەکەوە (فطرة) بۆ حاڵەتی رێکخستنێکی سیاسی رێك و پێك ئەنجامدرابێ..). (د.عەبدولسەلام ئەلتەرمانینی) (الوسیط في تاريخ القانون و النظم القانونية) لـ ٤٤٩ ـ بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٧٩. ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە لەبەرئەوەی خاوەنی ئەو (گرێبەستە کۆمەڵایەتیە) فەیلەسووفەکانن نەك مێژوونووسەکان، بۆیە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو گرێبەستانە تەنها دارشتنێکی مەنتقین نەك مێژوویی کە فەیلەسوفەکان لەرووی سیاسیەوە شێوەی بنیادی دەوڵەتی پێ شی دەکەنەوە. (بۆیە دەبینین فەیلەسووفێکی وەك هیگڵ رەخنەکانی خۆی ئاراستەی ئەو (گرێبەستە کۆمەڵایەتیانە) دەکات کە دەوڵەتی پێ بەڕێوە دەچێ، بۆ یەك چرکەیێکیش چییە بە و قۆناغە مێژووییەی دانانێ کە مرۆڤ لە حاڵەتی خۆڕسگەوە بۆ حاڵەتی رێکخستنی سیاسی پێیدا تێپەڕیبێ، چونکە زۆر چاك لەوە ئاگادار بوو کە ئەمە دارشتنێکی مەنتقیە، یان بەهانەیێکی ئەقلانییە بۆ دروستکردنی دەوڵەت هەر لەمەوە رەخنەکانی خۆی لەوەدا چڕ دەکردەوە کە ئەو گرێبەستە لەسەر ویست وئارەزووی تاکەکان دانەنراوە، چونکە ویستەکان هەر بە سروشت خۆڕسك و زۆرداری بوونە)، هەروەها (دەوڵەت لەسەر گرێبەست بنیاد نانرێ، چونکە گرێبەست لە پێش هەموو شتێکدا چەند کارێکی رەمەکیانە دەسەپێنێ و شتێکی هەڵەیە ئەگەر بڵێین دامەزراندنی دەوڵەت شتێکە پشت بە مافی هەڵبژاردنی هەموو ئەندامەکانی دەبەستێ..). هیگڵ دەگاتە ئەو رایەی، کە دەبێ دەوڵەت لەسەر بنچینەی ئەقڵ دابمەزرێ نەك ویست وئارەزوو، لەبەرئەوەی هەر بە سروشت ئەقڵ گشتگیرترە، نەك ببێتە بەشێك لە ویست و ئارەزوو. (اصول فلسفة الحق لهيطل) وەرگێڕانی د.ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام لـ ٢٣٣ـ هەروەها لـ٣٥٣ ـ٣٥٤ یش لە گەڵیدا بەراورد بکە کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦.

شانازیەکەی ئەودا بێت. ئەگەر بڕوانینە هێزی جەستەیی دەبینین یەکێك لە رووی جەستەییەوە لە هەمووان لاوازترە، بەڵام لە توانایدا هەیە لە هەمووان بە هێزتر بکوژێ: ئەمەش بە بەکار هێنانی فرت و فێڵ، یان بە هاوپەیمانیکردن لەگەڵ خەڵکانی تردا و بە هەمان ئەو مەترسیەی کە هەڕەشەی لێدەکرێ هەڕەشە بکاتەوە..[376]. بەمجۆرە دەتوانین یەکسانی لەنێوان ئادەمیزاددا پێوانە بکەین. بەمشێوەیە یەکسانی لە نێوان خەڵکیدا ئەژمار دەکرێ ئینجا بە توانا جەستەییەکانی بێ، یان بە توانا زەینییەکانی بێ، کە گەورەترین سەرچاوەی ململانێیە لەنێوانیاندا، یان بە شێوەییێکی وردتر تاکە سەرچاوەی ناکۆکییە بەردەوامەکانی نێوان خەڵکییە.

### ب ـ یەکسانی لە هیواو ئاواتەکاندا : ـ

ئەمەیان کە سەرچاوەی دووەمیانە ئەنجامێکی مەنتیقیە لە سەرچاوەی یەکەمەوە دروست بووە بە شێوەییێکی گشتی ئەگەر خەڵکی لە توانا جەستەیی و زەینییەکانیاندا لە هەردوو رووەوە لەگەڵ یەکتردا یەکسان بن، کە کەس لەویتر بە هێزتر نییە تا بتوانێ ئەوانی تر بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، لەهەمان ئەو یەکسانیانەدا یەکسانییێکی تر دێتە کایەوە کە ئەویش یەکسانییە لە هیواو ئاواتەکاندا بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی کە ئارەزوویان لێیەتی بیهێننە دی، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە هەر یەکەو چەند بەهانەییێکی یەکسانی لەگەڵ ئەوانی تردا دەبێ، کە هیوای بەو شتە هەبێ کەحەزو ئارەزووی لێیەتی بۆ ئەوەی بەدی بهێنێ ـ بەمشێوەیە ململانێکان توندترو بە هێزتر دەبن.

### ج- شتە دژ بە یەکەکان: ـ

هەر تاکێك لە رووی تواناو هیواکانەوە لەگەڵ ئەوانیتردا یەکسانە، کە بۆ شتێکی دەرەکی دیاریکراو هەوڵدەدات، ململانێکانیش بۆ ئەو شتە دیاریکراوە بە هێزتر و توندتر دەبن، لێرەدا هۆبز گوتەکەی جان پۆل سارترمان بیر دەخاتەوە، کە (کەم)ی شتەکان دەبنە هۆی دروستبوونی ململانێیەکی توندو تیژ لەنێوان تاکەکانی ئادەمیزاددا، هەروەها چەندی مەبەستەکان زۆرتر بن ئەو شتانەی کە خەڵکی لە جیهانی دەرەوەدا ئارەزووی دەکات کەمتر بن ململانێیەکە لەنێوانیاندا توندتر دەبێ. هۆبز دەڵێ: (دەردی هەرە گەورەی ئارەزووەکانی خەڵکی کە یەکتری پێ ئازار دەدەن بە هۆی ئەوەوە دروست دەبێ کە لەیەککاتدا حەزی زۆربەی هەرە زۆریان دەچێتە

---

376 - Thomas Hobbes Leviathan P.141 .

سەر یەك جۆرە شت، ناتوانن هەمووشیان پێکەوە سوودی لێ وەربگرن، لەمەدا مەبەستم سوودێکی هاوبەشە، هەروەها ناشتوانن لەنێوان خۆیاندا دابەشی بکەن. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە ئاراوە ئەویش ئەوەیە: کێ لە هەموویان بە هێزترە؟ ئەمەش ئەو کێشەیەیە کە تەنها شمشێر دەتوانێ یەکلایی بکاتەوە[377].

هۆبز دێت و سەرچاوەییێکی تری ململانێمان بۆ ئاشکرا دەکات ئەویش (کێبەرکێ) و (باوەڕ بە یەکتر نەبوونە) لەنێوان خەڵکیدا...هتد، کە ئێستا پێویست بەوە ناکات ئێمە لێرەدا بیخەینە روو، چونکە ئێمە تەنها دەمانەوێ ئاماژە بە ململانێیە توندو تیژەکان، یان (شەڕی هەمووان لە دژی هەمووان) (لە حاڵەتی سروشتیدا، یان لە حاڵەتی ئاژاوە سروشتییەکان کە مرۆڤ تێیدا دەژی و لە ژیانی خۆی دڵنیا نییە و تەنها باوەڕی بەو هێزە هەیە کە خۆی هەییێتی، بەڵام ئەم حاڵەتە سروشتیانە دەمانگەیێنێتە شتە دژ بە یەکەکان: ئێمە گوتمان ئامانجی بنچینەیی مرۆڤ پارێزگاریکردنە لە خودی خۆی. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەرکاتێکدا بێ هەڕەشەی لەناوچوونی لێدەکرێ، ئەگەر بێت و من ئەو مافەم هەبێ کە هەموو ئەو هۆکارانەی کە لەبەر دەستمدان بە کاری بهێنم بۆ پارێزگاریکردن لە خۆم، کەواتە ئەوانی تریش هەمان ئەو مافەیان هەیە بۆ پارێزگاریکردن لە خۆیان، لێرەدا ئێمە لەهەر چرکەییێکدا لە تاکەکانی دەوروبەرمانەوە هەڕەشەی لەناو چوونمان لێدەکرێ. ئەم هەستکردنەش بەو مەترسی و نائارامیە بەردەوامە وای لە خەڵکی کرد کە بە شێوە تایبەتییەکانی خۆیان دەسبەرداری هەندێك لەو مافانە بن کە پارێزگاریان پێی لە خۆیان دەکرد بۆ دەسەڵاتێك کە بتوانێ پارێزگاری لە مانەوەیاندا بکات و (ئەو پارێزگاری لە خۆکردنەیان) بۆ دەستەبەر بکات. هۆبز ناوی لەو ئاڵ وگۆڕکردنەی دەستبەرداربوون لە مافەکان ناوە (گرێبەستی کۆمەڵایەتی). هەروەها دوو مەرجیشی بۆی داناوە: یەکەمیان: دەبێ هەر هەموویان دەسبەرداری مافەکانی خۆیان بن، نەك لەلایەن یەك تاکە کەسێکەوە بێ. دووەمیشیان: دەبێ ئەو دەسەڵاتە پاراستنی بوون مانەوەی تاکەکان مسۆگەر بکات.

دەبێ لێرەدا ئێمە ئاگاداری ئەوە بین، کە دروستکردنی دەوڵەت لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەست پێدەکات، واتە لە تاکەکانی گەلەوە بۆ فەرمانڕەوا، ئەگەر ئەو پرسیارە بکەین، کە ئایا فەرمانڕەوا لە کوێوە دێ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە، کە لەو رێککەوتنانەی نێوان خەڵکەوە دێ، لەو گرێبەستانەی کە لەسەر شێوەییێکی دیاریکراوی شێوەکانی بوونی کۆمەڵایەتی ئەنجامی دەدەن.

---

377 - English Works Vol. P.8 Thomas Hobbes

مانەوەشی بە جێبەجێکردنی ئەو گرێبەستەوە بەندە، بۆیە دەبینین هۆبز ـ لایەنگری دەسەلاتێکی رەهایە ـ زۆر بە راشکاوانە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە ناکرێ دەسبەرداری ئەو داکۆکی کردنانە بین کە پارێزگاری لە ژیانی مرۆڤ و ئەندامەکای لەشی دەکات، چونکە ئەمە مافێکی بنچینەییە، ئەگەر مرۆڤ دەسبەرداری ئەو مافە بێ، واتە بوونی خۆی لە دەست دەدات. ئەمەش ئەوە دەگەیێنی کە مرۆڤ مافی هەیە بەرگری لەخودی خۆی بکات تەنانەت لە دژی فەرمانەکانی بەرێز فەرمانرەواش بوەستێتەوە لەهەر بارو دۆخێکیشدابێ.گوێرایەڵ بوون بۆ بەرێز فەرمانرەوا واتە ئەو دەبێ لە توانایدا هەبێ بەردەوام بمپارێزێ، یان دەبێ ئەو هێزەی هەبێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئەم کارە ئەنجام بدات. ئەگەر هات و بێهێز بوو، یان نەیتوانی لە کارە سەرەکییەکەی خۆیدا بەردەوام بێ ـ کە دەستەبەرکردنی ژیان و ئاسایشە بۆ دارو دەستەکەی خۆی ـ خەڵکی بۆیان هەیە لە گوێڕایەڵیکردنی ئەو فەرمانرەوایە دەرچن، چونکە ئەگەر کەس نەبوو بیانپارێزێ خەڵکی ئەو مافە سروشتییەیان هەیە کە پارێزگاری لە بوون و مانەوەی خۆیان بکەن، ئەمەش ئەو مافەیە کە ناکرێ بە هەر پەیمانێك بێ دەستبەرداری بن.

لەوانەیە لێرەدا بەردەوام دەبینی باس لە (مافەکانی خەڵکی) دەکرێ، ئەم کارەش پێشتر بوونی نەبوو ـ(بەڵکو هۆبز ناوی ناوە (مافە سروشتییەکان)، وەك: مافی ژیان، خاوەندارێتی، بەرگریکردنی تاك لە خودی خۆی بە هەر شێوەییێك بێت...هتد) لە هەمان ئەو (مافانە)وە (گرێبەستی کۆمەلایەتی) دێتە ئاراوە کە دەوڵەت لەسەر ئەو بنچینەیە دادەمەزرێ، ئەمەش پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیە کە پێشتر بینیمان، کە دەڵێ (هەر هەموو مافەکان) بۆ کەسایەتی پیرۆزی فەرمانرەوا دەگەرێتەوە و خەڵکیش دەبێ گوێڕایەڵی بن!.

## سێیەم: ئەخلاق..و سیاسەت: .

هۆبز لە دروستکردنی دەوڵەتدا ئامانجی پارێزگاریکردن بوو لە ماف و بەرژەوەندییەکانی خەڵکی نەك بڵاوکردنەوەی بێخەوشیە جۆراوجۆرەکان و ناچاربکرێن، کە رەفتارەکانی خۆیان چاك بکەن، تا ئەو رادەیەی کە ئەگەر پێویست بکات فەرمانرەوا بە زۆری زۆرداری بەرەو بێخەوشیان بەرێت، لەبەرئەوەی کە هێشتا منداڵن و پێنەگەیشتوون و نازانن بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان لە چیدایە، یان لەوانەیە ئەگەر رەفتارەکانیان خراپ بێ زیانی بۆیان دەبێ و لە بەهەشت بێبەش دەبن، کە فەرمانرەوا خۆی دەیەوێ ئامادەیان بکات بۆ ئەو بەهەشتە!.

هەرچی ئەخلاقە هۆبز لەسەر رای زۆرێك لە لێکۆڵەرەوەکانیش لەسەر بناغەی غەریزەی حەزکردن بە مانەوە هەڵێدەسەنگێنێ، لە دیدی ئەودا ئەمە ئەو غەریزە بنچینەییەیە، کە تەحەکوم بە بوون و مانەوەی مرۆڤایەتی دەکات، وەك هۆفدینگ[٣٧٨]، دەڵێ: لێرەدا چەمکەکانی ژان و چێژ وەرگرتن بە سروشتی ژیان و مانەوەوە بەستراوەتەوە، چونکە هەرشتێك ئەو غەریزانەی لە ناخماندا هەیە تێر بکات جۆرێك لە چێژو خۆشیمان پێ دەبەخشێ، بەڵام وەك باسمان کرد ئەگەر بە پێچەوانەوە بێت جۆرێك لە ئێش و ژانمان تیادا دەوروژێنێ. چێژ وەرگرتنیش بە رۆڵی خۆی ئارەزوومان لا دروست دەکات، لە کاتێکدا ئێش و ژان دوورکەوتنەوە، یان هەڵاتنمان لا دروست دەکات، لێرەدا (هەر شتێك کە بۆ حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤ داندرابێ پێی دەڵێن (چاکە)، هەرشتێکیش بۆ دوورکەوتنەوە و رق لێبوونەوە داندرابێ پێی دەڵێن: (خراپە)، یان شەڕانگێزی..)[٣٧٩]. (چاکە) وەك ئەم وشانەیە (رووخۆشی) و (نازداری) و (بەتام) و (سەرنجڕاکێش) و (خۆشی)... هتد کە هەست و سۆز و ئارەزوو وکاردانەوەکان دەوروژێنن، کە تایبەتە بە کەسەکەوە، ئایا تا چەند ئەو کەسە بە کاریان دەهێنێ و تا چەند گرنگیان پێدەدات و تا چەند سوودیان لێ وەردەگرێ؟!.

ئەگەر بێت و ئەو تیۆرەی هۆبز، کە لە بارەی شیکردنەوەی ئەخلاقە و لەسەر بنچینەی قازانج هەڵێدەسەنگێنێ راست بێ، یان ئەو (نامەیەی تایلۆر) راست بێ، کە ئەخلاق لەلای هۆبز لەسەر بنچینەی (ئەرك) هەڵدەسەنگێنێ، یان ئەوەیان راست بێ کە ئێمە لەبارەی ئەخلاق گوتوومانە و دەڵێ: لەسەر بنچینەی پێوەندییە توندو تۆڵەکانی نێوان (ئەقڵ..و پەیوەستبوونەکانی خوو و ئەخلاق)[٣٨٠] بنیاد دەنرێ ـ ئەمانە هەر هەمووی هیچ لە شتەکان ناگۆڕن، چونکە ئەخلاق لەلای هۆبز پێش هەموو شتێك شتێکی مرۆڤایەتییە. دووەمیان تایبەتە بە تاکەوە، سێیەمیشیان دوورە لە سیاسەت، بەو مانایەی، کە دەوڵەت چیتر بلاوکردنەوەی بێخەوشی و راستکردنەوەی رەفتارە خراپەکان لەناو خەڵکیدا ناکاتە ئامانجی خۆی، بەڵکو دەوڵەت بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکان و رەخساندنی ئەو بوارانە دەبێ، کە تاکەکان بتوانن مافە رەواو سروشتییەکانی خۆیان پیادە بکەن، چونکە بواری ئەخلاق تایبەتە بە رەفتارەکانی تاك و مەیدانی سیاسەتیش

---

378 - Hoffding History Of Modern Philosphy Vol.1.P 277 .

379 - Thomas Hobbes Leviathan. P.90 .

٣٨٠ - لە بارەی ئەمانە هەمووی بەو کتێبەماندا بچنەوە (توماس هوبز : فیلسوف العقلانیة).

تایبەتە بە رێکخستنی رەفتارەکانی کۆمەڵ و دروستکردنی ئەو دامەزراوانەی، کە بەرژەوەندییەکانی تاك دەپارێزن، هەروەها پارێزگاری لە مافەکانی هاوڵاتیان دەکات، لە پێش ئێستادا بینیمان کە تێکەڵکردنی هەردووکیان لە فەلسەفە کۆنەکاندا شتێکی باو بوو، یان گشتی بوو، بەڵکو یەکێك بوو لە مۆرکەکانی شارستانییەتە کۆنەکان، هەروەها لە پێش ئەوانیشدا لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا.

## چوارەم: ئاین...و دەوڵەت: .

ئەگەر ماکیاڤیللی لە نووسینەکانیدا هەوڵی ئەوەی دابێ، کە ئەخلاق بە شێوەییێکی بنەڕەتی لە سیاسەت جیا بکاتەوە، تەنانەت ئەو جیاکردنەوەیە گەیشتە ئەو رادەیەی، کە لە هەموو پێودانگێك دەربچێ، ئەو کاتەی، کە رێگەی بەوەدا مرۆڤ هەرچی رێگەییێکی بێ ئەخلاقیانە هەیە بیگرێتە بەر بۆ پاراستنی دەوڵەت و پشتگیریکردنی دەسەڵاتەکەی، بەڵام دوای ئەو تۆماس هۆبز ئەو رێگەیەی بڕی و تەواوی کرد و هات ئەخلاقی لە شوێنە ئاساییەکەی خۆی دانا واتە وەك (رەفتارەکانی تاك)، دوای ئەوە هەنگاوێکی دوورتری هاوێشت کە ئەویش ئەوە بوو ئاینی لە سیاسەت جیاکردەوە.

لە ساڵی ١٦٥١ دا تۆماس هۆبز کتێبێکی بە چاپ گەیاند، کە ئەو کتێبە ناونیشانێکی سەیر و ناوەڕۆکێکی نوێی هەبوو. ناونیشانی ئەو کتێبە (لیڤیاسان ـLeviathan) بوو. کە وشەییێکی عیبریە، ناوی دڕندەییێکی دەریایی زەبەلاحە، کە دەتوانێ هەموو دڕندەکانی تر تێکبشکێنێ و دەتوانێ زۆر بە شێوەییێکی تۆکمە دەست بەسەر هەموو ئەو ئاژەڵانەدا بگرێ کە لە سنوورەکەی ئەودا دەژین و ترس و دڵەڕاوکێ بخاتە دڵیانەوە، بەڵام ناوەرۆکی کتێبەکە بریتی بوو لە بنیادی دەوڵەتێکی بە هێز، کە بتوانێ هەرچی ئاژاوەگێڕی و شەڕ و شۆڕێکی ناوەخۆیی هەیە لەناوی بەرێت و سەقامگیری بۆ وڵات بگێڕێتەوە و پارێزگاری لە هاوڵاتیانی خۆی بکات (لەبەر ئەم فاکتەرەش مرۆڤە ژیرەکان وای بە چاك دەزانن کە دەبێ دەوڵەتێکیان هەبێ بەڕێوەیان بەرێت، ئەو دەوڵەتە لە شێوەی ئەو (ئەژدیهایە دەریاییە بێت) بۆ ئەوەی بتوانێ پارێزگاریان لێ بکات. دەوڵەتێك بێ پتەو و بەهێز، کە هەر هەوڵدانێك بۆ لە باربردنی جۆرێك بێ لە شێتی...)[٣٨١].

---

٣٨١ - ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (توماس هوبز: فیلسوف العقلانیة) لــ ٢٩٠ ــ.

ئەو (ئەژدیها زەبەلاحە) ئەو دەوڵەتەیە، کە لە تاکەکانی هاوڵاتیان پێکدێ، ئەگەر بێت و ئێمە سەرنجێك بدەینە وێنەی ئەو ـــ ئەژدیها زەبەلاحەکە، دەبینین نیوەی لای سەرەوەی ئەو ئەژدیهایە سەرپەرشتی زەوی و زارەکان و کێڵگە و پیشەسازی و کشت وکاڵ و شار و دێهاتەکان و کڵێساو و مزگەوت و قەڵا و شوورەکان و دارستان وکۆشك تەلارەکان و هەموو شتەکانی ناو کۆمەڵگە...هتد دەکات، بەڵام لە نیوەکەی خوارەوەی وێنەکە کۆمەڵێك وێنەی بچووك بچووك بەدی دەکەین کە لە دوو ریزی هاوتەریبدا رێکخراون: ریزی یەکەمیان چەند هێماییێکن بۆ کۆمەڵە وێنەییێکی دەزگا مەدەنییەکان وەك (قەڵاییێکی شوورەبەند، تاجێکی شاهانە، لەگەڵ کۆمەڵێك قەڵغان و چەك و تفاق...هتد). لە کاتێکدا ریزی دووەمیان چەند ئاماژەییێکن بۆ کۆمەڵێك هێمای ئاینی کە بەرامبەر ریزی یەکەم ریز کراون وەك (کڵێساییێك وکڵاوەکەی پاپا و هەروەها وێنەی بروسکێك کە لە ئاسمانەوە دابەزیوەتە خوارەوە...هتد). ئەمەش مانای ئەوەیە دەوڵەت دەسەڵاتێکی دوولایەنەی هەیە، کە دەتوانێ بە شێوەییێکی جوان و سەرکەوتوانە کارەکانی پێ بەڕێوە ببات و خەڵکیش لە سایەیدا لە ئاشتی و ئارامیدا بژین[٣٨٢].

ئێمە دەبێ هەر لە بەرگی کتێبەکەوە بگەینە ئەو ئەنجامەی کە هۆبز (پێوەندییەکانی نێوان ئاین و دەوڵەتی یەکلایی کردۆتەوە)، لەبەرئەوەی مرۆڤ لە توانایدا نییە بتوانێ خزمەتی دوو ئاغا بکات، ناشکرێ دەسەڵاتی رۆحی لە دەسەڵاتی دونیایی جیا بکرێتەوە و سەربەخۆ بێت، هەروەها حکومەتی هاوبەشیش، یان تێکەڵکردنی هەردووکیان، بە مانا وردەکەی ئەو وشەیە ئەمە حکومەت نییە، بەڵکو تەنها بەوە دەبێ کە یەکێکیان مل بۆ ئەویتریان کەچ بکات، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە دەبێ دەسەڵاتە رۆحیەکە بچێتە ژێر باری دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، چونکە ئەو هەڵانەی کە زۆربەی نەتەوەکان بە هۆی دەسەڵاتە رۆحییەکانەوە تێیکەوتوون لە ئەژمار نایێت، بۆیە دەبێ ئێمە زۆر بە وردی ئەو پلەوپایە ئاییینیانە دەسنیشان بکەین کە لەناو دەوڵەتدا هەن و سنوورەکانی ئەو دەسەڵاتە رۆحیە روون بکەینەوە. ژیانی رۆحی وەك فەیلەسووفەکەمان وێنای دەکات تایبەتە بە ژیانی ناوەوەی مرۆڤەکان، بەڵام دەربڕینەکانی دەرەوەی رەفتارەکانی ئیماندار دەبێتە بەشێك لە سیستەمی دەوڵەت، هەروەها دەکەوێتە بن رکێفی چاودێری و دەسەڵاتەکانی ئەوەوە. دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوا هیچ ناکۆکییێك لە نێوان شمشێری دەوڵەت و قەڵغانی باوەڕدا

٣٨٢ - تەماشای ئەو وێنەیە بکە کە لەسەر کتێبەکەی مندا کراوە بە ناونیشانی (تۆماس هۆبز: فیلسوف العقلانییە) لـــ ١٨٩ ـــ.

نابینیّ، لەبەرئەوەی ئەو داوا لە هەر هەموو هاولاّتیان دەکات بە خودی پیاوە ئایینییەکانیشەوە کە گوێڕایەڵی یاسا مەدەنییەکان بن، کە هەر هەموو یاسا سروشتییەکانی تێدایە کە لەهەمانکاتیشدا یاسا خواییەکانیشە، چونکە گوێڕایەڵبوون بۆ دەسەلاّتەکانی فەرمانڕەوا هیچ سودێکی نابیّ بۆ باوەڕی مرۆڤ، لەبەرئەوەی باوەڕ خۆی پرسێکی ناوەوەی مرۆڤە و بە چاو نابیندریّ، بۆیە گوێڕایەڵبوون بۆ یاسا مەدەنییەکان هیچ کارێکی تیّ ناکات.

لە کۆتایی کتێبەکەیدا کە بە ناونیشانی (ئەژدیها)یە و لە بەشێکی بە ناوبانگی ئەو کتێبەدا بە ناونیشانی(مەملەکەتی تاریکی) تۆماس هۆبز هێرشێکی توند دەکاتە سەر ئاینزای (کاسۆلیکی) و شتە خورافییەکان و هەردووکیان بە دوو دوژمنی سەرەکی ئایین وەسف دەکات، وای بۆ دەچیّ کە ئەو تاریکییە رۆحیانە لە، بە هەڵە توێژینەوەی کتێبی پیرۆزدا سەرچاوە دەگریّ و باوەڕ هێنانیشە بە شەیتان و پاشماوەکانی بت پەرستی، هەروەها قەناعەت هاتنیانە بە شتە پڕوپووچەکانی فەیلەسووفە کۆنەکان ـ بە تایبەتی ئەرستۆ ـ هەروەها بلاّوبوونەوەی بیرۆکەکانی کلێسای کاسۆلیکی، کە دژی هەموو ئاشتییێکە لە ناو کۆمەڵگەی ئادەمیزاددا. هۆبز نموونەییێکی زۆر مان بۆ دەهێنێتەوە وەك ئایینی مەسیحی لە وێنە کاسۆلیکیەکەیدا، کە چەندین پاشماوەی کۆنی بت پەرستی لە خۆیدا گرتووە، هەروەها پاپایەتیش لە تارمایی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پێشوو زیاتر شتێکی ئەوتۆ نییە و تاجەکەی لەسەر ناوەو لەسەر گۆڕەکەی دانیشتووە هەروەها (حیبری مەزنیش)[٣٨٣](الحبر الاعظم) لە ئایینی رۆمانی کۆندا ئێستا گۆڕاوە و بۆتە (پاپای رۆما)، هەروەها ئاوی پاکیش لەو ئاینەدا گۆڕاوە و بۆتە ئاوی پیرۆز لە ئاینی مەسیحیدا، هەروەها جەژنی (ساتۆرن) (زوحەل)ی خوای رۆمانی گۆڕاوەو بۆتە جەژنی کەرنەڤال ـ Carnival[٣٨٤]. هەروەها جەژنی (باخوس)ی خوایان کردۆتە جەژنی شەفاعەت خوازەکان لە

---

٣٨٣ - لە ئایینی رۆمانیدا (حیبری مەزن) Pontifex Maximus پلەو پایەییێکی بالاّی هەبوو و لە کارەکانیشیدا چوار کاهین یارمەتیان دەدا... هتد، بەوکتێبەماندا بچۆوە (المعتقدات الدينية لدى الشعوب) چاپی دووەم کتێبخانەی مەدبولی ساڵی ١٩٩٦ لـ ١١٩ ــ.

٣٨٤ - ئاهەنگێك بوو لە کۆتایی رۆژانی پێش جەژنی (رۆژوی گەورە) دا (مەسیحییەکان لەو ماوەیەدا چل رۆژ گۆشتیان نەدەخوارد) لە سەرتاپای رۆمانی کاسۆلیکیدا بە رێوە دەچوو. ئەم جەژنەش سەرچاوە مێژووییەکەی دیار نییە، لەوانەیە بۆ ئاهەنگە سەرەتاییەکانی سەرەتای ساڵی نویّ بگەڕێتەوە. وەك هۆبز

کلێسا. هەروەها ئەمەش زۆر بەروونی دەردەکەوێ کە پێوەندییێکی پتەو لە نێوان ڤینۆس و (کیۆبید)ی کوڕی و لەنێوان مریەمی پاکیزەو منداڵەکەیدا هەیە. هەروەها لە کلێساکانیشدا زمانی لاتینی بە کار دەهێنرا بۆ ئەوەی ببێتە تارماییێکی زمانی رۆمانی کۆن. لەولاشەوە پیریێژنەکان دەستیان بە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی دێو و درنج و جرِوجانەوەر کردبوو. ئینجا پاپاش وەك هاوشانی (شای جنۆکەکان) ی لێکرابوو، کاهینەکانیش خۆیان پیاوانی رۆحی بوون، باوکەکانیش وەك جنۆکە وابوون. دێو ودرنجەکانیش ئەو جنۆکەو فریشتانە بوون، کە لە شوێنە تاریك و ترسناك گۆڕستانەکاندا دەژیان کاهینەکانیش لە کلێسا و دێرو گۆڕستانەکاندا بە چەند رێنماییێکی نادیار و شاراوە کارەکانیان بەڕێوە دەبرد. ئەو کاهین و جنۆکانە ئەقڵی گەنجەکانیان بردبوو و وایان کردبوو کە واز لە ژنهێنان بێنن و لە قەلاییێکی جادوییدا نیشتەجێ بن، شتە خورافییەکانیش باڵی بە سەریاندا کێشابوو، خەڵکەکەش هەرهەموویان نەزان بوون و ترس باڵی بە سەریاندا کێشابوو (پاپا) ییەکانیش زۆر بێ بەزەییانە ترسی ئەو نەزانانەیان بۆ خۆیان قۆستبۆوە، بۆ ئەوەی بتوانن بە بەردەوام کۆمەڵێك قەشەی بێبەزەیی و بێ ئەخلاق و بێ باوەڕیان بۆ دابنێن[٣٨٥].

لەمەدا هۆبز مەبەستی ئەوە نەبووە، کە هێرش بکاتە سەر ئاین، بەڵکو دەیەویست مێشك و دڵ و دەروونی خەڵکی لەو خورافیات و شتە پڕوپووچانە پاك بکاتەوە، کە هێلانەیان تێدا کردووە.

---

دەڵێ : لەوانەیە لە ئیتاڵیادا بەو ئاهەنگانەوە بەسترابێتەوە کە بۆ (ساتۆرن)ی (خوای کشت وکاڵ) بەڕێوە چووبێ لە رۆمای کۆندا.

385 - Thomas Hobbes ;English Works -Vol.3.P.698.ز

## کۆتایی: .

(١) ئێمە لەگەڵ هۆبزدا تێبینی گەشەکردنێکی زۆر گرنگ لە فەلسەفەی سیاسیدا دەکەین ، چونکە ئەو هەوڵی نەداوە کە (یۆتۆپیا)ییێك، یان یۆتۆپیاییێك دروست بکات، کە هاوڵاتییەکانی بێخەوش بن، وەك ئەو بیرمەندە سیاسیانەی، کە لە پێش ئەودا دەیانکرد، هەروەها لێکۆڵینەوەییێکی کۆمەڵگاش نییە لە گۆشەییێکی ئاینییەوە کە مەبەستی دروستکردنی (دەوڵەتی باوەڕداران بێ)، بەڵکو لێکۆڵینەوەکانی ئەو لەبارەی توێژینەوەی ئەو واقیعەیە کە کۆمەڵانی خەڵکی لەو سەردەمەدا بە هەموو کێشەکانییەوە تێیدا دەژیان، چونکە لەسەردەمی ئەو فەیلەسووفەماندا شەڕێکی ناوەخۆیی کوشندە لە ئارادابوو، کە حەوت دانە ساڵ درێژەی کێشا، هەروەها لەو سەردەمەدا وڵات بە جۆرەها ئاژاوەو ناکۆکیەوە دەیناڵاند. ئەمەش وای لەو فەیلەسووفە کرد کە بە دوای رێگەچارەییێکدا بگەڕێ بۆ ئەوەی رێگە لە دووبارە بوونەوەی ئەو شەڕ و فیتنەو رووداوە ناخۆشانە بگرێ. ئەو رێگەچارەیەشی لە پێکەوەنانی دەسەڵاتێکی سیاسی بە هێزدا بەدی دەکرد، بە شێوەییێك، کە بەو یاسایانەی کە دایان دەڕێژێ خۆی بە سەر خەڵکیدا بسەپێنێ و هەر هەموو هاوڵاتیان ناچار بکات رێز لە مافەکانی خەڵکانی تر بگرن، بە ئاشتی لەگەڵ یەکتردا بژین، بۆیە لەو بارەیەوە (سباین) بە هەڵەدا نەچووە، کە دەڵێ: (فەلسەفە سیاسیەکەی هۆبز جوانترین شاکارە، کە لە ماوەی شەڕی ناوەخۆی ئینگلیزدا بەرهەم هاتووە و لەگەڵ هیچ شتێکی دیکەدا بەراورد ناکرێ)[٣٨٦].

**(٢)** لە فەلسەفەکەی هۆبزدا پشتگیرییێك بەدی دەکەین بۆ لە یەکتر جیاکردنەوەی ئەخلاق و سیاسەت، کە ماکیاڤیللی بێ ئەوەی لە بەهای هیچ کامێکیان کەم بکاتەوە هەنگاوی یەکەمی بۆی نابوو، بەڵکو تەنانەت بوارە تایبەتییەکانی هەر یەکێك لەوانەشی دەسنیشان کردبوو، بۆ ئەوەی هیچ تێکەڵییێك لەنێوانیاندا روونەدا لەبەرئەوەی

---

٣٨٦ - جۆرج سباین (تطور الفکر السیاسی) وەرگێڕانی د. راشد ئەلبەڕاوی کتێبی سێیەم لـ ٦٤٢ ـــ دار ئەلمەعاریف لە قاهیرە.

ئەخلاق تایبەتە بە رەفتارەکانی تاکەوە و لە کۆتاییشدا بۆ ویژدانی تاکەکە خۆی دەگەڕێتەوە، ئەمەش شتێکە تایبەتە بە کەسەکە خۆی، لەبەرئەوەی هیچ کەسێك ناتوانێ تاکێك ناچار بکات کە راستگۆ، یان دڵسۆز، یان دەسپاك، یان وەفادار... و هتد بێت، تەنها ئەو پەروەردەیە نەبێ کە لە منداڵیەوە ویژدانی ئەو تاکەی پێ پەروەردەکراوە، بەڵام یاسا تەنها گرنگی بە هەڵس وکەوت و رەفتارە دەرەکییەکانی تاك دەدات. لەلاییێکی ترەوە بواری سیاسەت، یان یاسا بۆ (سوود)، یان (بەرژەوەندی)، یان (پارێزگاری)کردنە لە ژیان و موڵك و ماڵی هاوڵاتیان و بوار رەخساندنە بۆیان، بۆ ئەوەی بتوانن گەشە بکەن و پێبگەن، هەروەها کارئاسانیکردن ولابردنی کۆسپ و تەگەرەکانە لە بەردەمیان، بۆ ئەوەی چەندی پێیان بکرێ گەشە بە تواناو موڵك وماڵەکانی خۆیان بدەن. ئێمە پێش ئێستا لە کۆمەڵگە کۆنەکاندا بینیمان کە چۆن ئەو دوو بوارە تێکەڵ بە یەکتر دەکران، لە بەر ئەوەی ئەو کاتە (داب و نەریت)ەکان، ئەخلاق و ئایین و یاسای لە خۆدا کۆ کردبۆوە: (ئەو داب و نەریتەش بە هەر هەموو جۆرەکانییەوە بە رەنگێکی ئایینی رەنگ کرابوو، چونکە ئەو داب و نەریتەی کە بڕیاری لەسەر بنەما ئەخلاقییەکان دەدا، جۆرێك بوون لەو داب و نەریتانەی کە خوداوەند چاودێری دەکرد. هەر لەبەرئەمەش بوو یاسا تێکەڵ بە ئەخلاق و ئاین کرابوو، هەتا باوەڕە ئاینی و پرەنسیپە ئەخلاقییەکان لە بەر یەکتر هەڵنەوەشانەوە و دەسەڵاتی دونیایی بە سەر دەسەڵاتی ئاینیدا سەرنەکەوت لێیان جیا نەبۆوە..)[٣٨٧]

**(٣)** یەکەم جارە لەلای هۆبز دەبینین داکۆکی لە (مافە سروشتییەکان) دەکرێت، وەك مافی ژیان و موڵکدارێتی و بەرگری لە خۆکردن... هتد، چونکە دەبێ کارە چاکەکانی دەسەڵات، وەك ئارامی و سەقامگیری و ئاسایشی تاکەکان و موڵك و ماڵەکانیان بە شێوەیێکی بەرچاو بۆ تاکەکان بخرێتە روو، چونکە ئەمە تاکە بنچینەیێکە بۆ ئەوەی بتوانی شەرعیەت بدەیتە بوون مانەوەی ئەو دەسەڵاتە، چونکە (خێرو چاکەی گشتی) شتێکە تەنها وەهمێکە کە لە خەیاڵدا هەیە، بەڵکو لێرەدا تاك هەیە حەز بەوە دەکات کە ژیان بە خۆشی بەرێتە سەر و تام و چێژ لە فاکتەرەکانی پاراستنی ژیان وەربگرێ. ئەم بە تاك کردنە، یان باسکردنی مافەکانی

---

٣٨٧ - د. عەبدولسەلام ئەلترمانینی (الوسیط في تاریخ القانون والنظم القانونیة) لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێت چاپی دووەمساڵی ١٩٧٩ لــ٤٤ـ٤٥ ــ.

تاك، ڕێك ئەو ڕەگەزە نوێیەی نووسینەکانی هۆبز بوو، کە لەلایەن سەردەمی دوای خۆیدا زۆر بە ڕوونی بە ڕێژەوە توانیان پەی پێ ببەن[388].

ئەمەیان بە پێچەوانەی ئەو فەلسەفە سیاسیانەی کە پێشتر دەمانبینی کە (مافەکانی فەرمانڕەوایان) دووپات دەکردەوە گوایە لە ئاسمانەوە دابەزیونەتە خوارەوە و دەبێ خەڵکی بە پیرۆز تەماشایان بکەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان بن و لێی دەر نەچن، بێ ئەوەی هیچ (مافێك) بەو خەڵکە بدەن، بەڵکو ئەرکێکی زۆریان خستبووە سەر شانیان کە لەهەر هەموویان گرنگتر گوێڕایەڵبوون بوو!.

(ئەوەی ڕاستی بێ ڕوانین لە تاك و گرنگیدان بە مافە سروشتییەکانی ئەو تاکە هەنگاوێکی پێشکەوتنخوازانەی گەورەبوو، چونکە یەکەمجار بوو کە دان بە (بەها) و (مرۆڤبوون) و (کەرامەتی) تاکدا بنرێ، هەروەها وەك یەکێکی گەورەو پێگەیشتوو تەماشا بکرێ نەك وەکو منداڵێك، یان مێردمنداڵێك، یان وەك ڕانە مەڕێك تەماشا بکرێن کە شوانێك سەرپەرشتیان بکات و بە هەوەسی خۆی بۆ هەر شوێن و لەوەڕگەییێك کە خۆی ئارەزووی لێبێ لێیان بخوڕێ، ئێستا هاوڵاتی بۆتە خاوەن (ماف)ەکانی خۆی و بۆی هەیە لەگەڵ هاوڵاتیانی تردا گرێبەست مۆر بکات ـ لە ڕێگەی ئەو گرێبەستانەوە فەرمانڕەوا دابنێ و دەوڵەت دروست بکات. ئەو بە تاککردنەی کە هۆبز چوارچیوەییێکی ڕوونی بۆ داناوە لەو سەردەمەدا وای لە فەلسەفەکەی هۆبز کرد لە هەر هەموو تیۆرەکانی تر شۆڕشگێڕانەتر بێ..)[389].

**(٤)** بەمشێوەیە فەلسەفەی سیاسی چیتر بەراوردکرنەکانی نێوان (مەملەکەتی خوا) و (مەملەکەتی مرۆڤ)ی نەدەکردە کێشەی سەرەکی خۆی، وەك ئەوەی کە قەشە ئۆگەستین و کەسانیتر لەو بیرمەندە سیاسیانەی کە کاریگەری ئاینییان بەسەرەوە بوو کردیان، ئەو کەسانەی کە (مەملەکەتی خوا)یان کردبووە نموونەییێکی باڵا، کە دەبووایە مەملەکەتەکەی تر چاوی لێ بکات، بەڵکو ئێستا (یەك مەملەکەت: هەیە کە ئەویش مەملەکەتی مرۆڤە، دەوڵەتیش بووە (دەستکرد) ێکی تەواوی ئادەمیزاد کە مرۆڤ خۆی بە دەستی خۆی دروستی دەکات، هەروەها ئەو دەوڵەتە دەوڵەتێکی (عەلمانییە) لەم جیهانەدا گرنگی بە کاروبارەکانی

---

٣٨٨ - جۆرج سباین (تطور الفكر السياسي) وەرگێڕانی د. ڕاشد ئەلبەڕاوی کتێبی سێیەم لـ ٦٤٢ ـ دار ئەلمەعاریف لە قاهیرە.

٣٨٩ - سەرچاوەی پێشوو لـ ٦٣٣ ـ.

مرۆڤ دەدات. نەك كاری ئەوەبێ خەڵكی رەوانەی بەهەشت بكات، چونكە ئەمە پرسێكی تاكە كەسییە، بەڵكو مەبەستم ئەو هەڵس وكەوتە ئاینییەیە، كە وەك ئەخلاق بۆ ویژدانی ئەو كەسە دەگەڕێتەوە و لە توانای كەسدا نییە كە ناچاری بكات ئەو كەسە ئاینپەروەر بێ، یان نا، مەگەر تەنها لە رووی دەرەوە، بەڵكو لەو حاڵەتەشدا ئاینپەروەرێكی ساختە دەبێ، لەبەرئەوەی تەنها گرنگی بە رووی دەرەوەی ئاین دەدات و لە ناوەڕۆكەكەی دوور دەكەوێتەوە، بگرە رەفتاری ئایینی پێویستی بە پەروەردەییێكی ئایینی هۆشیارانە هەیە و دەوڵەت ناتوانێ بەهێز یاسا بە سەر خەڵكیدا بسەپێنێ!.

**(٥)** هۆبز لێرەدا ئەوە دووپات دەكاتەوە، كە دەبێ ئاین بخرێتە ژێر چاودێری دەوڵەتەوە، نەك بە پێچەوانەوە بێ، بەم شێوەیە دەبینین ئەو دوولایەنییەی كە لە سەردەمەكانی ناوەڕاستدا لە نێوان دەسەڵاتی رۆحی و دەسەڵاتی دونیاییدا هەبوو ئێستا نەما، تەنها یەك دەسەڵات مایەوە ئەویش دەسەڵاتی دونیایە، یان باڵادەستی دەوڵەتە بەهۆی ئەو یاسایانەی، كە هەیبێتی بۆ ئەوەی چاودێری رەفتارەكانی دەرەوەی خەڵكی پێ دەكات. بە هەڵس وكەوتە دەرەكییەكانی ئاین پەروەرەكانیشەوە، بەو پێیەی، كە باوەڕ كێشەییێكی ناوەوەی خودی مرۆڤە، نەكەس دەتوانێ لێی بڕوانێ و نەكەسیش دەتوانێ تێی بگات، تەنها كەسە باوەڕدارەكە خۆی نەبێ.

**(٦)** هۆبز لە گەرمەی هەڵچوونەكانیدا بۆ پاراستنی هاولاتیان، دانی بە دەسەڵاتێكی رەهای فەرمانڕەوادا ناوە كە لەو كارەیدا بە هەڵەدا چووە، چونكە لەو گرێبەستانەی نێوان هاولاتیان خۆیاندا دەبەسترێ فەرمانڕەوای بە لایەنێك دانەناوە، كە تێیدا هاولاتیان دەسبەرداری هەندێك لە مافەكانیان دەبن بۆ ئەو فەرمانڕەوایە. ئەم هەڵەیەش (جۆن لۆك) دێت و راستی دەكاتەوە و ئەو گرێبەستە دەكاتە گرێبەستێك لە نێوان هاولاتیان لە لاییێك فەرمانڕەوا لەلاییێكی ترەوە، بەمشێوەیە توانی یەكەم تۆوی سیستمی دیموكراسی نوێ بچێنێ.

# بەشی سێیەم

## (جۆن لۆك ١٦٣٢ . ١٧٠٤)

**(کەس بۆی نییە دەسەڵات بۆ خۆی زەوت بکات و بەپێچەوانەی ویست و ئارەزووەکانی هاوڵاتیان فەرمانڕەوایەتی بکات، ئەگەرنا دەبێتە داگیرکەر، داگیرکەریش دەست بەسەردا گرتنی ئەو شتەیە کە مافی یەکێکی ترە.**

**جۆن لۆك : فی الحکم المدنی برگەی ١٩٧ )**

### یەکەم: پێشەکی: .

جۆن لۆك هەر لە سەرەتاوە و دوور لە ویست و ئارەزووەکانی خۆی، ئەو لەناو گەرمەی سیاسەتدا نوقوم ببوو و لەناو جەرگەی شەڕێکی خوێناوی ناوەخۆدا دەژیا لە ئینگلتەرا، شەڕێك بوو لەنێوان شارل پاشای یەکەم و پەرلەماندا. سەرەڕای ئەمەش (ئەوانەی سەرکردایەتی شۆڕشەکەی پەرلەمانیان دەکرد لەدژی پاشادا بیۆریتانییەکان بوون) باوکی (جۆن لۆك)یش لە بیۆریتانیا پارێزەر بوو، لایەنگری کێشەکەی پەرلەمان بوو و پشتگیریشی لێدەکرد. هەردوو تیۆرەکانی دەسەلاتی گەل و حکومەتی پەرلەمانی کە ولات پێویستی پێیان هەبوو بۆ کوڕەکەی شیکردبۆوە و تێی گەیاندبوو، ئەو کوڕە گەنجەش باوەڕی بە وانەکانی باوکی هەبوو و دلسۆزیشبوو بۆیان، خۆشی دان بەمەدا دەنێ و هەمیشە سوپاسگوزاریشی بوو[390].

لەلاییێکی ترەوە ئەو گەنجە لەو کاتەدا تەمەنی حەڤدە سالان بوو، لە خوێندنگەی (ویستمنسەر)دا دەیخوێند کە لە کۆشکی(وایتهۆل) ەوە نزیك بوو، کە لە سالی ١٦٤٩ دا لە گۆڕەپانەکەی ئەو کۆشکەدا شارل پاشای یەکەمیان لە سێدارەدا. ئەم رووداوە کاریگەرییێکی گەورەی لەناودل و دەروونی ئەو گەنجەدا جێهێشتبوو. لەوانەیە هەر بە هۆی کاریگەری ئەم رووداوەوە بوو کە دواتر لەبارەی لێبووردەیی دەینووسی.

جگە لەمانەش بێنەو بەردەی شەڕە ناوەخۆییەکان بووە هۆی ئەوەی چەند سالێك لە خوێندن دابڕێ و نەتوانێ بچێتە کۆلێجی (مەسیح) لە زانکۆی ئۆکسفۆرد تا تەمەنی گەیشتە بیست سالان.

یەکێك لە هۆکارەکانی دیکە، کە کاریگەری لەسەر ژیانی (جۆن لۆك)دا هەبوو ئەوەبوو، دوای ئەوەی، کە زانکۆی تەواو کرد ئاشنایەتی و برادەرایەتی لەگەل (لۆرد ئاشلی) دا پەیدا کرد، کە دواتر بە (لۆرد شافتسبری) بانگ دەکرا. ئەو پیاوە بەشدارییێکی کاریگەری لە ئەخلاق و سیاسەتدا هەبوو تا ئەو کاتەی گرتیان و خستیانە بەندیخانەوە، بەلام دواتر توانی

---

٣٩٠ - ول دیۆرانت (قصة الحضارة) وەرگێڕانی فوئاد ئەندراوس بەرگی ٣٤ لـــ ٤٢ ـــ.

رابکات و خۆی بگەیێنێتە هۆڵەندا. گومان لەوەدا نییە، کە (شافتسبری) لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیکردنی شارڵ پاشای دووەمدا لەهەرهەموو کەسایەتییەکان کاریگەری زیاتری لەسەر ژیانی سیاسی ئینگلتەرادا هەبوو، لەبەرئەوەی زۆر رقی لە ستەم و زۆرداری دەبۆوە، بە هەموو شێوەکانییەوە، هەمان ئەو رق وکینەیەش لەناو دڵودەروونی (لۆك)ی هاوڕێی چەکەرەی کردبوو، کە دوایی بووە یەکێك لە داکۆکیکارەکانی ئازادی.

ئەم فاکتەرە جۆربەجۆرانە هۆکارێك بوون بۆ ئەوەی هەر لە منداڵییەوە تێکەڵی گەرمەی سیاسەت بێ، هەر ئەو هۆکارەش بوو وای لێکردبوو کە زیاتر لەجارێك لە ئینگلتەڕاوە رابکات و بچێتە هۆڵەندا و ساڵانێکی دوورودرێژ لەوێ بمێنێتەوە، هەر هەمان هۆکاریش بوو وای لێکرد، کە بە چەند کتێبێك بەشداری لە (فەلسەفەی سیاسی)دا بکات. ئەوەبوو یەکەمجار: لە ئازاری ١٦٨٩ دا نامەییێکی لەبارەی (لێبووردەیی) نووسی دوای ئەوە لە ساڵی ١٦٩٠ دا نامەی دووەمی لەبارەی (لێبووردەیی) نووسی و لە شوباتی ١٦٩٠ دا کتێبە سەرەکییەکەی خۆی نووسی کە لەبارەی فەلسەفەی سیاسی بوو بە ناونیشانی (دوو نامە لەبارەی دەسەڵاتی مەدەنی)..

دووەم: خوا دەسەڵاتی بە پاشاکان بەخشیوە: ـ

سەرەڕای ئەوەی، کە بیرۆکەی (خوا دەسەڵاتی بە پاشاکان بەخشیوە) چاخەکانی ناوەڕاستی گرتبۆوە ـ لەناو مەسیحییەکان و ئیسلامییەکان) لە سەرەتای سەردەمی راپەڕینی ئەوروپادا چەند لێدان و بەر پەرچدانەوەییێکی توندیان لەسەر دەستی بیرمەندە سیاسییەکانەوە بەرکەوت، کە دوا پەناگەی خۆی ـ لەوانەیە دواپەناگەشی بێ ـ لە کتێبەکەی سێر رۆبەرت فیلمەر Sir Robert Filmer دا ـ ١٥٨٨ ـ١٦٥٣ دەدۆزێتەوە کە سیاسەتمەدارێکی ئینگلیزە و لە ساڵی ١٦٨٠دا بە ناو نیشانی (حوکمڕانی باوکسالاری ـ Patriarcha) بڵاوی کردەوە، فەیلەسووفەکەی ئێمە، نزیکەی دە ساڵی (لە ساڵی ١٦٨٠ ـ تا ساڵی ١٦٩٠ ئەو ساڵەی کە لۆك کتێبەکەی خۆی تێدا بڵاو کردەوە خەریکی توێژینەوە و شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە بوو لەسەر ئەو کتێبە). لێرەدا نامەی یەکەمی کتێبەکەی، کە بە ناونیشانی (دوونامە لەبارەی حوکمڕانی مەدەنی) بوو (خراپ) بوو بەو مانایەی کە ئەو هەر لەبنەڕەتدا تەنها مەبەستی ئەوە بوو رەخنە لە نووسینەکانی (فیلمەر) بگرێت کە داکۆکی لەوە دەکرد کە(خوا دەسەڵاتی بە پاشاکان بەخشیوە)، ئەو پرەنسیپە ترسناکەی داڕشتبوو، کە مافی ئەوە دەداتە پاشاکان کە فەرمانڕەوایەتییێکی رەها و ستەمکارانەی هاوڵاتییەکانی

خۆیان بکەن. بێ ئەوەی هیچ تاکێك لە هاولاتییان بتوانێ نارەزایەنی خۆی پێشان بدات، یان شۆڕش لە دژیدا بکات. لەبەرئەوەی خوا ئەو دەسەلاتانەی بە پاشا بەخشیوە بۆ فەرمانڕەوایەتیکردنی خەلکی. لێرەدا ئەوەی لەسەر شانی خەلکی بوو تەنها گوێڕایەلی بوو بۆ فەرمان و بڕیارەکانی فەرمانڕەوا. پاشا لەبەرئەوەی، کە خوا دەسەلاتی پێ بەخشیوە ـ ئەو مافەی هەیە، کە ئەو یاسایانە دەربکات، کە لە بەرژەوەندییەکانی گەلدایە. ئەمەش وەك ئەوە وایە کە لە کاتی خۆی لە میسری کۆندا خەلکی دەیانگوت (فیرعەون ئاگاداری هەموو شتێکە و هیچ شتێکیشی لێ وون نابێ، شتیش نییە لەو دونیایەدا ئەو نەیزانێ و تەنانەت دەستی دەگاتە هەر هەموو زانستەکانیش)[391] ـ لێرەدا ئەو خۆی دەزانێ کام یاسا بۆ ئەو گەلەی کە خۆی حوکمڕانی دەکات یاساییێکی گونجاوە، بۆیە دەبێ وتارەکانی پاشا (هێزی یاسا)یان هەبێ، لەبەرئەوەی بە تێڕوانینی (فیلمەر) (ناکرێ مرۆڤێك بێت و یاساییێك بۆ سنووردارکردنی ئازادییەکانی خۆی دابڕێژێ).

ئەگەر بێت و پاشا لەلایەن خواوە دەسەلاتی پێدرابێ، کە بەمشێوەیە فەرمانڕەوایەتی گەلەکەی خۆی بکات، ئەگەر بێت خۆی ئەو یاسایانە دەربکات، کە خۆی بە چاکی دەزانێ بۆ گەلەکەی خۆی، واتە ئەو پاشایە، یەکەم: ئەو پاشایە لە سەرووی هە هەموو یاساکانەوەیە، لەبەرئەوەی خۆی خاوەنی یاساکانە.دووەم: ئەو پاشایە هەر لە خۆیەوە بڕیار نادات، بەلکو ئەو یاسایانە لە هەمان ئەو دەسەلاتەوە هەلدەهێنجێ، کە خودا پێی بەخشیوە. سێیەم: هەر کەسێك بیر لەوە بکاتەوە کە شۆڕشێك ئەنجام بدات، یان هەولی ئەوە بدات، کە ئەو دەسەلاتە بگۆڕێ، ئەو کەسە بە (کافر)، یان (زەندیق) تۆمەتبار دەکرێ، لەبەرئەوەی هەلگەڕانەوەیە لە ویستەکانی خوا، چونکە بڕیارەکان هی پاشایە و پاشاش سێبەری خوایە لەسەر زەویدا[392].

فیلمەر لەسەر ئەو ئاراستەیەدا چەند ئەنجامێکی ترسناکی بۆ ژیانی سیاسی ئەوسا دارشتبوو، یەکێك لەمانە ئەو گوتەیەی کە دەلێ: مرۆڤ بە ئازادی لە دایك دەبێ ـ یان ئەوەی ناویان ناوە (ئازادییە سروشتییەکان) ـ ئەم شتانە هیچ بوونێکیان نییە،

---

٣٩١ - بەو کتێبەمان (الطاغية) دا بچۆرەوە کە لێکۆلینەوەییێکە لە بارەی ستەمی سیاسی لـ ٦٧ ـ چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبولی سالی ١٩٩٧.

392 - B.Rossell:A. History of Western Philophy.P.642 .

بەڵکو تەنها چەند شتێکی پڕوپووچ رۆمانسیانەن!، چونکە هیچ مرۆڤێك نییە بە ئازادی لە دایك ببێ، لەبەرئەوەی خوا وای ویستووە کە ئێمە بخاتە ژێر فەرمانەکانی فەرمانڕەواییێکی رەهاوە. (چونکە ئێمە هەر هەمووومان بە کۆیلەیی لە دایك دەبین)!، ئەو گوتەیەی کە دەشلێ: حکومەتێك لەسەر پێکهاتن و رەزامەندی تاکەکانی گەل بێتە ئاراوە، ئەمە دووەم شتە لەو شتانەی پڕوپووچن!، هەروەها ئەو شتەی کە هەندێك کەس پێی دەلێن (حکومەتی پەرلەمانی) ئەمەش سێیەم شتە پڕو پووچەکانە!(ئێمە فێلێ لە خۆمان دەکەین ئەگەر بلێین رۆژێك هەر دێ فەرمانڕەواییێك فەرمانڕەوایەتیمان بکات ستەمکار نەبێت)! سەرەڕای ئەمەش، ئەگەر هەر حکومەتێك پشت بە ویست و ئارەزووەکانی خەڵکی ببەستێ زۆر زوو دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە حکومەت نامێنێ، چونکە هەر تاکێك، یان کۆمەڵێك بەپێی ویژدانی خۆی ئەو مافە بە خۆی دەدات، کە لە حکومەت هەڵگەڕێتەوە، یان لێی یاخی بێت، ئەمەش ئاژاوەییێکە بۆ خۆی، یان حوکمڕانی شوان وگاوانە و هیچ ستەمکارییێکیش نییە لەگەڵ ستەمکاری جەماوەردا بەراورد بکرێ.

بەڵام دەبێ (فیلمەر) ئەو بەڵگەیەی لە کوێ دەسکەوتبێ کە (خوا ئەو دەسەڵاتەی داوەتە پاشاکان)، کە بەو گوڕوتینەوە داکۆکی لێدەکات؟ لە وەڵامدا دەڵێ: لە کتێبی پیرۆزی وەرگرتووە، چونکە حوکمڕانی پاشایەتی بۆ (ئادەم) دەگەڕێتەوە، کە خوا ئەو دەسەڵاتە رەهایەی پێ بەخشیوە کە دەسەڵاتی بەسەر هەر هەموو بوونەوەرەکاندا بشکێ، هەروەها ئەو  دەسەڵاتەشی پێدراوە کە حوکمڕانییێکی باوکسالارانە بەسەر کوڕەکانی خۆیدا بکات و نابێ هیچ کەسێك ناڕازیبوونی خۆی لە بەرامبەریدا دەربڕێ. ئەم دەسەڵاتە تەنها بە (ئادەم) نەدراوە، (.. بەڵکو بە میر و پاشاکانی دوای ئەویش دراوە، کە بە ناوی باوکسالاریەوە دەسەڵاتێکی رەهایان بە سەر بنەماڵەکەی خۆیانەوە هەبێ..). بەم شێوەیە ئەو دەسەڵاتەی کە خوا بە (ئادەم) ی بەخشیبوو، ئێستا میرەکانی ئیسرائیل پێڕەوی دەکەن. ئەمە لە مەودا و چالاکبوونیدا لەو دەسەڵاتە بانگەشە بۆکراوە دەچێ کە هەر پاشاییێك لە سەردەمی دروستبوونی بوونەوەرەکانەوە هەیێتی، ئەمە ئەو دەسەڵاتەیە بەسەر رۆحی بەندەکانەوە و مافی راگەیاندنی شەڕ و شۆڕو سەقامگیریشی هەیە، چونکە دەسەڵاتەکانی پاشایەتی لە شەریعەتەکانی خوداوە سەرچاوەی گرتووە، هیچ شەریعەتێکی لەو نزمتر ناتوانێ سنووری بۆ دابنێ. لە

سەردەمی خۆیدا ئادەم گەورەی هەمووان بوو، ئەو پاشایانەی کە بە میراتیش ئەو دەسەڵاتەیان وەرگرتووە هەمان دەسەڵاتیان دەبێ[393].

لۆك هەستی بەوە کردبوو کە دەبێ کاری یەکەمی ئەو ئەوە بێ بەڵگەکانی (فیلمەر) بە درۆ بخاتەوە لەبەرئەوەی (هیچ کاتێك وەك ئەو سەردەمە ئەو قسە پڕو پووچ و بێمانایانە بەو زمانە ئینگلیزیە پاراوە بڵاو نەببوونەوە..)!.

ئەوەی راستی بێ ئێمە بە شێوەییێکی تایبەتی لەم لێکۆڵینەوەیەدا مەبەستمان ئەو گفتوگۆیانەیە کە لۆك لەبارەی بەڵگەکانی (فیلمەر) ئەنجامی داوە، چونکە لەلاییێکەوە ئەو زەرەر و زیانانەی تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەتمان بۆ دەر دەخات، لەلاییێکی تریشەوە گرنگی لە یەکتر جیاکردنەوەی ئەو دووانەمان بۆ دووپات دەکاتەوە، ئەمەش شتێکی روونە کە هەر یەکەیان بواری تایبەت بە خۆی هەیە.

لۆك لەبارەی بەڵگە پڕوپووچەکانی (فیلمەر) گفتوگۆییێکی دوورودرێژی ئەنجام داوە، کە نامەی یەکەمی ئەوەندەی نەماوە نیوەی کتێبەکە دابگرێ  کە دەتوانین خاڵە گرنگەکانی لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە: ـ

**(١)** (لۆك) پێی وایە کە نابێ پێوەندییەکانی نێوان پاشاو خەڵکی وەك پێوەندیەکانی نێوان باوك وکوڕ بێ، ئەمەش لەبەرئەوەی پێوەندییەکانی نێوان باوك و خێزان بە پلەی یەکەم پێوەندییێکی ئەخلاقیانەیە ئەو لە رووی  ئەخلاقەوە لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا بەرپرسە و دەبێ فێری بەهاکانی ئەخلاقیان بکات، تا ئەو کاتەی پێدەگەن دەبێ خەرجیان بداتێ، بەڵام دەبێ پێوەندییەکانی نێوان پاشاو خەڵکی پێوەندییێکی سیاسیانە بێ لەسەر ئەوە دەوەستێ، کە پاشا بە کۆمەڵە ئەرکێکی تایبەت هەڵدەستێ، کە یاساکانی دەوڵەت دەسنیشانی کردووە: ـ لەوانە، سەرپەرشتیکردنی قازانج و بەرژەوەندییەکانی خەڵکی و پیادەکردنی، هەروەها مافە سروشتییەکانیان بۆ دابین بکات و مسۆگەرکردنی ژیانێکی پڕ لە ئاسایش و ئارامی و مافی موڵکداریێتی و یەکسانی و ئازادی...و هتد دابین بکات. ئەگەر هات و نەیتوانی ئەمانە ئەنجام بدات، یان لە جێبەجێ کردنیاندا کەمتەرخەم بوو، خەڵکی بۆیان هەیە لەسەر کارەکەی لایبدەن و یەکێکی دیکە لە جێگاکەیدا دابنێن، کە بتوانێ ئەرکە سیاسییەکانی خۆی جێبەجێ بکات.

---

٣٩٣ - جۆن لۆك (في الحكم المدني) لـــ ١٠ ـ ـــ وەرگێڕانی ماجید فەخری  ـ لیژنەی نێونەتەوەیی بۆ بڵاوکردنەوەی شاکارەکان  بەیروت ساڵی ١٩٥٩.

له کاتێکدا لەناو خێزاندا ئەو مافە بە منداڵەکان نادرێت، یان هەر لە توانایاندا نییە باوکیان لاببەن و یەکێکیتر لەجێگەکەیدا دابنێن.

**(٢)** ئەخلاق ئەوە بە سەر منداڵدا دەسەپێنێ، کە رێز لە باوکیان بگرن و گوێڕایەڵی بن، هەر لێرەوە هەر دەرچوونێك، یان هەڵگەڕانەوەییێك دەبێتە کارێکی خراپ، بۆیە بەها ئەخلاقییەکان رێگەی پێنادەن. ئەو هاولاَتیانەی، کەوا لەگەڵ پاشادا گرێبەستیان مۆر کردووە هەمان ئەو حاڵەتەی ناو خێزان نییە، چونکە ئەگەر هات و پاشا بەو گرێبەستەوە پابەند نەبوو هاولاَتیان مافی خۆیانە کە لێی هەڵبگەڕێنەوە و لەسەر دەسەلاَت دایگرن. بگرە ئەخلاق ئەوە بە سەر پاشادا دەسەپێنێ کە ئەگەر دایك و باوکی لە ژیاندا مابێ دەبێ رێزیان بگرێ ـ بەلاَم ئەو دایك و باوکە بۆیان نییە دەست لە کاروبارە سیاسییەکانی دەوڵەت وەربدەن هەروەها بۆشیان نییە هیچ بیروڕاییێکی خۆیان بە سەر پاشادا بسەپێنن لەبەرئەوەی دایك و باوکی ئەون، چونکە ئەمە دەبێتە تێکەڵکردنێکی ترسناکی نێوان چەمکە ئەخلاقییەکانی خێزان و چەمکە سیاسییەکانی دەوڵەت.

**(٣)** سەرەڕای ئەمانەش هێشتا دەسەلاَتەکانی باوك بە سەر منداڵەکانییەوە دەسەلاَتێکی رەها نییە وەك (فیلمەر) دەڵێ، بەڵکو شتێکی کاتیە و بە ماوەییێکی زەمەنی دیاریکراوەوە بەستراوەتەوە. ئەویش ئەو کاتەی کە منداڵن دەبێ پەروەردەیان بکات و پێداویستییەکانیان بۆ دابین بکات، کە گەورەش بوون و پێڕاگەیشتن ئەو کاتە مافی خۆیانە کە لە خێزانەکە جیا ببنەوە ـ تەنانەت لەژێر دەسەلاَتیشی نەمێنن ـ وەك هەر هاولاَتییێکی تر مافەکانی خۆیان پیادە بکەن و خێزانێکی تایبەت بە خۆیان پێك بهێنن و لەلاییێك بەرپرسیارێتییەکان بەرامبەر بە خێزان لە ئەستۆ بگرن و لەلاییێکیتریشەوە بەرامبەر بە کۆمەڵگە.

**(٤)** ئەگەر وەك (فیلمەر) دەڵێ: ئەو دەسەلاَتە خوازراوەی کە ئادەم هەیبوو، کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە، بە تایبەتی لە وەسیەتنامەی پێنجەمدا: (اكرم اباك و امك..) واتە رێزی باوك و دایکت بگرە، (سفر التثنيية ـ الاصحاح الخامس:١٦) ئەوەی بە روونی لەم وەسیەتەدا دیارە ئەوەیە، کە دەسەلاَت دەداتە ژنانیش چونکە لێرەدا تەنها باس لە باوك ناکات، بەڵکو باسی دایکیش دەکات..!.

**(٥)** تەنانەت ئەگەر بێت و واش دابنێین کە (ئادەم) خوا دەسەلاَتێکی رەهای پێبەخشیبوو، بەلاَم ئەمە ئەوە ناگەیێنی کە هەمان ئەو دەسەلاَتانەش بگوازرێتەوە بۆ منداڵەکانیشی، بەڵکو لەگەڵ مردنی ئەودا ئەو دەسەلاَتە کۆتایی پێدێ، چونکە ئەو مافەی کە

لە کتێبە پیرۆزەکەی خودا دا هاتووە زۆر بە روونی دیارە، کە نویٚ ناکرێتەوە، تەنها بە نوێکردنەوەی ئەو کتێبە نەبیٚ.

**(٦)** ئەگەر وامان دانا ئێمە باوەڕمان بە پرەنسیپی ئەو دەسەڵاتە پاشایەتیە کرد، کە لە ئادەمەوە بۆمان ماوەتەوە، لەبەرئەوەی کێشە سیاسیە گەورەکان وا دەکەن کە دەبیٚ میراتگرێکی شەرعی بۆ ئادەم دابندریٚ و لە دەوڵەتێکی دیاریکراودا و بۆ ماوەییێکی دیاریکراو ئەو خاوەن مافە دەسنیشان بکەین بۆ دەسەڵات، چونکە ئێمە هەر هەموومان میراتگری (ئادەم) ین، بەو پێیەی کە ئێمەش نەوەی ئەوین، کەواتە هەر هەموومان مافێکی یەکسانمان لەو دەسەڵاتە رەهایەدا هەیە.

بەمشێوەیە ئەم بینا هەڵچنراوەی کە دەڵیٚ: (خوا ئەو دەسەڵاتەی بە پاشاکان بەخشیوە) کە سەردەمەکانی چاخی ناوەراستی گرتبۆوە لە ئەوروپادا، هەروەها بە چەندین شێوەی جۆراوجۆر و بە درێژایی مێژوو رۆژهەڵاتی گرتبۆوە دا دەتەپیٚ و بوونی نامێنیٚ.ـ(فیلمەر) بە چەند بەڵگەییێکی بیٚ بنەما کە کەس پێی رازی نابیٚ تەنها خەڵکی ساویلکە نەبیٚ، دەیویست لە داڕومان و داتەپین رزگاری بکات. لە هەمانکاتدا خەڵکی لەوە گەیشتبوو کە پاڵپشتی لەو دەوڵەتە بکات، کە لە سەردەمی راپەریندا ماکیاڤیللی، ئینجا دوای ئەویش تۆماس هۆبز و فەیلەسووفە سیاسییەکانی تر دەستیان بە بنیادنانی کردبوو. خەڵکی بگاتە ئەوەی، کە ئەو مافەی هەبیٚ فەرمانڕەواکەی خۆی هەڵبژێریٚ و چاودێری بکات و لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات، بەو پێیەی کە خۆی خاوەنی ئەو دەسەڵاتە رەهایەیە لە هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی خۆیدا، بیٚ ئەوەی کەس دەستی بگریٚ: ئەو شتەی کە زۆر بە روونی لە چاخەکانی رۆشنگەریدا دەردەکەویٚ ئەوەیە کە (کانت) رایگەیاند (دەبیٚ مرۆڤ چیتر لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی کەسدا نەبیٚ)، چونکە ئێستا منداڵ نییە و گەورە بووە، بۆیە پێویستی بە هیچ کەسێك نییە دەستی بگریٚ و لە جیاتی ئەو بیر بکاتەوە. هەر لێرەوە دروشمی سەردەمی رووناکی بووە: (با جورئەت و ئازایەتیت تێدا هەبیٚ و ئەقڵی خۆت بە کار بێنە، ئازابە لە هەموو کاروبارەکانی ژیاندا خۆت بناسە و هەر بابەتێك کە دەخرێتە بە دەستت ئەقڵی خۆتی لیٚ بەکار بێنە.

## سێیەم: گریبەستی کۆمەڵایەتی: .

هەروەکو وتمان یەکەم نامەی ئەو دوو نامەیەی (لۆك) نەرێنی بوو، چونکە تەنها مەبەستی ئەوە بوو رەخنە لە بەڵگەکانی (فیلمەر) بگرێ و ئەو بنچینە ئاینییە هەڵبوەشێنێتەوە کە دەڵێ (خوا ئەو دەسەڵاتەی داوەتە پاشاکان)، بەڵام نامەی دووەمیان زۆر (باش) بوو، واتە بۆ خستنە رووی فەلسەفە تایبەتیەکەی خۆی تەرخان کرابوو، کە بە خستنە رووی ئەو پرسیارانە دەستی پێکردبوو: ئایا سیستەمی سیاسی چۆن دروست دەبێ؟ ئایا دەوڵەت چۆن بنیاد دەنرێ؟ ئایا ئەگەر رەگ و ریشەکانی دەوڵەت بۆ سەرچاوە ئاینییەکان نەگەڕێتەوە، وەك فیلمەر وای بۆ چووبوو، دەبێ ئەو رەگ و ریشانە چۆن بدۆزینەوە؟ بە رای ئەو دەوڵەت تەنها لەسەر دەستی ئادەمیزاد دروست بووە، لێرەدا (لۆك) هەمان رێچکەکەی (هۆبز) ی گرتۆتە بەر، کە ئەویش وای بۆ چووە کە پێش دروستبوونی دەوڵەت (حاڵەتە سروشتییەکان) بوونی هەبووە، بەڵام لێرەدا بە پێچەوانەی (هۆبز) ئەو لەو باوەڕەدا بووە کە تاکەکان لەو حاڵەتەدا چێژیان لە ئازادی و یەکسانی وەرگرتووە، واتە ئازادی و یەکسانیان لە ناودا هەبووە، چونکە لە سروشتدا کەس مافی لە مرۆڤێکی کە زیاتر نییە، هەروەها ئەقڵە سروشتیەکەش خەڵکەکەی وا فێرکردووە کە لەبەرئەوەی ئەوان هەر هەموویان سەربەخۆ و یەکسانن، بۆیە نابێ کەس زیان بەویتر بگەیێنێ: نەبە ژیانی و نە بە ئازادییەکانیشی،ـ لەو سەردەمدا (کۆمۆنەی سەرەتایی) هەبوو، واتە موڵکدارێتی هاوبەش، هەموو تاکێك مافی ئەوەی هەیە، کە هۆکارەکانی ژیانی خۆی بە دەست بهێنێ، ئەو هۆکارانەی کە سروشت پێی بەخشیوە، چونکە (خوا) زەوی بە شێوەییێکی هاوبەش وگشتی بە مرۆڤ بەخشیوە: کە لەهەر شوێنێکدا دارەکانی سەر زەوی بەری هەبوو، ئەو بەروبوومەش بۆ خواردن بێ نەك مرۆڤ رواندبێتی، ئەوە هەر تاکێك مافی خۆیەتی کە بە بێ ماندووبوون لەو بەروبوومە بخوات، بەڵام کە مرۆڤ دەستی دایە کارکردن و چالاکییەکانی خۆی بە گەڕ خست، ئەو کۆمۆنە سەرەتاییە کۆتایی پێهات و چیتر موڵکدارێتی هاوبەش کاری پێ نەکرا، چونکە هەر تاکێك پارچەییێك زەوی بۆ خۆی دابڕی و کردیە موڵکی تایبەتی خۆی. کاتێکیش کە ئەو زەویە لە (رێگەی کار کردنەوە) شێوەکەی دەگۆڕێ و لەگەڵ هەوڵوکۆشش و ماندوبووندا تێکەڵ بە یەك دەبن و نرخ و بەهاییێکی تایبەتی پەییدا دەکرد (لەبەرئەوەی کارکردن سەرچاوەی هەر

هەموو بەها ماددییەکانە)، چونکە گومان لەوەدا نییە، کە شارستانییەتەکان لەرێگەی کارکردن و چالاکییەکانی مرۆڤەوە گەشە دەکەن و پێش دەکەون. هەرچەندە پرەنسیپە ئەقڵییەکان دەڵێن: مرۆڤ نابێ لەوەندە زیاتری هەبێ کە نەتوانێ بە کاری بهێنێ، ئەمەش لە (حاڵەتی سروشتیدا) پیادە نەکرا، هەر کە موڵکداریێتی تایبەتیش هاتە کایەوە، یەکسەر چاوچنۆکی و زوڵم و زۆرداری لەگەڵ خۆیدا هێنا. لەم رێگەیەشەوە جیاوازییەکان پەرەیان سەند و یەکسانی موڵکداریێتی لەناو خەڵکیدا بوونی نەما، ئەمە سەرەڕای ئەوەی، کە موڵکداریێتی مافێکی سروشتی هەموو تاکێکە، بەڵکو هەروەکو ئازادی و یەکسانی و مافەکانی تر یەکێکە لە (مافە پیرۆز)ەکان، چونکە بەردەوامبوونی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی ـ بەڵکو بە شێوەییێکی گشتیتر شارستانییەتەکانیش ـ بە پاراستنی ئەو مافانەوە بەستراوەتەوە، بە تایبەتی موڵکداریێتی تایبەتی، کە پاراستنی دەبێ لەکارە هەرە باڵاکانی دەوڵەت بێ، چونکە لە توانای دەسەڵاتی باڵادا نییە ئەگەر بە رەزامەندی مرۆڤەکە خۆی نەبێ دەست بە سەر هیچ بەشێکی موڵکە تایبەتییەکانی ئەو مرۆڤەدا بگرێ[٣٩٤].

---

٣٩٤ - شتێکی روونە کە هیگڵ لە فەلسەفە سیاسیەکەی خۆیدا کە لە (اصول فلسفە الحق)دا خستویێتیە روو کاریگەری بیرۆکەکانی (جۆن لۆك) ی بە سەرەوەیە وەك چۆن کاریگەری فەیلەسووفەکانی تری بە سەرەوەیە. هەر بۆیە دوای ئەوەی کە سەلماندی تاك کەسایەتییێکی بێ کۆتایی هەیە دەبینین واژەی (موڵکداریێتی دەخاتە پێش هەموو واژەکانی تری فەلسەفەی رەواوە )، ئەو وای دەبینێ کە مرۆڤ مافی بە سەر هەموو ئەو شتانەوە هەیە کە کۆتاییان دێ، ئەو مافەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە کەسێکە واتە خودی هۆشمەندێکی بێ کۆتاییە، ئەمەش خۆی مەبەستە لە خودی خۆیدا، نەك وەك شتەکانی تر هۆکارێك بێ. بۆیە مافی خۆیەتی کە دەست بە سەر ئەو شتەدا بگرێ، یان ئەویتریان. دەست بە سەرداگرتنیش خۆی لە خۆیدا موڵکداریێتیە. موڵکداریێتیش سێ جۆر لە خۆیدا دەگرێ کە ئەمانەن : کاری بە دەستهێنان ـ بە کارهێنانی شتەکە ـ لە ناوچوون، یان گواستنەوەی ئەو شتە بۆ یەکێکی دیکە. هیگڵ دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە کارکردن، یان بە کارهێنانی هەر شتێك بنچینەی موڵکداریێتیە. لەبەرئەوەی تەنها ئەوە بەس نییە کە بڵێین: فلانە کەس پارچە زەوییێکی (هەیە)، بەڵکو دەبێ ئەو کەسە زەوییەکە بکێڵێ، و شێوەکەی بگۆڕێ و بیچێنێ...وهتد. بەم شێوەیە هەوڵ ماندوبوون وکارەکانی خۆی تێکەڵ بەو زەوییە دەکات. تەنها لێرەدا ئەو زەوییە دەبێتە موڵکی تایبەتی خۆی. بۆ ئەمانە هەر هەمووی بە کتێبی (اصول فلسفة الحق) ی هیگڵدا بچۆرەوە کە ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام وەریگێڕاوە لــ٣٨ ـــ و لاپەڕەکانی دوای ئەو، هەروەها بە لــ٢٠٧ ـــ و دوای ئەودا بچۆرەوە، کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦.

بەلام، کە موڵکداریّتی هاتە کایەوە، ئەوکاتە هەر تاکێك بووە خاوەن چەند پارچە زەوییێکی دیاریکراوی خۆی و بۆ خۆی بە کاری دەهێناو ئاگای لیّ دەبوو، لێرەدا ناکۆکییەکان وردە وردە پەرەیان سەند و هەندێك کەس ڕێزی لە مافەکانی بەرامبەرەکەی خۆی نەدەگرت و موڵکەکەی لیّ داگیر دەکرد، بەڵکو دەسدرێژیان دەکردە سەر موڵك و ماڵی کەسانی دیکەش و بە ئارەزووی خۆیان بە کاریان دەهێنا. بەمشێوەیە تەمبەڵی و بیّ کاری و رق وکینە وئیرەیی و دەست بەسەر موڵك وماڵی خەڵکی داگرتن دەستی پێکرد و ئەم حاڵەتە سروشتیەیان لە ئاشتی و ئاسایشەوە گۆڕی بۆ ناکۆکی و دووبەرەکی و شەڕو شۆڕ، تا گەیشتە رادەییێك کە مرۆڤ نەتوانیّ مافە بنچینەییەکانی خۆی وەك: موڵکداریّتی و ئازادی و یەکسانی لە ژیانی رۆژانەیدا پیادە بکات. ئەو مافە پیرۆزانە بە شێوەییێکی بەردەوام لەلایەن براکانیانەوە کە لە هەمان هۆز بوون، یان دراوسێکانیانەوە، لە رێگەی داگیرکردن هێرش کردنە سەریان و...هتد، دەستدرێژیان دەکرایە سەر. ئەمەش وای لە خەڵکی کرد کە بە دوای رێگە چارەییێکدا بگەڕێن کە لەم مەترسیە رزگاریان بکات، هەموویان گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە دەبیّ واز لە هەندێك لە مافە سروشتییەکانی خۆیان بهێنن بۆ دەسەلاتێك کە بتوانیّ بیانپارێزیّ و ئەو بوارەیان بۆ بڕەخسێنیّ کە بتوانن مافەکانی تری خۆیان بە کاربهێنن، بۆیە لەسەر ئەوە پێکهاتن، کە هەر یەکەیان واز لەو مافە سروشتییە بهێنن کە بەرگری لە زەوی و موڵك وماڵ و خودی خۆیان و... هتد پیّ دەکەن بۆ دەسەلاتێکی فەرمانڕەوا، کە لە جیاتی ئەوان بەو پارێزگاریکردنە هەڵستیّ، بەم شێوەیە ریکخستنی سیاسی، یان مەدەنی، یان بڵێین دەوڵەت، بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە گشتییەکان دروستبوو. ئەمەش مانای ئەوەیە، کە پێویستبوونی دابینکردنی مافە سروشتییەکانی تاك وەك: موڵکداریّتی تایبەتی و ئازادی و دروستکردنی دادپەروەری و یەکسانی لەنێوانیاندا ـ ئەمانە بوون وایان لەو تاکانە کرد کە بچنە پاڵ یەکتر و دەسبەرداری مافی بەرگری کردن بن لە خۆیان و موڵکە تایبەتەکانیان. بەمشێوەیە (گرێبەستی کۆمەلایەتی) هاتە وجوود، کە بنچینەی رێکخستنی سیاسی وکۆمەڵگەی مەدەنی و دروستبوونی دەوڵەتە. ئەو گرێبەستە کۆمەلایەتیەش لەنێوان دوو لایەندا بوو: لایەنی یەکەم هاولاتیانن و لایەنی دوەمیش دەسەلاتی فەرمانڕەوایە کە (پاشا، یان حکومەت)ە. لە بەر ئەوەی ئەم گرێبەستە، بنچینەی حوکمڕانیکردن و بنەمای رێکخستنی سیاسیە، بۆیە هەر هەڵەییێك لە کاتی جێبەجێکردنیدا رووبدات لەلایەن هەر لایەنێکەوە لەو دوو لایەنە، ئەو

گرێبەستە بوونی نامێنێ و هەڵدەوەشێتەوە: ئەگەر بێت هەر هاوڵاتییێك گوێڕایەڵی ئەو یاسایانە نەبوو کە دەسەڵاتی یاسادانان دەری دەکات، دەبێ ئەو هاوڵاتیە بە پێی یاسا سزا بدرێ، نەك پارێزگاری لێ بکرێ، هەروەها ئەگەر پاشا، یان حکومەت ئەو بەڵێنانەی کە بە خەڵکیان دابوو نەیان گەیاندە سەر، یان لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتیەی کە دەکەوێتە سەر شانیان سستیان نواند، دەبێ لەسەر کار لابردرێن و سزا بدرێن، نەك گوێڕایەڵ و ملکەچی دەسەڵاتەکانی بن. بەم شێوەیە دەبینین گەل تەنها خۆی دەبێتە سەرچاوەی دەسەڵاتەکان ـ دواتر  هەر ئەویش پرەنسیپە دیموکراسیە گرنگەکەیە ـ بۆ هەر کەسێکیش کە دەسەڵات دەگرێتە دەست گەل خۆی دوا پەناگەیە. بۆیە دروستبوونی هەر شێوەییێك لە شێوەکانی حوکمڕانیکردن بە بێ ڕەزامەندی گەلْ دەبێتە داگیرکردن، یان ستەمکار (لەبەرئەوەی ستەمکاری دەسەڵاتێکە پشت بە هیچ ڕەوایەتییێك نابەستێ، کە هەرگیز بۆ هیچ فەرمانڕەواییێك (ڕەوا) نییە ـ لەژێر هەر ناوێکدا بێ ـ لە جیاتی یاسا[٣٩٥] ویست و ئارەزووەکانی خۆی بکاتە بنەمای ڕەفتارەکانی ڕۆژانە.

بەڵام ئەو پاشا، یان ئەو فەرمانڕەوایانەی، کە بە ڕەزامەندی گەل دێنە سەر دەسەڵات، ئەو کەسانە نابنە ستەمکار لەبەرئەوەی بە ئارەزووی خۆیان پابەندی ئەو کۆت و پێوەندانە دەبن، کە یاساکانی وڵات بە سەریاندا دەسەپێنێ.  لە بەر ئەوەی ستەمکاری لەو کاتەدا دەست پێدەکات کە دەسەڵاتی یاسا بوونی نامێنێ[٣٩٦].

## چوارەم: ئەنجامەکان: .

فەلسەفەی سیاسی لە سەدەی حەڤدەمدا چی لێ کەوتەوە ـ کە دواتر لە سەدەی هەژدەمدا، لە چاخەکانی ڕۆشنگەریدا بە ڕوونی دەرکەوت ـ سەدەی هەژدەم ـ سەردەمی دوو شۆڕشە گەورەکەی ئەمریکا و فەرەنسا وەك ئەوەی لە دەروازەی داهاتوودا باسی دەکەین؟. لە تێگەیشتنەکانماندا بۆ ئەو کۆمەڵگە سیاسییەی، کە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا باو بوو مەسیحی بێ، یان ئیسلامی  چ پێشکەوتنێك لە سەردەمی نوێدا ڕوویداوە؟.کۆمەڵێك ئەنجامی گرنگمان دەسکەوتووە کە دەتوانین لەم خاڵانەدا کورتی بکەینەوە: ـ

---

٣٩٥ - جۆن لۆك (فی الحکم المدنی) : بڕگەی ١٩٩.

٣٩٦ - جۆن لۆك (فی الحکم المدنی) : بڕگەی ٢٠٢.

**یەکەم: ـ** ئەو گەشەکردنە بەشێوەیێك ئەوەی سەلماند، کە هیچ گومان لەوەدا نەبێ، کە بنچینەی یەکەمی دروستکردنی دەوڵەت، یان ڕێکخستنی سیاسی بەشێوەیێکی گشتی باوەڕ هێنانە بە بوونی ئەو مافە سروشتی و پیرۆزانەی مرۆڤ  کە نابێ دەستیان لێ بدرێ، وەك ئەوەی، کە هەر مرۆڤێك مافی ژیانی هەیە و دەبێ پارێزگاری لە بەردەوامی مانەوەیدا بکرێ، هەروەها مافی ئازادی و یەکسانی...و هتد هەبێ. بۆ نموونە: نابێ هیچ کەسێك ئەگەر تاوانێکی بەرامبەر یەکێکی تر ئەنجام نەدابێ یەکێك لە مافەکانی لێ زەوت بکرێ، چونکە ئەو لەسەر ئەو تاوانە سزای خۆی وەردەگرێ، لەو حاڵەتەشدا لەئەنجامی ئەو کارەی، کە کردویەتی ئازادی لێ دەسەندرێتەوە، کاتێك کە بە بەندکردن سزا دەدرێ، بۆیە دەبینین هیگڵ لە دواییدا دەڵێ: (تاوانبار بەو کردارەی خۆی بڕیار دەدات کە توندوتیژی ببێتە پرەنسیپێکی گشتی، یان هەر خۆی یاسای توندوتیژی دادەڕێژێ، کاتێك کە ئێمە سزای دەدەین هەر بەو یاسایەی خۆیەتی سزای دەدەین، بەڵکو لێرەدا بە سزادانی تاوانبارەکە، ئێمە پاداشتی دەکەین و ئیعتباری خۆی بۆ دەگێڕینەوە، بەو سیفەتەی کە ئەو بوونەوەرێکی ئاقڵە و بوونی هەیە. ئەو کەسانەی کە وا دەڕواننە سزادان کە (تەمێ) کردنە، یان چاکسازیکردنە بەرامبەر بە کەسەکە، ئەوانە مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵدا لەیەك ئاست دادەنێن)[٣٩٧].

**دووەم: ـ** بەشێوەیێکی گشتی بنچینەی بنیادی دەوڵەت، یان هەر ڕێکخستنێکی سیاسی (بەرژەوەندی)، یان (سوودورگرتن)ە، یان پاراستنی مافە سروشتییەکانی هاوڵاتیان و ڕەخساندنی بوارێکی ئارامە لەبەر دەمیان بۆ ئەوەی بتوانن ئەو مافانە پیادە بکەن. بۆ نموونە پاراستنی گیان و موڵك وماڵی خەڵکی...و هتد. هەروەها سزادانی ئەو کەسانەی ئەو مافانە پێشێل دەکەن. بەم شێوەیە دەبینین (مەبەست)ەکان لە دروستکردنی دەوڵەت و کارەکانی فەرمانڕەوا گۆڕانکاریان بە سەردا دێ، چونکە پاشا نابێ بێخەوشی و ئەخلاقە چاکەکان لە دڵ و دەروونی خەڵکەکەی خۆیدا بچێنێ، ئەگەر وابێ دەبێ لەسەر کورسی دەسەڵات بێتە خوارەوە و لە مزگەوت و کلێساکاندا (گوتار) بخوێنێتەوەو ڕێنمایی خەڵکی بکات، یان ڕۆڵی باوکێك، یان مامۆستایێك، یان شوانێك...وهتد، ببینێ، ئەمانەش چەند کارێکن کە باوك لە ماڵەوەدا و مامۆستاش لە قوتابخانەدا و پیاوی ئاینیش لە مزگەوت و کلێساکاندا پێی هەڵدەستن..هتد.

---

٣٩٧ - هیگڵ (اصول فلسفة الحق) وەرگێڕانی د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام، بەرگی یەکەم لە کتێبخانە هیگڵییەکان (المؤلفات) لـ٦١ ـ ٢٢٩ ـ ٢٣٠ـ کتیبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦.

ئەمجۆرە بیرکردنەوە (ئەخلاقی)یانە لە بارەی بنیادی دەوڵەت، یان دەسەڵاتی سیاسی هەندێك ئەنجامی زۆر ترسناکی لێ دەکەوێتەوە کە ئەمانەی خوارەوەن: ـ

**(١)** کاتێك کە فەرمانڕەوا تەماشای خۆی دەکات، کە لەهەرهەموو خەڵکی پایە بەرزترە، یان لەسەروی ئەوانەوەیە، یان پێگەیێکی لەوانی تر باڵاتری هەیە، نەك تاکێك بێ لەوان کە کارێکی تایبەتی پێ سپێردرابێ، ئەگەر بە شێوەیێکی چاك بەو کارە هەڵنەستێ دەبێ لەسەر کارەکەی لابدرێ و یەکێکیتر لە جێگاکەی دابندرێ، کە چالاکانەتر کار بکات.

**(٢)** لەو حاڵەتەدا فەرمانڕەوا لەو شوێنە (باڵایەدا) دەوەستێ بۆ ئەوەی بەرەو خێرو چاکە خەڵکی ئاراستە بکات بۆ ئەوەی لە دونیا و رۆژی قیامەت سوودمەند بن. لەبەرئەوەی ئەو، واتە پاشا لە دۆزینەوەو هەڵبژاردنی رێگا راستەکاندا لەوان (زانا)تر و بە(توانا)ترە. هەرچی هاولاتیانیشە هێشتا (کاڵفام) پێنەگەیشتوون و نازانن بەرژەوەندییە راستەقینەکانی خۆیان لە کوێدایە. لێرەدا فەرمانڕەوا هەمیشە ئەو وشە ئەخلاقیانە دووبارە دەکاتەوە کە ئەو (باوك) و (شوان) و (رێنیشاندەر)ە و هەر خۆشی (ئەو بارانی رەحمەتەیە کە لەلایەن خوداوە دانراوە و هەر خۆشی بەرەکەتی ئاسمان و ژیانی سەر رووی زەویە). وەك (تەرتوشی)یش پێشتر باسی کردووە دەڵێ: (پاشا بە بەراورد لەگەڵ گەلەکەیدا وەك رۆحێك وایە بۆ جەستە..هتد).

لەمەدا بەبێ یەك و دوو لەناو خەڵکیدا چەند جیاوازیێکی سروشتی لێ دەکەوێتەوە، وەك چینی سەرو و چینی خوارتر، چونکە لە هەموو حاڵەتەکاندا هیچ یەکسانییێکی سروشتی لە نێوان خەڵك و فەرمانڕەوادا بە دی ناکرێ، چونکە چۆن دەکرێ (فەرمانڕەوا) لەگەڵ (دارو دەستەکەی خۆیدا)، یان شوانێك لەگەڵ (ژێردەستەکەی خۆیدا)[٣٩٨]، یان (باوکێك) لەگەڵ (منداڵەکانیدا) یەکسان بن، هەروەها چۆن (رۆح) لە گەڵ جەستەکەیدا یەکسان دەبێ. زۆر جار تاوەکو ئێستاش لە ولاتەکەی خۆماندا گوتەی سەیر و سەمەرە لە زاری ئەو کەسانە دەبیستین کە هێشتا باوەڕیان بە شتە خورافییەکان هەیە، کە دەڵێت: (هیچ کاتێك چاو ناچێتە سەر برۆ!)، هیچ کاتێك نابێ کرێکارێك

---

٣٩٨ - تێبینی ئەوە بکە، کە وشەی (شوان) بە زۆری لە کڵێساکاندا بە کار دەهێنرێ، کە بەو (قەشە) یە دەڵێن، کە کۆمەڵە خەڵکێکی دیاریکراو ئاراستە دەکات. حەزرەتی (مەسیح) خۆی بە (شوان) دانابوو بۆ ئەوەی رێگەی راست بە (کاوڕ)ە ونبووەکانی ئیسرائیل پیشان بدات و ئاراستەیان بکات ! ئەم وشەیە لە بنچینەدا خۆی لە خۆیدا وشەیێکی ئاینییە شێوەیێکی (باڵادەستی)یان بەرزتر لەوانی تری فەرمانڕەوا دەگەیێنێ لە پێوەندییەکانیدا لەگەڵ خەڵکەکەی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا.

هەمان مافەکانی بەڕێوەبەرێکی هەبێ، یان پاسەوانێکی شەوانە هەمان ئەو مافانەی هەبێ، کە وەزیرێك هەیێتی[٣٩٩].

(٤) هەروەها دابەزینی (بەها)کانی تاکی لێ دەکەوێتەوە، یان تاك هەر بە جارێك دەتوێتەوە و بە سووك و ئاسانی و بە سادەترین هۆکار لەژێر پێی فەرمانڕەوادا دەپلیشێتەوە. تەنها لەبەرئەوەی، کە ئەو فەرمانەی فەرمانڕەوا فەرموویەتی، ئەو تاکە جێبەجێی نەکردووە، بۆیە خوێنی حەڵاڵ دەبێ، هەر وەك ئەوەی (حەجاجی کوڕی یوسف ئەلسەقەفی) لە وتارێکیدا دەری بڕیبوو کە دەڵێ: (ئەگەر بێت و فەرمان بە یەکێك بکەم کە لە دەرگاییێك لە دەرگاکانی مزگەوت بچێتە دەرەوە، ئەویش بە گوێم نەکات و لە دەرگاییێکی تر بچێتە دەرەوە بەو خودایە دەبێ لە سەری بدەم!)[٤٠٠]. لێرەدا (تاك) هیچ نرخ و بەها و کەرامەت و مرۆڤایەتییێکی بۆ نامێنێتەوە، لەبەرئەوەی لە پلەی

٣٩٩ - ئێوە نابێ رەخنە لەوە بگرن کە (پلە دانان) لە نێوان خەڵکیدا لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە. ئەوەی راستی بێ ئەو بیرۆکەیە لێرەدا جیاوازی زۆری لە گەڵ ئەویتردا هەیە، چونکە ئەو پلە دانانەی کە قورئانی پیرۆز باسی دەکات، یان پلە دانانێکە لە رووی باوەڕەوەیە وەك (یرفع الله الذین آمنوا منکم والذین اوتوا العلم درجات..) (المجادلە، ئایەتی :١١) واتە (خودای گەورە پلەی ئەو کەسانە بە چەند پلەیێك لە ئێوە بەرزتر دەکاتەوە کە باوەڕیان هێناوە، هەروەها ئەوانەش کە (زانا) ن. یان ئەو پلە و پایانەی کە لە ئەنجامی کارکردن دەدرێن وەك (و لكل درجات مما عملوا، وماربك بغافل عما یعملون ) الانعام، ئایەتی ١٣٢ ) واتە (هەرکەسێك لە سەر ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدات پلەی خۆی وەردەگرێ، خواکەی تۆش لەو کارانە بێ ئاگا نییە کە دەیکەن )، یان دەڵێ (هم درجات عند الله، والله بصیر بما یعملون) (ئال عمران،ئایەتی :١٦٣) واتە (ئەوانە هەر هەمویان لە لای خوا پلەی خۆیان هەیە، هەرچی دەشیکەن خوا دەیبینێ)، بەڵام لێرەدا یەکسانی لە ئاینی ئیسلامدا شتێکی بنچینەییە و هەموو کەسێك وەك یەك لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێ (چونکە خەڵکی وەك ددانەکانی شانە لەگەڵ یەکتردا یەکسانن ) و هیچ جیاوازییێك لە نێوان عەرەبێك و عەجەمێکدا نییە تەنها بە خواپەرستی نەبێ، بەڵام پلەکان، یان چینەکان لە ئەنجامی کارەکانی ئادەمیزادەوە دروست دەبن نەك لە سروشتەوە هاتبن، یان هەر بە خۆڕسك، یان لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤدا هەبن.

٤٠٠ - ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (الطاغیة: دراسة فلسفیة لصور من الاستبداد السیاسي) لـ٢٤٣ ـــ چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٧.

ئاژەڵدا دانراوە[٤٠١]. دەتوانی ئەمە لەگەڵ ئەو نرخ و بەها بێ کۆتاییەی، کە (جۆن لۆك) بە تاکی داوە، هەروەها لە گەڵ ئەو سیستەمە دیموکراسیەی کە بە پیرۆزی دەڕوانێتە مافەکانی مرۆڤ بە شێوەییێك، کە نابێ دەسکاری بکرێن بەراوردی بکەیت.

(٥) ئەو شێوە بیرکردنەوە (ئەخلاق)یە لە بنیادنانی سیاسی دەوڵەتدا، بە بێ یەك و دوو دەسەڵاتێکی ستەمکاری لێ دەکەوێتەوە، ئەمەش ئەو ئەنجامەیە کە لەم وشەیەوە دەکەوێتەوە کە فەرمانڕەوا وەك (باوك)ێکە بۆ چەند منداڵێکی پێنەگەیشتوو، یان (شوان)ی رانەمەڕێکە، هەر وتەییێکیش لە بارەی هەر شۆڕشێك، یان هەڵگەڕانەوەییێك، یان یاخی بوونێك لە فەرمانەکانی پاشا چەند شتێکی مەحاڵن، یان خەیاڵێکەو هەرگیز نایێتە دی، تەنانەت ئەگەر واشمان دانا کە دەکرێ، ئەمەش دەبێتە ئاژاوەگێڕی و مانگرتن، بۆیە عەرەب دەڵێن: (چل ساڵ پاشاییێکی زۆردار فەرمانڕەوایەتیت بە سەردا بکات، لە خەم ساردی ساتێکی دارو دەستە باشترە، چونکە دارو دەستەی بێ پاشا وەك ماڵێکە کە چرای تێدا نەبێ.. ئەو کاتەش مار و مشك و دووپشك دێنە دەرەوە و بەو ناوەدا بڵاو دەبنەوە).!! خەڵکیش (بە بێ پاشا وەك نەهەنگی ناو دەریایان لێ دێ گەورەکان بچووکەکان قووت دەدەن. هەر کاتێك ئەگەر پاشاییێکی بە هێزیان نەبێ کارەکانیان رێك ناکەوێ و ژیانیشیان راستەڕێ نابێ و چێژ لە ژیانی خۆیان وەرناگرن..)[٤٠٢]. لێرەدا تۆ دەتوانی تێبینی ئەوە بکەیت کە بە شێوەییێکی بەردەوام ئەوان تاکەکانی مرۆڤیان بە ئاژەڵ چواندووە: کە هەندێك جار بە دڕندەی ترسناك و هەندێك جاریش بە ئاژەڵی ژەهراوی و زیانبەخش، یان بە مشك و جورجیان چواندوون، لە باشترین حاڵەتەکانیاندا بە رانە مەڕ چوێندراون کە ناتوانێ خودی خۆی بەڕێوە ببات، بە مانا تازەکەی ئێستامان، واتە دیموکراسی سوودی بۆیان نابێ.. ئەم جۆرە دەربڕینانە هەتا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ لە ولاتی ئێمەدا دەوترێنەوە. با جارێکی تریش ئەم چیرۆکە بخوێنینەوە کە لە مێژوودا زۆر وتراوەتەوە و دەوترێتەوە و مانایێکی گرنگیش دەبەخشێ: ـ (رۆژێکیان (ئەبو موسلیمی خوراسانی) لە (معاویە) چوە ژوورەوە و گوتی: (سلاوی خوات لێ بێ ئەی کرێکار) پێیان گوت (بڵێ سلاوت لێ بێ ئەی ئەمیر) دیسان گوتی: (سلاوت لێ بێ ئەی

---

٤٠١ - لەوانەیە ئەمە وامان لێبکات کە هەڵوەستەییێك بکەین و نەختێك بە کەلەپوری رابوردوومان‌دا بچینەوە، بە تایبەتی لە بوارە سیاسیەکەیدا، چونکە ئیستا پێداهەڵدان بە سەرکەوتنە کۆنەکان، کە ئێستا تۆزی لە سەر نیشتووە، گران دەبیسترێن.!

٤٠٢ - ئەبو بەکر ئەلتەرتوشی (سراج الملوك) لـــ ٤٧ ـــ سەرچاوەی پێشووتر.

کرێکار) پێیان گوتەوە بڵێ (ئەی ئەمیر) بۆ جاری سێیەمیش هەمان شتیان لێ دووبارە کردەوە. ئینجا لە وەڵامدا گوتی تۆ تەنها کرێکارێکی لەلای خودا کار دەکەیت و تۆی بۆ ئەو مەڕانە بە کرێ گرتووە بۆ ئەوەی ئاگات لێیان بێ. ئەگەر تۆ گەڕو گولەکەیانت دڵخۆش کردو نەخۆشەکانیانت تیمار کرد و یەك بە یەك بە سەریانت کردەوە، ئەو کاتە خاوەن کارەکەت کە خودایە رۆژانەکەت بە تەواوی دەداتێ... ئەگەر نا خاوەن کارەکەت سزات دەدات.)[٤٠٣].

**(٦)** ئەگەر وەك پێش ئێستاکە بە شێوەیێکی (ئەخلاق)یانە لە فەرمانڕەوا بڕوانین، ئەم شێوە تێڕوانینە وای لێدەکات کە فەرمانڕەوا لە (سەرووی) یاساکانەوە بێت ـ ئەمە ئەگەر هەر خودی خۆشی یاسا و ناوبژیوان و دادوەر و دەسەڵاتی جێبەجێکردن و...هتد نەبێ ـ کەی شتی وا بووە کە یەکێك بە پێی ئەو پێناسەیەی سەرەوە خۆی لە سەرووی یاساکان و ئادەمیزادەوە بێ، ئینجا بێت و گوێڕایەڵی ئەو یاسایانە بێت کە مرۆڤ دایڕشتوون؟!، بۆیە دوا مەرجەع، کە ئەو بۆی بگەڕێتەوە تەنها (ویژدانی) خۆیەتی. ئینجا ئەو ویژدانە لەرووی مرۆڤایەتیەوە بێت، یان لەرووی ئاینییەوە بێ، کە ئەگەری دووەمیان زۆر زیاترە ـ لەبەرئەوەی زۆربەی کاتەکان ـ دەبێ لە خوا بترسێ و (تەرازووی دادپەروەری خوا لە زەویدا دابنێ) و (بەشێوەیێکی دادپەروەرانە حوکمڕانی بکات) کە لە مەیاندا تەنها پەنا بۆ (ویژدانی) خۆی دەبات، نەك بۆ ئەو یاسایانەی کە دانراون.

لە پێش ئێستاکەشدا باسمان کردووە کە دادوەرێك ناوی ـ کەلیرند هاند ـ ە بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی (هۆڵمز)ی سەرۆکی دادگای باڵای دەگەیاندە دادگا و لە رێگا داوای لێکرد کە بە شێوەیێکی دادپەروەرانە لەنێوان خەڵکیدا دادوەری بکات، بەڵام لەبەرئەوەی سەرۆکی دادگای باڵا پیاوێکی زیرەك بوو و لە کارەکەی خۆیدا شارەزا بوو، لە وەڵامدا بە توندی گوتی: ئەمەپێوەندی بە منەوە نییە، بەڵکو کاری من تەنها ئەوەیە کە بە پێی ئەو یاسایانە بڕیار بدەم کە دانراون.[٤٠٤] ئەم شێوە بۆچوونانە لە بارەی (ئەرکەکانی فەرمانڕەوا) بوو وای لە (خدێوی تۆفیق) کرد کە بە عورابی پاشا بڵێ: ـ (ئێوە هەمووتان کۆیلەی ئەو چاکانەن کە لەگەڵ ئێوەدا کردوومانە)!. لەمجۆرە بڕیارانەدا هاوڵاتیان لە بەردەم فەرمانڕەوادا هیچ (مافێکی سروشتی)یان نابێ، بەڵکو ئەمانە هەمووی وەك

---

٤٠٣ - د.محەمەد فاروق ئەلنەبهان (نظام الحكم فی الاسلام) لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی کوێتە ساڵی ١٩٨٧ لـ ـ٤٠.

٤٠٤ - لە گەڵ کتێبەکەی د. مولحیم قوربان (قضايا الفكر السياسى : العداله) لــ٣٦٠ــ، دەزگای زانکۆ بۆ لێکۆلینەوە و بڵاوکردنەوە و دابەشکردن ساڵی ١٩٩٢ بەراوردی بکە.

دەستی چاکە درێژکردن بۆ خەڵکی و کاری چاکەکردن تەنها چەند ئەرکێکن بۆ ئەخلاقی ئەو فەرمانڕەوایە دەگەڕێتەوە، بۆیە خدێوی لە خۆبایی هیچ کاتێك بیری لەوە نەدەکردەوە کە ڕۆژێك دابێ کۆیلەکان لە دژی ئەو کەسە ڕاپەڕن کە چاکەی بەرامبەریان کردووە و ئەو دەستە بگەزن کە خێر و چاکەی بەرامبەریان ئەنجام داوە.

**(٧)** ئەگەر بێت و (ویژدان) ـ ئینجا لە رووی مرۆڤایەتیەوە بێ، یان ئاینی ـ پرسێکی (ناوەوەی) کەسەکەیە، چونکە رێکخستنی سیاسی کە گرنگی بە هەڵسوکەوتە دەرەکییەکانی خەڵکی دەدات ـ ئەوەندە گرنگی بە ویژدان نادات، یان بڵێ لە بنیادی دەوڵەتدا لە پلەی یەکەمدا داینانێ، چونکە کێشەی فەرمانڕەوا کە دەچێتە بەهەشت، یان فڕێ دەدرێتە دۆزەخ، ئەمە تەنها کێشەی فەرمانڕەواکە خۆیەتی، بەڵام ئەوەی کە بۆ من گرنگە وەك هاوڵاتییێك ئەوەیە، کە ئەو با لەبەر ترسی خوا دادپەروەر نەبێ و ویژدانی خۆی نەکاتە پێوانە بۆ هەڵسەنگاندنی شتەکان ـ بەڵکو با وەکو من یاساکانی وڵاتی بە سەردا بسەپێ و لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێ نەك لە رۆژی قیامەتدا لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێ، بەڵکو لە سەر دونیادا وەك چۆن سزا دەدرێم ئەویش بە هەمان شێوە لە سەر کارە خراپەکانی سزا بدرێ.[٤٠٥]

**سێیەم:** بنچینەی سێیەمی بنیادی دەوڵەت، یان هەر رێکخستنێکی سیاسی بە رەزامەندی ئەو تاکانە دەبێ، کە خاوەن بەرژەوەندی یەکەمن لە دروستکردنی ئەو رێکخستنە سیاسیەدا، ئەگەر مافە سروشتییەکانیان بپارێزرێت، کە هەندێك لەو مافانە ناکرێ دەسبەرداری بن، وەك ئازادی و مافی ژیان و موڵکدارێتی...و هتد.. بەڵام هەندێك مافیش هەیە دەکرێ ـ یان دەبێ تاکەکان دەسبەرداری بن ـ وەك، مافی بەرگریکردن لە موڵك ومالْ و بەرگری لە خۆکردن بە شێوازە تایبەتییەکانی مرۆڤەکە خۆی کە هەموو رێگاییێك بگرێتە بەر بۆ بەرگری لە خۆکردن و بەر بەو زەرەرو زیانانە بگرێ کە خەڵکانی تر لە دژیدا ئەنجامی دەدەن ـ ئەو مافەش کە پێشتر تۆماس هۆبز دەسنیشانی کردبوو ـ کە تاك چیتر لەناو رێکخستنی سیاسیدا ناتوانێ ئەو مافە بە خۆی بدات، بەڵکو دەبێ دەسبەرداری ئەو مافە بێت بۆ دەسەڵاتی سیاسی بۆ ئەوەی ئەو پیادەی بکات. ئەگەر چی دەستبەرداربوونی تاك لەو مافە پەیوەستە بە پاراستنی ئەو کەسە لەلایەن دەسەڵاتەوە

---

٤٠٥ - ئایا دەکرێ ئێمە بە دز و جەردە و پیاو کوژەکان...و هتد بڵێین تا رۆژی قیامەت وازتان لێ دێنین ؟ ئەگەر وەڵامەکەی (نەخێر) بێ کەواتە نابێ وا بە فەرمانڕەواش بڵێین !!.

لەهەر دەستدرێژییێك كە بكرێتە سەری، یان هەر پێشێلكردنێكی مافەكانی ئەو تاكە لەلایەن كەسانی ترەوە.

(ئەگەر چی زانایانی یاسا دەستوورییەكان ناویان لە دەسەڵاتەكانی فەرمانڕەوا ناوە، دەسەڵاتەكانی سەرۆكی دەوڵەت، بەڵام بیرمەندەكانی ئیسلامی سیاسی بەو ناولێنانە رازینین وپێیان وایە كە گوزارشت لە مانای تەواوی كارەكانی فەرمانڕەوا ناكات، لە دیدی ئەواندا دەبێ ناوی لێ بنێن (ئەركەكانی خەلیفە)، چونكە لە دیدی ئیسلامدا كاری خەلیفە ئەمانەت و بەرپرسیارێتیە. ئەو كەسەش، كە ئەو ئەمانەت و بەرپرسیارێتیە لە ئەستۆ دەگرێ، دەبێ بە شێوەییێكی دروست بەو ئەركانە هەڵبستێ كە پێی سپێردراوە..)[406].

لە ئیسلامدا هیچ دەسەڵاتێك نەدراوەتە فەرمانڕەوا، یان خەلیفە، بەڵكو خەلیفە چەند ئەركێكی پێسپێردراوە، كە دەبێ پێیان هەڵبستێ. لە كۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەر هەموو تاكەكان چاودێرن بە سەر فەرمانڕەواو والییەكان و وەزیرەكانەوە، هەروەها لە كۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەر تاكێك بۆی هەیە رەخنە لە هەڵسوكەوتەكانی فەرمانڕەوا بگرێ[407].

(هەروەها لە دوای چەند دێریكدا دەڵێ: ئەگەر چی ئیسلام ئەوەی بە سەر خەڵكیدا سەپاندوە، كە دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا بن، بەڵام ئەو گوێڕایەڵیەی بە چەند مەرجێكەوە بەستۆتەوە، ئەویش ئەوەیە، كە نابێ فەرمانەكانی خەلیفە لەگەڵ شەریعەتدا پێچەوانەبێت)[408].

**چوارەم: ـ** ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو رێكخستنە سیاسیەی، كە لەسەر پاشماوە وكۆتەڵی (حاڵەتە سروشتی)ەكە دروست دەبێ، رەگ و ریشەی خۆی لەسەر مافەكانی تاكەكانی سروشتدا دادەكوتێ، هەروەها مانەوە و شەرعیەتی خۆشی لەوەوە وەردەگرێ. بەمشێوەیە دەبینین هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێكردن كە دەوڵەتە، یان (رێكخستنی سیاسیە) بۆ پاراستنی مافە سروشتییەكانی تاك بەكاردەهێنرێن، وەك: پاراستنی ژیان و موڵك ماڵەكانیان...و هتد. ئەمەش تەنها دەسەڵاتێكی سروشتی هەموو مرۆڤێكە، كە دەیداتە دەست فەرمانڕەواوە لەبەرئەوەی ئەمە بە باشترین شێوە دەزانێ بۆ پاراستنی ئەو مافانە: ئەمەیان زۆر لەوە چاكترو باشترە كە هەر تاكێك لە جێگەی خۆیەوە بە شێوەییێكی سروشتی كە ئەنجامەكەشی مسۆگەر نییە پارێزگاری لە

---

٤٠٦ - د. فاروق ئەلنەبهان (نظام الحكم في الاسلام ) لە بڵاوكراوەكانی زانكۆی كوێت ساڵی ١٩٨٧ لـــ ٤١ ــــ.

٤٠٧ - سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەڕە.

٤٠٨ - سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەڕە.

مافەكانی خۆی بكات، كە لەوانەیە لەكاتی دابینكردنی ئەو مافانەدا هەندێك جار سەركەوتن بە دەست بهێنێ و هەندێك جاریش بە پێچەوانەوە دەبێ. ئەو پەیمانەی لەگەڵ فەرمانڕەوادا دەیبەستێ ئەو (پەیمانە رەسەنەیە) كە خەڵكی بە هۆیەوە لە (یەك كۆمەڵگادا كۆ بوونەتەوە): (ئەمەش تەنها پێكهاتنێكە لە سەر یەككگرتنەوە لەناو یەك كۆمەڵگەی سیاسیدا، ئەمەش ئەو شتەیە، كە دەبێ بیكەن ـ كە تاكەكان لەنێوان خۆیاندا لەسەر ئەوە پێك دێن دەوڵەتێك بۆ خۆیان پێكەوە بنێن)[٤٠٩].

هەروەها نەك تەنها ئەوەی كە كۆمەڵگە دەجوولێنی رەزامەندی تاكەكانە، بەڵكو بۆ ئەوەی هەر كۆمەڵگەیێك ـ كە یەك دەستە جەمعیە ـ ئەگەر بیەوێ بە رێگاییێكدا بڕوا، دەبێ ئەو دەستەیە بەرەو ئەو رێگایە بجوولێ كە هێزە گەورەكە وای لێ دەكات ئەو رێگەیە بگرێ، كە ئەویش رەزامەندی زۆرینەی خەڵكیە[٤١٠].

پێنجەم : لەمەدا دوو دەسەڵات دروست دەبن، كە ئەمانەی خوارەوەن: ـ

١ـ دەسەڵاتی یاسا دانان: ئەو یاسایانە دادەڕێژێ، كە كۆمەڵگە رێكدەخات و پارێزگاری لە مافی تاكەكانی ناو ئەو كۆمەڵگەیە دەكات.

٢ـ دەسەڵاتی جێبەجێكردن: ئەو یاسایانەی سەرەوە لە ناو كۆمەڵگەدا جێبەجێدەكات[٤١١].

لەبەرئەوەی دەسەڵاتی یاسادانان گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، چونكە ئەو دەسەڵاتەیە، كە یاسا دادەڕێژێ، بۆیە یەكەم شت دەبێ ئەو دەسەڵاتە لە دەسەڵاتی جێبەجێكردن جیا بكرێتەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر بێت و هەردووكیان بە یەكەوە بە دەست یەك دەسەڵاتەوە بن، دەبێتە هۆی خراپ بەكارهێنانی. دووەم شت دەبێ ئەم دەسەڵاتە، واتە (دەسەڵاتی یاسادانان) چەند خەسڵەت و مەرجێكی تایبەت بە خۆی هەبێ، كە دەبێ پارێزگاریان لێ بكرێ كە ئەمانەن: ـ

---

٤٠٩ - جۆن لۆك (في الحكم المدني) بڕگەی٩٩. هەروەها تەماشای كتێبەكەی جۆرج سباین (تطور الفكر السياسي) بكە كتێبی سێیەم، لە وەرگێڕانی د. رەشاد ئەلبەڕاوی لـ٧١٢ ـ دار ئەلمەعاریف لە میسر.

٤١٠ - جۆن لۆك (في الحكم المدني) بڕگەی ٩٦. هەروەها تەماشای كتێبەكەی جۆرج سباین (تطور الفكر السياسي) بكە كتێبی سێیەم، لە وەرگێڕانی د. رەشاد ئەلبەڕاوی لـ٧١٣ ـ دار ئەلمەعاریف لە میسر.

٤١١ - جۆن لۆك دێت دەسەڵاتێكی تری دەخاتە سەر، كە ئەویش دەسەڵاتی (كۆنفیدراڵی)ە و گرنگی بە پێوەندییەكانی دەرەوە دەدات، وەك: بەستنی هاوپەیمانێتی و پێكهاتن و شەڕ و ئاشتی، بەڵام لەلاییێكەوە ئەوەندە لەلای ئێمەدا گرنگ نییە، لەلاییێكی تریشەوە ئەمە بە دەسەڵاتی جێبەجێكردنەوە بەستراوەتەوە.

١ـ ئەم دەسەڵاتە نابێ لە بەرامبەر گەلدا توندو تیژ بێ، چونکە گەل خۆی ئەم دەسەڵاتەی دامەزراندووە، بۆیە نابێ یاسایێك دابڕێژێ کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەودا یەکنەگرنەوە، هەروەها ناشبێ بە هیچ شێوەیێك ڕێگە لە هیچ مافێك لە مافەکانی گەل بگرێ، هەروەها نابێ لە لایەن هیچ کەسێك لەو کەسانەی، کە دایانمەزراندووە دەستی بە سەردا بگیرێ، بەڵکو دەبێ لە ناخی زۆرینەی خەڵکییەوە هەڵقوڵابێ و ڕەزامەندی ئەوانی لە گەڵدابێ.

٢ـ لەبەرئەوەی دەسەڵاتی یاسادانان لەلایەن خەڵکییەوە هەڵبژێردراوە، نابێ بۆ داڕشتنی یاساکان کەسانێکی تر لە جیاتی خۆیان دابنێن.

٣ـ دەبێ هەمیشە دەسەڵاتی یاسادانان جێگەی باوەڕی خەڵکی بێت و نابێت هەڵسوکەوتێك بکات، کە پێچەوانەی ئەو باوەڕە بێت، چونکە گەل لەو حاڵەتەدا ئەو مافەی هەیە، کە ئەوانە لابدات و بە خەڵکانێکی تر بیانگۆڕێتەوە لەبەرئەوەی خۆی خاوەنی تەواوی دەسەڵاتەکانە.

٤ـ ئەگەر بە ویست و ڕەزامەندی خۆیان نەبێ، نابێ موڵکی تایبەتی هیچ تاکێك زەوت بکات و لێیان بستێنێ، چونکە دەبێ بە شێوەیێکی بەردەوام مافی موڵکدارێتی وەك مافە سروشتییەکانی تر بە مافێکی پیرۆز تەماشا بکرێ، کە دەستکاری ناکرێ.

٥ـ بە پێچەوانەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن، کە دەبێ بە شێوەیێکی بەردەوام بوونی هەبێ بۆ ئەوەی یاساکان جێبەجێ بکات، دەسەڵاتی یاسا دانان دەسەڵاتێکی کاتییە، واتە بۆ کاتێکی دیاریکراو داندراوە، ئەگەرچی هەموو کاتێك پێویست بەوە ناکات یاسا دابڕێژرێ، بەڵام دەبێ بە شێوەیێکی بەردەوام دەستەیێکی جێبەجێکار، کە (حکومەت)ە بوونی هەبێ بۆ ئەوەی بتوانێ یاساکان بخاتە چوارچێوەی جێبەجێکردنەوە.

**شەشەم:** ئازادییەکانی بیرو باوەڕ: ـ ئەم ئازادییە ـ بەشێکە لە ئازادییە گشتییەکان، کە یەکێکە لە مافە سروشتییەکانی هەر تاکێك ـ لێرە ئەمە بۆ هەموو تاکێك وەکو یەك دەستەبەرکراوە، هەروەها کڵێساو هەر دەزگاییێکی تری ئاینی بۆی نییە هیچ کەسێك بەهۆی باوەڕی ئایینەوە بچەوسێنێتەوە، چونکە پێوەندییەکانی هەر تاکێك بە کڵێساوە وەك پێوەندی هەر تاکێك وایە بە سەندیکاییێك، یان یانەییێکەوە، سەندیکاش بۆی نییە کەس بچەوسێنێتەوە، بەڵکو ئەگەر یەکێك لە ڕێنماییەکان لابدات، یان لە سنووری بنەماو ڕێکخستنەکانی ئەو دەرچێ تەنها ئەو مافەی هەیە کە لە سەندیکا دووری بخاتەوە. هەروەها دەوڵەتیش بۆی نییە لەسەر بیرو ڕای جیاواز، یان بە هۆی ئایینەوە کەس بچەوسێنێتەوە. ئەگەر کڵێسا ئەو مافەی نەبێ ـ کە دەسەڵاتێکی ئاینییە لە ناو دەوڵەتدا ـ وا چاکترە کە حکومەتیش ئەو مافەی نەبێ ـ کە دەسەڵاتێکی مەدەنییەـ

چونکە ئازادی بیروباوەڕ ناکرێ بچێتە بن رکێفی هیچ کەس و لایەنێکەوە، ئینجا ئەو کەس و لایەنە هەر چییێك بێت. هەر بەو پێیەش دەوڵەت بۆی نییە کەس لەسەر بیروباوەڕێکی دیاریکراو ناچار بکات و ناشبێ دەس بخاتە شێوەی خواپەرستی و مەزهەبی هیچ کەسێکەوە. هەروەها نابێ پشتگیری لە مەزهەبێك بکات و یەکێکی تر پشتگوێ بخات، چونکە هەر چەندی مەزهەبێك لە مەزهەبە ئایینییەکان لە راستیەوە نزیکتر بێ، ئەوەندە کەمتر پێویستی بە یارمەتی دەوڵەت دەبێ. سەرەڕای ئەمانەش زانستە مرۆڤایەتییەکان سنوورەکانی بەر تەسکن و ئەگەری ئەوە زۆرە، کە هەڵەی تێدا بکرێ، بە تایبەتی لە کاروبارە رۆحییەکاندا ـ بە رادەیێك کە نەتوانین پێداگری لەو شتانەدا بکەین، کە پێوەندی بە بیروباوەڕە ئایینییەکانمانەوە هەیە بتوانین بڕیارێکی کۆتایی بدەین کە بیروباوەڕەکەی ئێمە راستن و بیروباوەڕەکانی تر هەڵەن، بۆیە ئەگەر بێت و ئێمە نەتوانین لە زانستە رۆحییەکانماندا بگەینە باوەڕێکی پتەو و تەواو، شتێکی گێرە شێوێنییە ئەگەر خەڵکانی تر لەبەرئەوەی، کە نەهاتوونەتە سەر بیرو باوەڕەکەی ئێمە سەرکۆنەیان بکەین.

ئەنجامە مەنتیقیەکەش ئەوەیە، کە دەبێ (لێبوردنی ئاینی) هەبێ، چونکە ئەقڵ ئەمەمان بە سەردا دەسەپێنێ وەك چۆن ئازادی بیروباوەڕی تاکی سەپاندووە (هەروەها دەبێ ئەقڵ رێنیشاندەرو ناوبژیوانیشمان بێ)[٤١٢]. هەروەکو ئاینیش ئەمەمان وەك واقیعێك بە سەردا دەسەپێنێ، ئاینی مەسیحی ئاینێکە لەسەر خۆشەویستی و لێبوردەیی دامەزراوە[٤١٣]. تۆ دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ وتارەکەی شاخ بۆ ئەوەی وتە روون و ئاشکراکانی مەسیح کە لەو بارەیەوە گوتویێتی بخوێنیتەوە:

---

٤١٢ - جۆن لۆك (مقال عن الفهم البشری)، بڕگەی ١٤.

٤١٣ - ئەو ئایەتانەی ناو قورئانی پیرۆز کە لەبارەی لێبوردەیی دەدوێن لە بوارەکانی عەقیدەدا لە ژمار نایەن (لست علیهم بمسیطر): الغاشیە /٢٢ )،واتە دەسەڵاتت بە سەریاندا ناشکێ،(فمن شاء فلیؤمن ومن شاء فلیکفر) : الکهف/ ٣٩) واتە : ئەوەی ئارەزووی لێیە با باوەڕ بێنێ، و ئەوەی ئارەزووشی لێ نییە با باوەڕ نەهێنێ. (ولو شاء ربك لآمن من في الارض كلهم جميعا) :یونس / ٩٩) واتە : ئەگەر خواکەی تۆ بیەوێ ئەوەی لەسەر روی زەویە هەر هەمووی باوەڕ دەهێنێ. (أفأنت تکره الناس حتى یطڕدونوا مؤمنین) :یونس / ٩٨ ) واتە : ئایا تۆ دەتەوێ بە زۆر خەڵکی ناچار بکەیت باوەڕ بە خوا بێنن..؟ لێرەوە بە روونی بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو چەوساندنەوە ئاینیانەی کە بە درێژایی مێژوو لە حوکمڕانێتیە خراپەکانی خەلیفەکانەوە بۆمان ماوەتەوە، چونکە ئیسلامی لێبوردە هیچ پێوەندیێکی بەجۆرەکانی ئەو چەوساندنەوەو ئەشکەنجەدانانەوە نییە، کە خەڵکی بە درێژایی مێژووی ئیسلام تاوەکو رۆژگاری ئێستا چەشتویانە.

(گوێتان لەوە بووە، کە دەیانگوت دۆستەکەی خۆت خۆش دەوێت و رقت لە دوژمنەکەت دەبێتەوە، بەڵام من پێتان دەڵێم: ئێوە دوژمنەکانی خۆتان خۆش بوێ، هەروەها پیرۆزباییش لەو کەسانە بکەن، کە نەفرەتتان لێ دەکەن و چاکەش بەرامبەر ئەو کەسانە بکەن کە رقیان لێتان دەبێتەوە، دوعای خێریش بۆ ئەو کەسانە بکەن کە خراپەتان لەگەڵدا دەکەن و دەرتان دەکەن. بۆ ئەوەی ببن بە کوڕی ئەو باوکەی کە لە ئاسمانەکاندایە، چونکە ئەو تیشکی خۆرەکەی خۆی وەك یەك بە سەر شەڕخوازەکان و پیاو چاکەکاندا دابەش دەکات و بارانیش بە سەر ستەمکارو دادپەروەراندا دەبارێنێ..)[414]. باشە ئەمە چۆن لەگەڵ چەوساندنەوەی خەڵکیدا دەگونجێ لە پێناو بیرو باوەڕەکانیاندا..؟

دەبێ ئێمە کۆتایی بە گفتوگۆکانی خۆمان بێنین لەگەڵ (جۆن لۆك)دا، تاوەکو باسی ئەو شتانە بکەینەوە کە پێشتر لە شوێنێکی تردا باسیمان کردووە [415]. ئێمە لێرەدا کۆمەڵێکی گەورەی ئەو پرەنسیپە بنچینەییانەی، کە لە دواییدا پشتگیریان لە کاروانی دیموکراسی کردووە دەخەینەڕوو کە ئەمانە هەندێکیانن: ـ

١ـ خەڵکی هەر هەموویان ئازادن، هەروەها لە مافەکانی ئازادیشدا یەکسانن.

٢ـ مافە سروشتییەکان پیرۆزن، چونکە پاداشتی هیچ کەسێك نییە، بەڵکو خەسڵەتێکی جەوهەری خودی مرۆڤ خۆیەتی.

٣ـ خەڵکی هەر هەموویان یەکسانن، هیچ چینێك و پلەو پایە و گروپێك لەنێوان مرۆڤدا نییە: چونکە دابەشکارێك و بەڕێوەبەرێك و پاسەوانێك و وەزیرێك...و هتد، هەر هەموویان مافیان وەکو یەك هەیە و لە ژێر باری یەك یاسادان، هەروەها فەرمانڕەواش لە چینێك نییە، کە لەگەڵ مرۆڤدا جیاواز بێ، بەڵکو تاکێکە لەوان و دەچێتە ژێر باری هەمان یاساوە.

٤ـ دەسەڵاتە سیاسییەکان لەسەر بنچینەی ئەو گرێبەستەدا دروست بووە، کە بە رەزامەندی هەردوو لایەنی گرێبەستەکە مۆر کراوە، بۆیە کەس بۆی نییە بە زۆرداری دەسەڵات بۆ خۆی قۆرخ

---

٤١٤ - ئینجیلی مەتی (الاصحاح الخمس) :٤٣ ـ ٤٦).

٤١٥ - تەماشای کتێبی (الطاغية : دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي )لـ ٢٩٦ـ چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵ ١٩٩٧.

بکات، ئەگەر نا دەبێتە کەسێکی دارگیرکەر (داگیر کردنیش دەست بە سەرداگرتنی شتێکە کە مافی یەکێکی ترە و بۆ خۆی بیبات)[٤١٦].

٤١٦ - جۆن لۆك (فی الحكم المدنی) بڕگەی ١٩٧.

# دەروازەی حەوتەم

## (ئەزموونەکانی دیموکراسی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا)

**(پرەنسیپەکانی دیموکراسی خۆی لە خۆیدا چەند راستییێکی روون و ئاشکران ، چونکە خۆیان لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤدا چڕ دەکەنەوە ..)!**

**(توماس جیفرسون)**

## پێشەکی:

لە چوار بەشی ئەم دەروازەیەدا لەبارەی ئەزموونەکانی ولاٌتە پێشکەوتووەکان لە بواری دیموکراسیدا لە رۆژئاوا و هەروەها لە رۆژهەلاٌتیشدا وەك: ئینگلتەرا و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، و فەرەنسا و ژاپۆن هەندێك نموونەتان دەخەینە بەر دەست. لەگەلٌ خستنەرووی چەند تێڕوانینێکی ئەو مێژووەی، کە پەردەمان بۆ لەسەر (دیموکراسی لیبرالی) هەلٌدەداتەوە لە هەر یەکێك لەو ولاٌتانە کە وردە وردە لەژێر گوشاری ئەو گەلانەدا دروست بوونە و هاتوونەتە کایەوە، کە ململانییێکی توندو تیژ وتالٌیان لەگەلٌ فەرمانڕەواکانیاندا دەست پێکردبوو بۆ گێڕانەوەی ئەو مافە سروشتیانەی کە لێیان زەوت کرابوو، ئینجا دوای ئەوەش ئەو گەلانە چۆن بەرەو پێشکەوتن و شارستانییەت هەنگاوی سەرکەوتوانەیان هاویشتووە.

دوای ئەوە لەو نموونانەدا دەبینین چۆن توانیان ئەخلاق لە سیاسەت جیا بکەنەوە، کە بووە یەکەم بنچینەی بنیادنانی ئەو دەولٌەتەی کە تیایدا مافەکانی خەلٌکی بە چاوێکی پیرۆز تەماشا بکرێ و نەتوانرێ دەستکاری بکرێن، چونکە خۆی لە بنەڕەتدا پاراستنی ئەو مافانە و بوار رەخساندن لە بەردەم تاکەکانی گەل بۆ پیادەکردنی ئەو مافانە کاری دەولٌەتە. ئیتر لەمەودوا ئەو سیستەمە نەما کە پێکهاتەی دەولٌەت لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێ بکات، ئیتر ئەوەش نەما، کە فەرمانڕەوا وەك (دلٌ)، یان (سەر)، یان (رۆح)، یان (چرا)... و هتد بێ بۆ خەلٌکەکەی خۆی.. بەلٌکو تەنها هاولاٌتییێکی سادەیە وەك هاولاٌتییەکانی تر و ئەویان هەلٌبژاردووە بۆ ئەوەی لەرێگەی نوێنەرەکانییەوە بە چەند کارێکی تایبەت هەلٌسێ و هاولاٌتیانیش چاودێر بن بە سەریەوە: (ئیتر ئەوە بە سەر چوو، کە خۆشگوزەرانی لە سایەی بەرزڕاگرتنی پاشاکان وگوێڕایەلٌبوون بۆیان بێتە دی) وەك ئەوەی ئیبن ئەبی رەبیع لە (سلوك المالك)دا باسی کردووە، بەلٌکو ئێستا خەلٌکی دەتوانن فەرمانڕەواکان وەك هەر هاولاٌتییێکی تر بەرەو رووی دادگاکان بکەنەوە و لێکۆلٌینەوەی لەگەلٌدا بکەن، تەنانەت دەتوانن ناچاری بکەن دەست لە کارەکەشی بکێشێتەوە: وەك ئەوەی لەگەلٌ (سەرۆك نیکسۆن) دا کردیان، هەروەها لەگەلٌ (کلینتۆن)یشدا ئەمە روویدا و ئەوەندەشی نەمابوو کە لەسەر کار لایبدەن ـ هەروەها ئەمە لەگەلٌ (تاناکا) شدا روویدا لە ژاپۆن...و هتد. ئەو رۆژە نەما کە تاکە ئەرکی هاولاٌتیان

تەنها (جێبەجێکردنی فەرمانەکانی فەرمانڕەوا بێ)، بەڵکو هاوڵاتیان خۆیان یەکەم خاوەنی بەرژەوەندییەکانن لە دروستکردنی دەوڵەتدا: ئێستا شتەکان پێچەوانە بوونەتەوە فەرمانڕەوا دەبێ گوێ بۆ داواکاری و پێداویستییەکانی خەڵکی بگرێ و جێبەجێیان بکات و ئارەزوەکانیان بێنێتە دی، ئەگەر نا بۆ جاری دووەم ناچێتەوە سەر کورسی دەسەڵات.

هەروەها ئەو رۆژەش بە سەرچوو کە دیموکراسیەت مەرجەکانی، پیاوچاکی و بێخەوشی بۆ فەرمانڕەوا دابنێ، بەڵکو دەبێ وەك هەر هاوڵاتییێکی تر پابەندی یاساکانی وڵاتەکەی خۆی بێ: چونکە هەرکاتێك پێشێلکارییێکی گەورەی یاسا، یان دەستوور روویدات: ئەنجامەکەی زۆر خراپ دەکەوێتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەی، کە یاساکەی پێشێل کردووە سەرۆکی دەوڵەتیش بێ.. بەمشێوەیە لە بەشەکانی داهاتوودا باشتر تێی دەگەین.

### یەکەم: کورتەییك لە مێژووی دیموکراسیەت لە ئینگلتەرادا: ـ

بۆ ماوەییێکی دوور و درێژ لە مێژووی ئینگلتەرا دەسەڵاتێکی رەها حوکمی تێدا دەکرد و پاشا پشتی بەوە دەبەست، کە پێیان دەگوت (لەلایەن خوداوە پێی بەخشراوە) divin right of kings ـ لەبەرئەوەی ئەو دەسەڵاتانە لەلایەن خوداوە بە پاشا بەخشرابوون، تەنها خۆی خاوەنی هەموو دەسەڵاتەکان بوو و بە ناوی خوداوە فەرمانڕەوایەتی دەکرد. لەکارەکانیشیدا تەنها خودا بۆی هەبوو لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات، بگرە تەنانەت دوای پێکهێنانی ئەو ئەنجومەنەی کە پێیان دەوت ئەنجومەنی پاشا، Kings Council، یان ئەنجومەنی شورا Witan – ئەم ئەنجومەنە بەهیچ جۆرێك بۆی نەبوو لە دەسەڵاتەکانی پاشا کەم بکاتەوە، بەڵکو تەنها دەسەڵاتی ئەوەی هەبوو، کە چەند ئامۆژگارییێك پێشکەش بە پاشا بکات[417]. تەنانەت ئەگەر پاشا داوای لێنەکردبایە نەیدەتوانی هیچ ئامۆژگارییێکیش پێشکەش بە پاشا بکات. ئەو ئەنجومەنە لەسەر داوای پاشا پێك دەهات و هەر لەسەر داواکاری ئەویش کۆبونەوەکانی ئەنجام دەدا و هەر کاتێکیش پاشا ئارەزووی لێبوایە کۆتایی پێی دەهێنا. بە کورتییەکەی ئەو ئەنجومەنە هیچ رۆڵێکی نەبوو، تەنها یارمەتیدەرێك بوو بۆ پاشا کە لەسەر تاکڕەویەکەی خۆی بەردەوام بێ، یان رەهاکردنی دەسەڵاتەکانی پاشا بوو لەناو وڵاتدا (تاکە ئەرکی بنچینەیی ئەو ئەنجومەنە تەنها ئەوەبوو کە ئامۆژگاری لەبارەی ئەو پرسانەی، کە پاشا پێی دەکردن بدەنە پاشا و ئەو فەرمانانە مۆر بکەن کە لەبارەی بەخشینی زەوی وزار بوو بە خەڵکی، یان کلێسا لەلایەن پاشاوە، هەروەها رەزامەندی نیشاندان بوو لەسەر ئەو پرۆژە یاسایانەی، کە پاشا دەریدەکردن، هەروەها لە بەرەنگاربوونەوەی هەڵگەڕاوەکان و ئاشکراکردنی کەسانی گومانلێکراو هاوکاری پاشایان دەکرد، بەڵام

---

٤١٧ - هەمان ئەو بیرۆکەیە لە کلتوری ئێمەشدا دەرکەوت، بەوەی کە ئیمام غەزالی کتێبێك بە ناوی (التبر المسبوك في نصائح الملوك) دادەنێ لە گەڵ ئەوەی کە نە دەتوانێ سنوورێك بۆ دەسەڵاتەکانی پاشا دابنێ و نە هیچ سوودێکیشی هەیە. ئەگەر وا بووایە (نیرۆن) ستەمکارە بە ناوبانگەکەی رۆما گوێڕایەڵی (سینکا)ی فەیلەسووفی (رەواقی) و مامۆستا و بەخێوکەرەکەی خۆی دەبوو. یان ئەوەتە مەلای مزگەوتەکان و قەشەی کلێساکان ئەوەندە گوێیان لە ئامۆژگاری و رێنمایی دەبێ، دەبووایە ئێستا بن بە فریشتە.

پێکهێنان و کاتی دانیشتنەکانی ئەو ئەنجومەنە، ئەمانە دوو شت بوون تەنها ویست و ئارەزووەکانی پاشا دەسنیشانیان دەکرد...)[418]

## دووەم:پەیمانی گەورە، یان (ماگنا کارتا) Magna Carta:

پاشا جۆن (١١٦٧- ١٢١٦) لە ساڵی ١١٩٩ دا لە دوای ریچارد پاشای برای، کە بە (دڵی شێر) ناسرابوو عەرشی پاشایەتی ئینگلتەرای گرتە دەست. ئەمەی دووەمیان، ئەوەندەی باج خستبووە سەر ملی خەڵکی باری سەر شانیانی زۆر قورس کردبوو، ئەو پارەو پوولەی، کە کۆی کردبۆوە هەرهەمووی لە رابواردن و داوەت و ئەو سەرکێشیە دۆڕاوانەی، کە لە شەڕی خاچپەرستەکاندا خەرجی کردبوون. سەرەڕای ئەوەی (جۆن) پاشا هاتە سەر میراتێکی زۆر قورس، بەڵام سڵی لەوە نەکردەوە کە بەردەوامی بداتە وەرگرتنی باجێکی گەلێ زۆر بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو بارە نا ئاسایی و هیلاکیەی کە خەڵکی پێیەوە دەیاننالاند بە تایبەتی خانەدان وپیاو ماقوڵەکان. بەڵکو زیاتر بەرەو زۆرداری وستەمکاری هەنگاوی نا، تەنانەت زۆر رق و کینەکانی خۆی بە پیاوە ئاینییەکان دەڕشت، تا وای لێهاتبوو بە کافر ناویان دەبرد. هەروەها خانەدان و پیاوماقوڵەکانیشی زۆر تووڕە کردبوو، چونکە سەرەڕای ئەوەی باجێکی زۆری لێ دەسەندن سووکایەتیشی پێدەکردن، هەروەها لە داب و نەریت و یاسا کۆنەکانیش لایدابوو. پاشا دەیویست ئەو کێشەیە لەنێوان خۆیی و ئەواندا کۆتایی پێ بهێنێ، هەر لەبەرئەمەش بوو داوای لێکردن، کە لە جیاتی ئەوەی بێن بۆ خزمەتی سەربازی دەتوانن بە پارە خۆیان بکڕنەوە (ئەو سوارچاکانەی کە پاشا لە شەڕەکاندا پشتی پێدەبەستن لەو خانەدان و میرانە بوون)، بەڵام لە جیاتی ئەوەی بێن پارە بدەن و خۆیان بکڕنەوە، شاندێکیان ناردە لای پاشا و داوایان لێکرد، کە بگەڕێتەوە سەر یاسا کۆنەکان کە مافەکانی ئەو پیاو ماقولانەی تێدا دەپارێزرا، هەروەها دەسەڵاتەکانی) پاشاشی تێدا دیاریکراوە. کاتێك کە وەڵامێکی ئەوتۆیان لەلایەن پاشاوە پێنەگەیشتەوە کە دڵیان پێی ئاو بخواتەوە. ئەوان کەوتنە کۆکردنەوەی هێزەکانی خۆیان و لەوکاتەی، کە پاشا جۆن بە سەردان رۆیشتە ئۆکسفۆرد، ئەوان نوێنەریکی خۆیان ناردە شاری لەندەن و ڕەزامەندی حکومەت و دەست و پێوەندەکانی پاشایان بەلای خۆیاندا راکێشا، ئینجا هاتن هێزەکانی خۆیان لەسەر لێواری رووباری تایز بەرامبەر بەو هێزە کەمەی پاشا

---

418 Encyclopedia Britanica.vol,10.p.716 - .

دامەزراند. لێرەدا جۆن خۆی بەدەستەوە دا و لە ساڵی ١٢١٥دا بەڵگەنامەی پەیمانی مەزنی مۆر کرد، کە بەناوبانگترین بەڵگەنامەیە لە هەموو مێژووی ئینگلیزدا[٤١٩].

## بەڵگەنامەکە ئەم خاڵانەی تێدا بوو:-

(لە (جۆن) ی پاشای ئینگلتەراوە و بە چاودێری خودای مەزن.. بۆ هەموو گەورە ئەسقەف، و سەرۆکی دێرەکان و هەڵگرانی نازناوی (ئێرڵ) و گەورە بارۆنەکانی وڵات... و هەموو هاوڵاتییە دڵسۆزەکان.

ئەوە بزانن، کە ئێمە بەم پەیمانەمان لەجیاتی خۆمان و میراتگرەکانیشمان، بۆ هەتا هەتایێ بەڵێنی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەدەین:-

١- کڵێسای ئینگلتەرا ئازادە و کەسێك بۆی نییە دەستدرێژی بکاتە سەرهیچ کام لە ماف و ئازادییەکانی کڵێسا.

٢- ئێمە لە جیاتی خۆمان و میراتگرەکانیشمان و بۆ هەتا هەتایێ، هەموو ئەو ئازادیانەی کە لەخوارەوە نووسراونەتەوە بەهەر هەموو خەڵکە ئازادەکانی ناو شانشینەکەی خۆمان دەبەخشین.

٣- کڕینەوەی سەربازی، یان وەرگرتنی هەر یارمەتییێك تەنها لە دەسەڵاتی ئەنجومەنی گشتیدا دەبێت لە وڵاتدا.

٤- بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی گشتی تایبەت بە خەملاندنی یارمەتی و پارەی کڕینەوەی خزمەتی سەربازی، ئێمە فەرمان دەدەین کە، گەورە ئەسقەف،و سەرۆکی دێرەکان و هەڵگرانی نازناوی ئێرڵ و گەورە بارۆنەکانی وڵات بۆ کۆبوونەوەکە بانگهێشت بکرێن.

٥- ئەگەر بەپێی یاسا نەبێ نابێ هیچ پیاوێکی ئازاد دەسگیر بکرێ، یان بخرێنە زیندانەکانەوە، یان موڵکەکانی لێ زەوت بکرێ، یان لە پاراستنە یاساییەکان بێبەش بکرێ، یان ئەوەتا دوور بخرێتەوە، یان بە هەر شێوەییێك لە شێوەکان ئازار بدرێ...

٦- هیچ کەسیك لە مافە مرۆڤایەتییەکان، یان لە دادپەروەری بێبەش ناکرێ.

---

٤١٩ - ۆل دیورانت (قصة الحضارة) وەرگێڕانی محەمەد بەدران، بەرگی- ١٥ دار الجیل بەیروت ١٩٨٨ ل ١٩٨ و دوای ئەو.

((بە دەستی خۆمان و بە ئامادەبوونی شاهیدەکان لە رۆژی پازدەی مانگی یۆنیۆیساڵی حەڤدەمی فەرمانڕەوایەتیەکەمان مۆرمان کرد..)).[420]

هەندێك لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن کە ئەم بەڵگەنامە گرنگە کە پێی دەڵێن — پەیمانی گەورە — تا ئەمڕۆکەشی لەگەڵدا بێ بنچینەی ئازادییەکانە لە جیهانی ئەوانەدا کە بە زمانی ئینگلیزی دەدوێن، هەر لەبەرئەمەشە ئەم پەیمانە شایستەی ئەو ناوبانگەیە، خۆی راستە بە هەندێك کۆت و بەند دەورە دراوە، بۆ نموونە وەك: ئەوەی خانەدان و پیاو ماقوڵان و پیاوانی ئاینی مافی زیاتریان پێدراوە و مافی کەمتر دراوەتە کۆمەڵانی خەڵکی بە گشتی. سەرەڕای ئەم کەموکوڕیانەش سەرکەوتنێکی گەورەبوو بەسەر دەسەڵاتە رەهاکانی پاشادا و ئەو گوتەیەی کە دەیگوت (مافی فەرمانڕەوایەتیکردن لەلایەن خوداوە بە پاشاکان بەخشراوە). هەروەها بووە هۆی دەرکەوتنی پەرلەمانێکی تازە پێگەیشتوو، کە ناوی لێندرا(ئەنجومەنی گشتی) کە لە پێنج گروپ پێکدەهات: گەورە ئەسقەفەکان و سەرۆکی دێرەکان، هەڵگرانی نازناوی (ئێرڵ) و هەروەها گەورە بارۆنەکانیش. هەروەها ئەمەشیان راستە، کە بە بۆچوونی هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن — ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ دەرەبەگەکان نەك بۆ دیموکراسی، بەڵام ئەو گروپانەی کە لێرەدا ناویان هاتووە، هەر ئەمانەن لە دواییدا ئەنجومەنی لۆردەکانی لێ پێکهات، کە یەکێکە لە ئەنجومەنە پەرلەمانییەکانی ئینگلیز، بەو شێوەیەی، کە لە سەدەی دواتر (سەدەی چواردەم)[421] پێکهێندرا.

---

٤٢٠ -سەرچاوەی پێشوو لـــ١٩٩ ــ و دوای ئەو، لە کتێبەکەی د.سوعاد ئەلشەرقاوی (النظم السياسية في العالم المعاصر ) لـــ٤٧٧ـــو دوای ئەودا بە دەقەکانی ئەم بەڵگەنامەیەدا بچۆرەوە، لەوێ هەندێك بە دوورو درێژی باسکراوە. دار ئەلنەهزە ئەلعەرەبیە — قاهیرە ساڵی ١٩٨٨.

٤٢١ - لە داڕشتنی پەیمانی گەورەدا پیاوە ئاینییەکان رۆڵێکی گەورەیان گێڕا، لە راستیدا (ستیفن لانگتۆن — Stephen Langton – 1150- 1228) گەورە ئەسقەفی کانتیبێری دەستێکی باڵای لە داڕشتنی پەیمانی گەورەدا هەبوو. ئەو خۆی رەشنووسی پەیمانەکەی نووسیبۆوە و هەرئەویش پشتگیری بارۆنەکانی دەکرد لە ململانێکانیاندا لەگەڵ پاشادا. هەروەها ئەویش بوو دواتر پەیمانی دا ئەو پەیماننامەیە لە یارییەکانی جۆن پاشا بپارێزێ کە (هەوڵی دەدا خۆی لە جێبەجێکردنی بدزێتەوە). ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو مەترانە کەسایەتییێکی ئاسایی نەبوو، ئەو بەشێکی زۆری لە ژیانی خۆی لە پاریس بە سەر بردبوو. ئەو کاتەی کە بۆ

دوای ئەوە کوڕەکەی پاشا جۆن کە ناوی هێنری سێیەم (١٢١٦ -١٢٧٢) بوو هاتە سەر کورسی دەسەڵات لە ئینگلتەرا و هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی (پەیمانی گەورە)ی دا، بەڵام لەو هەوڵەدا سەرکەوتوو نەبوو. سەرەڕای ئەمەش دیسانەوە باجێکی زۆری خستەوە سەر پیاو ماقووڵەکان بەم باجەش باری سەر شانیانی زۆر قورس دەکرد، گەیشتبووە رادەیێك کە دەیانویست لەدژیدا راپەڕن، بەڵام هەرچەند جاری کە باجەکەی زیاد دەکرد سوێندی بۆ دەخواردن کە ئەمە دواجارە باج زیاد دەکات!.

دوای ئەویش (ئەدواردی یەکەم)ی (١٢٣٩-١٣٠٧) کوڕی، فەرمانڕەوایەتی ئینگلتەرای گرتە دەست کە لەساڵی ١٢٧٢ تاوەکو ١٣٠٧ فەرمانڕەوایەتی کرد. گرنگترین ئەو رووداوانەی کە لە سەردەمی ئەودا روویاندا نەشونماکردنی پەرلەمان بوو، ئەمەش لەبەرئەوەبوو پاشا لە گەڵ ئەسکوتلەندا و وێڵز و فەرەنسادا کەوتە شەڕەوە، بۆیە ناچار بوو داوای یامەتی دارایی لە چین وتوێژەکانی گەل بکات. بۆ ئەو مەبەستەش بانگهێشتی پەرلەمانی کرد کە شێوەیێکی نوێی بە خۆیەوە گرتبوو، تەنانەت مێژوونووسەکان ناویان ناوە (پەرلەمانە نموونەییەکە) Model Parliament. لە فەرمانی بانگهێشتەکەشدا گوتی (هەر شتێك پێوەندی بە هەموو خەڵکەوە هەبێت دەبێ هەموو خەڵکی پێی قایل بن هەروەها دەبێ مەترسییە گشتییەکانیش بە چەند هۆکارێك وەڵام بدرێنەوە کە هەر هەموو خەڵکی لەسەری رازی بن).

لێرەدا پاشا لەهەر شارێکدا دوو کەسی بانگهێشت کرد، بۆ ئەوەی لە دانیشتنەکانی ئەو ئەنجومەنە گەورەیەدا ئامادەبن کە لە (ویستمینستەر) دەبەسترا، لەو فەرمانەشدا هاتبوو، کە ئەو کەسانەی لە هەرێمەکاندا بۆ ئەو ئەنجومەنە هەڵدەبژێردرێن دەبی لەناو خەڵکیدا پێگەی خۆیان هەبێ، هەرچەندە ئەو نوێنەرانە ئەو دەسەڵاتەیان نەبوو، کە پیاو ماقووڵەکان هەیانبوو، بەڵام لەو ساڵەدا واتە (١٢٩٥) لە سەر پرەنسیپێکی زۆر گرنگ پێکهاتن ئەویش ئەوە بوو کە هەر یاسایێك پەرلەمان بڕیاری لە سەر بدات، تەنها پەرلەمانیش دەتوانێ هەڵیبوەشێنێتەوە. دوو ساڵ دوای ئەوە واتە (١٢٩٧) لە سەر پرەنسیپێکی دیکەی گرنگ پێکهاتن ئەویش ئەوە بوو، کە بە بێ رەزامەندی پەرلەمان نابێ هیچ باجێك کۆ بکرێتەوە.

---

پلەی گەورەی ئەسقەفەکان دەسنیشانیان کرد (کە خۆی لە بنچینەدا دەسنیشانکردنی پاپا بوو) ئەو مامۆستای لاهوت بوو لە زانکۆکەیدا. ئەم پلە ئاینییە لە ئینگلتەرادا کاری سیاسی و کاری ئاینی بە یەکەوە کۆ دەکردەوە . هەرچەندە پاشا رازی نەبوو ئەو پلەیەی بدرێتێ، بەڵام لە سەرەتای ساڵی ١٢١٣ دا پلەکەی بە دەست هێنا. ئەم کتێبەی خوارەوە بەراورد بکە : -The Hutchinson Encyclopedia ,1999 ,p.611.

ئەو ئەنجومەنە، یان ئەو پەرلەمانە نموونەییە بە ئامادەبوونی چەند نوێنەرێك لەو سوارچاکانەی کە پلەیێك لە میرەکان نزمتر بوون لەهەر ناوچەو هەرێمێکدا پێکهاتبوو، ئەمەش بۆ یەکەمجار بوو کە هەندێك لە نوێنەران بچنە ناو پەرلەمانەوە کە لە چینی پیاو ماقوولاَن و پیاوە ئاینییەکان نەبن (هەر لەبەر ئەم هۆکارەش بوو ناوی لێنرا پەرلەمانێکی نموونەیی)، بەلاَم لە کردنەوەی دانیشتنەکەدا ناوبڕێکیان لەنێوان ئەو چینەو چینی پیاو ماقوولّ ئاینییەکاندا دانا، کە لەیەکیانی جیا دەکردەوە، یەکەمجار بوو ئەو دوو گروپە بە یەکەوە گوییّان لەو گوتارەی پاشا دەگرت (کە دواتر ناوی لێنرا وتاری عەرشی پاشایەتی) لەو وتارەدا ئەو بابەتانە شیکرایەوە کە گفت وگۆو لێکۆلّینەوەکانی لەسەر دەکریّ و پێویستیان بە جۆرە بڕیارێکە. لە دوای ئەوە ئەندامە نوێییەکان هاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی کۆبوونەوەکانی خۆیان لە هۆلّێکی دیکەدا ئەنجام بدەن، هۆلّەکەش ئەو جێگایە بوو کە زۆرجار قەشەکانی (دێری وستمنستر)ی تێدا کۆ دەبوونەوە، ئەمانیش دوای ئەوەی لە کۆبوونەوەکانی خۆیان بوونەوە وتەبێژێکیان[٤٢٢] راسپارد بۆ ئەوەی ئەنجامی گفتوگۆکانی خۆیان بە ئەنجومەنی بالاَ رابگەییّنیّ، بۆ ئەوەی ئەنجامە کۆتاییەکان بە پاشا رابگەیێنن. دوای کۆتایی پێهێنانی کۆبوونەوەکان، جارێکیتر هەردوو ئەنجومەنەکە کۆبوونەوە بۆ ئەوەی گویّ لە پاشا بگرن و دوای ئەوەش رایبگەیێنن کە خولی کۆبوونەوەکان تەواو بوو، چونکە تەنها پاشا بۆی هەبوو داوا لەو ئەنجومەنانە بکات کۆببنەوە، یان خولی دانیشتنەکان کۆتایی پیّ بهێنن.

لە سەردەمی ئەدوارد پاشای سێیەمدا (١٣٢٧-١٣٧٧)[٤٢٣] پەرلەمان بە یەکجارەکی دابەش بووە سەر دوو ئەنجومەن: کە ئەنجومەنی گشتی و ئەنجومەنی لۆردەکان بوو. ئەمەش

---

٤٢٢ - ئێستا بە سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی دەلّێن وتەبێژ (The Speeker).

٤٢٣ - ئەمە کوڕی ئەدوارد پاشای دووەمە (١٢٨٤- ١٣٢٧)کە ژنە فەرەنسیەکەی پاشا ناوی ئێزابێلا بوو، کە لەگەلّ دۆستەکەیدا، کە ناوی رۆجەر مۆرتیمەر (Roger Mortimer) بوو پیلانێکیان بۆ داڕشت و لە قەلاَی (بارکلی) دا کوشتیان و کوڕەکەی کە ناوی ئەدواردی سێیەم بوو لە جێگەی ئەودا کردیان بە پاشای ئەنگلّتەرە کە ئەو کاتە ئەو کوڕە تەمەنی هێشتا نەگەیشتبووە پازدە سالاَن خۆی و دۆستەکەشی چاودێریان دەکرد. هەروەها لەبەرئەوەی ئێزابیلای دایکی (١٢٩٢-١٣٥٨) یەکێك بوو لە کچە میرەکانی فەرەنسا، کچی فیلیپ پاشای چوارەم بوو کە پاشای فەرەنسا بوو، کوڕەکەی داوای دەکرد عەرشی فەرەنسا وەر بگریّ.
The Huchinson Encyclopedia.1999.P.344 .

دوای ئەوەبوو کە پاشا لە ساڵی ١٣٣٧ دا داوای ئەوەی کرد کە عەرشی پاشایەتی فەرەنسا وەربگرێتەوە و داوای موڵکەکانی ئینگلتەرای لە فەڕەنسا دەکردەوە، ئەمەش بووە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕێکی سەد ساڵە لەنێوان هەردوو وڵاتدا، کە لە ١٣٣٧ەوە دەستی پێکرد تا ساڵی [٤٢٤]، ١٤٥٣ بەردەوام بوو.. لە سەرەتادا پاشا پێویستی بە پارەو پولێکی زۆر هەبوو، بۆیە باجێکی زۆری خستە سەر شانی خەڵکی بۆ ئەوەی بتوانێ خەرجییەکانی ئەو شەڕەی پێ دابین بکات، بەڵام دەوڵەمەندەکانی ناو خەڵکە گشتییەکە ئەوەیان ڕەتکردەوە کە بەشداری لە خەرجییەکانی شەڕدا بکەن، لەبەرئەوەی لە بڕیارەکاندا بەشداریان پێناکرێ. بەم شێوەیە ڕێگەیان پێدرا بێنە ناو پەرلەمانەوە، بەڵام وەك چینێکی نزمتر لە چینی میرەکان ـ بەم شێوەیە پەرلەمانی ئینگلیزی بە یەکجارەکی بوو بە دوو بەشەوە، ئەنجومەنی لۆردەکان و ئەنجومەنی گشتی. (هەر بۆ یەکەمجاریش بوو کە وشەی پەرلەمانی تێدا بەکار هات). لە سەرەتادا چینی لۆردەکان ئەوەندە گرنگیان بە ئەنجومەنی گشتی نەدەدا، بەڵام دوای ئەوەی گرنگی ئەو ئەنجومەنەیان بۆ دەرکەوت، هەوڵی ئەوەیان دەدا کوڕەکانی خۆیان بۆ ئەو ئەنجومەنە بپاڵێون، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش گرنگی ئەو ئەنجومەنە زیاتر دەبوو، تاوای لێهات بە پێش ئەنجومەنی لۆردەکان کەوتەوە.

سێیەم□: پەرلەمان جێ پێییەکانی خۆی جێگیرتر دەکات:

دەرکەوتنی پەرلەمانی ئینگلیزی لە سەردەمی (ئەدواردی سێیەم)دا، پاڵپشتێکی چاك بوو بۆ کاروانی دیموکراسی، هەرچەندە نوێنەرایەتی تەواوی خەڵکی نەدەکرد. ڕاستە کە جگە لە توێژەکانی میر و ئەسقەفەکان لە هەر شارێکی گەورە، یان لە هەر هەرێمێکدا دوو سوار چاك بەشداریان تێدا دەکرد، بەڵام هێشتا چەند هەنگاوێکی زۆری مابوو بۆ پشتگیریکردنی ئەو کاروانە. لەسەردەمی (ریچارد پاشای دووەم

---

٤٢٤ - ئەوەی ڕاستی بێ لەو شەڕەدا بۆ ماوەی ساڵانێکی دوورودرێژ هەندێك بەشی فەرەنسای داگیر کرد. لەو ماوەیەدا کەسایەتی جان دارك (١٤١٣-١٤٣١) دەرکەوت ئەو پاڵەوانە ئەفسانەییە خەڵکی وڵاتەکەی خۆی بەوە هاندەدا کە بەرەنگاری داگیر کەران ببنەوە، بۆیەش ئینگلیز لە ساڵی ١٤٣١ دا، کە گرتیان بڕیاری لە سێدارەدانی بە سووتاندن بۆدەرکرد، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٠ دا بە کەسایەتییێکی پیرۆز ناسێندرا و ساڵانە لە (٣٠) مایۆدا یادی دەکەنەوە.

١٣٦٧_١٤٠٠)دا[٤٢٥]، ئەو کاروانە هەنگاوێکی گرنگی نا ئەویش هەستکردنی خەڵکی بوو بە مافەکانی خۆیان، چونکە لەسەردەمی ئەودا بڕیاریدا (هەرکەسێك تەمەنی پازدە ساڵ بە سەرەوە بێ دەبێ باج بدات) بۆ ئەوەی خەرجی ئەو شەڕە سەد ساڵەییەی کە لەگەڵ فەرەنسادا تووشی هاتبوو پێ دابین بکات [٤٢٦]، لە شەشی یۆنیۆی١٣٨١دا کاتێك کە تیمێکی پارە کۆکەرەوە چوونە هەرێمی کێنت Kent، خەڵکە سادەکە لەگەڵ جوتیارەکاندا یەکیان گرت و لەدژی ئەو بڕیارە راپەڕینێکی گەورەیان ئەنجامدا نوێنەرەکانی پاشایان دەرکرد، ئەم راپەڕینەش ناوی لێنرا (شۆڕشە مەزنەکە). و خەڵکەکە دەرگای زیندانەکانیان تێك شکاندو زیندانییەکانیان ئازاد کرد. بۆ رۆژی دواتر شۆڕشگێڕەکان (وات تایلەر)یان بە پێشەوای خۆیان هەڵبژارد و تێکڕای خەڵکەکە رویان لە لەندەن کرد و (جۆن بۆڵ) یان لە زیندان ئازاد کرد، کە هەندێك کەس ناویان نابوو (قەشە شێتەکەی هەرێمی کێنت) ئەویش خۆی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا و وتاری بۆیان دەخوێندەوە و ئەوەی بۆ دووپات دەکردنەوە، کە هەمیشە دیموکراسیەت یەکێکە لە داواکارییە بالاکانی مرۆڤ و گوتی: (لەمڕۆوە ئەودیموکراسیەتە دەست پێدەکات کە خەومان پێوە دەبینی و بەرگریمان لێ دەکرد. ئەو ڕۆژەیە کە جیاوازی لە نێوان چینەکانی کۆمەڵدا نامێنێ، لەمڕۆوە ئەوە نامێنێ، کە ئەوە دەوڵەمەندە و ئەوە هەژارە، یان ئەمە دەرەبەگە و ئەوە کۆیلەیە، بەڵکو هەر مرۆڤێك تەنها موڵکی خۆیەتی..).

لە کۆتاییدا پاشا لەسەر ئەوە رازی بوو کە (تایلەر) ببینێ. تایلەر لەو چاوپێکەوتنەدا تووشی شۆك هات کاتێك کە دیتی پاشا رەزامەندی خۆی لەسەر هەر هەموو داواکارییەکان نیشاندا، کە ئەمانەی خوارەوەن: هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی لە سەرتاسەری ئینگلتەرادا، لابردنی کاری سوغرە و زۆرەملێ و بارگرانی دەرەبەگەکان لەسەر خەڵکی و دیاریکردنی نرخی

---

٤٢٥ - لە ساڵی ١٣٧٧ تا ١٣٩٩ فەرمانڕەوایەتی ئینگلتەرای کرد، کوڕی میر ئەدوارد بوو کە بە میرە ڕەشەکە ناسرابوو.

٤٢٦ - هەندێك لە مارکسییەکان پێیان خۆشە بەو چینەی، کە سەری هەڵداوە بڵێن: (چینی بۆرجوازی) بۆ ئەو مەبەستەش تەماشای د. عیسمەت سەیفولدەولە کتێبی (الاستبداد الديمقراطي) بکە، دارولموستەقبەل لە قاهیرە لـ٥٩ ـ٦٠ـ.

بە کرێدانی زەوی و زارەکان وەك ئەوەی کرێچییەکان داوایان کردبوو، هەروەها دەرکردنی بڕیارێکی لێبووردنی گشتی بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەسەر بەشداریکردنیان لەو شۆڕشەدا گیرابوون، پاشا تەنها یەك داواکاری رەتکردەوە ئەویش ئەوە بوو، کە ئەو وەزیرانەی تاوانیان بەرامبەر بە خەڵکی ئەنجام دابوو بیداتە دەستی خەڵکی تا خەڵکی سزایان بدات. لەم خاڵەیاندا ریچارد گوتی ئەو کەسانەی بە خراپ بە کارهێنانی دەسەڵات تاوانبار کراون بەپێی ئەو رێنماییانەی کە یاسا رێکیان دەخات دەیاندەینە دادگا، ئەگەر تاوانەکانیان بە سەردا سەپا ئەوە بەپێی یاسا سزا دەدرێن!.

خەڵکی توانیان لە رێگەی پەرلەمانەوە وردە وردە لە تایبەتمەندییەکانی پاشا کەم بکەنەوە، هەنگاو بە هەنگاو دیموکراسیەتیان دەسەپاند. لەسەردەمی هێنری شەشەمدا (١٤٢١_١٤٧١) بوو، و لە ساڵی ١٤٣٩دا یاسایێك دەرچوو، کە تیایدا بڕیار لەسەر پرەنسیپەکانی هەڵبژاردنی نوێنەرەکان درابوو لە شارە گەورەکان و هەرێمەکاندا، کە جاران پاشا خۆی ئەو نوێنەرانەی دەسنیشان دەکرد.

دوابەدوای ئەمە رووبەڕووبوونەوەکەی نێوان پاشاو پەرلەمان دێ. وابوو لە سەردەمی شارك پاشای یەکەمدا (١٦٠٠ـ ١٦٤٩) دوای ئەوەی پاشا نەیتوانی بارەگای پەرلەمان کۆنترۆڵ بکات ململانێیەکە توندتر بۆوە، گەیشتبووە ئەو رادەیەی کە هەر لایەك سوپای تایبەت بە خۆی هەبێ بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکات، بەم جۆرە وڵات رووبەڕووی شەڕێکی ناوخۆیی کوشندە بۆوە و ماوەی چەند ساڵێکی خایاند و لە ئەنجامدا بە سەرکەوتنی پەرلەمان کۆتایی پێهات و لە ساڵی ١٦٤٩دا شارك پاشای یەکەم لە سێدارە درا ـ بەمشێوەیە پەرلەمان توانی وەك هێزێکی پتەو پێگەکانی خۆی جێگیر بکات، رۆژ لە دوای رۆژیش سەرکەوتنەکان زیاتر دەبوون، تا لە ساڵی ١٦٨٨دا توانی ئۆرانجی سێیەم (١٦٥٠ـ١٧٠٢) وەك پاشای ئینگلتەرا دەسنیشان بکات. ئەمەش وای کرد کە پاشا ملکەچی داواکارییەکانی پەرلەمان بێت، لە ساڵی دواتردا واتە لە (١٣ی فێبرایەری ١٦٨٩) دا یاسایێکیان دەرکرد کە پێیان دەوت (یاسای مافەکان)، یان (بەڵگەنامەی مافەکان -The Bill of Rights)[٤٢٧] ئەو یاسایە کێشەی (میراتی تاجی شاهانە) چارەسەر دەکات و ماف وئازادییەکانی خەڵکی دەخاتەڕوو.

---

٤٢٧ - لە کتێبەکەی سوعاد ئەلشەرقاویدا (النظم السياسية في العالم المعاصر) لـ ٤٨١ ـــ، تەماشای کورتەی ئەو بەڵگەنامە گرنگە بکە.

لەهەمانکاتدا پەرلەمان پرەنسیپێکی دەستووری گرنگ دەردەکات کە دەڵێ: (هەر فەرمانێکی شاهانە بۆ راگرتنی، یان جێبەجێکردنی. [٤٢٨] هەر یاسایێك بە بێ رەزامەندی پەرلەمان، کارێکی نا یاساییە..) هەروەها (کۆکردنەوەو وەرگرتنی هەر باج و پارە و پوولێك بە ناوی مافی شاهانەوە بە بێ رەزامەندی پەرلەمان، کارێکی نا یاساییە..). بەمشێوەیە پەرلەمان لە دەرکردنی یاساکاندا بووە خاوەن بڕیاری کۆتایی و بە یەکجاری دەسەڵاتی یاسادانانی بۆ خۆی گەڵاڵە کرد[٤٢٩]. لە کاتێکدا نزیکەی هەموو دەوڵەتەکانی ئەوروپا تا ساڵەکانی (١٧٨٩) ش زۆردارەکان تیایاندا فەرمانڕەوایەتیان دەکرد، بەڵام لە ئینگلتەرادا حکومەتێکی دەستووری هەبوو کە فەیلەسووفەکان بە سەریاندا هەڵداوە و نیوەی جیهانیش ئیرەیی پێ دەبردن[٤٣٠].

گرنگترین ئەو شوێنەوارانەی کە شۆڕشی ١٦٨٨ لەسەر سیستەمی دەسەڵات داینا لە ئینگلتەرا، پرەنسیپی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بوو، ئەو پرەنسیپەش تەنها پشت بە (بەڵگەی مافەکان) کە (ولیەم ئۆرانج) رەزامەندی خۆی لەسەری نیشاندا نابەستێ، بەڵکو زیاتر پشت بەو بارودۆخە دەبەستێ کە ئەو تیایدا هاتە سەر دەسەڵات[٤٣١]، ئەویش، کە پەرلەمان خۆی ئەوی هەڵبژاردو دەسەڵاتی دایە دەستی بەو مەرجانەی کە بۆی دانابوو، ئەمەش وایکرد چەمکی پاشایەتی بگۆڕێ. چیتر پاشا ئەو پیرۆزی و دەسەڵاتە رەهایەی لە ناو دەوڵەتدا هەیبوو نەیما، بەڵکو بووە ئەندامێك، یان دەزگایێك لە دەزگاکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت. بەپێی ئەو چەمکە تازەیەش زۆر ئاساییە ئەگەر دەسەڵات، یان تایبەتمەندییەکانی پاشا بگۆڕدرێن. لەبەرئەوەی هەر لەسەردەمە کۆنەکانەوە رەفتارەکانی پاشا پەیوەست بوو بە وەرگرتنی رەزامەندی ئەنجومەنە تایبەتیەکەی خۆی، ئەمەش ئەوەی لێ کەوتەوە، کە ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە، کە (وەزیرەکانن) بەرپرس بن لەو هەڵسوکەوتانە. یان بەشێوەیێکی تر بڕیاردرا کە نابێ هیچ وەزیرێك دابمەزرێ ئەگەر بڕوای پەرلەمانی بە دەست نەهێنابێ، دوای دوو سەدە گەشەکردن و بەرەو پێشچوون ئەم کەمکردنەوانەی دەسەڵاتی پاشا بووە یەکێك لە

٤٢٨ - د. عیسمەت سەیفولدەولە کتێبی (الاستبداد الدیمقراطي) دارو لموستەقبەل لە قاهیرە لـ٦٠ـ.

٤٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٣٠ - وۆل دیورانت (قصە الحضارة ) بەرگی ٤٢ وەرگێڕانی ئەندراوس لـ٣٦ـ.

٤٣١ - مەرجێك لە مەرجەکانی پەرلەمان بۆ چوونە سەر عەرشی پاشایەتی ئەوە بوو، کە دەبێ پاشا بەم بەڵگەنامەیە رازی بێ.

نیشانەکانی سیستەمی پەرلەمانی لە ئینگلتەرادا[٤٣٢]. ئەو سیستەمەی لە بەشی دواتردا بە شێوەییێکی درێژتر باسی لێوە دەکەین.

## چوارەم: سیستەمی پەرلەمانی لە ئینگلتەرادا:

لە بەشی پێشتردا لایێك لە خەباتی ئینگلتەرامان خستەڕوو، کە لە پێناو بەدەسهێنانی ماف و ئازادییەکاندا ئەنجامیان دابوو بەرامبەر بەو دەسەڵاتە ڕەهایەی کە پاشا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بەپێی (ئەو مافەی کە خوا بە پاشاکانی بەخشیوە) بۆ حوکمڕانی کردنی خەڵکی. لە ئەنجامی ئەو خەباتەشدا باوەڕێکی نەگۆڕ و چەسپاو لە ناخی گەلی ئینگلیزیدا چەسپا، کە هەر کەسێك بووە خاوەن دەسەڵات و ئازادانە پیادەی کرد، دەبێ بەر پرسیارێتی تەواوی ئەو کارانەی، کە ئەنجامی دەدات لە ئەستۆ بگرێت. ئەگەر هات و وەك خاوەن دەسەڵاتێکی ڕەها مایەوە، بە شێوەییێکی تاکڕەوانە لە حوکمڕانێتیەکەی بەردەوام بوو بڕیارەکانی خۆی دەردەکرد بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت و کاروباری وڵات (ئەمە سەرەڕای بوونی ئەو ئەنجومەنە ڕاوێژکاریەی کە هیچ ڕۆڵێکی نییە تەنها ڕۆڵی ئامۆژگاریکردن نەبێ) ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە دەبێ خۆشی بەر پرس بێت لەو کارانەی کە ئەنجامی دەدات و ئەو بڕیارانەی کە دەریدەکات و لە هەرچییێکی، کە ئەنجامی دەدات، بەڵام ئەزموونە مێژووییەکانی پێشوو ئەوەیان سەلماندوە کە لێپرسینەوەییێکی ڕاستەقینە لەگەڵ پاشادا دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش و دروستبوونی نائارامی لە وڵاتدا، وەك ئەوەی لە سەردەمی جۆن پاشا و ئەدوارد پاشادا ڕوویاندا... و هتد، بەڵکو کێشەکەی شارك پاشای یەکەم بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ و لە ساڵی ١٦٤٩دا بە لە سێدارەدانی پاشا کۆتایی پێهات و بۆ یەکەمجار و دواجار لە مێژوودا سیستەمی کۆماری ڕاگەیێندرا.

ئەگەر بێت و لێپرسینەوە لەگەڵ پاشادا بووبێتە پرسێکی پێویست و یەکلاکەرەوە ئەمە لەلاییێك ـ لەلاییێکی تریشەوە ئەمە هۆکارێکی گرنگ بێت بۆ بەدیهێنانی یەکسانی بۆ ئەوەی کارەکان بە باشی بەڕێوەبچێ، لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی ترسناکە لەبەرئەوەی بارودۆخی وڵات بەرە و نائارامی و پشێوی دەبات و ئاسایشی وڵات و ڕێزگرتنی پاشا دەخاتە مەترسیەوە ـ ئینگلیزیش سەرەڕای هەموو ئەمانە ڕێزێکی تایبەتی لە سیستەمی پاشایەتی دەگرن ـ

---

٤٣٢ - د. عیسمەت سەیفولدەولە کتێبی (الاستبداد الديمقراطي) دارو لموستەقبەل لە قاهیرە لـ٦٢ـ.

سەرەڕای هەر هەموو ئەمانەش گێروگرفتەکانی وڵات ئەوەندە زۆر و ئاڵۆز بووە کە مەحاڵە تاکە کەسێك بتوانێ چارەسەریان بکات، یان ڕێگەچارەییێکی بۆ بدۆزێتەوە. خۆی لێرەوە بیرۆکەی پشتبەستن بە دەستەییێکی بە کۆمەڵ هاتە ئاراوە لە جیاتی ئەوەی پشت بە تاکە کەسێك ببەسترێ. ئەم خەباتەش بە سەقامگیربوونی سیستەمی پەرلەمانی رازێندرایەوە، کە ئەمڕۆکە زیاتر لە بیست دەوڵەت پیادەی دەکات ـ لەو وڵاتانەدا پێشکەوتنی ئابوری و پیشەسازی بەدیهاتووە و بارودۆخی سیاسیشیان جێگیرە و کۆڵەگەکانی دیموکراسیشی تێدا چەسپاوە. گرنگترین ئەو وڵاتانە ئەمانەن: کۆماری ئەڵمانیا و نەمسا، ئیتاڵیا، ئیرلەندا، بەلجیکا، هۆڵەندا، سوید، نەرویج، ئایسلەندا، دانیمارك، کەنەدا، ئوسترالیا، نیوزیلەندا، ژاپۆن[٤٣٣].

سەرەڕای ئەوەی کە ئینگلتەرا بێشکەی سیستەمی پەرلەمانییە، کە کۆڵەگەکانی لەوێدا جێگیر بوو وچەسپا و چەکەرەی کرد، ئەمەش لە ئەنجامی زنجیرەییێك ڕووداودا هاتە کایەوە، کە پێشتر هەندێککیمان باس کرد، گرنگترین ئەو شتانەی کە ئەو سیستەمە لە سیستەمەکانی تر جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەو سیستەمە تا ئێستا هیچ دەستوورێکی نووسراوی نییە، بەڵکو ئەو سیستەمە سیاسیە لەسەر چەند بنەماییێکی دەستووری دابێ کە لە زەینی دام ودەزگا حکومییەکاندا چەسپاوە و لە بەکارهێنانیدا راهاتوون و تا ئەو رادەیەی، کە بۆتە چەند بنەماییێکی دەستووری کە نەتوانرێ فەرامۆش بکرێت[٤٣٤].

لە ئینگلتەرا سیستەمی پەرلەمانی سیستەمێکی پاشایەتی دەستووریە، بە نموونەییێکی کلاسیکی دادەنرێ کە لەسەر هاوکاری و هاوسەنگی نێوان هەرسێ دەسەلاتەکە و چاودێریکردنی یەکتری لەنێوان خۆیاندا بنیادنراوە. سیستەمێکە پەرلەمان بە تایبەتی ئەنجومەنی گشتی (عموم) جێگاو بایەخی تایبەتی خۆی هەیە، کە بۆتە سەنتەری تەواوی سیستەمەکە. هەروەها پێوەندییەکانی نێوان هەردوو دەسەلاتی یاسادانان و جێبەجێکردن پێوەندییێکی بە یەکەوە بەستراو و زیندووە، نەك پێوەندییێکی پاشکۆیەتی بێ، یان یەکێکیان ملکەچی ئەویتر بێ : چونکە پەرلەمان خۆی سەرۆکی حیزبی زۆرینە بۆ (سەرۆك وەزیران) هەڵدەبژێرێ. سەرۆکی وەزیرانیش حکومەتەکەی خۆی لەنێوان ئەندامەکانی پەرلەمان

---

٤٣٣ - د.سوعاد ئەلشەرقاوی (النظم السياسية المعاصرة) لـــــ٣٨٣ـــ.

٤٣٤ - محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر (النظم السياسية والقانون الدستوري) لـــ١٥٣ـــ.

هەڵدەبژێرێ[٤٣٥]. ئەو حکومەتەش هەر هەموویان لە رووی سیاسیەوە لە بەردەم پەرلەماندا بەر پرسیارن[٤٣٦].

## پێنجەم: دەسەڵاتە سیاسییەکان: .

لە ماوەی داهاتوودا بە سروشتی هەر سێ دەسەڵاتە سیاسیەکەی شانشینی یەکگرتوو (ئینگلتەرا) ئاشنا دەبین: ـ

یەکەم: دەسەڵاتی جێبەجێکردن: ـ

دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە شانشینی یەکگرتوودا لە پاشا، یان (شاژن) و سەرۆکی وەزیران و ئەنجومەنی وەزیران، یان حکومەت پێکدێت.

**(أ) پاشا: ـ**

(تاجی بەریتانی) بە کۆنترین دەزگای سیاسی لەمشێوەیە دادەنرێ لە جیهاندا و بە شێوەی میراتگری دێنە سەر کورسی دەسەڵات وەك ئەوەی لە سیستەمی میراتگری پاشایەتیدا هەیە، لەم کارەشدا (نێر) و (مێ) یەکسانن. لە شانشینی یەکگرتودا پاشا سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردنە، بەڵام رۆڵی پاشا لە پیادەکردنی ئەم کارەدا وەك بڵێی بە شێوەییێکی رەمزیە، لەبەرئەوەی پاشا خاوەنی وڵاتە، بەڵام حوکمڕانی تێدا ناکات. لێرەدا پاشا لە پیادەکردنی دەسەڵاتدا بە کردەوە خۆی کێشاوەتەوە و تەنها رۆڵی لە هەندێك کارو فەرماندا هەیە وەك ئاهەنگ و کاروبارە رووکارییەکان، هەرچەندە پلەوپایەکەی وەك سونبولی وڵات و نەتەوە وایە. راستە، کە پاشا سەرۆکی وڵاتە و ئەویشە کە یاساکان واژوو دەکات و گەورە فەرمانبەرانی مەدەنی و سەربازی و دبلۆماتکارەکان دادەمەزرێنێ و نازناو پلەو پایە دەدات بە خەڵکی و مافی بانگهێشتکردنی پەرلەمان و هەڵوەشاندنەوەی هەیە و هەروەها ئەویشە کە دانیشتنەکانی پەرلەمان دەکاتەوە...و هتد ـ بەڵام ئەمانە نەك هەر هەمووی بە شێوەییێکی روکارییە، بەڵکو لە پیادەکردنی ئەو رۆڵەدا تەنها واژوو دەکات و هیچ بڕیارێك نادات و وتارەکان دەخوێنێتەوە،

---

٤٣٥ - موسوعة العلوم السیاسیة، بەرگی دووەم ـ زانکۆی کوێت ١٩٩٤.

٤٣٦ - لەبەر بە هێزی ئەو پەرلەمانە و ئەو گرنگیەی کە لە ژیانی سیاسیدا هەیبوو هەندێك کەس دەیانگوت (پەرلەمانی ئینگلیزی تەنها ناتوانێ پیاو بکاتە ژن ئەگەر نا دەتوانێ هەموو شتێك بکات !!).

بەڵام بەدواداچوونیان بۆ ناکات، ئەمەش لەبەرئەوەیە  لە کۆتاییدا وەزارەتەکانن لە رووی پراکتیکەوە پیادەی ئەو کارانە دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا مافی ئەوەی هەیە راوێژی پێ بکرێ و ئاگاداریان بکاتەوە و هانیان بدات[٤٣٧]. شاژنە ڤیکتۆریا بە تایبەتی لە کۆتاییەکانی سەردەمی دەسەڵاتەکەیدا، گفت وگۆی لەگەڵ سەرۆك وەزیراندا دەکرد و لە هەڵبژاردنی وەزیرەکاندا تەداخولی دەکرد، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا ئەو نەریتە نەماوە و پیادە ناکرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا وەك نەریتێك دەبێ پاشا ئاگاداری هەر هەموو کاروبار و رووداوەکان بێ: هەموو ئێوارەی سێ شەموانێك راپۆرتێکی سەرزارەکی لە سەرۆك وەزیرانەوە لە بارەی گفتوگۆکانی ئەنجومەنی وەزیران پێدەگات. هەر هەموو ئەو بەڵگەنامەی پێوەندی بە ئەنجومەنەوە هەیە و هەموو بروسکە دیبلۆماسییەکان و بروسکەی ئاژاسەکانی هەواڵی بۆ دەنێردرێ. هەروەها پاشا پێوەندی راستەوخۆی لەگەڵ باڵیۆزەکان و نوێنەرەکانی وڵاتەکەی لە وڵاتانی کۆمۆنوێڵسدا هەیە...هتد. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پاشا هیچ تەداخولێك لە کاروبارەکاندا ناکات تەنها بۆ ئەوە نەبێ، کە بە بیری حکومەت و هاوڵاتیان بێنێتەوە کە دەبێ دەرکردنی هەر بڕیارێکی گرنگ بۆ بەرژەوەندییەکانی گەل و نەتەوە بێت.

### (ب) وەزیری  یەکەم (سەرۆك وەزیران): ـ

لە ئەنجامی کەمبوونەوەی رۆڵی پاشادا، حکومەت، یان وەزارەت ـ لە بواری دەسەڵاتی جێبەجێکردندا رۆڵێکی سەرەکی و کاریگەر لە شانشینی یەکگرتوودا دەگێڕێ و پاشا نابێ سەرۆکی وەزیران لەنێوان ئەنجومەنی لۆردەکاندا هەڵیبژێرێ بەڵکو دەبێ لەنێوان ئەندامانی ئەنجومەنی گشتیدا هەڵیبژێرێ بۆ سەرۆکایەتیکردنی ئەنجومەنی وەزیران[٤٣٨]، بۆیە بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران دەڵێن وەزیری یەکەم Prime

---

٤٣٧ - (موسوعة العلوم السياسية ) بەرگی دووەم زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٩٤ لــ١٦٦ ـــ و دوای ئەو.

٤٣٨ - جێگەی ئاماژە پێکردنە کە لە یۆلیۆی ساڵی ١٩٦٣دا یاسایێك دەرچوو کە رێگەی بە (ئەندامانی ئەنجومەنی لۆردەکان) دا ئەگەر دەسبەرداری نازناوەکەی خۆیان بن، دەتوانن خۆیان بۆ (ئەنجومەنی گشتی) هەڵبژێرن. لەم بارەیەوە (لۆرد هیۆم) دەسبەرداری نازناوەکەی خۆی بوو و بووە ئەندامی ئەنجومەنی گشتی، واتە لە (لۆرد هیۆم ) ەوە بوو بە (سێر هیۆم)، و هەر لە ساڵی ١٩٦٣دا بوو بە سەرۆکی وەزیران. تەماشای

Minister، لەبەرئەوەیە ئەو بەو سیفەتەیەوە تەنها یەکێکە لە هاورێکانی خۆی و لە رووی کردارەوە یەکسانن. کاری ئەنجومەنی وەزیران ئەوەیە کە دەسەلاتەکانی حوکمڕانی جێبەجێ بکات و بە شێوەی کۆمەڵ بڕیارەکان دەربکات، بەڵام خۆی لە راستیدا وا نییە، چونکە سەرۆکی وەزیران سەرۆکی زۆرینەیە لە پەرلەماندا.. زۆربەی جارەکانیش خەڵکی لەسەر بنچینەی کەسایەتی سەرۆکی حیزبەکە دەنگی خۆی دەدات، کە لە دواییدا دەبێتە سەرۆکی وەزیران. بۆیە زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران، کە لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردراون، بەڵام بوون و شەرعیەتی خۆیان لە سەرۆکی وەزیراندا دەبیننەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی بەهێز بوونی پلە و پاییەکانیان:

(١) لەبەرئەوەی سەرۆکی وەزیران خۆی ئەنجومەنی وەزیران پێکدەهێنێ، هەر خۆشی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە دەسنیشان دەکات، ئەگەریش پێویست بکات هەر خۆی گۆڕانکاری تێدا دەکات و دەتوانێ داوای دەست لە کارکێشانەوەی وەزیرێکی دیاریکراو بکات و پۆستەکەی بداتە وەزیرێکی تر، هەروەها دەشتوانێ دەس لەکارکێشانەوەی خۆی، یان ئەنجومەنی وەزیران پێشکەش بە پاشا بکات، هەروەها دەتوانێ ئەنجومەنی گشتی هەڵبوەشێنێتەوە.

(٢) وەزیری یەکەم ئەڵقەی پێوەندییە لەنێوان ئەنجومەنی وەزیران و پاشا، چونکە هەر هەموو ئێوارەی سێ شەممەیەك ـ وەك پێشتریش باسمان لێوەی کردووە ـ راپۆرتێکی سەرزارەکی لەبارەی گفتوگۆکانی کۆبوونەوەکانی ناو ئەنجومەنی وەزیران کە پاشا تێیدا نەبووە پێشکەش بە پاشا دەکات. لەبەرئەوەی وەزیرەکان مافی ئەوەیان نییە راستەوخۆ بچنە لای پاشا، بۆیە وەك نەریتێك وەزیری یەکەم خۆی ئەو داواکاری و چاوپێکەوتنانە دەباتە لای پاشا، زۆربەی جارەکانیش خۆی لەو چاوپێکەوتنانەدا ئامادە دەبێ.

(٣) وەزیری یەکەم وەك چاودێرێك وایە بە سەر هاورێکانییەوە، بە تایبەتی لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا، لەبەر ئەوەی سیاسەتی دەرەوە لە ئینگلتەرادا بەرهەمی

---

کتێبەکەی پێشووتری سوعاد ئەلشەرقاوی لـ٤٥٦، و کتێبەکەی پێشووتری د.محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر لـ١٥٤ ـ بکە.

هاوکارییەکانی نێوان سەرۆکی وەزیران و وەزیری دەرەوەیە[٤٣٩]، بۆیە دەبینین وەزیری یەکەم وەك سەرۆکی کارامەی دەوڵەت دەردەکەوێ، چونکە ئەو وەزیرانەی کە ئەو هەڵیاندەبژێرێ بە هەر هەموو تایبەتمەندییەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن هەڵدەستن، تەنانەت ئەو کارانەش، کە جاران لەژێر دەسەڵاتی پاشا دابوون. هەر لەبەرئەم هۆکارەشە، کە هەندێکجار بە سەرۆکی وەزیرانی ئینگلتەرە دەڵێن: (پاشای کاتی)، (پاشای هەڵبژێردراو). لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە بۆتە نەریتێك کە دەبێ وەزیری یەکەم لە ناو ئەندامانی ئەنجومەنی گشتیدا دەسنیشان بکرێ.

بە هاوکاری کۆمەڵێك دەستەی ڕێکخەر لە ناویشیاندا (دەستەی سکرتاریەت) بەرنامەکانی کارکردن ئامادە دەکات، وەزیرەکان بانگهێشت دەکات و کۆنووسی دانیشتنەکانیش دەنووسێتەوە..هتد. هەروەها دەستەی لێژنە سنووردارەکان، کە تایبەتە بەو وەزیرانەی گرنگی بە بابەتێکی دیاریکراو و ڕاستەوخۆ دەدەن، هەروەها کۆمەڵەی وەزیرە ڕێکخەرەکان و . . .هتد هاوکاری دەکەن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەسەڵاتەکانی سەرۆکی وەزیران لەلایێك پابەندە بە بەرپرسیارێتی دەستەجەمعی وەزیرەکان و لەلایێکی تریشەوە پابەندە بەو شێوە گشتییە هاوڕا بوونەی ناو ئەنجومەنی وەزیرانەوە، کە کاریگەرییێکی زۆری لەسەر دەنگدەر هەیە[٤٤٠].

### (ج) ئەنجومەنی وەزیران:

یەکێك لە مۆرکە هەرە بنچینەییەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە سیستەمی بەریتانیادا ئەوەیە کە ئەنجومەنی وەزیران هەموو وەزیرەکان لەخۆی ناگرێ، بەڵکو تەنها کۆمەڵێکیان لێ هەڵدەبژێرن و دەبن بە ئەندامی ئەو ئەنجومەنە، کە خۆی لە بیست وەزیر دەدات، چونکە ئەو ئەندامانەی کە سەرپەرشتی ئیدارەییێکی دیاریکراو دەکەن زۆر پێویست ناکات کە ئەندام بن لە

---

٤٣٩ - لە بارەی ڕۆڵە گرنگەکانی وەزیری یەکەم تەماشای کتێبی (النظم السياسية في العالم المعاصر) ی د. سوعاد ئەلشەرقاوی لــ٤٥٥ ـ و دوای ئەو بکە هەروەها تەماشای: . Berkley :The Prime Minister , London,1968 F.W. Benemy:The Elected Monarch : The Development of the Prim Minister , London,1966

٤٤٠ - (موسوعة العلوم السياسية ) بەرگی دووەم، زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٩٤ لــ١٦٦٠ ــ و دواتر.

ئەنجومەنی وەزیراندا، لەبەرئەوەی ئەو ئەنجومەنە پێکهاتەکەی لە حکومەتێکەوە بۆ حکومەتێکی تر دەگۆڕێ، هەروەها دەکرێ لە کاتی قەیرانەکاندا ژمارەی ئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنە زۆر لەوە کەمتر بکرێتەوە.

لە سالآنی شەڕی جیهانی یەکەمدا (١٩١٤ ـ ١٩١٨) ئەنجومەنی وەزیران لە پێنج ئەندام زیاتر تێنەدەپەڕی و لە شەڕی جیهانی دووەمیشدا (١٩٤٠ ـ١٩٤٥) ژمارەی وەزیرەکان لە پێنج وەزیر تا هەشت وەزیر بوون، هەروەها لە مانگی مایۆی ١٩٦٩دا (ویلسۆن) بڕیارێکی دەرکرد کە تەنها شەش ئەندامی سەرەکی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە (وەزیری دەرەوە و ناوەخۆ و دارایی و بەرگری و ئابوری و ئینجا سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی)[٤٤١].

ئەنجومەنی وەزیران چەند کارێکی بنچینەیی ئەنجام دەدات، کە ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ هێڵە گشتییەکانی سیاسەتی ناوەوەو دەرەوە دادەڕێژێ، ئەمەش وەك نەریتێکە، کە کارێکی سروشتی هەر ئەنجومەنێکی وەزیرانە. ئەوەی شایانی باسکردنە، لێرەدا ئەو سەربەخۆییەی، کە ئەنجومەنی وەزیران لە ئاراستەکردنی سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا هەیێتی، سەربەخۆییێکە بۆ سیستەمی ئەو حیزبە دەگەڕێتەوە کە ئەنجومەنی وەزیران لەژێر کاریگەری ئاراستەکانی ئەو دایە.

٢ـ ئەنجومەنی وەزیران چاودێرە بەسەر ئیدارەکانەوە، ئەم چاودێریەش بە شێوەییێکی کاریگەر و راستەقینە ئەنجام دەدرێ، هۆکاری کاریگەریەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ماوەی کارکردنی ئەنجومەنی وەزیران ماوەییێکی گونجاوە و هەروەها پێگەییێکی گرنگی هەیە و فەرمانبەرە مەدەنییەکانی دام و دەزگا دەسەڵاتدارەکانیش دڵسۆزن و رێز لە سیاسەتەکەی دەگرن و بە ئەمانەتەوە کاردەکەن.

٣ـ ئەنجومەنی وەزیران ئەو بڕیارانە دەردەکات، کە تایبەتن بە دامەزراندن و نازناو بەخشین.

٤ـ ئەنجومەنی وەزیران مافی دەسپێشخەریکردنی لە پرسە داراییەکاندا هەیە.

٥ـ بەبێ ئەوەی بۆ پەرلەمان بگەڕێتەوە مافی ئەوەی هەیە کە باجەکانی سەر هاوڵاتیان زیادو کەم بکات، تەنها مەگەر پەرلەمان بڕیارێکی تری هەبێ. ئەمەش هەر هەموو باجەکان

---

٤٤١ - سەرەڕای ئەوەی وەزارەتەکەی (هیس) لە ساڵی ١٩٧٠ لە ٨٤ ئەندام پێکدەهات، بەڵام لە نێوانیاندا تەنها هەژدە وەزیریان لە ئەنجومەنی وەزیراندا ئەندام بوون، کە یەکێکیان ژن بوو.

دەگرێتەوە تەنها (باجی دەرامەت Income Tax) نەبێ کە بۆ سەپاندنی ئەو باجە وەك مەرجێك دەبێ ساڵانە رەزامەندی پەرلەمانی پێوەربگیرێ.

٦ـ ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کەجڵەوی پرسەکانی سەپاندنی باج وەرگرتن لە دەستی ئەنجومەنی وەزیراندایە تەنها باجی دەرامەت نەبێ.

٧ـ لیستێکی لە بابەتەکانی ئەو پێکهاتنە هەیە کە ناچێتە ژێر باری گفتوگۆکانی ناو پەرلەمانەوە، وەك ئایین و پلەو پایەی دادوەرەکان.

٨ـ پرۆژەیاساکان لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە دادەنرێن، چونکە زۆربەی ئەو یاسایانەی کە پەرلەمان دەریان دەکات لە ئەسڵدا پرۆژەی حکومەتن و ئەو پرۆژە یاسایانەی کە لەلایەن پەرلەمانەوە پێشنیاز دەکرێن لە دەیەکی پرۆژە یاساکانی ئینگلیز تێپەڕ ناکات.

٩ـ پەرلەمان دەتوانێ مافی رەزامەندیدان لەسەر پرۆژە یاساکان بە ئەنجومەنی وەزیران بسپێرێ، هۆکاری ئەو رازیبوونەی پەرلەمانیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چونکە ئەنجومەنی وەزیرانیش لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێدراوە و متمانەی ئەوانی پێدراوە. لەبەرئەوەی ئەو کاتەی کە دەنگدەر دەنگ بۆ ئەنجومەنی گشتی دەدات، لە هەمان کاتدا دەنگدانە بۆ وەزیرەکانیش، چونکە سیستەمی دوو حیزبی وایکردوە کە پاشا بە پێی داواکارییەکانی خەڵکی سەرۆکی وەزیران دەسنیشان بکات، لەبەرئەوەی ئەوان لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی گشتیدا دەنگیان پێداوە. لە هەڵبژاردنەکاندا هەر حیزبێك بە شێوەیێکی روون و ئاشکرا بەرنامەی حیزبەکەی خۆی دەخاتەڕوو بۆ ئەوەی یارمەتی دەنگدەران بدات لە هەڵبژاردندا. ئەگەر هەر حیزبێکیش بە زۆرینەی دەنگەکان لە هەڵبژاردندا بردیەوە، مانای ئەوەیە کە خەڵکی بەرنامەی ئەو حیزبەی پێ باش بووە[٤٤٢]. جگە لەمەش حیزبی ئۆپۆزسیۆن ئەوەی کە پێیدەڵێن (حکومەتی سێبەر ـ( The Shadow Cabinet لەو ئەندامانە پێکدێن کە لەلایەن خەڵکیەوە ناسراون، ئەگەر هات و لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوت لە ئامادەباشیدایە بۆئەوەی دوای حکومەتی دەست لە کارکێشاوە حکومەتی خۆی پێکبهێنێت.

---

٤٤٢ - تەماشای کتێبی (النظم السیاسیة في العالم المعاصر) ی د. سوعاد ئەلشەرقاوی لـــ٤٥٢ـــ و دواتر بکە، و تەماشای کتێبی (النظم السیاسیة والقانون الدستوري) ی د. محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر لـــ١٥٣ـــو دواتری بکە، و هەروەها تەماشای (موسوعة العلوم السیاسیة) زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٩٤ بەرگی دووەم لـــ١٦٦٦٠ـــ و دوای ئەو بکە.

## دووەم: دەسەڵاتی یاسادانان:

پێشتر لایێك لە ململانێکانی پەرلەمانمان خستەڕوو کە لەگەڵ پاشادا دەیانکرد بۆ ئەوەی مافی یاسادانان لە پاشا بستێننەوە، ئەوەشمان روونکردەوە کە لە سەرەتادا ئەنجومەنی لۆردەکان لەم کارەدا دەسپێشخەربوون، ئینجا دوای ئەوە و لە سەردەمی ئەدوارد پاشای سێیەمدا بوو بە دوو ئەنجومەن: ئەنجومەنی لۆردەکان و ئەنجومەنی گشتی. هەردوو ئەنجومەنەکەش نوێنەرایەتی دەسەڵاتی یاسادانانیان دەکرد لە وڵاتدا. ئەنجومەنی گشتی توانی وردە وردە کارەکانی ئەنجومەنی لۆردەکان بۆ خۆی رابکێشێ، بەو پێیەی، کە ئەوان دەستەیێکی پەرلەمانین و نوێنەرایەتی خەڵکی دەکەن، تا گەیشتە رادەیێك کە بە شێوەیێکی راستەقینە کاری یاسادانان تەنها تایبەت بێ بە خۆیان، بە تایبەتی لە دوای ساڵی ١٩١١دا، کە تایبەتمەندییەکانی ئەنجومەنی لۆردەکان کەمتر بوونەوە. وا لە خوارەوە وتارێکی کورتتان لە بارەی هەر یەك لەو ئەنجومەنانە دەخەینە بەر دەست: ـ

پێکهاتەی ئەنجومەنەکە: ئەنجومەنی لۆردەکان لەم ئەندامانە پێکدێن:ـ

### أـ ئەو ئەندامانەی بە میرات بۆیان ماوەتەوە:

هەڵگرانی نازناوی (لۆرد) بە حوکمی میراتە ـ ئەمە ئەو نازناوەیە، کە کاتی خۆی پاشا بە باپیرانیانی بەخشیبوو و ئێستا بە میرات بۆیان ماوەتەوە ـ ئەو جۆرە ئەندامانە زۆرینەی گەورەی ئەندامانی ئەنجومەنەکە پێکدەهێنن، چونکە کۆی ژمارەی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە دەگاتە ١٠٠٠ ئەندام، لە کاتێکدا ئەمان ژمارەیان ٨٠٠ ئەندامە.

### ب ـ ئەو ئەندامانەی بە دامەزراندن دێنە ناو ئەنجومەن:

ئەمانە بەپێی پلەوپایەیەکانیان پاشا بەمشێوەیەی خوارەوە دایاندەمەزرێنێ: ـ

- لۆردە رۆحییەکان کە ژمارەیان دەگاتە بیست و شەش ئەسقەف کە ئەندامی کڵێسان، ئەمانە سەرۆکی ئەسقەفەکانی لەندەن و یۆرك و کانتبری و..هتد ین. هەروەها بیست و یەك کورسی بۆ کۆنترین ئەسقەفەکان دادەنرێن، ئەندامەتی ئەمانەش لەگەڵ نەمانی پلەو پاییەکانیاندا نامێنن.

- لۆردەکانی دادگای پێداهەڵچوونەوە (الاستئناف) ی باڵا، کە ژمارەکەیان ٩ ئەندامە، ئەندامەتی ئەمانە لەگەڵ مردنیاندا کۆتایی پێدێ.

- ئەو لۆردانەی کە نوێنەرایەتی ئەسکوتلەندا دەکەن و ژمارەیان دەگاتە ١٦ ئەندام، ئەمانە لەلایەن سەرجەم لۆردەکانی ئەسکوتلەنداوە هەڵدەبژێردرێن نەك کەسانی تر.

- لە ساڵی ١٩٥٨ ەوە ژنان توانیان ببنە ئەندام لە ئەنجومەنی لۆردەکاندا، ئەمەش ئەندامێتی نزیکەی بیست ئەندامی ژنی لێکەوتەوە لەو ئەنجومەنەدا.

**ئەو کارانەی کە تایبەتن بەو ئەنجومەنە:**

لە مێژووی بەریتانیادا ئەنجومەنی لۆردەکان بۆ ماوەییێکی دوور و درێژ رۆلێکی بنچینەیی هەبوو و چەند سەدەییێك بوو ئەو وڵاتە حوکمڕانییێکی نادیموکراسی تیادا بەڕێوە دەچوو، کە ژمارەی ئەو کەسانەی مافی دەنگدانیان هەبوو لە(٤٪)ی هاوڵاتیانی تێپەڕ نەدەکرد، لێرەدا ئەنجومەنی لۆردەکان رۆڵێکی گرنگی لە ژیانی سیاسیدا هەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٨٣٢ بە دواوە وردە وردە ئەو رۆڵەیان کەم دەبۆوە، بەو پێیەی کە ئەوان تەنها نوێنەرایەتی چینێکی دیاریکراو دەکەن کە ئەویش چینی ئۆروستوکراتییەکان بوو لە بەریتانیا. سیستەمی پەرلەمانی زیاتر بە لای ئەوەدا دەچوو، کە (ئەنجومەنی گشتی) بکاتە نوێنەری راستەقینەی گەل دوای ئەوە و لە ساڵی ١٩١١دا یاساییێکی دەرکرد تیایدا هاتبوو، کە ئەنجومەنی لۆردەکان بۆی نییە دەسکاری یاساکانی تایبەت بە دارایی بکات[٤٤٣]. لێرەدا تەنها مافی ئەوەی هەبوو، کە ئەو یاسایانە رەتبکاتەوە کە پێوەندی بە داراییەوە نییە، بۆ ماوەییێك بوو، کە دوو ساڵی دەخایاند، ئینجا

٤٤٣ - ئەم یاسایە دوای ئەوەی ئەنجومەنی لۆردەکان بوودجەی ڕەتکردەوە، لە ساڵی ١٩٠٩دا و لە دوای قەیرانێکی زۆر دژواردا دەرچوو، ئەو قەیرانەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەنجومەنی گشتی هەڵبوەشێتەوەو سەرلەنوێ هەڵبژاردن بکرێتەوە، ئەو ئەنجومەنە نوێیەش هەمان هەڵوێستی ئەنجومەنی پێشووتری هەبوو ململانێیەکە هەر بەردەوام بوو، تا کار گەیشتە ئەوەی لە ساڵی ١٩١١دا یاسای Parliament Act دەربچێ کە دەسەڵاتە دەستوورییەکانی ئەنجومەنی لۆردەکانی کەم کردەوە، کە دەقەکەی بەمشێوەیەیە : ئەو پرۆژە یاسایانەی، کە مۆرکی داراییان هەیە و پاشا رەزامەندی خۆی لەسەر نیشان داوە، ئەگەر دوای مانگێك لە ڕەوانەکردنی لەلایەن ئەنجومەنی گشتییەوە، ئەنجومەنی لۆردەکان رەزامەندی خۆی لەسەری نیشان نەدات، ئەو یاسایە کاری پێدەکرێت.

لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٤٩دا یاسایێك دەرچوو ئەو ماوەیەی کردە یەك ساڵ[٤٤٤]. لێرەدا هەموو ئەو یاسایانەی، کە ئەنجومەنی لۆردەکان رەتیدەکردەوە، بۆ جاری دووەم ئەنجومەنی گشتی رەزامەندی خۆی لەسەری نیشاندەدایەوە وکاریان پێدەکرا و دەخرانە بواری جێبەجێکردنەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەنجومەنی لۆردەکان هێشتا خاوەنی کۆمەڵێك بیرۆکەی بنچینەییە، کە لە ناخ و ویژدانی نەتەوەی بەریتانیدا جێگیر بووە و چەند کەسایەتییێك لەسەر کورسییەکانی دادەنیشن، کە رێزی خۆیان هەیە، ئەمەش قورساییێکی مەعنەوی و گرنگییێکی زۆر دەداتە ئەنجومەنی لۆردەکان.

**١- ئەنجومەنی گشتی:**

هەرچەندە ناویان لە ئەنجومەنی گشتی ناوە (ئەنجوومەنە ناوەندییەکە)، بەڵام ئەوەی راستی بێ ئەو ئەنجومەنە دامەزراوەییێکی یاسادانانە، کە نوێنەرایەتی خەڵکی بەریتانیا دەکات، بە راستی هەر خۆی خاوەنی پرۆژە یاساکانە. ئەو ئەنجومەنە ٦٣٥ نوێنەر لە خۆی دەگرێ و لە هەڵبژاردنێکی گشتیدا و بە شێوەییێکی نهێنی و راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن و رێگە بە هەر کەسێك دەدرێ کە تەمەنی گەیشتبێتە ٢١ ساڵ خۆی کاندید بکات[٤٤٥]. سەرکەوتن لە ململانێکانی هەڵبژاردندا لەسەر بنچینەی زۆرینەییێکی رێژەیی دەبێت، واتە پاڵێوراو دەبێ زۆرترین ژمارەی دەنگەکان بە دەست بێنێ. هەروەها بوون بە ئەندام لەو ئەنجومەنەدا بە پێی یاساکانی ساڵی ١٧١٥ بۆ ماوەی (حەوت ساڵ) بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩١١دا ئەو ماوەیە بۆ (پێنج ساڵ) کەمکرایەوە. ئەنجومەنیش لە دوای هەڵبژاردندا سەرۆکێك بۆ خۆی دەسنیشان دەکات، کە بەرپرسیارێتییێکی گەورەی دەکەوێتە ئەستۆ، هەروەها بەپێی داب و نەریتەکانی پەرلەمان دەسەڵاتێکی فراوانیشی دەبێت.

---

٤٤٤ - ئەمە لە ئەنجامی رەتکردنەوەی ئەو پرۆژە یاسایەی پیشەسازی ئاسنەوە بوو کە حکومەتی کرێکاران لەو کاتەدا پێشکەشیان کردبوو لەلایەن ئەنجومەنی لۆردەکانەوە.

٤٤٥ - بەڵام لە ئینگلتەرا، ئەمریکا، ئەڵمانیا، نەمسا و...هتد، تەمەنی دەنگدەر دەبێ ١٨ ساڵی تەواو کردبێ.

### أ- سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی:

ئەو پۆستە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە و نازناوی (وتەبێژ ـ The Speaker) یان لە خاوەنی ئەو پۆستە ناوە، ئەمەش نەریتێکە بۆ سەرەتاکانی دروستبوونی ئەنجومەنی گشتی دەگەڕێتەوە لە سەدەی چواردەمدا، ئەو کاتەی کە ئەندامە تازەکانی ئەو ئەنجومەنە دوور لە لۆردەکان کۆدەبوونەوە و گفتوگۆیان ئەنجام دەدا، یەکێکیان وەك وتەبێژ رادەسپارد کە ئەنجامی گفت وگۆکانی ئەوان بگەیێنێتە (ئەنجومەنی بالاّ)، تا ئێستاش پابەندن بە هەندێك رێورەسمی ئەو سەردەمەوە، لەوانە لەبەرکردنی (رۆبێکی) تایبەتی و پرچێکی خوازراو و کاتی چوونەژوورەوەی، سەربازێك دارێك بە دەستەوە دەگرێت لە پێشیەوە رێ دەکات و... هتد.

(وتەبێژ) لە ناو ئەنجومەندا هەڵدەبژێردرێ، کە حیزبی زۆرینە ئەندامێك بۆ ئەو مەبەستە دەپاڵێوێ، هەروەها حیزبی ئۆپۆزسیۆنیش ئەندامێك بۆ خۆی دەپاڵێوێ، لەم دووانە و بە رێکەوتنی هەردوو حیزب یەکێکیان بە (وتەبێژ)، واتە سەرۆکی ئەنجومەن هەڵدەبژێردرێ، سەرۆکی ئەنجومەن بەم شێوەیەی خوارەوە کارەکانی خۆی رادەپەڕێنێ:

١- لەناو ئەنجومەندا کارەکان رێکدەخات و ئازادی و رشت بوون لە کارەکاندا دابین دەکات.

٢- بواری ئەندامەکان دەدات قسەی خۆیان بکەن، هەروەها کار بۆ ئەوە دەکات گفت وگۆکان لە چوارچێوەی ئەو بابەتە دوور نەکەوێتەوە کە گفتوگۆی لەسەر دەکرێ.

٣- ئەندامەکان ئاخاوتنەکانی خۆیان ئاراستەی ئەو دەکەن، ئەمەش رێگەییێکی کاریگەرە بۆ ئەوەی گفتوگۆکان لە نێوان ئەندامەکاندا شێوازێکی شەخسی وەرنەگرێ.

٤- ئەو تەنها وەك سەرۆکی ئەنجومەن دەنگی خۆی دەدات، ئەویش لەو حاڵەتانەدا، کە بیروڕاکان دابەشدەبن، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا لایێکیان سەربکەوێ.

### ب- تایبەتمەندییەکانی ئەنجومەنی گشتی: ـ

وەك پێشتریش باسمان کرد ئەنجومەنی گشتی تەنها خۆی دەسەڵاتی راستەقینەی یاسادانانە لە ئینگلتەرادا و دەسەڵاتێکی گەورەی هەیە، ئەو مافەشی هەیە، کە هەر یاسایێك بە باش بزانێت دای برێژێ، بەڵام وەك نەریتێك خۆی لە خستنەرووی پرۆژەیاساکاندا دەسپێشخەری ناکات، تەنها لە سنوورێکی بەر تەسکدا نەبێت، لەبەرئەوەی تەواوی حکومەت لە ئەندامانی

پەرلەمان پێکهاتوون، هەر بۆ خۆشی پرۆژەیاساکان پێشکەش دەکات، هەر خۆشی پابەندە بەو نەریتە باوە، بۆیە وەزارەتی پێوەندیدار خۆی پرۆژەکە دادەڕێژێ و یەکەمجار خۆیان لەگەڵ ئەو وەزارەتانەدا گفتوگۆی لەسەر دەکەن، کە پێوەندیان پێیەوە هەیە، ئینجا پرۆژەکە بۆ نوسینگەی سەرۆکی وەزیران دەنێردرێ، ئەویش رادەستی پارێزەرێکی تایبەتمەندی دەکات بۆ ئەوەی بە داڕشتنە یاساییەکەیدا بچێتەوە و لە دروستی داڕشتنەکەی دڵنیا بێت. ئەو پرۆژە یاسایانەی، کە لەلای وەزیری یەکەم کۆدەبنەوە پێش ئەوەی رێگە بە وەزیری تایبەتمەند، یان یەکێك لە هاوکارە پەرلەمانتارەکانی بدرێت بۆ ئەوەی بیدەنە پەرلەمان، بە پێی پلانێکی یاسادانانی دیاریکراو، کە لە سێ قۆناغ پێکهاتووە، دەدرێنە لیژنەییێك کە پێی دەڵێن: (لیژنەی یاسادانان) بەمشێوەیە: ـ

**أ- پێشکەشکردنی پرۆژەکە و بەرگری لێکردنی لەلایەن ئەو کەسەی کە پێشکەشی کردووە و پشتگیری لێکردنی لەلایەن ئەندام پەرلەمانێکەوە.**

**ب- بانگهێشتکردنی ئەنجومەن بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەسەر پرۆژەکە بکەن و هەر پرسیارێکیشیان لە بارەی پرۆژەکە هەبێ بیخەنەڕوو.**

**ت- دەنگدان لە سەر پرۆژەکە و ئینجا دەبێتە بڕیار.**

ئەنجومەنی گشتی تەنها رۆڵی یاسادانان نابینێ، بەڵکو رۆڵێکی گرنگی تری هەیە، کە ئەویش چاودێریکردنی سیاسەتی حکومەتە، لەم رێگەیەشەوە دەتوانێ لێپێچینەوە لەگەڵ گشت وەزیرەکاندا بە یەکەوە، یان یەکە یەکەیاندا بکات، هەروەها مافی ئەوەشی هەیە متمانەیان لێ بستێنێتەوە، ئەو کاتە دەبێ وەزیرەکە، یان تەواوی کابینەکە دەست لەکار بکێشێتەوە. هەروەها ئەندامانی ئەنجومەن بۆیان هەیە، کە پرسیارەکانیان ئاراستەی وەزیرەکان بکەن. لە ئامارێکی سەیردا، ئەندامانی پەرلەمان لە ماوەی ساڵێکدا هەشت هەزار پرسیاریان ئاراستەی وەزیرەکان کردبوو.

سەرەڕای ئەمە ئەندامانی پەرلەمان پاراستنی (حصانە) پەرلەمانیان هەیە و مافی ئەوەیان هەیە بە ئازادییێکی تەواوەوە بیروڕاکانی خۆیان بخەنەڕوو، هەروەها لە رێگەی وتەبێژەکەیانەوە، واتە سەرۆکی ئەنجومەنەوە دەتوانن سەردانی پاشا، یان شاژن بکەن، دەشتوانن ئەو رۆژنامەنوسانە بدەنە دادگا کە رێز لە پەرلەمان ناگرن.

## سێیەم: دەسەڵاتی دادوەری: .

هەرچەندە ئەنجومەنی لۆردەکان هیچ خەسڵەتێکی یاسادانانی تێدا نەماوە، بەڵام دەتوانێ چەند پرۆژەیاساییێك پێشکەش بکات، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەکەمی ئەو کارە دەکات. ئەوان هێشتا ڕۆڵێکی گرنگ لە کاروبارە تایبەتییەکانی دادوەریدا دەگێڕن، کە ٩ کەس لە لۆردەکان پێی هەڵدەستن و پێیان دەڵێن (لۆردەکانی یاسا)، یان (لۆردەکانی پێداچوونەوە)، چونکە ئەوان دادگای باڵای پێداچوونەوە پێکدەهێنن، کە سەرۆکی ئەنجومەنەکە خۆی (وەزیری دادە)، لە حاڵەتێکدا ئەگەر چوار لەو قازیانە ئامادە نەبوون، دەتوانن پەنا بۆ شارەزایانی یاسا ببەن لەو ئەنجومەنەدا، لێرەدا بڕیاری ئەو ئەنجومەنە بڕیاری کۆتایی دەبێت. دوو جۆرە دادگا لە دوای ئەم دەستە دادوەریە باڵایەدا دێن کە ئەمانەی خوارەوەن:

**أ- دادگا مەدەنییەکان.**

**ب- دادگاکانی کەتن.**

ئەگەرچی دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆیە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین، کە ناکرێ ئەو سەربەخۆییە لە رووی پراکتیکی و واقیعەوە سەربەخۆییێکی تەواوی هەبێت. ئەمەش لەبەرئەوەی، کە دەکرێ ئەم قازیانە لە لایەن یەکێك لە ئەنجومەنەکانی پەرلەمانەوە لە پلەکانیان لابدرێن. سەرەڕای هەموو ئەمانەش بنەماکانی دادگای باڵایە، کە (چۆنێتی بەڕێوەچوونی کێشەکان یەکلایی دەکاتەوە)، کە دادوەرەکانی دادگای باڵا، دادگای پێداچوونەوە بە پێی یاساییێك، کە لە پەرلەمان دەرچووە دایدەنێن. ئەمە جگە لەوەی، کە یاسای گشتی و یاسای هاوبەش Common Law دادوەرەکان دایانڕشتووە، کە لەو نەریتانەی لەناو خەڵکیدا باوە وەرگیراوە. دادوەرەکان لە رێگەی بڕیارەکانیانەوە بەردەوام خەریکی گەشەپێدانی یاسای هاوبەشن و لە رێگای شیکردنەوەکانیانەوە ئەو دادوەرانە یاساکان تەواو دەکەن و بەسەر ئەو حاڵەتانەدا دەیسەپێنن، کە دەخرێتە بەر دەستیان. لەم رێگەیەشەوە دادوەرەکان دەسەڵاتێکی ناڕاستەوخۆ لە یاسادانان پیادە دەکەن بەو مانایەی، کە بنەمای یاسا تازەکان دادەڕێژن. لە پاڵ ئەمەشدا ئەو دادوەرانە چەند کارێکی کارگێڕی ئەنجام دەدەن، وەك دەرکردنی فەرمانێك بۆ پاسەوانیکردن لە منداڵێك، یان دەرکردنی فەرمانێك بە ساغکردنەوەی کۆمپانیاییێك لە کۆمپانیاکان و...هتد.

بەمشێوەیە بە روونی تێکەڵبوونی هەرسێ دەسەڵاتەکە بەدی دەکەین، یان بڵێین ئەو دەسەڵاتانە لە بەریتانیادا بە تەواوەتی لە یەك جیا نەبوونەتەوە. ئەم وێنەیەی خوارەوە بۆمان روون دەکاتەوە کە چۆنە[٤٤٦].

---

٤٤٦ - تەماشای کتێبی سوعاد ئەلشەرقاوی کتێبی پێشونرل‌ـ٤٩٢ ـبکە. Phrfield British Constitution Made Simpl , opo.Cit. P.10-14.




**لێککردنەوەی دەسەڵاتەکان لە بەریتانیادا.**

**أ ، ب ، ج ئەم جێگایانە شوێنی چوونە ناویەکی دەسەڵاتەکانە.**

**تاج : پاشا سەرۆکایەتی هەرسێ دەسەڵاتەکە دەکات.**

## شەشەم: حیزبەکان لە بەریتانیادا: .

سیستەمی سیاسی لە بەریتانیادا بۆ مێژوییێکی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە، کە دەگاتە سێسەد ساڵ بەر لە ئێستا. لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەمدا دوو حیزب دروست بوون، وەك (حیزبی تۆری Tory ـ، یان حیزبی پاشایەتی کۆنەپارێز و حیزبی ویگ Whig ـ، ئازادیخوازەکان. حیزبی یەکەمیان لە ساڵی ١٦٧٩دا دامەزرا. هەر لە بنەڕەتدا ئامانجی ئەوەبوو یارمەتی جەیمس پاشای دووەم (١٦٢٣ـ١٧٠١) بدات، کە کوڕی دووەمی شارك پاشای یەکەم بوو، بۆ ئەوەی بگاتە سەر کورسی پاشایەتی. هەر لەو ساتەوەختەوە مۆرکی کۆنەپارێزی و

کۆنەپەرستی پێوە لکا، بەڵام رۆبەرت پیل (R.Peel ١٧٨٨-١٨٥٠) سیاسەتمەدارێکی بەریتانی و سەرۆك وەزیرانی پێشوو، سەرلەنوێ بە ناوی پارێزگاریکردن لە دام و دەزگاکانی ئەو حیزبە، حیزبەکەی  بە ناوی (حیزبی پارێزگاران)ەوە رێکخستەوە و توانی لە ساڵی ١٨٣٤دا یەکەم حکومەتی پارێزگاران بە سەرۆکایەتی خۆی پێکەوە بنێ، بەڵام (حیزبی ویگ) لە هەمان سەردەمی حیزبی تۆریدا لە ئەسکوتلەندا دروست بوو. هەر بۆ ئەوەش دروست بوو کە نەهێڵێ جەیمسی دووەم دەستی بگاتە کورسی پاشایەتی، چونکە ئەو زیاتر پشتگیری کاسۆلیکییەکانی دەکرد، ئەم حیزبە بەشداری لە سازدانی شۆڕشە نەمرەکەی ساڵی ١٦٨٨دا کردبوو. هەروەها بۆ بە دەسهێنانی دەسەڵات لە بەریتانیادا ململانێی لەگەڵ حیزبی تۆریدا دەکرد، لەم کارەشیدا هەندێکجار لە هەڵبژاردنەکاندا سەردەکەوت و هەندێکجاریش دەیدۆڕاند، بەڵام لە سەدەی پێشووتر حیزبی ویگ لەبەر یەك هەڵوەشایەوە و لە ساڵی ١٨٦٨دا حیزبی ئازادیخوازانی  Liberal Party لێ دروست بوو، بۆیە ئەو ناوەی لێنرا لەبەرئەوەی بانگەشەی ئازادبوونی بازرگانی دەکرد. ناودارترین سەرۆکی ئەو حیزبە ولیەم گلادستۆن ( W.Gladstone 1809 -1898) بوو، کە ئالای بزوتنەوەییێکی چاکسازی بەرفراوانی بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی هەڵگرتبوو، بەڵام ئەو حیزبە بۆ چەند جارێك کەرتبوون و دووبەرەکی بە خۆیەوە بینی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی چالاکبوونی لەسەر سیاسەتی بەریتانیادا کەم ببێتەوە و دوای ئەوە حیزبی کرێکاران جێگاکەی گرتەوە کە سەندیکاکانی کرێکاران لە ساڵی ١٩٠٠دا دروستیان کردبوو و توانی لە مانگی یەنایەرەوە تا ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٤ بە سەرۆکایەتی جەیمس ماکدۆناڵد (١٨٦٦ـ ١٩٣٧) دەسەڵات بگرێتە دەست، کە ئەمە یەکەم سەرۆك وەزیرانی کرێکاران بوو لە مێژووی بەریتانیادا، دوای ئەوە توانی لە ساڵی ١٩٢٩ تا ١٩٣١) دەسەڵات بگرێتەوە دەست. لەو بەروارەوە لەگەڵ حیزبی پارێزگاراندا کە بنیامین دزرائیلی (B.Disraeli ١٨٠٤-١٨٨١) یەکێك لە ناودارترین سەرکردەکانی بوو کە لە ساڵی ١٨٦٨دا سەرۆکایەتی وەزیرانی گرتەدەست، بۆ جاری دووەمیش لە ساڵی ١٨٧٤ ەوە تا ١٨٧٨ بوو بە سەرۆکی وەزیران، هەروەها ونستۆن چەرچڵ (١٨٤٧ـ١٩٦٥) لە ماوەی شەڕی جیهانی یەکەمدا (١٩٤٠ـ١٩٤٥) وەك ئەستێرەیێکی درەوشاوە دەرکەوت، کە ئەو کاتە توانی بەریتانیا لە لێوارەکانی لەناوچوونەوە بەرەو سەرکەوتن بەرێت، بەڵام لە دوای کۆتاییهاتنی شەڕەکە حیزبی پارێزگاران لە دەسەڵات لادرا و کرێکاران دەسەڵاتی وەرگرتەوە. لەوکاتەوە ململانێکان لەنێوان ئەو دوو حیزبەدا لە سەر دەسەڵات گەرمتر بوو، لە

هەڵبژاردنەکانیشدا هەندێکجار پارێزگاران سەردەکەوتن و هەندێکجاریش کرێکاران سەردەکەوتن. لە مایۆی ۱۹۷۹دا حیزبی پارێزگاران لە حیزبی کرێکارانی بردەوە، هەر لەو کاتەوە مارگرێت تاتچەر (M.Thatchar ۱۹۲٥-.....) کە سەرۆکی حیزبی پارێزگاران بوو توانی تا ساڵی ۱۹۹۰ سەرۆکایەتی وەزیران وەربگرێ، ئەمەش یەکەمجار بوو لە مێژووی بەریتانیادا شتی وا رووبدات.

ئەوەی راستی بێ لە رووی رێکخستنەوە بە باشترین حیزب دەژمێردرێ لە بەریتانیادا، ئەو رێکخستنەش بە یەکێك لە رێکخستنە ئاڵۆزەکان دادەنرێ، کە لە سەردەمێکی کۆنەوە بۆی ماوەتەوە، چونکە ئەو رێکخستنەی ئێستای حیزب بۆ سەدەی نۆزدەم دەگەڕێتەوە، کاتێك کە سێ ئاستی رێکخستن لە پێکهاتەکەیدا سەری هەڵدا.

أ- رێکخستنی نیشتمانی، کە خۆی لە یەکێتی نیشتمانی کۆمەڵەکانی پارێزگاراندا دەنوێنێ کە لە ماوەی نێوان ساڵانی (۱۸٦۷ ـ۱۸٦۸)دا دامەزرا.

ب- حیزبی پەرلەمانی کە لە ساڵی ۱۹۲۲ ەوە ئەو شێوەیەی ئێستای وەرگرتووە و ئەو ئەندامانەی حیزب دەگرێتەوە کە بۆ ئەنجومەنی گشتی هەڵبژێردراون، یان ئەوانەی لە ئەنجومەنی لۆردەکان دامەزرێنراون، ئەم حیزبەش ناوی لێنراوە لێژنەی ۱۹۲۲.

جـ - مەکتەبی ناوەندی حیزب کە لە ساڵی ۱۸۷۰دا دامەزراوە، ئەم مەکتەبەش سەنتەری وەرگرتنی بڕیارەکانە لە ناو حیزبدا.

ئەم شێوە رێکخستنە سێ لایەنەییە تا دۆڕاندنەکەی ساڵی ۱۹٤٥ بەردەوام بوو، بەڵام ئەو دۆڕاندنە ناچاری کرد شێوازی رێکخستنەکانی خۆی نوێ بکاتەوە. هەروەها حیزب ئیدارەییێکی دارایی چالاکی بۆ خۆی دامەزراند و شێوازەکانی بانگەشەی هەڵبژاردنی نوێی پیادە کردو و گەشەی پێدا، دەرگای هاتنە ناو حیزبی بۆ خەڵکی کردەوە و بووە حیزبێکی جەماوەری کراوە و لە هەموو بازنەکاندا لێژنەی هەڵبژاردنی دانا و نزیکەی نیوەی ئەندامەکانی بۆ کاری حیزبی پەژراند و لە حیزبەوە مانگانەی بۆیان بڕیەوە. حیزب سیاسەتێکی پارێزگارانەی کۆن پیادە دەکات کە لەمانەدا خۆی دەنوێنێ، کەمکردنەوەی رۆڵی دەوڵەت لە چالاکییە ئابورییەکاندا و نەهێشتنی کەرتی گشتی، لەگەڵ بەرەنگاربوونەوەی تاوان بە شێوەییێکی توند و دانانی چەند کۆت و مەرجێك لە سەر کۆچکردن... هتد.

## یەکەم: چەند شتێك لە بارەی مێژووی دیموکراسی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا:.

لە سەدەی هەژدەمدا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەژێر چەپۆکی داگیرکارانەی بەریتانیادا دەینالاند، تەنها یەك ولایەتیش نەبوو کە لەلایەن بەریتانیای مەزنەوە داگیر نەکرابێ، کە پێیان دەگوت دەسەلاتی دژە یاساکان، کە ئەنجومەنی موستەعمەرەکان رەزامەندی خۆی لەسەر نیشان دەدا، ئەو ولاتە نە لە رووی سیاسی و نە لە رووی ئابورییەوە، هیچ جۆرە سەربەخۆییێکیان نەبوو. بۆ نموونە: کاتێك، کە ئەنجومەنی کارۆلینای خواروو رەزامەندی خۆی لەسەر یاساییێك نیشاندا، کە باجێکی قورس بخرێتە سەر هاوردەکردنی کۆیلە: (لەبەرئەوەی هەستی بە مەترسییێکی زۆری کۆمەلایەتی و سیاسی دەکرد لەبەر زۆربوونێکی بێ ئەژماری کۆیلەکان لەو موستەعمەرەیەدا، بەلام (تاجی شاهانەی بەریتانیا ئەو بڕیارەی هەلوەشاندەوە) بەو بیانوەی، کە بازرگانیکردن بە کۆیلە پڕقازانجترین بەشەکانی بازرگانی ئینگلیزە..)، ئەوە گرنگ نەبوو، کە دوای ئەوە ئەو جۆرە بازرگانییە چی بەسەر موستەعمەرەکان دێنێ! ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ، کە یاسا پەرلەمانییەکانی بەریتانیا زۆربەی جارەکان لەسەر حیسابی دەولەتە داگیرکراوەکان هەرچییێکی باش بووایە بۆ ولاتی دایك، کە بەریتانیایە دەیانکرد، ئامانجیشیان ئەوەبوو، کە ئەمریکا بکەنە بازاڕێکی کالا پیشەسازییەکانی بەریتانیا و تەگەرە بخەنە پێش گەشەکردنی ئەو پیشەسازیانەی ولاتە داگیرکراوەکان، کە کێبڕکێی پیشەسازییەکانی ئینگلتەرا دەکەن، بۆیە پیشەسازی کوتالّ و شەبقە و ئەو کالایانەی لە پێستە دروست دەکرێن و بەرهەمەکانی ئاسن لە خەلکی ولاتە داگیرکراوەکان قەدەغە کرابوو[٤٤٧].

لەلاییێکی تریشەوە ئینگلتەرا کۆتوبەندێکی زۆری بۆ بازرگانە ئەمریکییەکان دانابوو، چونکە ئەوان جگە لە پاپۆڕەکانی بەریتانیا نەیاندەتوانی بە هیچ پاپۆڕێکی دیکە کەل و پەلەکانی خۆیان بگوازنەوە و نەشیاندەتوانی توتن و پەمۆ و حەریر و قاوە و شەکر و برنج و

---

٤٤٧ - وۆل دیورانت (قصة الحضارة) بەرگی ٤٢ وەرگێڕانی فوئاد ئەندراوس، دار ئەلجیل بەیروت سالّی ١٩٨٨ لـ ٧٦ـ.

زۆر کەل وپەلی تریش لە بەریتانیا زیاتر بە هیچ وڵاتێکیتر بفرۆشن، هەروەها هەرکەلوپەلێکیشیان لە ئەوروپاوە هاوردە بکردایە دەبووایە لە کەنارەکانی بەریتانیا گومرکی بکەن، ئینجا هەر بە پاپۆڕەکانی بەریتانیاش بیگوازنەوە بۆ ئەمریکا!.

لە ئازاری ١٧٦٣دا پەرلەمانی بەریتانی (یاسا بە ناوبانگەکەی تەمغە)ی دەرکرد، کە تیایدا داوا دەکات هەرچییێك لەبەڵگە نامە و سەنەد و دبلۆمات و کۆمپیالە و گرێبەست و پسولەی دابینکرن و رۆژنامەییێك...هتد، لە موستەعمەرەکات دەر بچێت دەبێ پولی لێبدرێت. ئەم یاسا نوێیە نارەزاییێکی زۆری لەناو خەڵکی وڵاتە داگیرکراوەکاندا دروست کرد، سەرکردەکانیان زۆر بە توندی هێرشیان کردە سەری و لە ساڵی ١٧٦٥دا چەند کۆمەڵەییێك بە ناوی (کوڕانی ئازادی) دروست بوو و چەندین کۆڕو کۆبونەوەیان بەست بۆ ئەوەی نارەزایەتی خۆیان بەرامبەر بەو غەدرانەی، کە پەرلەمانی ئینگلیزی لە دژی مافەکانی هاوڵاتیە ئازادەکانی وڵاتە داگیرکراوەکان دەیکات، بەو باجەی، کە دەیخاتە سەر وڵاتە داگیرکراوەکان لە رێگای ئەو پەرلەمانەی کە کەسێکی ئەوانی تێدا نییە نیشاندا و لە کۆنگرەی فلادلفیادا (یەکەم کۆنگرەی کیشوەری) بوو (سمۆئیل ئادەمز ١٧٧٢ Adams .لـ١٨٠٣)کە یەکێکە لە سیاسەتمەدارە رادیکالییەکانی ئەمریکا هەڵسایە سەر پێ و گوتی: ((ماگناکارتا) ئەو نەریتە ئینگلیزیەی کە بۆیان ماوەتەوە و ئەو شەڕە ناوخۆییەی کە لە سەردەمی شارلی یەکەمدا روویدا و (بەڵگەنامەی مافەکان)، رێگە بەوە نادەن، کە هیچ باجێکیان بخرێتە سەر ئەگەر خۆیان، یان نوێنەرە شەرعییەکانیان پێی رازی نەبن ـ بۆیە چۆن رێگە بەوە دەدرێ لە پەرلەمانێکەوە باج بخرێتە سەر وڵاتە داگیرکراوەکان، کە کەسی ئەوانی تێدا نییە؟). بەریتانییەکان بەمە وەڵامیان دانەوە کە ناخۆشییەکانی هاتوچۆکردن وادەکات کە بوونی نوێنەرانی ئەمریکییەکان لە پەرلەماندا بە شێوەییێکی پراکتیکی لە تواناادا نەبێ، بەڵام ئەمریکییەکان بڕوایان بەو وەڵامەی ئەوان نەکرد و دوای ئەوەی حکومەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٧٦٧دا چەند یاساییێکی دەرکرد بۆ ئەوەی باج بخاتە سەر چەند هاوردەییێك نائارامی و ناسەقامگیری زیاتر پەرەیان سەند و هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسایانە لە ساڵی ١٧٧٠دا تەنها بە شێوەییێکی کاتی توانی ئەو نائارامیە هێور بکاتەوە، بەڵکو باجی سەر (چا)یەی هێشتەوە تەنها بۆ ئەوەی بڵێن پەرلەمان مافی ئەوەی ماوە باج بخاتە سەر خەڵکی.

وەزیری دارایی بەریتانی پێشنیازی ئەوەی کرد، کە موستەعمەرەکان پابەند بکرێن بە خەرجکردنی خەرجییەکانی ئەو هێزە ئیداری و سەربازیانەی، کە بۆ پارێزگاریکردنی ئەوان لە

ئاژاوەو پشێویە ناوخۆیی و هێرشە دەرەکییەکان لەوێ هێڵدراونەتەوە، پەرلەمانیش ڕەزامەندی خۆی لەسەری نیشاندا، ئەمریکییەکانیش زۆر بە توندی بەرەنگاری ئەو یاسایە بوونەوە و ئەنجومەنی ویلایەتەکان لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە چیتر کەل و پەلی بەریتانی نەکڕن و ئاژاوە هەمو ویلایەتەکانی گرتەوە، ئەو هەست بە بێزاریکردنە زۆرە لەو کۆمەڵە موستەعمەرەیەی کە بە (نیو ئینگلاند) ناسراوە لە ساڵی ١٧٧٣دا بووە هۆی ئەو خۆپیشاندانەی، کە بە (ئاهەنگی چایەی بۆستن) ناسرابوو[٤٤٨]. پەرلەمانیش بە چەند یاسایێك وەڵامی دانەوە، کە لەلای خەڵکی ئەو موستەعمەرانە بە (یاسا چاوەڕواننەکراوەکان) ناسرابوو. بەم شێوەیە بەرەنگار بوونەوە بە نەزمێکی خێرا بەرەو پێش دەچوو، لەو حاڵەتەشدا دەبووایە شەڕی چەکداری ڕوویدات و لە ساڵی ١٧٧٤دا ئەنجومەنەکان یەکەمین کۆنگرەی خۆیان بەست، کە بە (کۆنگرەی کیشوەری یەکەم) ناسرابوو و لە کۆنگرەی کیشوەری دووەمیشدا، کە لە ساڵی ١٧٧٥دا بەسترا، جۆرج واشنتۆن بە فەرماندەی هێزی سەربازی دەسنیشانکرا[٤٤٩]. دوای چەند شەڕێکی قورس و بە هاوکاری فەرەنسا سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنیان بە دەستدەهێنا، تا لە چواری یۆلیۆی ١٧٧٦دا هەر سێزدە ویلایەتەکەی، کە دەڕواننە سەر زەریای ئەتلەنتی لە ئەمریکای باکوردا لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیای مەزن ئازادکران و لە ساڵی دواتردا ئەمریکییەکان لە ناوچەی ساراتۆگادا Saratoga سەرکەوتنی باشیان بە دەستهێنا و لە ناوچەی یۆرك تاون York Town فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا، کە ناوی لۆرد کۆرن والیس

---

٤٤٨ - ئەمریکییەکان بە جلوبەرگی هیندیە سوورەکانەوە هێرشیان کردە سەر پاپۆڕێکی بەریتانی کە چایەی بارکردبوو و بارەکەیان هەر هەمووی فڕێدایە ناو دەریاوە.

٤٤٩ - جۆرج واشنتۆن (١٧٣٢ـ١٧٩٩) تا سەرکەوتنی کۆتایی سەرکردایەتی شەڕی سەربەخۆیی کرد و دوای سەرکەوتن بە یەکەم سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژێردرا (١٧٨٩ـ ١٧٩٧) و لە ساڵی ١٧٨٧دا بەشداری لە دانانی دەستووردا کرد و لەو کاتەی سەرکۆماربوو کاری زۆری بۆ ئاشتی کرد. هەروەها ڕەتیکردەوە، کە بۆ جاری سێیەم خۆی بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژێرێتەوە و لە ساڵی ١٧٩٦دا وتارە بە ناوبانگەکەی خۆی خوێندەوە کە بە وتاری ماڵئاوایی ناسرابوو، کە تیایدا خەڵکی ئەمریکای لەوە ئاگادار کردەوە، کە لەگەڵ وڵاتانی بێگانەدا هاوپەیمانێتی نەبەستن. ئەمریکییەکان لەبارەی ئەو پیاوە دەڵێن : ئەو پیاوە لە شەڕدا یەکەم بوو و لە ئاشتیشدا یەکەم بوو و یەکەم کەسیش بوو لە ناو دڵی هاوڵاتییەکانی خۆیدا.

Lord Corn Wallis بوو خۆی بە دەستەوەدا و لە ساڵی ١٧٨١دا[٤٥٠] شەڕ بە یەکجارەکی کۆتایی پێهات و لە سەپتەمبەری ١٧٨٣دا پەیمانی کۆتایی ئاشتی لەنێوان ئەمریکاو بەریتانیادا لە پاریس مۆر کرا کە بە (پەیمانی پاریس) ناسراوە، لەو پەیمانەدا بەریتانیا دانی بە دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا نا.

## دووەم: ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی: ـ

لە چواری یۆلیۆی ١٧٧٦دا لە دایکبوونی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاگەیێندرا، هەروەها گرنگترین بەڵگەنامەی مێژوویی ئەمریکیشی لە گەڵدا ڕاگەیێندرا، کە ڕاگەیاندنە بەناوبانگەکەی سەربەخۆیی ئەمریکا بوو، هەندێك لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن کە ئەو بەڵگەنامەیە لەهەموو سەردەمەکاندا بە گرنگترین بەڵگەنامەی مێژوویی دادەنرێ. ئەو بەڵگەنامەیە (تۆماس جیڤرسۆن).[٤٥١] بەمشێوەیەی خوارەوە دایڕشتبوو: ـ

(ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەم ڕاستیانەی خوارەوە زۆر ڕوون و ئاشکران، ئەویش ئەوەیە، کە خەڵکی هەر هەمووی لە کاتی هاتنە دونیاوە یەکسانن، کە خوداوەند چەند مافێکی پێ بەخشیون، ئەو مافانەش بۆتە بەشێك لە سروشتی ژیانیان، وەك (مافی ژیان) و (مافی ئازادی) و (گەڕان بەدوای خۆشگوزەرانییەکانی ژیاندا) و بۆ ئەوەی خەڵکی دەستی بگاتە ئەو مافانە لەنێوان خۆیاندا هەڵسان بە دروستکردنی حکومەت، ئینجا ئەو حکومەتە هەر سیستەم شێوەییێکی هەبێ، دەسەڵات و دادپەروەرییەکانی خۆیان لە ڕەزامەندی خەڵکی وەردەگرن،

---

٤٥٠ - لۆرد کۆرن والیس خۆی لەگەڵ هەزاران کەس لە سەربازەکانی، دوای دوو مانگ ئابلۆقەدان لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە خۆی بە دەستەوەدا.

٤٥١ - تۆماس (١٧٤٣ ـ١٨٢٦) سێیەم سەرۆکی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکایە (١٨٠١ـ١٨٠٩)، ئەو خۆی بەڵگەنامەی سەربەخۆیی ئەمریکای نووسیوەتەوە و بڕیاری وەقفی هەڵوەشاندەوە، ئەو کاتە میرات تەنها بەر کوڕی گەورە دەکەوت، ئەو هەڵیوەشاندەوە و هانی ئازادی دا و سیستەمی قوتابخانە گشتییەکانی دامەزراند. هەروەها وەك وەزیرێکی ڕێگە پێدراو لە فەرەنسادا کاریکردوە (١٧٨٥ـ١٧٨٩). دوای ئەوە بۆتە وەزیری دەرەوە (١٧٩٠ـ ١٧٩٣)، پێوەندی بە گروپی کۆمارییەکانەوە کرد، کە ڕێگەیان بۆ دروستبوونی حیزبی دیموکراتی ئێستا خۆشکرد و شاری واشنتۆنی کردە پایتەختی ئەمریکا. لە گرنگترین کارەکانیشی (کرینی ) لۆزیریانا بوو لە فەرەنسا و زانکۆی فەرجینیای دامەزراند و وەك بەڕێوەبەرێکیش کاری تێدا کرد.

ئەگەر هات و بەو شێوەیە نەبوون، کە خەڵکی پێی رازی بێ، ئەو کاتە خەڵکی مافی ئەوەی هەیە، کە ئەو حکومەتە بگۆڕێ، یان لایبەرێ و حکومەتێکی تر لە جێگاکەی دابمەزرێنێ، کە پرەنسیپ و شێوەی کارکردنی بە شێوەییێك ریکخرابێ، کە کارەکانی بە شێوەییێکی روون و ئاشکرا دیار بێ و مافەکانی خەڵکی دابین بکات.[٤٥٢]

ئەم بەڵگەنامەیە بیروبۆچوونەکانی رۆحی شۆڕشی ئەمریکی دەردەبڕی، ئەم بەڵگەنامەیە چەندین پرەنسیپی گرنگی تێدایە، کە هەڵوەستە بە مرۆڤ دەکات، چونکە دواتریش لە شۆڕشی فەرەنسادا و لە جاڕنامەکەی مافی مرۆڤیشدا کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٠ی دیسەمبەری ١٩٤٨دا دەریکرد دووبارە دەبێتەوە ـ کەوا مافی یەکسانی و ئازادی ژیان و بە دەستهێنانی خۆشگوزەرانی، کە خۆی لە خۆیدا چەند شتگەلێکی روون و ئاشکران ـ واتە بەڵگەنەویستن ـ کە ئەو راستیانە پێویست بە سەلماندن ناکەن، چونکە ئەمانە چەند مافێکن کە لەلایەن خوداوە بە مرۆڤ بەخشراون، نەك وەکو خێرێك بێ لەلایەن فەرمانڕەواکانەوە بدرێتە خەڵکی، هەرکاتێك حەز بکات بیداتێ و حەزیشی لێ نەبێ لێی بستێنێتەوە، بەڵکو ئەو مافانە بەشێکن لە بوونی مرۆڤدا، بە شێوەییێك، کە هەرگیز مرۆڤ بەبێ ئەو مافانە وەك مرۆڤێك خوێندنەوەی بۆ ناکرێ و ئەگەر هەر حکومەتێکیش لەناو خەڵکیدا سەری هەڵدا، ئەمە لەبەرئەوەیە، کە ئەو خەڵکە خۆیان ئەو حکومەتەیان بنیاد ناوە، بۆ ئەوەی ئەو مافانەیان بۆ بپارێزێ و ئەگەر هات و هەر تەگەرەییێکیش بخاتە بەردەم ئەو مافە مرۆڤایەتیانە، ئەوە خۆیان ئەو حکومەتە دەگۆڕن، یان لایدەدەن.

باشە دەبێ ئەو بەڵگەنامەیە بابەتەکانی خۆی لە کوێوە هەڵهێنجابێ؟. بەپێی دانپیێدانانەکانی خودی خۆیان بیرۆکەی ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەنامەیە لە داهێنانی دانەرەکانیدا نەبووە،[٤٥٣] بەڵکو (جۆن لۆك) (١٦٣٢ـ١٧٠٤) ی فەیلەسوفی ئینگلیزی سەرچاوەی ئەو بیرۆکە سیاسیە بوو، کە لەکاتی شۆڕشەکەیدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای تەنیبۆوە ، ئەو

---

٤٥٢ - تەماشای کتێبەکەی د. زەکی نەجیب مەحمود (حياة الفكر في العالم الجديد) بکە، دار ئەلشروق لە میسر چاپی دووەم ساڵی ١٩٨٢ هەروەها تەماشای کتێبەکەی جۆن دیوی (الحرية والثقافة) بکە کە ئەمین موسا قەندیل وەریگێراوە لە کتێبخانەی ئەنگلۆمیسری لــ٢٢٨ و ٢٢٩ــــ.

٤٥٣ - تەماشای کتێبەکەی د. زەکی نەجیب مەحمود (حياة الفكر في العالم الجديد) لــ١٣ـــ، و کتێبەکەی د. عیسمەت سەیفولدەولە (الاستبداد الديمقراطي) لــ١٥ـــ بکە.

سەرچاوەیە بوو، کە سەرکردەکانی شۆڕشی ئەمریکی بە شێوەیێکی راستەوخۆ پرەنسیپەکانی خۆیان لێ هەڵدەهێنجا،[٤٥٤] ـ پێش هەر هەموو شتێك ـ ئەمریکییەکان ئەو چەك و بەهانانەی کە هێرشیان پێدەکردە سەر پاشا و پەرلەمان لەو حوکمڕانییە زۆرداریەی کە دەیانکرد، لە (نوسینەکانی جۆن لۆك) وەریان دەگرت. ئەگەر یەکێك هەبێ لە کاتی شۆڕشەکەی ئەمریکادا بڵێین باڵی بە سەر فەلسەفەی سیاسیدا کێشابێت، دەبێ بڵێین ئەو کەسە (جۆن لۆك)ە، کەواتە بیری سیاسی ئەمریکی تەنها شیکردنەوەی نوسینەکانی لۆك بووە. تەنانەت ئەمریکییەکان خۆیان دەڵێن لۆك (فەیلەسوفێکی ئەمریکی)یە و دانەری بنچینەی بیرۆکە سیاسیەکەیێتی.[٤٥٥]

شەڕ بە شێوەیێکی پراکتیکی لەگەڵ مۆرکردنی دواپەیمانی ئاشتیدا لە ٣ی سەپتەمبەری ١٧٨٣ کە لە (ڤێرسای ـ پاریس) دا بەسترا کۆتایی پێهات، لەوێدا حکومەتی ئینگلتەرا دانی بە سەربەخۆیی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دانا. لەو سەردەمەدا ئەو نەتەوە گەنجە خۆی لە بارێکی ئابوری قورسدا دیتەوە، ئەمەش لەبەرئەوە نییە بۆ جیاوازی سیستەمەکە بگەڕێتەوە، کە حکومەتەکەی لەسەر بنیاد نرابوو، بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە لەلایەن ئینگلتەرا و وڵاتە ئەوروپاییەکانەوە وەك گەلێکی بێگانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا، چونکە نەیاندەهێشت پاپۆڕە ئەمریکییەکان بەشداری لە هەڵگرتنی بارە بازرگانییەکانی دوورگە هیندییەکانی خۆرئاوای بەریتانیادا بکەن، کە ئەو بازرگانیانە لە پێش شۆڕشدا گرنگیێکی زۆری بۆ ئابووری ئەمریکا هەبوو، ئەمەش چەند گیروگرفتێکی ئابووری ماوە درێژی لێکەوتەوە و لە ساڵانی ١٧٨٤، ١٧٨٥دا بووە هۆی بێ بازاڕییێکی زۆر، کە لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٨٧دا کەمێك هاتەوە ئاستی خۆی، ئەگەرچی بەندەکانی وڵاتە سوێندخۆرەکان لەو هەڵوێستە دژوارەی وڵاتدا

---

٤٥٤ - لەگەڵ ئەوەشدا دکتۆر عیسمەت سەیفولدەولە وا باسی دەکات کە (جۆن لۆك لە درۆکردن لەگەڵ گەلاندا بۆ بێتاوانکردنی زوڵم و زۆرداریەکان پێش هەر هەموو فەیلەسوفەکانی تر کەوتۆتەوە، لــ٦٣ــ، دەڵێ (جۆن لۆك فەیلەسوفی زوڵم و زۆرەکانی بۆرجوازیە ) لــ٦٤ــ. لە دواییدا گفت وگۆ لەسەر بیروڕاکانی دەکەین.

٤٥٥ - لێرەدا وانەیێك هەیە دەبێ ئاگاداری بین، ئەویش ئەوەیە کە (جۆن لۆك ) خۆی فەیلەسوفێکی ئینگلیزییە و ئەمریکییەکان سود لە فەلسەفەکەی وەردەگرن و بیرۆکەی شۆڕش و ئەو چەکەی کە هێرشیان پێدەکردە سەر پاشاو پەرلەمانی ئینگلیزی لەوەوە وەریان گرتبوو، بگرە ناویان نابوو (فەیلەسوفە ئەمریکیەکە) و کەس نەیدەگوت فەیلەسوفی ئەو وڵاتەیە کە چەندین ساڵە ئێمەی داگیر کردووە و دەمانچەوسێنێتەوە.

ئەوەندە بەرپرسیار نەبوون، بەڵام گلەییێکی توندی ئاراستە کرا، ئەو کات لەو باوەڕەدا بوون، کە گونجاو نییە. لەدوای ئەزموونی پارەی کاغەز، کە ویلایەتەکان دەریان چواند باری ئابووری بەرەو خراپتر ڕۆیشت و دوای ئەوەی کۆنگرێس، کە نەیتوانی بڕە پارەییێکی گونجاو کۆبکاتەوە، لە کاتێکدا بێتوانایی حکومەتی ناوەندیش جێگەی داخێکی زۆر بوو.[٤٥٦] لێرەدا ناکۆکی کەوتە نێوان سەرکردە سیاسییەکان و یەکێك لە گروپەکان داوای دەکرد دەسەڵاتەکانی گەل سنوردار بکرێن و حکومەتێکی بەهێز دروست بکرێت، کە بتوانێ تاکەکان و مافەکانی ئەو تاکانە بپارێزێت، ئەو گروپەش جۆن ئادەمز J. Adams سەرکردایەتی دەکرد.[٤٥٧] یەکێك لە گروپەکانی تر دەیانگوت، بەڵگەنامەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی و ئەو پرەنسیپانەی، کە تێیدایە گوزارشت لە ڕۆحی شۆڕش دەکات، بۆیە دەبێ بڕیارێك دەربکرێ، کە دەسەڵاتەکانی حکومەت سنوردار بکرێت، پشتگیری لە دەسەڵاتی ڕەهای گەل بکرێت و دان بە بیرۆکەی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا بنرێت.

لە ٥ی مایۆی ١٧٨٧دا (ئەنجومەنی دەستووری) بۆ دانانی دەستوور کۆ بۆوە، دوای چوار مانگ کارکردنی بێ وچان ئەنجومەنەکە دەستووری دانا و لە ١٧ی سەپتەمبەری ١٧٧٨دا هەر هەموو ئەو ئەندامانەی لە کۆبونەوەکەدا ئامادە بوون دەستوورەکەیان مۆرکرد و بەڵگەنامەکەیان بۆ ویلایەتەکان ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر پێشان بدەن، بە مەرجێك ئەگەر نۆ ویلایەت ڕەزامەندی خۆی لەسەری پێشاندا ئەوە کاری پێدەکرێ. لە یۆلیۆی ١٧٧٨دا ویلایەتی (نیو هامشیر) ـ کە ویلایەتی نۆیەم بوو

---

٤٥٦ - تەماشای (موسوعة العالم) ولیەم لانجەر بەشی چوارەم کتێبخانەی نەهزەی میسری ساڵی ١٩٦٣ لـــ١٣٨٤ـــ. و(تاريخ النظريات السياسية و تطورها) حەسەن خەلیفە چاپخانەی ئەلحەدیسە لە قاهیرەدا لـــ٢٦٤ ـــ بکە.

٤٥٧ - جێگری سەرۆك (جۆرج واشنتۆن ١٧٨٩ـ١٧٩٧) بوو و ئەندامی پەرلەمانی کیشوەری (١٧٧٤ـ١٧٧٨) یش بوو و لەسەر جاڕنامەی سەربەخۆیی ئەمریکاش مۆری کردبوو و لە ساڵی ١٧٧٩ شدا بۆ بەشداریکردن لە دانوستانەکانی نێوان بەریتانیا و ئەمریکا لە پاریس بەشدار بوو، کە لە ساڵی ١٧٨٣دا بە مۆرکردنی پەیمانەکە کۆتایی هات و کۆتایی بە شۆڕشیش هێنا و لە ساڵی ١٧٨٥دا بووە یەکەم باڵیۆزی ئەمریکا لە لەندەن، هەروەها کوڕە گەورەکەی جۆن ئادەمز (١٧٦٧ـ ١٨٤٨) بووە شەشەم سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (١٨٢٥ـ ١٨٢٩).

ڕەزامەندی لەسەری پێشاندا، لەو ڕۆژەوە دەستوورەکە کاری پێکرا، لە هەندێك ویلایەتیشدا ئەوانەی ناڕازی بوون بڕوایان بەو بەڵێنانە کرد، کە ئەگەر ئێستا لەسەری ڕازی بن دواتر هەندێك راستکردنەوەی تێدا دەکەن.[٤٥٨]

## سێیەم دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: .

بە بۆچوونی لێکۆڵەوەرەکان دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە کۆنترین دەستووری نوسراو دەژمێردرێ، کە ئێستا لە جیهاندا جێبەجێدەکرێ ـ (بەو پێیەی کە لە ئینگلتەرادا دەستوورێکی نوسراو بوونی نییە) ـ و تیایدا سیستەمی سەرۆکایەتی پیادە دەکرێ، کە بە نمونەیێکی روون و کلاسیکی سیستەمی سەرۆکایەتی دادەنرێ و دەستووری ئەمریکی خۆی یاساییێکی بنچینەیی سیستەمی فیدرالیە لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا، ئەو دەستوورە تەنها پرەنسیپە گشتییەکان لەخۆی دەگرێ و پیرۆزییێکی تایبەتی خۆی هەیە و هەتا ئێستاکەش کاری پێدەکرێ، دوای ئەوەی لە ماوەی دوو سەدەدا بیست و حەوت جار راستکردنەوەی بۆ کراوە. ئەم دەستوورە چەند مافێکی بەر فراوانی بۆ هاوڵاتی ئەمریکی دەستەبەر کردووە، لە هەمانکاتدا چەند پێگەییێکی پتەوی بۆ سیستەمی فیدرالی داڕشتووە کە لەسەر جیاکردنەوەی تەواوی هەرسێ دەسەڵاتەکە وەستاوە: جێبەجێکردن ـ یاسادانان ـ دادوەری، لەگەڵ دروستکردنی هاوسەنگییێك لەنێوانیاندا، کە بتوانن چاودێری یەکتری بکەن. لە کاتێکدا هەر دەسەڵاتەو کارەکانی خۆی بەرامبەر بە دەسەڵاتەکانی تر بەپێی دەستوور جێبەجێ دەکات.[٤٥٩]

### دەقە بنچینەییەکانی دەستووری ئەمریکی لە حەوت ماددە پێکهاتووە کە ئەمانەن: ـ

١- ماددەی یەکەم تایبەتە بە رێکخستنی کۆنگرێس، وەك دەسەڵاتەکانی و سنوورەکانی و ئەو کردەوانەی لەو بوارەدا دێنە ئاراوە و پێکهاتنی لە دوو ئەنجومەندا: ئەنجومەنی نوێنەران و ئەجومەنی پیران.

---

٤٥٨ - ولیەم لانجەر لـ١٣٨٦ـ.

٤٥٩ - تەماشای د. محەمەد قاسم ئەنەس جەعفەر کتێبی (النظم السياسية والقانون الدستوري) دارئەلنەهزە ئەلعەربیەی ساڵی ١٩٩٩. و (موسوعة العلوم السياسية) کە زانکۆی کوێت لە ساڵی ١٩٦٤ دا دەریکردوە، بەرگی دووەم لـ١٥٣٥ـ.

٢- بەڵام ماددەی دووەم تایبەتە بە چۆنێتی هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگرەکەی و دەسەڵات و ئەرکی هەر یەکێك لەوانە.

٣- ماددەی سێیەم دەسەڵاتەکانی (دادگای باڵا) و دادگاکانی تر دەسنیشان دەکات، کە کۆنگرێس بڕیار لە دامەزراندنیان دەدات.

٤- بەڵام ماددەی چوارەم زیاتر لەبارەی پێوەندییەکانی نێوان ویلایەتەکان و هاوڵاتییەکانی خۆیەتی، ئەمە لەلایێك، لەلایێکی تریشەوە، لە بارەی پێوەندییەکانێتی لەگەڵ ئەو ویلایەتە تازانەی کە رێگەیان پێدەدرێ بێنە ناو یەکێتیەکەوە.

٥- ماددەی پێنجەمیش ئەو کارانە رێکدەخات کە لە راستکردنەوەی هەر ماددەییێکی دەستووردا پێویستە بگیرێتە بەر.

٦- ماددەی شەشەمیش باس لە قەرزە گشتییەکان و پیرۆزی دەستوور و پێویستی پابەندبوون پێیەوە دەکات.

٧- بەڵام ماددەی حەوتەم و دوا ماددە شێوازی داڕشتنی دەستوور و چۆنێتی رەزامەندی نیشاندان لەسەر ماددەکانی دەسنیشان دەکات.[٤٦٠]

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە لە یۆنیۆی ١٧٨٨دا ئەو دەستوورە رەزامەندی لە سەرنیشاندرا و کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێ، کە ماددەکانی ئەو دەستوورە وەك خۆی بمێنێتەوە و دەسکاری نەکرێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ١٥ی دیسەمبەری ١٧٩١دا کۆنگرێس پێشنیازی ١٢ گۆڕانکاری لەو دەستوورەدا کرد (واتە تەنها سێ ساڵ دوای دەرچوونی ئەو دەستوورە). ئیتر بەمشێوەیە گۆڕانکارییەکان یەك بەدوای یەکدا دەکران، تا گەیشتە بیست و شەشەمین جار کە لە ١٥ی یۆلیۆی ١٩٧١دا رەزامەندی لەسەر درا. گۆڕانکاری بیست و حەوتەمیش کە ناوی نرا (مافەکانی یەکسانی) کە کۆنگرێس لە ٢٢ی مارسی ١٩٧٢دا رەزامەندی لەسەر نیشاندا.[٤٦١]

---

460 - Encyclopedia Britannica , Vol. 3,P.106&Vol.X .

٤٦١ - ئەو گۆڕانکاریە زۆرانەی، کە لە دەستووردا کران، دەتوانین ئەو بابەتانەی، کە ڕاستکردنەوەکان چارەسەریان کردووە بەمشێوەیەی خوارەوە کورتی بکەینەوە :ـ

١- ئازادی ئایینی و بیروڕا و بڵاوکردنەوە و خستنەڕووی ڕوونکردنەوەکان و داوا تۆمارکردن.

٢- مافەکانی هەڵگرتنی چەك و چۆنێتی پارێزگاری لێکردنی.

٣- چۆنێتی بە کارهێنانی هێزە سەربازییەکان.

٤- دڵنیا کردنی هاوڵاتیان لەوەی، کە بە بێ هۆکار نەگیرێن.

٥- مافە گشتییەکانی تاوانباران و ئەو کارە یاساییانەی لەبارەی ئەو مافانە دەکرێن.

٦- ئەو مافانەی تاوانبار لە پێش و لە دوای دادگاییکردنیدا هەیێتی.

٧- مافی دادگاییکردن لە کێشە مەدەنییەکاندا لە بەردەم سوێندخۆرەکان.

٨- قەدەغەکردنی هەر توندوتیژییێك بەرامبەر بە تاوانباران لە کاتی هەڵسوکەوتکردن لە گەڵیاندا.

٩- قەدەغەکردنی ئەوەی، کە مافەکانی گەل بێسنوورن.

١٠- قەدەغەکردنی ئەوەی کە دەسەڵاتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بێسنوورن.

١١- سنوورەکانی دەسەڵاتی دادوەری.

١٢- شێوازی هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگرەکەی.

١٣- هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی.

١٤- ئامارکردنی ئەو بڕیارانەی لە دوای شەڕی ناخۆوە دەرچوون، ئەمەش مانای ڕێگە گرتنە لە ویلایەتەکان، کە هیچ تاکێك لە مافەکانی بە هاوڵاتیبوون بێبەش نەکرێت تەنها لە ڕێگەی ئەو یاسایانەوە نەبێت کە لەو بوارانەدا نوێنەرەکانی کۆنگرێس دەسنیشانی دەکەن.

١٥- پێشنیازە گشتییەکان تەنها بۆ نێرینەکان دەبێ بەبێ جیاوازی نەتەوە، یان ڕەنگ.

١٦- سەپاندنی باجی دەرامەت.

١٧- سەپاندنی بڕیاری هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پیران لەلایەن گەلەوە.

١٨- بڕیاردرا کە نابێ زیادەڕۆیی لە خواردنەوەی مادده کحولییەکاندا بکرێ.

١٩- هەڵبژاردنە گشتییەکان بۆ هەر هەموو هاوڵاتیان وەك یەك دەبێت بە بێ جیاوازی ڕەگەز چ (نێر بێ، یان مێ).

٢٠- دەسنیشانکردنی دەسەڵاتەکانی سەرۆك و جێگرەکەی و کۆنگرێس و کۆمەڵێك لەو مەراسیمانەی، کە لە کاتی مردنی سەرۆکدا ڕوودەدەن.

٢١- هەڵوەشاندنەوەی (ڕاستکردنەوەی) (تعديل) ژمارە ١٨.

٢٢- دوو بەند بۆ دیاریکردنی سەرۆکایەتی.

٢٣- مافی هەڵبژاردنی فیدراڵی و دیاریکردنی نوێنەرەکانی بە هەرێمی کۆلۆمبیا بەخشرا.

٢٤- سەرانە وەرگرتن قەدەغە کرا.

٢٥- ئەو کارانەی، کە دەبێ لە حاڵەتەکانی بێ توانایی سەرۆك دا بکرێ، یان پڕکردنەوەی شوێنی جێگری سەرۆك لەو حاڵەتانەی کە چۆڵ دەبێ.

٢٦- دیاریکردنی تەمەنی دەنگدەر بە ١٨ ساڵ و بە سەرەوە.

دەستووری ئەمریکی چۆن هەر سێ دەسەڵاتەکەی ڕێکخستبوو..؟ و چۆن پێوەندییەکانی نێوانیانیشی ڕێکخستبوو..؟ ئێستا بە درێژی باسی دەکەین...

## چوارەم دەسەڵاتی جێبەجێکردن: ـ

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا سەرکۆمار بە خاوەنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن دادەنرێ و بەشێوەییێکی پراکتیکیش ئەو دەسەڵاتە پیادە دەکات، سەرۆك کۆمار هەردوو سەرۆکایەتی دەوڵەت و ئەنجومەنی وەزیرانی لە دەستی خۆیدا کۆکردۆتەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکان لەساڵی ١٧٧٦ەوە تا ئێستا سیستەمی سەرۆکایەتی پەیڕەو دەکات، ئەو سیستەمەش لەسەر بنچینەی لێك جیاکردنەوەی تەواوی دەسەڵاتەکان بنیادنراوە. ئەمەش مانای ئەوەیە، کە هەردەسەڵاتێك بە یەکسانی لەگەڵ دەسەڵاتەکانی تردا و بەپێی دەستوور کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات.

### ١- سەرۆك کۆمار: ـ

دەستووری ئەمریکی دەسەڵاتێکی زۆر فراوانی داوەتە سەرۆك کۆمار، ئەو خۆی دەتوانێ وەزیرەکان دابنێ، یان لایبا، وەزیرەکانیش لە بەرامبەریدا بەرپرسیارن. ئەنجومەنی وەزیران بەو مانا کلاسیکیەی، کە هەیە لە سیستەمی ئەمریکادا بوونی نییە و بە وەزیرەکان دەڵێن (سکرتێر)، هەروەها وەزیرەکان ئەو دەسەڵاتەیان نییە بەبێ سەرۆك کۆمار کۆببنەوە و بڕیار بدەن، لەبەرئەوەی هەر هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی سەرۆك کۆماردایە. ئەو کاتانەی، کە سەرۆك لەگەڵ وەزیرەکاندا کۆدەبێتەوە، ئەمە تەنها بۆ ڕاوێژپێکردن و تاوتوێکردنی پرسەکانە، چونکە بڕیاری کۆتایی لەو بابەتانەدا لەلای خۆیەتی، ئەمە و هەروەها سەرۆکی ئەمریکا دەسەڵاتی جێبەجێکردنی یاسا و فەرمانەکانی جێبەجێکردن و بڕیارەکانیشی هەیە و بۆجێبەجێکردنیان دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر هێزی سەربازی، چونکە خۆی فەرماندەی باڵای هێزە سەربازییەکانە و سەرۆکی باڵای هەر هەموو هێزەکانی ئاسایشە و بەرپرسیاری یەکەمیشە لە بەڕێوەبردنی پێوەندییەکانی دەرەوەدا...و هتد.

---

٢٧- ڕاستکردنەوەی مافەکانی یەکسانی و بنبڕکردنی ئەو جیاوازیانەی، کە لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا هەبوو.

سەرۆك خۆی هاوكارەكانی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی كاروبارەكانی دەوڵەت هەڵدەبژێریْ، زۆربەی جارەكان كە سەرۆكێكی نویْ دێتە سەر كار بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات نزیكەی چوار هەزار كەس لە پیاو و دەست و پەیوەندەكانی خۆی لە جیاتی گروپەكەی پێشووتر دادەمەزرێنیْ.

## ٢- هەڵبژاردنی سەرۆك: ـ

سەرۆك بەپێی ئەو سیستەمەی كە هەیە هەڵدەبژێردریْ، كە لە هەڵبژاردنێكی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پێكهاتووە و بە چوار قۆناغ كۆتایی دیْ.

أ- هەر حیزبێك لە دوو حیزبە سەرەكیەكە: ـ (حیزبی كۆماری و حیزبی دیموكراتی)، هەر حیزبەو كۆنگرەییێكی گشتی دەبەستیْ و كەسایەتی پاڵێوراوەكەی خۆی بۆ سەرۆكایەتی دەسنیشان دەكات، هەروەها جێگرێكیش بۆ سەرۆك دەسنیشان دەكەن.

ب- پێش ئەمەش چەند كارێكی هەڵبژاردنی تاقیكردنەوەی سەرەتایی لە ویلایەتێك، یان چەند ویلایەتێكی دیاریكراو ئەنجام دەدەن بۆ ئەوەی لەوە دڵنیا بن كە سەركردە حیزبییەكانیان تا چ رادەییێك دەنگ دەهێنیْ، ئەوسا بەپێی ئەو هەڵبژاردنە سەرەتاییە پاڵێوراوە تاقیكراوەكەی خۆیان بۆ سەرۆك، یان جێگری سەرۆك دەسنیشاندەكەن.

ج- بەپێی دەقی ئەو دەستوورە هەر ویلایەتێك دوو نوێنەر دەسنیشان دەكات، كە هەموویان دەستەییێك پێكدەهێنن و ژمارەكەیان ئەوەندەی ژمارەی ئەندامانی كۆنگرێس دەبیْ بە هەردوو ئەنجومەنەكەیەوە كە (٥٣٧) كەسە، بۆ دەسنیشانكردنی سەرۆك، هەر ویلایەتێك چەند نوێنەرێك دەسنیشان دەكات كە ئەوەندەی ئەو كورسیانەیە كە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا بۆی دانراوە، كە لە ویلایەتێك بۆ ویلایەتێكی تر جیاوازیان هەیە، ئەمە جگە لە ژمارەی ئەو كورسیانەی كە لە ئەنجومەنی پیراندا بۆ هەر ویلایەتێك دیاریكراوە كە (دوو كورسیە بۆ هەر ویلایەتێك).

د- ئەو دەستەیە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك كۆمار كۆدەبێتەوە و ئەو پاڵێوراوەی كە زۆرترین دەنگ دەهێنیْ بۆ ماوەی چوار ساڵ دەبێتە سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هیچ كەسێكیش بۆی نییە لە دووجار زیاتر بۆ سەرۆك كۆماری هەڵببژێردریْ.

بەمشێوەیە بۆمان روون دەبێتەوە، كە سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە چەند قۆناغێك لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردریْ، هەرچەندە ئەو رێكخستنە وردەی، كە حیزبە سیاسییەكانی ئەمریكا هەیانە وادەكات، كە تەنها بە هەڵبژاردنی نوێنەرەكان لە ویلایەتەكاندا

ئەنجامە کۆتاییەکان دەزاندرێ، چونکە نوێنەری هەر حیزبێك دەبێ دەنگ بداتە حیزبەکەی خۆی، ئینجا دوای ئەوە کارەکانی هەڵبژاردنی قۆناغەکانی کۆتایی دەبێتە چەند کارێکی رووکەشیانە.

لەو حاڵەتانەی، کە سەرۆك دەمرێ، یان دەست لەکار دەکێشێتەوە، یان لە حاڵەتێکدا، کە نەتوانێ کارەکانی خۆی ئەنجام بدات، جێگری سەرۆك دەچێتە جێگاکەی تا ماوەی سەرۆکایەتیەکە کۆتایی پێ دێ، ئەگەر لەبەهەر هۆکارێکیش بێ جێگەی جێگریش بەتاڵ بوو، ئەو کاتە سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران جێگەی سەرۆك کۆمار پڕدەکاتەوە و ئەو کەسەی کە بۆ سەرۆك هەڵدەبژێردرێ دەبێ سێ مەرجی تێدا بێ کە ئەمانەن[٤٦٢]: ـ

١- دەبێ لە دایکبوی ئەمریکا بێ.

٢- دەبێ بۆ ماوەی چوار ساڵ لە ئەمریکادا دانیشتبێ.

٣- دەبێ تەمەنی گەیشتبێتە ٣٥ ساڵ.[٤٦٣]

## پێنجەم دەسەڵاتی یاسادانان: .

بەپێی دەقەکانی دەستووری ساڵی ١٧٨٩ دەسەڵاتی یاسادانان، واتە (پەرلەمان) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دوو ئەنجومەن پێکدێت، ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران، هەردووکیشیان بەیەکەوە پێی دەڵێن (کۆنگرێس). کۆنگرێس لە ٤ی مارسی ١٧٨٩دا یەکەم دانیشتنی خۆی ئەنجامدا، لە پێش ئەو کۆنگرێسەشدا کۆنگرێسێکی تریش هەبوو، کە لە ساڵی ١٧٨١ەوە تا ساڵی ١٧٨٩ نوێنەرایەتی ویلایەتە جۆراوجۆرەکانی دەکرد.

أ- ئەنجومەنی نوێنەران: House Of Representatives:-

ئەم ئەنجومەنە نوێنەرایەتی هەر هەموو دانیشتوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات و لە ٤٣٧ کورسی پێکهاتووە، هەر ویلایەتێك ژمارەیێك کورسی خۆی هەیە و لە

---

٤٦٢ - ئەو کەسانەی، کە دەستووری ئەمریکیان داڕشتووە بەو مەرجە ئاسانانە ویستویانە کە هەموو کەسێك بتوانێ خۆی بۆ ئەو پۆستە بپاڵێوێ. تەماشای د. ئەحمەد ئەبو عجیلە (النظم السیاسیة) کتێبخانەی نەهزەی میسری لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٢ لـــ٣٠٥ــ.

٤٦٣ - د. محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر (النظم السياسية والقانون الدستوري) دار ئەلنەهزە ئەلعەرەبیە ساڵی ١٩٩٩ لـــ١٣٩ــ و دواتری. و (موسوعة العلوم السياسية) بەرگی دووەم زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٩٤ لـــ١٥٣٥ــ و دواتری. و د.عیسمەت ئەحمەد عجیلە (النظم السیاسیة) لـــ٢٩٨ــ و دواتری.

ویلایەتێکەوە بۆ ویلایەتێکیتر ژمارەی کورسییەکانیان بەپێی ژمارەی دانیشتوانەکەی دەگۆڕێ. زۆربەی کاتەکان هەر **٣٠** هەزار هاوڵاتی نوێنەرێکی لەو ئەنجومەنەدا دەبێت بە مەرجێك تەمەنی لە **٢٥** ساڵ کەمتر نەبێ، هەر ویلایەتێك ئەگەر دانیشتوانەکەی لەو ژمارەیەی سەرەوەش کەمتر بوو بەلایەنی کەم دەبێ ئەندامێکی لەو ئەنجومەنەدا هەبێ، بۆ نموونە (نیڤادا **٤** کورسی هەیە و کالیفۆڕنیاش **٤٧** کورسی هەیە، و ماوەی ئەندامێتیش لەو ئەنجومەنەدا دوو ساڵە. ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران هەردووکیان بە یەکسانی بەشداری لە داڕشتنی یاساکاندا دەکەن. ئەنجومەنی نوێنەران لەبەرئەوەی نوێنەرایەتی ویستو ئارەزووەکانی گەل دەکات، وەك ئەوەی لە دەستووریشدا هاتووە، بۆیە دەبێ بەرپرسیارێتی داڕشتنی یاساکان لە ئەستۆ بگرێ، هەر لەبەرئەو هۆکارانەی سەرەوەشە، کە دەستوور چەند دەسەڵاتێکی ناوازە و تایبەتی داوەتە ئەنجومەنی نوێنەران و دەبێ راستەوخۆ لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێن، لەهەرهەمووی گرنگتر ئەوەیە، کە دەتوانێ پەنجەی تاوان بۆ هەر پیاوێك لە پیاوەکانی دەوڵەت، بە سەرکۆماریشەوە رابکێشێ و بە کەمتەرخەم، یان گوێ پێنەدان، یان خاین...و هتد تاوانباری بکات. وەك ئەوەی کە لەگەڵ سەرۆك (کلینتۆن)دا روویدا و لە پێش ئەمەشدا ئەنجومەن گوشاری خستە سەر سەرۆك (نیکسۆن) تاوەکو بە هۆی لێکۆڵینەوە ئابڕوبەرەکەی (واتەر گێت)ەوە لە ساڵی **١٩٧٣**دا ناچاری کرد دەست لە کار بکێشێتەوە. هەروەها ئەو ئەنجومەنە بە بوودجەی ساڵانەی دەوڵەتیشدا دەچێتەوە...و هتد.

رێکخستنەوەی ئەنجومەن بەهۆی چالاکبوونی حیزبە سیاسییەکانەوە گەشەی بە خۆیەوە دیت کە بۆ کۆنترۆڵکردنی کارەکان چەندین هۆکاریان بۆی زیادکرد، سەرۆکی حیزبەکان ـ حیزبی زۆرینە و حیزبی کەمینە ـ هەروەها سەرۆکی ئەنجومەنیش The Speaker رۆڵی بنچینەییان لەو گۆڕانکاریانەدا هەبووکە لە ناو ئەنجومەنەکەدا روویاندا.

لەناو ئەنجومەندا لێژنەییێکی گرنگ هەیە، کە پێی دەڵێن لێژنەی سیستەم System Committee ، کە چەندین لێژنەی تری لێ دەبێتەوە: لێژنەی ئامادەکردنی دانیشتنەکان، لێژنەی گوێگرتن و لێژنەییێکی تر بۆ ئامادەکردنی پرۆژە یاساکان و لێژنەییێکیش بۆ ئەو کارانەی کە ئەنجومەن رێکدەخات. وەك نەریتێك ئەو لێژنانە لەژێر کۆنترۆڵی حیزبی زۆرینەدا دەبێت. ئامارەکان دەڵێن لە حەفتاکانی ئەم سەدەیەدا زیاتر لە **٢٠** لێژنە لەو ئەنجومەنەدا هەبوون.[٤٦٤]

---

464 - Encyclopedia Britannica, Vol,VIII, P 515 .

**ب ـ ئەنجومەنی پیران:** House Of Senates: -

ئەمیش بەهەمانشێوەی ئەنجومەنی نوێنەران بەپێی دەقی دەستووری ساڵی ١٧٨٩ بڕیاری لێدراوە، ئەو وەك یەك نوێنەرایەتی تێکڕای ویلایەتەکان دەکات، واتە بۆ هەر ویلایەتێك دوو ئەندام هەڵدەبژێردرێ بۆ نوێنەرایەتیکردنی ویلایەتەکان (بەو مەرجەی، کە دەبێ ئەو ئەندامە خەڵکی ویلایەتەکە بێ) ئینجا ئەو ویلایەتە رووبەرەکەی، یان دانیشتوانەکەی زۆر بێ، یان کەم. لەبەرئەوەی ژمارەی ویلایەتەکان ٥٠ ویلایەتە، بۆیە ئەنجومەنەکە لە ١٠٠ ئەندام پێکدێ و ئەندامی ئەو ئەنجومەنەش نابێ تەمەنی لە ٣٠ساڵ کەمتر بێ، بە مەرجێك دەبێ ئەو ئەندامە لایەنی کەم ماوەی نۆ ساڵ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دانیشتبێ. ماوەی ئەندامێتی لەو ئەنجومەنەدا شەش ساڵە کە دەبێ هەر دوو ساڵ جارێك هەڵبژاردنەکە نوێ بکرێتەوە، ئەمەش بۆ پارێزگاری کردنە لە ئاستێکی دیاریکراوی شارەزایی و لێهاتویی ئەندامەکان و بە شێنەیی لە خولێکەوە بۆ خولێکی تر و لە نەوەیێکەوە بۆ نەوەیێکی تر بیگوازنەوە.

ئەوانەی کە دەستووریان دارشتووە وایان مەزەندە دەکرد، کە رۆڵی ئەم ئەنجومەنە کپکردنی جموجۆڵەکانی ئەنجومەنی نوێنەران دەبێ.

ئەنجومەنی پیران لەگەڵ ئەنجومەنی نوێنەراندا بە شێوەیێکی یەکسان بەشداری لە بەرپرسیارێتی هەر هەموو یاساکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەکەن و بۆ ئەوەی یاساکان جێگەی باوەڕ بن وکاریان پێبکرێ دەبێ کۆنگرێس بە هەردوو ئەنجومەنەکەیەوە رەزامەندی خۆیان لەسەری نیشان بدەن، ئەمە جگە لەوەی کە دەستوور چەند دەسەڵاتێکی گرنگی داوەتە ئەنجومەنی پیران لە (ماددەی دووەم ـ وبەشی دووەم)دا لەوانە مافی رەزامەندی نیشاندان لەسەر دامەزراندن لە کارە گشتییەکاندا وەك ئەندامانی وەزارەتەکان و باڵیۆزەکان و دادوەرەکانی دادگای باڵا..بەمشێوەیە ئەنجومەنی پیران ـ بە بێ ئەنجومەنی نوێنەران ـ لەگەڵ سەرۆککۆماردا بەشداری لە هەندێك کاروباری جێبەجێکردندا دەکات. ـ هەروەك ئەنجومەنی نوێنەران ـ لە ئەنجومەنی پیرانیشدا حیزبەکان و لیژنەی نیزام، کۆنترۆڵی ئەنجومەنەکەیان کردووە، هەر حیزبێکیش سەرکردەییێك بۆ خۆی دادەنێ بۆ رێکخستنی چالاکییەکانی ئەنجومەن، وەك هەمیشەش دەبێ ئەو کەسە خاوەن دەسەڵات و خاوەنی رای خۆی بێت، ئەو کەسە رۆڵێکی گرنگی دەبێ لە پێکهێنانی لیژنەکانی ناو ئەنجومەندا.

ئامارەکان ئەوەمان پیٚ دەڵێن، کە لە سەرەتای حەفتاکانی ئەم سەدەیەدا ١٦ لیژنە لە ئەنجومەنی پیراندا هەبوو.[٤٦٥]

هەر لە بنەڕەتدا کارە تایبەتییەکانی کۆنگرێس بە هەردوو ئەنجومەنەکەیەوە پێشنیازکردن و بڕیاردانە لەسەر پرۆژەیاساکان، بەڵام لەهەمانکاتدا کارێکی تریش ئەنجام دەدات، کە لەو کارانەی سەرەوە کەمتر نییە، ئەویش چاودێری کردنی دەسەڵاتی جێبەجێکردنە لە رێگای دەسەڵاتەکانییەوە، کە لە بواری متمانە داراییەکانییەوە دەسەڵاتێکی نیمچە رەهای هەیە و دەتوانیٚ لیژنەی گوێگرتن و لیژنەی لێکۆڵینەوە پێکبهێنیٚ.

شەشەم: پێوەندییەکانی نێوان دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسادانان: ـ

## ١. پێوەندییەکانی دەسەڵاتی یاسادانان بە جێبەجێکردنەوە:

(کۆنگرێس) پەرلەمان وەك پێشتریش باسمان کرد لە بنچینەدا تایبەتمەندە بە پیادەکردنی کاری یاسادانان، بەڵام لێرەدا جۆرێك لە پێوەندی لەنێوان پەرلەمان و دەسەڵاتی جێبەجێکردندا هەیە وەك ئەمانەی خوارەوە: ـ

أ ـ ئەنجومەنی پیران بۆ سەرۆککۆمار لە جێگەی ئەنجومەنێکی سیاسییە، کە لە هەندێك کێشەدا سەرۆك راوێژی پێدەکات، چونکە لە بنچینەدا ئەمە کاری دەسەڵاتی جێبەجێکردنە (وەك ئەوەی لە ماددەی دوو ـ بەشی دووەمی دەستووردا هاتووە)، بەڵکو بۆ هەندێك لەو کێشانە دەستوور مەرجی ئەوەی داناوە، کە بۆ کۆتایی پێهێنانی پێشوەختە دەبیٚ رەزامەندی ئەنجومەنی پیران وەربگیریٚ، وەك دامەزراندنی گەورە فەرمانبەرانی فیدراڵی و دادوەرەکانی دادگای باڵا...... هتد. هەروەها ئەمە دامەزراندنی وەزیرەکانیش دەگرێتەوە هەرچەندە ئێستا وا باو و سەقامگیرە، کە ئەنجومەنی پیران ئەو مافەی خۆی بەکارناهێنیٚ، ئەمەش بۆ رێزگرتنە لە سەرۆککۆمار، ئەمە وادەکات سەرۆککۆمار خۆی بە تەنها وەزیرەکان دابمەزرێنیٚ و رەزامەندییێکی رووکەشانەی ئەنجومەنیشی پیٚ وەردەگریٚ.

---

465 - Encyclopedia Britannica, Vol , IX , P.515 .

ب ـ دەستوور ئەو مافەی داوەتە ئەنجومەنی نوێنەران، کە پەنجەی تاوان ئاراستەی سەرکۆمار و جێگرەکەی و هەروەها وەزیرەکانیش بکات و ئەنجومەنی پیرانیش لە سەر داوای ئەنجومەنی نوێنەران دادگاییان بکات.

## (٢) پێوەندییەکانی ئەنجومەنی جێبەجێکردن بە یاسادانانەوە: .

أ ـ سەرۆك کۆمار بە هیچ شێوەییێك بۆی نییە پرۆژە یاسا پێشنیاز بکات لە گەڵ ئەوەشدا بۆی هەیە چەند نامەییێك ئاراستەی ئەنجومەنی پیران بکات، سەرنجی پەرلەمان بەلای چەند بابەتێکی دیاریکراودا رابکێشێ بۆ ئەوەی ئاگایان لێ بێ، بە مەرجێك، کە نابێ ئەو نامانە لە شێوەی پرۆژە یاسادا بن، چونکە ئەمە لە چەند ئارەزوویێك زیاتر چیتر نییە و ناتوانێ زۆر لە پەرلەمان بکات، یان سنووری بۆ دابنێ.

ب ـ سەرۆککۆمار دەتوانێ لە کاتی بارودۆخە نا سەقامگیرەکاندا داوا لە پەرلەمان بکات کۆبوونەوە ئەنجام بدات.

ج ـ وەزیری دارایی دەتوانێ بە نوسراو پێوەندی بە پەرلەمانەوە بکات بۆ پێشکەشکردنی راپۆرت و روونکردنەوە داراییەکان.

د ـ سەرۆککۆمار دەتوانێ ئەو یاسایانە رەتبکاتەوە کە پەرلەمان بڕیاری لە سەر دەدات، ئەمەش لە ماوەی ١٠ رۆژدا دەبێ، لە دەرچوونی یاساکەوە و دەبێتە هۆی راگرتنی جێبەجێکردنی یاساکە، (ئەمەش پێی دەڵێن مافی راگرتنی) یاساکە بەو تێبینی و رەتکردنەوانەی سەرۆکەوە دەگەڕێندرێتەوە پەرلمان، ئەگەر بۆ جاری دووەمیش پەرلەمان بە زۆرینەی دەنگی دوو لە سەر سێی ئەندامەکانی رەزامەندی لەسەر نیشاندایەوە، ئەو یاسایە سەرەڕای رەتکردنەوەکەی سەرۆکیش دەکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

## حەوتەم: دەسەڵاتی دادوەری: .

دەزگاکانی دادوەری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بە سەربەخۆییێکی تەواوەوە و دوور لە دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات. دادگای باڵا بە باڵاترین دەسەڵاتی دادوەری دادەنرێ لەو وڵاتەدا و لە ٩ نۆ دادوەر پێکدێ و بە بڕیاری

سەرۆککۆمار دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەنجومەنی پیران دادەمەزرێن و نابێ لەسەر کارەکانیان لا بدرێن تەنها مەگەر چەند بارودۆخێکی نالەبار و کوشندە بێنە ئاراوە. ئەو کارانەی، کە بۆ گۆڕینی دەستووری ئەمریکی دەکرێ، هەمان کاریش بۆ گۆڕینی لیستی دادگای باڵا دەکرێ: کە دەبێ دوو لەسەر سێی ئەندامانی کۆنگرێس دەنگی بۆ بدەن، لەگەڵ وەرگرتنی ڕەزامەندی سێ لەسەر چواری ئەنجومەنەکانی ویلایەتەکان. دادگا بەوەندە ناوەستێ کە تەنها یاساکان شی بکاتەوە، بەڵکو دەشتوانێ بڵێ یاساکە خۆی کەم کوڕی تێدایە، لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی دەستوورە، بۆیە بە کەڵکی سەپاندن نایێت.

لەکۆتاییدا ئەوانەی، کە دەستووری ئەمریکایان داڕشتووە، لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا کاریگەری بیرۆکەکانی مۆنتسکیۆیان بە سەرەوە بووە و بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی و یەکسانی لە نێوانیاندا ویستیان ئەو بیرۆکەیە جێبەجێبکەن (أ) بۆ نموونە هەرگیز نابێ یەکێك پلەی وەزیری هەبێ و لە هەمان کاتیشدا ئەندام پەرلەمان بێ، چونکە وەزیر و سکرتێر و هاوکارەکانی سەرۆك مافی ئەوەیان نییە لەهەمانکاتدا ئەندام پەرلەمانیش بن، ئەگەر هات و سەرۆککۆمار هەندێك لە وەزیرەکانی خۆی لە ناو پەرلەماندا هەڵبژارد، ئەوانە دەبێ یەکسەر دەست لەکار کێشانەوەی خۆیان پێشکەش بکەن و کەسانی تر لە شوێنیاندا هەڵبژێردرێنەوە. (ب) سەرۆککۆمار مافی ئەوەی نییە هیچ یاسایێك پێشنیاز بکات بۆ پەرلەمان. هەروەها پەرلەمان خۆی بوودجەی گشتی دەوڵەت لە ڕێگەی لیژنە هونەرییەکانییەوە ئامادە دەکات و گفتوگۆی لەسەر دەکات و بڕیاری لەسەر دەدات. (ج) پەرلەمان بۆی نییە متمانە لە وەزیرەکان بسێنێتەوە و لە کارەکانیان لایان ببات، چونکە ئەوان تەنها لە بەرامبەر سەرۆکدا بەرپرسیارن کە دایمەزراندوون و تەنها ئەو دەتوانێ لە کار لایان بدات. (د) لەلایێکی تریشەوە سەرۆککۆمار ناتوانێ پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوە.

بەمشێوەیە دەبینین سیستەمی سەرۆکایەتی، بە پێچەوانەی سیستەمی پەرلەمانییە ـ کار بۆ جیاکردنەوەی تەواوی هەردوو دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسادانان دەکات، لەمەدا ئەو مەبەستی بەدیهێنانی یەکسانی تەواوە لەنێوان هەردوو دەسەڵاتەکەدا، هەر دەسەڵاتێکیش سەربەخۆییێکی تەواوی لەگەڵ ئەویتردا هەبێ، کە هیچ دەسەڵاتێك دەست نەخاتە ناو کارەکانی دەسەڵاتێکی ترەوە.[٤٦٦]

466 - Encyclopedia Britannica, Vol , 18 .

## هەشتەم: حیزبەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا: .

راستەوخۆ لە دوای بەدەسهێنانی سەربەخۆیی، بەو مانایەی کە هەیە ویلایەتە یەکگرتووەکان حیزبی تێدا نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە شێوەیێکی گشتی لەناو خەڵکیدا هەستێك باوبوو، کە دژی هەر حیزبێك بوون، چونکە خەڵکی حەزیان نەدەکرد، دوای ئەو هەموو شەڕو ئاژاوانە هیچ گروپێکی تر دروست بێ، بەڵام ناکۆکی لەنێوان باوکەکانی یەکەمدا ئەوانەی دەستووری ساڵی ١٧٨٩ یان دارِشت لەسەر شێوازی پێکهێنانی حکومەتدا هاتە کایەوە: کە ئایا ئەو حکومەتە حکومەتێکی ناوەندی بەهێز و بە توانا بێت و دەسەڵاتی بەسەر ویلایەتەکاندا هەبێ، یان بواری جموجۆڵەکان بدات و هەر ویلایەتێکیش یاسای خۆی هەبێ؟. بەم شێوەیە بوون بە دوو بەشەوە: فیدرالییەکان لەناو یەکەم کۆنگرێسدا بە سەرۆکایەتی ئەلیکساندەر هاملتۆن (١٧٥٧ـ١٨٠٤)[٤٦٧] بەرەیێکیان دروست کرد، کە هاوکار بوون لە دارِشتنی یەکەم رەشنووسی دەستووری ئەمریکا لە ساڵی ١٧٨٩دا و لایەنگری پێکەوەنانی ئەو حکومەتە فیدرالیە بەهێزە بوون، کە لە دوای شەڕی سەربەخۆییدا ئەو نائارامی و گێرەشێوێنییەی، کە بەدوایدا هاتبوون کار بۆ ئەوە بکەن بنەماکانی سەقامگیری لە وڵاتدا بسەپێنن، بەڵام هەندێك لە نوێنەرەکان ـ بە تایبەتی نوێنەرەکانی (نیۆیۆرك)

---

بە شێوەیێکی گشتی تەماشای ئەمانە بکە :

د. محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر (النظم السياسية والقانون الدستوري) دار ئەلنەهزە ئەلعەرەبیە ساڵی ١٩٩٩ و (موسوعة العلوم السياسية) کە زانکۆی کوێت لە ساڵی ١٩٩٤دا دەریکردوە، بەرگی دووەم لــ١٥٣٥ و دواتری .

٤٦٧ - ئەلیکساندەر هاملتۆن (١٧٥٧ـ ١٨٠٤) یەکێکە لە باوانی یەکەم و لە دانانی دەستووری ئەمریکیدا رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو و لە حکومەتەکەی جۆرج واشنتۆندا وەزیری دارایی بوو، ئەوەی، کە جێی سەرسوڕمان بوو ئەوە بوو، کە کاتێك لە کۆنگرەی دەستووری فلادلفیا لە ساڵی ١٧٨٧دا وتاری خوێندەوە بە بێ هیچ دوو دڵییێك گوتی : (گومانم لەوەدا نییە، کە حکومەتی بەریتانیا باشترین حکومەتە لە جیهاندا..) ! ئەو نەیگوت ئەو حکومەتە داگیرکەرە و ئێمە شەڕمان لەگەڵیدا هەبووە و باجی زۆری لێمان سەندووە و غەدری لێمان کردووە، لەبەرئەوەی ئەو دەیزانی جیاوازی لەنێوان سیستەمی سیاسەتی دەرەوە لەگەڵ سیاسەتی ناوەخۆدا زۆر جیاوازە و پێشنیازی ئەوەی کرد کە حکومەتێکی ناوەندی بە هێز پێکبهێندرێ، کە حاکمی ویلایەتەکان دابمەزرێنێ و مافێکی رەهایان لە رەتکردنەوەی پرۆژەیاساکانی ویلایەتەکاندا هەبێ. لەکاتی بە شەڕهاتنیدا لە گەڵ یەکێك لە نەیارەکانیدا بریندار دەبێ و بۆ رۆژی دواتر دەمرێ .

زۆر بە توندی بیروڕای فیدرالییەکانیان ڕەتکردەوە. هاملتۆن لە ڕۆژنامەکاندا بە ناوی خوازراوی (قەیسەر)ەوە وەڵامی دەدانەوە، بەڵکو ئەو بەرەیەی کە هاملتۆن پێکیەوە نابوو ئەوەندەی پێ نەچوو بوو بە حیزبێکی سیاسی بە ناوی (حیزبی فیدرالی) و خۆی سەرۆکی بوو، (جۆرج واشنتۆن) یش هاوکاری هاملتۆنی دەکرد، بەڵام ئۆپۆزسیۆنەکانی ئەو حیزبە نوێیە، ئەوانەی دەیانویست ئازادییێکی زیاتر بدرێتە ویلایەتەکان، لەناو ڕێکخستنێکی سیاسیدا بە سەرۆکایەتی جێمس مادیسۆن (١٧٥١ـ١٨١٧) کۆبوونەوە. ئەویش بە هەمان شێوە ئەندامی کۆنگرەی دەستووری بوو لە فلادلفیا، دواتر لە سەردەمی سەرۆك جیفرسۆندا بووە وەزیری دەرەوە ـ و ناویان لەو حیزبە نا (حیزبی کۆماری دیموکراسی). ئەم حیزبە لە بنچینەدا مەبەستی بەرگریکردن بوو لە مافی یەك بە یەکی ویلایەتەکان دژی داواکارییەکانی فیدرالییەکان،[٤٦٨] دوای ئەوە دووبەرەکی بە هۆی ئەو ناکۆکیانەی لەبارەی ئازادکردنی کۆیلەکان کەوتە ناو حیزبەکەوە، بۆیە لە ساڵی١٨٣٤دا دابەشبوون بۆ دوو حیزب (حیزبی دیموکراتی) و (حیزبی ویگەکان Whigs). دیموکراتەکان بە سەرۆکایەتی ئەندرۆ جاکسۆن ((Adrew Jackson،١٧٦٧) ـ١٨٤٥) و بە یارمەتی (مارتن ڤان بیێرن Martin Van Buren)). ئەمەش بووە بەردی بناغەی ئەو حیزبە دیموکراتیەی ئێستا، کە دەیویست ببێتە حیزبی چینی کرێکاران بەرامبەر بە حیزبی کۆماری کە نوێنەرایەتی چینی خاوەنکارەکان دەکەن: ـ

أ- **حیزبی دیموکراتی:** Democratic Party

ئێستا ئەو حیزبە یەکێکە لە دوو حیزبە گەورەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەم ناوەی ئێستای لە سەردەمی ڕۆژگارەکانی (ئەندرۆ جاکسۆن) ی حەوتەم سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە (١٨٢٩ـ١٨٣٧) بۆ ماوەتەوە، کە ئەوەندەی نەمابوو لە شەڕەکانی ناوخۆدا بکوژرێ.

بۆ ماوەییێك (حیزبی کۆماری) کە لە ژیانی سیاسیدا ڕکابەرایەتی دەکرد لێی دەبردەوە، بەڵام حیزبی دیموکراتی لە ساڵی ١٨٧٦دا توانی پێگەکەی خۆی بگێڕێتەوە و لە کاتی شەڕی هەڵبژاردنەکاندا ببوژێتەوە لەو کاتەشدا سەرکردەییێکی نموونەیی دیموکراتی دەرکەوت کە (ودرۆ

---

٤٦٨ - هەندێك لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن، کە سەرۆك (جیڤەرسۆن) خۆی لە ساڵی ١٧٩٢دا ئەو حیزبەی دامەزراندووە، ئیتر هەرچۆنێك بێ گومان لەوەدا نییە کە جیڤەرسۆن پشتگیری لە هەوڵەکانی مادیسۆن دەکرد و پیرۆزیشی دەکرد.

ولسن: (Wilson . 1856-1924) ی بیست و هەشتەمین سەرۆك بوو و لەژێر سەرکردایەتی فرانکلین رۆزفیلت (١٨٨٢ـ١٩٤٥)[٤٦٩] سی و دووەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو و تەنها خۆی سەرپشك بوو. رۆزفیلت هەندێك پلان و بەرنامەی دارشت، کە دڵو هۆشی ئەمریکییەکانی بەلای خۆیدا راکێشا. ئەوکاتەی ئەو سەرۆکایەتی وڵاتی گرتە دەست وڵات بە قەیرانێکی ئابووری کوشندەدا تێدەپەری، بۆیە بۆ دەربازکردنی وڵات لەو قەیرانە ئابوریەیدا، بۆ ئەوەی سەر لەنوێ بیگێڕێتەوە سەر کارێکی بەرهەمدار، بەرنامەیێکی دارشت و ناوی لەو بەرنامەیە نا (پاتێکی نوێ New Deal).[٤٧٠]

لە سەرۆکە دیارەکانی ئەو حیزبە (جۆن کنێدی)، (١٩١٧ـ ١٩٦٣) سی و پێنجەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەویش بەرنامەیێکی بە هێزی دارشت و ناوی نا (کۆمەڵگەیێکی مەزن) کە لە دوای کوژرانیشی لە ساڵی ١٩٦٣دا (لیندۆن جۆنسن) لەسەر جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە بەردەوام بوو. ئەگەر بێت و بەرنامەی (پارتێکی نوێ) ی رۆزفیلت مەبەستی ئەوە بووبێ کە وڵات لە قەیرانە ئابوریەکەی دەرباز بکات، ئەوا بەرنامەی (کۆمەڵگەیێکی مەزن) روی لە پشتگیریکردنی مافە مەدەنییەکان و خوێندنی باڵا و مافی هەڵبژاردنە گشتییەکان و یەکسانی دەکرد لە بوارەکاندا و...هتد. هەروەها هەوڵی ئەوەی دەدا جۆرێکی نوێ لە شێوازی دەسەڵات پیادە بکات، بۆیە کۆمەڵێك ئەکادیمی و رۆشنبیری هێنایە

---

٤٦٩ - لەساڵی ١٩٣٢ەوە بووە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە ئەوکاتە جیهانی سەرمایەداری بە ترسناکترین قەیرانی ئابوریدا تێدەپەڕی لە مێژوودا. لەماوەی یەکەم سەرۆکایەتیدا سەرکەوتو بوو و توانی هەندێك چاکسازی و گۆڕانکاری گرنگ بە دی بێنێ لەبواری دارایی و مەسرەفیدا. بۆ یەکەمجار بوو لە مێژوودا سەرۆکێك بۆ ماوەی سێ جار بۆ سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژێردرێتەوە (١٩٣٢ـ١٩٣٦)، (١٩٣٦ـ ١٩٤٠)، (١٩٤٠ـ١٩٤٤) کاتی تەواو بوونی سێیەم سەرۆکایەتی لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا تەواو بوو، بۆیە لە نۆڤەمبەری ١٩٤٤دا بۆ جاری چوارەم بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژێردرایەوە، بەڵام پێش ئەوەی ماوەی سەرۆکایەتیەکەی تەواو بکات، لە ئەپریلی ساڵی ١٩٤٥دا بە هۆی زۆر ماندوو بوونییەوە کۆچی دوایی دەکات !.ئەوەی شایانی باسکردنە لە ساڵی ١٩٣١دا رۆزفیلت توشی نەخۆشی ئیفلیجیی هات و ماوەیێکی زۆر لەسەر کورسی کەم ئەندامانددا سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی دەکرد.

٤٧٠ - پاتێکی نوێ = صفقة الجديدة (وەرگێڕ).

ناو كایە سیاسی و دبلۆماسییەكانی ئەمریكاوە و ئەو بچوكترین سەرۆكی ئەمریكا بوو، كە تەمەنی ٤٣ ساڵ بوو و یەكەم كاسۆلیكیش بوو ئەو پایەیە وەربگرێ.

(بیل كلنتۆن)، كە دەسەڵاتی وەرگرت سەركردایەتی باڵێكی چاكسازی لەناو حیزبدا دەكرد بە ناوی (دیموكراسیەتی نوێ) (كلنتۆن) لە ساڵی ١٩٩٣دا یەكەم سەرۆكی دیموكراتی بوو (واتە دوای ١٣ساڵ لە دەسەڵاتی كۆمارییەكان) و یەكەم سەرۆكی دیموكراتی بوو لەدوای فرانكلین رۆزفیلت بۆ جاری دووەم هەڵبژێردرێتەوە.

**ب ـ حیزبی كۆماری:** Republican Party

یەكێكە لە دوو حیزبە سەرەكیەكەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، وەك پێشتریش باسمان كرد مێژووی دروستبوونی بۆ ساڵی ١٨٥٤دەگەڕێتەوە، دوای ئەوەی ناكۆكی كەوتە نێوان ئەندامانی (حیزبی كۆماری دیموكراتی)ەوە لەسەر كێشەی ئازادكردنی كۆیلەكان، چەند ساڵێكی كەمی پێچوو كە ئەو حیزبە توانی، لە رێگەی (ئەبراهام لینكۆلن)ەوە (١٨٠٩ـ١٨٦٥) شازدەمین سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا (١٨٦١ـ١٨٦٥) سەركەوتن لە ژیانی سیاسی خۆیدا بە دەست بێنێ، كە شەڕی لەدژی ویلایەتەكانی باشور بەرپا كرد، كە ئەو كات ئازادكردنی كۆیلەكانیان رەتدەكردەوە. لینكۆلن توانی سودێكی زۆر لە تێكچونی شیرازەی حیزبی دیموكراتی ركابەر و دابەشبوونیان لەسەر ئەو كێشەیەی لەبەر دەستدا بوو وەربگرێ. هەرچەندە هەڵبژاردنی لینكۆلن بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ، بەڵام كۆمارییەكان توانیان تا رادەیێكی زۆر كۆنترۆڵی ژیانی سیاسی ئەمریكا بكەن. لەناو حیزبی كۆماریدا باڵێكی رادیكالی بە سەرۆكایەتی (پادیۆس ستیڤنس Thaddeus Stevens) دەركەوت، كە داوایان دەكرد چەند مەرجێك دابندرێ بۆ جارێكی تر گێڕانەوەی ویلایەتە شكستخواردوەكانی باشوور بۆ ناو ئەو یەكێتیەی لەنێوان ویلایەتەكاندا هەبوو. كۆمارییەكان لە سەردەمی (ئۆلیس گرانت ١٨٢٢ (U.Grant ـ١٨٨٥) دا كە شازدەمین سەرۆكی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بوو لە (١٨٦٩ تا ١٨٧٧) كە لە ساڵی ١٨٦٨دا هەڵبژێردرا و بۆ جاری دووەمیش لە ساڵی ١٨٧٢دا هەڵبژێردرایەوە و چەندین چاكسازی لەبواری خزمەتی مەدەنیدا ئەنجامدا.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا (تیۆدۆر رۆزفیلت ١٨٥٨ ـ ١٩١٩) بیست و شەشەمین سەرۆكی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا (١٩٠١ـ١٩٠٩) و جێگری سەرۆك ماكینلی

Makinley) بوو و دوای کوژرانی ماکینلی لە ساڵی ۱۹۰۱دا جێگەی ئەوی گرتەوە. ڕۆزفیلت بەرگری لە مافەکانی پیاوانی شەقام کرد و بەڵێنی بە دەوڵەمەندەکاندا وچەندین یاسای بۆ دامەزراوە گەورەکان دانا و سیاسەتی پارێزگاریکردن لە سەرچاوە داراییەکانی وڵاتی گرتەبەر.

دیارترین سەرکردەکانی کۆماری لەسەدەی بیستەمدا (دوایت ئیزنهاوەر)(۱۸۹۰ـ۱۹٦۹) بوو، کە لە ساڵی ۱۹٤٤دا دەستی بەسەر ئەوروپادا گرت فەرماندەیی هێزەکانی سوێندخۆرەکانی دەکرد و جەماوەرێکی زۆری هەبوو و لە ساڵی (۱۹٥۳ـ۱۹٦۰) بووە سی و چوارەمین سەرۆکی ئەمریکا و لەکاتی سەرۆکایەتیەکەیدا (ڕیچارد نیکسون (R.Nixon 1913-......)، کە بووە سەرۆکی حیزبی کۆماری و بووە سی و حەوتەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (۱۹٦۹ـ ۱۹۷٤) و کۆتایی بە شەڕی ڤێتنام هێنا و کاری لەسەر باشکردنی پێوەندییەکان کرد لەگەڵ وڵاتی چیندا، بەڵام بەوە تاوانبار کرا کە چاوپۆشی لە پاڵەوانەکانی کارە ئابڕووبەرەکەی (واتەر ـ گێت) کردووە، بۆیە ناچار بوو لە ۹ی ئابی ۱۹۷٤دا دەس لە کار بکێشێتەوە و (جیرال فۆرد) هاتە جێگاکەی کە بووە سی و هەشتەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان (۱۹۷٤ـ۱۹۷٦)، بەڵام (جیمی کارتەر J. Carter (ی دیموکراتی توانی لە ساڵی ۱۹۷٦دا بە سەریدا سەرکەوێ. و بووە سی و نۆیەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام کۆمارییەکان جارێکی تر بە سەرۆکایەتی (ڕۆناڵد ریگن (R. Reagan 1911 -.....) گەڕانەوە سەر دەسەڵات و بووە چلەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان، کە توانی بەجیاوازییێکی زۆر، کە دەگەیشتە (۹ ملیۆن دەنگ) بەسەر (جیمی کارتەر)دا سەرکەوێ، کە کەم کەس توانیوێتی بەم شێوەیە لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوێ. (ڕیگن)ی کۆماری لە ساڵی۱۹۸۱ تا ۱۹۸۹ لە دەسەڵات مایەوە، دوای ئەویش جۆرج بۆش G. Bush 1924 -.... هاتە جێگاکەی کە لە ماوەی سەرۆکایەتیەکەی ریگندا ئەو جێگری بوو. (جۆرج بۆش) چل و یەکەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو (۱۹۸۹ـ۱۹۹۳) تاوەکو دۆڕاندنەکەی بۆش لە ساڵی ۱۹۹۳دا لە بەرامبەر رکابەرە دیموکراتیەکەیدا کە(بیل کلنتۆن) بوو، کە دوا سەرۆکی کۆمارییەکان بوو تا ئێستا.[٤٧١]

---

٤٧١ - لە کاتی دانانی ئەم کتێبەدا کلنتۆن دوا سەرۆك بوو و بۆ ماوەی هەشت ساڵ سەرۆك بوو، بەڵام لەدوای ئەوەدا (جۆرج بۆش) ی کوڕ دەسەڵاتی وەرگرت کە ئەویش لە کۆمارییەکان بوو و ئەویش بۆ ماوەی

ج ـ حیزبە بچووکەکان:

لەو ـ دوو حیزبە سەرەکییە زیاتر ـ حیزبی تر لە ولآتە یەکگرتووەکاندا نابینی، تەنها چەند هێزێکی بچوك نەبێ کە لە ٥٪ ی دەنگەکان تێناپەڕن، ئەمانە بە مانا وردەکەی حیزب، حیزب نین، بەڵکو چەند هێزێکن ماوەییێك دەردەکەون ماوە ماوەش ون دەبن نارەزایەتی لەسەر چەند کێشەییێکی دیاریکراو دەردەبڕن. لەوانەیە هەندێك لە پاڵێوراوەکانیان چەند کورسییێکی کەم بە دەس بهێنن وەك ئەوەی لەگەڵ حیزبی (پێشکەوتندا روویدا).

هەشت ساڵ سەرۆکایەتی کرد و دوای ئەویش دیسان دیموکراتییەکان سەرکەوتنەوە باراك ئۆباما لە کاتی ئێستادا سەرۆککۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە ئەویش لە حیزبی دیموکراتییە (وەرگێڕ).

## یەکەم: کورتەییێکی مێژوویی:

شۆڕشەکەی ئەمریکا کاریگەرییێکی زۆری لەسەر ئەوروپا هەبوو، ئەوەی کە ئەمریکا بە شۆڕش بە دەستی هێنا، فەڕەنساش بەهەمانشێوە دەیتوانی بە چاونەترسی و ئازایەتی بە دەستی بێنێ. هەرچەندە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، فەڕەنسییەکان یارمەتی ئەمریکییەکانیاندا و توانیان بەسەر بەریتانییەکاندا سەرکەون، بەڵام ئەو شەڕە بوودجەی فەڕەنسای زۆر ماندوو کرد، چونکە (نیکەر- Necker) (١٧٣٩-١٧٩٤) خەرجییەکانی ئەو شەڕەی لە رێگەی قەرزەوە دابین دەکرد، بێ ئەوەی بزانێ ئەو قەرزانە چۆن دەدرێنەوە، یان ئەو رێگەچارەیەی، کە قەیرانی بوودجەی پێ چارەسەر دەکرێ کامەیە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی فەڕەنسا خۆی لە بنچینەدا لەدەست رژێمێکی خراپدا دەیناڵاند: چونکە پیاوە ئاینییە گەورەکان هەر چەندە، کە زۆر دەوڵەمەند بوون، بەڵام باجێکی ئەوتۆیان نەدەدا کە شایانی باسکردن بێ. هەروەها خانەدانەکانیش (الاشراف) بەردەوام بوون لە وەرگرتنی سەرانە وکرێی زەوییەکانیان و چەندین جۆرە بێگاریان بە جوتیارەکان دەکرد، بۆیە ببوونە بارێکی زۆر قورس بە سەر شانی کۆمەڵگەوە و ئەوەی بارەکەی زیاتر بەرەو خراپی برد ئەو قات و قڕیەی ساڵی ١٧٨٨ بوو کە بە رەشەباو زریانێك کۆتایی پێهات هەر هەموو ئەو کشت وکاڵە لاوازەی هەبوو لەناوی برد. زستانی ساڵی ١٧٨٨ ـ ١٧٨٩ سەختترین زستان بوو کە فەڕەنسا بە خۆیەوە دیبێ لە مێژوودا و نرخی تەنها نانێك بۆ دووقات بەرز بۆوە و خۆپێشاندان لە شەقامەکانی پاریس دەستی پێکرد و خەڵکی داوای نانی دەکرد و چینە باڵاکان هەوڵەکانی خۆیان خستە گەڕ بۆ نەهێشتنی ئەو کارەساتە، بۆیە هەندێك لە خانەدانەکان بە سەدان هەزار جونەیهیان لە ناندان و گەرمکردنەوەی هەژارەکاندا خەرجکرد و سەرۆکی ئەسقەفەکان چوارسەد هەزار جونەیی بەخشیەوە و یەکێك لە دێری راهیبەکان بۆ ماوەی شەش هەفتە لەسەر یەك رۆژانە هەزارو دووسەد کەسی نان دەدا،[٤٧٢] رژێمی پاشایەتیش نەیتوانی کێشەکە چارەسەر بکات، چونکە زۆر لەوە بێتوانا تر بوو لەوەی کە بەرەنگاری سیستەمی دەرەبەگایەتی ببێتەوە، یان لە

---

٤٧٢ - وول دیورانت (قصە الحضارة) بەرگی ٤٢ لــ٤٧٢ــ، وەرگێڕانی فوئاد ئەندراوس ـ دار ئەلجیل بەیروت ساڵی ١٩٨٨.

بەرامبەر ئەو ئیمتیازاتە زۆرەی کە چینەکانی کۆمەڵگەی فەرەنسی هەیانبوو بوەستێتەوە. لە کۆتاییدا پاشا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە بانگهێشتی (ئەنجومەنی چینەکانی نەتەوە) بکات بۆ دانیشتن، کە ماوەییێکی زۆر بوو دانەنیشتبوون، ڕووداوەکان زۆر بە خێرایی بەرەو پێش چوون، وچینی سێیەم، کە دەکاتە چینی (زۆرینەی خەڵکی) لە چینی خانەدان و پیاوە ئایینییەکان جیا بوونەوە و لە ١٧ی یۆنیۆی ساڵی ١٧٨٩دا (کۆمەڵەی نیشتمانیان) پێکەوە نا و لە دانیشتنە بە ناوبانگەکەی ٢٠ی یۆنیۆی لە (یاریگەی تێنس)دا بەسترا، کە لە تەنیشت کۆشکی (ڤێرسای) بوو و سوێندیان خوارد، کە تا ئەو دەستوورەی بۆ فەرەنسا پێویستە دانەنێن لەو دانیشتنە هەڵنەستن، وەك ئەوەی، کە چۆن چەند کەڵە پیاوێك دەستووری ئەمریکایان دانا.. بەم شێوەیە شۆڕش دەستی پێکرد: و لە ١٤ی یۆلیۆی ١٧٨٩دا پاستیل گیرا (کە ئێستا ئەو ڕۆژە بۆتە جەژنێکی نەتەوەیی ساڵانە، فەرەنسییەکان لەو ڕۆژەدا ئاهەنگ دەگێڕن دوای ئەوەی خۆپێشاندەرانی هەڵچوو هێرشیان کردە سەری و بیرۆکەییێك بە هەموو وڵاتدا بڵاو بۆوە کە خۆشی خستە ناو هەموو دڵێکەوە، ئەویش ئەوە بوو کە گەل خۆی خاوەنی دەسەڵاتە و سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکانیشە و ڕژێمی پاشایەتی کەچەندین سەدە بوو بە شێوەییێکی ڕەها حوکمڕانێتی فەرەنسای دەکرد ـ کەوتبووە ناڵە ناڵ. لەو کاتەدا پێویستی دەکرد دەستوورێك بۆ وڵات دابندرێ و لە ساڵی ١٧٩١دا ئەو دەستوورە دەرچوو، لە پێشەکیەکەیدا (جاڕنامەی مافی مرۆڤ و هاوڵاتیانی) تێدا بوو، چونکە کۆمەڵەی نیشتمانی یەکەم جاڕنامەی لە ٥ ی ئابی ١٧٨٩دا دەرکردبوو، ئینجا دوای ئەوە بووە بەشێك لە دەستووری ١٧٩١) کە مافە بنچینەییەکانی مرۆڤی دووپات دەکردەوە وەك: ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی و دابینکردنە کۆمەڵایەتییەکان بە هەموو جۆر و بوارەکانییەوە، کە دەبێ هەر هاوڵاتییێك هەیبێ، هەروەها ئەوەشی دووپات دەکردەوە، کە بنچینەکانی دەسەڵات لە نەتەوەدا سەرچاوە دەگرێ و ئەوەی ڕاستی بێ هیچ کەس ولایەنێك بۆی نییە دەسەڵات بگرێتە دەست ئەگەر لە گەلەوە هەڵنەقوڵابێ...هتد.

بەڵام ئەو دەستوورە نەبووە کۆتایی شتەکان و نەبووە هۆی سەقامگیری بارودۆخەکە لە فەرەنسادا، بۆیە لە ١٠ی یۆنیۆی ١٧٩٣دا دەستوورێکی نوێیان دانایەوە و لە ٢٤ی هەمان مانگدا ڕەزامەندی لە سەر پێشاندرا و دواتر خرایە بەر دەستی کۆمەڵانی خەڵکی بۆ دەنگدان لەسەری و خەڵکیش بە زۆرینەی دەنگ لە ڕۆژی ٩ی ئابی ١٧٩٣دا لەسەری ڕازی بوون و ئەمەش یەکەمجار بوو لە مێژووی فەرەنسادا دەستوور بخرێتە بەر دەستی خەڵکی بۆ دەنگدان.

دەستوور لە دوو بەش پێکهاتبوو، یەکەمیان بانگەوازێکی شۆڕشگێڕانەی مافەکانی مرۆڤ بوو، دووەمیشیان بە راستی یەکەم دەستووری دیموکراتی بوو لە مێژووی ئەوروپادا. کە دان بە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤدا بنێ، بەمشێوەی خوارەوە: ـ

١- هەموو کۆمەڵگایێك مەبەستی ئەوەیە خۆشگوزەرانی هاوبەش بۆ ئەندامەکانی خۆی بەدی بێنێ، کاری حکومەتیش ئەوەیە، کە ئەو بوارەی بۆ بڕەخسێنێ کە چێژ لەو مافە سروشتیانەی خۆی وەربگرێ، کە هەرگیز نابێ لێی بسەندرێتەوە.

٢- ئەو مافانەش ئەوەیە، کە لە بەرامبەر یاسادا یەکسان بن. هەر هاولاتییێکیش مافی ئەوەی هەیە کارە گشتییەکان وەربگرێ.

٣- یاسا ئەو دەربڕینە ئازادە فەرمیەیەی ویست و ئارەزووە گشتییەکانە.

٤- ئازادی ئەنجامدانی کارێکە، کە زیان بە مافەکانی یەکێکی دیکە نەگەیێنێ، کە ئازادی رادەربڕین و بیرکردنەوە لەخۆ دەگرێ، ئینجا لە رێگەی رۆژنامەوە بێ، یان رێگەییێکی ترەوە بێ. هەروەها ئازادی کۆڕوکۆبوونەوە و باوەڕیش لەخۆ دەگرێ.

٥- مرۆڤایەتییەکانی مرۆڤ نابێ دەسکاری بکرێن و هەرگیز یاسا دان بەوەدا نانێ کە یەکێك ببێتە خزمەتکاری یەکێکی تر.[٤٧٣]

٦- کاتێك کە حکومەت مافەکانی گەل پێشێل دەکات بەرەنگاربوونەوە دەبێتە پیرۆزترین ماف و ئەرکی هەموو گەل و تاکێك.

ئینجا دەستوور هات ئەو پرەنسیپانەی بە یاسا رێکخست.

بەلام ئەم دەستوورە ئەوەندە بەردەوام نەبوو (لێژنەی ئاسایشی گشتی) بەناوی بەرەنگاربوونەوەی هێرشە دەرەکییەکان پێکهێنرا، کۆمەڵەش بووە دادگاییێك بۆ دادگاییکردنی خائینەکانی ناوەوە و سەرەتا بە لە سێدارەدانی پاشا دەستی پێکرد و دوای ئەوە بە لە سێدارەدانی ئەو کەسانە دەستی پێکرد کە رازی نەبوون لەسەر ئەو لە سێدارەدانە، ئینجا لە ئۆپۆزسیۆنەکانەوە پێدا هاتن ئەگەر هەبووایە، دوای ئەوە ئەو کەسانەی کە گومانیان لێ

---

٤٧٣ - گرنگی ئەو ماددەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە (کە ژمارە ١٨ یە)، چونکە خزمەتکارەکان لە مافی دەنگدان بێبەش بوون، هەروەها ئەو جوتیارانەی وابەستەبوون بە زەوییەکانیانەوە (أقنان)، کە زۆربەی ئەوانە گۆڕان وبوونە پیاوی خانەدانەکان.

بکرابا کە ئۆپۆزسیۆنن، ئینجا ئەو کەسانەی کە لەوانەیە ئۆپۆزسیۆن بن و فەرەنسا لەناو دەریاییێکی خوێندا نوقوم بوو.

ئەوەی راستی بێ فەرەنسا لە مێژووی نوێدا سەقامگیری بە خۆیەوە نەدیوە و شۆڕشەکەی ساڵی ١٧٨٩ تەنها یەکێك بوو لەو سێ شۆڕشە گەورەیەی کە لە ماوەی نیو سەدەدا روویاندا، و شۆڕشی دووەمیش لە ساڵی ١٨٣٠دا روویدا و سێیەمیشیان لە ساڵی ١٨٤٨دا روویدا و سیستەمە سیاسییە جۆربەجۆرەکان یەك بەدوای یەکدا هاتن، لە سیستەمی کۆمارییەوە بۆ گەڕانەوە بۆ سیستەمی پاشایەتی، ئینجا دیسان جارێکیتر کۆماری و لە سیستەمی دیموکراسیەوە بۆ دیکتاتۆری و ئینجا بۆ دیموکراسی و لە سەرەتای سەدەی رابردووەوە پێنج کۆماری بە دوای یەکدا هاتن کە سێیان تەمەنیان لە چەند ساڵێکی کەم زیاتر تێنەپەڕی، لێرەدا شتێکی ئەوتۆ نییە کە ئێمە بکەوینە دوای ئەو سیستەمانە و لێیان بکۆڵینەوە، چونکە ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە کۆماری پێنجەمە (کۆمارەکەی جەنەراڵ شارل دیگۆل ( Ch.De Gaulle: 1890-1970)ە دوای ئەوەی کۆمەڵەی نیشتمانی لە ٣ی یۆنیۆی ١٩٥٨دا بۆ کۆمەڵە بانگهێشتی کرد) ـ لە ٤ی ئوکتۆبەری ١٩٥٨دا بنەمای دەستوورێکی نوێیان دارِشت (لە ساڵی ١٩٦٣دا جارێك گۆڕانکاریان تێدا کرد) ـ و تاکو ئێستا لەسەر ئەو سیستەمە بەردەوامە. باشە بنەما بنچینەییەکانی سیستەمی سیاسی فەرەنسای ئێستا چین؟

## دووەم: سیستەمی دیموکراسی ئێستا لە فەرەنسادا:

ئەگەر بێت دیموکراسیەت لە بەریتانیادا سیستەمی پەرلەمانی وەرگرتبێت، لە کاتێکدا دیموکراسیەتی ئەمریکی سیستەمی سەرۆکایەتی وەرگرتووە، بەڵام دیموکراسیەتی فەرەنسی هەردوو سیستەمەکەی پیادە کردووە.[٤٧٤]

وا لە خوارەوە باس لەو سێ دەسەڵاتە دەکەین کە سیستەمی فەرەنسای لێ پێکهاتووە:

٤٧٤ - بۆیە فەرمانگەی ئینسکلۆپیدیای بەریتانی ناوی لێناوە (سیستەمی دیموکراسی دوڕە (تێکەڵ)) .

### (١) دەسەڵاتی جێبەجێکردن:

### أ- سەرۆککۆمار:

دەستووری ساڵی ١٩٥٨ هەڵبژاردنی سەرۆککۆماری لە رێگەی دەستەییێکی هەڵبژاردنەوە رێکخستووە، کە لە ئەندامانی پەرلەمان و ئەنجومەنی هەرێمی و ئەنجومەنی هەرێمەکانی پشت دەریاکان و ئەو نوێنەرانەی بۆ ئەنجومەنی شارەوانییەکان هەڵبژێردراون پێکهاتووە، بەڵام ئەم شێوازی هەڵبژاردنە لە ٧ی نۆڤەمبەری ١٩٦٣دا گۆڕانکاری تێدا کرا و وای لێهات سەرۆککۆمار راستەوخۆ لە رێگەی هەڵبژاردنی گشتییەوە لەلایەن هاولاتیانەوە هەڵبژێردرێ، بەڵام ماوەی سەرۆکایەتی هەر وەك خۆی مایەوە کە (حەوت ساڵە) دەکرێ لە جارێك زیاتریش خۆی هەڵبژێرێتەوە.

سەرۆککۆمار دەبێ لە هەڵبژاردنەکاندا زۆرینەی رەهای دەنگەکان بە دەست بێنێ. ئەگەر لەو هەڵبژاردنەدا هیچ کەسێك نەیتوانی زۆرینەی رەهای دەنگەکان بە دەست بێنێ، بۆ جاری دووەم ئەو هەڵبژاردنە لە نێوان دوو کەسدا، کە زۆرترین دەنگیان لە خولی یەکەمدا بە دەستهێناوە ئەنجام دەدرێتەوە. بە شێوەییێکی سروشتی لە خولی دووەمدا یەکێك لەم دووانە دەتوانێ دەنگی پێویست بە دەست بێنێ، کە زۆرینەییێکی رێژەییە. مەبەستیش لەم گۆڕانکاریەدا بە هێزکردنی پێگەی سەرککۆمار بوو، لەبەرئەوەی، کە راستەوخۆ لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراوە، واتە نوێنەری ویست و ئارەزووەکانی خەڵکە، بەڵکو دەبێتە کلیلی تێکڕای سیستەمە سیاسیەکەی فەرەنسا، چونکە دەسەڵاتی ئەو لە دەسەڵاتی سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان بەرزترە و دەسەڵاتێکی بەرفراوانی هەیە و لەبەر رێزی کەسایەتی ئەو چەندین بواری بۆ رەخسێندراوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە چەندین کۆسپ و تەگەرە رزگاری دەبێ کە بۆ رووبەڕووبوونەوەی هاتنە سەرکاری دەردەکەون لە بەر ئەوەی ئەو پشت بە هەمان بنچینە دەبەستێ، کە پەرلەمان لە دروستبوونیدا پشتی پێ دەبەستێ ئەویش ئەوەیە، دەبێ لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرابێ.

بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ کە خۆی تاکڕەوانە خاوەنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بێ، بەڵکو ئەنجومەنێك هاوبەشی لەگەڵدا دەکات، کە لە بەردەم پەرلەماندا بەرپرسە. لە کۆتاییدا کارەکە پێویستی بە رێکخستنێکە لەنێوان هەردوو باڵەکەی دەسەڵاتی جێبەجێکردندا، ئەگەر بێت و هەر یەك لە سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران سەر بە هەمان زۆرینەی پەرلەمان بن ئەو رێکخستنە ئەوەندە گیرو گرفتی تێناکەوێ، بەڵام ئەگەر هات و لە هەڵبژاردنەکانی دەسەڵاتی

یاسادانانداندا زۆرینەی نەیارەکانی سەرکۆمار بردیانەوە ئەوە لە نێوانیاندا کێشەی راستەقینە سەرهەڵدەدەن. ئەمەش لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٨٦دا کە راستڕەوەکان زۆرینەیان بە دەستهێنا روویدا. لە کاتێکدا لە ساڵی ١٩٨١ەوە (فرانسۆ میتیران) ی سەرۆکی حیزبی سۆشیالیست سەرۆککۆمار بوو ئەو ماوەیەش وەك تاقیکردنەوەییێك بوو بۆ ئەو سیستەمە سیاسیە تێکەلەی کە سیستەمی پەرلەمانی و سیستەمی سەرۆکایەتی لە بارودۆخە ناخۆشەکاندا لە بواری کارکردندا بە یەکەوە کۆدەکاتەوە. ئەو سیستەمەش ئەو ماوەیەی سەرکەوتوانە بڕی. هەرچەندە حکومەت بە دەیان جار متمانەی لێ سەندرایەوە، بەڵام توانی بە شێوەییێکی سەرکەوتوانە قەیرانەکان تێبپەڕێنێ.

**ب – دەسەڵاتەکانی سەرۆککۆمار: ـ**

سەرۆککۆماری فەرەنسا دەسەڵاتێکی زۆری هەیە کە لە هەر سیستەمێکی پەرلەمانی تردا کەم کەس هەییێتی. ئەویش دەبێتە دوو بەشەوە: ئەو دەسەڵاتەی، کە لە بارودۆخە ئاساییەکاندا هەییێتی و ئەوەی تریشیان ئەو دەسەڵاتەی، کە لە بارودۆخە نائاساییەکاندا هەییێتی.

لە بارودۆخە ئاساییەکاندا:

١- سەرۆککۆمار خۆی سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان دادەنێ و دەشتوانێ داوایان لێ بکات دەست لە کار بکێشنەوە و لە کارەکەی لایانبدات.

٢- دامەزراندن و لادانی وەزیرەکان لە پلەکانیاندا، بە پێی پێشنیازەکانی سەرۆك وەزیران دەبێ.

٣- سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران دەکات، چونکە سەرۆکایەتی ئەنجومەن بە بڕیاری سەرۆککۆمارە نەك وەزیری یەکەم، ئەنجومەنیش هەر بڕیارێك دەر بکات ئەویش دەنگی خۆی هەیە.

٤- سەرۆککۆمار مافی دامەزراندنی کۆمەڵێك گەورە فەرمانبەری دەوڵەتی هەیە.

٥- لە دوای وەرگرتنی بیروڕای سەرۆك وەزیران و سەرۆکی پەرلەمان دەتوانێ کۆمەڵەی نیشتمانی هەڵبوەشێنێتەوە.

٦- ئیمزاکردنی ئەو فەرمان و مەراسیمانەی، کە ئەنجومەن گفتوگۆیان لەسەر دەکات.

٧- دامەزراندنی باڵیۆزەکان و ئەندامەکانی تری بواری دیبلۆماسی و کونسولی.

٨- پەیمان بەستن و ئیمزا لەسەر کردنیان.

٩- ئەو مافەی هەیە پەنا بباتە بەر راپرسی خەڵکی.

**لە بارودۆخە نا ئاسایییەکاندا: ـ**

ئەگەر هات و سەروەری نیشتمان، یان خاکەکەی بکەوێتە مەترسییەوە سەرۆککۆمار بەم کارانەی خوارەوە هەڵدەستێ:

١- لە رێگەی وتارێکەوە کە ئاراستەی کۆمەڵانی خەڵکی دەکات، خەڵکی لەو بارودۆخە ئاگادار دەکاتەوە، کە وڵات تیێ کەوتووە.

٢- سەرۆکی وڵات چەند دەسەڵاتێکی رەهای بێ سنوری دەبێت.

٣- پەرلەمان بە پێی یاسا کۆدەبێتەوە و نابێ لەو کاتەی سەرۆککۆمار دەسەڵاتە نا ئاسایییەکانی خۆی پیادە دەکات کۆمەڵەی نیشتمانی هەڵبوەشێندرێتەوە.

٤- مافی ئەوەی هەیە چەند بڕیارێك دەربکات شێوەی دەستووری، یان یاسایی هەبێت.

هەرچەندە دەستوور ئەو دەسەڵاتە بەرفراوانەی داوەتە سەرۆککۆمار، لە دەقێکدا دەڵێ سەرۆك بەرپرسیار نییە لەو کارانەی، کە ئەنجامیان دەدات، چونکە ماددەی ٦٨ دەڵێ: سەرۆککۆمار دوای دەسبەکاربوونی لە کارەکانیدا لەو کارانە بەرپرسیار نییە، کە ئەنجامیان دەدا تەنها لە حاڵەتی خیانەتی گەورەدا نەبێ. لەبەرئەوەی بەر پرسیارێتیەکە دەکەوێتە سەر وەزیری یەکەم، ولەکاتی دادگاییکردندا دەکەوێتە سەر وەزیرە تایبەتمەندەکان.[٤٧٥]

### ج ـ وەزارەتەکان:

دوای ئەو گۆڕانکاریەی لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦٣دا لە دەستووری فەرەنسادا کرا، ئەنجومەنی وەزیران ئەگەر بڕیاردەری بنچینەیی نەبێ، ئەوە لایەنی دووەمی دەسەڵاتی جێبەجێکردنە، کە سەرۆککۆماری تێدا سەرپشك کردووە. ئەنجومەنی وەزیرانیش لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا هاوکاری دەکەن، کە لە سەرۆکی وەزیران و وەزیرەکان پێکدێ و نابێ ئەندامی ئەنجومەنی وەزیران بێت و لە هەمان کاتدا ئەندامی پەرلەمانیش بێت وەك ئەوەی لە سیستەمی ئەمریکیدا هەیە. هەر ئەندام پەرلەمانێك ئەگەر پۆستی وەزارەت وەربگرێ دوای مانگێك لە وەرگرتنی ئەو پۆستە بە دەست لەکار کێشاوە ئەژمار دەکرێ لە پەرلەماندا.

---

٤٧٥ - د محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر (النظم السياسیە والقانون الدستوری) لــ١٦٢ـــ ودوای ئەو.

له دوای پێکهێنانی وەزارەت هەر هەموو دەستەکە بۆ وەرگرتنی متمانە لەسەر بنچینەی ئەو کارنامەیەی، کە سەرۆکی وەزیران بەرنامەو سیاسەتی حکومەتەکەی تێدا دەخاتەروو دەچنە کۆمەڵەی نیشتمانی و دەکرێ سەرۆك وەزیران داوا لە ئەنجومەنی پیران بکات بۆ وەرگرتنی رەزامەندی، نەك متمانە لەسەر بەرنامە و سیاسەتە گشتییەکانی حکومەتەکەی و سەرۆکی وەزیران ئەو دەسەڵاتانەی خوارەوەی هەیە:

١- بەڕێوەبردنی کارو ئەرکەکانی حکومەت و لە بەرگری کردن لە نیشتمانیش بەر پرسیارە.

٢- یاساکان جێبەجێدەکات و دەسەڵاتی دەرکردنی رێنمایی هەیە.

٣- فەرمانبەرانی کارە مەدەنی و سەربازییەکان دادەمەزرێنێ.

٤- ئەگەر وای پێویست کرد لە جیاتی سەرۆککۆمار سەرۆکایەتی ئەنجومەنی بەرگریکردن و لێژنەکانی سەر بەو ئەنجومەنە دەکات.

٥- دوای وەرگرتنی رای ئەنجومەنی دەوڵەت مافی پێشنیازکردنی یاسای هەیە لە بەردەم پەرلەماندا، کە دەبێ لە شێوەی پرۆژە یاسادا بێ، ئەمەش لە دوای ئەوەی لە ئەنجومەنی وەزیراندا گفتوگۆی لەسەر دەکرێ.

بەڵام وەزارەتەکان هەر وەزیرەو کاروباری وەزارەتەکەی خۆی بەڕێوە دەبات و سیاسەتی حکومەت لە سنوورەکانی خۆیدا جێبەجێدەکات.

### (٢) دەسەڵاتی یاسادانان:

### أ- ئەنجومەنی پیران:

ئێستا ئەنجومەنی پیران لە ٣١٩ ئەندام پێکدێ و لە رێگەی هەڵبژاردنێکی ناڕاستەوخۆوە بە دوو قۆناغ هەڵدەبژێردرێن:

**یەکەم:** دەسنیشانکردنی کۆمەڵەیێکی هەڵبژاردن لەسەر ئاستی پارێزگاکاندا و چەند نوێنەرێك لە ئەنجومەنە خۆجێیەتییەکان و ژمارەشیان لە پارێزگاییێکەوە بۆ پارێزگاییێکیتر دەگۆڕێ.

لە قۆناغی دووەمدا ئەو کۆمەڵەی هەڵبژاردنە ئەندامەکانی ئەنجومەنی پیران دەسنیشان دەکات، و ماوەی ئەندامێتی لەو ئەنجومەنەدا ٩ نۆ ساڵە، بە مەرجێك هەر سێ ساڵ جارێك (یەك لە سەر سێی) ئەندامەکان نوێ دەکرێتەوە.

**ب ـ کۆمەڵەی نیشتمانی:**

کۆمەڵەی نیشتمانی فەرەنسی کۆمەڵەی نوێنەرانی راستەقینەی خەڵکیە، لەبەرامبەر ئەنجومەنی نوێنەراندا هەر خۆی سەرپشکە و ئەندامەکانیشی لە هەڵبژارنێکی گشتیدا بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەلایەن هەموو هاولاتیانەوە ئەوانەی تەمەنیان گەیشتۆتە ١٨ ساڵ هەڵدەبژێردرێن. ئەنجومەنی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٨٦ەوە لە ٥٧٧ نوێنەر پێکدێ کە ٥٥٥یان نوێنەرایەتی فەرەنسا دەکەن، ئەوانی تریش کە ٢٧ ئەندامن نوێنەرایەتی ئەو هەرێم و زەویانە دەکەن، کە کەوتونەتە پشت دەریاکانەوە و سەر بە فەرەنسان.

هەرچەندە ماددەی ٣٤ی دەستووری فەرەنسی چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی پەرلەمانی تا رادەییێکی زۆر بەر تەسك کردۆتەوە، بەڵام ئەو دەسەڵاتەکانی خۆی پیادە دەکات، چونکە دەکرێ ئەوان، یان حکومەت بە بێ جیاوازی پرۆژە یاساکان پێشکەش بکەن. ئەنجومەنی نیشتمانی لە رێگەی ئەو مافەی کە هەییێتی لە بڕیاردانی رەتکردنەوە، یان رازی بوون لەسەر ئەو پرۆژەیاسایانەی، کە دەخرێنە روو و هەڵسەنگاندنی بوودجە و لێژنەکانی گوێگرتن و لێکۆڵینەوە...هتد چاودێری کارەکانی حکومەت دەکات. ئەگەر حکومەت بەرپرسیارێتیەکەی خۆی بە پرۆژە یاساییێکی پێشنیازکراو بەستەوە، لەو حاڵەتەدا دەبێ ئەنجومەنی نیشتمانی: یان پرۆژەکە رەتبکاتەوە، لەو حاڵەتەشدا دەبێ بە زۆرینەی دەنگی ئەندامان متمانە لە حکومەت بسەندرێتەوە. ئەگەر ئەوەش نەکات پرۆژەکە دەکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە و وا ئەژمار دەکرێ لە پەرلەمان رەزامەندی لەسەر پێشاندراوە. دەبێ ئەوە بزانین، کە سەرۆککۆمار دەسەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نیشتمانی هەیە و هەڵبژاردنێکی نوێ بۆ پەرلەمان بکاتەوە، ئەو مافەش وەك کەرەستەییێکی گوشارە لەسەر کۆمەڵە لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە.

**(٣) دەسەڵاتی دادوەری:**

ئەگەر چی (مۆنتسکیۆ) ی فەیلەسوفی فەرەنسی داوای دەکرد دەسەڵاتەکان لە یەکتر جیا بکرێنەوە، ئەم داواکاریە لەگەڵ دەسەڵاتی دادوەری فەرەنسیدا سەرکەوتنێکی تەواوی بە دەستهێنا، کە بە سەربەخۆییێکی تەواو لە دەسەڵاتەکانی تر کارەکانی خۆی جێبەجێدەکات، دادوەری فەرەنسی دابەش دەبێتە سەر سێ جۆر: مەدەنی و تاوان و کارگێڕی. دادگای پێداچوونەوە (النقض) ی فەرەنسی بە بالاترین دادگای پێداچوونەوەی کاروبارەکانی مەدەنی و تاوان دادەنرێ، هەروەها ئەنجومەنی دەوڵەتیش بالاترین لایەنە لە کاروبارە کارگێڕییەکاندا.

**ئەنجومەنی دەوڵەت:** E, Tat ‹Conseild

ئەنجومەنی دەوڵەت یەکێکە لە کۆڵەگە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی دادوەری و بۆ ماوەیێکی دورو درێژ ئامۆژگاری و راوێژی لە بارەی رێنماییەکان پێشکەش بە حکومەت دەکرد و شەرعیەتی یاساکان، کۆتایی هێنان بە کێشە کارگێرییەکان (خۆی ناپلیۆن ئەو ئەنجومەنەی بۆ ئەو مەبەستە دامەزراندبوو). ئەمرۆکەش ئەنجومەنی دەوڵەت بۆ خۆی دادگاییێکی سەربەخۆیە و پارێزگارییێکی تەواو لە هاولاتیانی فەرەنسی دەکات لەدژی گەندەڵی دام و دەزگا کارگێرییەکان، یان خراپ بە کارهێنانی دەسەلات. ئەو بۆ کێشە کارگێرییەکان وەك دەسەڵاتی باڵا و کۆتایی وایە، بۆیە لە بەر ئەو بارە قورسەی، کە لەسەر شانییێتی چەندین دادگای کارگێری لە سەرتاسەری ولات دامەزراندووە، کە ژمارەیان دەگاتە **٢٢** دادگا، ئەمە سەرەڕای دادگاییێکی تایبەت لە پاریس، کە زۆربەی هەرە زۆری کێشە کارگێرییەکانی بۆ دەنێردرێ.

زۆر لە ولاتەکان چاویان لە فەرەنسا کرد و ئەنجومەنی دەوڵەتیان دامەزراند وەك: ئیتالیا و ئیسپانیا و یۆنان و بەلجیکا و پورتوگال و تورکیا و میسر و لوبنان، بەلام دەبێ ئەوە بلێین کە ئەو پێگە بالایەو ئەو دەسەلات و ناوبانگە چاکەی ئەنجومەنی دەوڵەت لە فەرەنسا هەییێتی لە هیچ دەوڵەتێکی دیکەدا بەدی ناکرێ.[٤٧٦]

دەستوورەکەی ساڵی **١٩٥٨** ئەنجومەنێکی دەستووری داهێنا کە دەسەلاتی پێداچونەوەی ئەو یاسایانەی هەبێ، کە سەرۆککۆمار، یان سەرۆکی وەزیران دەری دەکەن، کە تا چەند دەستوورین. ئەو ئەنجومەنە لە **٩** ئەندام پێکدێ، کە هەر یەك لە سەرۆککۆمار و سەرۆکی ئەنجومەنی پیران و سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانی دایاندەنێن، کە هەر یەکەیان سێ لەو ئەندامانە دادەنێن و بۆ ماوەی **٩**ساڵ نوێ ناکرێنەوە و سەرۆککۆمار یەکێك لەو نۆ کەسە هەڵدەبژێرێ دەیکاتە سەرۆکی ئەنجومەنەکە و سەرۆك کۆمارەکانی پێشوتریش بە حوکمی پلەو پاییەکانیان دەبنە ئەندام لەو ئەنجومەنەدا. بەلام رۆڵیان لە ئەندامە سەرەکییەکان کەمتر دەبێ.[٤٧٧] سەرۆك کۆمار سەربەخۆیی دەسەلاتی دادوەری دەپارێزێ. هەر خۆشی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی بالای دادوەری سەرپەرشتی دامەزراندنی هەر هەموو ئەندامەکانی دەکات.

---

476 - Encyclopedia Britannica , Vol , I, P.93-94 .

٤٧٧ - د. محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر (النظم السياسية والقانون الدستوري) دار ئەلنەهزەلعەرەبیە لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٩ لـــ١٥٨ــ ودواتری، هەروەها (موسوعە العلوم السياسيه)بەرگی دووەم زانکۆی کوێت ساڵی ١٩٩٤ لـــ١٦٤٢ــ ودواتری : Encyclopedia Britannica , Vol,6 P.530.

## سێیەم: گرنگترین  حیزبە سیاسییەکانی فەرەنسا: .

سیستەمی سیاسی لە فەرەنسا بە پرەنسیپی فرە حیزبی کار دەکات، چونکە دەستوور دروستبوونی حیزبەکان و گردبوونەوە سیاسی و رۆشنبیری و سەندیکا کرێکارییەکان و.. هتد چارەسەر کردووە، لەوانەشە بتواندرێ ئەوە بگوترێ کە دروستبوونی حیزبەکانی فەرەنسا لە گەڵ شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩دا دەستی پێکرد. هەرچەندە دروستبوونی حیزبە نوێییەکان بۆ سەرەتای سەدەی رابردوو دەگەڕێتەوە، بۆیە دەتوانی گرنگترین حیزبە سیاسییەکانی ئەم سەردەمە بەمشێوەیەی خوارەوە کورت بکەیتەوە.

### (١) حیزبی سۆشیالیست:

ئەو حیزبە یەکەمجار وەك بزوتنەوەیێکی سەندیکایی دەستی پێکرد و تیۆرەکانی مارکسیزم کاریگەریان لەسەر ئەو حیزبە هەبوو، کە مەبەستی گۆڕینی سیستەمی سەرمایەداری بوو لە وڵاتدا، باڵێکیشی لێ جیابۆوە سەر بە حیزبی شیوعی جیهانی بوون، بەڵام رەوتە سەرەکیەکە وردە وردە بووە حیزبێکی چاکسازیخواز و زیاتر بەلای راستدا دەشکایەوە نەك بەلای چەپدا و تاوەکو ساڵی ١٩٨٤ هەردوو حیزبی ـ سۆشیالیست و شیوعی ـ هاوپەیمانیان لە نێواندا هەبوو و شیوعییەکان پێش ئەوەی بڕیاری کشانەوە بدەن لەبەرئەوەی (دڵنیایی تەواو) یان پێ نەدرابوو بە چوار وەزیر لە حکومەتدا بەشدار بوون. لەو کاتەی حیزبی سۆشیالیست روو لە هەڵکشان بوو، حیزبی شیوعی وردە وردە بچووك دەبۆوە تا لە ناو سیستەمی سیاسی فەرەنسیدا بووە یەکێك لە هێزە پەراوێزخراوەکان، ئەو کە لە ساڵی ١٩٧٨دا ٨٦ کورسی بە دەست هێنا، ئەو ژمارەیە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨١دا بۆ ٤٤کورسی دابەزی و لە ساڵی ١٩٨٦دا بوە ٣٥ کورسی، بەمشێوەیە ئەستێرەی بەختی روو لە دابەزین بوو تا ئەو کاتەی رۆڵی لە ژیانی سیاسی فەرەنسادا زۆر کەم بۆوە.

### (٢) حیزبی کۆماری:

ئەم حیزبە ڤالێری جیسکار دیستان (١٩٢٦ـ......) دایمەزراند کە سیاسەتمەدارێکی فەرەنسی کۆنەپارێزە و لە حکومەتەکەی شارل دیگۆلدا بۆ ماوەی چوار ساڵ (١٩٦٢ـ١٩٦٦) وەزیری دارایی بوو، دوای دەرچوونی دیستان لە پۆستی وەزارەت لە ساڵی ١٩٦٦دا تۆڕێکی یانە سیاسییەکانی دانا و لە ساڵی ١٩٧٧دا لە شێوەی (یەکێتییێکی نیشتمانی کۆماریە

سەربەخۆكان)كۆبوونەوە، كە دوواتر بووە حیزبێكی سیاسی بە ناوی (حیزبی كۆماری) ئەمە دوای بە دەستهێنانی پۆستی سەرۆك كۆماری فەرەنسا بوو (١٩٧٤ـ١٩٨١) بە هاوپەیمانی كردن لەگەڵ باڵی دیگۆلدا كە باڵی (جاك شیراك) بوو تازە سەردەكەوتن، لەدوای دۆڕاندنی دیستان لەبەرامبەر ركابەرەكەیدا (فرانسوا میتیران) (١٩١٦ـ ١٩٩٦) لە ساڵی ١٩٨١دا حیزبی كۆماری وەك رەوتێكی راستڕەوی كۆنە پارێز لەگەڵ رەوتی دیگۆلیدا گرنگترین هێزە راستڕەوەكانیان پێكهێنابوو. لە ساڵی ١٩٩٦دا (دیستان گەڕایەوە (كۆمەڵەی نیشتمانی) و بووە سەرۆكی لیژنەی كاروبارەكانی دەرەوە.

### (٣) گردبوونەوە لە پێناو كۆماری بووندا:

ئەمە رەوتێكی سیاسی بوو زیاتر لە چوارچێوەی كەسایەتی (شارل دیگۆل) و ئەو رۆڵەی كە لە رزگاركردنی فەرەنسادا هەیبوو لە دەستی نازییەكان دەسوڕایەوە لە كاتی شەڕی جیهانی دووەمدا. ئەم یەكێتیە لە ساڵی ١٩٤٦دا لەسەر دەستی هەندێكك لە لایەنگرە دڵسۆزەكانی دیگۆل دامەزرا، بەڵام دیگۆل لە ساڵی ١٩٥٥دا دەستی لە كاری سیاسی هەڵگرت و دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٨دا داوایان لە دیگۆل كرد بگەڕێتەوە دەسەڵات و سەر لە نوێ ژیان بخاتەوە بەر ئەو رەوتە، ناوی بووە (یەكێتی كۆمارییە نوێییەكان) بۆ ماوەی چارەكە سەدەییێك بووە بە هێزترین حیزبی سیاسی لە فەرەنسا. دوای مردنی دیگۆل لە ساڵی ١٩٧٠و مردنی (جۆرج بۆمبیدۆ) لە ساڵی ١٩٧٤دا، ئەو كە لە دانانی دەستووری ١٩٥٨دا یارمەتی دیگۆلی دابوو، (جاك شیراك) (١٩٣٢ـ.....) بووە سەرۆكی حیزب و لە (١٩٧٤ـ١٩٧٦) و (١٩٨٦ـ١٩٨٨) بووە سەرۆكی وەزیران و دواتر لە ساڵی ١٩٩٥دا بووە سەرۆككۆمار. هەرچەندە ئەو حیزبە نەگەڕایەوە سەر ئەو هێزەی سەردەمی دامەزرێنەرەكەی، بەڵام تاكو ئێستاش بە گەورەترین حیزبی سیاسی راستڕەو دادەنرێ لە فەرەنسا.

### (٤) حیزبە كەمینەكان:

لێرەدا كۆمەڵێك حیزبی بچووك بچووك هەن لەوانە:

(أ) حیزبی ناوەندی دیموكراسی كۆمەڵایەتی، كە دەیەوێ هەمان رۆڵی حیزبە مەسیحییەكانی ئەوروپا لەناو سیستەمی سیاسی فەرەنسادا بگێڕێ، ئەو حیزبە لە ساڵی ١٩٧٦دا دروست بوو.

(ب) بەرەی نیشتمانی، حیزبێکی راستڕەوی توندڕەوە و لە ساڵی ۱۹۷۳دا دروست بووە، هەرچەندە ئەو حیزبە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۷۸دا تەنها یەك کورسی بە دەسهێنا ـ و بەهەمان شێوە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۸۱دا سەرنەکەوت ـ بەڵام لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۸٦دا توانی ۳۵ کورسی بە دەسبێنێ و زیاتر لە ۲۰ ملیۆن کەس دەنگی بۆ دابوون و لە هەر هەموو حیزبە سیاسییەکانی تری فەرەنسا کۆنەپەرست ترو رەگەزپەرستتر و دوژمنکارانە ترە بە تایبەتی بەرامبەر بە عەرەب.

(ج) بزوتنەوەی رادیکالیە چەپڕەوەکان، لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۷۸دا هیچ کورسییێکیان لە پەرلەمان بە دەست نەهێنا، هەروەها لە هەڵبژاردنەکانی ۱۹۸۱یش هیچیان بە دەست نەهێنا، بەڵام لە هەڵبژاردنەکانی ۱۹۸٦دا توانیان دوو کورسی بە دەسبێنن. ئەم بزوتنەوەیە بزوتنەوەییێکی گێرە شێوێنە و لە رووداوەکانی ۱۹٦۸دا رۆڵی کاریگەریان گێڕا، بەڵام ئێستا زۆر لاواز بوونە.

## یەکەم: کورتەیێکی مێژوویی: .

بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست ژاپۆن دەوڵەتێکی ئیمپراتۆری بوو و ئیمپراتۆرێك لەسەر عەرشی پاشایەتی دادەنیشت، کە بە نەوەی خوداوەند ئەژمار دەکرا. هەندێك جار پێیان دەگوت (خۆری ئاسمان)، یان (ئەو پاشایەی، کە لە ئاسمانەوە دابەزیوە)، یان (دەرگا نەمرەکە). بە دار و دەستەکەی چواردەوری پاشاشیان دەگوت (دانیشتوانی سەرووی هەورەکە) و هەندێك لە دەرەبەگەکان، ئەوانەی لە ناوەڕاستی سەدەکانی ناوەڕاستدا دەسەڵاتەکانیان بە هێزتر ببوو و توانیان لە زۆربەی ناوچەکانی وڵاتدا کارو بارەکان بە دەستەوە بگرن و فەرمانڕەوایەتی دوورگەکان بکەن و ئەوەندە منەتی ئیمپراتۆریان نەدەزانی، بەڵکو تەنها وەك دیاردەیێکی پیرۆز تەماشایان دەکرد و بە کەمترین باج هاوکاریان دەکرد، و ناویشیان لە خۆیان نابوو (شاجنەکان)، واتە فەرماندەکان، دواتر وشەی (شاجن) بە مانای (فەرمانڕەوای سەربازی) بەکار دەهات. لەرووی تیۆریەوە بەو پێیەی کە (ئیمپراتۆر کەسێکی پیرۆزە) وەك سەرۆکی وڵات سەیر دەکرا: بەڵام دەسەڵاتداری راستەقینە لە وڵاتدا تەنها (شاجنەکان) واتە فەرماندەکان بوون و ماڵ سەروەتی ژاپۆن لەژێر دەسەڵاتی ئەواندابوو و چەندین ئیمتیازاتیان دابووە خۆیان، کە هەر هەمووی مافی ئیمپراتۆر بوون، تەنانەت وای لێهاتبوو پلەو پاییەکانی خۆیان بە میرات دەدا بە کوڕەکانیان. گەیشتبووە رادەیێك کە ئەنجومەنێکی وەزیران، یان ئەنجومەنێکی راوێژکاری بۆ خۆیان دابنێن: کە لە پێنج وەزیر پێکهات بوو، ئینجا لەگەڵ شەش کەسیش لە پیران ئەنجومەنێکی بچووکیان پێکدەهێنا.

دوا بەدوای فەرماندە سەربازییەکان و دەست و پێوەندەکانیان، چینی (میرە دەرەبەگەکان)، یان (خاوەن ئاسمانە مەزنەکان) دەهات، بە هەزاران کەس لە ساموراییەکان، یان پاسەوانە (شمشێر بەدەستەکان) لە دەوریان کۆ ببونەوە، ئینجا چینی ئەو بەرێزانە دەهات، کە سەرپەرشتی زەوی و زارەکانیان دەکرد و.. هتد.

ژاپۆن لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوودا  لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە دەرچوو بەرەو چاخی نویێ، لەوکاتە لە ساڵی ١٨٥٣دا کەشتیگەلی ئەمریکی لە دەرگای ژاپۆنی دا و فەرماندە ئەمریکیەکە پێی گوت: (حکومەتی ئەمریکی تەنها دەیەویێ چەند بەندەرێکی ژاپۆنی دەرگاکانی خۆی بە رووی کاڵا بازرگانییەکانی ئەمریکادا بکاتەوە و هەندێك کار بۆ پاراستنی ئەو دەریاوانە ئەمریکیانە بکات، کە کەشتییەکانیان لە کەنارەکانی ژاپۆندا تێکدەشکێن)، بەڵام ئەو کەشتیگەلەی ئەمریکا لاوازبوون (چوار کەشتی جەنگی ٥٦٠ پیاو بوون) ـ کەچی لە ساڵی دواتر بە (١٨٥٤) چەکدار و بە هێزێکی دەریایی گەورەترەوە، کە جۆرەها دیاریان پێبوو گەڕانەوە. فەرماندە سەربازیەکەی ژاپۆن زۆر بەو دیاریانە دڵخۆش بوو (کە لە بنچینەدا ئەو دیاریانە بۆ ئیمپراتۆر و خێزانەکەی نێردرابوو) و پەیمانێکییان مۆر کرد کە تیایدا ژاپۆن دانی بە هەر هەموو داواکارییەکانی ئەمریکییەکاندا نا، بەڵام گەلی ژاپۆنی بە دەست ئەو پەیمانەوە زۆریان ناڵاند و سەرکردەکانیان بوونە دوو بەشەوە، بەشێکیان دەیگوت: با شەڕی بیگانەکان بکەین و لە وڵات دەریان بکەین و وڵات بگێڕینەوە سەر سیستەمی دەرەبەگایەتی کۆنی کشت وکاڵی، کە دەتوانیێ پشت بە خۆی ببەستیێ و چاوی لە کەسانیتر نەبیێ. هەندێکی دیکەش پێیان وابوو کە چاو لە رۆژئاوا کردن لە دەرکردنیان باشترە لە وڵات، بۆیە لەسەر ژاپۆن پێویستە بە زوترین کات شێوەکانی پیشەسازی رۆژئاوا و هونەرەکانی شەڕی نویێ فێر بێت، ئەو سەرکردانە سەرکەوتن، کە دەیانویست وڵات بە رۆژئاوا بکەن و توانا و زیرەکی خۆیان بەکار هێنا بۆ بە دەستهێنانی پشتیوانی گەورە دەرەبەگەکان بۆ خۆیان و روخاندنی فەرماندە سەربازییەکان و هێنانەوەی ئیمپراتۆر.  بەم شێوەیە ئیمپراتۆر ماجی (١٨٥٢ Majii ـ ١٩١٢) لە ساڵی ١٨٦٧دا بۆ فەرمانڕەوایەتیکردنی ژاپۆن گەڕایەوە سەر دەسەڵات تا رۆژی مردنی و کۆتایی بە سیستەمی دەرەبەگایەتی هێنا و پیشەسازی رۆژئاوای هێنایە وڵات و پێشکەوتنێکی راستەقینە لە ژاپۆندا رویدا کە هەموو بوارەکانی ژیانی گرتەوە: لە ئینگلتەراوە خەڵکیان هێنا بۆ سەرپەرشتیکردنی هێلی ئاسنین و راکێشانی وایەری تەلەفۆن و دروستکردنی کەشتیگەل. هەروەها خەڵکانێکیان لە فەرەنساوە هێنا بۆ دارشتنەوەی یاساکان و مەشقپێکردنی سوپا. چەند کەسێکیان لە ئەڵمانەکان راسپارد بۆ رێکخستنی کاروبارە پزیشکییەکان و تەندروستی گشتی. بۆ ئەوەی پێشکەوتنەکان هەموو بوارێك بگرێتەوە

هەندێك كەسیان لە ئیتالیاوە هێنا بۆ ئەوەی ژاپۆنییەكان فێری وێنەكێشان و كاری نەحتكردن بكەن.[٤٧٨]

ژاپۆن لە سەردەمی (ماجی) ئیمپراتۆردا توانی لە ساڵی **١٨٨٩**دا یەكەم دەستوور رابگەیێنێ. ئیمپراتۆر لە ترۆپكی یاسادانانەوە بوو، واتە لەرووی دەستوورییەوە سەرۆكی باڵای حكومەت و خاوەنی هەر هەموو زەوی وزارەكان و فەرمانده‌ی باڵای سوپا و كەشتی گەلەكان بوو، كە تەنها **لە** بەردەم ئەودا بەرپرسیار بوون، لەگەڵ ئەوەشدا دەستوور بڕیاری لەسەر دامەزراندنی (دایت Diet [٤٧٩]) دابوو، بۆ ئەوەی كاری یاسا دانان بگرێتە ئەستۆ، كە لە دوو ئەنجومەن پێكدێ ئەنجومەنی پیاوماقووڵان و ئەنجومەنی نوێنەران، دەتوانن لە كارەكانیاندا بەردەوام بن مادام ئیمپراتۆر وای بوێت، كە دەسەڵاتی دامەزراندنی وەزیرەكانی بە خۆی داوە و تەنها لە بەرامبەر ئەودا بەرپرسیارن نەك پەرلەمان (دایت)، بەڵام چینی دەنگدەران، كە ژمارەكەیان دەگەیشتە چوارسەدو شەست هەزار كەس و یەكێك لەو مەرجانەی كە دەبووایە هەیانبووایە، دەبووایە بەشێكی دیاریكراو زەوی وزاریان هەبووایە، ئینجا دواتر بە هۆی بزوتنەوە رزگاریخوازیە یەك لە دوای یەكەكان ژمارەی دەنگدەرەكان لە بەرزبوونەوەدا بوون تا لە ساڵی **١٩٢٨**دا گەیشتە **١٣** ملیۆن كەس.

هەروەها ژاپۆن گرنگی بە دامەزراندنی هێزێكی سەربازی دا، كە بتوانێ چارەنووسی وڵات دیاری بكات، بۆیە بانگهێشتی موالیدەكانی كرد بۆ سەربازی، تەنانەت هەر قوتابخانەییێكی كردە سەربازگەییێكی مەشق پێكردن بۆ سەربازەكان. بە هۆی ئەو

---

٤٧٨ - وۆل دیورانت (قصه الحضارة) وەرگێڕانی دكتۆر زەكی نەجیب مەحمود، بەرگی پێنجەم لـ١٦٥ـ و دواتری.

٤٧٩ - وشەی (دایت Diet) بە مانای كۆمەڵە، یان ئەنجومەن، یان كۆنگرە دێت ئەو واژەیە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتە پیرۆزەكانی ڕۆمانیدا لە ئەوروپا و هەروەها لە ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیاشدا باو بوو كە گرنگترینیان دایت وۆرمز Diet Worms بوو كە لە ساڵی ١٥٢١دا بۆ گفتوگۆكردن لەسەر بیروڕاكانی مارتن لۆتەر M.Luther بەسترا لە سەردەمی (شارل) ی پێنجەمدا، بەڵام ئێستا لە ژاپۆندا بۆتە كۆمەڵەی نیشتمانی یاسادانان كە لە دوو ئەنجومەن پێكدێ، ئەویش ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی ڕاوێژكارەكانە، كە دواتر باسی دەكەین. بۆ ئەمەش ئەمانەی خوارەوە بخوێنەوە :

The Hutchinson Encyclopedia , 1999 P.314. Encyclopedia Britannica, Vol,3,P.5238 .

گەشەکردنەوە ژاپۆن ـ بە خێراییێکی سەرسوڕهێنەر ـ بووە هێزێکی سەربازی کە کێش و پێگەی خۆی لەناو وڵاتاندا هەبێ، لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا (١٨٩٤ـ١٨٩٥) بەسەر چیندا سەرکەوت و لە (١٩٠٤ـ١٩٠٥)دا بە سەر روسیادا سەرکەوت و لە شەڕی جیهانی یەکەمدا کاریگەری لەسەر هەندێك لە موستەعمەرە ئەڵمانییەکان دانا، بەڵام لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنانەدا بیرۆکەی عەسکەرتاریەت لە ژاپۆندا بەهێز بوو، بۆیە ژەنەراڵەکان ئەوانەی چێژی هێزی سەربازی مەستی کردبوون ـ گاڵتەیان بە بیرۆکەی دیموکراسی دەهات و چەند پلانێکی فراوانخوازیان داڕشت کە گەیاندیانییە ئەوەی، لە سییەکانی سەدەی رابردوودا مەنشوریا و باکوری چین داگیر بکەن، هەروەها لە ساڵی ١٩٤٠دا چەند ناوچەییێکیان لە باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیا داگیر کرد. ئینجا لە ٧ی دیسەمبەری ١٩٤١دا گورزێکی لە (بیرل هاربەری) وەشاند، دوای ئەوە شەڕێکی ترسناکی دەست پێکرد کە چوار ساڵێ خایاند، لە کۆتاییدا ئەمریکییەکان (بۆمبی ناوەکی)یان لە (هیرۆشیما) و (ناکازاکی)دا بە کار هێنا و ژاپۆن خۆی بە دەستەوەدا و لە ٢ ی سەپتەمبەری ١٩٤٥ دا لەسەر پشتی کەشتی (میسۆری) پەیمانی راگرتنی شەڕیان مۆرکرد. ئینجا دوای ئەو وڵاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٥١ دا پەیمانێکی ئاشتی لەگەڵ ژاپۆندا مۆرکرد کە چەند دورگەییێکی زۆری لە ژاپۆن داماڵی ـ ئەم بارودۆخە تا هاتنی حکومەتەکەی (ساتۆ Sato) بەردەوام بوو کە لە ساڵی ١٩٦٤دا دەسبەکاربوو ـ ئەو حکومەتە توانی لە ساڵی ١٩٧٢ دا دورگەکانی ئۆکیناوا Okinawa.... بگێڕێتەوە ـ کە هێشتا (هیرۆ هیتۆ Hirohito)ی ئیمپراتۆر (١٩٠١ـ١٩٨٩) لەسەر تەختی پاشایەتی ژاپۆن بوو.[٤٨٠]

---

٤٨٠ -هیرۆ هیتۆ (١٩٠١ Hito Hiroـ ١٩٨٩) لە ساڵی ١٩٢٦ ەوە ئیمپراتۆری ژاپۆنە و دوای شکستەکەی ژاپۆن لە ساڵی ١٩٤٥دا ـ لە دەستووری ساڵی ١٩٤٦دا بووە کەسایەتییێکی ڕەمزی و لە ساڵی ١٩٤٧دا ئەو دەستوورە پیادەکرا. ئەو وتارەی لە ١٥ی ئابی ١٩٤٥دا بۆ کۆمەڵانی خەڵکی ژاپۆنی خوێندەوە ـ واتە یەك ڕۆژ پێش خۆ بەدەستەوەدانی ژاپۆن ـ ئەوە یەکەم وتار بوو، کە ئیمپراتۆرێکی ژاپۆنی ڕاستەوخۆ ئاراستەی گەلەکەی خۆی بکات.

**دووەم: سیستەمی سیاسیی ئێستا:**

**١. دەسەڵاتی جێبەجێکردن:**

**أ– ئیمپراتۆر:**

ئەو دەستوورەی ئێستای ژاپۆن لە ساڵی ١٩٤٦دا دەرچووە و لە ساڵی ١٩٤٧ەوە دەست بە جێبەجێکردنی کراوە و دەستوورەکەی ساڵی ١٨٨٩ی هەڵوەشاندەوە و لە زۆر خاڵدا پێشی کەوتەوە. تێیدا هاتووە کە ژاپۆن دەوڵەتێکی پاشایەتی دەستوورییە، ئیمپراتۆریش سەرۆکی دەوڵەتە، بەڵکو یەکێکە لە گرنگترین سونبولەکانی سیستەمی سیاسی. هەرچەندە دەسەڵاتەکانی تەنها لە پیادەکردنی چەند کاروبارێکی رووکەشدا کۆبۆتەوە، وەك: بانگهێشتکردنی پەرلەمان بۆ دانیشتن و ئاشکراکردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و دانانی وەزیری یەکەم و سەرۆکی دادگای باڵا و مۆرکردنی پەیمان و یاساکان و بەخشینی نازناوی شەرەف و...هتد. ئەمە لەدوای رەزامەندی ئەنجومەنی وەزیران ئەم کارانە پیادە دەکات. ئیمپراتۆر پێش ئەوەی سەرۆکی وەزیران (وەزیری یەکەم) دابمەزرێنێ دەبێ رەزامەندی پەرلەمان وەربگرێ کە لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردراوە.

لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین کە دەستوورە نوێیەکە (دەستووری ١٩٤٧) لەم خاڵانەدا پێش دەستوورە کۆنەکەی ١٨٨٩ کەوتۆتەوە:

١- ئیمپراتۆر تەنها بۆتە رەمزێکی دەوڵەت و یەکێتی نەتەوەی ژاپۆن، بەڵام ئێستا دەسەڵاتی راستەقینە هی گەلە.

٢- دەسەڵاتی گەلە، کە مافی ئەوەی هەیە جاڕی شەڕبدات و پەیمانە جۆربەجۆرەکان مۆر بکات.

٥- مافە بنچینەییەکانی هاوڵاتیان دەستەبەر کراوە و ئەزەلیە، بۆیە نابێ دەسکاری بکرێن.

٤- گرنگترین ئەرکەکانی حکومەت پاراستنی ژاپۆنە بەوپێیەی، کە دەوڵەتێکی دیموکراسیە و بانگەشەی ئاشتی دەکات.

٥- ئیمپراتۆر هیچ دەسەڵاتێکی بە سەر حکومەتدا نییە، تەنها ئەو رۆڵانە نەبێ، کە لە کاروبارە روکەشەکانی پێشوودا دەیانبینێ.

٦- دەسەڵاتی جێبەجێکردن سەرۆکی حکومەت پیادەی دەکات و ئەنجومەنی وەزیرانیش هاوکاری دەکا.

٧- دەسەڵاتی یاسادانان لە دەستی دایت Diet دا دەبێت.

ب ـ ئەنجومەنی وەزیران:

ئەنجومەنی وەزیران پیادەکردنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە ئەستۆ دەگرێ. دەستوور بەرپرسیارێتی ئەو ئەنجومەنە دیاری دەکات، کە لە بیست و یەك وەزیر پێکدێت جگە لە وەزیری یەکەم ـ کە ئیمپراتۆر لەسەر داوای پەرلەمان دایدەمەزرێنێ. وەك نەریتێك لەبەرئەوەی سەرۆکی وەزیران لەلایەن پەرلەمانەوە دەسنیشان دەکرێت، بۆیە دەبێ سەرۆکی حیزبی زۆرینە بێت. لە ژاپۆندا بیرۆکەی گۆڕینی دەوری وەزیرەکان پیادە دەکرێت، ئەمەش مانای ئەوە ناگەیێنێ کە حکومەت جێگیر نییە، بەڵکو کارەکانی دەوڵەت لە ڕێگەی جێگرەکانیانەوە بە شێوەییێکی بەردەوام بەڕێوە دەچێت، چونکە ئەوان ماوەییێکی زیاتر لەسەر کارەکانیان دەمێننەوە، هەروەها لە ڕێگەی ئەنجومەنیشەوە کەسانێك بۆ پلەی وەزیر دەسنیشان دەکرێت کە شارەزایی باشیان لە کارەکاندا هەبێت.

ئەنجومەنی وەزیران لە بەردەم پەرلەماندا(دایت) بەر پرسیارە، ئەو مافەشی هەیە لێکۆڵینەوە لەگەڵ وەزیرەکاندا بکات، ئینجا تاك تاك بێت، یان بە کۆمەڵ. جارێکیان وا ڕێککەوت کە (تاناکا ١٩٧٤ -١٩٧٢)[٤٨١] (Tanaka) سەرۆکی وەزیران بوو، تاوانی گەندەڵی خرایە پاڵی، چونکە هەندێك قازانجی نا شەرعی لە کارگەکانی لۆکهید Lockehead دەسکەوتبوو، (کە گەورەترین کارگەی فڕۆکەن لە ئەمریکا و لە گەورە کۆمپانیاکانی پیشەسازی جەنگیشن). کە بە (کارە ئابڕوو بەرەکەی لۆکهید ناسرابوو)، ئەو کارەی وای کرد لە ساڵی ١٩٧٦دا واز لە سەرکردایەتی حیزبەکەی بهێنێت. پەرلەمانیش بۆی هەیە متمانە لە وەزیرێك، یان سەرجەم وەزیرەکان بسەنێتەوە، ئەو کاتەش ناچار دەبێ دەست لە کار بکێشێتەوە، ئەگەر لە ماوەی دە ڕۆژدا ئەنجومەنی نوێنەران هەڵنەوەشێندرێتەوە.[٤٨٢]

---

٤٨١ - (کاکۆی تاناکا ١٩٩٣ -١٩١٨) ( Kakuei Tanaka) سیاسەتمەدارێکی باڵی ڕاستڕەوەکان بوو لە ژاپۆن و سەرۆکی حیزبی دیموکراتی لیبرالیە و لە (١٩٧٢- ١٩٧٤) سەرۆکی وەزیرانی ژاپۆن بوو و لە ساڵی ١٩٥٧دا وەزیری گەیاندن بوو و لە ساڵی ١٩٦٢ تا ١٩٦٤ وەزیری دارایی بوو. یەکێکیش بوو لە سەرکردە بە هێزەکانی ناو حیزب و لە ساڵی ١٩٦٥دا بووە سەرۆکی حیزبەکەی خۆی.

482 - Encyclopedia Britannica Vol.10 ,P.52 .

**(٢) دەسەڵاتی یاسادانان:**

لە ژاپۆندا ئەنجومەنی دایت..Diet (پەرلەمان) دەسەڵاتی یاسادانان بەڕێوە دەبات، ئەنجومەنی دایت لە دوو ئەنجومەن پێکدێت کە ئەمانەن: یەکەمیان ئەنجومەنی نوێنەران، کە ئەنجومەنێکی پلە نزمترە (Shugiin)، بەڵام بڕیارەکانی یەکلاکەرەوەیە و لە چاودێری کردنی حکومەتدا خاوەن قورساییێکی راستەقینەیە. دووەمیشیان ئەنجومەنی راوێژکارانە کە ئەنجومەنێکی باڵاترە. پێدەچێ ئەو ناولێنانە وەك ئەو لاسایی کردنەوە پەرلەمانییەی (Sangiin) ی ئینگلتەرابێ، کە بە ئەنجومەنی گشتیان دەگوت ئەنجومەنە بچووکەکە (سەرەڕای ئەو قورساییەی کە هەیبوو) و بە (ئەنجومەنی لۆردەکان) یان دەوت ئەنجومەنە باڵاکە، وەك ئەوەی پێشتریش، کە باسی ئینگلتەرامان کرد وبەر چاومان کەوت.

**(أ) ئەنجومەنی نوێنەران:**

واتە ئەنجومەنی یاسادانان، لە ٥١١ کورسی پێکدێت، نوێنەرایەتی ٤٧ هەرێم دەکات لە ژاپۆن کە (دوورگەکانی ئۆکیناواشی لە گەڵدایە) ـ و لە تەواوی ژاپۆندا بە سەر ١٢٤ بازنەی هەڵبژاردندا دابەش دەبێت. ئەندامەکانیشی لە رێگەی هەڵبژاردنێکی گشتی و راستەوخۆوە هەڵدەبژێردرێن. هەر هاوڵاتییێك تەمەنی گەیشتبێتە(٢٥) ساڵ دەتوانێ خۆی بۆ ئەو ئەنجومەنە بپاڵێوێ ـ وەك لە دەستووردا هاتووە هەڵبژاردن بۆ ئەو ئەنجومەنە دەکرێ، بەڵام بە دەگمەن وا رێکدەکەوێ، کە ئەو ماوەیە تەواو بکات، بەڵکو تەنها دوو تا سێ ساڵ زیاتر نابات و هەڵبژاردن دەکرێتەوە. لە ساڵی ١٩٤٧ ەوە تا ئێستا ١٣ سێزدە ئەنجومەن یەك بە دوای یەکدا هاتوون و گۆڕاون و هیچ کامێکیان چوار ساڵەکەی تەواو نەکردووە.

**(ب) ئەنجومەنی راوێژکاران:**[٤٨٣]

ئەنجومەنی راوێژکاران، کە تەنها بە ناو ئەنجومەنی باڵایە لە ٢٥٢ ئەندام پێکدێ، نوێنەرایەتی هەموو هەرێمەکان دەکات، هەروەها نوێنەرایەتی سەرجەم نەتەوەی ژاپۆن دەکات و هیچ لایەنێکیش توانای هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئەنجومەنەی نییە. ماوەی بە ئەندامبوون لەو

٤٨٣- لە کاتی خۆیدا ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان بوو (الاشراف) و ئێستاش هەندێك کەس پێی دەڵێن (ئەنجومەنی پیران ).

ئەنجومەنەدا شەش ساڵە. بە مەرجێك هەر سێ ساڵ جارێك نیوەی ئەندامەكانی لە ڕێگەی گۆڕینیان نوێ دەكرێنەوە.

شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامەكان لەو ئەنجومەنەدا جیاوازی لەگەڵ شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامەكانی ئەنجومەنی نوێنەراندا هەیە، ئەگەر بێت و دەسنیشانكردنی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی و ڕاستەوخۆوە بێت، ئەوە ئەندامانی ئەنجومەنی ڕاوێژكاران بە دوو قۆناغ هەڵدەبژێردرێن، هەڵبژاردنی ١٥٢ كەس لە ٤٧ بازنەدا لە سەرۆكی هەرێمەكان و سەرۆكی دام و دەزگا حكومییەكان لە پارێزگاكان و شار و دێهاتەكان، كە دانیشتوانی ناوچەكە هەڵیانی بژاردووە و لەهەر بازنەییێكی هەڵبژاردنیشدا كورسییەكان بە پێی چڕی دانیشتوان دەستنیشان دەكرێن، وەك لە دەستووری ساڵی ١٩٤٧دا هاتووە، بە لەبەرچاوگرتنی هەر گۆڕانكارییێكیش كە بەسەر دانیشتواندا بێ، بەڵام لە قۆناغی دووەمدا: ئەو ١٠٠ سەد ئەندامەی كە ماوە لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی و ڕاستەوخۆوە هەڵدەبژێردرێن بە بەشداریكردنی كۆی دەنگدەران لە سەرتاسەری ژاپۆندا. ئەو دەنگدانەش ئەوەی تەمەنی گەیشتبێتە بیست ساڵ نێرینە بێت، یان مێینە، دەتوانێ بەشداری تێدا بكات.

پەرلەمان لایەنی كەم ساڵی جارێك كۆ دەبێتەوە، دانیشتنەكانیشی نزیكەی لە ناوەڕاستی دیسەمبەرەوە دەست پێدەكات، تا ناوەڕاستی مایۆ بەردەوام دەبێت، ئەگەر پێویستیش بكات ماوەكە درێژتر دەكەنەوە.

لە پەرلەماندا (دایت Diet ١٦) شازدە لیژنە هەیە، لەگەڵ وەزارەتەكان و دام و دەزگاكانی حكومەتدا دادەنیشن و چاودێری كارەكانیان دەكەن، ئەندامبوون لەو لیژنانەدا بە پێی ڕێژەی ئەندامانی حیزبە سیاسییەكانە لە ناو پەرلەماندا. كە زۆربەی ئەندامەكانی ئەو لیژنانە بەر حیزبی زۆرینە دەكەوێ، لە كاتێكدا حیزبە ئۆپۆزسیۆنەكان ڕێژەییێكی كەمیان بەر دەكەوێ.

كاری یاسادانان لە ژاپۆندا زۆر دیموكراسیانە ئەنجام دەدرێ، سەرەڕای ئەوەی كە حیزبی زۆرینە دەتوانێ پشت بە زۆرینەكەی خۆی ببەستێ و هەندێك لەو یاسایانە بڕوێنێ، كە ئۆپۆزسیۆن ڕەتی دەكاتەوە، بەڵام زۆر بە دەگمەن ئەو مافەی خۆیان بە كار دەهێنن، لەناو پەرلەماندا وەك نەریتێكی لێهاتووە، كە ئەو پرۆژە یاسایانەی دێنە پەرلەمان، بە تایبەتیش (گرنگەكانیان) بە تێكڕای دەنگی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بیڕوێنن.[٤٨٤]

٤٨٤ - (موسوعة العلوم السياسية) بەرگی دووەم لـــ١٢٨١ــــ ودوای ئەو، زانكۆی كوێت ساڵی ١٩٩٤.

لەبارەی پێوەندییەکانی نێوان هەردوو ئەنجومەنەکەش، ئەوەی تا ئێستا تێبینیکراوە ئەوەیە، کە زۆر بە دەگمەن وا ڕێککەوتووە، کە پرۆژە یاسایێك پێشتر ئەنجومەنی ڕاوێژکاران ڕەتیکردبێتەوە، تا سەرلەنوێ ئەنجومەنی نوێنەران بیخاتەوە دەنگدان بۆ ئەوەی ئەنجومەنی ڕاوێژکاران بە دوو لەسەر سێی دەنگەکان ڕەزامەندی لەسەر پێشان بدات. هەرچەندە ئەنجومەنی نوێنەران ئەو مافەی بۆ دەستەبەر کراوە. لە زۆربەی حاڵەتەکاند بۆ ڕواندنی پرۆژەیاساکان لیکتێگەیشتنێك بە هەماهەنگی لەگەڵ لێژنە هاوبەشەکاندا لەنێوان هەردوو ئەنجومەنەکەدا هەیە، بەڵام لە هەندێك لەو پرسانەی کە بە زەحمەت لەسەری هاودەنگ دەبن، وەك: بوودجە و دانانی سەرۆك وەزیران، ڕاکانی ئەنجومەنی نوێنەران سەردەکەون، لەبەرئەوەی بڕیارەکانی ئەو ئەنجومەنە یەکلاکەرەوەن.

### (۳) دەسەڵاتی دادوەری:

دەسەڵاتی دادوەری لە ژاپۆندا سەربەخۆیە، بە شێوەیێك کە بە تەواوی لە هەردوو دەسەڵاتەکەی تر، کە یاسادانان (خۆی لە (دایت)دا دەبینێتەوە) و جێبەجێکردن (کە خۆی لە ئەنجومەنی وەزیراندا دەبینێتەوە) جیاوازە، دەسەڵاتی دادوەریش لە دادگای باڵا (Supreme Court) پێکدێ، کە باڵاترین دەسەڵاتی دادوەریە لەو وڵاتەدا و بە هەر هەموو پێوەرەکانیش گرنگترین دادگایە لە وڵاتدا، کە لە سەرۆکی دادگا و چوار دادوەر پێکدێت. سەرۆکی دادگا لەسەر داوای ئەنجومەنی وەزیران، ئیمپراتۆر دایدەمەزرێنێ و چوار دادوەرەکەی تریش ڕاستەوخۆ لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەسنیشان دەکرێن. کارەکانی ئەو دادگایە ئەوەیە کە بەو یاساو بڕیارانەدا دەچێتەوە کە دەردەچن، بۆ ئەوەی بزانن تا چ ڕاددەیێك دەستوورین، هەروەها بە تێهەڵچوونەوەکان و داواکارییەکانی هاوڵاتیان و دام و دەزگا جۆربەجۆرەکاندا دەچنەوە. پێداچوونەوەی دامەزراندنی دادوەرەکانی دادگای باڵا دەکەوێتە بەر دەنگدانی هاوڵاتیانەوە، بە زۆریش لەو هەڵبژاردنانەدا دەکرێ، کە دەکەوێتە دوای دامەزراندنیانەوە، هەروەها لەکاتی ئەو هەڵبژاردنانەشدا، کە دەکەوێتە دوای کۆتایی هاتنی ماوەی دامەزراندنەکەیان، کە دە ساڵە.

ـ هەروەها هەشت (دادگای باڵای تریش High Court) هاوکاری دادگای باڵا دەکەن، ئەمانە تەماشای ئەو کێشانە دەکەن کە لەلایەن دادگا خۆجێیەتییەکان و دادگای خێزان و دادگا بە پەلەکان و هەندێك لە دادگاکانی تاوان پێشکەشیان دەکرێن. ئەم دادگایانە لە چەند دادوەرێك پێکدێن کە ژمارەکەیان لە سێ تا پێنج دادوەر دەبێ.

ـ هەروەها چەندین دادگای خۆجێیەتی تر هەن، کە هەر هەرێمێك دادگاییێکی دەبێ، تەنها هەرێمی (هۆکایدۆ Hokkaido) نەبێ، کە چوار دادگای هەیە. زۆربەی کاتەکان ئەو دادگا

خۆجێیەتیانە لە تەنها یەك دادوەر پێكدێن و لەكاتی پێویستیشدا دوو دادوەری تری بۆ زیاد دەكرێ. ئەم دادگایە بە كێشە سەرەتاییەكان و كێشەكانی تاواندا دەچنەوە.

ـ یەكێكیش لە دادگا گرنگەكانی وڵاتی ژاپۆن ئەوەیە، كە پێی دەڵێن (دادگای خێزان) ئەم دادگایە لە دادوەرێك تا سێ دادوەر پێكدێ، كاری ئەوەیە هاوسەنگی لەنێوان لایەنەكانی ململانێی ناو خێزان رابگرێ، هەروەها بەو كێشانەشدا دەچێتەوە كە تایبەتن بە مێردمنداڵان.

ـ دادگا بە پەلەكان: لە دادوەرێك پێكدێ و بە سەرپێچی و تاوانە بچووكەكاندا دەچێتەوە و نوێنەری گشتی و بریكارەكانی جەخت لە جێبەجێكردنی ئەو بڕیارانە دەكەنەوە، كە لە دادگاكانی پێشوتر دەردەچن و بەرگری لە بەرژەوەندییەكانی گەلیش دەكات.

هەرچەندە ئەنجومەنی وەزیران خۆی دادگاكانی خوارەوە دادەمەزرێنێ، بەڵام ئەو لەناو لیستێك دەسنیشانیان دەكات، كە لەو كەسایەتیانە پێكهاتووە و لەلایەن (دادگای باڵا)وە پێشكەش كراوە و كراوەتە دیاری. هەروەها تێكڕای دادوەرەكانی ئەو دادگایە بە پێی یاسا دەبێ لە تەمەنی ٧٠ حەفتاساڵیدا خانەنشین بكرێن.

سەرەڕای ئەمەش دادگاییەكی تر هەیە، كە پێی دەڵێن: (دادگای تایبەت)، ئەمە كاتێك یەكێك لە پیاوەكانی دەوڵەت بە تاوانێك تۆمەتبار دەكرێ وەك: كەمتەرخەمی لە كارەكانیدا، یان بەكارهێنانی دەسەڵات بۆ مەرامی تایبەتی خۆی، یان خیانەتكردن و...هتد. لەو حاڵەتانەدا (دادگاییەكی تایبەت) بۆ ئەو مەبەستە پێكدەهێندرێ، كە لە چەند ئەندامێكی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی راوێژكاران پێكدێ.[٤٨٥]

## (٤) حیزبە سیاسییەكان: ـ

دەستووری ژاپۆن ئازادییە گشتییەكانی دەستەبەر كردووە لەوانە: پێكهێنانی حیزبی سیاسی. لەدوای دانانی دەستووری ساڵی ١٩٤٧ەوە چەندین حیزبی سیاسی دروست بوون، ئەمانە هەندێكیان لەگەڵ یەكتریدا یەكیان گرتەوە و هەندێكیشیان هەڵوەشانەوە.

هەر لە ساڵی ١٩٧١ ەوە حیزبی دیموكراتی لیبرالی بە هێزترین حیزب بوو. ئەو حیزبە زیاتر لە كەسانی موحافیزكار  پێكدێن و لە ساڵی ١٩٤٨ ەوە ئەو كەسانەن كە دەسەڵاتیان بە دەستەوەیە.

---

485 - Encyclopedia Britannica ,VoL.10 , P. 52 .

حیزبی سۆسیالیستی ژاپۆنیش ماوەیێکی زۆرە بە هێزترین حیزبی ئۆپۆزسیۆنە. ئەو حیزبە زۆربەی یەکێتییەکانی کرێکاران و دانیشتوانی شارە گەورەکان و کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی بەلای خۆیدا راکێشاوە. ئەو حیزبە پلانێکی بێ لایەنانە لە بەرنامە سیاسییەکانی خۆیدا دادەنێ: داوا دەکات سیستەمێکی پڕ ئاسایش و ئاشتی لە رێگەی بەستنی پەیمانێك لەگەڵ هەریەك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و روسیا و چین دابنرێ، کە هەموو ناوچەکانی ژاپۆن، یان رۆژهەلاتی ئاسیا بگرێتەوە. هەروەها ئەو دژی ئەو پێکهاتنە ئەمنی و هاوکاریەی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆنە کە حیزبی لیبرالی دەسەلاتدار لە ساڵی ١٩٦٠ ەوە مۆری کردووە.

ـ لە ساڵی ١٩٧١یشەوە حیزبی کۆمای (ئۆکۆمیتۆ Komeito) کە مانای حکومەتێکی پاك دەگەیێنێ بۆتە دووەم حیزبی ئۆپۆزسیۆنی گەورە لە ژاپۆندا، ئەو حیزبە هێزو پشتگیرییەکانی خۆی لە (سۆکا ـ گاکای Soka- Gakkai) وەردەگرێ، ئەمانە کۆمەڵەیێکی ئایینین و سەر بە یەکێك لە تیمەکانی ئایینی بوزیە. حیزبەکان لە رێگەی هەڵبژاردنەوە لەناو حیزبدا و بۆ ماوەی سێ ساڵ سەرۆکی حیزب دەسنیشان دەکەن و دەکرێ بۆ جارێکی تریش خۆی کاندید بکاتەوە. لە هەمان کاتیشدا دەتواندرێ سەرۆکی حیزب بدرێتە دادگا، یان لابدرێ، یان ناچار بکرێ دەست لەکار بکێشێتەوە وەك ئەوەی لەگەڵ (تاناکا Tanaka) دا رویدا لە ساڵی ١٩٧٦ بە هۆی (کارە ئابروبەرەکەی لۆکهید)ەوە، هەرچەندە وەك لە پێشتر باسیمان کردبوو وەك ئەندامێك، بەڵکو وەك هێزێکی کاریگەر لە ناو حیزبەکەیدا مایەوە.[٤٨٦] سەرەڕای ئەوەی ئەو حیزبە لە ساڵی ١٩٦٤دا لە باوەشی ئەو کۆمەڵە ئاینییەدا دروست ببوو، بەڵام توانی وردە وردە خۆی لە هەر هەموو ئەو وابەستەبونە فەرمیانە رزگار بکات، کە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئایینییەدا هەیبوو.[٤٨٧] ئامانجی پلانی

---

٤٨٦ ـ سەیر لەوەدایە، کە (تاناکا) خۆی یەکێك لە گەورە دەوڵەمەندەکانی ژاپۆن بوو و لە تەمەنی ١٥پازدە ساڵیدا وازی لە قوتابخانە هێناوە و لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا کۆمپانیای (تاناکای) ئەندازیاری دامەزراندووە، کە لە ماوەی شەڕی جیهانی دووەمدا، بە هۆی گرێبەستە سەربازییەکانییەوە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەی بە دەستهێنا. تاناکا لەگەڵ دانانی دەستووری ساڵی ١٩٤٧دا، ئەو کاتەی خۆی بۆ ئەنجومەنی نوێنەران کاندید کرد هاتۆتە ناو ململانێ سیاسییەکانەوە و ماوەییێکی زۆری پێ نەچوو لەناو حیزبی دیموکراتی لیبرالیدا بە خێرایی پلەکانی بەرز بۆوە و بوە سەرۆکی ئەو حیزبە.

٤٨٧ ـ یەکێکە لە تیرەکانی ئایینی بوزی کە (نیێچیرن ١٢٢٢) (Nichiren ـ ١٢٨٢) لە شاری کاما کۆرای ژاپۆنی دایمەزراندووە و ناوی ئەویشی هەڵگرتووە و کۆمەڵەی (سۆکۆ جاکایش) کە بە مانای (کۆمەڵەی

سەرەکی سیاسەتی حیزبی کۆمای بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی و هەرزانییە بۆ وڵات و گەشە پێدانی پێوەندیە مرۆڤایەتییەکانە لەنێوان هاوڵاتیاندا.

ـ حیزبی سۆسیالیستی دیموکراسی: لە ساڵی ١٩٦٠دا وەك باڵێك لە حیزبی سۆسیالیست، ئەو حیزبەی ئایدیۆلۆژیاییێکی توندڕەوی هەبوو جیابۆوە و بەرنامە سیاسیەکەی بە شێوەییێك داڕشتووە کە ئامانجی دروستکردنی کۆمەڵگەییێکی سۆسیالیستیە لەناو کاروانی دیموکراسیدا، کۆمەکیش لە هەمان ئەو سەرچاوانە وەردەگرێ کە حیزبی سۆسیالیست لێی وەردەگرێ.

ـ حیزبی شیوعی ژاپۆنی: ئەو حیزبە یەکێکە لە حیزبە بچووکەکانی ژاپۆن، هەرچەندە کاریگەرییێکی بە هێزی لەسەر گەشەپێدانە سیاسی و ئەقڵییەکاندا هەبوو.[٤٨٨]

ئەم ئامارە خشتەیەی خوارەوە.[٤٨٩] ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی **١٩٧٩** مان بۆ دەردەخات، کە ئاماژەییێکە بۆ دۆخی حیزبە جۆربەجۆرەکانی ژاپۆن.

| ز | ناوی حیزبەکان | ڕێژەی دەنگەکان | ژمارەی کورسییەکان | لایەن |
|---|---|---|---|---|
| ١ | حیزبی دیموکراتی لیبرالی | ٤٤/٦ | ٢٤٨ | ڕاستڕەو |
| ٢ | حیزبی سۆسیالیستی | ١٩/٧ | ١٠٧ | سۆسیال دیموکرات |
| ٣ | دیموکراسی | ١٠/٤ | ٥٩ | شیوعی |
| ٤ | شیوعییەکان | ٩/٨ | ٥٧ | ڕاستڕەو |
| ٥ | حیزبی حکومەتێکی پاك | ٦/٨ | ٣٥ | سۆسیال |
| ٦ | سۆسیالیستەکان سەربەخۆکان | ٨/٧ | ٣٥ | سەربەخۆ |

---

ڕەوشت بەرزەکان) دێت لەو تیرەیە جیا بۆوە ـ تەماشای جیفری بارندر (المعتقدات الدينية) بکە لە وەرگێرانی د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمامە، کتێبخانەی مەدبولی ساڵی ١٩٩٦ لـ٣٩١ـ .

488 - Encyclopedia Britannica ,VoL.10 , P. 53.

٤٨٩٤٨٩ ـ تەماشای کتێبەکەی د. نوعمان ئەلخەتیب (الاحزاب السياسية و دورها في أنظمة الحكم المعاصرة) بکە دار ئەلسەقافە بۆ دابەشکردن و بڵاوکردنەوە لـ٦٣٢ـ .

# (دەروازەی هەشتەم)

## (گفتوگۆکانی کۆتایی)

**(ئەو زیانانەی لە ئەنجامی بێدەنگکردنی دەربڕینی بیروڕاکان دەکەوێتەوە, ئەوە دەگەیێنێ کە ئێمە سەرتاپای ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەدزین.)**

**جۆن ستیوارت میل:**

**(بنچینەکانی لیبرالیی سیاسی) ل ـ١٣٧**

## یەکەم: ئەو بیرۆکە بنچینەییانەی لەسەر ستەمەکانی دیموکراسی گوتراون: .

### (١)دیموکراسیەتی حوکمڕان وحوکمکراو:

وای دەبینم ئێمە لە تویژینەوەییێك داین لەبارەی (ئەخلاقە سیاسییەکان)، کە لە کۆتاییدا گرنگی بە خستنەڕووی چەند نمونەیێکی روناك دەدات لەبارەی (دیموکراسیەت لە ولآتە پێشکەوتووەکاندا)، بۆیە دەبێ ئێمە لە کۆتاییدا گفتوگۆ لەسەر ئەو بیرۆکەیە بکەین، کە دیموکراسیەتی لیبرالی لە بناغەوە دەڕووخێنێ وەك ئەوەی ئەو ولآتانە پیادەی دەکەن و وای پێشان دەدات کە ئەمە شێوەییێکە لە شێوەکانی (ستەمی دیموکراسی). هەروەها ئەوە دیموکراسیەتێکی کارتۆنییە و لەسەر گەلێکی کارتۆنیش بنیاد نراوە کە(خۆی حوکمڕانی خۆی دەکات)، لە کاتێکدا دیموکراسیەتی راستەقینە لەسەر تێگەیشتنێکی راست و رەوان لەبارەی گەل بنیادنراوە!. لێرەوە دیموکراسیەت دابەش دەبێتە سەر دوو بەش دیموکراسیەتی دەسەلآتدار و دیموکراسیەتی بێ دەسەلآتەکان، بە پێی دابەشبوونی گەل، کە دوو جۆرن:

أ ـ ئەو گەلەی کە لە کۆی هاولآتیان پێکهاتووە، نەك تاکەکان، ئەوانە بە تەواوەتی لە راستییە کۆمەلآتییەکان نامۆ و بێبەشن. ئەم (جۆرە تێگەیشتنەش لەبارەی گەل) هەموو ئەو شتانەی لەناو کۆمەڵگادا بوونیان هەیە وەك هۆکارەکانی فرەیی و دابەشبوونەکان و جیاوازییەکانی نێوانیان و بارودۆخی کۆمەلآیەتی و داهاتە ئابورییەکان و ئارەزووەکانیان و...هتد هەیە پشتگوێ دەخات.

ب ـ ئەو گەلەی کە لە (مرۆڤ) پێکدێت وەك ئەوەی لە واقیعدا بوونی هەیە، ئەوەی راستی بێ مرۆڤ بە جەوهەر و بە پێوەندییە کۆمەلآیەتییەکانی لەیەك جیا ناکرێتەوە، بەڵکو بەو تایبەتمەندییانەی، کە لە دۆخە کۆمەلآیەتیەکەی خۆیدا بە دەستی دێنی، کە جیاوازە لە دۆخی خەڵکانی تر جیا دەکرێتەوە. ئەو مرۆڤەیە، کە ئەو پێوەندیانەی رۆژانەی بە هۆی کار و هەڵس وکەوت و هۆکارەکانی ژیانی راستەقینەی خۆیەوە رووبەڕوویان دەبێتەوە، نەك لە رێگەی ئەو بیرکردنەوە میتافیزیکیەی، کە لە ناخیدا هەیە.

ئەم جیاوازییە ریشەییە کاریگەرییێکی قووڵی لەسەر جۆری دیموکراسیەتەکە دەبێ:

لەبەرئەوەی هەر هاولآتییێك چەند ئیمتیازاتێك لە ناخی خۆیدا هەڵدەگرێ، کە وەك مرۆڤێك لە سروشتە مرۆڤایەتیەکەی خۆیدا وەری گرتووە، بەلآم مرۆڤی واقیعبین لەو

ناوەندەوە وەری دەگرێ، کە تیایدا دەژی، بە مانایێکی تر مرۆڤ هیچ مافێکی وەك مرۆڤ نییە: مافی ژیان و مافی ئازادی و مافی موڵکدارێتی و یەکسانی و بیرکردنەوەو دەربڕینی بیروڕاکانی خۆی...هتد، چونکە ئەمانە هەموویان بیرۆکەی (میتافیزیکین)، بۆ نموونە کە دەڵێن ئازادی بەشێکە لە تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی مرۆڤایەتی، یان بەشێکە لە پێکهاتەکانی مرۆڤ هەرکاتێك لە دەستی بدات واتە مرۆڤایەتیەکەی خۆشی لە دەست داوە، ئەمە قسەیێکی (خەیاڵیە) ئەمەیە ئازادی میتافیزیکی، کە لە هەر شوێنێکدابێ ئازادی بە بە شێك لە سروشتی مرۆڤ دادەنێ.. (بەڵام ئازادی راستەقینەی مرۆڤ بە حوکمی ئەوەی پێداویستیەکانی هەمیشە لە نوێ بوونەوەدایە، بۆیە هەمیشە ون بووە. هەر لەبەر ئەمەشە دەیبینین هەمیشە هەوڵدەدات خۆی لە هەر پێوەندییێکی کۆمەڵایەتی رزگار بکات، کە رێگەی پێبدات چێژ لە هەندێك ئازادی رووکەش وەربگرێت، کە هێشتا ناوەڕۆکە راستەقینەکەی خۆی وەرنەگرتووە، ئەمەش کێشەیێکی بەردەوامە بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە..).[490]

لەسەر ئەو بنچینەیە دیموکراسیەتی بێ دەسەلات، یان سەپێنراو لە دیموکراسیەتی دەسەلاتدار جیا دەکرێتەوە کە یەکەمیان لەسەر بنچینەی ئەو تێگەیشتنە (کارتۆنییەی) بۆ گەل کراوە بنیاد نراوە و دەبێتە هۆکاری ستەمێکی (شارستانی): سیستەمێکی دیموکراسی کە شێوەو خەسڵەتێکی کلاسیکی تەواوی هەیە، کە گەل خۆی حوکمڕانی خۆی دەکات، بەڵام (گەلێکی کارتۆنی)، چونکە ئەو گەلەی کە هەیە، ئەو گەلێکی راستەقینەیە نەك گەلە نموونەییەکە. هەروەها لەبەرئەوەی دیموکراسیەتی سەپێنراو واتە (لیبرالی) تەنها ئامرازیکە بۆ چەوساندنەوەی (گەلە راستەقینەکە) و هیچی تر، هەرچەندە هەموو شێوە دەستوورییەکانی تێدا بەدی دەکرێ بۆ پیادەکردنی ئەو شتەی پێی دەڵێن دیموکراسیەت.[491]

---

٤٩٠ ـ د.عیسمەت سەیفولدەولە (الاستبداد الديمقراطي) دار ئەلموستەقبەل لە قاهیرە لـ١٢ـ١٣ـ.

٤٩١ ـ هەمان سەرچاوە لـ١٣ـ.

### (٢)ستەمی شارستانی:

ئەگەر چاخەکانی مێژووی مرۆڤایەتی چەندین زوڵم و زۆر و ستەمکاری بە خۆیەوە دیوە، دانەر ناوی لەم جۆرە ستەمە کۆنانە ناوە (ستەمی دواکەوتوو) لەبەرئەوەی ستەم و زوڵم زۆرەکانی بە زەقی دیارن، بەڵام ستەم، زوڵم و زۆرەکانی ئێستا شێوەیێکی تری وەرگرتووە و دانەر ناوی ناوە (ستەمی شارستانی)، بۆیە ئەو لێرەدا دەڵێ: ستەمکارەکان بە درێژایی مێژوو گەشەیان بە بیرۆکە وشێوازەکانی چەوساندنەوە داوە و لەبەرئەوەی گەلان بەردەوام بە رووی ستەمکاریدا راپەڕیون و بەرەنگاری بوونەتەوە و لەبەرئەو گەشەکردنە شارستانییەی، کە مرۆڤایەتی لەهەر هەموو بوارەکانی وەك کلتوری و زانستی و کارە پراکتیکییەکاندا بە خۆیەوە بینیوە: بۆیە دەبووایە لە هەموو سەردەمێکدا ستەمکارەکان و بیرمەندەکانیشیان بەو بیانوەی، کە لەو سەردمەدا باو بووە، کە لەرووی فیکری و زانستی و پراکتیکیەوە شتێك بدۆزنەوە تا عەیب و عارەکانی ئەو ستەمکاریەی پێ داپۆشن، چونکە وا ئاسانتر خەڵکی چەواشە دەکرێ و عەیبەکانیش باشتر دادەپۆشرێن. (دیموکراسیەت)یش دوا شتە ،کە لەو سەردەمەدا ستەمکارەکان بۆ پەردەپۆشکردنی زوڵم و زۆرەکانی خۆیان دەستیان بۆ بردبێ.[٤٩٢] لێرەدا ئەو (جۆن لۆك ـ ١٦٣٢ـ١٦٩٠)ی فەیلەسوف وەك نموونە بۆ ئەو بیرمەندانە دێنێتەوە کە بەرگری لە ستەمکاری دەکەن، لە ١٦٩٠دا بە ناونیشانی (دوو نامە لە بارەی دەسەڵاتداری) ئەوە کتێبێکە (رژێمێك شیدەکاتەوە و پاساوی بۆ دێنێتەوە کە لەوکاتداهەبووە، ئەو کتێبە بە شێوەیێکی بەرچاو رەسەنایەتی فیکری لە دەست داوە، هەرچەندە دەڵێن کە ئەو دامەزرێنەری سەردەمی راپەڕین و رۆشنگەریە لە بەریتانیا و فەرەنسا..).[٤٩٣] بەڵام (جۆن لۆك) لەو کتێبەدا تەنها وەك پزیشکێك بۆ (سێر ئەنتۆنی ئاشلی) دەردەکەوێ و هیچی تر کە سەرکردایەتی شەڕی پەرلەمانی دەکرد لە دژی پاشادا،[٤٩٤] چونکە ئەو کتێبەی (دوور لەو حەزەی بۆ سەرکەوتنەکانی خاوەن پشت و

---

٤٩٢ ـ هەمان سەرچاوە لــ٢١ ــ.

٤٩٣ ـ هەمان سەرچاوە لــ٦٢ــ.

٤٩٤ ـ بەو کتێبانەی مندا (جون لوك...والمرأە) و(پێوەندییەکانی جۆن لۆك لە گەڵ ئاشلی) دا بچۆرەوە کتێبخانەی مەدبولیساڵی ١٩٩٩ لــ٣٣ــ و دوای ئەو وئەوە بزانە کە دانەر دەڵێ لۆرد ئاشلی

پەناکەی خۆی دانەنابوو. لەبەرئەوەی پشت و پەناکەی ئەو پێشەنگ و دامەزرێنەری (حیزبی ئازادیخوازان) بوو، حیزبی بۆرجوازیە تازە پێگەیشتووەکانی ئینگلیزی بوو و لەو رۆژەشەوە تا ئێستا نموونەی هەموو حیزبە بۆرجوازییەکانە..)[٤٩٥]. و ئەوەی (لۆك) لە رووبەڕوو بوونەوەکانیدا دژی (مافە خواییەکانی پاشاکان) وتویەتی تەنها (سیستەمی پەرلەمانی خستۆتە پالّ ویست و ئارەزووەکانی گەلەوە بەم کارەشی لە خەلّەتاندنی گەلان و بۆ ئەوەی پاکانە بۆ ستەمکاری بکات بە پێش هەموو فەیلەسوفەکانی تر کەوتۆتەوە..)[٤٩٦] ئەگەرچی ئینگلتەرا (دیموکراسی لیبرالی) وەك سیستەمێك بۆ خۆی هەلّبژارد و لێی دلّنیا بوو و پشتی پێ بەست و ئاسۆکانی داهاتووی بەڕوودا کردەوە، بەلاّم دانەر ئەو رەخنەیەی لێ دەگرێ کە لە سەرەتادا (نوێنەرایەتیکردن لە پەرلەماندا) کە شێوەی(نوێنەرایەتییێکی بە زۆری) واتە بە خورتی بە خۆیەوە گرتبوو، چونکە هەر هەرێمێك، یان شارێك کاتێك، کە نوێنەرەکانیان دەچوونە ئەنجومەنی گشتی چەند رێنماییێکی دیاریکراویان دەدایە ئەو نوێنەرانە. لەبەرئەوەی ئەو نوێنەرانە کاتێك کە ماوەی دانیشتنەکان درێژەی دەکێشا تێچوی هاتوچۆ و مانەوەیان لە لەندەن لە هاولاّتیانی ئەو شارانە وەردەگرتەوە کە دەنگیان بۆیان دابوو. ، بۆیە ئەوانەی کۆمەکی دارایی خەرجییەکانی ئەو نوێنەرانەیان دەکرد لە خۆیان بێزار بوون و کۆمەکە داراییەکانی خۆیانیان راگرت، وەلاّمی بۆرجوازییەکان ئەوە بوو، کە با ئەو نوێنەرانە وەك (نوێنەرێك) لە پەرلەمان ئامادەبن، نەك وەکو (بریکارێك)، جیاوازی نێوان ئەو دوو واژەیە لە مێژووی سیستەمەکاندا ئەوەیە، کە لە شێوەی بریکاریدا دەبووایە ئەو بریکارانە لیستی خەرجییەکانی خۆیان بدابا ئەو کەسانەی ئەوان بوونەتە بریکاریان و خەرجییەکانیان وەردەگرتەوە، بەلاّم (نوێنەر) دوای هەلّبژاردنیان بە نوێنەر ئیتر پێوەندییەکانیان لەگەلّ ئەو کەسانەدا دەپچڕا، کە دەنگیان بۆ دابوون و هیچ لیستێکی خەرجیان پێشکەش نەدەکردن، کەچی پێوەندییەکانیان بە شارەکانیانەوە هەر دەمایەوە

---

(سەرکردایەتی شەڕی پەرلەمانی کرد لە دژی پاشادا) بەلاّم ئەمە لە ڕوانگەی مارکسییەکانەوە لێی نابوردرێ !.

٤٩٥ ـ هەمان سەرچاوە لـــ٦٣ـــ.

٤٩٦ هەمان سەرچاوە وهەمان لاپەڕە.

و دەبووایە شارەکان نوێنەریان لە ئەنجومەنی گشتیدا هەبێ، ئەمەش بە مەبەستی قازانجکردن هەستی قۆستنەوەی ئەو هەلانەیان لە ناخدا جوولاّ بۆ ئەوەی (بازرگانی) بە کورسییەکانی ئەنجومەنی گشتیەوە بکەن...).[497]

## (٣) (بازرگانیکردن) بە کورسییەکانی پەرلەمانەوە:

نوسەر چەندین نموونەمان لە بارەی (بە کارتۆنیکردنی) نوێنەرایەتی نوێنەرەکان لە ڕێگەی (بازرگانیکردن) بە کورسییەکانی پەرلەمانەوە بۆ دێنێتەوە، (هەر لە ساڵی ١٧٦٨دا یەکێك لە لۆردەکان دوو هەزار جونەی دەداتە یەکێك لە خاوەن زەوییەکان بۆ ئەوەی کورسییێکی پەرلەمان بۆ کوڕەکەی بکڕێتەوە، بەلاّم ئەو پێی دەڵێ زۆر لەوە زیاتریان داوە..)، هەروەها لە بازنەییێکی هەڵبژاردندا، کە ناوی (ئۆڵد سارم) بوو، کە تەنها یەك دەنگدەری لێبوو، بەلاّم ئەو بازنەیە مافی هەڵبژاردنی دوو نوێنەری هەبوو، هەموو کاتێکیش ئەو دوو کورسیە بۆ فرۆشتن دانرابوو. کاتێك، کە (ئۆلمبیت)ی ناودار لە ساڵی ١٧٨٠دا ویستی بچێتە ناو ئەنجومەنی گشتییەوە پەنای بردە بەر لۆرد (لاند ستاد) لە باکوری بەریتانیادا، کە دەستی بەسەر نۆ شاردا گرتبوو و لە هەرهەمووشیاندا مافی خۆپالاّوتنی هەبوو. (وا ڕێککەوت، کە یەکێك لە شارەکان بکەوێتە ژێر ئاوی دەریاوە و تەنها یەك دەنگدەر ڕوی کردە بنکەی دەنگدانەکە بۆ ئەوەی خۆی بە تەنیا نوێنەرێك هەڵبژێرێ، یان کورسیەکە بفرۆشێ..).[498]

ئەمە لەبارەی نوێنەرەکان بوو، بەلاّم لەبارەی دەنگدەرەکان، لە سەدەی هەژدەمدا ئەو کەسانەی، کە مافی دەنگدانیان هەبوو لە ئینگلتەرا لە کۆی هەر هەموو هاولاّتییەکاندا دەگەیشتە (٤٠٠٠٠٠) چوارسەد هەزار دەنگدەر، کە کۆی دانیشتوانەکەی دەگەیشتە نزیکەی ١٠ ملیۆن کەس. ئەمەش لەبەرئەوە بوو، کە مافی دەنگدان گشتی نەبوو. لە هەرێمەکاندا مافی دەنگدان تەنها بۆ ئەو کەسانە بوو، کە موڵکی زەوی و زاری هەبووایە، یان شتێکی بەردەوامی لە بەر دەستدا با وەك زەوییێك، کە داهاتی ساڵانەی ٤٠ چل شەلن کەمتر نەبێ، بەلاّم لە شارەکاندا بە پێی داب و نەریت ئەو ئیمتیازاتانەی، کە درابووە هەر شارێك شێوەی دەنگدانیان لە یەکتری جیا بوو. لە هەموو حاڵەتەکاندا تەنها پەیوەست بوو بە هاولاّتییە

---

٤٩٧ ـ سەرچاوەی پێشوو لــ ٦٥ــ.

٤٩٨ ـ هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

(چالاکەکان) و خاوەن بنەماڵەکان. موڵکدارێتی و (باج) دان پێوەر بوون بۆ چالاکی هاوڵاتیان، بەو پێیەش هەر شارێك، یان هەر هەرێمێك دوو نوێنەری هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی لە ئەنجومەنی گشتیدا نوێنەرایەتی بکات.[٤٩٩]

ئەمەش کاکڵەی ئەو سیستەمە پەرلەمانییەمان بۆ دەردەخات کە لە سەدەی هەژدەمدا لە ئینگلتەرا باو بووە. وەك نووسەر دەڵێ، ئەمە سیستەمی دەسەڵاتی کەمایەتیە، یان (لیگارشیە)، کە سەرچاوەی دەسەڵاتەکەیان نایابی و ماڵ و سەروەت و زیرەکی بوو و زۆر بە توندی و بە شێوەییێکی راستەقینە بە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەوە پەیوەستە، ئەو هەموو شتەش وای لێ دەکات، کە لەهەر پاشکۆیەتییێکی نەویستراوی ویست و ئارەزووەکانی گەل بە دوور بێ.[٥٠٠]

## (٤) لە فەرەنسادا:

هەمان شتیش لەبارەی فەرەنسا بڵێ، چونکە چینی بۆرجوازی تازە پێگەیشتوو بۆ پشتگیریکردن لەخۆی پێویستی بە بیرمەندێك هەبوو، ئەوەشی لە کەسایەتی پارێزەر شارل دی مۆنتسکیۆ (Ch.De.Montesqiueu 1689 -1755) دا دۆزیەوە، کە تێکڕای بیرۆکەکانی خۆی لە بیرۆکەی ئینگلیزی وەرگرتبوو، چونکە ئەو پێشتر سەردانی ئینگلتەرای کردبوو و لە دانیشتنەکانی پەرلەمانی ئەوێدا بەشدار ببوو و لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ فەرەنسا کتێبە ئینگلیزییەکانی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بۆیە لە ساڵی ١٧٤٨ دا دوو کتێبی دانا، کە یەکێکیان لەسەر سیستەمی دەستووری ئینگلتەرا بوو، دووەمیشیان بە ناونیشانی (رۆحی یاساکان) بوو کە بەم کتێبە ناوبانگی دەرکرد. مۆنتسکیۆ بەر لە شۆڕش تیۆرێکی بڵاوکردەوە، کە لەبارەی سنوردارکردنی دەسەڵاتەکانی پاشا بوو ئەمە لەلایێك و سنوردارکردنی دەسەڵاتەکانی گەل لەلاییێکی ترەوە ئەمەش رێك لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کەمایەتیە بۆرژوازییەکاندا دەگونجا. بەم شێوەیە مۆنتسکیۆ توانی پێش هەر شتێك تیۆرێکی ستەمکارانە بسەپێنێ وەك ئەوەی لە رژێمە نازی و فاشییەکاندا بینیمان، ئەویش ئەوەبوو یاسا ـ ئینجا هەر یاساییێك بێ و تەمسیلی هەر کێیەکیش بکات دەبێتە سەرچاوەو پێوەری سنوری

---

٤٩٩ ـ هەمان سەرچاوە لـ٦٦ـ.

٥٠٠ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ ٦٧ـ.

ئازادییەکان، چونکە ئازادی لەلای ئەودا ئەوەیە تۆ مافی ئەو کارەت هەیە، کە یاساکان رێگەت پێدەدەن بیکەیت و ئەگەر هەر هاولاتییێکیش توانی کارێك ئەنجام بدات، بەلاّم یاسا رێگەی پێنەدات کەواتە هیچ ئازادییێکی نییە.[٥٠١]

تەنانەت لەدوای شۆڕشی فەرەنساش ـ کە لە رێگەی کۆمەڵەی نیشتمانییەوە ـ دەستوورێکی نوێ لە ١٤ی سەبتەمبەری ١٧٩١ دا دانرا، تیایدا هاتبوو (دەسەلاّت یەك دەسەلاّتە، نە پارچە پارچە دەکرێ و نە دەشگوازرێتەوە، ئەو دەستوورە تایبەتە بە نەتەوەکەمان و هیچ بەشێك و هیچ کەسێك بۆی نییە بڵێ تەنها من پیادەی دەکەم). لە دەقێکی تریشدا دەڵێ: (ئەو نەتەوەیەی، کە سەرچاوەی هەموو دەسەلاّتەکانە تەنها لە رێگەی نوێنەرەکانیانەوە دەتوانن پیادەی بکەن. دەستووری فەرەنسیش دەستوورێکی نوێنەرایەتیە و هەر نوێنەرەکانی نەتەوەشن، کە خۆیان دەبنە دەستەی یاسادانان و دەبنە پاشا). ئەم دوو دەقە دەستووریە لەلاییێك ئەوەی چڕ کردۆتەوە کە دەسەلاّت (دەسەلاّتی نەتەوەیە)، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا کەسایەتییێکی مەعنەویە و لە دەرەوەی تاکەکانی گەلە و دەسەلاّتی دراوەتێ. ئینجا پیادەکردنی ئەو دەسەلاّتە بۆ شێوازی نوێنەرایەتی کورتکرایەوە و ناشبێ گەل هیچ تەدەخولێکی تێدا بکات، لە دواجاریشدا کاتێك کە پاشایان بە نوێنەر دانا و نوێنەرایەتی نەتەوەشیان بەو سپارد لە کاتێکدا ئەو پلە و پایەکەی خۆی بە پێی یاساکانی میراتە پیادە دەکرد،[٥٠٢] و پێوەندییەکانی پەرلەمانی لەهەر ئاماژەییێکی یاسایی داماڵی.

لەوەش روونتر ئەوەیە لە هەندێك لە حوکمەکانی ناو دەستووردا لەبارەی مافی هەڵبژاردن هاتووە، کە تیایدا مەرجی ئەوەی داناوە، کە مافی دەنگدان ئەو شارانە دەگرێتەوە ژمارەی دانیشتوانەکەیان لە (٦٠٠٠) شەش هەزار کەس و بە سەرەوە بێ و دەبێ خاوەن موڵك بێت، یان سوود لە موڵکێك وەربگرێت، کە داهاتی ٢٠٠ رۆژ کارکردنی هەبێت، یان خانوێکی بە کرێ دابێت، کە کرێیەکەی ئەوەندەی ١٥٠ رۆژ کارکردن بێت، هەرچی ئەو شارانەی، کە دانیشتوانەکەیان لە ٦٠٠٠ کەس کەمتر بێ دەبێ دەنگدەر موڵکێکی هەبێ، کە داهاتی ساڵانەی لە ١٥٢ رۆژ کارکردن کەمتر نەبێ، یان شتێکی بە کرێ دابێ، کە داهاتەکەی لە ١٠٠ رۆژ کارکردن کەمتر نەبێ. بەلاّم لە گوندەکاندا مەرجی ئەوەی داناوە کە دەبێ سوود لە

---

٥٠١ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٧٣ ـ٧٤ ـ.

٥٠٢ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٧٧ـ.

زەوییێك وەربگرێ، کە داهاتەکەی ئەوەندەی ١٥٠ ڕۆژ کارکردن بێ، یان لە سەر زەوییێك جوتیار بێ کە داهاتی ساڵانەی لە ٤٠٠ ڕۆژ کارکردن کەمتر نەبێ، واتە دەبووایە ئەو جوتیارە زەوی و زاری سێ لە موڵکدارەکان بکێڵێ بۆ ئەوەی مافی دەنگدانی هەبێ.[٥٠٣]

سەرباری ئەم هەموو شتەش دەبووایە دەنگدان بە دوو پلە بووایە و هەروەها دەبووایە دەنگدەر تەمەنی لە ٢٥ ساڵ و سەرەوەتر با و باجێك بداتە دەوڵەت، کە هاوتای سێ ڕۆژ کارکردن بێ و ناوی لە لیستی ناوەکانی پاسەوانی نیشتمانیدا هەبێ و دەبووایە سوێندێکی دیاریکراو بخوات، کە دوو ساڵە لەو شوێنەدا نیشتەجێیە و نابێ خزمەتکار، یان تاوانبار، یان هەڵاتو بووبێ.[٥٠٤] بەمشێوەیە ـ بەڕای نووسەر ـ دەبینین دوای ئەوەی کۆمەڵەی نیشتمانی دانیشتنی یەکەمی لە ساڵی ١٧٨٩دا ئەنجامدا ویست و ئارەزووەکانی گەلی لە بڵاوکردنەوەی جاڕی مافەکانی مرۆڤدا تۆمارکرد. دوای ئەوەی دوو ساڵ زیاتر بە سەر دانیشتنی پەرلەماندا تێپەڕیبوو، بە پێچەوانەی ئەو پرەنسیپانە رەفتاری کرد، کە بڵاوی کردبۆوە و دەستوورێکیشی دارِشت، کە زیاتر بۆ پێکهاتنەوە بوو لە گەڵ پاشایەتیدا نەك پێکهاتنەوە بێت لەگەڵ گەلدا. ئەمەش لە هەڵوێستەکەیدا بەرامبەر بە دیموکراسیەت رەنگیدابۆوە و وایکرد، کە کەسایەتییێکی داهێنراو بە گەل بگۆڕێتەوە، کە ئەویش (نەتەوە بوو) تا دەسەڵاتی بخاتە پاڵ و لە جیاتی گەلیش چەند نوێنەرێکی دانا بۆ ئەوەی مافی یاسادانانیان پێ بسپێرێ، واتە گەلیان بە توێژێکی کەم و بچووك گۆڕیەوە بۆ ئەوەی مافی دەنگدانیان هەبێ و دەبووایە ئەو مەرجانەیان تێدا با، کە بە لای چینی مام ناوەندی (بۆرجوازی)ەوە گرنگ بوون، ئەویش موڵکدارێتی زەوی و زار بوو پێش ئازادییەکان کە ئەویش کۆمەڵەی بۆرژوازییە موڵکدارەکان بوو.[٥٠٥]

بەمشێوەیە فەرەنسا لە دوای شۆڕشدا لە ژێر حوکمڕانێتی بۆرجوازییەکاندا دەیناڵاند، کە حوکمڕانێتی کەمینەکان بوو، دەسەڵاتێك بوو هیچ پێوەندییێکی بە ویستەکانی گەلەوە نەبوو: (سەرکەوتنی چینی بۆرژوازی لە سەدەی نۆزدەمدا ئەو هەستەی لەلای خەڵکیدا دروست کرد، کە لە مەودوا دەسەڵات لەسەر بنچینەی دارایی دروست دەبێ، ئەمەش گەشەکردنێك بوو

٥٠٣ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـــ٧٩ـــ.

٥٠٤ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـــ٨٠ـــ.

٥٠٥- هەمان سەرچاوە.

روویدا، ئەم دۆخەش لەوەوە دروست بوو، کە (دەوڵەمەندە نوێیەکان) ئەو برژوازیە پەڕپووتانەی لەناو کۆمەڵدا دەرکەوتن جێگەی چینی دەوڵەمەندە کۆن و بە سەرچوەکانیان گرتەوە، کە تاکەکانیان هەر هەمووی خانەدان و لە چینی باڵا بوون.. چینی ئۆرستۆکراتییەکان پارە و پوولیان زۆر خۆشدەویست، بەڵام لانی کەم بە ئاشکرا ئەوەند خۆیان پێ هەڵنەدەدایەوە، هەرچی بۆرژوازییەکان بوون چەند پلەیێکی بەهاکانیان لەسەر بنچینەی پارەوپول دامەزراند و زۆر بێ شەرمانە دەیانگوت پارە هەموو شتێکە. بەردەوامیش بە پارەیاندا هەڵدەگوت. [٥٠٦]

ئەو بەها و پێوەرانەی کە بۆرژوازییەکان ستەم و زۆردارییەکانی خۆیان لەسەر دامەزراندووە تەنها دارِشتەیێکی نوێی هەمان ئەو بەهاو پێوەرانەن، کە پێشتر هەبوون کە دەیانگوت ماڵ و سەروەت سەرچاوەی ئیمتیازاتەکان و پێوەری ڕێزگرتنن و بنچینەی وەرگرتنی دەسەڵات و ستەمکردنە، بەڵام (ستەمێکی شارستانیانە)، لەبەرئەوەی بۆرژوا  دان بەوەدا دەنێ، کە خەڵکی هەموویان ئازادن، و لەبەرامبەر یاسادا یەکسانن، وخاوەنی مافە سروشتییەکانن وەك ئازادی بیروباوەڕ و رادەربڕین، و لەو بڕیارانەی بۆ هەر هەموو کۆمەڵ دەگەڕێنەوە و پێوەندی بە هەموو تاکێکەوە هەیە وەك یەك مافی بڕیاردانیان هەیە. بۆرژوازییەکان ئەمانە هەر هەمووی لە دەستووردا دادەڕێژن و هێمایێکی پیرۆزی پێدەبەخشن، هەروەها ئەوان بە پێی بنەماڵە جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا ناکەن، چونکە پێوەندیە خێزانییەکان، کە هیچ (قازانج)یکی پێوە نییە و باری ئەوان قورستر دەکات بارێکە بۆرژوازی ناتوانێ هەڵیبگرێ. هەروەها بە پێی زانیارییەکانیان جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا ناکەن، چونکە ئەو چۆن کرێکار بە کرێ دەگرێ بەو شێوەیەش زانا و بیرمەندەکانیش بە کرێ دەگرێ بۆ ئەوەی خزمەتی خۆی پێ بکات. هەروەها بە پێی نیشتمان پەروەریش جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا ناکات، چونکە لەهەر شوێنێکدا قازانج نەبوو نیشتمانیش بوونی نامێنێ، تەنها ئەوانە شایستەی نیشتمانن، کە موڵك ومالّیان هەیە. لەهەر شوێن وسەردەمێکدا ململانێ چارەنوسسازەکانی نێوان خەڵکی دەبێتە هۆی سەرکەوتن و مانەوەو پاڵپشتیکردنی ستەمکارییەکانی بۆرژوازی. [٥٠٧]

---

٥٠٦ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٩٠ـ.

٥٠٧ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٩١ـ.

**(١) له ویلایەته یەکگرتووەکاندا:**

ئەوەی لەبارەی فەرەنسا دەگوترێ، هەمان شتیش لەبارەی ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەگوترێ، ئەمە وشە مردووەکانی سەر لاپەڕەکانی دەستووری ئەمریکی وا دەڵێن، هەموو تاکێك مافی خۆپالاوتنی هەیە بۆ سەرۆکایەتی کۆمار، یان ئەندامێتی کۆنگریس، بەڵام لە راستیدا گەیشتن بە کورسییەکانی کۆنگریس، یان سەرۆکایەتی تەنها ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە توانای خەرجکردنی ملیۆنەها دۆلاریان هەیە بۆ هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن. ئەوان ئەو پارەو پولانە بۆ هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و کڕینی رۆژنامەکان و بەرتیل دانە دەنگدەرەکان و بە کرێگرتنی نوسەر و هونەرمەندان و پێکهێنانی چەند کۆمەڵەییێکی گوشار (لۆبی)، ئەوان ئەو پارەیە وەك ئەوەی لە ئەوروپا باوە بە دزی و شاراوەیی خەرجی ناکەن، بەڵکو بە ئاشکرا و بێ شەرمانە خەرجی دەکەن، چونکە پارە وەك بەهاییێکی نایاب لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هیچ شتێك نییە شان لە شانی بدات، یان لە بەها ئەخلاقییەکان بیانشارێتەوە کە هێشتا پاشماوە شاراوەکانی لە ویژدانی ئەوروپاییدا ماوە. ئەو کاتەی کە (تۆکفیل) لە بارەی سیستەمی حوکمڕانی بۆ خەڵکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەدوا دەیگوت: (ئەوەی بە پلەی یەکەم بۆ دیموکراسیەت گرنگە، دۆزینەوەی رێگەچارەییێك نییە بۆ ئەوەی گەل حوکمڕانی خۆی بکات، بەڵکو یەکێك بۆ گەل هەڵبژێرن کە باشتر حوکمڕانێتیان بکات). [٥٠٨].

## ٦. ستەمکارییەکانی پەرلەمان:

لێرەدا نووسەر هەموو هەوڵەکانی خۆی بۆ لەڕەگەوە هەڵکێشانی سیستەمی پەرلەمانی دەخاتە گەڕ و هەوڵەکانی خۆی لەسەر پەرلەمانی ئینگلیزی چڕ دەکاتەوە، کە لەهەرهەموو پەرلەمانەکانی تر کۆنترە. ئەگەر بێت و باس لەوە بکەین، کە یەکێك لە بیرمەندەکان دەڵێ: (پەرلەمانی ئینگلیزی دەتوانێ هەموو شتێك بکات، تەنها ناتوانێ پیاو بکاتە ژن..) هەرچی نووسەریشە باسی وتەکەی بەڕێز (بلاکستۆن) ی بۆ زیاد کردووە، کە دەڵێ: (ئەوەی پەرلەمان

---

٥٠٨ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٩٢ـ ٩٣ـ.

دەیکات هێز نییە لە سەر زەویدا بتوانێ ڕەتی بکاتەوە..).[٥٠٩] ئەو وادەزانێ کە ئەم قسانە زیاتر گوزارشت لە ئامانجەکانی چینی بۆرجوازی ناوەڕاست دەکەن، کە بوونەتە ئۆروستوکراتی. نەك واقیعی پەرلەمان دەربڕێ. بۆ ئەوەی ئەو ئامانجەیان ببێتە ئامانجێکی ڕاستی، چونکە دەبووایە بۆرژوازیەتی ئینگلیزی پەرلەمان لە هەڵوەشانەوە بپارێزێ. گەمەی پاشاکانیش بەو مافەوە (مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان) یارمەتی ئەو کارەیانی دەدا. لە ساڵی ١٨٣٠دا، کە (ولیەمی چوارەم) هاتە سەر کورسی پاشایەتی، سەرەتا بە پاڵپشتیکردنی لایەنە دیموکرات خوازەکان دەستی پێکرد، پشتگیری سەرۆك وەزیرانی دەکرد لەو ململانێیەی، کە لەگەڵ پەرلەماندا هەیبوو بۆ چاکترکردنی شێوەی هەڵبژاردن، کە مەبەستی فراوانترکردنی بنکەی دەنگدەران بوو، بەڵام لەدوای ئەوە پاشا هەڵوێستی خۆی گۆڕی و لە کێشەی کاسۆلیکەکانی ئیرلەندادا پشتگیری لە بۆچوونەکانی ئۆپۆزسیۆن دەکرد، بۆیە وەزارەت هەرچەندە خاوەنی زۆرینەی ڕەهاش بوو، بەڵام دەستی لە کار کێشایەوە. پاشاش وەزارەتی بە (لۆرد ملبرۆن) سپارد، کە ئەویش هەر سەر بە حیزبی ئازادیخوازانی زۆرینە بوو. ئەویش نەیتوانی متمانەی پاشا بە دەست بێنێ، پاشاش نەیتوانی بەلای خۆیدا ڕای بکێشێ، ئینجا لەوکاتەشدا بوو، کە یەکێك لە وەزیرەکان باوکی دەمرێ و بە وەرەسە دەبێتە لۆرد، ئەمەش پێویستی بە گۆڕانکارییێکی بچووك دەکرد، بەڵام پاشا ئەو هەلەی بۆ خۆی قۆستەوە بۆ ئەوەی هەر هەموو وەزارەتەکە بگۆڕێ و بە (ڕۆبەرت بیل) ی بسپێرێ کە لە حیزبی پارێزکاران بوو و دەیویست لە پەرلەمان رزگاری بێ، بۆیە هەڵیوەشاندەوە. ئەم کردارەش تەوژمێکی توندی ناڕەزایی لێکەوتەوە و بووە هۆی دانانی چەند بنەماییێك، کە لە دواجاردا بوونە چەند مەرجێك بۆ بە دەستووری کردنی هەڵوشاندنەوەی پەرلەمان. لەگەڵ داننان بەوەی، کە سەرۆکی وڵات مافی گۆڕینی وەزیرەکانی خۆی هەبێ، بەڵام بەکارهێنانی مافی هەڵوەشاندنەوەو گەڕانەوە بۆ دەنگدەران، تەنها لەو کاتانەدا دەبێ، کە ناکۆکییێك لەسەر کێشەییێکی دیاریکراو بکەوێتە نێوان سەرۆکی دەوڵەت و وەزیرەکان، یان ناکۆکییێك لەناو ئەنجومەنی وەزیراندا هەبێ کە وا پێویست بکات ئەو وەزارەتە بگۆڕدرێ و بگەڕێنەوە لای هاوڵاتیان، یان ناکۆکییێك لەنێوان

---

٥٠٩ ـ (ولیەم بلاکستۆن ١٧٢٣ Blackstone ـ ١٧٨٠) بیرمەندێکی ئینگلیزی بوو، لە ساڵی ١٧٥٣وە مامۆستای یاسا بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد محازەرەکانی خۆی لە کتێبێکی بەناوبانگدا کۆکردەوە بە ناونیشانی (پرۆژەی ٣ یاسای ئینگلتەرا ) (١٧٦٥ـ١٧٦٩).

وەزیرەکان و پەرلەماندا هەبێ، کە وا پێویست بکات وەزارەت بگۆڕدرێ، یان پەرلەمان هەڵبوەشێندرێتەوە. کاتێك کە هیچ شتێك لەو بابەتانە روویندا، کە پێشتر روویاندابوو، ئەنجامەکانی هەڵبژاردنە نوێیەکە لە بەرژەوەندی حیزبی (ئازادیخوازەکاندا) (الاحرار) بوو، بۆیە (رۆبەرت بێل) ناچار بوو دەست لەکار بکێشێتەوە. لەو رۆژەوە تا ئێستا مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی چ بە شێوەیێکی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، بێ کە وەزارەتێك خۆی بە بێ پشت بەستان بە زۆرینەی ناو پەرلەمان دایبنێ رووی نەداوەتەوە. بەم شێوەیە دەبینین، کە چۆن هەموو دەسەڵاتەکان گەڕایەوە لای پەرلەمان.[510]

لەبەرئەوەی سەرۆکی دەوڵەت مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی نەما و پەنا بەرێتە بەر هاولاتیان ئەمە لەلایێك[511]، لەلایێکی تریشەوە پاشا ناتوانێ وەزارەتێك دابمەزرێنێ، کە متمانەی پەرلەمانی نەدرێتێ. هەر چییێك بێت، پەرلەمان لەو رۆژەوە ئەو رۆڵە دەگێڕێ، کە جاران پاشا دەیگێڕا. جاران پاشا وەزارەتی دەسنیشان دەکرد و دەیسەپاند بە سەر پەرلەماندا، بەلاّم ئێستا پەرلەمان خۆی حکومەت هەڵدەبژێرێ و دەیسەپێنێ. لە جیاتی ئەوەی وەزیرەکان هێزو تواناکانی خۆیان لە دەسەلاّتی پاشا وەربگرن، پەرلەمان بووە سەرچاوەی دەسەلاّت بۆیان.

بەمشێوەیە دەسەلاّتی یاسادانان خۆی دەسەلاّتی جێبەجێکردنی هەڵدەبژارد و دایدەمەزراندن، یان وەك ئەوەی یەکێك لە زانا ئینگلیزەکان دەڵێ: (مەبەست لەو ناوە لێژنەییێکی نایابە لە ئەندامانی دەستەی یاسادانان بۆ پیادەکردنی دەسەلاّتی جێبەجێکردن، چونکە ئەنجومەنەکانی پەرلەمان چەندین لێژنەیان هەیە، بەلاّم گرنگترینیان ئەو لێژنەیەیە، کە پەرلەمان لەو پیاوانەی کە جێی متمانەی تەواوی ئەون هەڵیاندەبژێرێ، هەرچەندە ئەو راستەوخۆ هەڵیان نابژێرێ، بەلاّم دەتوانێ بە شێوەیێکی ناڕاستەوخۆ هەڵیانبژێرێ. سەدەییێك پێش ئێستا پاشا وەزیرەکانی هەڵدەبژارد سەرەڕای ئەوەی، کە دەشیزانی لە توانایدا نییە ئەو سیاسەتە پێڕەو بکات، کە دەبێ پیادە بکرێت، بەلاّم وەك بنەماییێك ئێستا دەسەلاّتی یاسادانان خۆی وەزیری یەکەم هەڵدەبژێرێ.[512]

---

٥١٠ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٦٨ـ٦٩ـ.

٥١١ ـ ئەمەیان ڕاست نییە، چونکە هێشتا وەزیری یەکەم ئەو مافەی ماوە، بەلاّم هۆیەکەی ئەوەیە، کە سەرجەم وەزارەتەکە وەك پەرلەمان هەڵبژێردراون، ئەگەر هەر ناکۆکییێکیش لە نێوانیاندا ڕووبدات دەبێ بگەڕێنەوە لای دەنگدەرەکان، ئەگەر ئەنجامەکەشی بۆ وەزارەت بە خراپە کەوتەوە دەبێ دەست لەکار بکێشێتەوە.

٥١٢ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لـ٦٩.

بەمشێوەیە ئەنجومەنی گشتی گەیشتە ئاستێك، کە بتوانێ ڕۆڵی خۆی لە سیستەمی ئینگلیزیدا بگێڕێ، کە دوو لایەنی هەبێ: ئەو لە ڕوویێکەوە دەستەییێکی یاسادانانە، لە ڕوویێکی تریشەوە خۆی خاوەنی دەسەڵاتە لە دەوڵەتدا. ئەو خۆی باڵاترین دەسەڵاتە، لە سەروی پاشا و لۆردەکان و گەلیشەوەیە!!.

بە پێی بیروڕای نووسەر (زمانی بۆرژوازی بەم شێوەیە ئاشکرا دەبێ کاتێك، کە ئەنجومەنی گشتی دەبێتە دەسەڵاتێکی باڵا لە سەروی گەلەوە)، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ئەو دەسەڵاتەی، کە پاشا و وەزیرەکانی ستەمیان پێدەکرد ئێستا پەرلەمان بە ناوی گەلەوە لێیانی زەوت کردووە، نەشیگەڕاندۆتەوە بۆ گەل، چونکە پرۆسەی گواستنەوەی دەسەڵات لە پاشاوە بۆ دەستی گەل لە قۆناغێکی دیاریکراودا وەستا و هێزێکی سێیەم، کە پەرلەمانە هاتە ناوەوە و بۆ خۆی قۆرخی کرد. ئەمەیە سەرچاوەی دەسەڵات لە ئینگلتەرا، دواتریش سەرچاوەییێکی دیاری سیستەمی نوێنەرایەتی، سیستەمی (دیموکراسیەتی بێ دەسەڵاتە).. کە ئەویش (ستەمێکی شارستانییە).[٥١٣]

ئەگەر بڵێین: (پەرلەمان نوێنەرایەتی نەتەوە دەکات)، نووسەر دەپرسێ: نەتەوە چیە؟ هەر خۆی وەڵام دەداتەوە دەڵێ: نەتەوە تەنها (بیرۆکەییێکە). هەروەها دەپرسێ ئەی نوێنەرایەتی پەرلەمان چیە؟ لە وەڵامدا دەڵێ (ئەوەی نوێنەری پێ جیا دەکرێتەوە ئەو کەسەیە، کە لەسەر حیسابی یەکێکی تر داوا دەکات و ئاخاوتن دەدا). لە کۆتاییدا وشەی (نوێنەرایەتی) پێویست دەکات دوو کەس بن یەکێکیان ئەسلیەکەی پێشترە و لە سەروی دووەمەوەیە: کە نوێنەرە. ئەمە مانای وشەی نوێنەرایەتیە. مانای ئەوەیە، کە یەکێکیان دەبێتە نوێنەری ئەویتریان، ئەمە ئەوە لە خۆ دەگرێ، کە کەسێکی پێشتر هەیە گونجاوە بۆ نوێنەرایەتیکردن. بە پشت بەستن بەمە دەتوانین بڵێین ئەو سیستەمەی، کە پێی دەڵێن: (سیستەمی نوێنەرایەتی)، بە مانای تەواوی وشە سیستەمی نوێنەرایەتی نییە، چونکە ناتوانین ئەندامانی دەستەی یاسادانان نە بە نوێنەری هاوڵاتیان و نە بە نوێنەری نەتەوە دابنێین، چونکە ئەوان نوێنەرایەتی ویست و ئارەزووەکانی هاوڵاتیان ناکەن لەبەرئەوەی ئەوان جگە لە پێوەندییەکانی هەڵبژاردن، شتێکی تری هاوبەشیان لەگەڵ هاوڵاتیاندا نییە، کاتێکیش یەکێك هەبێ ئەوپەڕی ئازادی هەبێ و بیەوێ بۆ یەکێکی تر کار بکات، بە بێ ئەوەی کەسی دووەم بتوانێ ویست و ئارەزووەکانی

---

٥١٣ ـ (الاستبداد الديمقراطي) لـ٧٠ـ.

خۆی بە سەریدا بسەپێنێ، ناتوانین بڵێین ئەمە نوێنەری ویست و ئارەزووەکانی کەسی دووەمە. لە راستیدا تەنها ویستی یەکێکە، کە بەو پەڕی ئازادی بتوانێ بڕیار لەو شتە بدات، کە دەیەوێ، بۆیە نوێنەرەکان نوێنەرێکی پێشوەختەی ویست و ئارەزووەکانی خەڵکی نین لەبەرئەوەی ئەو سیستەمە رێگە بەوە نادات هاولاتیان خۆیان شتێکیان بوێ جگە لەوەی (نوێنەرەکە) دەیەوێ.. بۆیە ناتوانین بڵێین ویست و ئارەزووەکانی خەڵکی لە سیستەمێکدا بوونی هەیە، کە لە بنەڕەتد ویستەکانیان بوونی نەبێ. لەلاییێکی تریشەوە نوێنەرەکان نوێنەرایەتی نەتەوە ناکەن، چونکە نەتەوە بیرۆکەییێکە، کە لە چەند کەسانێکدا بەرجەستە نابێ تەنها بە هەڵبژاردنی نوێنەرەکان نەبێ، ئەمەش ویستەکانی ئەوان نییە، چونکە پێکهێنانی دامەزراوەییێکی یاسادانان، یان هەر دەسەڵاتێکی تر، کە دەسەڵاتی ویستەکانی نەتەوەی هەبێ، پێکهاتەییێکە مەبەستی نوێنەرایەتیکردنی ویستەکانی نەتەوە، یان کەسێك نییە، بەڵام بەرجەستە بوونی ئەو ویست و کەسایەتیە، واتە نوێنەرەکانی نەتەوە نوێنەرایەتی ویستەکانی ئەوان ناکەن، بەڵکو ئەوان خۆیان نەتەوە لە کەسایەتی و ویستەکانی خۆیاندا دروست دەکەن.

## دووەم: گفتوگۆی کۆتایی

### (١) پێخەفەکەی (قەریوڵەکەی) پرۆکرێست:

بە شێوەییێکی دوورودرێژ بیرو بۆچونێکمان خستەڕوو، کە وا دەزانێ دیموکراسی لیبرالی (تەنها شێوەییێکە لە شێوەکانی ستەمکاری شارستانیی). لە راستیدا ئەوانە بە تێڕوانینی مارکسییەکان دەڕواننە دیموکراسیەت لە ئینگلتەرا و فەرەنسا و وڵاتە یەکگرتووەکاندا و وای دەبینن، کە دیموکراسیەتێکی راستەقینە نییە، چونکە (دیموکراسیەتێکی بێ دەسەڵاتە) (مەحکومە) نەك دەسەڵاتدار (حاکمە). راستە سیستەمێکی دیموکراسی لە شێوە و مواسەفاتدا تەواو کلاسیکیە، کە گەل خۆی دەسەڵات بە سەر خۆیدا پێڕەو دەکات، بەڵام گەلێکی قەڵبە و...هتد.

لە راستیدا مرۆڤ یەکسەر گوتەکەی (سارتەر)ی دێتەوە یاد، کە لە بارەی ئەو رەخنانەی لە عەقڵی جەدەلی گرتبووی (کە مارکسیەت توشی ئەنیمیاییێکی توندو سەرتاسەری بووە)، بۆیە گۆڕاوە و بۆتە مارکسیەتێکی وشك و رووکەش و تەمبەڵ و داماڵدراو..هتد. ئەو چەند قالبێکی ئامادەکراوی هەیە بۆ دەسنیشانکردنی هەر شێوە و هەڵوێست و رووداوێکی جۆربەجۆر و شوێن و ئاراستەیێك، کە بیەوێ، بۆ نموونە ئەو دەتوانێ ئەو بابەتەت بۆ دەسنیشان بکات، کە دەکرێ وتارەکانی (رۆبسبیر) یان (جیرۆند)ی لێ دابندرێ، کە لە کاتی شۆڕشی فەرەنسیدا گوتبوویان، هەروەها دەشتوانێ پارچە شیعرێکی (پۆل ڤالێری)، یان داستانێکی (ڤیکتۆر هۆگۆ)ت بۆ دەسنیشان بکات...هتد. ئەو رێبازەی، کە هەموو شتێکت بە شێوازێکی ئامێرئاسا و وشك بۆ شی دەکاتەوە (سارتەر) ناوی ناوە جەدەلێکی وەستاو، یان (جەدەلی دۆگمای چینایەتی)، کە هیچ ئامانجێکی نییە تەنها ناچارکردنی کەسەکان و روداو وکردار و دیاردەکان نەبێ بۆ ئەوەی هەمان شێوەی ئەو وەربگرێ.. هیچ ئامانجێکیشی نەماوە تەنها روداوەکان بخاتە ناو پێخەفەکەی پرۆکرێست Procrustes[٥١٤] بۆ ئەوەی هەموو: بیرۆکە

---

٥١٤ ـ (پرۆکرێست) یەکێك بوو لە رێگرەکانی میسۆلۆجیای یۆنانی و لە ناوشاخەکاندا دەژیا و پێخەفێکی ئاسنینی هەبوو، ئەگەر میوانێك لەلای بماباوە، لە پێخەفە ئاسنینەکەدا دەیخەواند، ئەگەر میوانەکە لە

و روداو و دیاردەکان بە (قەدەر) چەمکە مارکسییەکان ببڕێتەوە).[515] دەتوانی خۆت ئەو وشانەی وەك (بۆرژوازی) و (ئۆرستوکراتی)، یان (بارودۆخی کۆمەڵایەتی) و (چین و چینەکانی کۆمەڵ)، (شۆڕشەکانی چینی زەحمەتکێشان) د. عیسمەت سەیفولدەولە چەند جار بە کاریهێناون.. هەر بیرۆکەییێکیش، کە مارکسی نەبێ یەکسەر ناوی (میسالی) و میتافیزیکی و (خەیاڵی) لێدەنرێ کەوا چەمکی (گەل) و چەمکی (مرۆڤ) بە جەوهەری مرۆڤەکە دەسنیشان ناکرێ، بەڵکو بەو خەسڵەتانە دەسنیشان دەکرێ، کە لە دۆخە کۆمەڵایەتیەکەی خۆیدا بە دەستی دێنێ، کە لەگەڵ دۆخی کەسەکانی تر جیاوازی هەیە. هەروەها دەتوانی تەماشای ئاخاوتنەکانی بکەیت، کە لە بارەی (دارایی) و (ماڵو سەروەت) گوتویەتی...هتد. با ئەو تێبینییە گشتیانە جێبێڵین و هەندێك لەو بیرۆکانە بخەینە روو، کە لە کتێبی (الاستبداد الديموقراطي) دا هاتووە و کەمێك بە درێژی گفتوگۆی لەسەر بکەین.

### (٢) دوو چەمك لەبارەی گەل:

نووسەر وای دەبینێ، کە مرۆڤ بە جەوهەر واتە (ناخ) جیا ناکرێتەوە و هیچ خەسڵەت و مافێکی نابێ بەو پێیەی، کە مرۆڤە، یان مرۆڤێکە، بەڵکو خەسڵەتەکانی بەو دۆخە دەسنیشان دەکرێ، کە لەناو کۆمەڵدا هەییێتی، کە لەگەڵ دۆخی خەڵکانێکی تر جیایە، چونکە دارتاش و ئاسنگەر لەگەڵ بیرمەندێك و هونەرمەندێك و زاناییێکدا جیاوازن.. هەر هەمووشیان لەگەڵ سەرمایەدارێکدا جیاوازن... هتد، وەك ئەوەی بڵێی کرێکار بە کرێکاری لە دایك دەبێ و تا دەمرێ بەوشێوەیە دەمێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دیموکراسیە لیبرالیەی کە نووسەر دەیەوێ هەڵیتەکێنێ (ئارنیست بیفین) (١٨١٨ ـ ١٩٥١) کە شوفێری شەمەندەفەر بوو بەرز بۆوە و بووە یەکێك لە سیاسەتمەدارەکان و سەرکردەی کرێکارەکان و ئینجا لە حکومەتەکەی (کلێمیت ئاتلی)دا بووە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (١٩٤٥ ـ ١٩٥١)، هەروەها ئەنیرن بیڤان (A.Bevan 1897 -1960) کە لە یەکێك لە کانەکانی خەڵوز کرێکار بوو بواری بۆ رەخسا

---

پێخەفەکە درێژتر بووایە زیادەکەی دەبڕیەوە، ئەگەر کورتریش بوایە توند دەیبەستەوە تا دەمرد ـ دوایە تیسۆس بە هەمان شێوە پرۆکرێستی کوشت.

٥١٥ ـ د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (تطور الجدل بعد هيجل) کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی١٩٩٦ لـــ٤٥٥ـــ و دوای ئەو.

و بوو بە سەرۆکی باڵی چەپی حیزبی کرێکاران و لە ساڵی (١٩٤٥)دا وەزارەتی تەندروستی وەرگرت و لە ساڵی (١٩٤٧)دا سیستەمێکی بۆ چارەسەرکردنی بە خۆڕایی و دابینکردنی تەندروستی دانا، هەمان شتیش لەبارەی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا (ئەنتۆنی بلێر A.Blair 1953-......) بڵێ، کە ئێستاش شانازی ئەوە بە خۆیەوە دەکات کە جاران لە پاریس (قاپشۆر) بووا!.

ئەمە تەنها لە بەریتانیادا روی نەداوە، بەڵکو لە دەوڵەمەندترین دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی جیهانیشدا ـ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ـ روویداوە، دیموکراسیەتی لیبرالی کەسێکی وەك (رۆناڵد رێگن) (١٩١١ـ..) کە بە هۆی ئەو نەبوونییەی باوکە رەوەندەکەی، کە لە ئیرلەنداوە هاتبووە ئەوێ ـ و خووی بە مەی خواردنەوە گرتبوو ـ و ژیانی منداڵی پڕ لە دەردەسەری بوو ـ بواری بۆ رەخسا و چووە ناو ململانێکانی ژیانی سیاسیەوە و لە ساڵی ١٩٦٦دا بووە سەرۆکی ویلایەتی کالیفۆڕنیا، کە یەکێکە لە گرنگترین و گەورەترین ویلایەتەکانی ئەمریکا و لە ساڵی ١٩٧٠دا ئەو پلەیەی بۆ نوێ کرایەوە، هەروەها لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٨١دا توانی بە جیاوازی (٩ نۆ ملیۆن دەنگ) بە پێش (جیمی کارتەر) بکەوێ و ببێتە چلەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بۆ جاری دووەمیش هەڵبژێردرایەوە کە لە ١٩٨١ تا ١٩٨٩ لە دەسەڵاتدا مایەوە. بە سەدان نموونەی تریش هەیە کە کەسانێکی زۆر لە (هەژارو نەدارەکان) دیموکراسیەتی لیبرالی وای کردووە بە پێی تواناکانی خۆیان بگەنە چەندین پلەو پایەی بەرز.

لێرەدا ئەگەر پیاو جوتیار بێ، یان کرێکار، یان بیرمەند بێ، یان سەرمایەدار بێت ـ ئەو پیاوە لە پێش هەموو شتێك ـ و لە دوای هەموو شتێکیشدا ـ ئەو لە (ناخ)یدا بە چەند خەسڵەتێکی بێ وێنە، کە لە بونەوەرەکانی تردا نییە جیا دەکرێتەوە. ئینجا بێ ئەوەی رەچاوی بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکەی بکرێ (چەند مافێکی سروشتی) تایبەتی هەیە، وەك: مافی ژیان و ئازادی و یەکسانی و موڵکدارێتی... هتد، ئەگەر هەر پلەو پایەیێکی کۆمەڵایەتی هەبێت، هیچ دژایەتییێك لەنێوان هەردوو تیۆرەکەدا نییە، کە لەهەمان کاتدا مرۆڤە و دارتاشیشە، لەوانەیە لێرەدا سوود لە بیرۆکەکەی (ئیبن سینا) وەربگرین بۆ روونکردنەوەی ئەو شتانەی، کە دەیلێین، ئەو نموونەییێکی بە ناوبانگمان بۆ دێنێتەوە کە تیایدا دەڵێ: (من لە رێگادا رێبوارێکم دیت، لێت دەپرسم ئەوە کێیە...؟ لەوانەیە بڵێی (ئەوە وەستای دیوارە) وای دابنێ، کە ئەو وەڵامە راستە و ئەو پیاوە وەستای دیوارە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەڵامەکە ناتەواوە، چونکە

ئەو ڕێبوارە لە پێش هەموو شتێكدا مرۆڤە، ئینجا وەستای دیوارە، ئەو وەك پێكهاتە مرۆڤە و لەرووی كاركردنیشەوە وەستای دیوارە...).[516]

لەبەر ئەمە لێكجیاكردنەوەی ئەو (مرۆڤە ئاساییەی)، كە بە دۆخە كۆمەڵایەتیەكەی دەسنیشان دەكرێ و ئەو (مرۆڤە نموونەییە)، یان میتافیزیكیەی، كە بە جەوهەرەكەی لێكجیا دەكرێتەوە ـ شتێكی پووچە، چونكە وەستان لەسەر پێناسەكردنی مرۆڤ لە سنووری كارەكەیدا، یان شێوەی ئارەزووەكانیدا و..هتد پێناسەییێكی پڕ لە كەم وكورتیە و بیركردنەوەییێكی ناتەواویشە، لەبەرئەوەی ئەو ئەوە لە بیری خۆی دەباتەوە، كە ئەوە لە رووی پێكهاتەكەیەوە (مرۆڤیشە)، ئەو مرۆڤبوونەش چەند (مافێكی سروشتی) لێدەكەوێتەوە ئەمە سەرەڕای ئەو كارەی كە دەیكات، یان ئەو شێوە ژیانەی كە بە سەری دەبات. ـ وەك ئەوەی یاساناسەكان دەڵێن ـ ئەوەی لەسەر شتی پووچ بنیاد بنرێ هەر پووچە، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە، كە دابەشكردنی هاوڵاتیان بۆ دوو جۆرە هاوڵاتی (گەلی هاوڵاتیان)، كە ئەمە چەمكە میسالیەكەیێتی و گەلێكی راستەقینە (ئەمەش تێگەیشتنی نووسەرەكە خۆیەتی)، ئەم دابەشكردنە دابەشكردنێكی بێ بنەمایە و هیچ كەسێك لە فەیلەسوف و یاساناسەكان شتی وایان نەگوتووە، ئەوانەی كە ـ زۆربەی جارەكان ـ لە دوو روانگەوە تەماشای گەل دەكەن: روانگەی كۆمەڵایەتی و سیاسی، (گەل بە چەمكە كۆمەڵایەتیەكەی هەر هەموو ئەو تاكانە دەگرێتەوە، كە رەگەزنامەی یەك وڵاتیان هەڵگرتووە، بەڵام گەل بە تێگەیشتنە سیاسیەكەی، هەر هەموو تاكەكانی گەل ناگرێتەوە، بەڵكو تەنها ئەو كەسانە دەگرێتەوە، كە مافی ئەوەیان هەیە لەناو سیاسەتدا كار بكەن،[517] بە مانایێكی تریش گەل بە چەمكە كۆمەڵایەتیەكەی

---

٥١٦ ـ تیۆرەكەی (ئیبن سینا) لە سەدەكانی ناوەڕاستدا كاریگەرییێكی بە هێزی لەسەر فەلسەفەی مەسیحی هەبوو، چونكە كێشەی پێوەندی نێوان جەستە و دەروونی بۆ چارەسەر كردن، بۆ نموونە كتێبەكەی ئاتی گلسۆن (روح الفلسفة المسيحية في العصر الوسيط) بخوێنەوە وەرگێڕانی د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام كتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦ لـ٢٣٤ـ.

٥١٧ ـ بۆ نمونە تەماشای كتێبەكەی د. عاتف ئەلبەننا (الوسيط في النظم السياسية) قاهیرە لـ٢٠٢ـ و دوای ئەو و د. عیسمەت عەبدەللا ئەلشێخ (النظم السياسية) لـ٢٠ـ و دوای ئەو، ود. محەمەد ئەنەس قاسم جەعفەر (النظم السياسية والقانون الدستوري) لـ٣٦ـ و دوای ئەو بكە، هەروەها تەماشای سوعاد ئەلشەرقاوی (النظم السياسية في العالم المعاصر) و د. سەروەت بەدەوی (النظم السياسية) دار ئەلنەهزە لعەرەبیە لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٦. و د. محەمەد كامل لیله (النظم السياسية : الدولة و الحكومة) دار ئەلفكر لعەرەبی لە قاهیرە.. هتد بكە.

(جگە لە بێگانەکان) هەر هەموو دانیشتوانی ئەو دەوڵەتە دەگرێتەوە  بە ژن و منداڵ و شێت و گەڕوگول و ئەو ژنانەش، کە ناتوانن مافە سیاسییەکانی خۆیان پیادە بکەن.[٥١٨]

لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کە دابەشکردنی دیموکراسیەت بۆ (دیموکراسیەتی بێ دەسەلات)، یان حوکمدراو کە پشت بەو هاولاتیانە دەبەستێ، کە گەلێکی نموونەیی میتافیزیکی و خەیالێن.. هتد (دیموکراسیەتی دەسەلاتدار)، کە پشت بە گەلێکی راستەقینە دەبەستێ خۆی لە خۆیدا دابەشکردنێکی پووچ و بێ بنەمایە، چونکە ئەمە دابەشکردنێکی ناتەواوی چەمکی گەلە ـ ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ئەو دیموکراسیەتە لیبرالیەی کە گەل (بە مانا سیاسیەکەی، واتە دەستەی دەنگدەران) خۆی تیایدا حوکمڕانی خۆی دەکات، وەك ئەوەی لە ئینگلتەرادا هەیە، بێگومان دیموکراسیەتێکی راستەقینەیە و هیچ ستەمکارییێکی شارستانی تێدا نییە وەك ئەوەی نووسەر دەیلێ.

### (٣)بیرمەندەکانی بۆرژوازی:

پێشتر ئەوەمان بینی، کە نووسەر پێی وایە ستەمکاری گەشە بە خۆی دەدات و لەسەر یەك شێوە نامێنێتەوە بەمەش ناوە ناوە بیرمەندە بۆرژوازییەکان بە درێژایی مێژوو بەو بیرۆکەو تیۆر و بیر و رایانە یارمەتیان دەدەن و کۆمەکیان دەکەن، کە گیان دەخاتەوە بەریان، ئەوەی لێرەدا پێمان سەیرە ئەوەیە، کە دوو کەس بە نموونەی بیرمەندەکانی (ستەمکاری شارستانی) دێنێتەوە کە هەردووکیان گەورەترین فەیلەسوفی دیموکراسی لیبرالین  وەك: (جۆن لۆك)ی ئینگلیزی و (مۆنتسکیۆ)ی فەرەنسی.

یەکەمیان ڕووبەڕووی ئەوانە بۆوە، کە پشتگیریان لە فەرمانڕەوایەتی رەها دەکرد، کە ئەوکات لەسەر بنچینەی (ئەو مافانەی، کە خوا بە پاشاکانی بەخشیبوو) کاریان دەکرد وەك ئەوەی، کە سێر رۆبەرت فیلمەر ( Sir Robert Filmer 1588-1653)ی بیرمەندی سیاسی ئینگلیزی نوێنەرایەتی دەکردن، کە کتێبێکی بە ناونیشانی (دەسەلاتی باوکسالاری) Patriarcha دانا و تێیدا داکۆکی لە دەسەلاتی باوکسالاری دەکرد و دەیگوت مرۆڤ وەك ئەوەی، کە دەیلێن بە سروشت ئازادە، وا نییە (هیچ مرۆڤێك بە ئازادی لە دایك نابێ، چونکە خوداوەند ئێمەی ملکەچی ویست و ئارەزووە رەهاکانی پاشا کردووە، لەبەرئەوەی ئێمە هەر هەموومان بە کۆیلەیی لە دایك دەبین)!!.

---

٥١٨ ـ بێ گومان ئەمە لە بارەی ئەو ولاتانەیە، کە ناهێڵن ژنان بەشداری هەڵبژاردنەکاندا بکەن.

ئەوەش شتێکی مەحاڵە، کە کۆیلە مافی گرێبەستی هەبێ، (ئادەم خۆی فەرمانڕەواییێکی ڕەها بوو، هەموو فەرمانڕەواکانی دوای ئەویش وا دەبن (چونکە ئەمە تەنها بۆ ئادەم وانەبوو، بەڵکو بۆ هەموو گەورە پیاوەکانی دوای ئەویش وابوو، کە دەسەڵاتێکی پاشایەتیان بەناوی باوکسالاریەوە بە سەر منداڵەکانیدا هەبوو). (فیلمەر) دەگاتە ئەو ئەنجامەی، کە (پاشا دەبێ لە سەرووی یاساکانەوە بێ، چونکە پاشا بە پێی ئارەزووەکانی خۆی، خۆی خاوەنی هەموو شتێکە لە تەواوی وڵاتدا).

ئێمە بینیمان (جۆن لۆك) چۆن بەرەنگاری ئەو بیرۆکە (مەترسیدارانە) بۆوە، کە لایەنگرانی دەسەڵاتی ڕەها دەیانویست هێز بە بەر ئەو دەسەڵاتەدا بکەنەوە و لە داڕوخان بیپارێزن ـ بۆیە جۆن کتێبە بە ناوبانگەکەی (دوو نامە بۆ فەرمانڕەوایەتی مەدەنی) دەنووسێ، نامەی یەکەمیان بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی (فیلمەر) تەرخان دەکات و لە چەند لاپەڕەیێکی دوورودرێژدا بە درۆی دەخاتەوە کە ناونیشانەکەی بەمشێوەیە بوو (لە بارەی هەندێك پرەنسیپی بۆگەنی دەسەڵات) و بەوە کۆتایی بە نامەکەی دێنێ، کە هەر هەموو مرۆڤەکان بە ئازادی لە دایك دەبن.[519] ئەوەی ڕاستی بێ بابەتی (ئازادییە مرۆڤایەتییەکان) تاکە بابەتی سەرەکی بوو، کە ئەو فەیلەسووفەی ئێمەی سەرقاڵ کردبوو، چونکە هەموو ئەو کتێبە بنچینەییانەی، کە بیری سیاسی ئەو مرۆڤە دەخەنەڕوو لە چوار دەوری ئەو بابەتەدا دەسوڕێنەوە لە کتێبی (نامەیێك لەبارەی لێبوردنەوە) کە لە ساڵی ١٦٨٩دا بۆ بەرگریکردن لە مافە ئاینییەکان نووسی و کتێبی (دوو نامە لەبارەی فەرمانڕەوایەتی مەدەنییەوە) کە لە ساڵی ١٦٩٠بۆ بەرگریکردن لە ئازادیە سیاسییەکان نووسی و کتێبی (بەهای دارایی) کە لە ساڵی ١٦٩١دا بۆ بەرگریکردن لە ئازادییە ئابورییەکان نووسی، هەر نوسراوێك لەم نوسراوانە بریتیە لە لێکۆڵینەوەیێکی باشی پرەنسیپەکانی ئازادییە مرۆڤایەتییەکان.[520]

بەڵام (جۆن لۆك)، کە سەرانی شۆڕشی ئەمریکا وا پێناسەیان کردووە کە (فەیلەسوفێکی ئەمریکیە) و داڕێژەری بنچینەکانی بیری ئەمریکیە.[521] ئەمە ـ لەلای نووسەر ـ ئەو

---

٥١٩ ـ لە بارەی هەموو ئەمانە بە کتێبەکەی ئێمەدا بچنەوە (الطاغية : دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي) چاپی سێیەم کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٧ لــ٢٧٨ــ و دوای ئەو. هەروەها بە بەشی سێیەمی دەروازەی شەشەمدا بچۆوە کە پێشتر باسمان کردوە.

٥٢٠ ـ هەمان سەرچاوە لــ٢٩١ــ. هەروەها ئەو بەشەی کە پێشتر لە بارەی (جۆن لۆك) نووسیومانە.

٥٢١ ـ د. زەکی نەجیب مەحمود (حياە الفكر فى العالم الجديد) لــ١٤ــ دار ئەلشروق لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٢.

فەیلەسوفەی کە(سیستەمی پەرلەمانی دایە پاڵ ویستەکانی گەل، لە دوو روویی کردن لەگەڵ گەلاندا بۆ ئەوەی پاکانە لە ستەمکاری بکات لە پێش هەموو فەیلەسوفەکانی تری داوەتەوە)!!. سەرباری ئەمانەش ((جۆن لۆك) وەك پزیشکێکی تایبەت لەلای لۆرد (ئاشلی) کاری دەکرد).. و (یەکێك بوو لەوانەی، کە تا کۆتاییەکانی ژیانی دوای ئەو کەوتبوون) (بۆیە شتێکی نەدەنووسی، کە دوور بێ لە سەرکەوتنی خاوەن نازو نیعمەتەکەی خۆی)!! لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر زۆر بە راشکاوانە دان بەوەدا دەنێ، کە (ئەو لۆردە بوو فەرماندەیی شەڕی پەرلەمانی لە دژی پاشادا دەکرد) !!..[٥٢٢] لەو کتێبەدا چەندین حوکمی هەندێکجار رێك و هەندێکجاریش دژ بە یەك دەبینین، بە شێوەییێك دیارە، کە چاو هەڵەی تێدا ناکات.

بەڵام لە فەرەنسادا دوو جۆر لەو بیرمەندانە دەرکەوتن، یەکەمیان گوزارشتیان لە بۆچوون و بەرژەوەندییەکانی چینی ناوەڕاست (بۆرژوازی) دەکرد، کە خۆیان لە (فیزیۆکراتەکاندا) دەدۆزیەوە..(بە پێشکەشکردنی چەمکێکی تایبەت بە ئازادی بە شێوەییێك، کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بگونجێ ئەویش ئەمەیە، کە دەڵێ، ئازادی پەیوەستە بە موڵکدارێتییەوە و ناکرێ لە یەك جیا بکرێنەوە، گوزارشتیان لە هیواو ئاواتەکانی بۆرژوازی دەکرد..). هەرچەندە دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە، کە (فرانسوا کیسنای) F. Quesney (1694-1774) خۆی لە خانەوادەییێکی جوتیاری بوو، بەڵام ئەو بنچینانەی لە ژیانی رۆژانەی خۆیدا هەڵهێنجابوو، کە لە دێهاتەکاندا بە سەری دەبرد، ئەو خۆشەویستیەی بۆ زەوی و زار وای لێکردبوو کە لەهەرهەموو ئەو شتانە بکۆڵێتەوە، کە پەیوەستە بە زەویەوە تا لە کۆتاییدا گەیشتە ئەو رایەی دەڵێ: (زەوی سەرچاوەی هەموو سەروەت و سامانەکانە). هەر لێرەشەوە فرانسوا بیرۆکەی هاوکاری و دابەشکردنی داهاتەکان بە گوێرەی توانای هەرتاکێك لەلا دروست بوو کە دەڵێ: (یان دەبێ مرۆڤ ئاژەڵ ئاسا ژیان بەسەر بەرێ و قوتی رۆژانەی خۆی دەستکەوێ و هەقی بەسەر خەڵکیەوە نەبێ، یان دەبێ لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا بگونجێ و ئەو سەروەت و سامانەی، کە بە کۆمەڵ دەستیان دەکەوێ لەنێوان خۆیاندا دابەشی بکەن هەرکەسەو بە گوێرەی هەوڵ و ماندوبوونی خۆی بەری بکەوێ. بەمشێوەیە رەگەزێکی گرنگی تری خستە سەری ئەویش کارکردن بوو).. (چونکە مافی سروشتی هەر مرۆڤێك بریتیە لەوەی

---

٥٢٢ ـ بەو پێوەندیانەدا بچۆرەوە کە جۆن لۆك لەگەڵ ئاشلی دا هەیبوو لە کتێبەکەی ئێمەدا (جون لوك.. والمرأه) کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٩ لـ٣٣ـ و دوای ئەو.

که به کارکردنەکەی خۆی دەستی دەکەوێ)، بەڵام ئەمانە هەر هەمووی لەلای نووسەرەکەی ئێمەدا، گوزارشت لە بەرژەوەندییەکانی بۆرژوازی دەکات!!.

بەڵام جۆری دووەمی بیری بۆرژوازی، بە شێوەییێکی تایبەت خۆی لە مۆنتسکیۆی پارێزەر (١٦٨٩ـ١٧٥٥)دا دەبینێتەوە، کە تێکڕای بیرۆکەکانی خۆی لە بیری ئینگلیزیەوە وەرگرتبوو، ئەو لە ـ پێش شۆڕشی فەرەنسیدا ـ (تیۆرێکی لەبارەی دەسەڵات پێشکەش بە گەلی فەرەنسا کرد کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کەمینەی بۆرژوازی رەهادا دەگونجا بۆ سنووردار کردنی ستەمکارییەکانی پاشا لەلایێك و لەلاییێکی تریشەوە ئەو هۆکارە شاراوانەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە بوونەتە هۆی نووسینی (ڕۆحی یاساکان). ئەم لێکۆڵینەوەیەش بووە رێخۆشکەرێك بۆ ئەوەی بچێتە سەر دەسنیشانکردنی پێوەندییەکانی نێوان یاساکان لەلاییێك و پرەنسیپی حکومەتەکان لە لاییێکی ترەوە. ئەوەی لێرەدا لەلای ئێمە گرنگە ئەوەیە کە مۆنتسکیۆ لەلاییێك زۆر بە توندی سەرکۆنەی (دەسەڵاتی تاکڕەوی) کردووە و بەمشێوەیە وەسفی ستەمکاری کردووە (کە مامەڵە لەگەڵ دارودەستەکەی خۆیدا دەکات وا دەزانێ ئاژەڵن..)، هەروەها لەلاییێکی تریشەوە تیۆرە بە ناوبانگەکەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی دانا، کە دواتر بووە (باوەڕێکی دەستووری گشتی). لە بەندی ١٦ ی جاڕی مافەکانی مرۆڤدا دەڵێ (هەر کۆمەڵگەییێك، کە مافەکانی مرۆڤی تێدا دەستەبەر نەکرابێ، یان جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی تێدا دەەسنیشان نەکرابێ، ئەو کۆمەڵگەیە بێ دەستوورە..).[٥٢٣]

### (٤)تێگەیشتنێکی هەڵە لەبارەی پەرلەمانەوە:

نووسەر رەخنەی ئەوە لە پەرلەمانی ئینگلیزی دەگرێ، کە بۆتە گەورەی هەمووان و لە سەروی (پاشا)وەیە و هەروەها لە (سەروی گەل) یشەوەیە..هتد. من نازانم چۆن ئەو نوێنەرەی، کە گەل بە ویست و ئارەزووی خۆی هەڵیبژاردووە، ئێستا لە (سەروی) ئەوانەوەن ـ نازانم چۆن..؟ ئەگەر بێت و نووسەر گومانی لە دروستی هەڵبژاردنەکە هەبوایە، یان بە تەزویر و هتد تاوانباری بکردبا، ئەو کاتە دەمانگوت پەرلەمان گوزارشت لە ویستەکانی خەڵکی ناکات و بە سەریدا سەپێندراوە، یان وەك خۆی دەڵێ لە سەرووی ئەوەوەیە، بەڵام هیچ شتێکی لەو بابەتە روی نەداوە چۆن دەکرێ بڵێین لەبەرئەم هۆکارە پەرلەمان بۆتە (ستەمکارێکی شارستانیانە) و

---

٥٢٣ ـ (الموسوعة السياسة) بە سەرپەرشتی عەبدولوەهاب ئەلکەیالی بەرگی شەشەم لـــ ٤٨٣ـــ و دوای ئەو.

دەسەڵاتی بۆ خۆی قۆرخ کردووە،..؟ ئەگەر پەرلەمان چەند یاساییێك، یان چەند پرۆژە یاساییێکی دەر بکردبا کە گوزارشت لە بەرژەوەندی ئەندامەکانی خۆی بکردبا لەوانەیە وامان بگوتایە، بەڵام هیچ کارێکی لەو شێوەیەیان ئەنجام نەداوە.!

لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر بۆ ئەوەی پەرلەمان لە بنچینەوە دارووخێنێ، پەنا دەباتە بەر شێوازێکی تر ئەویش: تانەو تەشەرگرتنە لە خودی نوێنەرایەتیکردن لە پەرلەماندا، چونکە بە بۆچونی ئەو وشەی (نوێنەرایەتیکردن) مانای ئەوەیە یەکێك دەبێتە نوێنەری یەکێکی تر (چونکە نوێنەر لەسەر حیسابی کەسێکی تر کار دەکات و دەئاخفی). کاتێك یەکێك لەسەر حیسابی یەکێکی تر داواکاری پێشکەش بکات و ئەو پەڕی ئازادیشی هەبێ، بێ ئەوەی ئەو کەسەی تریان هیچ ڕێگەچارەییێکی لەبەر دەستدا بێ بۆ ئەوەی ویستەکانی خۆی بە سەریدا بسەپێنێ، (بۆیە بە هیچ جۆرێك ناتوانین بڵێین نوێنەرایەتییێك لە جیاتی یەکێکی تردا بوونی هەیە، یان ئەو کەسە نوێنەرایەتی ویستەکانی ئەو دەکات).

دەتوانین چەند سەرنجێك لە بارەی ئەو بیروڕا سەیرانە بخەینە روو بەم شێوەیەی خوارەوە:

(أ) با وای دابنێین کە ئەو شتانەی نووسەر دەیڵێ ڕاستن، بەڵام بە هەڵتەکاندنی پەرلەمان لە رەگ و ریشەوە و بە (ستەمکارێکی شارستانی) دابنێین چارەسەر ناکرێت، بەڵکو سیستەمی دیموکراسی دەتوانێ ئەو مەرجە بۆ نوێنەرەکە دابنێ، کە ماوە ماوە سەردانی بازنەی هەڵبژاردنەکەی خۆی بکات بۆ ئەوەی لە کۆبونەوەییێکی گشتیدا کاروبارەکانی ناو پەرلەمان و ئەو بابەتانەی کە گفتوگۆیان لەسەر کراوە (جگە لەو بابەتانەی کە پێویست دەکات بە نهێنی بمێنێتەوە) و...هتد، چین بۆ دەنگدەران بخاتەڕوو، بەمشێوەیە دەتوانێ لە بازنەکەی خۆیدا بیروڕای دەنگدەران وەربگرێ بە تایبەتی بیروڕای کەسە شارەزاکانیان.

(ب) وەك پێشتریش باسمان، کرد ئەگەر دیموکراسیەت پیادە بکرێ، دەتوانین بڵێین، کە هێشتا سەرەداوەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان بە دەست دەنگدەرەوە دەمێنێ، چونکە ئەگەر جارێك لە هەڵبژاردنی نوێنەرێکی کارامە، کە بە دوای بەرژەوەندییەکانی ئەودا بگەڕێ هەڵەی کرد، دەتوانێ لە جارەکانی داهاتوودا ئەو هەڵەیە ڕاست بکاتەوە، تا ئەو کاتەی پەرلەمانێك دروست دەبێ، کە گوزارشت لە بەرژەوەندیە ڕاستەقینەکانی خەڵکی دەکاتەوە، بەمشێوەیە دەتوانین پەرلەمان ڕاست بکەینەوە نەك بیڕوخێنین.

(ج) ئەوەی ڕاستی بێ پیادەکردنی دیموکراسیەت لەلای جەماوەری دەنگدەراندا پێویستییێکی زۆری بە هۆشیاری سیاسی هەیە، هەر چەندی زیاتر پیادە بکرێ و دەزگاکانی

راگەیاندن بە ئەمانەتەوە بەشداری تێدا بکەن، ئەوەندە ئەو هۆشیاریە زیاتر پێدەگات و بە هێزتر دەبێ، ئەمەش وادەکات، کە هاولاتیان بتوانن کەسانی باشتر هەلبژێرن بۆ ئەوەی نوێنەرایەتیان بکات، بۆیە راستیان گوتووە کە دەلێن: (باشترین چارەسەر بۆ هەلەکانی دیموکراسی بوونی دیموکراسیەتی زیاترە)!.

(د) تاکە جێگرەوەی نوێنەرایەتیکردن لە پەرلەماندا ـ کە ئەمە دەرئەنجامێکی پێویستی رەخنەکانی نوسەرە ـ ئەوەیە، کە بگەرێینەوە بۆ دووبارە چەسپاندنەوەی دیموکراسیەتی راستەوخۆ، وەك ئەوەی، کە لە شاری ئەسینای کۆندا هەبوو، بەلام ئەم ئەلتەرناتیفە لەو ولاتانەدا، کە چڕی دانیشتوانەکانی زۆرە شتێکی مەحالە و ئەنجام نادرێ، واتە ناکرێ هەر هەموو گەل (بە مانا سیاسیەکەی) لە گۆرەپانێکی فراواندا، یان لە شوێنێکی گشتیدا کۆبکرێنەوە و هاولاتیان لە نێوان خۆیاندا باس لە کاروبارەکانی دەولەت بکەن، هەر لەبەرئەم هۆکارەشە نوێنەرایەتی بۆتە شتێکی پێویست و ناکرێ وازی لێ بێنین. ئەگەر هەر هەلەو کەم و کورییێکیش بێتە پێش دەبێ بیر لەوە بکەینەوە، کە چۆن خۆمانی لێ لابدەین و چارەسەری بکەین، نەك بێین و پەرلەمان لە رەگ و ریشەوە هەلبکێشین، وەك ئەو پزیشکە بکەین کە دەیەویست پلەی گەرمی نەخۆشێك دابەزێنێ، هەلسا رۆحی کێشا.

(هـ) مرۆڤ هەموو کاتێك ناتوانێ بەرژەوەندییەکانی خۆی بخاتەروو، بۆ نموونە: بە رای من ناکرێ بلێین ئەو کرێکارە، یان ئەو جوتیارە وەك پێویست دەتوانێ گیروگرفتەکان، یان داواکاری و پێداویستییەکانی خۆی بخاتەروو، چونکە ئەو زۆربەی جارەکان لە ژیانی رۆژانەیدا پەنا دەباتە بەر (پارێزەر)ێك، یان (رۆژنامەنوس)ێك و ئەو گیرو گرفتانەی بۆ باس دەکات و داوای لێ دەکات کە بە شێوازی تایبەتی خۆی ئەو گرفتانە بخاتەروو.

### (٥) راوکردنی هەلەو کەم و کورییەکان:

نووسەر زۆرجار دەکەوێتە دوای ئەو هەلەو کەموکوریانەی کە لە رابردوودا بە درێژایی مێژووی پیادەکردنی دیموکراسیەت تێی کەوتووە بۆ نموونە وەك:

(أ) رەخنە لەو دیموکراسیەتەی بەریتانیا دەگرێ، کە لە سەدەی هەژەمدا پیادەی کردووە، کە نوێنەرایەتیکردن لە پەرلەماندا کارتۆنی بووە، چونکە (بازرگانیان) بە کورسییەکانەوە کردووە. یەکێك لە لۆردەکان دەیەوێ کورسییێکی پەرلەمان بۆ کورەکەی خۆی بکرێتەوە و یەکێکی تر دوو کورسی پەرلەمان بۆ فرۆشتنەوە دەخاتەروو وسێیەمیان وا و وا دەکات...هتد،

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەو نووسەرە یەك نموونەش لەسەر ئەو بازرگانی کردنە لە سەدەی بیستەمدا باس ناکات.. ئەمەش مانای ئەوەیە، کە هەر هەموو ئەو هەڵانەی، کە روویانداوە لە سەرەتای پیادەکردنی دیموکراسیەتدا بووە (سێ سەدە پێش ئێستا)، ئەو هەڵانەش لە کاروانی دیموکراسیدا راست کراونەتەوە، چونکە (بەشێك) نەبووە لە جەوهەری دیموکراسیەت.

(ب) نوسەر جارێکی تر دێتەوە باسی دیموکراسیەتی بەریتانیا لە سەدەی هەژدەمدا دەکات و بە سیستەمی دەسەڵاتی کەمینەکان، یان بە دەسەڵاتی چینی خاوەن پارەو پول و خاوەن ژێرییەکان وەسفی دەکات. بێ ئەوەی یەك وشە لەبارەی ئێستایانەوە بڵێ، لەبەر ئەوەی ئەو باسی (کەم وکوڕییەکانی رابردوو) دەکات، ئەمانەتی زانستی وا پێویست دەکات کە شتێکیش لەبارەی ئێستایانەوە بڵێت.

(ج) نوسەر لە دیموکراسیەتی ئینگلتەراوە دێتە سەر دیموکراسیەتی فەرەنسا و دیسان باسی دەستووری ساڵی ١٧٩١ دەکات کە ئەو مەرجەی بۆ دەنگدەران دانرابوو کە دەڵێ: دەبێ موڵکێکی هەبێت ساڵانە داهاتێکی دیاریکراوی لێ دەست بکەوێ...هتد، بەڵام ئەوەی لە بیر خۆی بردۆتەوە، کە دوای دوو ساڵ ئەو دەستوورە هەڵوەشێندرایەوە و دەستووری ساڵی ١٧٩٣ جێگەی گرتەوە. لێرەدا کەم وکوڕییەکان هەر چییێك بن، لەم دەستوورەدا، یان لە دەستوورێکی تردا بن، خۆی لە فەرەنسادا دەستوور لەدوای دەستوور دەگۆڕا تا ئەو کاتەی (شارل دیگۆل) ـ وەك پێشتریش باسمان کرد ـ دەستووری ساڵی ١٩٥٨ (دەستووری کۆماری پێنجەم) ی دانا و دیسان لە ساڵی ١٩٦٢ هەندێك گۆڕانکاری تێدا کرا، ئەو دێ رەخنە لە دیموکراسیەتی فەرەنسا دەگرێ کە لە سەردەمی منداڵی، یان لە سەردەمی گەنجێتیدا کەوتۆتە چەند هەڵەیەکەوە، کە دواتر لە سەردەمی پێگەیشتنندا چارەسەر کراون.

(د) بەڵام هەرچی دیموکراسیەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، نووسەر تەنها یەك رەخنەی ئاراستە دەکات ئەویش ئەمەیە: ئەمانە چەند وشەییێکی (مردوون) ـ کە لە دەستووردا هاتووە ـ دەڵێ ئەگەر مافی خۆ پاڵاوتن بۆ سەرۆکایەتی کۆمار و بە ئەندام بوون لە کۆنگرێسدا بۆ هەر هەموو هاوڵاتیان دەستەبەر کراوە، ئەو دەڵێ ئەوەی راستی بێ تەنها بۆ ئەو کەسانە دەستەبەر کراوە، کە دەتوانن بە ملیۆنەها دۆلار لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا خەرج بکەن. ئێمەش حاشا لەوە ناکەین و لەوانەیە وابێ، بەڵام ئەوە نابێتە چارەسەرکردن، کە ئێمە سیستەمی نوێنەرایەتی هەڵوەشێنینەوە، یان دیموکراسیەتی لیبرالی لەناو بەرین، بەڵکو ئەگەر هەڵەییێك هەبێ، دەبێ بە دەرکردنی چەند پرۆژە یاساییێك چاکی بکەینەوە، بۆ نموونە:

دەسنیشانکردنی ئەو برە پارەیەی کە پالێوراوەکان لە پڕو پاگەندەکانی هەڵبژاردندا خەرجی دەکەن ئەمشتە چارەسەر دەکات.

ئەوەی راستی بێ، کە ئێمە بەشان و باڵی دیموکراسیەتی لیبرالیدا هەڵدەدەین، ئەمە مانای ئەوە نییە، کە ئێمە دەمانەوێ دەقاودەق ئەو وێنەیەی، کە لە ئینگلتەرا، یان فەرەنسا، یان لە ئەمریکادا پیادە دەکرێ بیگوازینەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان، چونکە دیموکراسیەت دەبێ رەنگی ئەو کۆمەڵگەیە بگرێ کە تیایدا پیادە دەکرێ، بە بێ ئەوەی بە شێوەییێکی دیاریکراو بە سەریدا بسەپێندرێ. بۆ نموونە: (لەو دەستەبەر کردنانەی کە دەستووری ئەمریکی بە هاوڵاتیانی بەخشیوە و ئەو هەست کردنە بە بوونی (یاساییێك) کە دەبێ رێزی لێ بگیرێ، کە یاساییێکە بەسەر هەموو کەسێکدا جێبەجێ دەکرێ و کەس لە دەرەوەی ئەو یاسایەدا نییە، لەمەدا نموونەییێکی باشە و دەبێ مرۆڤی عەرەبی و حکومەتە عەرەبییەکان شتی زۆری لێ فێر بن..)،[٥٢٤] (هەر کاتێك یاسا، یان دەستوور بە شێوەییێکی بەر چاو لەلایەن هەر کەسێکەوە پێشێل بکرێ، ئەگەر ئەو کەسە گەورەترین دەسەڵاتداریش بێ لە وڵاتدا، دەرئەنجامەکەی خراپ دەبێ..).[٥٢٥] ئەمەش بنچینەییێکی بە هێزە لە بنچینەکانی دیموکراسیەت، دەکرێ بە بێ ئەوەی هەمان (نموونە)ی ئەمریکی، یان فەرەنسی، یان هەر وڵاتێکی تر بۆ لای خۆمان بگوازینەوە سودی لێ وەربگرین.

ئەم باسەش دەمانباتە سەر خاڵێکی کۆتایی گرنگ کە ئەمەیە: ئێمەی عەرەب چۆن دەتوانین سوود لە نموونەکانی ئەو دیموکراسیەتە لیبرالییە وەربگرین کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هەیە..؟

### (٦) ئێمە.. و دیموکراسیەت:

وا تێدەگەم لێرەدا چەندین وانە هەبن، کە ئێمە دەتوانین لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا ئەزمونە دیموکراسییەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان لێکبدەینەوە و سودی لێ وەربگرین، دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورتی بکەینەوە:

---

٥٢٤ ـ د. فوئاد زەکەریا :(العرب والنموذج الامریكی) کتێبخانەی میسر لە فوجالە ـ قاهیرە ساڵی ١٩٩١ لـ٣٦ـ.

٥٢٥ ـ هەمان سەرچاوە.

(١)لەوانەیە یەکەم وانە، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا سودی لێ وەربگرین ئەوەبێ، کە دیموکراسیەت شێوەییێکی دیاریکراوی نییە کە پێویست بەوە بکات دەقاودەق جێبەجێی بکەیت، چونکە لە ئینگلتەرادا پاشایەتی بۆماوەییە و سیستەمی پەرلەمانی تێدا پیادە دەکرێ و لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کۆماریە و سیستەمی سەرۆکایەتی تێدا پیادە دەکرێ و فەرەنسا لە هەردوو سیستەمەکە کۆدەکاتەوە و پیادەی دەکات. لە ئینگلتەرادا تێکەڵبوونێك لە هەر سێ دەسەڵاتەکەدا هەیە و لە فەرەنسا سەربەخۆییێکی تەواو لە هەرسێ دەسەڵاتەکەدا هەیە و سەرۆکی ئەمریکا بۆی نییە پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام لە فەرەنسا و ئینگلتەرا ئەو مافە بۆ سەرۆك دەستەبەر کراوە و لە ئینگلتەرادا دەبێ وەزیرەکان ئەندامی پەرلەمان بن، بەڵام ئەمە نە لە ئەمریکا و نە لە فەرەنسادا رێگەی پێنادرێ. بەمشێوەیە، ئەوەی گرنگە بنچینەکانی دیموکراسیەتە: وەك ئازادی و یەکسانی و مافی گەل لە حوکمڕانیکردنی خۆیدا و داگرتنی سەرۆك لە کارەکەیدا ئەگەر لە رێگە لایدا.

(٢) سیستەمی دیموکراسی دوا شێوەی سیستەمی سیاسیە، ئەمە سیستەمێکە لە پڕێکدا نەهاتۆتە کایەوە، بەڵکو بەری خەباتێکی دورودرێژە، کە گەلان لەدژی ستەمکارییەکانی زۆرداراندا کردوویانە، هەروەها (ئەمە ئەزموونی مرۆڤایەتیە وەك مرۆڤ).

(٣) خۆی دیموکراسیەت (پیادەکردنە) ئەمەش مانای ئەوەیە، کە لە سەرەتای پیادەکردنیدا بێ کەم و کوڕی نابێ، بەڵکو گومان لەوەدا نییە کە لەکاتی پیادەکردنیدا دەکەوێتە چەندین هەڵەی زۆرەوە، بۆیە دەبێ ئێمە لێی نیگەران نەبین، بەڵکو دەبێ بە چاکی دەست بە سیستەمی دیموکراسیەوە بگرین و بیپارێزین، ئینجا دوای ئەوەش هەوڵی ئەوە بدەین ئەو کەموکوڕیانەی، کە هەییێتی چاکی بکەینەوە.

(٤) دەبێ بەوە هەست بە دڵتەنگی نەکەین، یان نیگەران نەبین، کە سود لەهەر شێوەییێکی سیستەمە دیموکراسییە پێشکەوتووەکان وەربگرین، چونکە ئێمە بینیمان، کە چۆن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ـ سەرەڕای ئەو شەڕ و ناکۆکی و (داگیرکردنەی) ـ کە لەنێوانیاندا هەبوو سودی لە دیموکراسیەتی ئینگلتەرا وەرگرت و فەرەنسا بۆ دانانی دەستووری وڵاتەکەی خۆی چۆن توانی سود لە هەردوو تاقیکردنەوەکەی ئینگلیزی و ئەمریکی وەربگرێت.

(٥) لێرەدا پێوەندییێکی توند وتۆڵ لە نێوان دیموکراسیەت و فرە حیزبایتیدا هەیە، تەنانەت هەندێك لە یاسا ناسەکان وای بۆ دەچن کە (دیموکراسیەت بە بێ فرە حیزبی بوونی نابێت) ـ

چونکە فرە حیزبی بڕبڕەی پشتی دیموکراسیەتە، ئەوان لەم ڕووەوە پشت بە کۆمەڵێك بەڵگە دەبەستن وەك: [٥٢٦]

(أ)خۆی سروشتی مرۆڤ وایە، کە لە بیروڕادا لە یەکتر جیاواز بێ، ئەمەش گرنگییێکی تایبەتی هەیە بۆ ئەو کێشانەی کە سروشتێکی سیاسیان هەیە.

(ب) حیزبەکان بۆ دروستکردنی هۆشیاری سیاسی ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن و ڕاییێکی گشتی ڕۆشن لەلای خەڵکی دروست دەکەن،، کە ڕاستی و دروستی کاروبارەکان دەربخات و لە کاروبارە گشتییەکانیشدا بەشداری بکات.

(ج) دروستبوونی حیزبەکان ڕێگە بە بوونی ئۆپۆزسیۆنێکی ڕێکخراو دەدات، کە حکومەت و دەسەڵات بە شێوەیێکی گشتی لە گەندەڵی دەپارێزێ.

(د) حیزب ئەو بیر و ڕایانە کۆ دەکاتەوە کە تەعبیر لەو سیاسەتە دەکات، کە خۆی لەو کاتەی دێتە سەر دەسەڵات جێبەجێیان دەکات و بە شێوەیێکی ڕێك و یەکگرتوو دایدەڕێژێتەوە و ناوی دەنێ (بەرنامەی حیزب) و دەیخاتە بەر دەستی خەڵکی بۆ ئەوەی بتوانن بە ئاسانی لە هەڵبژاردنەکاندا بڕیاری خۆیانی لەسەر بدەن. هەروەها حیزب ڕۆڵی ڕاگەیاندنێکی گرنگ دەگێڕێ بەوەی کە زانیاری و ڕونکردنەوەیێکی تەواو دەداتە دەنگدەر بۆ ئەوەی لە ڕووداوە سیاسی و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تێبگات و یارمەتیشی دەدات بۆ ئەوەی باشترینیان هەڵبژێرێ.

(ه) ئەو ململانێیەی نێوان حیزبەکان دەبێتە هۆی گەشەکردنی حیزبەکان و ئەندامەکانیشیان، یان لانی کەم گەشەکردنی ئەندامە بەرزەکانیان ڕۆشنبیرتر دەکات ئەوانەی کە دەتوانن بەرگری لە پرەنسیپەکانی حیزب بکەن، بەمشێوەیە حیزبەکان دەبنە قوتابخانەییێکی مەزن کە ئەندامەکانی مەشقی پیادەکردنی دەسەڵاتی تێدا دەکەن و بە کاروبارەکانی دەسەڵات هەڵدەستن، بە تایبەتی ئەو حیزبەی، کە بە باشی ڕێکخرابێ و لەناو خۆی حیزبدا دیموکراسیەت پیادە بکات، کە ئەندامەکانی سەرۆکی حیزب و مەکتەبی سیاسی هەڵبژێرن و دەستەی سیاسی لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکات.

(٦) لێرەدا وانەییێك هەیە دەبێ لێی وریا بین ئەویش ئەوەیە کە (ئەخلاق و سیاسەت) تێکەڵ بە یەکتری نەکەین وەك بیرمەندە سیاسییەکانی خۆمان لە ڕابردوودا لە

---

٥٢٦ ـ تەماشای د. نعمان ئەلخەتیب (الاحزاب السياسية و دورها في أنظمة الحكم المعاصرة) لـــ٧٨ـــ و دوای ئەو بکە، دار و لسەقافە بۆ بلاوکردنەوە ودابەشکردن لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٣.

(ئیبن ئەبی رەبیع)ەوە بیگرە تا دەگاتە (فارابی) و (ماوەردی) و تەرتوشی تا دەگاتە (ئیمام غەزالی) کردوویانە. یان وەك هەندێك لە فەرمانڕەواکانی سەردەمی ئێستامان دەیکەن کە خۆیان بە هەندێك نازناوی ئەخلاقیانەی وەك (ئێمە باوکی میللەتین)، یان هاولاتیان بە (مندالّی خۆیان) ناوزەد دەکەن.. (ئێمە بە توندی ئەوە رەتدەکەینەوە، کە سەرۆککۆمار نازناوی (براگەورە) لە خۆی بنیّ، چونکە ئەو ئاماژانە لەگەلّ دەستووردا یەك ناگرنەوە و ئەوەشی لیّ دەکەوێتەوە، کە هیچ کەسێك لە هاولاتیان بۆی نییە هیچ بڕیاریکی سەرۆك رەتبکاتەوە، چونکە لە داب و نەریتدا سەرۆکی خێزان، یان براگەورە هەر بڕیارێك بدات نابیّ ئەندامانی خێزانەکەی رەتی بکەنەوە، یان ئامۆژگاری بکەن تەنانەت ئەگەر بڕیارەکە هەلّەش بیّ).[527] ئێستاشی لە گەلّدابیّ هەندێك فەرمانڕەوامان هەیە شانازی بەوە دەکەن کە باوکی کۆمەلّگەکەی خۆیانن، ئەو خەلّکەش خەلّەتێندراوە کە چاوەڕێی چاکە لەو ناوزەدکردنە دەکەن! هەندێکی دیکەش هەن کە بە خۆیان دەلّێن (کاك فلان) یان (فیسار) ئەم نازناوانە هەرهەمووی دەسکردی عەرەبین و لە هیچ سیستەمێکی سیاسی پێشکەوتوودا نایبیستین.

(٧) هەروەها دەبیّ ئاگاداری لایەنێکی تریش بین ئەویش وەسفکردنی کۆمەلّگەیە بە یەك خێزان، زۆر جاریش ئەمە دووبارە دەکرێتەوە، هەندێك کەسیش سەبارەت بەو شتە هەلّهەلەی بۆ لێدەدەن ئەمەش هەلّەیێکی زۆر گەورەیە، چونکە (خێزان)، یان (بنەمالّە) چەمکێکی ئەخلاقیە نەك چەمکێکی سیاسی. دامەزراوەییێکە تاکەکانی بە کۆمەلّێك چەمکی ئەخلاقی وەك ئەرك و پێوەندییەکانی نێوانیان بە یەکەوە دەبەسترێنەوە و هیچ (یاسا)ییێکی وەك ئەوەی لە دەولّەتدا هەیە نایانگرێتەوە. هەروەها نابیّ بگوتریّ ئێمە (یەك خێزانین)، یان (بنەمالّە)ییێکی گەورەین و یەك بیروڕا کۆمان دەکاتەوە و جیاوازی بیروڕا (پیلانێکە) بۆ لێکترازاندنی ئەو یەکێتیە و لەبەر یەك هەلّوەشاندنەوەی نەتەوە!. بەم شێوەیەش سەرپێچیکاران دەبنە پیلانگێڕ و نیشتمان فرۆش بە دەستی دەرەکی کار دەکەن.[528]

---

٥٢٧ ـ د. حیلمی موراد (جریدة الشعب) قاهیرە رۆژی ٧\١٠\١٩٨٠. هەروەها تەماشای د. زەکی نەجیب مەحمود کتێبی (تحدیث الثقافة العربیة) بکە، دارلشروق لە قاهیرە سالّی ١٩٨٧ لـ٢٠٨تـ .

٥٢٨ ـ لە وتارێکدا بە ناونیشانی (الاجماع : ما له وما علیه) ئەم بابەتەمان بە دوور و درێژی لە گۆڤاری سطور ژمارە ٩ ئابی ١٩٩٧دا چارەسەر کردوە.

(٨) بیرۆکەییێکی گرنگ لەو بیرۆکانەی پێشتر سەر هەڵدەدا ئەویش ئەوەیە کە:(دیموکراسیەت لەناو خێزاندا بوونی نییە) هەروەها ئاخاوتن لەسەر (دیموکراسیەتی خێزان) گوزارشتێکی هەڵەیە، چونکە پلان بۆ تێکەڵکردنی دوو بوار دادەنێ کە دەبێ لە یەك جیا بکرێنەوە ئەویش (بواری ئەخلاق) و (بواری سیاسەتە)، چونکە خێزان چەمکێکی ئەخلاقیە و لە کۆتاییدا سەرەداوەکان هەر هەمووی لە دەستی باوکدا کۆ دەبێتەوە، کە لە روی ئەخلاقیەوە لەو خێزانە بەر پرسیارە پێش ئەوەی لە روی یاساییەوە بەر پرسیار بێ. ئێمەش لەناو خێزاندا لە بەردەم چەند منداڵێکی بچووکداین و بەها ئەخلاقییەکانیان تێدا دەچێنین، ئەمەش ئەرکی سەرەکی بنچینەیی خێزانە.

(٩) ئەوەی کە لەبارەی (دیموکراسیەتی خێزان) دەوترێ هەمان شتیش و بە هەمان رێگەو هەمان هۆکاریش لەبارەی (دیموکراسیەتی قوتابخانە) دەوترێ، کە دامەزراوەییێکی پەروەردەییە ئەرکی ئەوەیە ـ لە پاڵ ئەو زانست و زانیاریەی، کە دەیداتە قوتابییەکانی خۆی، بەها ئەخلاقییەکانیشیان تێدا بروێنێ، هەندێك جاریش فێری بەها دیموکراسییەکانیان دەکەن وەك رێزگرتن لە بیروڕای کەسانی تر و ملکەچبوون بۆ رای زۆرینە و قوتابییەکان هەر هەموویان لە بەرامبەر مامۆستاکەیان و کارگێری قوتابخانەکەیان یەکسانن..هتد. بەڵام ئەمانە هەمووی ـ بە مانا سیاسییەکەی ـ مانای ئەوە نییە، کە دیموکراسیەت لە قوتابخانەدا پیادە دەکرێ و بوونی هەیە.

(١٠) ئەمەش مانای ئەوەیە کە سیستەمی دیموکراسی سیستەمێکی سیاسییە بە چەمکە سیاسییەکەی بەسەر گەلدا دەسەپێندرێ، لێرەدا چەند کەلێن و قوژبن و بوارێك هەیە ئەو چوارچێوەیە نایانگرێتەوە وەك: خێزان و قوتابخانە و سوپا...هتد.

# بەشی دووەم

## ئەخلاق..و سیاسەت لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا

(لە پێناو بەرژەوەندییەکانی بەریتانیادا هەندێك تاوانم ئەنجامداوە ، ئەگەر ئەو تاوانانەم لەناو بەریتانیادا ئەنجام بدابایە، گومانی تێدا نەبوو هەر هەموو ژیانی خۆم لە بەندیخانەکاندا بەسەر دەبرد )!.

(وینستۆن چەرچل)

(من هەرگیز نەم گوتووە، ئێمە لە سیاسەتی دەرەوەماندا سیاسەتێك پیادە دەکەین، کە لەسەر پرەنسیپەکانی ئەخلاق بنیاد نرابێت!..)

(ڕۆبەرت هۆك)

(وەزیری دەرەوەی بەریتانیا)

## یەکەم: دەسپێك:

لە پێش ئێستادا و لە سەرەتای ئەم کتێبەدا باسمان لەوە کرد، کە وشەی (سیاسەت) چەندین مانای هەیە، لەوانە: لە ناو دەوڵەتدا مانای سیاسەتی ناوەخۆ دەگەیێنێ ، یان (ئەو یاسایانەی کە ژیانی خەڵکی ڕێکدەخات، واتە کۆمەڵگە بە شێوەییێکی سیاسی ڕێکدەخات)، هەروەها مانای سیاسەتی دەرەوە، یان پێوەندییەکانی نێوان وڵاتانیش دەگەیێنێ. ئێمە لە سەرەتای ئەم کتێبەوە جەخت لەسەر مانای یەکەمیان دەکەینەوە، هەر ئەوەش مەبەستی سەرەکی ئێمە بووە، چونکە ئێمە هەر لە بنچینەدا مەبەستمان (فەلسەفەی حوکمڕانی) بووە، بەڵام شتێکی تێدا بەسەر نابێ ئەگەر لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، یان پێوەندییەکانی نێوان وڵاتاندا ئێمە هەندێك ڕۆشنایی بخەینە سەر (ئەخلاق..و سیاسەت).

ئەوەی ڕاستی بێ هیوای پێکەوەنانی پێوەندییێکی باش و توندوتۆڵ لەنێوان وڵاتاندا، ئاشتی و دڵنەوایی و خۆشەویستی دێنێتە کایەوە و شەڕو شۆڕ و ناکۆکیش لەناو دەبات، ئەمەش مرۆڤ هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە بیری لێکردۆتەوە، هەروەها لەناو مرۆڤدا حەز و ئارەزوێکی زۆر و گشتی بۆ بەدیهێنانی ئەو ئاواتە هەبووە، بەڵام سەرنەکەوتنەکانیش بۆ بەدیهێنانی ئەم ئاواتە بە هەمان شێوە گشتی بوونە.

چیرۆکی هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی ئاشتی و پێکەوە ژیان لەنێوان وڵاتاندا زۆر کۆن و دوورودرێژە. مێژوو نووسان باس لەوە دەکەن، کە مرۆڤ هەر لەسەرەتای دروستبوونی مێژووەوە هەوڵی دروستکردنی ئاشتییێکی بەردەوامی داوە لەنێوان وڵاتاندا، لە کۆنترین پەیمانی هاوپەیمانیدا هاتووە کە لەنێوان (ڕەمسیسی دووەم)ی فیرعەونی میسر و (حتیپار) ی پاشای حیسییەکاندا مۆر کراوە، کە مێژووەکەی بۆ سەدەی سێزدەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، یەکەم بەندی ئەم پەیمانە کە هەردوولا لەسەری ڕێککەوتوون (دروستکردنی ئاشتییێکی بەردەوامە لەنێوان هەردوو وڵاتدا)، بەڵام ئەم پەیمانە نەیتوانی پێش بەو شەڕ و شۆڕە یەك لەدوای یەکانە بگرێ، کە لە ناوچەکەدا ناوە ناوە سەریان هەڵدەدا و سەرتاسەری ناوچەکەی دەگرتەوە ـ بەمشێوەیە گەلانی ناوچەکە نەیانتوانی چێژ لە ئەمن و ئاسایش و ئاشتی وەربگرن تەنانەت لەدوای مۆرکردنی ئەو پەیمانەشدا.

هەروەها شارە یۆنانییەکان سەرەڕای ئەو پێکهاتن و پەیمانانەی لەنێوان شارەکاندا مۆرکرابوون بەردەوام لە شەڕ وشۆڕدا بوون. تەنانەت گریکەکان گەیشتبوونە باوەڕێك، کە ئەو شەڕ و شۆڕانەی نێوان وڵاتەکان شتێکی (سروشتیە) و بەو پێیەی، کە لایەنێکە لە سروشت و دەبێ پێی رازی بن. تەنانەت خواکەیان لە بنەچەدا لە نەوەی جەنگ بوو و دوای شەڕێکی کوشندە، کە لە نێوانیاندا روویدا هاتە سەر دەسەڵات، هەر لەبەر ئەمەش بوو، کە خوای جەنگ کەسایەتییێکی سەرەکی بوو، لە کاتێکدا خوای ئاشتی خواییێکی لاوەکی و هاوکار بوو. دوای ئەوە رۆمانییەکان (یاسای گەلان Jus Gentium) یان دارِشت، ئەمە ئەو یاسایە بوو، کە مەبەستی رێکخستنی پێوەندییەکانی نێوان رۆما و نەتەوەکانی تر بوو. لە دواییدا ئەم یاسایە گەشەی کرد و بووە بنچینەییێك بۆ بیرۆکەی (یاسای سروشتی Jus Naturale) کە ئەمەیان کۆمەڵێك پرەنسیپی نموونەیی بوون بۆ دادپەروەری و ویژدان دارِێژرابوون بۆ ئەوەی بتوانن وەك یاساییێك بەسەر هەموو گەل رەگەزێکدا بە شێوەییێکی گونجاو بیسەپێنن، کە لە دواییدا ئەم بنەمایانە بوونە یەکەم سەرچاوەی یاسای نوێی نێو دەوڵەتی.[٥٢٩]

بیرمەندەکان بۆ هێنانەدی ئاشتییێکی بەردەوام لەنێوان مرۆڤەکاندا لە هەوڵ و کۆششەکانی خۆیان بەردەوام بوون، ئەو هەوڵانەش لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا وەك یەك بەردەوام بوو. بۆیە ئەبو نەسری فارابی (٨٧٠ ـ ٩٥٠) گەورە فەیلەسوفی ئیسلام و مامۆستای دووەم لە ناوەڕاستی سەدەی دەیەمدا لە کتێبەکەیدا (آراء أهل المدينة الفاضلة) کە پێشتریش باسمان کردووە داوا دەکات (یەکێتییێك لە سێبەری ئەو شتەی کە ئەو ناوی لێنابوو (ئاوەدانییێکی بێخەوش) لەنێوان هەر هەموو وڵاتانی جیهاندا دروست بکرێ). هەروەها (دانتی ئەلجیری ـ ١٢٦٥ ـ ١٣٢١) شاعیری ئیتالی بەناوبانگ، لە سەدەی چواردەمدا پێشنیازی پێکهێنانی حکومەتێکی جیهانی کرد، کە هەر هەموو وڵاتەکان دانی پێدا بنێن و دانیشتوانی جیهان هەر هەمووی لەژێر رکێفی ئەو حکومەتەدا بن. لە سەرەتای سەدەی شازدەمیشدا (ئاراسمۆس Erasmus)ی (١٤٦٩ ـ ١٥٣٦) فەیلەسوفی هۆڵەندی بە توندی هێرشی کردە سەر جەنگ و بە خۆکوشتنێکی بە کۆمەڵی ناوبرد. لە ساڵی ١٥١٠دا کتێبێکی دانا بە ناونیشانی (دفاع من العقل والدين والانسانية ضد الحرب) واتە (بەرگرییێك لەلایەن عەقڵ و ئاین و

---

٥٢٩ ـ **(المدخل الى علم السياسة)** لە دانانی پەترۆس غالی، و د. مەحمود خەیری لـ٢٩٩ و ٣٠١ـ لە چاپی پێنجەم لە قاهیرە ساڵی ١٩٧٦.

مرۆڤایەتیەوە دژی جەنگ)، لەو کتێبەدا داوا لەهەرهەمموو مرۆڤێك دەكات، كە هەرچی هێز و توانای خۆی هەیە بە كاری بێنی بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ جەنگ دابنێن و لە كۆتاییەكانی سەدەی هەژدەمیشدا پرۆژەیێك دەركەوت كە (كانت Kant)ی (١٧٢٤ ـ ١٨٠٤) فەیلەسوفی ئەڵمانی لە ساڵی١٧٩٥دا لە نامیلكەیێكی بچووكدا بە ناونیشانی (مشروع للسلام الدائم).[٥٣٠] واتە پرۆژەیێك بۆ ئاشتییێكی بەردەوام، لەو پرۆژەیەدا هەوڵی ئەوەی داوە هەندێك بنچینەی فەلسەفی بۆ دروستبوونی ئاشتییێكی بەردەوام لەنێوان وڵاتانی جیهاندا دابڕێژێ، بەڵام (هیگڵ ١٧٧٠ ـ١٨٣١) بیروڕاییێكی پێچەوانەی ئەو بیروڕایەی هەبوو، چونكە ئەو لەو باوەڕەدا بوو كە (خەونی ئاشتییێكی بەردەوام) خەیاڵێكە، كە هەرگیز نایێتە دی، ناكۆكییەكانی نێوان وڵاتانیش تەنها جەنگ دەتوانی یەكلایی بكاتەوە، بۆیە تەنها (جەنگ دادگای مێژوو بووە).

بە كورتیەكەی ئاشتی و پێكەوە ژیان وخۆشەویستی و پێوەندییێكی باش لەنێوان وڵاتانی جیهاندا خەونێكە مرۆڤ لە سەرەتای مێژووەوە خەونی پێوە دەبینێ و نایەتەدی، وەك چۆن ئەو چەمكە باشانەی، كە جەختیان لە مرۆڤ كردۆتەوە، كە لەنێوان هاوڵاتیانی وڵاتێكدا بیهێنێتەدی، بەڵام ئەمانە هەر هەمووی وەك چەمكێكی ئەخلاقی ماونەتەوە و چاوەڕێی یەكێك دەكەن بێت و بیانكاتە یاساییێكی بە توانا و بیخاتە بواری جێبەجێكردنەوە... ئایا دەبێ ڕۆژێك بێت و ئەو هیوا و ئاواتە بێتەدی وەك ئەوەی لەنێوان هاوڵاتیانی وڵاتێكدا هاتۆتەدی..؟

لە ڕاستیدا ئەو هەوڵ و تێكۆشانانەی، كە بیرمەند و فەیلەسوف و چاكسازیخوازەكان لەو بوارەدا بۆ بەدیهێنانی حەز و ئارەزووەكانی مرۆڤ بۆ ئاشتی و ئارامی هیچیان سەریان نەگرت و سەرنەكەوتن و لە ساڵی ١٩١٤دا جەنگی جیهانی یەكەم هەڵگیرسا و زۆربەی وڵاتانی جیهانی تێوەگلا و بەو ئاگرەوە سووتا، سەر لە نوێ داواكارییەكان بۆ بەرقەراربوونی ئاشتی، دروشمی (دەبێ ئەم نەهامەتیە دووبارە نەبێتەوە) یان بەرز كردەوە، ئەم بانگەوازە لە سەرتاسەری جیهان دەنگی دایەوە، و بووە هۆی دەركەوتنی یەكەم ڕێكخراوی جیهانی كە ئەویش (كۆمەڵەی نەتەوەكان) (عصبة الامم) بوو، كە لە ساڵی ١٩١٩دا دروست بوو، ئەو ڕێكخراوەش هەوڵەكانی خۆی خستە گەڕ بۆ چەسپاندنی پرەنسیپ و بنەماكانی ئەو پرۆژانەی، كە لەلایەن

---

٥٣٠ ـ ئەم كتێبە د. عوسمان ئەمین وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لەگەڵ پێشەكییێك و هەندێك سەرنجدا ـ كتێبخانەی ئەنگلۆ میسری ١٩٦٧.

بیرمەند و ئاشتیخوازەکانەوە خرابوونە روو، بەڵام ئەم کارەش نەیتوانی ئەو حەز و ئاواتانە بێنێتەدی و پێش بە جەنگ بگرێ، بۆیە لە ساڵی **١٩٣٩**دا دووبارە جەنگی جیهانی دووەم روویدایەوە ـ ئەو شەڕە زۆر لە شەڕی یەکەم توند و تیژتر و دژوارتر بوو، سەرلەنوێ بیرمەندو ئاشتیخوازان و یاساناسەکان جارێکیتر کەوتنەوە خۆیان و داوای دروستکردنی رێکخراوێکیان کرد، کە ببێتە هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی ئاشتی وئارامی لەنێوان نەتەوەکاندا، بۆیە لە ساڵی **١٩٤٥**دا (دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان) دامەزرا و هەوڵی ئەوەیدا ئەو کون و کەلەبەرانەی، کە رێکخراوی (کۆمەڵەی نەتەوەکان) هەیبوو، ئەو بنبڕی بکات و نەیهێڵێ، بەڵام ئەویش بەهەمانشێوە نەیتوانی ئاشتی و ئارامی بەدی بێنێ، چونکە هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە تاکو ئێستاش شەڕو شۆڕی نێوان وڵاتان کۆتایی پێ نەهاتووە!. ئایا هەر لەبەرئەوەیە، کە سروشتی خودی مرۆڤ حەز بە شەڕوشۆڕ و ململانێ دەکات، دەبێ بەدیهاتنی ئەم ئاشتی و ئارامیە شتێکی مەحاڵ بێ؟!، یان دەبێ مرۆڤ بێ ئومێد نەبێ و لە هەوڵ و کۆششەکانی خۆیدا بەردەوام بێ و گەشبین و ئارام بێ لە بەدیهێنانی ئەو خەونە پڕ جادوو سەرسوڕهێنەرە، هەرچەندە رێگەکەشی ناخۆش و دژوار بێ. ئایا مرۆڤ لە سەدەی سێزدەی پێش زایینەوە تا ئێستا، لە شتێکی کەم زیاتر توانیوێتی هیچ لەو رێگایە ببڕێ؟!.

## دووەم: لە ئەخلاقەوە..بۆ یاسای نێودەوڵەتی: .

ئایا دەبێ مرۆڤ لەوە بێئومێد بێ، کە بتوانێ چەمکە ئەخلاقییەکانی وەك: خۆشەویستی و ئاشتی و پێکەوەژیان لەنێوان وڵاتانی جیهاندا بگۆڕێ و بیکاتە چەند یاسایێك، کە هەر هەموو ئەندامەکان ناچار بکرێن رێزی لێ بگرن وەك ئەوەی لەناو چوارچێوەی وڵاتێکدا پەیڕەو دەکرێت؟ هەندێك لە یاسا ناسەکان گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتە، کە بنەما نێودەوڵەتییەکان، لە دیدی ئەواندا هەمان ئەو سروشتە یاساییانەیان نییە، کە ئەو بنەمایانەی رەفتارەکانی هاوڵاتیان لەناو چوارچێوەی وڵاتێکدا رێکدەخات هەیانە، بۆ ئەم مەبەستەش پێنج هۆکاریان هێناوەتەوە کە دەتوانین بەمشێوەیەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە.[٥٣١]

(١)ئەگەر لە توانادا هەبێ لە چوارچێوەی وڵاتێکدا یاسا جێبەجێبکرێ، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەو وڵاتەدا دەسەڵاتێکی باڵا هەیە دەتوانێ یاساکە بە سەر خەڵکیدا

٥٣١ ـ لەم بەشەیاندا بەشێوەییێکی گشتی ئێمە پشت بە کتێبەکەی د. سەمیر عەبدولمونعیم (البعد الاخلاقي لقانون العلاقات الدولية) دەبەستین، چاپی یەکەم کتێبخانەی ئەلنەهزە ئەلمیسریە قاهیرە ساڵی ١٩٨٨.

بسەپێنێ، لە کاتێکدا لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا ئەو دەسەڵاتە باڵایە بوونی نییە تا بنەما نێودەوڵەتییەکان بە سەر وڵاتاندا بسەپێنێ.

(٢) دەبێ سێ مەرج لە بنەما یاساییەکاندا هەبێ کە ئەمانەی خوارەوەن:

(أ) دەسەڵاتێکی یاسادانان، کە یاساکان دابڕێژێ.

(ب) دەسەڵاتێکی دادوەری جێبەجێکردنی ئەو یاسایانە لە ئەستۆی خۆی بگرێ.

(ج) دەسەڵاتێکی جێبەجێکردن، کە هێزی ئەوەی هەبێ سزای ئەو کەسانە بدات، کە یاساکان پێشێل دەکەن.

ئەم سێ دەسەڵاتەش لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بوونیان نییە، ئەگەر چی لەناو چوارچێوەی دەوڵەتێکدا بوونی هەیە.[٥٣٢]

(٣) لەوانەیە گرنگترین هۆکار ئەوەبێ، کە یاسای نێودەوڵەتی سیفەتی بە زۆر سەپاندنی نییە و بە روونی ئەو رەگەزی سزادانەی تێدا نییە، کە بتوانێ ئەندامەکانی خۆی ناچار بکات رێز لە یاساکان بگرن.[٥٣٣]

(٤) هەمان ئەو بەرپرسیارێتییەی، کە دەکەوێتە سەر سەرپێچیکارێك لە ناو چوارچێوەی وڵاتێکدا ناکەوێتە سەر سەرپێچیکارێکی نێودەوڵەتی لەکاتی پێشێلکردنی یاسا نێودەوڵەتییەکاندا.

(٥) لە کۆتاییدا یاسا ناوخۆییەکانی ناو کۆمەڵگە لەکاتی جێبەجێکردنیدا سیفەتێکی گشتی هەیە، لە کاتێکدا ئەوانەی یاسا نێودەوڵەتییەکانیان بە سەردا جێبەجێ دەکرێ ژمارەیان دیاریکراوە.

لەوانەیە دیارترین لایەنگرانی ئەم لایەنە یاساناسی ئینگلیزی بە ناوبانگ (جۆن ئۆستن) (John Austin 1790 -1859) بێ، کە نوسینەکانی کاریگەرییێکی قووڵیان لەسەر لێکۆڵینەوە یاساییەکاندا هەبوو لە ئینگلتەرادا.[٥٣٤] ئەو لەو باوەڕەدا بوو، کە یاسا هەر دەبێ

---

٥٣٢ ـ د. حامید سولتان (القانون الدولي العام في وقت السلم) لـ١٥ـ.

٥٣٣ ـ د. جەعفەر عەبدولسەلام (مبادىء القانون الدولي) چاپی دووەم، دار ئەلنەهزە ئەلمیسریە قاهیرە ساڵی ١٩٨٦.

٥٣٤ ـ جۆن ئۆستن لە ساڵی ١٨٢٦دا لە کاتی دامەزراندنی کۆلیجی زانکۆ Universty College ی سەر بە زانکۆی لەندەن (کورسی) یاساناسی وەرگرت، بەڵام لە ساڵی ١٨٣٢دا لە ناخی خۆیدا هەستی بە دارمانێك دەکرد و بە هۆیەوە دەستی لە کار کێشایەوە، چونکە نەیتوانیبوو سەرنجی قوتابییەکانی بەلای خۆیدا ڕابکێشێ. دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٦دا بووە نوێنەری حکومەتی بەریتانیا بۆ کارو بارەکانی ماڵتا. دوای ئەوە بۆ ماوەیێك ڕۆیشتە پاریس. لەدوای ئەوەدا بۆ تەواو کردنی لێکۆڵینەوە یاساییەکانی خۆی گەڕایەوە بەریتانیا. یەکێك لە کێشە هەرە گەورەکانی ئەو پیاوە، کێشەی لە یەك جیاکردنەوەی نێوان ئەخلاق و یاسای وەزعی

جێبەجێ بکرێ و بۆ ئەوەی جێبەجێش بکرێ دەبێ بنەماکانی ئەو یاسایە لە دەسەڵاتێکی بە هێزەوە دەرچووبێ و بتوانێ سزای ئەو کەسانە بدات، کە سەرپێچی بەندەکانی ئەو یاسایە دەکەن و لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی نێودوڵەتی ئەو دەسەڵاتە سیاسیەی نییە، کە لە سەرووی دەسەڵاتی وڵاتەکانەوە بێ و توانای ئەوەی هەبێ ئەندامەکانی خۆی ناچار بکات مل بۆ ئەو بنەما یاساییانە کەچ بکەن، کە دایدەرێژێ و ئەو کەسە سزا بدات، کە سەرپێچی ئەو یاسایانە دەکات. هەر لەبەرئەم هۆکارانەشە، کە یاسا نێودەوڵەتییەکان سیفەتی بە زۆر سەپاندیان نییە، بە ماناییێکی وردتر هەر لەبەرئەمەشە، کە بە یاسایی ئەژمار ناکرێ، بەڵکو کۆمەڵێك بنەمان، کە مۆرکی ئەخلاق بە سەریاندا زاڵە. تەنانەت ئەگەر ئەخلاقێکی نێودەوڵەتیش بێ International Morality.

زۆر لە یاساناسەکان لە تیۆرەکانی خۆیاندا پشتگیری خۆیان بۆ ئەم لایەنە دەربڕی، کە لەبارەی سروشتی یاساکانەوە دایانڕشتبوو،، کە تیایدا جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە رەگەزی ناچارکردن، یان بە زۆر سەپاندن کرۆکی بنەما یاساییەکانە، گەیشتنە ئەو باوەڕەی، کە دەوڵەت تاکە سەرچاوەی یاسایە و هەر بنەماییێکیش لە دەرەوەی ئەو بازنەیە دەربچێ هیچ سروشتێکی یاسایی لە خۆی ناگرێ، لەبەرئەوەی ئەو دەسەڵاتەی کە حکومەت هەیێتی تاکە عەنباری (مستودع) هێزی بە زۆر ناچارکردنە کۆمەڵایەتییەکانە و مافی بە زۆر ناچارکردنیش بەشێوەییێکی رەها لە دەستی ئەودایە.[٥٣٥]

## سێیەم: رەخنەکانی سەر ئەم لایەنە:

ئەو لایەنەی پێشوو لەلایەن هەندێك لەو یاساناسە نێودەوڵەتیانەوە، کە پشتگیری هەبوونی یاسای نێودەوڵەتیان دەکرد رووبەڕووی چەندین رەخنەی جۆراوجۆر بوونەوە و سیفەتێکی یاسایی شەرعییان پێیدا و لەو باوەڕەشدا بوون، کە لایەنی پێشوو، یان ئاراستەی پێشوو

---

بوو، یان لە یەك جیاکردنەوەی ئەخلاق و سیاسەت بوو وەك ئەوەی ئێمە دەیڵێین، جۆن تا ئەو کاتەی لە ژیاندا مابوو ئەو لە یەك جیاکردنەوەیە هیچ ناوبانگێکی دەرنەکرد، بەڵام لەدوای مردنیدا ئەو یاسایە کاریگەری وگرنگییێکی زۆری پەیدا کرد.

٥٣٥ ـ سەروەت ئەنیس ئەلئەسیوتی (مبادیء القانون) لـ ٢٠٨ـ لە د. سەمیر عەبدولمونعیم وەرگیراوە لەو کتێبەی کە پێشتر باسمان.

(ڕاستیە مێژووییە چەسپاوەکان و واقیعە ڕاستەقینەکەی ژیانی نێودەوڵەتیە).[536] لایەنگرانی لایەنی دووەم پشت بە کۆمەڵێك بەهانە دەبەستن وەك ئەوەی، کە لەخوارەوە کورتیان دەکەینەوە[537]:-

(١) ئەوەی لە مێژوودا شتێکی نەگۆڕە ئەوەیە، کە دیاردەی ئەو یاسایەی، کە دەبێ جێبەجێ بکرێ (القانون الملزم) لەپێش دیاردەی دەوڵەتدا بوونی هەبووە، چونکە زانا و مێژوونوسەکان ئەوەیان سەلماندووە، کە کۆمەڵگاکانی مرۆڤی سەرەتایی کۆن (یاسا)ی بە چەمکە ڕاستەکەی خۆی ناسیوە ئینجا چ لەبواری ریکخستنی رەفتاری تاکەکانی بێ لە ناوخۆدا، یان پێوەندیە دەرەکییەکانیان بێ لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تردا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە نەیاندەزانی دەوڵەت چیە. ئەمەش لەبەرئەوەیە، کە یاسا دەسکردی کۆمەڵ خۆیەتی بۆ رێکخستنی هەڵس و کەوتی تایبەتی تاکەکانی ناو کۆمەڵگاکەی خۆی، نەك پێوەندی بە دەوڵەتەوە هەبێ، چ لە دانانی بنەماکانیدا و چ لە سەپاندنی سزاکانیشیدا بە سەر ئەو کەسانەی، کە یاسا پێشێل دەکەن ـ هەروەها دەوڵەت خۆی قۆناغێکە لە قۆناغەکانی گەشەکردنی یاسا، لەوانەشە گرنگترین قۆناغەکانی ئەو گەشەکردنە بێ.

(٢) لایەنگرانی لایەنی پێشوو لەو باوەڕەدان، کە دەسەڵاتی یاسادانان تاکە سەرچاوەی یاسایە، بەو پێیەی، کە دەبێ لەلایەن دەسەڵاتێکی باڵاوە دەربچێ، کە خاوەن هێز بێ و لە کۆتاییدا رۆڵی داب و نەریت (پشتگوێ) دەخەن، کە سەرچاوەی سەرەکی بنەما یاساییەکانە لەهەرهەموو کۆمەڵگە مەدەنییە نوییەکاندا، لە کاتی ئێستادا هیچ دەوڵەتێك نییە دەسەڵاتی یاسادانان تیایدا تاکە سەرچاوەی یاسابێ، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگە کۆنەکان پێوەندییەکانی نێوان تاکەکانی خۆی لە ناوخۆدا و پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگەکانی تردا بە چەند بنەمایێکی یاسایی کە هەرهەمووی (داب و نەریت) بوو رێکدەخست.

(٣) ئەگەر ئێمە باوەڕ بە تیۆرەکەی (ئۆستن) و هاورێکانی بێنین، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ، کە دەبێ باوەڕمان بەوەش هەبێ، کە ژیانی مرۆڤایەتی لە پێش دروستبوونی دەوڵەتدا بوونی

---

٥٣٦ ـ د. سەمیر عەبدولمونعیم پشتگیری خۆی بۆ لایەنی دووەمیان دەربڕی، کە وای دەبینێ (لایەنی دووەم لەگەڵ ڕاستیە مێژووییەکاندا دەگونجێ). تەماشای کتێبەکەی پێشووتری لـ٢٧٠ـ و دوای ئەو بکە.

٥٣٧ ـ سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەرە.

نەبووە، چونکە ئەمن و ئاسایش و دڵنەوایی بۆ مرۆڤەکان نایەتەدی ئەگەر لە سایەی سێبەری یاساییێکی دادپەروەرانەی بە زۆر سەپێندراودا نەبێ کە رەفتارەکانیان رێکبخات ـ ئەمەش پێچەوانەی راستییەکانە!، چونکە دیاردەی دەوڵەت بەو چەمکە نوێیەی ئێستا هەیێتی لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەیەمی زاینی تێپەڕ ناکات. هەرچەندە لە چەند کۆمەڵگاییێکی کۆندا سەرو سیمای دەوڵەت بوونی هەبووە.

(٤) بۆ ماوەییێکی دوورو درێژ و نەوە دوای نەوە گەشەکردنی ژیانی مرۆڤایەتی لە ڕێڕەوەکەی خۆیدا بەردەوام بووە و یاسا کار پێکراوەکانیش لەگەڵ دروستبوونی کۆمەڵگاکانەوە لەگەڵیدا بەستراوەتەوە و سەپێندراوە، بە شێوەییێك، کە ناتواندرێ دیاردەی یاسا و دیاردەی کۆمەڵگە لە یەك جیا بکرێنەوە، لەبەرئەوەی یاسا دیاردەییێکی کۆمەڵایەتییە هەر لەگەڵ دروستبوونی کۆمەڵگەدا ئەویش دروست دەبێ و هێزی خۆی لەو ویژدانە بە کۆمەڵەی تاکەکان وەردەگرێ.

(٥) ئەوەی (ئۆستن) و هاوڕێکانی پشتی پێ دەبەستن ئەوەیە، کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەسەڵاتێکی سیاسی خاوەن هێزێکی ئەوتۆی نییە، کە بتوانێ سزا بەسەر ئەوانەدا بسەپێنێ، کە بنەما نێودەوڵەتییەکان پێشێل دەکەن، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ، کە ئەو بنەمایانە سیفەتێکی یاساییان نییە، ئەمەشیان گریمانەییێکی هەڵەیە، چونکە رەگەزی سزادان ئەگەرچی یەکێکە لە گرنگترین رەگەزەکانی یاسا، بەڵام مەرج نییە تەنها دەسەڵاتێکی دیاریکراو ئەنجامی بدا، بەڵکو دەکرێ کاری مۆرکردنی سزاکە بە چەند دەزگاییێکی تایبەت بەو کارە بسپێردرێ، کە مەرجی بوونی هێزیان تێدا نییە، ئەگەر بێت و بارودۆخە باوەکەی نێو وڵاتە نوێییەکان، بەلەبەر چاوگرتنی هەندێك ئیعتباراتی واقیعیش، کە پەیوەستە بە پێویستیە تایبەتمەندییەکان و دابەشکردنی کارەوە، ئەوەیە کە دەسەڵاتێکی دیاریکراو سزادانەکە جێبەجێ بکات، بەڵام ئەو جۆرە ئیعتبارانە هیچ پێوەندییێکی بە سروشتی خودی بنەمای یاساکەوە نییە.

لە کۆتاییدا ئەو تیمە دوای ئەوەی پێکهاتەی بنەما یاساییەکان و سەپاندنی ئەو بنەمایانەیان لە یەك جیا کردەوە، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە بڵێن رەگەزی سزادان مانای ئەوە نییە کە هەر دەبێ پەیوەست بێ بە پێکهاتەی بنەما یاساییەکانەوە، بۆیە بڕیاریان دا، کە رەگەزی سزادان لەناو رەگەزەکانی تایبەت بە پێکهاتەی بنەما یاساییەکاندا بوونی نییە، بەڵکو مەرجێکە لەو مەرجانەی، کە دەبێ بوونی هەبێ بۆ ئەوەی بە باشی جێبەجێبکرێ دوای ئەوەی بنەما یاساییەکە دروست دەبێ و پێکدێ وەك بوونی کۆدەنگییێکی باش.

بەڵام تیمێك لەو تیمانە پێی وایە، کە یاسای نێودەوڵەتی دەبێ بە زۆر بسەپێندرێ و لابردنی سزاکانیش دەبێتە هۆی داماڵینی بنەما نێودەوڵەتییەکان لە وەسفی ڕێڕەوە پراکتیکیەکەی خۆی، هەروەها لە جەوهەرەکەی خۆشی دادەماڵدرێ وەك بنەماییێکی بە زۆر سەپێندراو و تایبەت، واقیعە کردەییەکانیش ئەوەیان سەلماندووە، کە یاسای نێودەوڵەتی سزاو پاداشتی خۆی هەیە، ئەگەرچی بە شێوەییێکی بەردەوام نییە وەك ئەوەی لە سزاو پاداشتەکانی یاسای ناوەخۆدا هەییێتی لەناو دەوڵەتێکدا، چونکە مەرج نییە دەسەڵاتێکی دیاریکراو هەبێ بۆ جێبەجێ کردنیان، ئەو سزاو پاداشتانەش لەگەڵ پێکهاتەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا دەگونجێ و ڕێزگرتنی بنەماکانیشی دەستەبەر دەکات ـ وەك ئەوەی لە دەقی دەستوورەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە تایبەتی و گشتییەکاندا هاتووە ـ هەروەها ئێستا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی سزادانی کەتن و ئەدەبی و داراییەکان و تەمێکارییەکان پەیڕەو دەکات. وەك پێشتریش سزادانی بە کۆمەڵ لەلایەن هەر هەموو وڵاتانی جیهانەوە بەسەر ئەو دەوڵەتەدا سەپاندووە، کە هەر بنەما نێودەوڵەتییێکی پێشێل کردبێ، یان لەکەداری کردبێ، ئینجا ئەو سزادانە سیاسی، یان ئابوری، یان شێوازی سەربازی بووبێ. وەك ئەو پێکهاتنەی لەنێوان دەوڵەتە ئەوروپییەکاندا روویدا کە هەڵوێستێکی بە کۆمەڵیان لە بەرامبەر لویسی چواردەم و ناپلیۆن وەرگرت بۆ ئەوەی دەستدرێژییەکانیان لەدژی وڵاتانی تردا ڕاگرن و ناچاریان بکەن ڕێز لەو مافانە بگرن کە لە بنەمای یاسا نێودەوڵەتییەکاندا هاتووە. هەروەها ئەو یەکگرتنەی کە لەنێوان وڵاتە سوێندخۆرەکاندا روویدا دژی ئەڵمانیا لە هەردوو شەڕی جیهانی یەکەم و دووەمدا و ئەوەی ئێستاش لەلایەن زۆربەی وڵاتانەوە لەدژی باشوری ئەفریقیادا ڕوودەدا، کە جیاوازی ڕەگەزی پیادە دەکات لەدژی ڕەشپێستەکان، کە یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ، کە لە بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتیدا هاتووە پارێزگاری لێ بکرێ..

ئەمەش مانای ئەوەیە ئەگەر بێت و سزادان لە بنەمای یاساییدا ڕەگەزێکی پێویست بێت، کەواتە پێویست بەوە ناکات تەنها یەك دەسەڵاتی دیاریکراو ئەنجامی بدا، بەڵکو دەکرێ هەر دەزگاییێکی تایبەت ئەو کارە ئەنجامبدات. ئەگەر ئەو دەزگایەی تایبەتە بەو کارە نەیتوانی ئەو سزایە جێبەجێ بکات، وەك ئەنجومەنی ئاسایش لە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، یان دەکرێ خودی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی خۆی بەرامبەر بەهەر کردەوەییێك، کە لە دەرەوەی یاسادا بێت پێی هەڵسێ. [٥٣٨]

---

٥٣٨ ـ د. محەمەد حافیز غانم (مبادیء القانون الدولي العام) لــ٨٨ــ، (لە د. سەمیر عەبدولمونعیم، ئەو کتێبەی کە پێشتر باسمان کرد وەرگیراوە).

## چوارەم: دوا گفتوگۆ: .

ئێمە نامانەوێ لەم گفتوگۆیەدا درێژ دادڕی بکەین و ناشمانەوێ بچینە ناو هیچ کێشەیێکی یاساییەوە لەبارەی یاسای نێودەوڵەتی، چونکە ئەو کێشەیەی، کە لەو پرسیارەدا چارەسەری دەکەین: ئایا دەکرێ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئەو چەمکە ئەخلاقیانەی، کە هەندێك جار لە پێوەندیە نێودەوڵەتییەکاندا هەیە: وەك خۆشەویستی و دادپەروەری و ئاشتی و ئاسایش و هاوکاری و دڵنەوایی و...هتد، کە وەك نموونەی باڵا چاوەڕوانی بەدیهاتنن، بگۆڕدرێن و بکرێنە چەند یاسایێك و پێوەندییەکانی نێوان وڵاتانی جیهانی پێ رێکبخرێ؟. ئایا دەکرێ ئەخلاق خۆی بگۆڕێ و ببێتە سیاسەت و لە پێوەندیە نێودەوڵەتییەکانیشدا (ئەرك) خۆی بگۆڕێ و ببێتە ماف وکۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش هەمان ئەو کارە بکات، کە یەك دەوڵەت دەیکات و چەند یاسایێك بەرێوەی دەبات و هاوڵاتیان لە سەرۆکەوە تا پیاوانی سەر شەقام ناچار بکات ملکەچی یاساکان بن و هەر کەسێکیش پێشێلی بکات سزایێکی توند و دادپەروەرانەی بدرێ کە هەر یاساکە خۆی سزاکە دیاری دەکات؟!.

وەك دەیبینین یاساناسەکان بوونەتە دوو تیم، یەکەمیان گومانیان لە بەدیهاتنیدا هەیە و وای دەبینن، کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هەر وا دەمێنێتەوە و ملکەچی چەمکە ئەخلاقییەکان دەبێ و ناتوانرێ ئەو چەمکانە بکرێنە چەند یاسایێکی بە زۆر سەپێندراو. ئەمەش لەبەرئەوەیە، کە دەسەڵاتێکی جێبەجێکردن بۆ ئەو یاسایە بوونی نییە تا بتوانێ سزاکان بەسەر سەرپێچیکارەکاندا بسەپێنێ، وەك ئەوەی (جۆن ئۆستن) و هاوڕێکانی بۆی چووبوون. لە کاتێکدا تیمێکی تر ئەو بیروڕایە رەتدەکەنەوە و پێیان وایە کە (ئەمە پێچەوانەی راستییە مێژوویە چەسپاوەکان، واقیعە راستیەکەی ژیانی نێودەوڵەتیە).[539] ـ بەو پێیەش بە رای تیمی دووەم ـ دەکرێ ئەخلاق بگۆڕێ و ببێتە سیاسەت و ئەرکەکانیش ببنە ماف و ئەو چەمکانەی، کە لە بنچینەدا ئەخلاقین بگۆڕدرێن و بکرێنە چەند یاسایێك و بەبێ جیاوازی بەسەر هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بسەپێندرێن. ئەو تیمە کۆمەڵێك بەهانە دەهێننەوە، کە بە رای ئێمە ئەو بەهانانە زۆر لەرزۆکن، بەڵام ئەوان وای دەبینن کە زۆر بەهێزن و پاڵپشتی

---

٥٣٩ ـ بە کتێبەکەی سەمیر عەبدولمونعیم (البعد الاخلاقي لقانون العلاقات الدولية) دا بچۆوە چاپی یەکەم کتێبخانەی نەهزەی میسری لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٨.لــ٢٧٠ــ.

ئەو بۆچوونانە دەکەن و تیۆرەکەی (ئۆستن و هاوڕێکانی) رەت دەکەنەوە ـ بەڵام لە راستیدا ئەو بەهانانە خۆیان لەبەردەم رەخنە ووردەکاندا ناگرن: ـ

ئەوەی روونە تیمی دووەم لەو باوەڕەدایە، کە دەکرێ لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا ئەخلاق بگۆڕدرێ و بکرێتە سیاسەت و بە زۆری گفتوگۆکانی خۆیان لەبارەی سەرچاوەکانی یاسا چڕ دەکەنەوە و لە بەهانەی یەکەمدا وای دەبینن کە (یاسای بە زۆر سەپێندراو) لە پێش دروستبوونی دەوڵەتدا بوونی هەبووە، چونکە دەسکردی کۆمەڵە، ئینجا ئەو کۆمەڵە هەر کۆمەڵێك بێت. هەر بەمشێوەیەش کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەتوانێ بە بێ بوونی مەرجەکانی دەسەڵاتی یاسادانان بۆ داڕشتنی یاسا و بوونی حکومەتێك بۆ جێبەجێکردنی، یاساکان دابڕێژێ. ئەوەی راستی بێ ئەو بەهانەیە لەلایێك گومان لە دروستی بەهانەکەدا هەیە، لەلایێکی تریشدا ئەو لە بابەتەکە دەچێتە دەرەوە. ئەو گوتەیەی کە دەوترێ کۆمەڵە سەرەتاییەکانی مرۆڤ یاسایان بە (چەمکە دروستەکەی خۆی) ناسیوە، شتێکە ناگاتە ئاستی راستییە مێژووییەکان، ئەوەی کەنەگۆڕە ئەوەیە، کە کۆمەڵە سەرەتاییەکانی مرۆڤ ئەو داب و داب و نەریتانە بەرێوەی دەبردن، کە لەگەڵ چەمکە ئەخلاقی و ئایینییەکاندا تێکەڵ بە یەك ببوو، کە هەندێك شت و کرداری دیاریکراوی حەرام دەکرد و هەندێکیشی حەڵاڵ دەکرد. ئینجا یاساش بە (چەمکە دروستەکەیەوە) تەنها لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتدا دەرکەوت، بەڵام با لەوە بگەڕێین، کە یاسا کەی دەرکەوتووە، تەنانەت ئەگەر واشی دابنێین، کە یاسا لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکانیشدا هەبووە، ئەمە مانای ئەوە نییە کە دەبێ لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیشدا دەبێ هەبێ. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە جیاوازی ناکۆکییێکی جۆری ورد لە نێوان هەردوو حاڵەتەکەدا بوونی هەیە لەوانەیە لەهەر هەمووی گرنگتر بوونی دەسەڵاتێکی جێبەجێکردن بێ، کە سزای سەرپێچیکاران بدات، لەوانەیە ئەویش دەسەڵاتی سەرۆکی خێڵەکە بێ، یان یەکێکی تر، کە لە ئاستی پلەکەی ئەودا بێ.

هەمان شتیش لەبارەی بەهانەکەی دووەم بڵێ، کە بۆچوونی وایە یاسادانان (التشریع) تاکە سەرچاوەی یاسا نییە، ئەگەر ئەمە وابێ کەواتە ئێمە (دان بەوەدا نانێین کە دابیش) یەکێکە لە سەرچاوەکانی یاسا. هەروەها ئەمە بەهانەییێکیشە زۆر لە کاکڵەی بابەتەکەوە دوورکەوتۆتەوە، چونکە تا ئێستاش باس لە (سەرچاوە) دەکات. هەرچەندە کەس حاشا لە گرنگی داب ناکات وەك سەرچاوەییێکی یاسا، بەڵام ئەمە پێویست بە بوونی دەسەڵاتێك ناکات، کە یاسای نێودەوڵەتی دابڕێژێ، یا پشت بەهەر سەرچاوەیێك ببەستێ بۆ ئەو داڕشتنە.

هەرچی ژیانی مرۆڤایەتیشە کە لە پێش بوونی دەوڵەتدا ئەو بوونی هەبووە، ئەمە کەس ناتوانێ رەتیبکاتەوە، ئەگەرچی رێکخستنی سیاسی ئەو ژیانە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا زۆر جیاوازتر بووە، لەبەرئەوەی پشتی بە کۆمەڵێك چەمکی ئەخلاقی و ئاینی دەبەست، کە هێشتا نەکرابوونە یاسا. لێرەدا و لە پێش دروستبوونی دەوڵەتدا کۆمەڵگاکان دەسەڵاتێکی ئەخلاقی تەم و مژاوی بەڕێوەی دەبرد، چونکە هێشتا هیچ یاسایێك بە مانا وردەکەی خۆی، دروست نەببوو و دانەڕێژرابوو، ریکخستنی سیاسی کۆمەڵگاکانیش بەو مانایەی، کە هەیە دەرنەکەوتبوو تەنها لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتدا دەرکەوت.

لەلاییێکی ترەوە ئەمەشیان راست نییە، کە دەڵێن (دیاردەی دەوڵەت بەو چەمکەی ئێستا هەیێتی لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەمەوە تێپەڕ ناکات)، چونکە ئەوەی لە سەدەی شازدەم و سەدەکانی دوای ئەودا روویاندا هاوشێوەی ئەو دەوڵەتانەیە، کە لەبەرە بەیانی مێژووەوە بەوانەی پێش زاینیشەوە دەرکەوتوون، کە ئەو کاتە بە درێژایی سەردەمە مێژووییە جۆربەجۆرەکان دروست بوون و وردە وردە گەشەیان دەکرد: دەوڵەتی فیرعەونەکان بەو سیستەم و رێکخستنە ناوخۆییەی، کە پێی ناسراوە دەرکەوت، هەروەها دەوڵەت لە چین و هیندستان و دەوڵەتی فارسی و دەوڵەتە شارەکان لە یۆناندا، کە ئەفلاتون و ئەرستۆ پێیان شتێکی باش بوو دەرکەوت. ئینجا دەوڵەتی رۆمانی، کە چەندین یاسای لە ژمار نەهاتووی تێدا دەرکەوت ئەو یاسایانەی (جۆستنیان) ی یەکەم (٤٨٣ ـ ٥٦٥)م لە ئینیستیتۆ بە ناوبانگەکەی خۆی و لەو کتێبەی بە (پەندکت، (Pandectes)[٥٤٠] ناسراوە تۆمار کرد، کە تا ئێستاش بە سەرچاوەییێکی یاسایی گرنگ دەژمێردرێ، یاساناسەکان تا ئەمڕۆش سوودی لێ وەردەگرن.

---

٥٤٠ ـ لە ساڵی ٥٢٨ز ئیمپراتۆر (جۆستنیانی یەکەم) (١٠)دە یاساناسی رۆمانی دامەزراند، بۆ ئەوەی یاساکانی دەوڵەت رێکبخەن. ئەمانە کۆمەڵێك یاساناس بوون، کە ناویان لێ نابوون (دەستەی (١٠) دە کەسەکە). ئەم دەستەیە توانی بیروڕای یاساناسەکانی ڕۆمانی لەیەك کۆمەڵەدا کۆ بکاتەوە و بە باشیشی زانی ئەو بیروڕایانە هێزی یاسایان هەبێ. ئەم بیروڕایانە لە ساڵی ٥٥٣دا لە نووسراوێکدا بە ناوی ئەنستیتۆی جۆستنیان Institutes De Justinien لەبارەی یاسا بڵاو کرایەوە. مامۆستا عەبدولعەزیز وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و دار ئەلکاتب ئەلعەرەبی لە ساڵی ١٩٤٦دا لە قاهیرە بڵاوی کردۆتەوە. هەروەها جۆستنیان کۆمەڵێك بەندی یاساکانی ڕۆمانی و لەگەڵ بنەماکانیدا، کە لە کتێبی یاساناسە کۆنەکانی ڕۆمانیدا وەری

ـ لێرەدا چەند نموونەیێکی گێرەشێوێنیان هەڵهێنجاوە، کە بەرگریکردنە لە بەرژەوەندییە زیندووەکانی وڵاتان، لەگەڵ سەپاندنی یاسای نێودەوڵەتی تێکەڵ بە یەك دەکەن. یەکگرتنەوەی وڵاتانی ئەوروپا و هەڵوێست وەرگرتنیان دژی لویسی چواردەم و ناپلیۆن، لەم کارەیاندا مەبەست لە سەپاندنی یاسا نێودەوڵەتییەکان نەبووە، بەڵکو بەرگریکردن بووە لە بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی ئەو وڵاتانە، سەرەڕای ئەمەش ئەو یەکگرتنەوەیەی، کە لەنێوان وڵاتانی ئەروپادا روویدا، ئەو کۆمەڵگە نێودەوڵەتیە پێکناهێنن، کە بتوانێ چەند یاسایێك دابڕێژێ و هەموو وڵاتانی جیهان ناچار بکات ئەو یاسایانە جێبەجێی بکەن. هەمان شتیش لەبارەی هەڵوێستی ئەو هاوپەیمانانە بڵێ، کە لەدژی ئەڵمانیادا وەریان گرت ـ لە هەردوو جەنگە جیهانییەکەی یەکەم و دووەمدا. لێرەدا ئەمە هاوپەیمانییێکە لەدژی ئەو مەترسیانەی هەڕەشە لەو وڵاتانە دەکات، هەر لەبەر ئەمەشە ناتوانین ئەم هەڵوێستانە وەك نموونەیێك بۆ سەپاندنی یاسا نێودەوڵەتییەکان بێنینەوە.

ـ ئەمە راستە، کە وڵاتان هەوڵدەدەن ئاشتی و پێکەوەژیان لەنێوانی خۆیاندا بەدی بێنن ـ ئێستاش هەر لەو هەڵانەیاندا بەردەوامن ـ و لە ئەنجامی کاولکارییەکانی جەنگی جیهانی یەکەمدا (کۆمەڵەی نەتەوەکان) پێکهێندرا و لە ١٣ی فێبرایەری ساڵی ١٩١٩شدا بەڵگەنامەی (میثاق) کۆمەڵەکە دەرچوو و وا پێدەچوو کەوا خەریکە خەونەکانی مرۆڤ بێتە دی، بەڵام تەنها بە خوێندنەوەی پێشەکی بەڵگەنامەکە یەکسەر ناوەڕۆکە ئەخلاقیەکەیت بۆ دەردەکەوێ، چونکە لەم پێشەکیەدا هاتووە دەڵێ:

(ئەو لایەنانەی کە لەم گرێبەستەدا بۆ پەرەپێدانی هاوکاری لەنێوان نەتەوەکان و بەدیهێنانی ئاشتی و پێکەوەژیان لە نێوانیاندا بەشدارن، وایان بە باش زانی، کە رەزامەندی خۆیان لەسەر هەندێك لەو داواکاریانەی کە داوا دەکەن، پەنا نەبردرێتە بەر جەنگ نیشان بدەن و کار بۆ ئەوە بکەن، کە پێوەندییێکی راشکاوانە لەنێوان وڵاتەکاندا دروست بکەن، کە بنچینەکەی دادپەروەری و شەرەف بێ و دادپەروەری بپارێزن و بە دڵێکی پاکەوە رێز لەو ئیلتزاماتانە بگرن، کە لە پەیمانەکەدا هاتووە..). دەتوانی خۆت سەرنجی ئەو پێشەکیە بدەیت و بزانە چۆن بە چەمکێکی ئەخلاقیانە رازاوەتەوە، کە باس لە (ئیلتزام) و (رێزگرتن) و

---

گرتبوو لە کتێبێکدا بە ناوی (پەندکێت Pandectes) کە مانای ئینسکلۆپیدیای پێویست )ە، یان (دیجێست Digest) ومانای (هەڵبژاردە)یە بڵاو کردەوە .

(راشکاوانه) و (نیازپاکی) و (دادپەروەری) و (شەرەف)... هتد دەکات. دەبێ ئەوە بزانیت کە هەر هەموو ئەمانە لەسەر ویست و ئارەزووی ئەو وڵاتە وەستاوە، کە ئەندامە لە کۆمەڵەکەدا، چونکە ئەو لەهەر کاتێکدا دەتوانێ خۆی لێیان بدزێتەوە. ئەمانەش لە ساڵی ١٩١٩ەوە تا ساڵی ١٩٣٦ بە کردەوە روویانداوە. بێگومان ئەمەش هەر لەو ماوەیەدا بوو، کە کۆمەڵەی نەتەوەکان تیایدا بوونی هەبوو، لە کۆی ٢١ بیست و یەك دەوڵەت ١٦ شانزە وڵاتیان خۆی لێ کێشایەوە، بۆ نموونە تەنانەت ئەو کۆمەڵەیە نەیتوانی رێگە لە یەك دەوڵەتێکی وەك ئیتالیا بگرێت، کە ئەندام بوو لەو کۆمەڵەیەدا، کاتێك کە لە ساڵی ١٩٣٦دا دەستی بەسەر وڵاتێکی تری وەك حەبەشەدا گرت، کە ئەندامی هەمان کۆمەڵە بوو. یان، کە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٨دا نەمسای داگیر کرد. ئینجا لە ٢٦ی یۆنیۆی ١٩٤٥دا نەتەوە یەکگرتووەکان بە خۆی و میساقە نوێیەکەیەوە دەرکەوت. هەروەها ئەنجومەنی ئاسایشیش دەرکەوت، کە کاری سەرەکی ئەو کارکردن بوو بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی، کە نیازیان وابوو لە جیاتی (پۆلیسی نێودەوڵەتی) بێ و ئاشتییێکی بەردەوام بە سەر هەمو ئەندامەکانیدا بسەپێنێ: باشە با بزانین دوایی چی روویدا..؟

گەشەکردنێکی زۆر گەورە لە تەکنەلۆجیای سەربازی و شێوازەکانی کاولکاری روویاندا ـ کە بە هاویشتنە خوارەوەی بۆمبی ئەتۆمی بۆ سەر هیرۆشیما و ناکازاکی دەستی پێکرد، دوای ئەوە بەلای مووشەکە کیشوەر بڕەکاندا گەشەی کرد، دوای ئەوەش مانگە دەسکردەکانیان دروست کرد، کە ئامانجی سەربازی و سیخوڕی لە پشتەوە بوو و...هتد. کە ئەمە گەشەکردنێك بوو هەڕەشەی لە لەناوبردنی تێکڕای مرۆڤایەتی دەکرد. ئەو کاتەی ململانێکانی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت توند ببوو لەوانەیە هەر ئەو لەناوبردنە بووە تاکە هۆکارێك، کە جەنگی جیهانی سێیەم روونەدات.

ئەگەربێت و شەڕی ناوەکی ئەگەرێکی دووربێ لەبەرئەوەی کاولکارییێکی سەرتاسەری لێدەکەوێتەوە، بەڵام دەرگای بۆ شەڕە خۆجێیەتییەکان خستۆتە سەر پشت. لێرەدا بە چەند نموونەیێکی کەم واز دێنین وەك ئەو نموونانەی کە بە بەر چاوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی ئاسایشەوە، یان هەندێك جاریش لەژێر چاودێری ئەواندا روودەدەن. نموونەی ئەمانەش:

شەری کۆریا، کە لە یۆلیۆی ساڵی ١٩٥٣دا کۆتایی پێهات و شەڕی هیندی چینی کە لە ئەپریلی ساڵی ١٩٧٥دا کۆتایی هات و شەڕی نێوان هیند و پاکستان لە دیسەمبەری

١٩٧١. ئینجا له كۆتاییدا زنجیره شه‌ڕه‌كانی نێوان عه‌ره‌ب و ئیسرائیل، كه له ساڵی ١٩٤٨ه‌وه تا ئۆكتۆبه‌ری ساڵی ١٩٧٣ به‌رده‌وام بوو. ئه‌مه‌ش نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه، كه ئاشتی به شێوه‌یێكی گشتی به ده‌ست ویست و ئاره‌زووی ئه‌و وڵاتانه‌یه، كه هیچ شتێك ڕێگه‌یان پێناگرێ. ئه‌مه ڕاسته، كه هه‌ر هه‌موو لاییێك به زمانێكی زۆر ناسك و شیرین باسی ئاشتی و ئه‌خلاق و خۆشه‌ویستی و پێكه‌وه‌ژیان و ویژدان و به‌هاكان و...هتد ده‌كه‌ن، به‌ڵام ته‌نها قسه‌یه و هیچی تر، له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا وه‌ك هیگڵ ده‌ڵێ: (ده‌بێ هێزێك هه‌بێ پشتگیری له بنه‌ماكان بكات، به‌ڵام له‌به‌رئه‌وه‌ی هێزێك نییه بڕیار بدات و ڕاستییه‌كان له ڕووی مه‌بده‌ئه‌وه ڕووبه‌ڕووی وڵاته‌كان بكاته‌وه و بڕیاره‌كه جێبه‌جێ بكات، ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌ی لێ ده‌كه‌وێته‌وه، كه پێوه‌ندیه نێوده‌وڵه‌تییه‌كان له قۆناغی (به ئه‌رك بوون) تێنه‌په‌ڕیوه، چونكه پێوه‌ندییه‌كانی نێوان وڵاتان پێوه‌ندییێكه له‌نێوان چه‌ند قه‌واره‌یێكی سه‌ربه‌خۆ، كه گرێبه‌ستی هاوبه‌رامبه‌ر (متبادل) مۆر ده‌كه‌ن، به‌ڵام له‌هه‌مان كاتدا ئه‌وان خۆیان له‌و گرێبه‌ستانه باڵا ترن..).[٥٤١]

لێره‌دا ده‌گه‌ینه كاكڵه‌ی ڕاستییه‌كانی ئه‌و كێشه‌یه، ئه‌ویش سه‌پاندنی یاسا نێوده‌وڵه‌تییه‌كانه و به ووردی جێبه‌جێكردنییێتی، ئه‌مه‌ش پێویستی به هێزێك ده‌بێ بۆ ئه‌وه‌ی هه‌ركه‌سێك یاساكه پێشێل بكات، یان له به‌نده‌كانی لابدات سزای به‌سه‌ردا بسه‌پێنێ، به بێ ئه‌وه‌ی كه‌س لێی به ده‌ر بێ، ئینجا ئه‌و ده‌سه‌ڵاته هه‌ر كه‌سێك بێت.

ئه‌وه‌ی ڕاستی بێ به هه‌ند هه‌ڵنه‌گرتنی به‌هاكانی سزادان بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی یاسا نێوده‌وڵه‌تییه‌كان پێشێل ده‌كه‌ن یاساكه له بن و بۆتكه‌وه هه‌ڵده‌ته‌كێنێ، له‌مه‌شدا مه‌رجی بنچینه‌یی ئه‌وه‌یه یاساكه به‌سه‌ر هه‌ر هه‌موو وڵاته‌كاندا بسه‌پێندرێ له گه‌وره‌وه تا بچووك بێ جیاوازی. ئێمه حاشا له‌وه ناكه‌ین، كه ڕێكخراوه‌كانی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان هه‌ڵوێستی نایابی به‌دی هێناوه به تایبه‌تی دادگای دادی نێوده‌وڵه‌تی بۆ كۆتایی پێهێنانی ئه‌و ناكۆكیانه‌ی، كه له‌نێوان وڵاتاندا له‌سه‌ر سنوور و شتگه‌لێكی تر دروست ده‌بن. هه‌روه‌ها هه‌ڵوێستی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان له ئابی ساڵی ١٩٩٠دا كه عێراق كوێتی داگیر كرد. هه‌ر چه‌نده ئه‌مه ئه‌وه‌مان له بیر ناباته‌وه كه به‌رژه‌وه‌ندییه‌كانی ئه‌مریكا و به‌رگری لێكردنی له‌به‌ر چاو نه‌گرین.

---

٥٤١ ـ هیگڵ (اصول فلسفة الحق) وه‌رگێڕانی د. ئیمام عه‌بدولفه‌تاح ئیمام ـ كتێبخانه‌ی مه‌دبولی له قاهیره ساڵی ١٩٩٦.

وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، پێویست بەوە ناکات، کەس لە دەرەوەی سەپاندنی ئەو یاسایەدا بێ، ڕێك وەك ئەوەی لە یاساکانی ناو وڵاتێکدا ڕوودەدەن، چونکە ئەگەر ئێمە ڕێگەمان بە دەوڵەمەندەکان، یان گەورەی قەومەکە، یان خاوەن دەسەڵاتەکان دا یاساکان پێشێل بکەن، ئێمە بەم کارەمان ئەو یاسایە دەقاودەق لەناو دەبەین. ئەگەر ئێمە تەماشایێکی یاسا نێودەوڵەتییەکان بکەین، دەبینین واقیعە پراکتیکییە کە زۆر بە توندی، سەپاندنی تەواو و گشتگیری یاساکان بە سەر هەموو ئەندامانی ئەو خێزانە نێودەوڵەتیەدا ڕەتدەکاتەوە، چونکە بۆ نموونە پێنج دەوڵەتە گەورەکە ئەگەر بڕیارێك لە بەرژەوەندی خۆیان، یان لە بەرژەوەندی ئەوانەدا نەبێ، کە خۆیان بەرگری لێدەکەن مافی (ڤیتۆ) بەکار دەهێنن، دیارترین نموونەش لەسەر ئەمە، کە چاو هەڵەی تێدا نەکات ئەو هەڵوێستەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە بە شێوەیێکی تایبەتی بەرامبەر بە ئیسرائیل و بە شێوەیێکی گشتیش بەرامبەر کێشەی فەلەستینە، چونکە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ماوەی نیو سەدەدا چەندین بڕیاری دەرکردووە و زۆربەی هەرە زۆریشی لەدژی ئیسرائیلدا بوو، بەڵام هیچ کامێکیان جێبەجێنەکراون و وەك حیبری سەر کاغەز ماونەتەوە! بەڵکو زۆربەی جارەکانیش سەرکردە ئیسرائیلییەکان گاڵتەیان بەو بڕیارانە هاتووە. تا ئێستاش ئیسرائیل لە پێشێلکردنی دابە نێودەوڵەتییەکاندا بەردەوامە و سادەترین مافەکانی مرۆڤ دەخاتە ژێر پێیەوە و نەتەوە یەکگرتووەکانیش جووڵەی تێدا نییە، یان دەڵێی قۆڵبەست کراوە و لە باراندنی سۆزی ناسك و هەستی پڕ بەزەیی و هەندێك هاوکاری خۆراك بەسەر فەلەستینییەکاندا زیاتر هیچی لەدەست نایێت! ئەمانەش هەر هەمووی هەڵوێستی ئەخلاقین کە ناتوانێ هیچ لە واقیعەکە بگۆڕێ، تەنها لابردنی شتێکی کەم نەبێ لە زوڵم و زۆرە دیارەکانی سەر خەڵکی.

ئەوەی ڕاستی بێ، بۆ سەپاندنی یاسا بە شێوەیێکی دادپەروەرانە پێویستی بە دوو مەرجی بنچینەیی هەیە:

**یەکەمیان:** گشتگیری، واتە دەبێ بە شێوەیێکی گشتی بە سەر هەمواندا بسەپێ.

**دووەمیان:** هەر کەسێ پێشێلی کرد سزایێکی توند بدرێ.

**مەرجی یەکەم:**

ئەوەی کە بە روونی دیارە لانی کەم مەرجی یەکەمیان تا ئێستا جێبەجێ نەکراوە، لێرەدا ئەمە راستە لەبەر چەند هۆکارێکی جۆراوجۆر چەند سزاییێك بەسەر هەندێك دەوڵەتدا سەپێندراوە وەك: لیبیا و سودان و عێراق و باشوری ئەفریقیا...و هتد. کە چەندین سزای جۆربەجۆریان بەسەردا سەپێندراوە وەك: ئابلۆقەی ئابوری و قەدەغەکردنی فرۆشتنی چەك، تا دەگاتە قەدەغە ئاسمانییەکان و رێگرتن لە فرۆشتنی نەوت و...هتد. بەڵام گشتگیر نەبووە، بۆ نموونە: لیبیا بەوە تۆمەتبار کراوە، کە دەستی هەبووە لە خستنە خوارەوەی فڕۆکەییێکی مەدەنی، کە چەند سەد سەرنشینێکی مەدەنی تێدا بوونە قوربانی ـ کە بە (کێشەی لۆکەربی) ناوی دەرکردووە ـ ئەمەش کارێکی تاوانکارانەیە و دژی مرۆڤایەتیە و شایستەی سزادانە...هتد. ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە، کە لیبیا تا چەند لەو کێشەیەدا تاوانبارە، یان گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەین، کە ئەو تاوانبارکردنە راستە، یان کێشەکە لە بەرژەوەندی لیبیا، یان لەدژیدا کۆتایی پیێ بێنین، بەڵام ئێمە بەوەندە واز دێنین، کە ئەو پرسیارە بیێ وەڵامە بخەینەڕوو، کە تا ئێستا وەڵامێکی روونمان لە بارەیەوە دەست نەکەوتووە ئەویش ئەوەیە: ئایا ئیسرائیلیش فڕۆکەییێکی مەدەنی میسری لەسەر (سینا) نەخستە خوارەوە و چەند سەد کەسێکی مەدەنی تێدا نەبووە قوربانی، کە (سەلوا حیجازی) پێشکەشکار یەکێك بوو لە قوربانییەکان..؟. بۆ لەو کاتەدا دونیای بۆ هەڵنەستا و داوا بکەن سزا بەسەر ئیسرائیلدا بسەپێندریێ و بۆ قەدەغە ئاسمانییەکانی بەسەردا نەسەپێندرا؟. بۆ تاکە یەك کەسیش داوای دادگایی کردنی ئەو کەسانەی نەکرد کە بوونە هۆکاری ئەم رووداوە دڵتەزێنە..؟ بۆ دەوڵەتی جوولەکە بە هیچ شێوەییێك سزا نەدرا وەك هاوردەکردنی چەك، ئەگەر بۆ چەند مانگێکیش بووایە، هەر بۆ ئەوەی دەمی خەڵکی پێداخەن؟.

دەتوانین هەمان شتیش لەبارەی ئەو تاقیکردنەوە ئەتۆمیانەی کە هیند و پاکستان ئەنجامیاندا، کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی زۆر نیگەران کردبوو، دواتر ئەو نیگەرانییە ئێرانیشی گرتەوە، چونکە ئەویش ئەوەندەی نەماوە بگاتە هەمان ئاستی ئەوان. لەگەڵ ئەوەشدا کوورە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل هەر بەردەوامە و موشەکە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیلیش کە هەڕەشە لە ناوچەکە دەکات عەمبار کراون و تاقیکردنەوەکان لەسەر چەکی کیمیاوی و بایۆلۆجی بە بەرچاوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە هەمیشە بوونی هەیە!.

بەڵام (ئەوەی لە دژی باشوری ئەفریقیا روویدا لەلایەن زۆربەی وڵاتانی جیهانەوە، لەبەرئەوەی شێوازەکانی جیاوازی رەگەزی پیادە دەکرد) هەڵوێستێکی زۆر باش بوو کەس ناتوانێ رەتیبکاتەوە، کەچی شتێکی لەو بابەتە لەبارەی کردەوەکانی سربەکان روویندا، کە لەدژی (هەرێمی کۆسۆڤۆ)دا دەیانکرد، یان ئەوەی لە پێش ئەودا لە بۆسنە و هەرسکدا روویاندا و هیچ جارێکیش ئەمە لەگەڵ ئیسرائیلدا رووینەدا، کە دەوڵەتێکی رەگەز پەرست و پڕە لە نائارامی ئایینی و تایفەگەرێتی و رەگەزی، کە رەشەبای گومان و لووت بەرزی بەسەر ناوچەکەدا بڵاوی دەکاتەوە و هاوڵاتیان  بە تایبەتی رۆژهەڵاتییەکان تیایدا هەست بە بێ متمانەییێکی زۆر دەکەن!.

**بەڵام مەرجی دووەم:**

ئەویش سزادانە کە وەك بنچینەییێك وایە، چونکە سزا کاکڵەی یاسایە، گوتەییێکی باو هەیە زۆر بە روونی دەڵێ: (هیچ یاسایێك بە بێ سزا بوونی نابێ). لێرەدا وەك هیگڵ دەڵێ: (سزا کاکڵەی راستییەکانە)، چونکە بە هۆی (سزا)وەیە، کە (راستی) ئیعتباری خۆی بۆ دەگەڕێتەوە و رێز و هەیبەتیش بۆ یاسا دەگێڕێتەوە، بە بێ بوونی سزاش نە راستی و نە یاساش بوونی نابێ، چونکە مەبەست لە سزادان بەرپەرچدانەوە و چاکسازی نییە، بەڵکو فەلسەفەی سزادان لەسەر پرەنسیپێکی جیاواز بنیاد نراوە ئەویش ئەوەیە، کە دەڵێ: سروشتە جەوهەرییەکان لەوەدا نییە، کە هۆکارێك بن بۆ بەدیهێنانی چەند ئامانجێك، بەڵکو لەوەدایە، کە خودی خۆی ئامانجەکەیە. بە چاوپۆشی لەهەرهەموو ئەو مەبەستە سوودبەخشانەی، کە دەکرێ شێوەکانی سزادان بەدی بهێنن، چونکە یاسای رەها بۆ حەقپارێزی دەبێ سزای هەرکەسێك بدات، کە یاسا پێشێل دەکات، یان مافەکانی خەڵکانی تر پێشێل دەکەن، لە دوای هەر تاوانێکیش ئازار و سزا دێت. ئەگەر بێت و پێشێلکردن خراپ بێ بۆ یاسا، سزادان خراپە بۆ ئەو خراپەیەی دوایی. ئەگەر بێت و لەناو دەوڵەتدا سزایێك نەبێ بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی یاسا دەکەن، هەر لە بنچینەدا یاسا بوونی نامێنێ. بۆ نموونە ئەگەر هەر کەسێك سەرپێچی یاسای هاتووچۆی کرد سزا نەدرێ، کەواتە ئەمە دەبێتە هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسایە، ناشبێ گەورەی قەومەکە، یان خاوەن دەسەڵاتەکان لەو سزایە بە دەربن، بەڵکو دەبێ بەسەر هەموو کەسێکدا بسەپێ وەك یەك، چونکە یاسا لە رێگەی سزادانەوە پێگەی خۆی دەپارێزێ و راستییەکان بۆ خۆی دەگێڕێتەوە و هەڵەکان راست دەکاتەوە  Right Rights

Itself بەم شێوەیە راستی پێگەی خۆی بۆ دەگەڕێتەوە و یاساش هەیبەتی بۆ دەگەڕێتەوە: چونکە یۆمیندز Euamenides))،[٥٤٢] بەردەوام خەوتوون تا ئەو کاتەی تاوانێك دێت و بە ئاگایان دێنێ. لێرەدا ئەنجامدانی تاوان خۆی تۆڵە لەخۆی دەکاتەوە.[٥٤٣]

ئێستا پرسیارەکەمان ئەوەیە: ئایا دەکرێ وڵاتە زلهێزەکان ـ ئەوانەی ئەندامی بەردەوامی ئەنجومەنی ئاسایشن ـ ئەگەر ئەو یاسایانەیان پێشێلکرد رێگە بەوە بدەن یاسا نێودەوڵەتەکانیان بەسەردا جێبەجێ بکرێ و سزاکە مۆر بکەن، بێ ئەوەی مافی ڤیتۆ بە کاربێنن، کە هەر بڕیارێك هەڵدەوەشێنێتەوە، کە لە بەرژەوەندی خۆیاندا نەبێ..؟. بۆ ماوەیێکی دوور و درێژ وڵاتانی جیهان لەژێر هەژموونی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤییێتدا مایەوە، بۆیە دەبووایە لە دەرکردنی هەر بڕیارێکی نێودەوڵەتیدا بەرژەوەندییەکانی ئەو دوو دەوڵەتە مەزنەی لەبەرچاو بگرتبا. هەروەها ئەو دوو دەوڵەتە ئاراستەی تێکڕای بڕیارەکانیان دیاری دەکرد، بەڵکو پەیمانەکان و پێکهاتن و هەڤاڵبەندی (التحالفات) و میساقە نێودەوڵەتییەکانیان دیاری دەکرد ـ بە ئاراستەییێکدا دەیبەن کە بەرژەوەندییەکانی خۆیان و ئەو وڵاتە بچووکانەی لە بازنەی ئەواندا دەسوڕێنەوە تێدا بپارێزرێ. دوای لەبەریەك هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت ئەمریکا بە تەنیا سەرکردایەتی جیهانی گرتە دەست و بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی دەستی لەهەرهەموو کارەکان وەردا. بۆیە تەنها خۆی دەسەڵاتی بەسەر ئەو دۆخە سەیر و نەشازانەدا هەبوو: کاتێك، کە باڵیۆزخانەکانی لە (نایرۆبی) و (دارالسلام) دا تەقێندرانەوە، تەنها خۆی دادوەر و ناوبژیوان بوو، هەر خۆی بێ ئەوەی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بگەڕێتەوە بە موشەك لە سودان و ئەفغانستانی دا. ئینجا ئەگەر ئەو دوو **وڵاتە دەستیان لە کارەکەدا هەبووبێ یان نا،** ئەمە کارێکە پێویستی بە سەلماندن و لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ هەیە، ئەمە کێشەیێکە دەبووایە نەتەوە

٥٤٢ ـ ئەمانە لە میپولوجیای یۆنانیدا سێ دایکەکەی تۆڵە سەندنەوەن. کاریان تەنها ئەوە بوو سزای تاوانبارانیان دەدا لە سەر ئەو کارانەی کە کردبویان. ئەمانەش: (ئەلیکتۆ Alecto)، و (میگیرا Megaera)، (تسیفۆن Tisiphone) بوون. تەماشای د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (معجم دیانات و اساطیر العالم) بکە ـ کتێخانەی مەدبولی لە قاهیرە سا ڵی ١٩٩٦ـ بەرگی یەکەم لــ ٣٦٠ ــ.

٥٤٣ ـ هیگڵ (اصول فلسفه الحق) وەرگێڕانی ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام ـ کتێخانەی مەدبولی لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٦. بڕگەی ١٠١.

یەکگرتووەکان پێی هەڵسابایە و دوای ئەوە بڕیارێکی گونجاوی پێ دەربکردایە و کارەکەی جێبەجێ بکردبایە، بەڵام کە وڵاتە یەکگرتووەکان خۆی بە تەنها بەو هەموو کارە هەڵبستێ، ئەمە کارێکە ئەگەر سادەترین وشە لە بارەیەوە بڵێی: ئەوەیە کە یاسای نێودەوڵەتی هەڵتەکاندووە، وەك ئەو بەهانانەی کە دەڵێن دەکرێ چەمکە ئەخلاقییەکان بگۆڕدرێن و بکرێنە چەند یاساییێکی نێودەوڵەتی و بکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

بەمشێوەیە لەم هەموو شتەدا دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە سەپاندنی یاسای نێودەوڵەتی بە هۆی هێز و زۆرلێکردنەوە پەیوەستە بە بەرژەوەندی وڵاتە زلهێزەکانەوە، کە هەر جارێك بزانێ بەرژەوەندییێکی تایبەت، یان سودێکی تێدایە، ئینجا بۆ خودی خۆی بێ، یان بۆ ئەو وڵاتانە بێ، کە لە بازنەی ئەودا دەخولێنەوە، بۆ سەپاندنی هەڵدەپەڕێ و پەلە لە جێبەجێکردنیدا دەکات. نەتەوە یەکگرتووەکانیش بەمشێوەیە بە دوو پێوانە، هەندێك جاریش بە سێ پێوانە شتەکان دەپێوێ. لێرەدا یاسای نێودەوڵەتی دوو مەرجە بنچینەییەکەی پێشوو لە دەست دەدات: کە گشتگیری و سزادانە، یان بڵێ سزدانێکی گشتی بۆ هەموو ئەو کەسانەی پێشێلی دەکات، یان سەرپێچی دەکات با پێگەی لەناو وڵاتاندا هەرچییێك بێت. ئاخاوتنیش لەبارەی (راستی) و (دادپەروەری) و (ئاشتی) و (پێکەوەژیان)، لەنێوان وڵاتاندا لە باشترین بارودۆخدا تەنها چەند نیازێکی پاکە و هیچی تر، یان تەنها نموونەییێکی باڵایە، کە لەناو هزری خەڵکیدا دەخولێتەوە، بێ ئەوەی رێگاییێك بدۆزێتەوە بۆ ئەرزی واقیع. رێك وەك وڵاتە رۆژئاواییەکان وایە کە لەبارەی پرەنسیپەکانی مەسیحیەت دەدوێن وەك: خۆشەویستی و بەزەیی و هاوکاری و برایەتی و ئاشتی...هتد، بەڵکو بە ئاخاوتن لەبارەیەوە وەك پرەنسیپێکی ئەخلاقی، کە ناتوانرێ جێبەجێ بکرێ وازدەهێنن، ئەمە (بێرتراند راسل) فەیلەسوفی ئینگلیزی هاوچەرخ زۆر بە روونی لە گوتە بەهێز رۆشنەکەیدا، کە دەریبڕیوە و دەڵێ: (وڵاتە رۆژئاواییەکان هەرهەمووی بە مەسیحدا هەڵدەدەن، ئەگەر بێت و ئێستا زیندوو بێتەوە بێگومان دەبێتە جێگەی گومانی پۆلیسی نهێنی لە ئینگلتەرادا (سکوتلاندیارد) ـ و رەگەزنامەی ئەمریکی لێ قەدەغە دەکرێت، چونکە دژی چەك هەڵگرتنە.[٥٤٤]

---

٥٤٤ ـ د. زەکی نەجیب مەحمود (برتراند رسل) ژمارەی یەکەمی (سلسلة نوابغ الفكر الغربی) دارولمەعاریف لە میسر.

گوتەکەی (وینستۆن چەرچڵ) کە سەرەتای ئەم بەشەمان پێکردەوە ـ و لەبەر گرنگیەکەی لە دووبارەکردنەوەی بێزار نابین ـ وەك دروشمێکی راستەقینەی ئاشکرا نەکراوی سیاسەتی نێودەوڵەتی دەمێنێتەوە، کە ئەویش ئەوەیە: (ئەوەندەم تاوان لە بەرژەوەندی بەریتانیادا ئەنجام داوە، ئەگەر لەناو بەریتانیادا ئەنجامم بدابان سەرجەم ژیانی خۆم لەناو بەندیخانەکاندا بەسەر دەبرد!). هەموو سەرۆك وەزیر و فەرماندەییێك شانازی بەوەوە دەکات، کە ئەو دروشمەی زۆر بە لێهاتویی و تواناوە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەی جێبەجێ کردووە و لەو رێگایەدا ماوەییێکی زۆرتری لە خەڵکانی تر بڕیوە بە داخەوە بۆتە جێگەی رێز و ستایش!. (ڕۆبەرت هۆك) ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ئەو گوتەیەشی دووپات دەکاتەوە دەڵێ (من هەرگیز نەم گوتووە سیاسەتی دەرەوەمان لە سەر پرەنسیپەکانی ئەخلاق بنیاد ناوە!). ئینجا ئەوەی دوو گوێچکەی هەیە با گوێی لێ بێ!.

## دواگوته

دواگوته: لەوانەیە باشترین شت بۆ کۆتایی پێ هێنانی ئەم لێکۆڵینەوەیە هێنانەوەی هەندێك لەو دژە بۆچوونانە بێ، کە لەناو مێشکی خوێنەردا دروست دەبێ لەبارەیئەو کێشە و بیرۆکانەی، کە لە لێکۆڵینەوەکەماندا وروژاندومانە، وەك ئەمانەی خوارەوە: ـ

### (١)لەوانەیە خوێنەر ئەم پرسیارە بوروژێنێ و بڵێ:

تۆ لەو کێشانەوە دەستت پێکرد، کە بانگەشەیان بۆ بە (حەتمی بوونی دیموکراسی) دەکرد، بەڵام تۆ بۆ ئەوەی بیسەلمێنی، کە ئەم گوتەیە راستە بیروڕای سێ (فەیلەسوف)ت هێناوەتەوە، کەچی لەوانەیە تیۆری فەیلەسوفەکان هەر هەمووی راست نەبن، زۆر جاریش لەوانەیە وورد نەبن.

لە راستیدا ئێمە تەنها بە تیۆری فەیلەسوفەکان (بە حەتمی بوونی دیموکراسی) مان دەسنیشان نەکردووە، بەڵکو بە خەباتی گەلانیش، کە بە درێژایی مێژوو بۆ وەرگرتنەوەی مافە زەوتکراوەکانیان کردوویانە، هەروەها باسی ئەوەشمان کردووە کە سیستەمە دیکتاتۆرییەکان بە هۆی دیموکراسیەتەوە لە ناوبردراون و گوتمان ئەمەش دانپێدانانێکی تەواوە بە بەها و گرنگی دیموکراسیەت.

هەروەها دەتوانین بڵێین: ئەوانەی رۆژێك لە رۆژان لایەنگری دەسەڵاتی سەربازی بوون و یەکێك بوون لە کۆڵەگەکانی ئەو لایەنە، لە کۆتاییدا گەڕانەوە و وازیان لێیهێنا و دانیان بەوەدا نا کە (دیموکراسیەت لە چەك گرنگترە) ـ و بەو گوتەیەی خۆیان شکستەکەی یۆنیۆی ١٩٦٧یان شیکردەوە کە دەڵێ: (چۆن دەکرێ گەلێك وەك رانەمەڕ راپێچی گۆڕەپانی شەڕەکان بکەیت و داوای سەرکەوتنیشی لێ بکەیت..؟!. بۆیە ئەم شکستە قێزەوەنەش ئەنجامێکی حەتمی نەبوونی دیموکراسیەتێکی راستەقینە بوو!) بەمشێوەیە کۆتایی بە ئاخاوتنەکانی خۆیان دێنن کە (ئەو شکستانە شتێکی سروشتین، لەبەرئەوەی دامەزراوە سەربازییەکان بە بێ ئەوەی بە دەنگێکی دیموکراسیانە بیر

بکەنەوە رووی تێدەکەن..).[545] زۆر لە پیاوانی شۆڕشی میسری، یان (دامەزراوە سەربازییەکان) ی میسری ئەم لایەنەیان هەڵبژارد.. کەچی لە کاتێکدا بوو، کە کار لەکار ترازابوو، ئێستاش پەشیمانی داد نادات!.

## (٢) هەروەها لە ناو دژە بۆچوونەکاندا دەگوترێ:

ئەو کاتەی گفتوگۆم لەسەر بیرمەندە سیاسییەکانی کۆنی خۆمان کرد، زیاد لە پێویست بارێکم خستە سەر شانیان، کە لە توانایاندا نەبێ هەڵی بگرن، من وا هێرشم کردە سەریان، کە نە لە (یاسا) و نە لە (دیموکراسیەتیش) هیچ نازانن... هتد. ئەم بیرۆکانەش لەبەرئەوەی نوێن، ئەوان شتێکی وایان لەبارەی نەدەزانی، بۆیە تۆ لەو حاڵەتەدا، کاتێك چەند بیرۆکەیێکی سەردەمێکیان بەسەردا دەسەپێنی، کە تێیدا نەژیاون وەك فەلسەفە دەڵێ: دەکەوێتە (هەڵەی جیاوازییەکانی مێژووەوە Anachronism)، ئەمەش وەك ئەوەی لێدێ کە یەکێك بڵێ (فارابی)، یان (ماوەردی) هیچ کامیان (تەلەفزیۆن) ی نەبوو پێویست بوو لە سەریان ئەو ئامێرەیان هەبا!.

هەرچەندە ئەو جۆرە رەخنانە دەکرێ بە ئاسانی وەڵامی بدەینەوە، بۆ نمونە: بیرۆکەی (یاسا) لە شارستانییەتی رۆمانیدا بوونی هەبوو، هەروەها (دیموکراسیەت) یش ئیفلاتۆن و ئەرستۆ رقیان لێ دەبۆوە ـ هەردووکیشی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی..هتد ـ بۆیە ئەم جۆرە بیرۆکانە نە تازەن و نە سەردەمیانەشن، بەڵکو بە مانایێکی تر نوێبوونەوە و گۆڕانکاری تێدا کراوە و ووردتر بووە.. ـ لێرەدا دەڵێم هەرچەندە ئێمە دەتوانین بەمشێوەیە وەڵامی رەخنەگرەکە بدەینەوە، بەڵام دەتوانین دوو لایەنی تری بخەینە سەر، کە ئەمانەی خوارەوەن: ـ

یەکەم: ـ ئێمە ویستمان خوێنەر لەو تێکەڵ کردنانەی نێوان ئەخلاق و سیاسەت ئاگادار بکەینەوە کە، لەناو بیرۆکە سیاسیە کۆنەکانماندا هەبووە.

دووەم: ـ ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە، کە هەندێك لە نووسەرە موسڵمانە هاوچەرخەکانی ئێمە، تاکو ئێستاش هەمان ئەو تێکەڵکردنە دووبارە دەکەنەوە. تا ئێستاش بیرۆکە کۆنەکان بەسەر مێشکیاندا زاڵە، هەمان ئەو شتانە دووبارە دەکەنەوە، کە (ماوەردی) و کەسانی تر

---

٥٤٥ ـ ئەمە ئاخاوتنی د. سەروەت عەکاشەیە لە گۆڤاری (سطور)دا ژمارە ٣٣ی ئابی ١٩٩٩.

دووبارەیان کردۆتەوە وەك ئەو خەسڵەتە ئەخلاقیانەی، کە دەبێ لە فەرمانڕەوادا هەبێ ـ هەرچەندە ئەوان هیچ وەڵامێکیان بۆ ئەمە پێ نییە..

## (٣) لەوانەیە رەخنەگری سێیەم رەخنەمان لێ بگرێ و بڵێ: .

من چیرۆکی یەکێك لە دادوەرەکانم هێنابۆوە، کە داوا لە سەرۆکی دادگای باڵا دەکات، کە بە شێوەییێکی دادپەروەرانە دادگایی لەنێوان خەڵکیدا بکات، پیاوەکەش بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: (ئەمەیان کاری من نییە، بەڵکو کاری من ئەوەیە، کە بە پێی ئەو یاسایانە کار بکەم کە داندراون). بێگومان تۆش لایەنگری ئەو هەڵوێستەی دواییان دەکەیت، بەڵام ئایا ئەمە لەدژی دەقەکانی ناو قورئانی پیرۆز نییە، کە داوامان لێدەکات دادپەروەرانە بڕیار بدەین: (واذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل) (النساء: ٥٨) واتە ئەگەر ناوبژیوانیتان لەنێوان خەڵکیدا کرد بڕیارەکانتان دادپەروەرانە بێت، (ان اللّه يأمر بالعدل والاحسان) (النحل:٩٠) واتە خودای گەورە فەرمانمان پێدەکات دادپەروەر و چاکەخواز بین، باشە ئێمە چۆن دەتوانین هاوسەنگییێك لەنێوان ئەو دوو هەڵوێستە دژ بە یەکە دروست بکەین..؟

لە راستیدا هیچ ناتەباییێك لەنێوان ئەو دوو هەڵوێستەدا نییە، بەڵکو لەوانەیە لێك تێنەگەیشتنێك، یان بە هەڵەدا چوونێك هەبێ. پێش ئەوەی ئەو وەڵامەتان بدەمەوە، با چیرۆکێکی دیکەتان بۆ بگێڕمەوە، کە دادوەرێکی میسری بۆی گێڕامەوە، گوتی: (ڕۆژێکیان تاوانبارێك هاتە بەردەمم زۆر کڵۆڵ بوو بەرگێکی شڕی لە بەردا بوو، تاوانەکەشی ئەوە بوو کە چووبووە ناو شینایێکەوە و هەندێك (فەریکە دەرەشامی) دزیبوو، کاتێك، کە تاوانەکەم بەرەو رووی کردەوە زۆر راشکاوانە و بە روونی گوتی (بەڵێ ئەم کارەم کردووە، چونکە زۆرم برسی بوو، چووم هەندێك فەریکە دەرەشامیم هێنا بۆ ئەوەی برسێتیەکەمی پێ بشکێنم). دادوەرەکە لە ئاخاوتنەکەی خۆی بەردەوام بوو و گوتی: (لەو حاڵەتەدا بەزەییم پێیدا دەهاتەوە و گریانم بۆی دەهات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێ مانگ زیندانیم بۆی بڕیەوە، چونکە ئەمە یاسایە!). لەوانەیە یەکێك لە خوێنەرەکان بپرسێ: ئایا ئەمە دادپەروەریە؟ لە وەڵامدا: دەڵێین بەڵێ، دادپەروەری ئەوەیە تۆ لە هەموو حاڵەتێکدا یاسا وەك یەك بەسەر خەڵکیدا بسەپێنی، بەڵام ئایا نابێ دادوەر بۆ ویژدان و هەست و نەست و لایەنە مرۆڤایەتیەکەی خۆی بگەڕێتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: (نەخێر، چونکە ئەو بۆ سەپاندنی یاسا هاتۆتە دادگا، نەك بە ویژدان و ئەخلاق ناوبژیوانی لەنێوان خەڵکیدا بکات. ئەو دەتوانێ پرسیار لە ویژدانی خۆی بکات و بڵێ: ئایا

من له سەپاندنی یاسادا سەرکەوتو بووم؟، چونکه من کەسم له خۆم نزیك نەکردۆتەوه، یان یارمەتی تاوانبارێکم دابێ لەبەرئەوەی خەڵکی گوندەکەی خۆمان، یان شارەکەی خۆمان بووه، یان له نەتەوەکەی خۆم بووه؟! بە کورتیەکەی نابێ ئێمه وشەی (دادپەروەری) بە مانا ئەخلاقیەکەی بە کار بێنین و هەر کەسەو بە ئارەزوی، یان بەپێی ویژدانی خۆی لێکی بداتەوە، چونکه ئەمه دەبێته گێرەشێوێنییێك بۆ خۆی. لەوانەیه بگوترێ ئەی ئەگەر یاساکه خۆی ستەمکارانه بوو؟ له وەڵامدا دەڵێین: دەبێ داوا بکەین بگێڕدرێتەوه بۆ دەسەڵاتی یاسادانان بۆ ئەوەی چاوی پێدا بخشێننەوه و راستی بکەنەوه، یان هەڵیبوەشێننەوه ئەگەر ستەمکارانه بوو.

لێرەدا دەتوانین وەڵامی خراپ لێك تێگەیشتنەکەی پێشوو بدەینەوه و دەڵێین هیچ ناتەباییێك لەنێوان ئەو دوو هەڵویستەدا نییە: چونکه له دەقی قورئانی پیرۆزدا هاتووه دادپەروەرانه ناوبژیوانی لەنێوان خەڵکیدا بکەین و ئەمه دەبێ جێبەجێ بکرێ، بەڵام پرسیارەکه لێرەدا ئەوەیه، کە چۆن ئەو دادپەروەریه بسەپێنین و شێوازی سەپاندنی چۆنە؟ وەڵامەکەی: دەبێ ئەو دادپەروەریه بگۆڕدرێ و بکرێته چەند یاساییێك، بەسەر هەموو تاکەکانی کۆمەڵدا بسەپێندرێ له گەورەوه تا بچووك وەك یەك، ئەگەر نا ئەو دادپەروەریه دەمێنێتەوه سەر ئەخلاقی دادوەرەکه خۆی،، کە چۆن لێکی دەداتەوه! لێرەدا (ئەنتیگۆنا) بە هەڵەدا چووبوو، کە گوێی بۆ پرەنسیپەکانی ئەخلاق گرت و دژی یاسا وەستایەوه، له کاتێکدا کە سوکرات بە شێوەییێکی زاڵمانه سزای مەرگی بەسەردا سەپێندرا، سوکرات ئەوەی رەتکردەوه، کە له زیندان رابکات و گوتی: (دەبێ ئێمە ملکەچی یاساکانی شارەکەمان بین ئەگەر ستەمکارانەش بێت!).[٥٤٦]

---

٥٤٦ ـ له کتێبی (افکار... و مواقف) دا بە دوور و درێژی گفت وگۆمان لەسەر ئەو بابەته کردوه، کتێبخانەی مەدبولی له قاهیره ساڵی ١٩٩٦. بۆ نمونه تەماشای (انتیجونا تطرح المشکلة) لــ٤٥٩ــ و دوای ئەو. و (القضاة القتلة) لــ ٤٦٤ و دوای ئەو بکه.

**(٤) من وا هەست دەکەم کە هەندێك کەس رەخنە لەو گوتەیە بگرن کە دەڵێ (دیموکراسیەت لە ناو خێزاندا نییە):**

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە باوك بەرامبەر بە منداڵەکان و ئەندامانی خێزانەکەی زۆردار و ستەمکارە..ئەوەی راستی بێ ئێمە وشەی (دیموکراسی) بە زۆری بە کار دێنین و زۆر بە ئاسانیش. لە کتێبێکدا، کە نوسەرەکەی باسی (حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی) دەکرد. وا وەسفی دەکرد کە کەسێکی دیموکراسی بووە..! پێم سەیر بوو ئەم وەسفەی بۆ خوێنڕێژە بەناوبانگەکەی بەغدا کردووە، کە رۆژێك لەسەر مینبەری مزگەوت وەستابوو و بەو کەسانەی گوت، کە بۆ نوێژ هاتبوونە مزگەوت (سوێندم بەو خوایە ئەگەر بە یەکێك بڵێم لە یەکێك لە دەرگاکانی مزگەوت بچێتە دەرەوە و ئەو لە دەرگایەکی تر بچێتە دەرەوە سەری دەپەڕێنم!).[٥٤٧] بۆیە دەبوایە بەدواداچوون بۆ نوسەرەکە بکەم بۆ ئەوەی بزانم دیموکراسیەت لەلای ئەو مانای چییە، دیتم باسی ئەوە دەکات، کە دیموکراسیەتی حەجاج لەوەدایە، کە یاری لە گەڵ منداڵاندا دەکرد و دڵی نەخۆشەکانی دەدایەوە و بەزەیی بە پیرەکاندا دەهاتەوە...هتد. ئەمانە چەند کارێکن ـ ئەگەر راستیش بن ـ هیچ پێوەندییێکی بە دیموکراسیەتەوە نییە.

وا پێ دەچێ، کە ئێمە لە بابەتی (دیموکراسیەت لەناو خێزاندا) دەمانەوێ باوك بەم شێوەیە لەگەڵ منداڵەکانیدا دیموکراسی بێ. لەراستیدا کەس ئەوە رەت ناکاتەوە، کە گەورەی خێزانەکە بیروڕای هەموو ئەندامەکان لەبارەی بابەتێکی دیاریکراو وەربگرێ، تا دەگاتە ئەو کاتەی، کە بڕیاری تێدا دەدرێ ئەو کاتە خۆی سەرپشکە، چونکە دیموکراسیەت هەرچەندە باشترین و نموونەیی ترین شێوەی سیاسیە بۆ مرۆڤ، بەڵام ئەمەیان ئەوە ناگەیێنێ کە لەهەرهەموو دامەزراوەکانی کۆمەڵگادا دەسەپێندرێ، بەڵکو هەندێك شوێنی لاچەپ هەیە بە پێی سروشتی پێکهاتەکەی دیموکراسیەت نایانگرێتەوە وەك (خێزان و قوتابخانە و سوپا و پاپۆڕ کاتێك لەناو دەریاکاندایە). هیچ دیموکراسیەتێك لەو بوارانەدا بوونی نییە. ئەگەرچی ئەمە مانای ئەوە نییە کە پرس و را پێکردن نەبێ، وەك ئەوەی باوك پرس و را بە منداڵ و خێزانەکەی خۆی دەکات، هەروەها هەندێك جار فەرماندەی سوپا تەنانەت لە گۆڕەپانی شەڕیشدا پرس و را بە هاوکارەکانی خۆی دەکات.

---

٥٤٧ ـ د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام (الطاغیة : دراسة فلسفیة لصور الاستبداد السیاسي) لـ٢١١ـ.

بەڵام لەو حاڵەتانەدا (بڕیار) ی کۆتایی بۆ یەك بەر پرسە. ئەمەش مانای ئەوەیە هەر هەموو ئەو شێوە سیستەمانە لەکاتی بڕیارداندا دیموکراسیەتی تێدا نییە.

بەڵام لە (دەرەوەی خێزان)دا لەوانەیە کێشەکان کێشەی هاوڵاتی و نیشتمان بێ لەو حاڵەتانەشدا دەبێ بڕیارەکان دیموکراسی بن، کە هەر دەستەییێك کارێك لە کارە گشتییەکان بە دەستەوە دەگرێ، بۆیە ئەگەر وامان دانا کە کوڕ و باوکێك بە یەکەوە ئەندامی پەرلەمان بن، یان بە یەکەوە ئەندامی یەکێك لە ئەنجومەنە کارگێڕییەکان بن، لەو کاتەدا لە دەربڕینی بیروڕاکاندا باوکەکە مافی باوکایەتی بە سەر کوڕەکەیەوە نامێنێ ـ لەبەرئەوەی هەردووکیان چوونەتە (دەرەوەی خێزان) و لە بەرامبەر بابەتێکی نیشتمانی گشتیدان. کاتێك، کە وشەی دیموکراسیەت و وشەی خێزان بەو شێوەیەی، کە هەردووکیان تێکەڵ بە یەکتری دەکرێن و لە شێوەی بڕیارداندا بە کاری دێنین، من گومانم لە نیازپاکی بە کارهێنانەکەدا نییە، بەڵکو گومانم لە روونی ماناکەیدا هەیە.[548]

بۆیە دەبێ ئێمە جیاوازی لەنێوان بوارێك و بوارێکی تردا بکەین، چونکە (خێزان) بواری منداڵانی پێنەگەیشتون کاری خێزانیش ئەوەیە، کە پرەنسیپە جۆربەجۆرەکانی ئەخلاقیان لە ناخدا بچێنێ، ئەو بوارە بواری پیادەکردنی مافە سیاسییەکان نییە، چونکە ئەو منداڵانە هێشتا مافی سیاسیان نییە. پێوەندی منداڵەکانیش بە باوکیانەوە لە بنچینەدا پێوەندییێکی ئەخلاقیە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە ملکەچی باوکیان بن و رێزی لێبگرن، هەروەها لەلایەن باوکیشەوە، دەبێ سۆز و خۆشەویستی بۆیان هەبێ و چاودێریان بکات، ئەگەرچی ئەمە هیچ پێوەندییێکی بە دیموکراسیەتەوە نییە. بەم شێوەیە دەبینین (خێزان) بواری ئەخلاقە نەك سیاسەت. ئەگەرچی ئەمە رێگە لەوە ناگرێ، کە باوك منداڵەکانی خۆی فێری هەندێك لە بەها دیموکراسییەکان بکات، وەك رێزگرتنی رای بەرامبەر و بوار بدرێتە ئەندامانی خێزانەکە بۆ ئەوەی گوزارشت لە خۆیان بکەن...و هتد. بەڵام لە هەندێك کاتدا دەبێ بڕیارەکانی باوك یەکلاکەرەوە بن، یان لەوانەیە زۆرداریش بێ ئەگەر بتوانین ئەو وشەیە بە کار بێنین ـ ئەگەر هات و یەکێك لە ئەندامەکانی خێزانەکە لە رێگە لایدابوو: وەك ئەوەی کە هەندێك جار منداڵەکەی درۆ بکات، یان دزی بکات، یان خیانەت بکات، یان هەر شتێکی تری خراپ بکات.

---

٥٤٨ ـ زەکی نەجیب مەحمود (في تحديث الثقافة العربية) دارلشروق لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٧ لــ١٣٤ــ و دوای ئەو.

### (٥)لەوانەیە ڕەخنەگرێکی تر بڵێ: .

تۆ دەتەوێ (دیموکراسیەتی لیبرالی) پیادە بکرێ، کە بۆتە هۆی (بەرەڵایی سێکسی) و ڕێگە بە نێربازی دەدات و ئەخلاقی لە ڕەگ و ریشەوە هەڵتەکاندووە هێشتا دەتەوێ لە سیاسەتی جیا بکەیتەوە.

ئەمە ڕەخنەییێکی زۆر گرنگە، چونکە هەر چەند جاری باسی شارستانییەتی ڕۆژئاوا و دیموکراسیەتی لیبرالی بکرێ بە تایبەتی ئەو ئازادیانەی، کە تییێدا هەیە، ئەم قسەیە دووبارە دەبێتەوە. سەیر لەوەدایە هەندێك لە ڕەخنەگرەکان هەر هەموو ئەم شارستانییەتە لە بابەتی (سێکس) دا کورت دەکەنەوە، وەك ئەوەی (ئەبولئەعلا ئەلمەوردی لە کتێبەکەیدا (عن الحجاب) دەڵێ: بە هۆی (بەرەڵاییە سێکسییەکانەوە) شارستانییەتە کۆن و نوێییەکان بە یەکەوە لەناو چوون، هەروەها پێشبینی ئەوەشی کردووە، کە ئەو شارستانییەتەی ئێستاش هەیە بە هەمان هۆکار لەناو بچێ!. هەرکەسێك ئەو کتێبانەی لەشێوەی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە وا هەست دەکات، کە موسڵمانەکان لەو دونیایەدا ئەوەندەی گرنگی بە بابەتی سێکس و ژن و خۆداپۆشین و پێچە، و...هتد دەدەن گرنگی بە هیچ شتێکی تر نادەن، وەك ئەوەی بلێی کێشەکانی موسڵمانان هەر هەمووی چارەسەر کرابێ!. بۆ نموونە نابینی تاکە یەك کەسیش باسی مافەکانی مرۆڤی موسڵمان بکات، کە زۆر بە روونی لە دەقەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتووە وەك: مافی ژیان و ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی و ئازادی بیرکردنەوە و ڕادەربڕین بە هەر شێوازێك بێ و مافی ئاخاوتن و بەستنی کۆڕ و کۆبونەوە، هەروەها مافی ڕێزگرتن لە شوێنی حەوانەوە (ماڵەوە) و هات و چۆ...هتد.

هەروەها کەس باسی ئەوە ناکات، کە دیموکراسیەتی لیبرالی بۆتە هۆی پێشکەوتنێکی سەرسوڕهێنەر لە بواری زانستدا وەك: زانستە سروشتییەکان و سەربازی و کیمیاگەری و کەس ئاماژە بۆ ئەو سەرکەوتنە گەورانە ناکات، کە لەبواری چوونە بۆشایی ئاسمان و گەیاندن و کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و لەبواری پزیشکی و چارەسەرکردن و ئەندازەی بۆماوەیی و بەڵکو لەبواری کۆمەڵایەتیشدا وەك: (دانانی بە بەهاکانی تاك و کەرامەت بە هەموو پیرۆزیەکانییەوە و هەستکردن بە ئازادییەکانی خۆی) (ئەو دەستوورەی کە هەیانە) لە دەست ستەمی دەسەڵاتەکەیان دەیانپارێزێ و مافی ڕادەربڕین و لێپێچینەوەکردن لەگەڵ حکومەتەکەی خۆیدا پێ دەبەخشێ بێ ئەوەی

کەس ڕێگەی لێ بگرێ و مافی ئەوەشی پێ دەبەخشێ، کە نوێنەرەکانی خۆی هەڵبژێرێ و دەنگی خۆی لەو کەسانەی، کە دەسەڵات خراپ بە کاردێنن بکێشێتەوە، تەنانەت ئەگەر لەسەر سەرەوەی دەسەڵاتیشدا بن.. سەرەڕای ئەمانەش هیچ چاودێرییێکیش ناخرێتە سەر ڕۆژنامەکان و سەرچاوەی زانیارییەکان...هتد.[549] ئێمە جارێکی تریش دەتوانین بڵێین (..لەو زەمانەتانەی، کە دەستوور بە هاوڵاتی تاکی دەبەخشێ و لەو هەستکردنەی کە (یاساییێك) هەیە دەبێ بیپارێزین ـ یاساییێك، کە بەسەر هەر هەمووواندا جێبەجێ دەکرێ و کەس لەو یاسایە بە دەر نییە. ئەمە نمونەییێکە دەکرێ مرۆڤی عەرەب و حکومەتە عەرەبییەکان زۆری لێ فێر بن..).[550]

ئەگەرچی خراپەشی هەیە ـ بەڵکو زۆریشی تێدا هەیە ـ چەندین لایەنی خراپە، کە لە پیادەکردنی دیموکراسیەتی لیبرالیدا دەرکەوتووە، ئەمەیان کەس زۆرمان لێ ناکات بیگوازینەوە ناو کۆمەڵگەی خۆمان، ئەوەی لەسەر ئێمەیە ئەوەیە لایەنە چاك و باشەکانی وەربگرین و بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵگاکەی خۆمان سوودی لێ وەربگرین و ئەو ڕەگەزە خراپانەشی لێ دەرکەین، کە کۆمەڵگاکەمان تێکدەدات. بۆ نموونە: ئەگەر پێم گوتی (وەك شێر بە) ئەمە مانای ئەوە نییە کە ببیتە کێوی یان، کلك و ڕنۆك و کەڵبەت لێ بڕوێ، بەڵکو مانای ئەوەیە ئازا بیت!.

ئەگەر گوتمان تەلەفزیۆن لە ڕۆژئاوادا جۆرە فلیمێکی سێکسی پێشان دەدات، کە لە دەرەوەی داب و نەریتە گشتییەکانە، ئایا پێویست بەوە دەکات ئێمە سەرلەبەری بیرۆکەی تەلەفزیۆن ڕەت بکەینەوە؟ یان ئێمە دەتوانین شتی زۆر لەو ئامێرە بچووکە فێر بین ـ هەر ئەمەش بە کردار ڕوودەدات و ئەو لایەنە سێکسیەی لێ دوور دەخەینەوە، کە ئێمەی سەرقاڵ کردووە..؟! ئەگەر ئێمە هەندێك کون و کەلەبەرمان لە سیستەمی پەروەردە لە وڵاتەکەی خۆماندا بەدی کرد، دەبێ چاکی بکەینەوە، یان دەبێ بڵێین: دەبێ قوتابخانەکان دابخەین و چیتر منداڵەکانمان فێر نەکەین و دەبێ بگەڕێینەوە سەر زەمانی سیپارە و خوێندنی حوجرەکان، لەبەرئەوەی هەندێك لە قوتابییەکان لە قوتابخانەکاندا فێری جگەرەکێشان بوونە و دواتر لە ڕێگە لایانداوە؟!

---

٥٤٩ ـ د. فوئاد زەکەریا (العرب والنموذج الامریکی) کتێبخانەی میسر لە فوجالە ساڵی ١٩٩١ لـ٢٨ ـ ٢٩ـ.

٥٥٠ ـ هەمان سەرچاوە لـ٣٦ـ.

عەرەب لە یۆنیۆی ١٩٦٧دا شکستێکی قێزەوەنی بە خۆیەوە بینی، بەڵام تاکە یەك کەسیش هاواری نەکرد بڵێ با ئەو سوپایە هەڵوەشێنینەوە و سەرباز و ئەفسەرەکان بنێرینەوە ماڵی خۆیان لەبەرئەوەی نەیانتوانی سەرکەوتن بە دەست بێنن (چونکە ئەم کارە کارێکی شێتیانەیە)، بەڵکو زۆر کەس داوایان دەکرد هەڵەکە چاك بکرێتەوە: ئینجا هەڵەکە لە سەرکردایەتی بێ، یان لە شێوازی مەشق کردن بێ، یان لە جۆری چەکەکان بێ!.

هەمان ئەو شتەش لەبارەی دیموکراسیەتی لیبرالی بڵێ. بەڵێ لەوانەیە هەڵە لە پیادەکردنەکەیدا هەبێ، بەڵام دەبێ لە هەموو کاتێکدا ئێمە دوو شت لە مێشکی خۆماندا دابنێین:

**یەکەم:** لێرەدا تاکە یەك شێوازی دیموکراسیەت نییە، کە دەبێ ئێمە دەقاودەق بیسەپێنین، بەڵکو چەند بنەچەیێکی گشتی هەیە، کە کەس لەسەری ناکۆك نییە، بگرە تەنانەت ئەوانەی دژی دیموکراسیەتیشن ئەوە دووپات دەکەنەوە و پشتگیری لێدەکەن.

**دووەم:** لە هەر سیستەمێکی مرۆڤایەتیدا، هەر دەبێ هەڵە و کون و کەلەبەری زۆری تێدا بێ، کە دەبێ چاك بکرێنەوە و کار بۆ چارەسەر کردنی بکرێ، بێ ئەوەی هەوڵی تێکدانی خودی سیستەمەکە بدرێ.

لە کۆتاییدا ئەوەمان لە یاد نەچێ کە (باشترین چارەسەر بۆ هەڵەکانی دیموکراسیەت، بوونی دیموکراسیەتی زیاترە)!.

## یەكەم: سەرچاوە عەرەبییەكان:

(١)د.ابراهيم الدسوقي اباظة و زميله (تاريخ الفكر السياسي) دار النجاح ـ بيروت عام ١٩٧٣.

(٢) ابراهيم (زكريا) (برجسون) (نوابغ الفكر العربي) رقم ٣ دار المعارف بمصر.

(٣) ابراهيم ابو الليل (المدخل الى نظرية الحق و القانون) مطبوعات جامعة الكويت عام ١٩٨٦.

(٤) ابن ابي الربيع (سلوك المالك في تدبير الممالك) تحقيق الدكتور ناجي التكريتي ـ دار الاندلس بيروت ط٣ عام ١٩٨٣.

(٥) ابوبكر محمد بن محمد الطرطوشي (سراج الملوك) المطبعة المصرية عام ١٣٨٩هـ.

(٦) ابو نصر الفارابي (كتاب السياسة المدنيية الملقب بمبادى الموجودات) د. فوزي متري نجار ـ دار المشرق بيروت عام ١٩٩٣.

(٧) ابو نصر الفارابي (كتاب آراء أهل المدينة الفاضلة) قدّم له وعلّق عليه د.البير نصري نادر ـ دار المشرق بيروت ط ٧.

(٨) ابو نصر الفارابي (تحصيل السعادة) تحقيق جعفر آل ياسين ـ دار الاندلس للطباعة والنشر بيروت ط ٢ عام ١٩٨٣.

(٩) أبو الحسن الماوردي (الاحكام السلطانيية) الناشر مصطفى الحليي بالقاهرة ط ٢ عام ١٩٦٦.

(١٠) ابو عبداللّه بن الازرق (بدائع السلك في طبائع الملك) تحقيق د. علي سامي النشار ـ منشورات وزارة الاعلام العراقية عام ١٩٧٧.

(١١) احمد بن الداية (الفلسفة السياسية عند العرب) تقديم و تحقيق الدكتور عمر المالكي ـ الشركة الوطنيية للنشر والتوزيع ـ الجزائر عام ١٩٧١.

(١٢) د. احمد شبلي (السياسة في الفكر الاسلامي) ط ٦ مكتبة النهضة العربية بالقاهرة عام ١٩٩١.

(١٣) احمد عبدالقادر الجمال (مقدمة في اصول النظم الاجتماعية و السياسية) مكتبة النهضة العربية بالقاهرة عام ١٩٨٥.

(١٤) احمد امين (ضحى الاسلام) في ثلاثة اجزاء مكتبة النهضة المصرية بالقاهرة ط ٦ عام ١٩٥٦.

(١٥) احمد فؤاد الاهواني (افلاطون) نوابغ الفكر لغربي عدد رقم ٥ دار المعارف بالقاهرة.

(١٦) افلاطون (الجمهورية) دراسة و ترجمة د. فؤاد زكريا ـ الهيئة المصرية العامة للكتاب بالقاهرة عام ١٩٨٥.

(١٧) المسعودي (مروج الذهب) ٤ اجزاء تحقيق محمد محي الدين عبد الحميد ـ المكتبة الاسلامية بيروت.

(١٨) امام عبدالفتاح امام (توماس هوبز: فيلسوف العقلانيية) دار الثقافة بالقاهرة ط ١ ـ دار التنوير بيروت ط ٢ عام ١٩٨٥.

(١٩) امام عبدالفتاح امام (الطاغية: دراسة فلسفية لصور من الاستبداد السياسي) الطبعة الثالثة مكتبة مدبولي بالقاهرة عام ١٩٩٧.

(٢٠) امام عبدالفتاح امام (المنهج الجدلي عند هيجل) الطبعة الثالثة مكتبة مدبولي بالقاهرة عام ١٩٩٦.

(٢١) امام عبدالفتاح امام (افكار..و مواقف) مكتبة مدبولي بالقاهرة عام ١٩٩٦.

(٢٢) امام عبدالفتاح امام (الاجماع ما له و ما عليه) مجلة سطور عدد ٩ اغسطس عام ١٩٩٧.

(٢٣) امام عبدالفتاح امام (مسيرة الديمقراطية: رؤية فلسفية) دار زويل بالقاهرة عام ١٩٦٩.

(٢٤) برندر(جيفري) : (المعتقدات الدينيية لدى الشعوب) ترجمة د. امام عبدالفتاح امام ـ و مراجع د. عبدالغفار مكاوي عالم المعرفة عدد ١٧٣ ط ١ مكتبة مدبولي ط٢. عام ١٩٩٦.

(٢٥) باركر (سيرارنيست): (النظرية السياسية عند اليونان) في جزأين ترجمة لويس أسكندر و مراجعة د. محمد سليم سالم مؤسسة سجل العرب القاهرة ١٩٦٦.

(٢٦) بدوي (د. عبدالرحمن): (مؤلفات الغزالي) المجلس الاعلى للاداب و الفنون بالقاهرة عام ١٩٦٦.

(٢٧) بدوي (د. عبدالرحمن): (الاخلاق عند كانط) وكالة المطبوعات بالكويت عام ١٩٧٩.

(٢٨) بدوي (د. ثروت): (النظم السياسية) دار النهضة العربية بالقاهرة عام ١٩٨٦.

(٢٩) بدوي (د. ثروت): (احوال الفكر السياسي) دار النهضة العربية بالقاهرة عام ١٩٧٦.

(٣٠) برستد (هنري): (فجر الضمير) ترجمة د. سليم حسن مراجعة علي أدهم ـ مكتبة مصر بالقاهرة.

(٣١) د. بطرس غالي: (المدخل في عالم السياسة) مكتبة الانجلو مصرية عام ١٩٩٠.

(٣٢) توشار (جان): (تاريخ الفكر السياسي) ترجمة د. علي مقلد الدار العالمية للطباعة و النشر بيروت عام ١٩٨٣.

(٣٣) د. حورية توفيق مجاهد: (الفكر السياسي من افلاطون الى محمد عبده) مكتبة الانجلو مصرية ط٢ عام ١٩٩٢.

(٣٤) خيري حماد: (مطارحات ماكيافيلي) دار الافاق الجديدة بيروت عام ١٩٨٢.

(٣٥) جون ديوي: (الحرية والثقافة) ترجمة امين موسى قنديل (مكتبة الانجلو مصرية) عام ١٩٩٥.

(٣٦) د. حسن كيره: (المدخل الى القانون) دار النهضة العربية للطباعة والنشر عام ١٩٦٧.

(٣٧) ديفيد بنيام: (مدخل الى الديمقراطية) ترجمة احدم رمز، منشورات وزارة الثقافة السورية دمشق عام ١٩٩٧.

(٣٨) ديورانت (ول): (قصة الحضارة) الترجمة العربية في ٤٢ مجلدا ترجمها د. زكي نجيب محمود والاستاذ محمد بدران و عدد كبير من المترجمين، نشرتها في مجموعة كاملة دار الجيل للطبع و النشر ـ بيروت.

(٣٩) رسل (برتراند): (حكمة الغرب) في جزأين ترجمة د. فؤاد زكريا سلسلة عالم المعرفة بالكويت عام ١٩٨٣.

(٤٠) رانكه (هرمان): (مصر والحياة المصرية القديمة) ترجمة عبد المنعم ابوبكر.

(٤١) رودلف ميتس: (الفلسفة الانجليزية في مائة عام) ترجمة فؤاد زكريا و مراجعة د. زكي نجيب محمود في مجلدين. دار النهضة العربية بالقاهرة عام ١٩٦٣.

(٤٢) د. زكي نجيب محمود: (.. والثورة على الابواب) الانجلو المصرية ـ و قد عاد طباعتها تحت اسم (الكوميديا الارضية) و اصدرتها دار الشروق بالقاهرة.

(٤٣) د. زكي نجيب محمود: (في تحديث الثقافة العربية) دار الشروق بالقاهرة عام ١٩٨٧.

(٤٤) د. زكي نجيب محمود: (حياة الفكر في العالم الجديد) دار الشروق بالقاهرة.

(٤٥) د. زكي نجيب محمود: (تجديد الفكر العربي) دار الشروق بالقاهرة.

(٤٦) سباين (جورج): (تطور الفكر السياسي) في خمسة أجزاء ترجمها حسن جلال العروسي و آخرون ـ دار المعارف بمصر.

(٤٧) د. سعاد الشرقاوي: (النضم السياسية في العالم المعاصر) دار النهضة العربية بالقاهرة عام ١٩٨٨.

(٤٨) د. سمير عبدالمنعم: (البعد الاخلاقي لقانون العلاقات الدولية) مكتبة النهضة المصرية الطبعة الاولى عام ١٩٨٨.

(٤٩) د. عبدالحميد متولي: (ازمة الفكر السياسي الاسلامي في العصر الحديث) الهيئة المصرية العامة للكتاب عام ١٩٨٥.

(٥٠) د. صلاح الدين رسلان: (الفكر السياسي عند الماوردي) مكتبة نهضة الشرق بالقاهرة عام ١٩٨٥.

(٥١) عبدالرازق السنهوري: (فقه الخلافة و تطورها لتصبح عصبة امم شرقية) ترجمة د. نادية عبدالرازق السنهوري و مراجعة د. توفيق محمد الشاور ـ الهيئة المصرية العامة للكتاب عام ١٩٨٩.

(٥٢) د. عبدالله ابراهيم ناصف: (السلطة السياسية: ضرورتها و طبيعتها) دار النهضة العربية بالقاهرة عام ١٩٨٣.

(٥٣) د. عبد الستار قاسم: (الفلسفة السياسية التقليدية) المطبعة الاردنيية عام ١٩٧٩.

(٥٤) د. عبد العزيز عامر: (المدخل لدراسة القانون المقارن) منشورات جامعة فاريدنس ـ بنغازي عام ١٩٧٧.

(٥٥) د. عبدالحى حجازي: (المدخل لدراسة العلوم القانونيية) مطبوعات جامعة الكويت عام ١٩٧٢.

(٥٦) د. عبد السلام الترميتي: (الوسيط في تاريخ القانون والنضم القانونيية) جامعة الكويت ١٩٧٩.

(٥٧) د. عصمت سيف الدولة: (الاستبداد الديمقراطي) دار المستقبل بالقاهرة.

(٥٨) د. فاروق مصطفى اسماعيل: (الانثروبولوجيا الثقافية) دار المعرفة بالاسكندرية جزآن عام ١٩٨٤.

(٥٩) د. عبدالواحد وافي: (المدينة الفاضلة للفارابي) مكتبة عكاظ ـ السعودية ط ٢ عام ١٩٨٤.

(٦٠) د. فؤاد زكريا: (العرب و النموذج الامريكي) مكتبة مصر بالفجالة بالقاهرة عام ١٩٩١.

(٦١) فؤاد شبل: (حكمة الصين) جزآن ـ دار المعارف بمصر.

(٦٢) فتحية البراوي: (تطور الفكر السياسي في الاسلام) دراسة مقارنة دارالمعارف بمصر عام ١٩٨٢.

(٦٣) فيشر (هـ.أ.ل): (تاريخ اوروبا في العصر الحديث) ترجمة احمد نجيب هاشم، وديع الضبع ـ دار المعارف بمصر عام ١٩٤٦.

(٦٤) كسيرر(آرنيست): (الدولة والاسطورة) ترجمة د. احمد حمدي محمود الهيئة المصرية بالقاهرة ١٩٧٥.

(٦٥) لوك(جون):(في الحكم المدني) ترجمة د. ماجد فخري ـ اللجنة الدولية لترجمة الروائع ـ بيروت عام ١٩٥٩.

(٦٦) ماركيوز (هربرت): (العقل والثورة: هيجل و نشأة النظرية الاجتماعية) ترجمة د. فؤاد زكريا ـ الهيئة المصرية العامة للتأليف و الترجمة ـ القاهرة عام ١٩٧٠.

(٦٧) ماكيند (روبرت): (تكوين الدولة) ترجمة د. حسن صعب ـ دار العلم للملايين ـ بيروت عام ١٩٨٤.

(٦٨) محمد مختار الزقزوقي: (نيقولا ماكيافيللي) مكتبة الانجلو مصرية بالقاهرة عام ١٩٨٥.

(٦٩) د. محمد ضيلءالدين الريس: (النظريات السياسية الاسلامية) مكتبة الانجلو المصرية عام ١٩٥٢.

(٧٠) محمد فاروق النبهان: (نظام الحكم في الاسلام) مطبوعات جامعة الكويت عام ١٩٨٧.

(٧١) د. محمد كامل ليلة: (النظم السياسية: الدولة و الحكومة) دار النشر العربي بالقاهرة.

(٧٢) د. محمد مهدي محفوظ: (اتجاهات الفكر السياسي في العصر الحديث) المؤسسة الاجتماعية للدراسات والنشر ـ بيروت عام ١٩٩٠.

(٧٣) د. محمد انس قاسم جعفر: (النظم السياسية والقانون الدستوري) دار النهضة العربية بالقاهرة ١٩٩٩.

(٧٤) د. محمود عاطف البنا: (الوسيط في النظم السياسية) دار الفكر العربي بالقاهرة عام ١٩٨٨.

(٧٥) د. محمد يوسف مرسي: (نظام الحكم في الاسلام) دار الكتاب العربي بالقاهرة للطباعة والنشر بالقاهرة.

(٧٦) د. ملحم قربات: (قضايا الفكر السياسي: العدالة) المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر ـ بيروت عام ١٩٩٢.

(٧٧) د. مصطفى الخشاب: (تاريخ الفلسفة والنظريات السياسية) لجنة البيان العربي القاهرة عام ١٩٥٣.

(٧٨) مونتسكيو: (روح الشرائع) جزآن، ترجمة عادل زعيتر ـ دار المعارف بمصر عام ١٩٥٣.

(٧٩) د. نعمان الخطيب: (الاحزاب السياسية و دورها في أنظمة الحكم المعاصر) دار الثقافة للنشر والتوزيع بالقاهرة عام ١٩٨٣.

(٨٠) هيجل: (فلسفة التاريخ) ترجمة د. امام عبدالفتاح امام، و مراجعة د. فؤاد زكريا العدد ١ المكتبة الهيجلية دار التنوير بيروت.

(٨١) هيجل: (اصول فلسفة الحق) ترجمة د. امام عبدالفتاح امام، مكتبة مدبولي بالقاهرة عام ١٩٩٦.

(٨٢) هيجل: (موسوعة العلوم الفلسفية) ترجمة د. امام عبدالفتاح امام ـ مكتبة مدبولي بالقاهرة عام ١٩٩٦.

**قواميس و دوائر معارف: .**


١ ـ موسوعة العلوم السياسية ـ مجلدان ـ جامعة الكويت عام ١٩٩٤.

٢ ـ موسوعة السياسة ـ بأشراف عبدالوهاب الكيالي ـ المؤسسة العربية للدراسات والنشر في سبعة مجلدات.

٣ ـ موسوعة العالم وليم لانجر ـ اشرف على الترجمة د. محمد مصطفى زيادة ـ مكتبة النهضة المصرية عام ١٩٦٣.

٤ ـ لسان العرب لابن منظور ـ احد عشر مجلدا ـ دار المعارف بمصر.

٥ ـ موسوعة المورد العربية ـ مجلدان ـ دار العلم للملايين ـ بيروت عام ١٩٩٠.

## سەرچاوە بیانییەکان:

(1)Ash Wiliam: Morals and Politics: The Ethics of Revolution،Routledge & Kegan Poul ،1997.

(2) Arisstotle: "The Complete Works Two Vols, Ed. By Barnes, Princeton Press, N.T.1985.

(3) Bluhm, Wiliam: "Theories of Political System " Prenceton-Hall, 1971.

(4) Cranston (Maurice): "Introduction to Social Contract" Penguin Books.

(5) De Toquville (Alexis): "Democrasy in America: Oxford, 1966.

(6) Ebenstein, Wiliam: "Great Political Thinkers" Oxford, 1997.

(7) Fukuyama (F.): "The End of The History and The Last Man" The Free Press 1993.

(8) Goldwin, A. Robert: "John Locke" in History of Political Philosophy" Ed. By Leo Strauss.

(9) Hobbes (Thomas) Leviathan Ed. By M. Oakshott, Oxford, 1945.

(10) Hobbes (Thomas) De Give: "Man and Citizen"Ed.By Bernard Gert, Humanities Press, 1972.

(11) Hoffding, H.:"A History of Modern Philosophy" Two Vols. Eng. Trans. By R.E. Mere, Macmillan, 1920.

(12) Kelsen (Hans):"General Theory of Law and State" Trans By A. Wedbery N.Y. Russell &Russell, 1961.

(13) Locke (John) Two Treatises of Government (Every Man' s Library) 1981.

(14) Lee Cameron McDonald: "Wistern Plitical Theory: "From The Origins to The Presant" –Harcout, N. Y. 1968.

(15) Machiavelli.(N.):"The Prince" Eng. Trans. By W.K Marriott (Every Man's Library).

(16) Pennock (Roland): "Democratik Political Theory" Princeton University Press, N.Y.1979.

(17) Peters (R.):"Thomas Hobbes" Greenwood, Press, 1987.

(18) Spencer (H.) Evolution in Culture and Society" Ed. By Sanslay Anderson, 1971.

(19) Strauss (Leo):" Ed History of Ploitical Philosophy"Chicago, 1987.

(20) Strauss (Leo): "City and Man" University of Chicago, 1964.

(21) Warrender (H.):"The Political Philosophy of Thomas Hobbes" Oxford, 1957.

## فەرهەنگ و ئینسکلۆپیدیاکان:

1-The Encyclopedia of Ohilosophy 8 Vols. Ed. Poul Edwards. Macmillan, 1967.

2-Great Books of The Western World,. The GREAT Ideas: 11. Vol. 3 ed. Robert Maynard Hutchins Carl: Tyrarny.

3-The Blackwell, Encyclopedia of Plitical Thought-Oxford Blackwell.

4-Dictionary of The History of The Ideas: Studied of Selected Pivotal Ideas, Vol 11 (Democrasy),ch, Scribner's Sons.N.Y.1973.

5-Scruton, Roger: Dictionary of Political Thought- McMillan 1982.

6-Dictionary of Modern Thought. Ed. By A Bullock – Fontana Press 1977.

7- Encyclopedia Americanan.

8- Encyclopedia Britannica